# کورد و باکوری کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە



# هەتا شەڕی دوهەمی جیهان





## بەرگی یەکەم

## هەتا کۆتایی شەری یەکەم

نووسینی :

م . ڕەسوڵ هاوار

# کورد و باکوری کوردستان لەسەرەتای میژووەوە
# هەتا شەڕی دووەمی جیهان

بەرگی یەکەم

((هەتا کۆتایی شەڕی یەکەم))

نوسینی : م. رەسوڵ هاوار

چاپی یەکەم

٢٠٠٠

ناوەندی چاپەمەنی و راگەیاندنی خاك

ناوی کتێب :

کورد و باکوری کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان

نووسینی

م . ڕەسوڵ هاوار

تایپ :

دارا صدیق - هێدی محەمەد

مۆنتاژ :

بـازیـان جەلال

بەرگی یەکەم - چاپی یەکەم :

چاپخانەی خاك / سلێمانی ۲۰۰۰

تیراژ :

۱۰۰۰دانە

ژمارەی سپاردن :

(۲٤٦) ی ساڵی ۲۰۰۰ ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

## ناوەرۆکی ( فهرستی ) بەرگی یەکەم — لاپەڕە

# پێشەکی

لەدوای چاپکردنی کتێبەکەی شێخ محمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خواروی کوردستان و کتێبەکەی سمکۆی شکاک و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد، بیرم لەوە کردەوە باسێکیش دەربارەی باکووری کوردستان ئامادەبکەم کە گەورەترین بەشێکی کوردستانی پارچە پارچە کراوو داگیرکراوەو لە زەمانی عوسمانیدا بەشێکی گرنگ بووە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و هەر لە شەڕی چاڵدێرانی ساڵی ١٥١٤ لە نێوان دەوڵەتی صفویی شیعەو عوسمانیی سونی ڕۆڵێکی زۆر گرنگی بینیوە لە پێشکەوتن و سەرکەوتنی عوسمانیداو خۆی بە بەشێك زانیوە لەو ئیمپراتۆریەتەداو لەوکاتەوە لەژێر دەستی ئیدریسی بەدلیسیدا هەموو ئەمارەتەکان چارەنووسی خۆیان بەستەوە بە دەوڵەتی عوسمانییەوەو هەرچی زانایان و ڕۆشنبیرانی کورد بوو هەموو ووزەو لێهاتوویی خۆیان لە پێناوی بەرژەوەندیەکانی ئەوا تەرخان کردوو هەتا ئەوکاتەی تورك لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا ووتبووی من عوسمانیم کوردیش هەر بەو شێوەیەی ئەو ووتبووی من عوسمانیم، بەڵام لەدواییدا کە تۆرانییەکان بە سەرکردایەتی (ژۆن تورك)و (اتحادوترقی) ووتیان ئێمە تورکین نەك عوسمانی، ئیتر کوردیش ناچار بوو بکەوێتە خۆی و ووتی منیش کوردم و داوای مافی خۆم ئەکەم و ساتێك تورکە طورانیە ڕەگەز پەرستەکان بەرەنگاری کورد بوونەوەو دژی ئەو داخوازییەی کورد ڕاوەستان، کوردیش دەستی دایە چەك و لە زەمانی بەدرخان پاشاوە یەك لەدوای یەك شۆڕشی چەکدارانەی کردووە بۆ دەسگیربوونی مافی ڕەوای خۆی و لەوساوە هەتا ئیمڕۆ کۆڵی نەداوە. ئەگەرچی بەداخەوە شۆڕشەکانی هەمووی توشی شکاندن بووەو ئەگەر سەرکەوتنێکی کاتیشی بەخۆیەوە دیبێت زۆری پێنەچووە دەسکەوتەکانی ئەو سەرکەوتنەی لەکیس چوەو تووشی کارەساتێکی زۆرو ماڵکاولی بووە، بەبێ ئەوەی لە یەکێك لە شۆڕشەکانیا توانیبێتی دەرس و پەند لە بەسەرهات و ڕووداوەکانی پێش ئەو شۆڕشە وەربگرێت و زۆرجار شۆڕشەکان هەموویان وەکوو فۆتۆکۆپیی یەکتر وابوون.

ئیمڕۆ ئەو تورکەی هەمووی شەش حەوت سەدە لەمەوبەر لە ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە لە شێوە عەشایری ڕاوو ڕووتکەردا ڕوویان کردۆتە ڕۆژئاوای

ئاسیاو لە ئەنجامدا لە ئاسیای بچوكدا لەسەر حسابی ئەو نەتەوانەی بەر لەوان خاوەنی زەوی‌و زاری خۆیان بوون وەكوو بێزەنتی‌و كوردو ئەرمەنی، بەتایبەتی لەو ناوچانەدا كە لە مێژوودا بە(ئەرزڕۆم) ناسراو بووە ئەو دەوڵەتە فراوانەیان پێكەوەناو ئیمڕۆ ئەوانەی پێیان دەوترا (كمالی)و ئیمڕۆ دروشمی (عیلمانی)یان بەرز كردۆتەوە بوون بە خاوەن ماڵ‌و ماڵ لە خاوەنی خۆی حەرامەو هەتا ئیمڕۆش تورکە ڕەگەز پەرستەكان بە كوردی باكووری (١٨-٢٠) ملیۆن كەسی دەڵێن توركی شاخاوی‌و لەم ڕۆژەدا كە لە جیهانا میللەت نەماوە مافی نەتەوایەتی خۆی دەستگیر نەبوبێت كەچی هێشتا دان بە بوونی نەتەوەی كوردا نانرێت‌و چ ڕەگەز پەرستە طورانیەكان خۆیان‌و چ ئەوانەی توركیایان كردووە بە بنكەی هێزەكانی خۆیان، بەتایبەتی ئەمریكای دۆستی توركیا، بەو پەڕی بێ شەرمییەوە بە ڕاپەڕینی كورد لە باكووری كوردستاندا ئەڵێن بزوتنەوەیەكی تیرۆریزمانەیە...

لەبەر ئەوەی كلیلی سەركەوتنی بزوتنەوەی كورد بریتیە لە سەركەوتنی كورد لە باكووری كوردستاندا دژی طورانیی ڕەگەز پەرستی داگیركەر، بۆیە بە پێویستم زانی بچمە بنج‌و بناوانی مێژووی كورد لە باكووری كوردستاندا لەگەڵ چوونە بنج‌و بناوانی چۆنێتی هاتنی تورك‌و بەتەمابووم كورتەیەكی ئەو باسە دوورو درێژە لە بەرگێكدا ئامادە بكەم‌و ساتێك بەخۆم زانی ئەوەی من مەبەستمە لێی بدوێم بەتەنها بەرگێك بۆم تەواو ناكرێت. بۆیە بڕیارم دا بەرگی یەكەم بریتی بێت لە باكووری كوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی جیهانی یەكەم‌و لە شەڕی جیهانی یەكەم بەدواوە هەتا شەڕی جیهانی دوهەم بكەم بە بەرگی دوهەم ئەگەر ئەوەی دوهەمم بە یەك بەرگ بۆ تەواو بكرێت...

لە نوسینەكاندا، بۆ ئەوەی لە كاتی باسكردنی ئەو سەرچاوانەی ئاماژەیان بۆ ئەكەم هەموو جارێك باسی ناوی سەرچاوەكەو نووسەرەكەی‌و ساڵ‌و شوێنی لەچاپكردنی دووبارە نەكەمەوە، وام بەباش زانی تەنها ئاماژە بۆ ژمارەی سەرچاوە بكەم لە ڕیزی سەرچاوەكاندا كە لە كۆتایی بەرگی یەكەم‌و دوهەمدا ژمارەم بۆ هەریەكێك لە سەرچاوەكان داناوە.

هیوادارم بەپێی توانای ئەم تەمەنەم كەوا خەریكە خۆی ئەدا لە (٧٥)ساڵ توانیبێتم بەو پێویستیەی لەسەر شانمە بەو بەشە گرنگەی كوردستان كە بریتیە لە باكووری كوردستان بەجێم هێنابێت‌و داوای لێبوردن ئەكەم لە هەر كەم‌وكوڕیەكدا لە باسەكاندا یاخود لە بۆچوونەكانمانا هەستی پێ‌بكرێت.

## بەشی یەکەم

# مێژووی کوردو ڕەگەزی کورد

بێگومـان باسـی مێــژووی کـوردو ڕەگـەزی کـورد لــە هــەموو پارچــەکانی کوردستاندا وەکوو یەك وایەو جیاکردنــەوەی مێـژووی هەریـەکێك لـە پارچـەکانی شتێکی ئاسان نیەو دەبێتە مایەی سەریەشەو سەرلێ تێکچوون، بۆیە بە پێویستم زانی مێژووی کوردو ڕەگەزی کورد بە شێوەیەکی تایبەتی باس بکەم بـەپێی ئـەو سەرچاوانەی لەو باسە گرنگو دووردرێژە دواون و ئەگەر جارویـار لـە قۆنـاغێکدا باسی کوردی باکوور هاتە پێشەوە ئەوا بەشێوەیەکی تایبەتی لەو بەشە بدوێم.

دەربارەی مێژووی کوردو کوردستان گەلێك نوسراوی خۆمانەو بێگانە باسیان کردووەو هەریەکەیان بەشێوەیەك چۆتە بنج وبناوانیو زاناو پسپۆڕو لێکۆڵەرەوەو ڕۆژهەلاّتناسەکان هەریەکەیان بایـەخیان داوەبـە قۆنـاغێك یـان چـەند قۆنـاغێکی مێژووی کوردو کوردستانو لەو ڕووەوە گەلێك بۆچوونی جیاواز لەلایـەن ئەوانـەوە تۆمارکراوە وەکوو لە سەرچاوەکانی ئەم کتێبەدا دێنە پێش چاو.

هــەندێ لــە نووســەرانی بێگانــە بەتایبــەتی نووســـەرانی ئــەو ولاّتانـــەی کوردستانیان داگیر کردووە یا لایەنگریان بـوون هەمیشـە هـەوڵیان داوە مێـژووی میللەتی کورد بشێوێنن بــە بـێ ئـەوەی هیـچ بەڵگەیـەکی مێژوویـیو زانیارەییـان بەدەستەوە بووبێتو گەلێك درۆو دەلەسەیان دەبـارەی کـورد هەڵبەسـتوەو هـی وایان هەبووە پەنای بردۆتە بەر هەندێك چـیرۆكو ئەفسـانەی پـڕ لـە پـڕوو پـووچ وەکوو ئـەوەی (مســعودی) دەربـارەی کـورد تۆمـاری کـردووەو ئـەو بـاسو نووسینانەی ئەو جۆرە بوون بە سەرچاوە بۆ نووسەرانی تر ئەگەرچی نووســەری بەویژدانو زانای واش بووە بەرپەرچی ئەو درۆو دەلەسانەی داوەتەوەو بۆچوونە

بێ بناغەکانیان پوچەڵ کردووەو بەشێوەیەکی زانیاریانە دەربارەی مێژووی کورد دواون.

ئەو سەرچاوانەی دەربارەی مێژووی کورد دواون ئێجگار زۆرن و ئێمەش لێرەدا هەوڵئەدەین باسی ئەو نووسەرانەی بە بەڵگەوە باسی کوردیان کردووە بخەینە بەرچاو بەبێ ئەوەی گوێ بدەینە جیاوازی بۆچوونەکانیان و بەپێی توانا هەوڵ ئەدەین جیاوازییەکانی هەندێ لەو نووسەرانە بخەینە پێش چاوو هیوادارم ئەمە بە دووبارە کردنەوەی باسێك لە باسەکان نەژمێرێت وەکوو هەندێکەس وای بۆ دەچن.

(لازاریف) لە کتێبەکەیدا (کوردومەسەلەی کورد) لە بڵاوکراوەکانی خوێندکارانی سۆشیالیست کە لە ساڵی ١٩٨٤دا لەلایەن دوکتۆر کمال علییەوە لە رووسیەوە وەرگێڕاوە بۆ کوردی، دەربارەی مێژووی کورد وتوویەتی..

(( کوردەکان گەورەترین گروپی (ئیتنی)ی ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیکن کە هەتا ئێستە لە مافی نەتەوایەتی خۆیان بێبەش کراون لە کاتێکدا یەکێکن لە هەرەکۆنترین دانیشتوانی خوارووی رۆژئاوای ئاسیا.

بەپێی بەڵگەکان دەردەکەوێ مێژووی کورد دەگەڕێتەوە بۆ دووهەزار پێش زایین و راستەوخۆ بەشداریی کردووە لە هەموو رووداوێکی سیاسی و رامیاری و کولتوریی و ناوچەکەو هیچ کاتێکیش لە لایەن ئیمپراتوریەتەکان و کۆمارە تازەکانی ئیمرۆی ناوچەکەوە بایەخیان پێ نەدراوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلانی ئێران و عەرەب و تورکدا بەرامبەر بە کۆلۆنیالیزم چالاکانە وەستاوەو بەشداری کردووەو دەیکا.

بەر لەهەموو شتێك پێویستە نەتەوەی کورد وەکوو نەتەوەیەکی جیاوازو سەربەخۆ سەیر بکرێت، چونکە بەتەواوەتی رەنگو رواڵەتو شێوەی تایبەتی خۆیان هەیەو ئەم راستیەش لەلایەن گەلێك سەرچاوەی باوەرپێکراوەوە دانی پیادانراوە.

پێویستە لێرەدا ئەوە دووبارە بکەینەوە کە تائێستە دەسەڵاتدارە شۆڤێنیەکان لە چەند وڵاتێکی خۆرهەڵاتی نزیکدا هەوڵو تەقەلایەکی زۆر دەدەن بۆ ئەوەی ئەم راستیە چەواشە بکەن و وای پێشان بدەن گوایە کورد نەتەوەیەکی

جیاوازو سەربەخۆ نیەو ئەوانە جارێك كوردیان بەفارسو جارێك بە عەرەبو یا تورك لەقەڵەم داوەو دەیدەنو ئەوپەڕەكەی ئەگەر زۆر لەخۆیان بكەن بە كورد ئەڵێن كەمە نەتەوەیەكە، لەكاتێكدا كورد لە هەموو پارچەكانیا نەتەوەیەكی سەربەخۆن لە ڕووی زمانو پێوەندیی جوگرافیەوە )).

دەربارەی ئەوەی لازاریف باسی كردووە كە عەرەبو فارس هەریەكەیان بە جۆرێك ویستویانە كورد ببەنەوە سەر خۆیان، شاعیرێكی كۆنی عەرەب لەو ڕوەوە وتوویەتی:

لعمرك ما الاكراد أبناء فارس ولكنهم أبناء كرد بن عامر

ئەمین زەكی بەگ دەربارەی ڕەگەزی كورد، لە لاپەڕە/٤٦ مێژووی كوردو كوردستان، سەرچاوە/٣٢ وتوویەتی:

(( لە چیرۆكو نووسەرە ئیسلامیەكانا وەكوو (مسعودی) كە لە كتێبەكەیدا (مروج الذهب) باسی كردووەو هەندێ نووسەری تریان كە باسی كوردو ڕەگەزی كوردیان كردووە، بۆچوونەكانیان بریتین لە گێڕانەوەی هەندێ چیرۆكو ئەفسانەی كۆنی بێ بەڵگە كە هی هیچیشیان لەهی یەكتر ناچێت)).

ئەمین زەكی لەهەمان باسیا لە لاپەڕەی (٣٨)و(٤٩)دا، بیرو بۆچوونی دوو زاناو شارەزای خستونە بەرچاو، یەكەمیان (ڤلادیمیر مینۆرسكی)یەو هی دوهەم (سێرسدنی سیمث)ەو لێرەدا هەوڵدەدەین بۆچوونی ئەو دوو زانایە دەربارەی مێژووی كورد وەكوو ئەمین زەكی باسی كردووە بیخەینە بەرچاو.

مینۆرسكی لە باسەكەیدا وتوویەتی:

(( ڕەنگە میللەتی كورد لە سەرەتادا لە ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە بەرەو ڕۆژئاوا كۆچی كردبێتو لە سەرەتای مێژووەوە لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بووبێتو هیچ دووریش نیە لەو سەردەمەی ئەوان بەرەو ڕۆژئاوا كۆچیان كردووە، لە كوردستاندا نەتەوەیەك یان چەند نەتەوەیەك كە ناوەكەیان نزیك بووبێت لە ووشەی (كاردو) لەوێدا تێكەڵ بەیەكتر بوونو بە هەموویان میللەتێكیان پێكەوە نابێ.

لەو ڕوەوە (ثورو دانجین Thureau Dengin)ی ڕۆژهەڵاتناس وتوویەتی چاوی بە گۆڤاری (ئاشوریۆلۆجی) كەوتووە باسی نەخشەی دوو لەوحەی تیادا

بڵاوکراوەتەوەو هەندێ وێنەو نووسینی وای تێدابووە مێژوەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ دووهەزار ساڵی پێش زایینو باسی ئەوەی تیادا کراوە ناوچەیەك هەبووە پێی وتراوە (کارداکا) لەنزیك (سوSU)ی باشووری گۆلی (وان).

مینۆرسکی لە باسەکەیدا ئاماژەی بۆ شرفنامەی بدلیسی کردووە کە باسی قەلآیەکی کردووە بەناوی (SUY)– کە (مەبەستی ئەوەبووە بلێ ئەمە هەمان شوێنە کە لە گۆڤاری (ئاشوریۆلۆجی)دا باس کراوە).

مینۆرسکی ئاماژەشی بۆ باسێکی (دریور _ درایڤر)ی ڕۆژهەلآتناس کردووە کە وتوویەتی (تیگلا بلسر) لە شاخەکانی (AZO) شەڕی لەگەڵ نەتەوەیەکدا کردووە کە ناوی (KURTI– کورتی) بووەو لەو شەڕەدا تیگلا بلسر ئەو کورتیانەی خراپ شکاندوە کە ئەو (AZO)ە بریتیە لە هەمان چیای (هارۆ)ی ئێستە کە پێی ئەڵێن (ساسون).

مینۆرسکی ئاماژەی بۆ باسێکی (هیرۆدۆتس)ی مێژووناسی بەناوبانگ کردووە کە وتوویەتی لە هەواڵەکانی سەدەی پێنجەمی پێش زایندا ناوچەی سیازدەهەمی دەوڵەتی ( Achamenid– ئەخمینی) کە لە دواییدا خرایە سەر ناوچەی ئەرمەنیا، لەو سەردەمەدا ئەو ناوچەی سیازدەهەمە بە (بوختەویخ) ناوبراوەو ووشەی (بوختان _ بەهتان _ بوتان)ی ئیمرۆ بە دەسکاریەوە لەو ووشەی بوختەویخەوە وەرگیراوە. جگەلە هیرۆدۆتس، (Zenophen – زینفون)یش لە پاشەکشەکەیدا بەخۆیو دەهەزار سەربازیەوە لە ساڵی (٤٠٠–٤٠١)ی پێش زایین باسی (کردوکی) کردووەو وتوویەتی : وڵاتەکەیان دەگاتە ناوچەی (بوهتان)و لەوساوە ئیتر ئەو ناوچەیە بە (بوهتان) ناو دەبرێت کە کەوتووەتە کەناری چەپی ڕوباری دجلە.

ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەڕە/٣٩ی کتێبەکەیدا وتوویەتی ووشەی دجلە لە زمانی فارسیدا بەرامبەرەکەی ووشەی (ARROU–ئەڕو) دەگرێتەوە و بۆیە وای پێ ووتراوە چونکە ئاوی ڕوبارەکە خوڕو تیژڕەوەو لە زمانی (عبری)دا ووشەی (چیدیگل) ناوی هاتووە کە ماناکەی هەر ئەو (ئەڕۆ)یە دەگرێتەوە، بەلآم ووشەی (Tigris) لە ووشەی (Tighlat)ی زەندی یەوە وەرگیراوە کەبە سنسکریتی مانای (تیژ) دەگرێتەوە.

مینۆرسکی وەکوو ئەمین زەکی باسی کردووە وتوویەتی :

(( دەورو بەری شاخی (جودی) لە لایەن نووسەرە بەناوبانگەکانەوە بەناوی (CORDUENE– کوردوئین)ەوە هاتووە، کە ڕەنگە هۆی دەسکاری کردن و گۆڕینی ووشەکە ئەوە بێت لە زمانی (سامی)یەکانا پیتی (گ) بەکار نەهێنراوە هەروەکوو درایڤەر بۆی چوەو باسی کردووە)).

هەروەها لە زمانی (ئارامی)دا ئەم ولاتە بەناوچەی (کاردو) ناوبراوەو لەلای نووسەرە عەرەب و ئیسلامەکان، هەروەکوو (بلاذری)و(طبری) بەناوی (بقردی Bakarde) ناوبراوەو (یاقوت الحموی) لە (أبن الأثیر)ەوە وەری گرتووە کە وتوویەتی ولاتی (بقردا) بەشێك بووە لە ولاتی (جزیرة أبن عمر) کە بریتی بووەلە (٢٠٠) شاروگوند وەکوو شارەکانی (ثمانین، جودی، فیروز، شاپور) کە کەوتبوونە لای چەپی ڕوباری دجلە کە بەوبەریانەوە (Bazabda) بووە.

بە پێی نووسینی عەرەب و ئەرمەنەکان، سنووری ولاتی (کاردۆ) تەسك بووەو بەربلاونەبووە.

مینۆرسکی ئەڵێ: لە ڕاستیدا سنووری ولاتی (کاردو)مان بۆ ڕون نەبۆتەوە تا بزانین هەتا کوێ دەگرێتەوە، تەنها شارەزایی دەربارەی سێ شاری کەناری دجلە بە دەستەوەیە کە بریتین لە (سترابو، ستالکا، پیناکا)، کە ئەمەی دوایی شاری (فینیك)ی ئێستە دەگرێتەوە.

ئەو ڕاپۆرتە بەنرخەی لەلایەن (سترابو)ی ڕۆژهەلاتناسەوە تۆمارکراوە دەری دەخا ووشەی (کوردوا) بۆ ماوەیەك بەو چیایانە وتراوە کە کەوتونەتە نێوان دیاربکرو مووشی ئێستەوە. هەرچۆنێك بێت، ئەوەی گومانی تێدانیە بریتیە لەوەی (کاردخۆی) هەبووە، ئەگەرچی هەندێجار ناوەکان بەشێوەیەکی تر هاتووەو لەوەش دەچێ ووشەی (خۆی)لە جیاتی (Kh– خ) بەکارهێنراوە کە نیشانەی (کۆمەڵ – مجتمع) دەگرێتەوە لە زمانی ئەرمەنیدا وەکوو چۆن بوتـەوە لە کوردیدا (کان) بەکاردەهێنرێ بۆ کۆمەڵ. بەوجۆرە زانایانی یۆنانیو ئەرمەن بەهۆی کتێبە ئەرمەنیەکانەوە ئەو ناوەیان دەسگیربووە کە شێوە ئەرمەنیەکە لە وەرگرتنەکەیانا زاڵ بووە.

(زینفون) لای وابووه کە شەعبی (کاردشو – کاردکو) لەژێر دەسـتەلآتی هیـچ لایەکدا نەبووە، نـە هـی (ئەرتاکسـێرس _ ئەردشـێر)ەکـان و نـە هـی حکومـەتی ئەرمەنی. ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەڕە/ ٤١دا بۆ ڕوون کردنەوەی (ئەکسێرس) وتوویەتی:

لەسەدەی یەکەمی پێش زایندا (دیکرانی دوهەم) ولآتـی (کوردوئـین)ی داگـیر کـردو پاشاکەیانی کوشـت کــە نــاوی (زابیونــوس) بــووەو لەســالّی (١١٥/ن)دا پاشایەکی تریشـی کوشـتوە کـە نـاوی (مانیسـاروس) بـووە،بـەلآم (هابشـمان)ی ڕۆژهەلآتناس وتوویەتی دلگیرکردنی ولآتی کوردوئین لەلایەن ئەرمەنیەکانەوە هەر بەناو بووە، چونکە هەرخۆیان دەسەلآتداربوون.

مینۆرسکی لەباسەکەیدا لەسەری ئەڕواو ئەلّێ:

((دوورنیە لــەکاتی (زینفـون)دا لـە بـاکووری دجلـەدا عەشـیرەتێك نیشـتەجێ بوویێت، بەلآم ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ( کوردو)ش لەو عەشیرەتە نەبوویێت)).

ووشـەی (کـاردو) لـە زمـانی سـامیەکانا کــە ئاشـوریو کلدانــیو عــەرەبـو فینیقیو قرطاجە دەگرێتەوە مانای بەهێزو بە توانا بووە، بــەلآم بـەهۆی ئـەوەی ووشـەی (Khalai– خـالدی) لـە کلدانـی دەچێـت ئیـتر هـەردوکیان هـەر یـەکێك بــوونو ئــەو خالیدیانــە لــە زەمــانی ئاشــوریەکانا بــە (ئۆرارتــو) وەیــا بــە (URSHTU–ئەرشتو) ناوبراوە کە لەدەورووبەری چیـای (ئـارارات)دا نیشـتەجێ بوون.لە کۆتایی سەدەی نۆهەمی زاینـدا گـەلی (خلـدی) لـە ئەرمـەنیادا هـەبووەو حکومـەتێکی بـەهێزیان بۆخۆیـان دروســت کردبــوو هــەتا ســەرەتای ســەدەی شەشەمی پێش زایین لە دەورووبەری گۆلی (وان)دا ژیابوون.

(مینۆرسـکی ئامـاژەی بـۆ باسـێکی (لهـان هویـت)ی زانـا کـردووە کـە لـە کتێبەکـەیدا (کۆتنگنـن) کـە لـە سـالّی ١٩٠٧یزاینیـدا کۆچـی دوایـی کـردووەو وتوویەتی گەلی (خالدی) هەندێ بێگانەشی تێکەڵ بووە)، (مـار)ی زانـاو شـارەزا لای وایە شوێنی نیشتەجێ بوونـی (خـالدی) بـەزۆری لـە دەوروبـەری (ئـاراکس–ئاراس)ی ناوەڕاستدا بووەو مـار بۆئـەوەی بەتـەواوەتی بگاتـە بنجوبنـاوانی ئـەو بۆچوونەی، دەستی کردووە بەپشـکنینو لێکۆلّینـەوە. وەکـوو لـە لاپـەڕە /٤٢ی

کتێبەکەی ئەمین زەکیدا باسی مینۆرسکی کردووەکە دەربارەی ئەرمەنیەکان وتوویەتی :

((لەدوای ئەوەی ئەرمەنیەکان کوردستانیان داگیر کرد، لەدەورو بەری سەدەی حەوتەمی پێش زایندا خالیدیەکان ناوچەکەی خۆیان بەجێهێشت‌و رویانکردە ناوچە شاخاویەکانی دەوروپشتیان)).

دەربارەی ئەو بۆچوونەی مینۆرسکی، ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەرە ٤٢ دا ئاماژە بۆ کتێبی (مفصل تاریخ عمومی) نووسینی ئەحمەد رەفیق بەگ کردووە کە وتوویەتی خالدیەکان هەر لە شوێنی خۆیان مابوونەوە بەلام تێکەڵ بە ئەرمەنیەکان بوبوون‌و لەناویانا تواببوونەوە.

مینۆرسکی لە باسەکەیدا لەسەری رۆیشتوەو وتوویەتی :

((خالدیەکان لە ناوچەی (وان)دا زۆر بەناوبانگ بوون‌و لەشاری (خلات) کە لە باکووری گۆلی (وان)دایە گەلێك شوێنەواری ئەو میللەتە بەجێماوە)).

ئەمین زەکی لە لاپەرە ٤٢ی کتێبەکەیدا، دەربارەی ئەو بۆچوونەی مینۆرسکی، ئاماژەی بۆ دائیرەی معارفی ئیسلامی کردووە کە باسی (خلات)ی تیادا کراوە بەهەڵە کە تیایدا وتراوە ئەوشارە نزیك بە شاری (ترابزون)بووە احمد رفیق بگ لە کتێبەکەیدا (مفصل تاریخ عمومی) لە باسی حکومەتی خلدیەکاندا وتوویەتی:

(( زمانی خلدیەکان وەکوو زمانی گورجی وابووە وەیا وەکوو زمانی (اللاظ)ی ئێستە وابووە کە زمانەکەیان هیچ جۆرە پەیوەندیەکی بە زمانی سامیەکانەوە نەبووە کە شاری (طوشپا - وان ) پایتەختی حکومەتەکەیان بووەو لە ساڵی ٧٤٢ ی پێش زایندا (تیگلات بلسری دوهەم)ی مەلیکی ئاشوور پەلاماری ئەم وڵاتەی داوەو گەیشتونە (طوشپا - یورسیبا - تورشیا)ی پایتەختەکەیان، بەلام ئەم میللەتە زۆر پەرۆشی سەربەستی‌و سەربەخۆیی خۆیان بوون‌و وڵاتەکەی خۆیان ئازایانە پاراستوە هەتا ئەو کاتەی دەوڵەتی (میدیا)پەیدا بووە، ئەوسا تێکەڵ بە میدیەکان بوون‌و حکومەتەکەیان لەناو چوە)).

مینۆرسکی دەربارەی (کاردو) وتوویەتی :

((کاردو سامی بوویێ یا سامی نەبوویێ، ئەوەی گومانی تیادا نیە ئەوەیە (کاردشو)ی ولاتی کۆنیان شوێنی دێرینی کوردی ئێستە بووەو ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ووشەی (کوردشوی)و (کوردی) هەردوکیان لەیەك دەچنو لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە دان بەمەدا نراوە. ئەگەر بەووردی بچینە بنجوبناوانی (کورد)ەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە میللەتی کورد لەگەڵ (خلدی)یەکانا هەر لەیەك ڕەگەزو بنچینە بوونو لەم ڕووەوە (Reiske – ڕایسکە)ی ڕۆژهەلاتناس لەکاتی لێکۆڵینەوەی کتێبەکەی (قسطنطین بورفیر جنیتوس)دا وتوویەتی : ووشەکانی خلدی، کوردی، کرد–ئەمانە هەموویان لەگەڵ ووشەی (کوردیای)دا یەك دەگرنەوەو هەموویان یەك مانا دەگەیەنن)).

ئەمین زەکی لە لاپەڕە ٤٤ی مێژووی کوردو کوردستاندا باسی ئەوەی کردووە کە مینۆرسکی ئاماژەی بۆ کتێبی (جوگرافیایەکی ئەرمەنی کردووە کە لە سەدەی حەوتەمدا نوسراوە تیایدا وتراوە: لەزەمانی (فوستیوس – بینرانتوس) لە سەدەی چوارەمدا ووشەی (کورد چینچ) ناوی قەزایەك بووە لە تەنیشت (سەلماس)و لە دواییدا پەرەی سەندوەو لە ناوچەی جۆڵەمێرگەوە گەیشتۆتە جزیرەی أبن عمر کە بریتی بووە لە قەزاکانی (کوردوخ ، سیکوردویخ _کوردیخ ، ئایتوانخ ، ئیکارخ ، مۆولوخ _ئوئولانخ ، ئورسیروخ _ ئورسیانخ ، کاراشونیخ _ سارا یونیخ ، چاهوك، ئەلبابی بچووك، هارشان، هویشمان).

مینۆرسکی لە کۆتایی باسەکەیدا هەروەکوو ئەمین زەکی باسی کردووە وتوویەتی : ئەوەی لە نووسراوە ئیسلامیەکانو چیرۆکە کوردیەکانا دەربارەی کورد نووسراون شتێك نین پشتیان پێ ببەسرێتو یەکێکی وەکوو (مسعودی) لە کتێبەکەیدا باسی ضحاك (ئەژدەهاك)ی هەریەو جۆرە کردووە کە فردوسی شانامەدا باسی کردووە.

تا ئێرە بریتی بوو لەو باسەی مینۆرسکی کە ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا باسی کردووەو بەرلەوەی بچێتە سەر باسەکەی (سێر سدنی سمیث) کە ئەمین زەکی باسی کردووە، باسێکی تری مینۆرسکی دەخەینە پێش چاو کە دوکتۆر کمال مەزهەر لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە١ی ساڵی ١٩٧٣وەرگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی، لەوەدا مینۆرسکی وتوویەتی :

((بەشی باکووری ڕۆژئاوای بەرزاییەکانی ئێران پێی وتراوە (Media میدیا)و سەرچاوە ئەرکیۆلۆجیو بزماریەکان باسی ئەو سەردەمەیان کردووە کە لەو ناوچەیەدا چەند دەوڵەتێکی بچووکو چەند عەشیرەتێکی ناوچەیی هەبووە کە لەناو ئەواندا توابوونەوە کەتازە هاتبوونو بە ئێرانیەکان ناسراوبوون)) (دوکتۆر کمال لە پەراوێزی لاپەڕە ٥٥ی گۆڤارەکەدا وتوویەتی : مەبەستی مینۆرسکی بریتی بووە لە میللەتە کۆنەکانی زاگرۆس وەکوو لۆلۆ، گۆتی، کاسایو هیتر).

وەکوو لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا ووتراوە، مینۆرسکی خۆشی بۆ ڕوونکردنەوەی باسەکەی ئاماژەی بۆ تازەترین کتێب کردووە کە لە(میدیا) کۆڵیوەتەوە کە بریتیە لە کتێبەکەی (م. دیاکۆنۆف) چاپی مۆسکۆ ساڵی ١٩٦٦و (علییێف)یش لە باکۆ لەساڵی ١٩٥٦دا ئەو کتێبەی پەسەند کردووە.

دوکتۆر کمال لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا بۆ زۆرتر ڕوونکردنەوەی ئەوەی مینۆرسکی وتوویەتی :

١ ـ (م.دیاکۆنۆف) لە لاپەڕەی /٤٨٥ی کتێبەکەیدا کە مینۆرسکی ئاماژەی بۆ کردووە وتوویەتی :

دیاکۆنۆف لە کتێبەکەیدا (مێژووی میدیا لە سەدە کۆنەکانەوە هەتا کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زایین) بۆ گەیشتن بە مەبەست تەقەلای داوە لە ڕێگەی سەرچاوە کۆنە ڕەسەنەکانو ئاوێستاوە بگاتە ڕەگو ڕیشەی میدیاو شوێنەوارە کۆنەکانی و هەوڵی داوە بزانێ مێژوونووسەکان لەو ڕووەوە چیان دەربارەی ئەوە بۆ ڕوون بۆتەوە.

٢ ـ دەربارەی ئەو پەسەندکردنەی (علییێف) لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا لە ساڵی ١٩٥٦لە مۆسکۆ چاپی کردووە، بایەخێکی زۆری داوە بە شارستانێتی میدیاییەکان لەگەڵ بڵاوکردنەوەی لوحەی ئەسەری دەربارەی مێژووی میدیا.

مینۆرسکی لە باسەکەیدا باسی دوو تاقم عەشایری کردووە کە بریتی بوون لە (Media) و (Parsa وەیاParsua – فارس)و وتوویەتی بۆ یەکەم جار سەرچاوە ئاشوریەکان لە ساڵی ٨٤٤ی پێش زایندا ناوی (Parsua)یان هێناوەو لە ساڵی ٨٣٦ی پێش زایندا ناوی (میدیا)یان بردوە کە لەناوچەکانی باشووری دەریاچەی (ورمیە)دا بوون کە بریتییە لە (موکریان)ی ئیمڕۆ.

مینۆرسکی لە باسەکەیدا وتوویەتی : ژمارەیەکی زۆر کەم لە ووشەکانی میدیامان لەبەردەستدایە، بەلأم بەپێی ناوی شارەکانیان‌و بەپێی سەرجەمی مێژوەکەیان دەردەکەوێت میدیاو فارس ئەگەر هەردوکیان برای یەکتر نەبووبن ئەوا ئامۆزای یەکتر بوون. (لە شوێنی خۆیدا ئەگەر چوینە سەرباسی ئاوێستا بەپێی سەرچاوە/٩٧ناوی هۆزەکان‌و پادشاکانی میدیا باس دەکرێت).

مینۆرسکی لەو باسەیدا کە دوکتۆر کمال مەزهەر لە لاپەڕە/٥٥٦ی گۆڤاری کۆڕی زانیاری لێی‌دواوە وتوویەتی :

((زۆری پێ‌نەچوو، ووشەی (Parsua) لەناوچەی خوارووی ورمیەدا نەماو لەوەدەچێ پاشاکان بەرەو باشوور کشابن کە لە ناوچە تازەکەیانا بە (Parsa) ناسران‌و ناوچەی فارس بوو بە بنکەی سەرەکی‌یان، بەلأم بە پێچەوانەی ئەمان (میدیا)ییەکان هەر لە باکووری رۆژئاوادا مانەوەو توانیبویان ئەو دەوڵەتە بچوکانەی لەوناوەدا بوون هەموویان بخەنە ژێر دەسەلأتی خۆیانەوەو بەسەر (سکیف)ی یەکانا زاڵبوون.

(دوکتۆر کمال مەزهەر لە پەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا وتوویەتی سکیفەکان لەنێوان سەدەی حەوتەمی پێش زاین هەتا سەدەی سێ‌هەمی پێش زاین لە کەناری باکووری دەریای ڕەشدا بوون‌و شێوە زمانەکەیان بریتی بووە لە شێوەزمانی هندوئوروپی‌و لە سالأنی حەفتاکانی سەدەی حەوتەمی پێش زایندا توانیبویان بچنە ناو خاکی ئاسیای بچووکەوەو میدیاو ناوچەکانی ڕۆژهەلأتی دەریای سپی ناوەڕاستیان داگیر کردبوو، بەلأم لە سەرەتای سەدەی شەشەمی زایندا (میدیا)یەکان ئەو (سکیف)یانەیان دەرکردبوو و ناچاریان کردبوون بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنانەی لێیەوە هاتبوون).

مینۆرسکی لە باسەکەیدا وتوویەتی ((وا دەردەکەوێ میدیاییەکان توانیبویان دەوڵەتی (ئورارتو) کە لەناوچەی واندا بوون لەناویان ببەن)). دوکتۆر کمال لە پەراوێزی لاپەڕە/٥٥٦دا دەربارەی ئورارتو وتوویەتی : ئەمانە لە دەوڵەتە هەرەکۆنەکانی رۆژهەلأتی نزیك بوون کە لە سەردەمی سەدەی نۆهەمی پێش زایینەوە هەتا سەدەی شەشەمی پێش زایین کە بەرزاییەکانی ئەرمەنیاو

ناوچەکانی دەورویەریان لەژێر دەستا بووە، بەڵام نزیکی ساڵی ٩٥٠/ی پێش زایین میدیاییەکان ئەو دەوڵەتەیان لەناو بردوە.

مینۆرسکی لەوباسەیدا وتوویەتی : گەورەترین سەرکەوتنێك کە میدیەکان وەدەستیان هێنابوو بریتی بووە لەو سەرکەتنەیان بەسەر دەوڵەتی (ئاشوری)داو ملك (کیاخسار)ی میدی توانیبووی لە ساڵی ٦١٢/ی پێش زایین نینوی پایتەختی ئاشوری داگیر بکاتو بگاتە ناوجەرگەی ئاسیای بچوکەوەو پاش ئەوەی کیاخسار (UKSITAR,Huvaxsatara) لەساڵانی ٥٩٠ — ٥٨٥ پێش زایین دژی شای (لیدی) شەڕی کردووەو پاش ئەوە ئیتر سنوری میدیا لە ڕۆژئاوادا گەیشتبووە ئەو ڕوبارەی ئیمرۆ پێی دەوترێ (قزل ئیرمق) کە پەنجا کیلۆمەتر دوورە لە شاری ئەنقەرەی پایتەختی ئیمرۆی تورکیا.

(دوکتۆر کمال لە پەراوێزی لاپەڕە/٥٥٧ی گۆڤاری کۆری زانیاریدا دەربارەی (کیاخسار) وتوویەتی :

ئەوناوە بە فارسی کۆن پێی وتراوە (فاخشاترا) کە یەکێك بووە لە شا گەورەکانی میدیا کە لەنێوان ساڵانی ٦٢٥ — ٦٢٤ی پێش زایین هەتاکو ساڵی ٥٨٤ی پێش زایین حوکمی کردووەو یەکەم پادشای میدی بووە توانیبوی هێزی پرش‌وبڵاوی عەشایرەکان کۆبکاتەوەو ڕێکیان بخاتو لە شێوەی هێزێکی سوپایی ڕێکخراودا یەکیان بخات کە ئەم ڕێكو پێکییەی بووە بەهۆی سەرکەوتنەکانی.

هەروەها دوکتۆر کمال لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا دەربارەی (لیدیا) وتوویەتی: یەکێك بووە لە دەوڵەتە کۆنەکانی ڕۆژئاوای ئاسیای کۆنو لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زایندا دەوڵەتێکی سەربەخۆو بەهێز بووەو لەو شەڕەی لە ساڵی ٥٨٥/ی پێش زایندا لەنێوان لیدیاو میدیادا ڕوویدابوو ڕێکەوتنێك لە بەینی هەردوکیانا کراوە کە بەپێی ئەو ڕێکەوتنە لیدیاییەکان ناچاربوون ڕوباری (گالیس) بەسنوری ڕۆژئاوای میدیا قبوڵ بکەنو بەوجۆرە دەستەڵاتی میدیا بەرەو خۆرئاوا پەرەی سەندو یەکەم کەس بوون لە ئێراندا یەکەم دەوڵەتیان دامەزراندبێت.

مینۆرسکی لەسەر باسەکەی ڕۆیشتوەو وتوویەتی :

((دەوڵەتی میدیا نزیکی (١٧٥) ساڵ ژیاوە (دوکتۆرکمال لە پەراوێزی لاپەرە ٥٥٧/دا وتوویەتی سەرچاوە کۆنەکانی ئاشوری وایان پێشانداوە کە حکومەتی میدیا لە حەفتاکانی سەدەی حەوتەمی پ.زدا پێك هاتووەو لە ساڵی٥٥٠ –٥٤٩ی پێش زایین بەشێك بووە لەو شوێنانەی کەوتبوونە ژێر دەستەڵاتی ئەخمینییەکانەوە).

مینۆرسکی دەربارەی لابردنی دوا پادشای میدیەکان وتوویەتی :

((کۆرش)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی فارس کە یۆنانییەکان بە (کیورس)و روسەکان بە (کیر)ناویان بردوە لە دەوروبەری ساڵی ٥٥٠پێش زایین دوا پادشای میدیەکانی لابردوە کە ناوی (ئیشتیاگ ــ ئیشتوفیگو ــ istu vegu) بوو.

یەکێك لەو بەڵگانەی دەری خستوە (میدیا)ییەکان و (فارس) خزمێکی نزیك بوون ئەوەیە بەوجۆرە دەستەڵات لە میدییەکانەوە کەوتە دەست فارس، بەڵام میدیەکان زۆرجار دژی فارسەکان راپەریون وەکوو ئەو راپەرینەی لە زەمانی (دارا Darya vahus)دا رویدا بوو، پاش سەرنەکەوتنیان لە راپەرینەکەدا ناچاربوون بەرەو رۆژئاوا کۆچیان کردبوو)). مینۆرسکی لە لاپەرە ٥٥٨ی ئەو سەرچاوەیەدا لەسەر مێژووی میدیەکان رۆیشتوەو وتوویەتی :

((لە گێژاوی هێرشی ئەسکەندەری مەکدونی بۆسەر ئێران لەنێوان ساڵانی (٣٣١ ـــ ٣٢٣ پ.ز)دا ساتێك (ئەتروپات)ی سەرکردەی هێزی دارای سێهەم دەوڵەتێکی تازەی پێکەوەنا بەناوی (میدیای بچووك) لەناوچەکانی باشووری ئازربایجانی ئێستەدا کە پێی دەوترا (ئوتورپاتکان ـــ Autur patakan)، ئیتر زۆریەی عەشیرەتەکانی میدیا چوونە پاڵ ئەو دەوڵەتە.

لە زەمانی (ئەرشاك)یەکانا (٢٤٨ –٢٢٦)پ.ز، لە ئازربایجانی خوارووی چەند عەشیرەتێکی تازەی ئێرانی لە رۆژهەڵاتەوە رووپانکردە ئەوێ کە بریتی بوون لە عەشایری (پاهلاڤ – Pahlav)و (پارتاڤا – Partava).

مینۆرسکی لە باسی زمانی کوردیدا وتوویەتی :

((ئەوەی زۆر جێگەی سەرسورمانە ئەوەیە کورد لەزەمانی کۆندا یەك بوون و لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازیەی لە شێوەکانی زمانی کوردیدا هەیە، بەڵام

هەمووشیان لەڕووی (فونتیکا)و دەستوورەوە یەك دەگرنەوە هەتا ڕادەیەکیش جیاوازن لە زمانی فارسی)).

مینۆرسکی پرسیویەتی ئایا هۆی ئەم یەك گرتنەی زمانی کوردی چییە لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان پرش‌وبڵاون لەناو چیاکانی کوردستاندا؟ مینۆرسکی خۆی جوابی ئەو پرسیارەی داوەتەوەو وتوویەتی:

((بەراستی پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی وورد هەیەو ئەبێ هەموو ووشەو ناوەکانی میدیا بەراورد بکرێنەوە لەگەڵ زمانی کوردیی ئیمڕۆدا هەرچەند هەتا ئێستە ئەم کارە بەئەنجام نەگەیشتوە، بەلآم کە لەمێژووی ئەو عەشایرە کۆچکردوانەی ئێران دەکۆڵمەوە کە بەرەو ڕۆژئاوا کۆچیان کردووە، ئەوەم بۆ ڕون دەبێتەوە لە غەیری (میدی)یەکان بەولاوە هیچ عەشیرەتێکی وا نەبووە بە کۆچ‌و ڕەو گەیشتبنە ناوچەی باشووری ئەنقەرەو بۆ باکووری (سوریا) کە بۆ ئەوە دەتوانرێ پەنا ببرێتە بەر ئەو نەخشەیەی (مارك سایکس)ی گەڕیدەی ئینگلیز بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی بۆ چەند ساڵێك بە کوردستاندا گەڕاوە (مارك سایکس ئەو گەشتەی لە ساڵی ۱۹۰۸دا کردووەو لە کوردستاندا نزیکی ۷۵۰۰میلی بڕیوە باسی گەشتەکەی کردووەو نەخشەیەکیشی کێشاوە).

مینۆرسکی وتوویەتی : ((لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە ناوی کوردی کۆن بەتەولوەتی لەناوی (میدیا) دەچێت)).

لەو ڕووەوە (مایسای خورینسکی) لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (کتێبی یەکەم/فەسڵی/۲۰)هەوڵی داوە ئەفسانەکانی ئەرمەنی ببەستێتەوە بەیەکەوەو بە پێی ئەو بۆچوونەی ئەو (تیگرانی – ڕەنگە دیکران بێ) مەلیکی ئەرمەنیای بەهاوکاری (کورووش)داناوە لەکاتی سەرکەوتنی کورووش بەسەر میدیاییەکانداو تیگرانی مەلیکی ئەرمەنی لە دوای ئەو سەرکەوتنە، ژنەکەی مەلیکی میدیا کە خوشکی خۆی بووە (هی تیگرانی ئەرمەنی) کە ناوی خوشکەکەی (ئانوس)بووە لەگەڵ دەهەزار کەسی (مار – کە مەبەستی میدیا بوو وەکوو سەرچاوەی ئەرمەنیەکان باسیانکردووە) هەموویانی بەدیل گرتووەو لە هەردوو کەناری ڕوباری (ئاراکس – ئاراس) نیشتەجێی کردوون)).

مینۆرسکی له باسه‌که‌یدا ئاماژه‌ی بۆ (مایسای خورینسکی) ئه‌رمه‌نی کردووه که به باوکی مێژوو نووسانی ئه‌رمه‌نی ناوده‌برێت، که به دوورو درێژ باسی ئه‌و ناوچه‌یه‌ی کردووه که ئه‌و به‌دیل گیراوانه‌ی تیگران به‌دیلی گرتبوون‌و نیشته‌جێی کردبوون که که‌وتبووه به‌شی رۆژهه‌ڵاتی چیای (ئارارات)که به‌شاخی گه‌وره ناوی بردوه هه‌تا ناوچه‌ی (نه‌خچه‌وان)و (جلفه)و وادیاره گه‌یشتبووه (ئۆردەباد)یش.

مایسای خورینسکی له کتێبه‌که‌یدا باسی ئه‌و گۆرانی‌یه مێژووییانه‌ی کردووه‌و باسی چۆنێتی دروستکردنی شاری (ماراکیرت)ی ناوچه‌ی (شارور)ی (مار – میدیا)یه‌کانی کردووه که له لایه‌ن (ئرتوان)ی کوڕی (ئه‌رده‌شیر)ه‌وه دروستکراوه.

له‌وباس‌و بۆچوونه‌ی (مایسای خورینسکی) گه‌لێك شتی گرنگ روون ده‌بێته‌وه، وه‌کوو:–

یه‌که‌م _ ده‌سنیشانکردنی جوگرافیایی زۆر وورد.

دووه‌م – ناوبردنی نیشته‌جێ بووه تازه‌کان به‌ناوی (مار)و به‌ستنی کۆچ‌و ڕه‌وه‌که‌یان به رووخاندنی (مار)ه‌وه که له لایه‌ن فارسه‌کانه‌وه لابرابوو.

مینۆرسکی له‌باسه‌که‌یدا وتوویه‌تی : ئه‌وه‌ی وای له‌(مایسای خورینسکی) کردبوو که ناوی مه‌لیکی ئه‌رمه‌نیا تێهه‌ڵکێشی باسه‌که‌ی بکات بریتی‌بووه له هه‌ستێکی نه‌ته‌وایه‌تی (مه‌به‌ست هی ئه‌رمه‌نی). بێجگه له‌وه (مایسای) ده‌سکاری شتێکی تریشی کردووه به‌وه‌ی ناوی مه‌لیکی (میدیا)ی له‌لای ئه‌غریقیه‌کانی به‌(ئیشتیاگ – ئیستوڤیکو) ناو بردوه‌و کردویه‌تی به ناوێك له‌وناوه ئه‌فسانه‌یه ده‌چێت که له (شانامه)دا به‌ناوی (ئه‌ژده‌هاك)ه‌وه ناوی هاتووه (دوکتۆر کمال له په‌راوێزی لاپه‌ڕه / ٥٦١دا بۆ ڕوونکردنه‌وه‌ی مه‌به‌ستی مینۆرسکی وتوویه‌تی (مایسای خورینسکی) به‌شداری کردووه بۆ له‌ناو بردنی ده‌وڵه‌تی (میدیا).

مینۆرسکی ده‌رباره‌ی ئه‌و بۆچوونه‌ی مایسای خورینسکی وتوویه‌تی: ئه‌وه‌ی ئه‌و تۆماری کردووه له‌و ڕۆژانه‌دا بووه ماوه‌یه‌کی زۆر به‌سه‌ر نه‌مانی ده‌وڵه‌تی میدیادا تێپه‌ڕی کردبوو، مه‌به‌ستی له‌مه‌دا ئه‌وه بووه تیرێکیش بگرێته ئه‌و کوردانه‌ی له زه‌مانی خۆیدا ژیابوون‌و تۆیان بگه‌یه‌نێت کورد له نه‌وه‌ی ئه‌و میدیایه بوون که له‌لایه‌ن ئه‌رمه‌نیه‌وه شکێنرابوون.

ئەو زانیاریە جوگرافیەی مایسای خورینسکی دەستی کەوتبوو بەتەواوی لەگەڵ زانیاریەکانی تردا یەك دەگرێتەوە کە هەندێ سەرچاوەی عەرەبی‌یەکان ئامارەیان بۆ کردووەو وتوویانە گەلێك لە بنکەی نیشتەجێبوانی کورد لە باکووری (ئاراکس – ئاراس)دا هەبوون و گرنگترین و راستترین باسێك کە لە سەرچاوە عەرەبیەکانا تۆمارکراوە بریتیە لە گوندی (ئەجدنقان) کە ڕەنگە (ئەجدهقان) بوو بێت لەبەر دەرگای شاری (دڤین)دا کە(مایسای خورینسکی)ش هەرباسی کردووە. (دوکتۆر کمال مەزهەر لە پەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا وتوویەتی شاری (دڤین)شارێکی بازرگانی کۆن بووە لە باشووری شاری (یریڤان)دا کە مغولەکان لە سەرەتای سەدەی سیازدەدا کاولیان کردبوو).

مینۆرسکی لە باسی شاری (دڤین)دا وتوویەتی شاری لەدایك بوونی صلاح الدین ئەیوبی نەیاری خاچ هەڵگرەکان بووە کە بناغەی بنەماڵەی ئەیوبی (١١٦٩ – ١٢٥٠)ی دامەزراندوە. (دوکتۆر کمال لە پەراوێزی لاپەڕەکەدا وتوویەتی لە ئازربایجانی باکووردا ناوچەی (دوین) مەڵبەندی عەشیرەتی (راودی) کورد بووە کە صلاح الدین لەو عەشیرەتە بووە).

مینۆرسکی لە باسەکەیدا لەسەری ڕۆیشتوەو وتوویەتی :

((ئەتوانم شتێکی تریش بڵێم دەربارەی ڕۆژئاوای ناوچەی (ماکو) لە ئێراندا کە بەتەواوەتی ناوچەی (دامیات) دەگرێتەوە کە هەتا ئێستەش دانیشتوانەکەی هەر کوردن. ئەگەر ناوی (Meda)ی کۆن وەکوو ئەرمەنیەکان بە (مار) ناویان بردوە، لە زمانی فارسیشدا بە (Mah) ناوی هاتووە کە ئەتوانرێ بوترێ شێوەی ناوی کۆنی (ماکو) کە بە (Mohkuh – ماەکوە) ناوی هاتووە، ئەمەشیان هەر بەڵگەیەکی‌ترە بۆ بوونی پەیوەندی کوردو مادەکان)).

مینۆرسکی لە کۆتایی ئەو باسەیدا پوختەی بۆچوونەکەی خۆی دەربارەی کوردو ماد بەم جۆرە باس کردووەو وتوویەتی:

((من (مینۆرسکی) بە پێی بۆچوونی سەرچاوەکان لاموایە بۆمان روون دەبێتەوە ئایا ئەگەر کورد لە نەوەی (ماد) نەبێت، ئەی ئاخۆ ئەو مادە کۆنە دەستەلاتدارو بەهێزەی ئەو ڕۆژانە چی‌بەسەرهات و ئەو هەموو عەشایرە کوردە تێرو بەرپلاوەی کورد لە کوێوە هەڵقولاون کە زمانەکەیان لە بنەڕەتدا هەمووی

یەك دەگرێتەوەو جیاوازییەكی تەواو ئاشكرا هەیە لە نێوان زمانی كوردو زمانی ئێرانیەكانی تردا؟)).

لەدوای تەواو بوونی ئەو دوو باسە گرنگەی مینۆرسكی، كە بە ئاشكراو بەپێی گەلێك بەڵگەی ناو سەرچاوەكان ڕوونی كردۆتەوە، نەتەوەی كورد ئیمڕۆ هەر لە (ماد)ە كانەوە كە سەرچاوەی ئەرمەنیەكان بە (مار) ناویان بردوەو وەكوو مینۆرسكی باسی كردووە ئەگەر كورد بریتی نەبێ لە مادی جاران ئەی ئاخۆ ماد چی بەسەر هاتووەو ئەم هەموو ژمارە زۆرەی كوردی ئیمڕۆ كە ژمارەی دەگاتە (٣٠)ملیۆن لە كوێوە پەیدا بووەو كە ئەم بۆچوونەی مینۆرسكی لەگەڵ ئەو بۆچوونە ناشیانەو بێ بەڵگانەی دوكتۆر مكنزیو ئەدمۆنسی مامۆستایدا یەك ناگرێتەوە كە وتوویانە كوردەكان ماد نین!! ئەی ئاخۆ ماد چی بەسەر هاتووە تۆ بڵێی هەروەكوو بڵقی سەر ئاو لە خۆیەوە پووكابێتەوەو ئەم هەموو كوردەی ئیمڕۆش لە خاكی كوردستاندا وەكوو قارچكو دومەڵان هەڵتۆقیبن؟؟... تۆ بڵێی مكنزیو ئەدمۆنس كە بۆ مەبەستێكی سیاسی حكومەتی بەریتانیا هەمیشە دژی بوونی حكومەتێكی كورد بووە ئەو دوانەو هاوبیرەكانیان خۆیان بە شارەزاترو پسپۆڕتر ژماردبێت لەچاو ئەو هەموو زانایانەی بە مەبەستێكی زانیاریانە چونەتە بنجوبناوانی نەتەوەی كورد؟

لەدوای ئەو دوو باسە تێرو تەسەلەی مینۆرسكی دەچینە سەر باسی زانایەكی تر (سێر سدنی سمیث) كە ئەمین زەكی لە مێژووی كوردو كوردستاندا بە دوورو درێژی لێی دواوەو لە پەراوێزی لاپەڕە /٤٩دا وتوویەتی ئەو باسەی سێر سدنی سمیث لەسەر تكای ئەو (ئەمین زەكی) ئامادەی كردووە لە ژێر ناوی (لەكوردستاندا)و بەتایبەتی بۆ ئەمین زەكی ناردوە كە ئەمەی خوارەوە پوختەی ئەو باسە ئامادەكراوەی سدنی سمیثە كە وتوویەتی :

((ئەوەی تا ئێستە دەربارەی كوردستان دەسگیر بووە كەمو كوڕییەكی زۆری تیادایەو بەشی ئەوە ناكا لەسەری بڕیین، بەڵام ئەوەی ڕوون بۆتەوە ئەوەیە لە زەمانی كۆندا (ناتوانم بڵێم كەی بووە) لە ناوچەیەكدا كە باكوورەكەی بریتی بووە لە ناوچەی (وان)و ڕۆژئاوای (دۆڵی خاپوور)و كركوكو خوارووەكەی بابل، ئەو ناوچانە لەژێر دەستەڵاتی میللەتێكدا بوون ناوی (شوباری) بووە كە

هەندێجار (سومەر)ی یەکان هەمووی یان هەندێ بەشی ئەو ناوچەیەیان داگیر کردووە کە زمانی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە هیچ پەیوەندیەکیان بە زمانەکانی (سامی)و (هندوئۆروپی) یەوە نەبووەو زاناکانی ئەم سەردەمە لایان وایە زمانی (شوباری) یەکان یەکێك بووە لە زمانە (قفقاسی)یەکان.

لە ساڵی ۲۵۰/ی پێش زایندا، ئاشوریەکان کە سامی بوون ئەگەرچی ناشتوانرێ بوترێ لە هەموو روویەکەوە سامیی تەواو بوون، ئەمانە لە ناوچەکانی (شوباری)دا نیشتەجێبوون کە قەلأی (شرقاط)ی ئێستە دەگرێتەوە.

لە دەوروبەری ساڵی (۲٥۲٥/ی پێش زایین) هەموو کوردستان بەشێك بووە لەو مەملەکەتەی (سرجون)ی مەلیکی (ئاکاد)و (نارامسین)ی دوای ئەو، وەلە خولی سیّهەمی حکومەتی (ئور)دا لەنێوان ساڵانی۲۳۰۰ – ۲۱٥۰پێش زایین، گەلێك هێرش کراوەتە سەر هەندێ لە بەشە بچوکەکانی کوردستان، لەوناوچانەی کەوتبوونە رۆژ هەڵاتی روباری دجلە وەکوو ناوچەی (سیمورو) کە لەوە دەچێ ناوچەی ئاڵتون کوپری ئێستە بوویێت بۆسەر (للبو – حلوان)و (سامرو)وناوچەی (ئوربیللوم – ئەربیلی ئێستا)و لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتوانی ئەو ناوچانە هەرلە یەك نەتەوە بوون، بەڵام دەستەڵاتدارێکیان نەبووە هەموویان کۆبکاتەوەو بیانکات بەیەك.

لە سەدەی هەشتو نۆی پێش زایندا هەندێ بزوتنەوەی فکریو راپەرینی نەتەوایەتی لەناو میللەتەکانی ئاسیای بچووکدا (ئەوەی ئیمرۆ پێی دەوترێ تورکیا) رووبداو کاری کردە سەر هەموو میللەتو گەلەکانی هندۆئۆروپیو (حیث)ی یەکان کەبە (هیتیت) ناوبراوەو زمانەکەیان لاتینی بووەو ولاتی (سوریا)یان داگیر کردو پەلاماری (بابل)یان داو تالأنیان کردو تاقمێك ناوی (نوممان ماندا) بوو لە میدیەکان جیابوونەوەو لەکەناری دەریای رەش دا دەژیانو تاقمێکی بچوکی (هندۆئۆروپی) شیان لەگەڵ خۆیاندا بردو لە رۆژئاوای کوردستاندا نیشتەجێ بوونو لەلایەن یەکێ لە بنەماڵەکانیان کە ناوی (میتانی) بوو لەسەر روباری خابور بەناوی (میتانی)یەوە حکومەتێکی دروست کردو لە ئەنجامی ئەوەدا رۆژئاوای ولاتی (شوباری) لە بەشەکەی رۆژهەڵاتی جیابووەوە کە پێی وترلوە (خوری).

لەوسەردەمەدا کێشە لەناو (کاسی)یەکانی ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ڕوویداو بوون بە دوو بەشەوە: بەشی دەشتەکەی بریتی بوو لە ولاتی (خـوری - هـوری)و بەشەکەی تری بریتی بووە لە ناوچە شاخاویەکانی (طورعابدین). لە گێژاوی ئـەو بەسـەرهاتانەدا بنەماڵەیـەکی تـازە بـەناوی (خـانی گالبـات) هاتـە کایـەوە بـۆ ماوەیـەکی کـەم حکومـەتێکی سـەربەخۆیان دامـەزراندو پایتەختەکـەیان شـاری (نسیپیس - نصیبین)بووە دەستیان گرت بەسەر ولاتی ئاشووردا. ئاشـوورییەکان لـە سـەرەتای سـەدەی چوارەمـی پێش زایـنـدا دەسـەلاتیان زۆریـووە بەسـەر (میتانی)یەکانداو بەشێکیشیان لە کوردستان داگیر کردبوو.

دوای ئـەوە میللـەتێکی تـر کـە پێـی وترابـوو (ئورارتـو) یـاخود (ئـارارات) لەناوچەکانی دەریاچەی (وان)و دەریاچەی (ورمیە)دا نیشتەجێ بوون و ناوی ئەو میللەتە لە کتێبی (پیرۆز)دا نـاوی مـەلیك (سلمانسر)ی بـاس کـردووە لـە سـاڵی ١٢٦٠ پێش زایین هەرچەند نەزانراوە ئەم میللەتە کێ بووە، بەڵام (بـت)ە کـەیان (خلدیان)یان پێوتووە کە ڕۆمانەکان بە (خلدیوی) ناویان بردوە ئـەبێ ئـەم نـاوە لـە ووشـەی (کلدانـی) جیا بکرێتـەوە چونکـە زمـانی ئـەم خلدویانــە لــە زمانـە قفقاسیەکان بووە.

بە پێی ئەو بەڵگـەو شـوێنەوارە کۆنانـەی لـە شـاری (وان)دا بیـنراون لەگـەڵ شـوێنەوارەکانی شـاری (طـبراق قلعـە)یتەنیشـت وان، دوورنیـە پەیوەندییــەکی شارستانی هەبووبێ لەنێوان ئەمانەو ئەوانەی لە کەناری دەریای سپی ناوەڕاستدا بوون (بەڵام محمد علي عوني، وەرگێڕی کتێبەکەی ئەمین زەکی بۆ عـەرەبی، لـە پـەراوێزی لاپـەڕە /٥٣ی کتێبەکـەی ئـەمین زەکیـدا وتوویـەتی (طـبراق قلعـە) مەرکـەزی قـەزای (ئەلشـکرد)ە کـە سـەربە لیـوای (بـایزید)ەو پـەیوەندی بـە (وان)ەوە نیەو لـەوە دەچێ سدنی سمیـث مەبەسـتی شـوێنێك بووبێـت لـەنزیك شاری (وان).

لەدوای لەناو چوونی ئیمپراتۆرێتی (حیثی) لەسـەدەی یـازدەی پێش زایـندا، شەعبی (موشکی) دەستی بەسەر هەموو ناوچەکانی باکووری کوردستاندا گـرت و بۆ مـاوەی (٥٠) سـاڵ حوکمیـان کـردو توانیبـووی بەشــی خـواروی ناوچـەی (کبادوکیا)و کیلیکیا کە بریتی یە لە ویلایـەتی (ئەدەنـە - ئـە طنـە)ی ئێسـتا لـە

ئەتاموڵ دڵگیر بکەن و تیایا جێگیر بوون. ساتێك (موشکی)یەکان تەقەلای ئەومیاندا سنووری دەسەلاتیان فراوان بکەن و بگەنە رۆژهەلاتی دەریاچەی وان، تیگلات پلسری مەلیکی ئاشوری لە سالی ١١٠٠ پێش زایندا بەرەنگاری ئەو (موشکی)یانە بووەوەو خراپ شکاندنی.

بەلگەو دۆکیومێنتەکانی زەمانی ئاشوریەکان لە سەدەی شەش و حەوتی پێش زایندا دەریان خستوە جۆرە گۆرانکاریەك بەسەر رۆژهەلاتی کوردستاندا هاتووە لە ئەنجامی کۆچکردنی شەعبی ئاری لە رۆژهەلاتی دەریای رەشەوە بۆ ناوچەکانی باشووروو یەکەم کەسێك لەو رۆژانەدا ناوی (میدیا)ی هێناوە (شلمانصری پێنجەم)ی مەلیکی ئاشوریەکان بووە لە (٨٢٣ – ٨١٠ پێش زایین)و هاتنی ئەو میدیایانە بوویە هۆی هەرەشەکردنێکی پڕ لە مەترسی بۆ سەر ئاشووریەکان بەشێوەیەکی هەمیشەیی کە لە پێشدا رۆژهەلاتی ناوچەی (میدیا)یان داگیر کردو ساتێك سەدەی حەوتەمی پێش زایین دەستی پێکرد، سەرۆکەکانی ئەم شەعبە تازەیە (واتە میدیا) توانیان دەست بەسەر ئەو هەموو ناوچانەدا بگرن کە لە دواییدا بە هەمووی ووترا (میدیا).

لەسەردەمی لەناوچوونی حکومەتی ئاشووریداو بەرلەوەش ناوی کورد گەلێك جار هاتووە (ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەرە/٥٦ی کتێبەکەیدا دەربارەی ئەو بۆچوونەی سدنی سمیث وتوویەتی : (مسترهول) لە کتێبەکەیدا (مێژووی کۆنی رۆژهەلاتی نزیك _ لاپەرە/ ٥١١) باسی (ئاشور ناصرپال)ی کردووە کە دوا پاشای ئاشوریەکان بووە پەلاماری (مانی)ی داوە، بەلام بەهۆی ئازایەتی کوردەکانەوە نەیتوانیوە لەو پەلاماردانەی سالی (٦٢٦ پێش زایین) سەربکەوێت.

سدنی سمیث لە بەسەرهاتەکەیدا وتوویەتی :

((بێجگە لەوەش (زینفون) لەباسی پاشەکشەکەی سالی (٤٠١ پێش زایین) ناوی کوردی هێناوەو ئەوی بیەوێ بچێتە بنج وبناوانی کوردو ئەو نەتەوانەی لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بوون، پێویستە بایەخیش بدا بە زمان و ئەو (کاردخۆ)یەی زنیفون باسی کردووەو هەر بریتی بووە لە میللەتی کورد کە هەمیشە پەرۆش

بووه بۆ سەربەخۆییو سەربەستی میللەتەکەیو زمانەکەشی زمانێکی جیاوازو سەربەخۆ بووە.

لەم سەردەمەدا بۆچوونەکانی زاناو شارەزاو لێکۆڵەرەوەکانی زمانی کوردی گەلێك گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووەو ئەوانەی بۆچوونەکانیان جێگەی بڕواو دڵنیاییە بۆیان دەرکەوتووە زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیەو بریتی نیە لە زمانی فارسی دەسکاری کراو چونکە ئەو زمانە لە کۆنەوەو بەر لە زمانی فارسی هەبووەو ئەو فارسیەی لەوحە بەناوبانگەکەی (دارا)ی پێ نوسراوە ئەوە دەگەیەنێت زاناکان مافی ئەوەیان هەیە بڵێن زمانی کوردی لە سەدەی شەشەمی پێش زایندا هەبووەو زمانێکی سەربەخۆ بووەو میللەتی کوردیش یەکێکە لە میللەتانی هندۆئوروپیو لەوکاتەوە میدیەکان چونەتە ناو خاکی میدیاو فارسەکان چونەتە فارس، کوردەکانیش چونەتە کوردستانو دەتوانین لەژێر تیشکی ئەو بۆچوونانەدا بڵێین :

هاتنی کورد بۆ کوردستان لەساڵی(٦٥٠ی پێش زایین)ەوە دەستی پێ کردووە چونکە بەرلەوە لەناو بەڵگەکانی ئاشوردا ناوی کورد نەهاتووە (بەلام ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا دەربارەی ئەو بۆچوونەی سدنی سمیث، لە لاپەڕە/٥٧دا لە پەراوێزەکەدا ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (مستر هول) کردووە کە وتوویەتی: (ئاداد نیراری)ی سێهەم پادشای ئاشوور لە ساڵی ٨١٢پێش زایندا هێرشی کردۆتە سەر کوردەکان بۆ تەمێ کردنیان، کە ئەمە پێچەوانەی بۆچوونەکەی سدنی سمیثە).

سدنی سمیث لە کتێبەکەیدا وەکوو ئەمین زەکی باسی کردووە وتوویەتی: ((ئەگەر نەتوانرێ ئەو پەیوەندییەی نێوان دانیشتوانی (ئورارتو)ی ئەصڵیو کورد دەستنیشان بکرێت، بەلام دەتوانرێ ئەو بۆچوونەی ئەڵێ کورد لەو هەموو نەتەوانە پێك هاتووە کە لە کوردستاندا بوون، ئەوا ئەتوانرێ ئەم بۆچوونەی دوایی بە بۆچوونێکی بەهێزتر بژمێریت)).

ئەمین زەکی دوای ئەوەی لە بۆچوونەکانی سدنی سمیث بۆتەوە، بۆچوونەکانی خۆی دەربارەی کورد بەم جۆرە دەربڕیوە: ((هەروەکوو چۆن نەتەوەیەکی سامی لە جزيرة العربەوە لە ساڵی (٢٢٢٥ پ.ز)دا چونەتە ناوچەی

بابل)و (ئەکەد)و داگیریانکردووەو دەوڵەتێکیان تیا دامەزراندوە، کە هاتنیان بەم جۆرە بووە بەهۆی ئەوەی بوترێ عەرەب لە ڕەگەزی ئەو (سامی)یانەن، یا هەروەکوو چۆن تورکەکانیش ڕەگەزی خۆیان دەبەنەوە سەر (هون – وەیا – ئەلقون) بە بیانوی ئەوەی هەندێ لەیەکچوون هەیە لە نێوان زمانی هەردولایانا، ئێمەش (مەبەستی ئێمەی کوردە)لەسەر ئەو بۆچوون و پێڕەوانە بۆمان هەیە بڵێین کوردستانیش کە شوێنی لانکەو بێشکەی پێگەیاندنی سلالەی بەشەری دوهەمی بووەو لە کوردستانەوە پرش و بڵاوبوونەتەوە بۆ شوێنەکانی تر،لە ئەنجامی رووداوە مێژوویەکاندا، کە لەو سەردەمەدا شەعبی (لولو)و (گوتی – جوتی)و (خالدی – کالدی)و (سوریای – هوری)و شەعبی عیلام کە شەعبەکانی زاگرۆس بوون و لەبەرئەوەی هەندێ لە یەکچوونی زمان و لە یەکچوونی تر لە نێوانیاندا هەبووە، هەرلەبەرئەوە بووە رۆژهەڵاتناسەکان ئەو شەعبانەیان بە ڕەگەزو ڕەچەڵەك بردۆتەوە سەر سلالەی قفقاس.

ئەو شەعبانەی ناومان هێناون جگە لە شەعبی (عیلام) ئەوانی تر هەموویان ڕەگەزی کۆنی کوردن و هەریەکەیان لە زەمانی (سوەر)و (ئەکەد)و سەرەتای ئاشوریەکاندا رۆڵی خۆیان بینیوە.وا دەردەکەوێ شالاوی کۆچی ئاریەکان لە سەرەتادا بۆ (زاگرۆس)و لە دوایدا بڵاوبوونەتەوە بەرەو رۆژهەڵات و رۆژئاوا، کە ئەمە لە سەدەی دەهەم و نۆهەمی پێش زایندا دەستی پێکردووە (ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەرە /٩دا دەربارەی کۆچی ئاریەکان ئاماژەی بۆ بۆچوونی (کرۆزن) کردووە کە لە پێشەکی گەشتەکەیدا بەناو ئێراندا وتوویەتی : هیچ دوورنیە کۆچی ئەو (ئاری)یانە لە سەدەی بیستەمی پێش زایندا بووبێت.

ئەمین زەکی لەسەر باسەکەی رۆیوە و وتوویەتی : ((وادیارە دانیشتوانی ئەو ناوچانەی ئاریەکان کۆچیان بۆ کردووەوتیایا نیشتەجێ بوون ، دوای هاتنی ئاریەکان لەناو ئەو ئاریانەدا توابنەوەو هەموویان بوون بە ئاری و(میدی)یەکان لەناو ئەواندا لە هەموو تاقمەکانی تر بەهێزتر بووەو لە سەرەتادا لە رۆژهەڵاتی گۆلی ورمیەدا جێگیر بووە پاش میدیا شەعبە ئاریەکانی تر وەکوو (پارس، ماتای، پارسیوی، پارت، کاردشوی...وهیتر بەرەو دوا هاتون و لەو بۆچوونەی

سدنی سمیث که باسی زینفونی کردووه، دەردەکەوێ (کاردشوی) لە سەدەی حەوتەمی پێش زایندا هاتوون)).

ئەمین زەکی لە لاپەڕە /٦٠ی کتێبەکەیدا وتوویەتی : ((کەحاڵ ئەمە بێ و، هەندێ زاناو شارەزایانی شوێنەوارە کۆنەکان و مێژوو نووسان باسیانکردووە، ئێمەش بە پێی ئەوانە بۆمان هەیە بڵێین : پەیوەندیەکی بەهێز هەیە لە نێوان ڕەگەزی کوردو سەرەتای شوێنی دەرکەوتنیان لەگەڵ ئەو کۆمەڵە شەعبانەی کۆنی زاگرۆس.

ئەمین زەکی لە باسەکەیدا شەعبەکانی زاگرۆسی کردووە بە دوو چینەوە :

**چینی یەکەم - بەناوی شەعبی زاگرۆس ناوی بردن.**

**چینی دوهەم - بە میدیاو لکەکانی ناوی بردون.**

باسەکەی ئەمین زەکی دەربارەی ئەو دوو چینە ئێجگار دوورو درێژە بۆیە تەنها کورتەیەکی هەردوکیان پێشکەش ئەکەین.

**چینی یەکەم – شەعبەکانی زاگرۆس**

**١- (لولو)وەیا (لولوبوم)**

لە ناوچەکانی زەهاوو شارەزورو سلێمانیدا ژیاون بەلاّم نەزانراوە کەی هاتوون و، لە دواییدا لەگەڵ شەعبی (گوتی) تێکەڵ بوون و لە ناوچەی ئێستای سلێمانی جێگیر بوون و ولاّتی (هالمان)یان داگیرکردووە (ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەڕە/ ٦٠دا وتوویەتی (هالمان) بریتە لە (حلوان)و بە پێی لەوحەی نارام سین کە پادشای (ئەکد) بووەو ئەدمۆنس ئەو لەوحەیەی لە گەرووی (گاور)ی چیای قەرەداغدا دۆزیوەتەوە لەگەڵ گۆڤاری (جیوفیك جورنال)دا باسکراوەو مێژووی لەوحەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی بیست وحەوتەمی پێش زایین).

هەروەها لە(زەهاو)یش بەردێك دۆزراوەتەوە، لەوەدا ناوی (ئانتۆبانینی)ی پادشای لولوی تیادا باسکراوە کە مێژووی دۆکیومێنتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی بیست و شەشەمی پێش زایین.

لەسەرەتای سەدەی سیازدەهەمی پێش زایندا پێوەندی هێزەکانی ئاشور بە شەعبی (لولو)هەبووە کە ئەم راستیە بەهۆی سەرچاوە ئاشوریەکانەوە زانراوە بێجگە لەو لێکۆڵینەوانەی (هوزینگ)ی رۆژهەلاتناس دەربارەی (لولو) کردویەتی.

لەو بەڵگانەی کە لە ( ئاشور ناصرپال )ەوە بەجێ ماوە، دەرکەوتووە شەعبی لولو لە شارستانێتیدا زۆر پێشکەوتوو بووەو شارەزای پیشەسازی بووەو پادشاکانی ئاشور گەلێك لەو شارەزایانەیان بردوە بۆ ولاتی خۆیان و سوودیان لێ وەرگرتوون (سەرچاوەی ئەمین زەکی بۆ ئەمە باسێکی – ئولمستید–ە).

**٢ ـ گوتی – جودی**

گوتی یەکێك بووە لە شەعبە بەناوبانگەکانی زاگرۆس کە لە سالی ٢٦٤٩پ.ز سۆمرو ئەکەدیان داگیر کردووە. دەربارەی وشەی (کوتی – کورتی) لەسەر سەردە نوسراوەکانی زەمانی (توکولتی – ئینورتا)ی پادشای ئاشوری ناوی کوتی و کورتی هاتووە.

(درایفر)ی رۆژهەلاتناس دەربارەی (کوتی) وتوویەتی :

((وشەکانی (کاردا، کاردوخی، کورتوخی، گوردی، کارداك، سیرتی، کیرتی، گوردیاری، گوردوئین، کاردو، کارداویە، کارناویەو، گەلێك وشەی تری لەو جۆرە هەموویان هەریەك مانا دەگرنەوە کە بریتییە لەو (کاردخۆ)یەی (زینفون) باسی کردووەو ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە پێوەندیەکی بەهێز هەیە لەنێوان وشەی (کورد)ی ئێستەو(کورت)ی کۆندا)).

**٣ ـ کاسای : (کوسی، کوشو)**

ئەمانە بەشێك بوون لە زاگرۆسیەکان کە سەرکردەی سوپاکەی ئەسکەندەری گەورە کە ناوی (ئەنیتفونوس)بووە لە گەرووی (پلی تنگ گلو)دا توشیان بووە.

**٤ ـ خالدی – ئورارتو**

ئەمانە لە کاتێکی نەزانراودا لە رۆژهەلاتی ئاسیای بچوکەوە چوونەتە ناوچەی گۆلی (وان). بەپێی سەرچاوە ئاشوریەکان، کە لە زەمانی (سرجونی دوهەم)دا باسی شەڕەکان کراوە، حکومەتی (خلدی) لە ماوەیەکدا دەسەلاتی لەباکورەوە گەیشتبووە دەریای (کوگجە)و (ئەلکسندروپول) لە قفقاسداو لە رۆژئاوادا گەیشتبووە روباری فراتو لە باشوردا گەیشتبووە خواروی رواندزو

سەرچاوەکانی روباری(زێ)و لە رۆژھەلأتدا گەیشتوتە دەریاچەی ورمیەو لە ماوەیەکیشدا (سوریا)شیان بە دەستەوە بووەو پایتەختی ئەو خالیدیانە (وان – توسپاس) بووەو لەوە دەچێ (ساردوریس)ی یەکەم پادشای خلدیەکان لە سالی (٨٤٠پ.ز)دا ئەو شارەی دروست کردبێت.

بەلأم ئەو حکومەتی خلدیە، دوای ئەوەی (میدیا)ییەکان پەرەیان سەند ئیتر خلدیەکان سەربەخۆیی خۆیان لەدەس داوەو بەتەواوی کەوتونەتە ژێر دەسەلأتی (ئەرمەن)یەکانەوە کە لە رۆژئاوای ولأتی خلدیدا نیشتەجێ بوبوون. (سەرچاوەی ئەمین زەکی بۆ ئەو بۆچوونەی بریتیە لە مێژووی کۆن، جلدی سێھەم – کابرج) وەکووخۆی وتوویەتی.

٥ ـ سوربای

بۆ یەکەم جار ناوی ئەم شەعبە لە لوحەیەکی زۆر کۆندا ھاتووە کە مێژوەکەی دەگەرێتەوە بۆ رۆژانی حکومەتی (لوغال – ئانی – موندو) کە لە سەدەی/٣٠ی پێش زایین بەناوی (سوبیر)ەوە ناوی ھاتووەو لە شوێنەوارەکانی زەمانی (نارام سین)دا ئەو ناوە بەشێوەی (سوبارتیم) ناوی ھاتووە کە بریتیبووە لەو ناوچانەی لە باکووری رۆژئاوای عیلامەوە دەستی پێکردووە ھەتا چیای (ئامانوس). (وەرگێری کتێبەکەی ئەمین زەکی بۆ عەرەبی ــ محمد علی عونی ـ لە پەراوێزی لاپەرە/ ٦٧دا وتوویەتی : چیای ئامانوس چیایەکە لە ئاسیای بچوکدا (تورکیا) لە خۆرئاوای روباری فراتدا لە نێوان لیوای ئەسکندرونەو ویلایەتی (ئەدەنە ـ ئەطنە).

ئەمین زەکی دەربارەی سوربای وتوویەتی : ((ھەروەھا (حمورابی)ش ناوی شەعبێکی بەوناوەوە ھێناوە کە بریتیبووە لە شەعبێکی سەربەخۆو لە بەلگە ئاشوریەکانیشدا ناوی (سوریا) ھاتووەو بەمەدا دەردەکەوێ ئەوانەی لە نێوانی میسوپوتامیاو ئاسیای بچووکدا ژیابوون بە (سوبارو) ناسرابوون کە شەریان لەگەلّ ئاشوریەکانا کردبوو، بەلأم لەدوای کۆتایی دەولەتی ئاشوری ئیتر ناوی (سوباری ) لەناودا نەماو لە جیاتی ئەو باسی شەعبێکی تر کراوە کە ناوی

(نیری)بووە کە ئێستە شوێنەواری شەعبی (نایری)و ناوەکانی بە ئاشکرا لە (توچەی (نهیری)ی ئێستادا دەردەکەوێ.

**چینی دوهەم : ئەمین زەکی (میدی)یەکان و لکەکانی بە چینی دوهەم داناوە کە بەم جۆرەی خوارەوە باسی ئەو چینەی کردووە :**

دوو مێژوو نووسی بەناوبانگ، یەکەمیان (هارفی روبنس)و دوهەم (هنری بریستد) کە ئەمەی دوهەمیان دووکتێبی نوسیوە بەناوی (سەردەمە کۆنەکان)و (مێژووی ئەورووپا بە گشتی) کە لە ساڵی ١٩٢٤دا لە (بوسطن)چاپکراوە و ئەو دوو مێژوو نووسە لە باسەکانیانا ووتویانە :( ئەو میللەت و شەعبانەی دراوسێی یەکتر بوون و لەیەك چوون، هەندێ جار پێیان وتراوە (ئاری)یەکان کە یەکێك بوون لە شەعبەکانی هندۆئوروپی و بەرلە (٢٥٠٠)ساڵی پێش زایین لە رۆژهەلاتو باکووری دەریاچەی (قزوین)دا ژیابوون.

هەندێ لەو عەشایرە(ئاری)یانە کۆچیان کردووە بۆ وڵاتی هند کە لەوێ کتێبی (پیرۆز)یان بەزمانی (سنسکریتی) بەجێهێشتووە کەپێی دەوترا (ڤیداس)و گەلێك باسی گرنگی تیادایە دەربارەی سەرەتای ژیانی ئەو عەشیرەتانەو، بەشێکی تری ئەو عەشیرەتانە رووپانکردۆتە باشووری رۆژئاوا بۆ (میسۆپۆتامیا) کە بریتی بوون لە شەعبی (ماد ـ مید)و(پارسا ـ پارسای) کە ئەمانە بەهێزترین تاقمی ئەم بەشانە بوون))

ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەرە /٦٨ی کتێبەکەیدا ـــ مێژووی کوردو کوردستان ـ وتوویەتی ئەو ئاریانە چووبوونە هندستان لە سەدەی دوازدەی پێش زایندا زمانی سنسکریتی یان لەگەڵ خۆیانا بردبوو لە سەدەی سێهەمی پێش زایندا کتێبی (ڤیداس ـ پیرۆز)یان بەو زمانە نوسی و بلاوکردەوە، بەوجۆرە زمانی سنسکریتی بوو بە زمانی نوسین و فێربوون کەبەر لە نووسینی ئەو کتێبە تەنها زمانی قسەکردن بووەو، ووشەی سنسکریت لە ووشەی (Sacae) کە سەرکردەی ئەو ئاریانە بووە کۆچیان کردبوو بۆ هندستان وەرگیراوە لەگەڵ ووشەی(Krekir ـ کەمانای نوسین یا زمان دەگرێتەوە ـــ (سەرچاوەی ئەمین زەکی بۆ ئەمە بریتیە لە کتێبی ((القضية الكردستانيه والترك ـ لاپەرە /٢٣).

ئـەمین زەکی لەباسی چینی دوهـەمدا نـاوی چـەند لکێکـی ئـەو چینانــەی باسکردووە کـە بریتـی بـوون لـە (میـد، نـایری، کـاردخۆی)و ئێمـە تەنـها کورتـە باسێکی ئەوانە ئەخەینە پێش چاو:

**١ـ مید**

ئـەم شـەعبە یەکێکــە لـە شـەعبەکانی هندۆئوروپـی‌و وادیـارە لـە ولاّتـی (باختر)یانــەوە لـە سـەدەی نۆهـەمیی پێـش زایـین یـا دوای ئـەوە روویانکردۆتـە رۆژئاوا باکووری بەرزاییەکانی ئێران کە مەبەسـت ولاّتـی (میدیـا)یـەو دوای ئـەوە دەسـتیانگرتووە بەسـەر ولاّتـەکانی دراوسـێدا وەکـوو (مــانی، سـیث، کـیری)و دانیشتوانی ئەو ولاّتانە لەناو میدیەکانا تواونەتەوەو تێکەلّ بەیەك بوون.

نوسراوو شوێنەوارەکانی ئاشوری لە باسی رووداوەکانی سەدەی هەشت‌ونۆی پێش زایین باسی میدیایان کردووە کە پێیان وتووە (ئامادا ــ مـاد)و لـە کۆتـایی سـەدەی هەشـتەمی پێـش زایـنـدا حکومـەتی سـەربەخۆی دامـەزراندوەو شـەعبی (پارسا)ی خستۆتە ژێر دەستەلاّتی خۆیەوەو شاری (ئاقبتان ـ ئەمین زەکـی لـە پـەراوێزی لاپــەڕە /٦٩دا بەرامبــەر ئاقبتــان ــ هکمتــان ـــی کـۆن، همدانــی ئێستەبووە)و ئەو شارەیان کردووە بە پایتـەختی خۆیـان‌و لەگـەلّ ئاشـوریەکانا هەتا کاتی روخاندنی ئاشوور هەمیشەلە کێشەو شەڕدا بوون).

ئەمین زەکی لەوباسەیدا ئاماژەی بۆ کتێبی (مێژوو نووسەکان) کردووە کە لە لایەن (سایس)ەوە لـە جلـدی دوهـەمی کتێبەکـەیدا دەربـارەی میدیـا وتوویـەتی :((میـدی)یـەکان بریتـی بـوون لـەو عەشـایرە کوردانـەی لـە رۆژهـەلاّتی ئاشـوردا ژیابوون‌و سنووریان گەیشتبووە دەریاچەی قزوین‌و بەشێك بوون لە شـەعبەکانی هندوئوروپـی‌و لــە رووی زمــان‌و خوێــن‌و رەگەزیشــەوە چوونەتــەوە ســەر (ئاری)یەکان)).

ئەمین زەکی دەربارەی زمانی (میدی)یەکان باسی ئەوەی کردووە کە هـەندێ لـە رۆژهـەلاّتناس‌و پسپۆڕو شـارەزاکان وتوویانـە زمـانی (میـدی) بریتــی بـووە لەهەمان زمانی کـوردی ئیمرۆ وەیـا هیـچ نـەبێ بریتـی بـووە لـە بناغـەی زمـانی ئێستای کوردی (سەرچاوەی ئەمین زەکی بۆ ئەم بۆچوونەی بریتیە لە کتێبەکەی مشیر الدولە(کتاب ایران قدیم ـ لاپەڕە /٥٧).

ئەمین زەکی لەباسەکەیدا وتوویەتی، لەدوای نەمانی حکومەتی مید، ئیتر میدیەکان کەوتنە ژێر دەسەلاتی شەعبی (پارس ـــ فارس)ەوە. بێجگە لەو بەسەی ئەمین زەکی دەربارەی میدییەکان، کورتە باسێکی سەرچاوەی ژمارە ٩٧ئەنەخەینە پێش چاو (ئافێستا)، کە لەوەدا ئاماژە بۆ باسێکی (هیرۆدۆتس)ی مێژوونوس کردووە کە ئەویش دەربارەی (میدی) دواوەو وتوویەتی:

((ئاشوریەکان ماوەی /٥٠٠ساڵ حوکمڕانییان کردووەو یەکەم تاقمێك دژیان وەستابوون (ماد)ەکان بووە کە خەڵکی تریش پشتگیریان کردووەو ناوچەکەیان لە ئاشوریەکان ڕزگار کردووەو کەوتۆتە ژێر دەسەلاتی (ماد)ە کانەوە (کە سەرچاوەی نوسەری ئافێستا بۆ ئەمە بریتیە لە بەندی /١، لاپەڕە /٩٦ی کتێبەکەی هیرۆدۆتس)و بە پێی ئەو سەرچاوەیە مادەکان لە شەش هۆز پێك هاتبوون کە بریتی بوون لە (بوسە، پارتاکنە، سترو خاتەکتە، ئاری سانت، بودی، موغ)).

نوسەری سەرچاوە /٩٧ ئاماژەشی بۆ باسێکی (بیروس)ی مێژوونوس کردووە کە وتوویەتی مادەکان لە دەوروبەری ساڵی (٢٥٠٠)ی پێش زایین بابلیان داگیر کردووەو بۆ ماوەی (٢١)ساڵ لە ژێردەسیانا بوون. نوسەری سەرچاوە/٩٧ وتوویەتی : بە پێی بۆچوونی ئەو دوو مێژونوسە (هیرۆدۆتس) و (بیروس) سەردەکەوێ ووشەی (ماد) بۆ هەموو هۆزەکانی زاگروس بەکارهێنراوەو هەندێ لە مێژوونوسەکانی دوای سەردەمی مادەکان، (هەخامەنشی)یە کانیشیان هەر بە ماد حساب کردووە.

سەرچاوە /٩٧، دەربارەی پادشاکانی ماد، ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (هیرۆدۆتس) کردووە کە ناوی چەند پادشایەکی مادەکانی تیادا باس کراوە کە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١ ـ دیوکوس ( ٧٠٨ ـ ٦٥٥ )ی پێش زایین کەبە ( دیاکو )ش ناوبراوە.

٢ ـ فرانوتیس ( ٦٥٥ ـ ٦٣٣ )ی پێش زایین کەبە ( فەرڤەتیش )یش ناوبراوە.

٣ ـ ئاکسار ( ٦٣٠ ـ ٥٨٥ )ی پێش زایین کەبە ( هوڤەخشەترە )ش ناوبراوە.

٤ ـ ئاستیاگس ( ٥٨٤ ـ ٥٥٠ )ی پێش زایین کەبە ( ئەژی دەهاك )یش ناوبراوە.

بە پێی باسەکەی (هیرۆدۆتس)، مادەکان ماوەی (١٥٠)ساڵ فەرمانڕەوا بوون، بەڵام بەپێی نوسینی (کزتیاس)ی مێژوونووس ناوی پادشاکانی مادی بە جۆرێکی تر باس کردووە کە وتوویەتی : ئارباکس ٢٨ساڵ پادشایەتی کردووە، (مانداکس ـ پەنجا ساڵ)، (سوزامیس ٢٨ساڵ)، (ئارتی کاس ٥٠ساڵ)، (ئاربیسیان ٢٢ساڵ)، (ئارتەیس ٤٠ساڵ)، (ئارتی نس ٢٢ساڵ)، (ئاستی باراس ٤٠ساڵ)، (ئاسپاداس ـ یاخود ئاس تی گاس ٣٥ساڵ). بەداخەوە نووسەری سەرچاوە /٩٧ باسی ئەو سەرچاوانەی نەکردووە کەی‌و لەکوێ چاپکراون‌و هەرئەوەندەی وتووە ئەو پادشایانە ناوەکانیان بە یۆنانی نوسراون.

نوسەری سەرچاوە /٩٧ باسی پەیوەندیی نێوان هۆزەکانی مادو چینەکانیان وتوویەتی :((لەپێش دروست بوونی حکومەتی ماد، هوزەکان هەریەکەیان پادشای خۆی هەبووە. بەڵام کە لە دواییدا یەکیان گرتووە دەسەڵات کەوتۆتە دەست (دیاکۆ)ی شای مادەکان بە هەموویان ئەو ئیمراتۆریەتەیان پێکەوە نابوو کە لە دوای نەمانی دەوڵەتەکەشیان هەتا سەردەمی سەلجووقیەکان‌و عباسیەکانیش بە وڵاتەکەیان هەر وتراوە (وڵاتی ماد).

دەربارەی چینەکانی کۆمەڵگای ماد، وتوویەتی لەسێ چین پێك هاتبوون: ١ ـ جەنگاوەران ٢ ـ وەزیرو فەلاح‌و شوانکارەکان ٣ ـ (موغ)ەکان کە بریتی بوون لە پیاوە ئاینیەکان. (لەباسێکی تایبەتدا کەبۆ ئاینی کوردمان تەرخانکردووە دەگەڕێینەوە سەر باسی (موغ)ەکان).

**٢ ـ نایری (نهری)**

ئەمین زەکی دەربارەی نایری لە لاپەڕە /٧٠ی کتێبەکەیدا وتوویەتی : هەرچەند لە شوێنەوارە زۆر کۆنەکانا ناوی ئەم عەشیرەتە نەهاتووەو لەوە دەچێت بەشێك بووبێت لە بەشەکانی (سوباری)و (گوتو) بەڵام لەکاتی ئاشوریەکانا ناوی (نایری) هاتووەو زۆری پێ‌نەچووە (نایری)یەکان بەسەر (سوباری)و (گوتو ـ گوتی)دا سەرکەوتون‌و جێگەی ئەوانیان گرتۆتەوە. نایریەکان زۆر ئازاو بەهێز بوون هەمیشە ئامادەی شەڕ بوون زۆرجار لەگەڵ ئاشوریەکانا شەڕیان کردووە.لەوە ئەچێ گوندەکانی ناوچەی نهری، بە تایبەتی ئەوانەی لە ناوچەی شمزینانا بوون بریتیبن لە شوێنەواری نایریەکان، کە

میتۆرسکی)ش لایەنگری ئەم بۆچوونەیە. (ثورو دانجین) لەو کتێبەیدا لە ساڵی ۱۹۱۲دا لە پاریس چاپی کردووەو بەناوی پەیوەندیی هێرشی هەشتەمی ملك سرجون، دەربارەی ناوچەی نایرییەوە یا (هوبشکا) بریتیە لە دۆڵی (بۆتان) کە لە رۆژهەڵاتی نایریدا کاتی خۆی حکومەتێکی تیادا دروست کرابوو. لای هەندێ لە رۆژهەڵاتناسان وایە لەدوای دروست بوونی حکومەتی (میدی) ئیتر ئەو (نیری)یانە تێکەڵ بە میدیەکان بوونو بە هەردولایان نەتەوەیەکی گەورەیان پێکەوە ناوە.

مێجرسۆن لەو کتێبەیدا لە ساڵی ۱۹۱۲لە لندن چاپی کردووەلە باسی نایریدا وتوویەتی :

((ئەگەر سەیری مێژووی زەمانی (کورتی)یەکان بکەین لەنێوان سەدەکانی پازدەهەم هەتا سەدەی دوازدەی پێش زایین، بۆمان روون دەبێتەوە (نایری)یەکان بەرلە (میدی)یەکان لە کوردستانی ناوەراستدا ژیاونو لەکاتی دەسەڵاتدارێتی نایریەکانا دانیشتوانی هەموو ناوچەکە لێیان ترساون کە لە دونیدا بەمانە وتراوە (کورد). لەدوای دەسەڵاتدارێتی میدیەکان ئیتر وردە نایریەکان تێکەڵ بە میدیەکان بوونو حکومەتەکەیان لەناو چوە.

**۲ ـ کاردخۆی :**

ئەمین زەکی لە لاپەرە /۷۲ی کتێبەکەیدا دەربارەی کاردخۆی ئاماژەی بۆ دوو بۆچوونی (زینفون) کردووە کە وتوویەتی :

**أ ـ بۆچوونی یەکەم :** ووشەی (کاردخۆی) هەرلە ووشەی (گوتی)ی کۆنەوە پەیدا بووەو بەهۆی دەسکاری کردنو تێکەڵ بوونی زمانەکانەوە لەکاتی (توکولتی) مەلیکی ئاشووریدا بەناوی (کوتی)و (کورتی) ناوی هاتووە. ئەو لێکۆڵینەوەیە (درایفر)ی رۆژهەڵاتناس کردوێتی، ئەو هەموو ناوانەی وەکوو کورتی، کاردا کە لە زەمانی (ئاراد ـ نانار)ی مەلیکی (لەگەش) هەمووی هەر بریتی بووە لە پاشماوەی شەعبی (گوتی)ی کۆن کە لە سەرەتای مێژودا هەبووە.

**ب ـ بۆچوونی دوهەم :** دورنیە کاتی هاتنی شەعبی (کاردوخی) بۆ کوردستان لەو کاتانەدا بوویێ کە (میدی)و (فارس)ەکانیش چوبنە ئەو شوێنانەی تیایا جێگیر بوون وەیا لەدوای ئەوەبوبێت کە ناوەراستی سەدەی

حەوتەمی پێش زایین دەگرێتەوەو کە کاردۆخیەکان چونەتە کوردستان بەسەر دانیشتوەکانیا سەرکەوتون و لەگەڵیانا تێکەڵ بەیەك بوون و لەوانەشە هەندێ لەو کاردۆخیانە چووبنە بەرزاییەکانی ئێران کە بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە هەندێ لە عەشایرە کوردەکان لە زەمانی ساسانیەکانا لە ئێران بوون کە (سێر سدنی سمیث) یش لایەنگری ئەم بۆچوونەیەو وتوویەتی: ((ئەو عەشایرە کوردانە زمانێکی تایبەتیو سەربەخۆی خۆیان هەبووەو بەتەواوەتی لە زمانی فارسەکان جیاواز بووە چونکە ئەمان لە فارسەکان کۆنتر بوون)).

ئەمین زەکی دەربارەی پوختەی هەردو بۆچوونەکە، لە لاپەرە /٧٣ی کتێبەکەیدا وتوویەتی:

((بەوجۆرە، بە پێی بۆچوونی یەکەم دەبێ شەعبی (کاردخۆی) لەنەوەی (گوتی)بووبێت کە لە شەعبەکانی زاگروس بووەو لەکاتی خۆیدا (سومەر) و (ئەکەد)یان داگیر کردبوو. بەڵام بە پێی بۆچوونی دوهەم (کاردوخ) بەرەگەزی ئاری (هندوئوروپی) دانراوە وەکوو (میدی)یەکان و (فارس)ەکان)).

ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا وتوویەتی بێجگە لەمانە، وا دەردەکەوێ چەند عەشیرەتو دەستەیەکی تری کورد هەبووبن کە ناویان لە بەڵگەو شوێنەوارە کۆنەکاندا هاتووە، بۆ نموونەی ئەوە، (ئولمستید) وتوویەتی:

تایەفەیەك ناوی (موسری)بووە کە ئەمانە هەر ئەوانەن پێیان دەوترێ (مزۆری) کە لە زەمانی (سنحاریب)دا لە دەوروبەری روباری (خازر)دا بوون هەروەکوو لە لاپەرە /٢٣٢ی کتێبی مێژووی ئاشوریدا باسکراوە، هەروەها عەشیرەتی (سیرتی) کە لە زەمانی ئاشوریەکاندا بوون هەر بریتیە لەو (سیرت)ەی (مارك سایکس) لە باکووری شاری زاخۆدا چاوی پێیان کەوتووە.

هەروەها هەندێ لەو حکومەتانەی مێژووناسەکان وتویانە لەناو ئەوانا هەبوون، ناوەکانیان بەتەواوەتی لە ناوی عەشیرەتە کوردەکان دەچن کە ئیمرۆ هەن وەکوو (مامیکۆنیان)و (باغراتونیان)و (رشدینان)و (مندیکانیان) کە بەرامبەر ئەوناوانە ئیمرۆ لەناو عەشایرەکانی کوردا (مامیکانلی)و (بغرانلی)و (رشکوتانلی)و (مندیکانلی) هەیە بەپێی ئەو باسەی لە لاپەرە /٥٥٢ی کتێبی (تراث الخلفاء الاخیر)دا بڵاوکراوەتەوە.

بەوجۆرە پوختەی ئەو بۆچوون و باسانە ئەوە دەگەیەنێت بە پێی باسی چینی یەکەم دەبێ کورد لە شەعبەکانی (زاگروس) بێت کە لای هەندێ لە زۆمەلاتناسان وایە دەچنەوە سەر قفقاسیەکان و لە دواییدا بەهۆی لێشاوی ئاریە کۆچکەرەکانەوە لە سەدەکانی نۆهەم و هەشتەمدا چوونەتە ناو چەکەو ئەوانیش بوون بە ئاری وەیا یەکسەر کورد لە ئاریەکانن (هندوئوروپی) کە زۆربەی مێژوونوسەکان و پسپۆرانی شارەزا لەگەڵ ئەم بۆچوونەی دوهەمدان.

ئەمین زەکی لەو باسەیدا لە لاپەرە ٧٤/ سەرنجی خۆی دەربڕیوە بەرامبەر بەونەی وتوویانە کورد لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش زایندا هاتونە کوردستان و وتوویەتی ئەمە بۆچوونێکی زۆر لاوازەو لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی مامۆستای زانا (سپایزر)و ئەوانەی لەسەر بیرو بۆچوونی ئەون یەك ناگرێتەوە کە ئەمانە کوردیان بەدانیشتوانی کۆن و رەسەنی دێرزەمانی چیاکانی زاگروس و کوردستان داناوەو، بەجۆرە دەتوانین بڵێین: ناوی کوردو وشەی کورد بە زمانی ئەو میللەتانە تۆمار کراوە کە قسەیان پێکردووەو لەگەڵ ئەوەشدا شارەزایان لایان وایە لەگەڵ بوونی ئەو جیاوازیە کەمەی کە هەیە، بەڵام هەمویان هەیەك شتدا یەك دەگرنەوە کە بریتیە لەوەی هەمویان هەر مانای (کورد) دەگرنەوە.

ئەمین زەکی بۆ روونکردنەوەی ئەو بۆچوونەی چەند بەڵگەیەکی خستۆتە پێش چاو:

**١ ـ لەلای (سومر)یەکان، کورد بەناوی (گوتی، جوتی، جودی) ناوی هاتووە.**

**٢ ـ کورد لای ئاشوری و ئارامیەکان بە (گوتی، کوتی، کورتی، کاردو، کاردا، کاردان، کارکتان، کارداك) ناوبراوە.**

**٣ ـ لای یونانیەکان و رۆمانەکان بە (کاردسۆی، کاردخۆی، کاردوك، کردوکی، کردوخی، کوردویکای) ناوی هاتووە.**

**٤ ـ لای ئێرانیەکان بە ناوی (کورتیوی، سیرتی، کورداها) ناوی هاتووە.**

**٥ ـ لای ئەرمەنیەکان ـ کورد بەناوی ( کوردوئین، کوردچیخ، کورتیـخ، کرخـی، کورخـی ناوی هاتووە ( بەلام باسیل نیکتین لە کتێبەکەیدا کورد /سەرچاوە /٥٤وتوویەتی کـورد لای ئەرمەنیەکان بە ( کیردوخ ) ناوی هاتووە ).**

**٦ ـ لای عەرەبەکان، بە پێی کتێبە ئیسلامیەکان، ناوی کورد بە ( کردی، کـاردوی، باکـاردا، کارتـاویـە، جـودی، جـوردی ) هـاتووە ( باسـیل نیکتـین وتوویـەتی کـورد لای عەرەبەکان بە ( بکرادە )ش ناوی هاتووە ).**

دەربارەی جیاوازی ئـەو ناونـاوە، تەنـها هـەر مـن نـا (ئـەمین زەکـی) بـەڵکو زۆربـەی شـارەزایانو پسـپۆڕانو رۆژهەڵاتناسـانی وەکـوو : درایڤـر، نولدکـی، هاوفمان، هات، سپایزر، ئەمانە هەموویان وتوویانە ئەو ناوانە هـەموویان بەشێك بوون لە شەعبی کـوردو ئـەبێ ئـەوەش بخرێتـە پێـش چاو گۆڕینـی نـاوی شـارو وڵاتو میللەتێك بۆ ناوێکیتر زۆر شتێکی ئاساییەو تەنـها هـەر لـە گۆڕینـی نـاوی کوردا رووی نەداوەو بۆ نموونـە : عربـەکان ئـەڵێن (بندقیـە)، لـەکاتێکدا میللەتـە لاتینیەکان بەوشارە دەڵێن (ڤینیسیا)و تورکەکان پێی دەڵێـن (وەندیـك) کـە لـە راستیدا هەرسێ ناوەکەش هەرهی شوێنێکە)).

ئەمین زەکـی لـە کۆتـایی ئـەو باسـەیدا وتوویـەتی :((بـەڵێ پێویسـتە لەسـەر میللـەتی کـورد وەکـوو وەفاداریـەك سوپاسـی مامۆسـتای بـەڕێز (دوکتـۆر سـپایزر)بکـات بـۆ ئـەو کتێبـە بەنرخـەی لەسـاڵی ١٩٣٠دا لـە (بوسـطن) بـەناوی (شەعبەکانی مابین النهرین)ەوە چاپی کردووەو بەو کتێبە بەنرخەی ئەو تارمایی لەسەر رووی مێژووی کورد لابردو ئەو تاریکاییەی رەواندەوەو گەلێك بەڵگەی زۆر بەنرخو پڕلە زانیاری دەستنیشانکردووەو توانیویەتی بیچەسپێنێت میللەتی کورد بەرەگەز دەچنەوە سەر زنجیرە شەعبی (گوتو ـ کوردی ـ جودی) کە لە مێژووی زۆر کۆندا ناوبانگی تەواوی هەیە)).

لام وایە وەکوو چۆن ئەمین زەکی داوای لە میللەتی کـورد کـردووە سوپاسـی ئەو زانا بەرزە بکا، نەوەی کـوردی ئیمـڕۆو دوارۆژیـش پێویسـتە سوپاسـگوزاری مێژوونووسو مێژووناسو لێکۆڵەرەوەی بەناوبانگی کورد، مامۆستا ئەمین زەکـی بێ بۆ ئەو هەموو هەوڵو کۆششـەی دابـووی بـۆ روونکردنـەوەی مێـژووی کـوردو، لەگەڵ ئەوەشدا ساتی خۆی ئەو باسەی ئامادەکردبوو هەمووی سـوتابوو، بـەلام

ئەو هەرکۆڵی نەدلو بۆ جاری دوهەم دەستی کردەوە بە کـارە پیرۆزەکـەی‌و ئـەم بەرهەمە بەنرخـەی، پێشکەشـی میللەتەکـەی خـۆی کـردووە بـۆ ئـەوەی قوڕێکـی حەست بدرێ بە دەم‌وچاوی ئـەو دوژمنانـەی کـورد بێ‌ووچـان تەقـەلای ئـەوەیان ...وە کورد وەکوو میللەتی بێڕەگەزو بێ ڕابردوو بخەنە پێش چاو.

...جگە لەو باسە گرنگانەی ئەمین زەکـی‌و مینۆرسـکی‌و سـێر سـدنی سمیـث، ...ێک نووسەری تری ئەورووپایی‌و عەرەب‌و فارس‌و تـورك هەریەکـەیان بـەجۆرێك ...ی مێژووی کوردیان کردووە. هەوڵئەدەین کورتەو پوختەی بۆچوونــی هـەندێ ...و نووسەرانەش بخەینە پێش چاو:

...ە لاپەڕە /٢٢٥ی گۆڤاری کۆڕی زانیاریی ژمارە /٨ ـ سەرچاوە/٧٤ باسـێکی ...یعە بڵاوکراوەتەوە لە زمانی ئیتاڵیەوە کراوە بە کوردی کە ئەو باسە بە ئیتـاڵی ...ە سـاڵی ١٩٧٨دا لـە گۆڤـاری (ڕۆژهـەڵاتی تـازە)ی ژمـارە / ١١، لەلایــەن ژنــە ...یتاڵیەکـەوە (Mirella Galleti) بڵاوکراوەتــەوە لـەژێرناوی (کوردسـتان لــە سەرچاوە ئیتاڵیەکانا، لە سەدەکانی (١٣هەتا١٩) لەو باسەیدا وتوویەتی:

(ساتێك زینفون لە ساڵی ٤٠١ ی پێش زایین بـە خـۆی‌و دەهـەزار سـەربازەوە شـکاو بـەناوخاکی کوردسـتاندا پاشەکشـەی کـرد، لــەو کتێبــەیدا بــەناوی ...کتاباسیس) بڵاوی کردۆتەوە، لەوەدا ناوی کوردی بە (carduchi) نـاو بـردوە، بـەڵام (بولیبـوس) لـە سـاڵی ٢٠٠یـا ٢١٠ی زایـنـدا لــە کتێبەکـەیدا :(polibus Historiae. V.52.5) کوردەکـانی بـە نـاوی (cirti) نـاوبردوەو (سـترابون) لــە ساڵی ٦٤ ـ ٦٣ی پێش زایندا لەو نەخشە جوگرافیایـەی بـڵاوی کردۆتـەوە نـاوی کوردی بە (Kyrtioi) ناوبردوە (بەڵام بلـەچ شـیرکوە لـە کتێبەکـەیدا سـەرچاوە ٦٠ وتویـە سـترابوون (کەبـە ئیسـترابون نـاوی بـردوە)، لـە کتێبەکـەیدا کـوردی بە( Gutu گوتو) ناوبردوە).

ژنە ئیتاڵیەکە لە باسەکەیدا، سەرچاوە/٧٤ وتوویـەتی : (titus livius) لـەو کتێبـەیدا لـە سـاڵی ٥٩/ی پێش زایـین نوسـراوەو لـە ڕۆمـا چاپکراوە، کــوردی بە(cirti سیرتی) وەیا بە (Elimei) ناویردوە، بەڵام هەمان نووسەر لە کتێبێکـی تردا ـ کتێبی ژمارە /٤٢، لەوەدا کوردی بە (Kirti) ناویردوە.

دەرچوونی کتێبەکەی زینفون بووبە هۆی بڵاوبوونەوەی ناوبانگی کوردو لەوە دواوە چۆن لە نزیك شاری (زاخۆ)ی ئێستادا تووشی ئەو کوردە کێوی‌یانە بوتەوە کە پەلاماری هێزەکەیان دابوو وهەموو جۆرە ڕێبازێکی شەڕی چەتەگەری‌یان دژی کردبوو بەتەواوەتی بێزارو هەراسانیان کردبوو ئەوەندە گورج وگۆڵ و لەش سووك بوون و خۆیان نەداوە بە دەستەوەو خۆیان دەربازکردووە، لەکاتێکدا هەموو چەکەکانیشیان بریتی بووە لە تیروکەوان کە تیرەکانیان بە درێژایی دووبال دەبوون و ئەوەندە کاریگەر بوون قەڵغانیان دەسمی و کونیان دەکردو، وەختێکیش لە کوردستان ڕزگارمان بوو هەناسەیەکی شادمانی و خۆشیمان هەڵکێشا کە بۆ ماوەی حەوت ڕۆژی بێ وچان پەلاماریان ئەدایین کە بە وڵاتەکەی خۆیان دەوت (کاردوکی).

ژنە نووسەرە ئیتاڵیەکە ئاماژەی بۆ هەندێ سەرچاوەی مێژوویی کردووە وەکوو کتێبەکەی (ابن خلدون) بەناوی (العبر) کە لە لاپەڕە/٤٦١ی جلدی دوهەم و لاپەڕە /٤١٣ی جلدی سێ‌هەمدا باسی مەغۆلەکانی کردووە چۆن کوردە موسوڵمانەکانیان تالانکردووەو کوشتاریکی زۆریان لێ کردبوون و لە ئەنجامیا هەندێ لە عەشیرەتەکانی کورد بەناچاری ڕوویانکردبووە میصرو سوریاو جزائر.

بێجگە لە کتێبەی ابن خلدون (میریلا گالیتی) ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (فون مولتکی) کردووە کە جەنراڵێکی پرووسیی بەکرێگیراو بووە لەناو سوپای عوسمانیداو کارویاری ڕێکخستنی هێزەکانی تورکی پێ سپێردراوەو بەشدار بووە لە هێرشەکانی سوپای عوسمانی بۆ سەر کوردستان (لەبەشی هەڵوەشانەوەی ئەمارەتەکانی باکووری کوردستاندا لە باسی هەڵوەشانەوەی ئەمارەتی بۆتاندا باسی مولتکە دەکرێت چۆن لە سوپای عوسمانیدا دژی کورد کاری کردووە).

میریلا گالیتی لە لاپەڕە /٢٥٦ی کتێبەکەیدا باسی (مارکۆپۆلۆ)ی کردووەو وتوویەتی شارەزاییەکی زۆری هەبووە دەربارەی چیاکانی کوردستان و وتوویەتی کوردەکان میللەتێکی شەڕکەرو ماتن و وڵاتەکەیان جیاوازە لە وڵاتی فارس (لە ڕاستیدا ئەو بۆچوونەی مارکۆپۆلۆ لەگەڵ بۆچوونی ژمارەیەکی زۆری گەڕیدەی تر کەبە کوردستانا گەڕاون یەك ناگرێتەوە کە کوردیان بە میللەتی ڕووخۆش و حەز بە گاڵتەو گەپ و شیعرو فۆلکلۆر باسکردووە وەکوو لە باسەکانی داهاتوودا و

ـە شوێنی خۆیدا سەرنجی ژمارەیەکی زۆر لــە گـەڕیدەکان لـەو ڕووەوە دەکەوێتــە
ـەرچو.

حوسـەری سەرچاوە /٧٤ باسی گەڕیدەیـەکی ئیتـالیی تـری کـردووە کـەناوی
ڕیکۆمو دلمونتیکروچی) بووە کە لە نێوانی سالآنی ١٢٤٢ ـ ١٣٢٠ زاینیدا ژیاوە
ـە کتێبەکەیدا کە لە (ڕۆما) چاپکراوە وتوویەتی :(curtorum ـ مەبەستی کـورد
چوە) زۆر حەز لـە شـەڕ دەکـەن‌و دڕتریـن شـەعبە لەوهـەموو ناوچانـەی پیایانـا
گەڕوە)).

سریا بدرخـان لـە سـەرچاوە /٧٩دا ئامـاژەی بـۆ کتێبەکـەی (هـیرۆدۆتس)
کردووە کە بە نەتەوەیەکی شەڕکەر ناوی بردون کە بـە (کەردەکـە carduoues)
ـوی بردوەو وتوویەتی کوردەکان بەخۆیان وتووە (Gutus) کە مانای شەڕکەری
گرتوتەوە.

سریا بدرخان لە باسـەکەیدا وتوویـەتی : بەرلـە هـاتنی ئیسـلام، لـە سـەدەی
شەشەمی پێش زایندا، کوردەکان بە سـەرکردایەتی ( Gootenza گوتـانزا) کـە
ســەرۆکی عەشـیرەتی ( Gouren ــ گـوران) بـووە حکومـەتێکیان پێکـەوەنا لـە
نەورێزەوە هەتا کرمانشاه دەستی ئەڕۆی‌و دەسەلآتدار بووە، بەلآم دوای ئەوەی
ئاینی ئیسلام لە سەدەی حەوتەم‌و هەشتەمی زایندا بلآوبووەوە، ئیتر کورد نـەك
تەنها دەسەلآتی سیاسی خۆی لەکیس چوو، بـەلکو وازی لـە ئاینەکـەی خۆیشـی
هێنا (مەبەست زەردەشت بووە)و چوەسەر ئاینی ئیسـلام تەنـها (یزیـدی)یـەکان
لەسەر ئاینی خۆیان مانـەوە کـە زەردەشـتی بـوون (Zaroazre Vien).(بـەلآم
بەداخەوە سریا بدرخان نەیوتووە ئەمەی لە چ سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووە).

دوکتۆر ئەحمەد عوسمان لەو باسەیدا لە گۆڤاری کۆڕی زانیـاریدا، سـەرچاوە
٧٢، ئامـاژەی بـۆ کتێبەکـەی (درایڤـر) کـردووە (The name Kurd and
philogica) کـە درایڤـر وتوویـەتی لای وایـە ووشـەی کــورد لــە بنــەڕەتدا لــە
فارسیەوە هاتووەو لەوانەشە هاویەش بێت لەگەڵ ووشەی (Gordo)ی بابلیدا کە
مانـای ئـازاو شـەڕکەر بـووە بـە زمـانی بـابلی‌و وشـەی بابلیـە لـە فارســەکانەوە
گەیشتوە بە عەرەبەکان.

(لام وایە بۆ ئەو بۆچوونەی درایڤر کە دوکتۆر ئەحمەد عوسمان باسی کردووە لەگەڵ بۆچوونێکی تری درایڤردا یەك ناگرێتەوە کە بەرلەمە لە باسەکەی ئەمین زەکیدا ئاماژەی بۆ باسێکی درایڤر کردووە کە وتوویەتی:

ووشەکانی کاردا، کاردوخی، کورتوخی، گورتی، کارداك، سیرتی، کیرتی، گوردیای.. و ئەوانی تر هەموویان هەر یەك مانا دەگرنەوە کە زینفون باسی کردووەو ئەمە دەری دەخا پەیوەندیەکی زۆر بەهێز هەیە لە نێوان ووشەی کوردی ئێستەو (کورتی) کۆنو بەپێی ئەو بۆچوونە ووشەی (Gordo) نابێ ووشەیەکی بابلی بووبێتو لە بنەڕەتدا فارسیش بووبێت).

دوکتۆر ئەحمەد عوسمان لەوە دواوە وەکوو چۆن عەرەبەکان بە شەعبی (فارس)یان وتووە (فرس)، بەوجۆرەش ووشەی (گورد)یش کە مانای شەڕکەرو ئازا دەگەیەنێت کراوە بە کوردو لەوانەشە ووشەی (کورد) لە (کاردا)ی بابلیەوە وەرگیرابێت.

ابن الاثیر لە کتێبەکەیدا (الکامل في التأریخ)لە لاپەڕە ٩٣یداو طبری لە لاپەڕە /٢٦٢ی کتێبەکەی (تأریخ الرسل و الملوك)هەردوکیان باسی ئەوەیان کردووە کە ساتێك (نمرود)و تاقمەکەی ویستبویان ئیبراهیم پێغەمبەر بسووتێنن، ئەوی فەرمانی سووتانەکەی دەرکردبوو ناوی (هێزن)بووەو لە دەمی (شعیب الجبلی)یەوە بیستویەتی گوایە ئەو هیزنە کورد بووە.

طبری لە لاپەڕە /٨١٧ی هەمان کتێبا وتوویەتی (ئەردەشیر بابك) نامەیەکیلە (ئەردەوان)ەوە پێگەیشتبوو، ئەردەشیر خەڵکی کۆکردبووەوەو ئەو نامەیەی بۆ خوێندبوونەوە کە ئەردەوان بە ئەردەشیری ووتبوو: ((ئەی دانیشتوانی ناو ڕەشماڵی کورد تۆ لە ڕەوشتی خۆت لاتداوەو بە دەستی خۆت بۆ مردنی خۆت دەگەڕێی، ئایا کێ ڕێگەی بەتۆ داوە ئەو تاجە بکەیتە سەرتو ئەو وڵاتە بخەیتە ژێر دەستی خۆتەوە؟)).

* * *

دوکتۆر ئەحمەد عەسمان دەربارەی ئەو نامەیەی ئەردەوان بۆ ئەردەشیری ناردوە، وتوویەتی دەبێ ئەردەشیری بابکی دامەزرێنەری دەوڵەتی (ساسان) کورد بووبێتو لە ئەنجامی ئەو نامەیەدا ئەردەشیر دژی ئەردەوانی پێنجەمی

ـسكى (ئەشكانى) ياخى بووەو شەڕى لەگەڵ كردووەو لە ساڵى ٢٢٤ى زايندا حەمەيـ سەركەوتووە.

ـمەرى)ش لە كتێبەكـەيدا وتوويـەتى : ساتێك (بهرام چوبين) دژى (كسرى ـحەمى) مـەليكى ساسـانى ڕاپـەڕيبوو، كسـرى لـە دەوروو پشـتەكەى خـۆى ـپرسيبوى ناخۆ ئەو (بهرام)ە كێيە؟ لە وەرامدا پێيان وتوبوو برايەكى هەيە ناوى ـكيرـ)ە كە هێشتا دڵسۆزو لايەنگرى (ئەبرۆين)ە.

ـينورى لە لاپـەڕە /١٦١ى كتێبەكـەيدا (الأخبـار الطـوال)كـە بـۆ باسـى بـاوو ـپيرـمى شاكانى ئێرانى تـەرخانكردووە وتوويـەتى:((شـياوس (لـەناو كـوردا بـە ـسيومحش بەناوبانگە) كوڕى كيكاوسـى كـوڕى قوبـاد ڕايكـردو چـوە نـاو ولأتـى ـتركەوە كچى مەليكى توركى مارە كـرد، زۆرى پێـنـەچوو ئـەو مەليكـە زاواكـەى خۆى كوشت (كـە مەبەسـت شياوسـە)و كچەكـەى خۆيشـى بـە سـكى پـڕەوە لـە ـترسى باوكى خۆى دەربـاز كـردو منداڵێكـى بـوو نـاوى نـرا (كەيخسـرەو)، لـەناو ـچيـكانى كوردا ئەو كوڕە گەورەو پەروەردە بوو)).(ئەو شياوسە كە لە ناو كوردا ـە سياوەحش بەناوبانگەو ئەوترىٚ بوو بە خوێنى شـياوەحش مەبەسـت ئەوەيـە ـكوشتنى سياوس ئەو ناكۆكيە نەكوژايەوەو درێژەى كێشا).

ـوكتۆر جەمال نەبەز لە لاپەڕە /١٠ى كتێبەكـەيدا سـەرچاوە /٩٤ بەرپـەرچى ـەوجۆرە بۆچوونانەى داوەتەوە هەروەكوو چۆن ئەمين زەكى ئەوجۆرە باسانەى ـەو سـەرچاوە عربيانـەدا بلأوكراونەتـەوە بـەجۆرە ئەفسـانەيەكى لەقەڵـەم داوە، ـوكتۆر جماليش لەو سەرچاوەيەوە بەرپەرچى هەندىٚ لەو باسـايانەى داوەتـەوە كـە يـەكێكى وەكـوو (مسـعودى)و لـە(التنبيـه و الأشـراف)دا بنەچـەو ڕچەڵـەكى كوردى بردۆتـەوە سـەر عـەرەبو لـە كتێبێكـى تريشـدا (مـروج الذهـب ومعـادن لجوهر) بنەو ڕچەلەكى كوردى بردۆتەوە سەر ئەو گەنجانەى لە ترسى سەربڕينو مێشك دەرهێنانى ئەژدەهاكەوە، بەهۆى دوو چێشتكەرى خێرخواى (زوحاك ـــ ـەژدەهاك)ەوە دەربازبوونو دابوويانە كەژوكێو.

فيردوسى لـەو شـانامەيەى لەلايـەن (Joonnes Augustusvullers)ەوە ـلأوكراوەتەوە، لە هەڵبەستى ٣٧ و ٣٨دا بـەم دوو دێڕە شيعرە باسـى كـوردى كردووە:

| | |
|---|---|
| کنون کرد زآن تخمه دارد نژاد | کز آباد نیاید بدل برش یاد |
| بود خانهاشان سراسر پلاس | ندارند دردل زیزدان هراس |

دوکتۆر جمال نەبەز بێجگـە لـەو سـەرچاوەیەی پێشـووی، لـە کتێبێکـی تریـا سەرچاوە /٣١، لاپەڕە /٣٧یدا چـەند نموونەیـەکی هێناوەتـەوە بـۆ ئەوانـەی بـە نیازێکی ناپاکیو نەزانیو بە هاندانو راسپاردەی دوژمنانی کورد شتیان نوسیوە دەربارەی کوردو رەگەزی کورد کـە ئەمـەی خـوارەوەی کردووە بـە یـەکێك لـەو نموونانە کە وتوویەتی:

((مامۆسـتایەکی ئـەڵمانی پـیّی ووتم : کوردەکـان دڕنـدەو سـەرەتایینو بـێ مێژوو وبێ کولتورنو ئەم راستیەم کاتێك بۆ روون بووەوە لە ئەستەمبولْ دۆستە تورکەکانم زۆریشیان دەربارەی کورد بـۆ گێڕاوەمەتـەوەو سـاتێك منیـش (دوکتـۆر جمال)لیم پرسی : ئایا هیچ کـاتێك خـۆی بـە زمـانو وێـژەی کـوردەوە خـەریك کردووە؟ لە وەرامدا پێی ووتم ئارەزووی شتیوا ناکـەم.... سـاتێك لـە مامۆسـتا ئەڵمانیەکەم پرسی ئەوەی لە دۆستە تورکیەوە بیستویەتی چیبووە؟ لە وەرامدا وتـی : خـۆ شـتەکە ئاشـکرایە کـە هـەموو کـورد هـەر جـەردەو قاچـاخچیی حەشیشەن ! !)).

دوکتۆر جمال لە باسەکەیدا دەپرسیّو دەڵێ : تۆ بڵێی ئـەم کـابرا ئەکادیمیـە هێندە نەفام بێتو نەزانێ لە هەموو دنیادا نەتەوەیەك نیە بێ مێژوو بێت؟ هەتا قەرەجو هیندیە سـوورەکانیش مێـژووی خۆیـان هەیـە... تـۆ بڵێـی ئـەم کابرایـە باوەڕ بەوەنـەکا ئێمـەی کـورد وێژەیـەکی خـەملاّو گەشـە کـردوو، مۆسـیقایەکی شیرینو هونـەرێکی میللـی پێشـکەوتوومان هەیـە؟ تـۆ بڵـیّی ئـەم کابرایـە لـەوە نەگەیشتبێت چەتەگەرییەکی یەکە یەکەو لێرەو لەوێی سەدەکانی رابوردوو نابێ بکرێ بە پێوانەو پێناسەی رەوشتو خووی میللەتێك لەم سەدەیەدا؟

ئەگەر جەنابی پرۆفیسۆر لە بانك بڕیـنو پـەلاماردانو دەسـتدرێژی کـردن بـۆ سـەر ژنـانو کوشـتنو رووتکردنـەوەو بازرگـانێتی تلیـاکی رۆژانـەی وڵاتەکـەی بێخەبـەرە، بـاش وایـە تەنـها جـارێك رۆژنامـەکانی (Bildzeitung) و (Abendzeitung) یا (Morgen post)ی برلینی بخوێنێتەوە وەکوو ئەوەی لـە مانگی ئابی /١٩٧١دا چۆن رۆژنامەکان بڵاویان کردبووەوە تـاقمێکی بـانك بڕ لـە

تی میونیخ هەموو دانیشتوانی شارەکەیان تۆقاندبوو، ئەگەر ئەم راستیانە لای حەتمی پروفیسۆر ئاشکرا نین‌و سەریان لیّ دەرناکا، دیارە شایانی ئەوە نیە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتاییش بێت چ جای زانستگە.

دوکتور جمال لە لاپەرە / ۳۹ی هەمان سەرچاوەدا نموونەی پێچەوانەی نموەی پێشووی باسکردووە کە ساتێك (Herbert Rittinger) ویستبوی بچێت بۆ کوردستان، رۆژهەلاتناسێك نەسیحەتی کردبوو نەچێت چونکە کوردەکان زۆر سەرمتاین بەلام ئەو ترس دای نەگرت‌و ساتێك گەڕایەوە گەشتنامەکەی کۆمەڵێکی تر بوو باسەکەی قورێك بوو سووی بەدەمی ئەوانەدا بوختانیان بۆ کورد دەکرد.

دوکتور جمال نەبەز لەو باسەیدا بەرپەرچی بۆچوونە بێ بنج‌و بناوانەکانی دوکتور مکنزیشی داوەتەوەو لە کۆتاییدا وتوویەتی : دوژمنان زۆرن... دەستەوخۆو ناڕاستەوخۆ... دەی سا چیبکەین...؟ واز لە کوردایەتی خۆمان بێنین‌و خۆمان بتوێنینەوە؟ کۆڵ بدەین‌و واز لەو داوایەمان بێنین کە ئێمەش نەتەوەیەکین‌و مافی خۆمان هەیەو دەمانەوێ ئازادانەو بە سەربەستی بژین، یان هەر بە دیلی‌و نۆکەری وەکوو مرۆڤی دەرەجە دوو بژین هەروەکوو رۆژنامەنووسی ئەلمانی (Rolf w. Schloss) بێ شەرمانە پێشنیازمان بۆ دەکا؟!

## بەشی دوهەم

## کوردستان بەشێوەیەکی گشتیو باکووری کوردستان بەتاییەتی )

أ ـ جوگرافیای کوردستانو ڕوو پێوانەی کوردستان.

ب ـ سەرژمێری کوردو عەشیرەتەکانی باکووری کوردستان.

ج ـ زمانی کوردیو شێوەکانی.

د ـ ئاینی کورد.

ه ـ ڕەوشتی کورد.




نەخشەی کوردستان




**نەخشەی کوردستان**

## أ ـ جوگرافیاو ڕووپێوانەی کوردستان :

دەربارەی جوگرافیای کوردستان و ڕووپێوانە (مساحە)ی کوردستان کێشەیەکی زۆر هەیەو داگیرکەرانی کوردستان هەمیشە تەقەلای ئەوەیان داوە لە هیچ کتێبو نەخشەیەکی جیهاندا باسی کوردو نەخشەی کوردستانی تیادا نەهێنرێت و گەلێك سەرچاوەش بەبیانووی ئەوەی کورد لەناو خاکی خۆیدا نەخشەیەکی سیاسی نیەو هەرپارچەی بە بەشێك دەژمێردرێت لە خاکی ئەو وڵاتانەی دەستیان بەسەر ئەو بەشەی کوردستاندا گرتووە باسی نەخشەی کوردستانی پشت گوێ خستوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نووسەرو زاناو لێکۆڵەرەوەی بێگانەی واش هەبووەو هەیە تەقەلاکانی دوژمنی کورد کاری تێ‌نەکردون و هەریەکەیان بە پێی شارەزابوونی خۆی دەربارەی جوگرافیای کوردستان دواوەو بەرپەرچی ئەو درۆو دەلەسانەیان داوەتەوە کە دژی کورد بڵاوکراوەتەوە.

لەم باسەدا هەوڵ ئەدەم لەو سەرچاوانە بدوێم بە شێوەیەکی زانیاریانە باسی جوگرافیای کوردستانیان کردووە، کە بێگومان ناتوانرێ باسی جوگرافیای باکووری کوردستان لە هەموو جوگرافیای کوردستان جیا بکرێتەوە:

باسیل نیکتین لە کتێبەکەیدا سەرچاوە /٥٤ دەربارەی جوگرافیای کوردستان وتوویەتی : کوردستان لە باکوورەوە ناوچەکانی ئازربایجان و لە ڕۆژئاوایدا عراقی عربی و لە باشووریدا خوزستان و لە ڕۆژهەڵاتیا عراقی فارسی بووە بەپێی کتێبەکەی (قزوینی) کە (نزهة القلوب)ە، چاپیساڵی ٧٤٠ی کۆچی، وتوویەتی لە سەدەی چوارەمی زایندا کوردستان بریتی بوو لە (١٦) قەزای ئیداری و هەموو مێژوو نووسەکان لەسەر ئەوەن ئەو ووشەی کوردستانی فارسی‌یە هەرئەوەیە عەرەبەکان پی‌یان ووتووە (مقاطعة الجبال)، بەڵام بەشەکەی کوردستانی ئیمڕۆ کەوتۆتە ناو چوارچێوەی سنووری تورکیاو عراقەوە. لەدوای هاتنی مەغۆلەکان و هێرش بردنیان بۆ سەر کوردستان، کوردستانی ئێران مایەوە سەر ناوچە شاخاویەکان و پاش ئەوە فارسەکان همدان و لورستانیان خستەژێر دەسەڵاتی خۆیانەوەو مایەوە سەر (ئەردەڵان) کە پایتەختەکەی (سنندج ـ سنە) بووە.

له کۆتایی سەدەی حەفدەهەمدا عوسمانیەکان ووشەی کوردستانی تورکیایان بە یەکێك لە ویلایەتەکان ناوبردوە کە (درسیم)و لیوای (موش)و دیاربکر بووە.بەڵام ئیمڕۆ کورد لەناو خاکێکی فراواندا دەژی کە لەنزیك بغدادەوە دەس پێدەکاتو لە دەورووبەری (مندلی)یەوە بە درێژایی سنووری ئێرانو عراق بەرەو باکور دەچێتو بەناو خاکی ئێرانو تورکیادا دەڕوا هەتا دەگاتە چیای (ئارارات).

ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە /٣٢دا ئاماژەی بۆ نەخشە جوگرافیاییەکەی (مارك سایکس) کردووەو وتوویەتی بە پێی یاداشتەکەی (سن مارتن) باسی ولاتی (کوردوئین) کراوە کە (کوردچیخ)یشی پێ وتراوە کە بەزمانی ئەرمەنی مانای خاکی کورد دەگرێتەوەو بە زمانی (چرکسی)یشی پێی وتراوە (کرد چیکو) کە کەوتۆتە نێوان ناوچەی (واسپورکان ــ وەرگێری کتێبەکەی ئەمین زەکی محمد علی عونی وتوویەتی واسپورکان ناوچەیەکی ئەرمەنی بووە)و لە خوارویدا ناوچەی ئاشور بووە.

بەڵام لە کتێبی (مێژووی ڕۆژهەلاتی کۆن)دا نوسینی (نورمان) وتراوە شوێنی کورد لە خلیجی فارسەوە هەتا دەریاچەی (قزوین)ە.

لێکۆڵەرەوەی بەناوبانگ (مستر Lestrange) لە کتێبەکەیدا (The loads of the Eastern caliphate) چاپی لندن ساڵی١٩٠٥ وتوویەتی ولاتی کورد لە پێنج ناوچە پێك هاتووە : خوزستان ، شاخەکان ، عراق، ئەران (موکان ــ موقان)و ئازربایجان. ئەمین زەکی لە باسەکەیدا وتوویەتی ووشەی کوردستان بۆ یەکەم جار لەلایەن سەلجووقیەکانەوە بەکارهێنراوەو چوارچێوەی سنوری کوردستان بە پێی دەسەلاتی داگیرکەران کەمو زیادی کردووە.

بە پێی کتێبی (نزهة القلوب في المسالك والممالك )ی (حمدالله المستوفي) مێژووناسی بەناوبانگ لەو کتێبە فارسیەیدا وتوویەتی شاری (بەهار) کە هەشت میل لە همدانەوە دوورە پایتەختی مقاطعەی کوردستان بووەو لە دواییشدا شاری (سلطان ئاباد) کراوە بە پایتەختی (لە پەراوێزی لاپەرە/٥ی کتێبەکەدا وتراوە سوڵتان ئاباد چم چماڵی ئێستە بووە.

بە پێی کتێبەکەی حمدالله المستوفي کوردستان بریتی بووە لە (١٦ ناوچە)، کە وەرگێڕی کتێبەکەی ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەرە /٦ی کتێبەکەی ئەمین

زەکیدا ناوەکانی ئەو ناوچانەی بەم جۆرە ناو بردوە :(ئالانی، ئالیشتار، بهار، خفتیان، دربندی تاج خاتون، دربندی زنگی، داریرلو، یزبیل – وتوویەتی راستیەکەی زبیل بووە، دینور، سلطان ئاباد، شهرزور، کرمنشاه، کرندو خوشان، کنکور، ماهی دشت، واسطام ـ بهستون).

ئەوی لەو پەراوێزەدا دەری ئەخا ئەو ناوچانە بریتی بوون لەوانەی رۆژهەلاتو باشووری کوردستاندا بوونو ئامارە بۆ ناوچەکانی باکور نەکراوە لەگەڵ ئەوەی (میستر Lestrange)یش یەك ناگرێتەوە کە باسی پێنج ناوچەی کردووە.

ئەمین زەکی لە لاپەڕە / ٩ی کتێبەکەیدا دوبارە باسی ئەوەی کردووە کە سنوری کوردستان بەپێی دەسەلاتی داگیرکەران گۆڕدراوەو بۆ نموونەی ئەوە وتوویەتی : بەر لە شەڕی قرم (لە نێوان عوسمانیو روسدا) کوردستان (مەبەستی ئەوەی ژێر دەسەلاتی عوسمانی بووە)بریتی بووە لە لیواکانی (وان، هەکاری، بایزیدو موصل) بەلام دوای ئەو شەڕە ئەو ناوچانە بەسرانەوە بە (ئەرزڕۆم)ەوە.

ئەگەر لە زەمانی عوسمانیدا هێڵێك بکێشرایە کە لە (قارص)ەوە دەستی پێ بکرایەو بە ئەرزڕۆمو ئەرزنجانو دەرسیمو خربوطدا برۆشتایە تا دەگەیشتە دیاربکرو لەوێوە بە درێژایی روباری دجلە برۆشتایە هەتا (جبل حمرین)، دەتوانرا ئەوە بە هێڵی رۆژئاوای کوردستاندا دابنرێت.

ئەولیا چلبی لە گەشتەکەی ساڵی ١٠٦٥ی کۆچیدا /سەرچاوە /٥١ ولاتی ئەرزڕۆم (ئەرزن ڕۆم)ی بە سنوری باکووری کوردستان داناوە کە لە وێوە بە شارەکانی: وان، هەکاری، جزیرە، عمادیە، درتنگ تێپەڕ دەکات تا دەگەیتە بصرە کە درێژاییەکەی (٧٠) قۆناغو پانتاییەکەی لەوە کەمتر بووە.

دوکتۆر جەمال نەبەز لە لاپەڕە / ١٧ی سەرچاوە/ ٩٤دا وتوویەتی:((بەلای کەمەوە لە سەدەی دوازدەهەمدا لە لایەن سوڵتان (سنجەر)ی سلجوقیەوە بە شێوەیەکی رەسمی دان بە بوونی نیشتمانی کوردا نراوەو ناوی کوردستان بە درێژایی سەدەکانی ١٦ـ٢٠ لە ئەدەبیاتی سیاسیو ناسیاسیی دەوڵەتی قاجاریو عوسمانیو قەیسەری روسیاو ئەوروپای رۆژئاوادا ناوی هاتووەو لە سەدەی شازدە بە دواوە چەند نەخشەیەکی کوردستان لەلایەن ئەورووپییەکانەوە

کێشراوه که یەکێك لەوانه ئەو نەخشەیه لەلایەن (A. lafvreri) ی ئیتاڵیەوه له ساڵی ١٥٦١دا و نەخشەیەکی تر لە سەدەی حەڤدەدا لەلایەن جوگرافیا زانی فەرەنسی (Guillau Mede La Croyere) کە لە نێوان ساڵانی ١٦٧٥ ــ ١٧٢٦ دا ژیاوه کێشراوەو ووشەی کوردستان لەلایەن دپلۆماتو گەشتوەرەکانی ئەوروپاوه له سەدەی شازدەهەمەوه بەکار هێنراوه.

کوردستانی ئیمڕۆ به نیشتمانێك دادەنرێت که زمانو کلتوری تایبەتی خۆی هەیە، بۆ وێنە لەو داخوازیەدا کە دوو سناتوری بەلجیکی (خانم Ven Puymbroeck) و (P. Ven Roye) له ١٩٨٥/٧/١٧دا دابویان به حکومەتی بەلجیکا بۆ ئەوەی دەسدرێژی کردنی رژێمی تورك بەرامبەر کورد بخرێتە بەرچاوو سنورێك دابنرێت بۆ ئەو دەستدرێژی کردنە، لە پێشەکیی داخوازیەکانیانا دەربارەی کوردستان ووتویانە:((کوردستان وڵاتێکە لەسەر نەخشەی جیهان دەستنیشان نەکراوه، بەڵام له رووی زمانو کلتورەوه بەیەکەوه بەستراوەو ژمارەی کورد نزیکەی ٢٥ ملیۆن دەبێت. کوردستان دەکەوێتە ناوجەرگەی ئاسیای ناوەڕاستەوەو رەنگە بێشکەی شارستانێتی ئێمەش بێتو نزیکەی چوار هەزار ساڵێك دەبێ بەو ناوەوه یا بە ناوێکی ترەوه ناسراوه)).

مارسیلا گالیتی لە کتێبەکەیدا، سەرچاوه/٧٤ دەربارەی جوگرافیای کوردستان هەوڵی داوه وەکوو سەرچاوەکانی تر باسی هەندێ ئەمارەتی کوردی کردووه که وتوویەتی کوردستان کراوه به پێنج ئەمارەتی گەورەی ئیسلامیەوه کە لە ژێر دەسەڵاتی (بابی عالی) دایەو هەندێکی تریش لە ژێر دەسەڵاتی فارسیدایەو ئەوانەی ژێر دەسەڵاتی بابی عالی بریتین لە : بدلیس، جزیرە ــ کەلای هەندێ لە شارەزایانی جوگرافیا به مەملەکەتی (Bolimi ــ کە مەبەست جزیرەو بۆتانه) ناسراوه، ئەمارەتی عمادیە، ئەمارەتی جۆڵەمێرگ، ئەمارەتی قەڵاچوالان (مەبەستی بابان بووه) کە دەتوانرێ لەو ئەمارەتانە (١٢) هەزار چەکدار پێك بێت.(لام وایه ئەو کتێبەی سەرچاوه/٧٤ هەرچەندە وتراوه له رۆما ساڵی ١٩٧٨ چاپکراوه، بەڵام واسیاره بەرلە ماوەیەکی زۆر نوسراوەو ئامادە کراوه بۆ بلاوکردنەوه، چونکە باسی زۆر رووداوی تیادا کردووه بەر لە ساڵی ١٩٧٨رویداوه، جگە لەوه وادیاره زانیاریش دەربارەی ئەمارەتەکانی کورد

هەرئەوەندە بووە کە ناوی هێناون و گەلێك ئەمارەتی تریش هەبووە ناوی نەهێناون).

ماریلا گالیتی لە باسەکەیدا وتوویەتی کوردەکان لەناو خۆیانا لەسەر سەرکردایەتی ناڕێکن و یەك ناگرن. لە لاپەڕە/٢٩٠ی ئەو سەرچاوەدا ماریلا باسی گەڕیدەیەکی کردووە ناوی (Agostino March) بووەو لە نێوانی ١٨٠٥ ـــ ١٨٧٥دا ژیاوەو کتێبی دەرکردووە دەربارەی گرنگێتی کوردستان لەڕووی بازرگانیەوە (لام وایە ئەم سەرچاوەیە تاکە کتێبە کە باسی گرنگی کوردستانی کردبێت لە رووی ستراتیژی بازرگانیەوە) کە ووتویە:((لەدوای ئەوەی لە دەریادا رێگەی (رأس رجاء الصالح ــ خوارووی ئەفریقا) دۆزرایەوە، ئیتر بایەخدان بە کوردستان لە رووی رێگاوبانی هاتوچۆکردنی بازرگانیەوە بەناو کوردستانا کەم بووەوە چونکە دوای ئەوە ئیتر پێویستی بەوە نەما ماڵی بازرگانی کە لە دەریای سپیەوە دەهات ناچاربێت بەناو خاکی کوردستانا بەوڵاغ و کەرو ئێستر بگوێزرێتەوە بۆ رۆژهەڵات)).

ماریلا گالیتی ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (جوزیب کامباتلی) کردووە بەناوی (مێژووی ناوچەکانی کوردستان) کە لە نێوان ساڵانی ١٧٦٢ ــ ١٨٣٥دا ژیاوەو ئەو کتێبە لە ساڵی ١٨١٨ لەشاری (ناپولی) چاپکراوە کە بە یەکەم کتێب دەژمێرێت هەتا ئەو سەردەمەی ئەو کە هەموو کتێبەکەی تەنها بۆ کوردستان تەرخان کرابێت لەلایەن نووسەرێکی بێگانەوە.

دەربارەی جوگرافیای کوردستان، دریە محمد علی عونی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە /٣٥ ئاماژەی بۆ باسیکی (طبری) کردووە کە وتوویەتی هارون الرشید لە ساڵی ١٧٤ی کۆچیدا کە چۆتە (باقردی)و (بازیدی) لەوێ کۆشکێکی دروست کردووەو شاعیرێك دەربارەی ئەو کۆشکە وتوویەتی :

بقردی وبازیدی مصیف مربع وعذب یحاکی السبیل برودة
وبغداد ما بغداد أما ترابها فجمر وأمّا حرها فشدید

(لە راستیدا ئەو دوودێڕە نە لە کێش و نە لە قافیەدا لەگەڵ یەکتردا رێك ناکەون و دووریش نیە هەر دێرە هی شیعرێکی جیاواز بووبێت) یاقوت الحموي لە (أبن الأثیر)ەوە وەری گرتووە کە وتوویەتی وڵاتی بقردا بەشێکە لە

ولاتی جزیرەی ابن عمر کە لە ٢٠٠ شارو دێهات پێك هاتووە. دریە محمد علی عونی ئەلی:

نیشتنەوەی کەشتی نوح لەسەر چیای جودی لە قورئاندا باسی کراوە: (واستقرت علی الجودي) دەربارەی رووپێوانەی (مساحە)ی کوردستان چەند سەرچاوەیەك باسیان کردووە.دریە محمد علی عونی رووپێوانەی کوردستان بە پتر لە (٥٠٠)هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەی داناوەو وتوویەتی: (رامبو)ی کاتبی فرنسی ئەو ژمارەیەی بە (٥٢٠) هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیی داناوە.

بەلام ولید حمدي الأعظمي لە کتێبەکەیدا سەرچاوە /٢٣ رووپێوانەی هەموو کوردستانی بە (٤٠٩٦٥٠)کیلۆمەتری چوارگۆشەیی داناوەو وتوویەتی لەو ژمارەیە (١٩٤٤٠٠) کیلۆمەتری لە باکووری کوردستاندایەو بەرزترین چیای کوردستان بریتیە لە چیای ئارارات کە لای کوردەکان بە چیای ئاگری بەناوبانگەو لای ئەرمەنیەکان بە شوێنێکی زۆر پیرۆز دادەنرێتو پێی دەڵێن (ماسیس).

چیای ئارارات دەکرێ بەدوویەشەوە : ئاراراتی گەورەو ئاراراتی بچووك‌و بەرزترین لوتکەی دەگاتە (٥١٦٨)مەتر لە ئاراراتی گەورەداو لە ئاراراتی بچووکدا بەرزترین لووتکەی (٣٩١٤)مترە بەلام عبدالرحمن قاسملو لەسەرچاوە /١٦دا بەرزایی چیای ئاراراتی بە (٥٢٢٨)مەتر داناوە وە لەدوای ئەو چیای (ڕەشکۆ)یە لەناوچەی (جیلو) کە بەرزاییەکەی (٤١٦٨) مەترەو بەرزایی ئاراراتی بچووك (٣٩٢٥) مترە کە جیاوازیەکی ئاشکرا هەیە لەگەڵ ئەوەی ولید حمدیدا.

دەربارەی گۆلەکانی باکووری کوردستان ولید حمدی باسی دوو گۆلی کردووە :یەکەم گۆلی (وان) کە بەرزاییەکەی لەژوور تەختایی دەریاوە بریتیە لە (١٧١٥)مەترو قولاییەکەی (١٠٠)مەترو ئاوەکەی پڕە لە مادەی صۆداو بۆ خواردنەوە دەس نادلو رووپێوانەی بەشێوەیەکی گشتی بریتیە لە (١٤٦٠)کیلۆمەتری چوارگۆشەیی.

گۆلی دوهەم وەکوو ولید حمدی باسی کردووە ناوی (کب)ە دەکەوێتە ژووری ئاراراتەوەو ئاوەکەی شیرینە چونکە لە توانەوەی بەفر پێك دێو سەوزایی‌و لەوەڕگایەکی زۆری بەدەورا هەیەو رووپێوانەکەی (١٥٠٠) کیلۆمەتری چوارگۆشەییە.(دەربارەی گۆلی دوهەم کە ولید حمدی باسی کردووە، چاوم گێڕا

به نەخشەی باکووری کوردستاندا بەلاّم ناوی (کب)م بەرچاونەکەوت بەڵکو گوڵێك هەیە بەناوی (Keban ـ کیبان) کە رەنگە مەبەستی ئەمە بێت).

ئەوی سەرنج ڕادەکێشێت لەوەی ولید حمدیدا دەربارەی ڕووپێوانەی گوّلی وان کە وتوویەتی بریتیە لە (١٤٦٠) کیلۆمەتری چوارگۆشەیی، لەوە ئەچیّ هەڵەیەکی چاپەمەنی بیّ، چونکە گوّلی وان ڕووپێوانەکەی لە هی (کب ـ کیبان) زۆر گەورەترە کە ئەمەی دوایی بە (١٥٠٠)کیلۆمتر ژماردوەو ئەوی تر عبدالرحمن قاسملو لە کتێبەکەیدا دەربارەی ڕووپێوانەی (وان) کەبە (٣٧٦٥) کیلۆمەتری چوارگۆشەیی داناوە دەبیّ ڕاستربێت لەوەی ولید حمدی.

دەربارەی ڕووپیوانی هەموو کوردستان عبدالرحمن قاسملو بە (٤٠٩٦٥٠) کیلۆمتری چوارگۆشەیی داناوە کە بەقەد ڕووپێوانەی هەموو بەریتانیاو هۆڵندەو بلچیکاو سویسرەو دانیمارك زۆرترە. دەربارەی ڕووبارەکانی ناو خاکی کوردستان عبدالرحمن قاسملو باسی سیّ ڕوباری کوردستانی کردووە :

**١ ـ ڕوباری ئاراس : بەناوچەی ( بینگول )دا ئەڕوات و لە نێوانی سنوری تورکیاو روسیاو ئێراندا تێپەڕ دەکات و تا دەگاتە دەریای ( خزر ـ قزوین )و درێژایی ڕوبارەکە ( ٩٢٠ ) کیلۆمترەو ( ٤٣٥ ) کیلۆمتری بەناو خاکی کوردستاندا دەڕوا.**

**٢ـ ڕوباری دجلە : لە گۆلاوی ( نوغول ـ جوك ) لەنێوان شاخی توروس، لە ڕۆژهەلاتی خوارویدا کە دەکەوێتە باکووری شاری دیار بکر هەڵدەقوڵێت و درێژاییەکەی ( ٦٠٠ ) کیلۆمەترەو ( ٤٠٠ ) کیلۆمەتری بەناو خاکی کوردستانا تێپەڕ دەکات.**

**٣ ـ ڕوباری فرات : بەشێکی لە ( دوملوتەپ ) لە باکووری ئەرزڕۆم هەڵدەقوڵێت کە ئەو بەشەی پێی دەڵێن ( قرەصو ). درێژاییەکەی ئەو بەشە ( ٤٦٠ ) کیلۆمەترەو بەشەکەی تری لە ( ئالان داغ )ەوە هەڵدەقوڵێت کە درێژاییەکەی ( ٦١٥ ) کیلۆمەترەو هەردوو بەشەکەی لە باکووری ڕۆژئاوای شاری ( ئەزیغ ) یەك دەگرن و دەبیّ بە ڕوباری فرات.**

دەربارەی یەکەم سەرچاوەیەك کە باسی جوگرافیای کوردستان و ڕووپێوانەی کوردستانی کردووە بریتیە لە کتێبی شرفنامەی بدلیسی کە دوکتۆر کمال مەزهەر لە لاپەڕە /٣٥ی سەرچاوە /٣٩دا وتوویەتی :((شرفخانی بدلیسی یەکەم

کەسە هەوڵی داوە بەشێوەیەکی دروستو بێ پێچو پەناو دەسکاریکردن سنوری کوردستان دیاری بکاتو بەرلەو، بەتایبەتی لە رۆژگاری سەلجووقیەکانا ووشەی کوردستان بەو مەڵبەندانە وتراوە کە کەوتبوونە نێوان ئازربایجانو لورستانو رۆژئاوای زنجیرە شاخەکانی زاگرۆسەوە، بەلاّم لە شرفنامەدا سنوری کوردستان لە (ملاطیە)وە دەس پێدەکاو لەسەر رۆخی خلیج (مەبەستی خلیجی فارس ـ عربیە) کۆتایی دێتو ئەم بۆچوونەی شرفنامە لەدەستنیشانکردنی جوگرافیاو سنوری کوردستاندا نیشانەی سەرەتای پەیدابوونی هەستی نەتەوایەتی بووە لەناو سەردارانی کوردا)).

مێجر نۆیل لەگەشتەکەیدا، سەرچاوە / ٢٧ی، لە لاپەرە /١٠یدا ناوی شوێنو ئەو گوندانەی لە باکووری کوردستاندا پیا گەڕاوە لەگەلْ ناو عەشیرەتەکانو سەرکردەکانی تومار کردووە کە لە بەشی دوای ئەمەدا باسی ئەو گەشتەی مێجر نۆیل ئەکەینو لە بەرگی دوهەمیشدا هەندێ لەو باسەی کە پەیوەندی بە رووداوەکانی دوای شەڕی یەکەمی جیهانیەوە بە دوورودرێژ باسی دەکەین.

نۆیل لە گەشتەکەیدا دەربارەی ناوی شوێنو ناوچەکانی باکووری کوردستان بە پێی ئەو نەخشەیەی لەبەردەستدا بووە، وتوویەتی زۆربەی ناوەکان بریتین لە زاراوەی تورکی کە لە لایەن تورکەکانەوە ئامادەکراوە وەیا لەلایەن ئەو گەڕیدە ئەوروپیانەی بە کوردستانا گەڕاونو زمانی کوردییان نەزانیوەو وادیارە چەند پۆلیسێکی تورکیان لەگەلاّ بووەو ناوەکانیان بۆ کردون بە تورکی و ئەوانیش بە پێی ئەوە تۆماریان کردووەو بەوجۆرە ناوە کوردیەکان گۆڕاون بە تورکی (مێجر نۆیل لە گەشتەکەیدا جلادت بدرخانو کامرانی برایو ئەکرمی جمیل پاشای دیاریکری لە گەڵدا بووە).

لەڕاستیدا ئەوەی مێجر نۆیل باسی کردووە دەربارەی گۆڕینی ناوی شوێنو ناوچەکانو گوندەکانو عەشیرەتەکان، تەنها ئەمە هەر لە باکووری کوردستاندا رووی نەداوە بەڵکو لە رۆژهەلاّتو باشووری کوردستانیشدا هەمان شت کراوەو لە باشووری کوردستاندا کاربەدەستانی عیراق گەلێك شوێنو ناوچەیان لە کوردییەوە گۆڕیوەو ناوی تازەی عەرەبییان بۆ داناوەو بە پێی بریاری رەسمی ناوە کوردیەکان لابراون.

عمادالدینی دەوڵەتی، کە کوردێکی ناوچەی کرماشانە لە نامیلکەیەکدا بەناوی (کومهای ناشناخته) باسی ئەو کەژو کێوانەی رۆژهەلاتی کوردستانی کردووە کە ناوەکانیان لە کوردییەوە گۆڕاوە بۆ فارسیو بۆ ساغکردنەوەی ئەو مەبەستەی وەکوو خۆی باسی کردووە پەنای بردۆتە بەر (ئاڤێستا) کە ناوە راستیە کۆنەکانی تیادا باسکراوە.

ئەوەی شایانی باسە، دوکتۆر فـۆاد حەمەخورشید کتێبێکی تایبەتی بەناوی جوگرافیای کوردستانەوە چاپکردووە، بەلام بەداخەوە ئەو سەرچاوەی ئەوم دەسگیر نەبوو تا سوودی لێ وەربگرم لەم باسەدا.

## ب ـ سەرژمێری کوردو عەشیرەتەکانی باکووری کوردستان

### ١ ـ سەرژمێری کورد :

ژمارەی کورد لە هەموو کوردستانا بە شێوەکی گشتی و لە باکووری کوردستانا بەجیا باسێکی ئالۆزەو تا ئێستە کورد دەسەلاتی سیاسی نەبووە بە شێوەیەکی سەربەخۆو دوور لە دەستێوەردانی داگیرکەرانی ولاتەکەی بزانێت ژمارەی تەواوی کورد چەندەو داگیرکەرانی کوردستان تا ئێستە دژی ئەوەن ژمارەی کورد ئاشکرابکرێتو رێگەیان نەداوە لە کاتی سەرژمێریدا کورد بە ئارەزوی خۆی ناوو نەتەوایەتی خۆی تۆمار بکاتو لە باکووری کوردستاندا دان بە میللەتی کوردا نەنراوەو ناتریێ وبە (تورکی شاخاوی) حساب دەکرێن، بەلام لەگەلێ ئەوەشدا هەندێ نووسەر ئەگەر بۆیان رەخسابێت هەولیانداوە شتێك دەربارەی کورد بزانن ئەگەرچی بەرهەمی تەقەلاکانیان زۆرجار پڕ لە کەمو کوڕی بووە.

ئەمین زەکی لە لاپەرە /١٩ی سەرچاوە /٣٢دا دەربارەی ژمارەی کورد وتوویەتی :

((ئەو میللەتانەی لەناو ولاتی عوسمانیدا بوون بەهۆی شەڕەوە تووشی گەلێك کارەسات بوونو ژمارەیەکی زۆریان لێ ئاوارە کراوەو تووشی برسێتیو نەخۆشیی کوشندە بوون و باجو سەرانەیەکی زۆریان لێ سەنراوەو بووە بەهۆی

لەناوچونی هەزارانیان کە کورد لە ریزی میللەتانی ناو دەوڵەتی عوسمانیدا لە هەموویان زۆرتر زیانی پێ گەیشتوەو ژمارەی کەم بۆتەوە.

لە ساڵی ۱۹۱۷دا کە هێزی دوهەمی سوپای عوسمانی تووشی برسێتی‌بوو، بەشێکی زۆری دانیشتوانی ناوچەی دیاریکر ئاوارەو پەرەوازە بوون‌و رویانکردە موصل‌و حلب‌و ئەدەنەو لەو شوێنانەدا ژمارەیەکی زۆریان مردن‌و لەناو چوون‌و لە ئەنجامی شەڕی دەرسیمی ساڵی ۱۹۲۱ یشدا ژمارەیەکی ئێجگار زۆری کورد کوژراو ولاتی خۆیان بەجێ هێشت.

هەروەها لە شۆڕشی شێخ سعیدی پیران لە ساڵی ۱۹۲۵داو لە شۆڕشی ئاگری داغدا باکووری کوردستان تووشی وێرانی بوو، بە هەزاران کورد کوژراو سیاسەتی بەزۆر کردنی کورد بە تورك بە ئاشکرا دەستی پێکرد، لەبەر ئەو هۆیانە شتێکی زۆر گرانە بوترێ سەرژمێری فلاّن شوێن ئەوەندەیە، بۆیە ناچارم پەنا ببەمە بەر ئەو بەڵگەو دوکومێنتانەی بەر لە شەڕی یەکەم باسی ژمارەی کوردیان کردووە.

(مارك سایکس)ی بەناوبانگ لە کتێبەکەیدا (The caliph last hertage) بە دوورودرێژی باسی عەشیرەتە کوردەکانی باکووری کردووەو بە پێی نەخشەکەی ئەو هێڵی عەشیرەتەکان لە ولاتی عوسمانیدا بریتی بووە لە هێڵی : ئالشکرد - ئەرزڕۆم - ئەزرنجان - زلرا ئەگین - ملا طیە بهسنی - بیرەجك - ئورفە - خواروی طورعا بدین - جێ رێژگەی ڕوباری زێی گەورە.

دائیرەی معارفی ئیسلامی لە لاپەڕە / ٤٤٠دا لە بەرگی چوارەمیدا دەربارەی کورد وتوویەتی : ژمارەی دانیشتوانی ویلایەتەکانی ئەرزڕۆم، وان، بدلیس، خربوط لە پێش شەڕی یەکەمدا (٦٤٢) هەزار کەس بووە (بەلاّم ئەمین زەکی خۆی لە کتێبەکەیدا کە لە ساڵی ۱۹۳۱دا نوسیویەتی ژمارەی ئەو ویلایەتانەی بە(٤,٥)ملیۆن داناوە). ئەمین زەکی لەهەمان کتێبدا ئاماژەی بۆ کتێبی (زەرد) کردووە کە لە لاپەڕە /۲۳یدا کە حکومەتی فرنسە لە ساڵی ۱۰۲۹ی کۆچیدا بەرامبەرە ۱۸۹۲/ی زایین چاپی کردووە (بێگومان ئەو ساڵی هیجرییەی لەکتێبەکەی ئەمین زەکیدا چاپکراوە، هەڵەی چاپەمەنیەو راستیەکەی بریتیە لە ساڵی۱۳۳۹ی کۆچی).

به پێی ئەم کتێبە ژمارەی کورد بە (٣٠١٢٨٩٧) کەس دانراوەو بەرامبەر بەمە (جنرال سیلادجی)ی روسی ژمارەی کوردی باکووری لە پێش شەڕی جیهانیدا بە (٢٨٠٠٤٧٥)کەس تۆمار کردووەو بەرامبەر بەو ژمارانە حکومەتی عوسمانی لەسەرژمێریەکانی خۆیدا بەر لە شەڕی یەکەم ژمارەی کوردی بە شێوەیەکی رەسمی بە (٢٥٢٧٨٤٠) کەس داناوە.

ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا (کە لە ساڵی ١٩٣١دا چاپکراوە) وتوویەتی : لەبەر ئەوەی ئێستە شتێکی بێ سودە ئەگەر بوترێ ژمارەی کورد ئەوەندەیە چونکە لەسەر ژمێری رەسمی تورکی ئیمرۆدا لە باسی تورك بەولاوە باسی سەرژمێری هیچ میللەتێکی تری ناو تورکیا نەکراوە.

دائیرەی معارفی ئیسلامی لە لاپەڕە /٢٢٦ی بەرگی نوهەمیدا لە باسی لیوای هەکاریدا بەرلە شەڕی یەکەم بە (٣٠٠) هەزار کەسی باسکردووە، کەچی بەپێی کتێبی (المناك جوتی) کە ئەمین زەکی لە لاپەڕە /٢٣ ـــ٢٤ی کتێبەکەیدا باسی کردووە وتوویەتی لە ساڵی ١٩٢٧دا ژمارەی کورد لە هەکاریدا بەجۆرێك کەم بووەوە کە گەیشتبووە (٢٥) هەزارکەس و کتێبی (التقویم السیاسي السنوي) لە ساڵی ١٩٢٦دا لە لاپەڕە /١٣٠٩دا ژمارەی هەکاریی بە (٣١٥٦٨)کەس داناوە.

ئەمین زەکی دەربارەی کەم بوونەوەی ویلایەتی بدلیس وتوویەتی کە چوار لیوا (بدلیس، موش، گنج، سیرت)بووە بەرلە شەڕی یەکەم (٣٩٨٩٠٠) کەس بووە، بەڵام بەپێی سەرژمێری حکومەتی تورکیا لەم ساڵانەی دواییدا (مەبەستی ساڵانی پێش چاپکردنی کتێبەکەی بووە لە ساڵی ١٩٣١دا) ژمارەی ئەو ویلایەتە بە (٢٨٢٥٧٨) کەس دانراوە. ناو شاری بدلیس خۆی کە بەر لە شەڕی یەکەم (٣٨) هەزار کەس بووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٢٩دا بەپێی کتێبەکەی (المناك جوتی) ژمارەی شارەکە تەنها (٩) هەزار کەس بووە.

دەربارەی سەرژمێری ویلایەتی دیاربکر، ئەمین زەکی باسی ئەو سەرژمێرییەی کردووە کە لە کاتی خۆی بە پێی پەیمانی برلین لیژنەیەك دانرا بوو بۆ سەرژمێری ویلایەتی دیاربکرو پاش ئەوە لیژنەیەکی تێکەڵیش پێکهێنرا لە (بیکر پاشا)ی ئینگلیز و سعید پاشای کورد (مەبەست سعید پاشای باوکی شریف پاشای خندان بووە)و (میناس ئەفەندی) ئەرمەنی بۆ سەردانی ئەو لیژنەیەو بە پێی راپۆرتی ئەو لیژنەیە ژمارەی ویلایەتی دیاربکر بریتی بووە لە

(٨٤٠) هەزار کەس بەڵام لە ساڵی ١٣١٠/ی کۆچیدا ژمارەیان ئەوەندە کەم بوو بووەوە کە بوبوو بە (٤٨٢٩٤٠)کەس هەروەکوو لە کتێبی (مماليك عثمانيه، تأريخ و جوغرافيا لوغاتی ــ نوسینی علی جواد چاپی ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٣١٣ی کۆچیدا باسی کردووە.

ئەمین زەکی جگە لەوەئاماژەی بۆ کتێبی (لاناسيون کورد) نوسینی (مسعود فانی) کردووە کە لە لاپەڕە /٢٣دا هەروەکوو لەو یاداشتەی شریف پاشادا باسی کردووە کە لە ساڵی ١٩١٩دا دابووی بە کۆنفراسی ئاشتی، باسی ئەوە کراوە کە لە شاری ئەستەمبوڵیشدا ژمارەیەکی زۆر کورد هەبووە.

ئەمین زەکی لە کۆتایی ئەو باسەیدا دەربارەی کەم بوونەوەی ژمارەی کورد وتوویەتی :

((بێگومان کەم بوونەوەی ژمارەی کورد، جگە لەهۆی ئاوارە کردنو ئەو کوشتارانەی لە کورد کرابوون، هەندێ هۆی تریش هەبووە بۆ کەم بوونەوەی ژمارەی کوردو زۆر کوردی واهەبووە خۆی لە سەرژمێری شاردۆتەوە بۆ ئەوەی نەکرێ بە سەربازو لە دلّی باجو سەرانەی زۆری جۆراو جۆر خۆیان رزگارکردووە. جگە لەوەی کە هەندێ ناوچەی دوورو سەختی وا هەبووە بە ئاسانی نەتوانراوە سەرژمێری تیادا بکرێت)).

لەو کتێبەی (Kurd and Kurdistan) نوسینی (chaland) چاپی ساڵی ١٩٨٠، وەرگێڕانی بۆ کوردی لەلایەن دوکتۆر ئەحمەد عوسمان، لە گۆڤاری (نووسەری کورد) ژمارە/٤ی ساڵی ١٩٨٦ دەربارەی سەرژمێری کورد لە باکووری کوردستاندا وتراوە: بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٧٠ ژمارەی کورد لە باکووری کوردستانا، لە ناوچە کورد نشینەکانا بریتی بووە لە (٦,٢ملیۆن)و ژمارەی هەمووی بە کوردەوەو بەو کەمایەتیانەی تر کە هەبوون لەگەڵ ئەو فەرمانبەرو سەربازە تورکانەی لە ناوچەکانی ماردین،سیرت، غازیعینتابدا هەبوونو ئەو نۆ هەزار ئەرمەنیەی لەو ناوچانەدا بوون بریتی بووە لە (٧٥٥٦٠٠٠) کەس و لە هەندێ شوێنی تریشدا وەکوو (جیهان بیلی، هەیامان، کورتوغە، توقات، سایگری)و چەند شوێنێکی تریشدا کورد هەبووەو بە کورتی دەتوانرێ بڵێین ژمارەی ئەو کوردانەش کە لە دەوری ناوچە کوردیەکانا هەبوون بریتی بووە لە (٢,٥) ملیۆن لە ساڵی ١٩٧٠دا، بەوجۆرە ژمارەی کورد لە باکووری کوردستان

پتر لە (٨,٥) ملیۆنە کە لە ٢٣٪ی ژمارەی هەموو دانیشتوانی تورکیا پێک دەهێنن.

نووسەر لە کۆتایی باسەکەیدا وتوویەتی لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی راستی کورد لە باکووری کوردستاندا بە دەستەوە نیەو لە هەندێ سەرچاوەدا ژمارەی کوردی باکووری کوردستان بە (١٢) ملیۆن دانراوە، ئەگەرچی لای رۆشنبیرانی کورد ژمارەی کورد زۆر لەوەش زیاترە.

لە کتێبێکی تردا (The Kurd)سەرچاوە /١ لە ساڵی ١٩٨٠دا ژمارەی کوردی بە (٨,٤٥٥) ملیۆن داناوەو ژمارەی هەموو دانیشتوانی تورکیای لەو ساڵەدا بە (٤٤,٥) ملیۆن داناوە. لەو باسەی دوکتۆر احمد عوسمان لە کتێبەکەی (**chaland**)ەوە وەری گرتووە باسی هۆی نەزانینی ژمارەی کوردی بە شێوەیەکی راست باس کردووەو وتوویەتی :

((بەهۆی جەورو ستەمو چەوساندنەوەی کورد لەلایەن تورکەکانەوە، ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان لەترسدا خۆیان بە کورد ناونووس نەکردبوو کە ئەم راستیە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٦٥دا ڕاست بووەوە کە خۆم (**chaland**) لەو سەرژمێرییەی ئەو ساڵەدا بەشداریم کردبوو، گوێم لێبوو ساتێك پرسیارێك لە کوردێکی هەژارو بێ دەرامەد کرا ئایا زمانی زگماکت چییە؟ ئەو کوردە داماوە هەرچەند وشەیەکی بە زمانی تورکی نەدەزانی. لەترسدا لە وەرامدا ووتی : بنوسە زمانی تورکی، چونکە ئەمەوێ خۆم لە گیروگرفت بپارێزم و تووشی شەڕەشەق نەبم.

ئەو نوسەرە لە باسەکەیدا وتوویەتی : لەگەڵ ئەو هەموو شتانەدا ژمارەی کورد لەچاو ژمارەی تورك وردە وردە زۆرتر پەرە دەسێنیت، بۆ نموونە لەنێوان ساڵانی ١٩٤٥ ـ١٩٦٥دا ئەندازەی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان بەهۆی زاو زێوە لەناو کوردا گەیشتبووە (٢٠٨٨٪) لەچاو هی تورکدا کە (٢٠٦٥٪)بووە.

**٢ ـ عەشیرەتە کوردەکان لە باکووری کوردستاندا**

دەربارەی ئەو عەشیرەتانە، دوو سەرچاوە بە دوور درێژ باسیانکردووە کە بریتین لە کتێبەکەی ئەمین زەکی و گەشتەکەی مێجر نۆیل لە باکووری کوردستاندا.

ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە /٣٢، لە لاپەڕە /٣٧٢دا باسی کتێبەکەی (مارك سایکس)ی کردووە کە دانیشتوانی کردووە بە شەش بەشەوە لە (A هەتا F ) و لە هەر بەشێکدا ناوی عەشیرەتەکان و شوێنیان و ژمارەی خێزانەکانی دەستنیشانکردووەو تەنها باسی عەشیرەتەکانی ناو وڵاتی عوسمانی کردووە (مەبەست ئەوەیە باسی عەشیرەتەکانی رۆژهەڵاتی کوردستانی نەکردووە، بەڵام مێجر نۆیل لەگەشتەکەیدا باسی هەموو بەشەکانی کوردستانی کردووە). ئەوەی ئێمە لەو باسەی مارك سایکس دا تەنها مەبەستمانە باسی عەشیرەتەکانی باکووری کوردستانە.

ئەمین زەکی لەو لیستەیەی لە لاپەڕەکانی ٣٧٦ هەتا ٤١٥ باسی عەشیرەتەکانی بە دوور درێژی کردووەو دەربارەی بەشی شەشەم (F) وتوویەتی مارك سایکس وتوویەتی :

((لە نزیك ئەنقەرە چاوم بە هەندێ لە تایەفەکانی کورد کەوت بە جل و بەرگ و شێوەیانا لە هەندێ لە تورکەکانی دەوروبەری ئەرزڕۆم دەچوون و کە چوومە پێشەوەو هۆی ئەو لەیەکچوونەم لێ پرسین، لە وەرامدا وتیان ئەوانەی ئەرزڕۆم بەبنەچە دەگەڕێنەوە سەر ئەو (ئەنکشاری) یانەی سوڵتان سەلیمی یەکەم ئەو زەوی و زارانەی دابوونێ کە ئێستە تیایا دەژین (لە شوێنی خۆیدا بە دوور درێژی باسی ئەنکشاری دەکەین)، بەوەدا بۆم دەرکەوت (بۆ مارك سایکس) ئەو زەوی و زارانە کاتی خۆی هی ئەو کوردانە بووە لەکاتیخۆیدا لەلایەن عوسمانیەکانەوە دوورخرابوونەوەو ئەنکشاریەکانیان لەشوێنی ئەوان نیشتەجێ کردبوو، هەروەها بۆشم دەرکەوت ئەو کوردانەی لە دەورو بەری ئەنقەرەدا بوون بریتی بوون لەو کوردانەی لە شوێنی خۆیان هەڵکەنرابوون و هێنرابوونە نزیك ئەنقەرەو بەزۆر ناچاریان کردبوون جل ویەرگی تورکی لەبەربکەن)).

جگە لەو باسەی مارك سایکس کە ئەمین زەکی باسی کردووە، لە لاپەڕە/٤١٧ی کتێبەکەیدا باسی زەمانی سوڵتان سەلیمی یەکەمی کردووە کە لە زەمانی ئەودا عەشیرەتی (حسنانلو) لە شوێنەکانی خۆیانەوەلە چیاکانی نزیك بە شاری (بدلیس)ەوە گوێزرابوونەوە بۆسەر سنوری روسیاو ئێران بۆ ئەوەی سنورەکانیان پێ بپارێزن و ساتێك شا عباسی صفوی ئەو ناوچەیەی داگیر کرد،

ئەو عەشیرەتەو هەموو لکەکانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو (زفرانلو، ئادامەنلو، گیوانلو) کە بەشێك بوون لەو عەشیرەتە، گواستنیەوە بۆ ناوچەی (خۆراسان)و لەوێ بەزۆر نیشتەجێ کران.

بێگومان بەشێکی زۆری حسنانلو لە شوێنی خۆیانا مابوونەوەو، ساتێك لەساڵی ١٩٠٤دا پەیمانی سنوری ئێران و تورکیا مۆرکرا ئەو عەشیرەتە کەوتنە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەوەو لەبەر ئەوەی هۆزی (حیدرانلو)و (سیکانلو) زۆر دڕ و شەڕکەر بوون و هەمیشە پەلاماری موڵك و ماڵی ئێرانیەکانی سەر سنووریان ئەدا، بۆیە کاربەدەستانی فارس و عوسمانی لە زەمانی سوڵتان مەحمودی دوهەمی عوسمانی و (شاەفتح علی)ی ئێراندا پەیمانیکیان مورکردو لەسەر ئەوە رێك کەوتن ئەگەر ئەو دوو هۆزە دەسدرێژی بکەنە سەرخاکی ئێران، لەلایەن حکومەتی عوسمانیەوە تەمێ بکرێن.

ئەمین زەکی لە لاپەرە /٤١٨دا باسی ئەوەی کردووە لە کاتی شەڕی نێوان روس و عوسمانیدا عەشیرەتی حسنانلو لەو شەڕانەی ساڵانی ١٨٢٩و ١٨٥٤و ١٨٨٧ دا بوبوون بە لایەنگری روسەکان بە ئومێدی ئەوەی ئەو شوێنانەی بەدەست خۆیانەوە بووە هەر لە ژێر دەسەڵاتی خۆیانا بمێنێتەوە.

دوا سەرچاوەی گرنگ کە باسی عەشایرەکانی باکووری کوردستان و شوێنەکەیانی کردووە بریتیە لە گەشتەکەی (مێجر نۆیل) سەرچاوە (/٢٧کە لەماوەی ١٩١٩/٦/١٤ هەتا ١٩١٩/٩/٢١ لە باکووری کوردستانا کردویەتی و لەو گەشتەیدا جلادت بدرخان و کامرانی برای و ئەکرمی جمیل پاشای لەگەڵدا بووەو یاداشتەکەی پڕە لە وێنەی ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی لە گەشتەکەیدا چاوی پێیان کەوتووەو گفتوگۆی لەگەڵدا کردون، کە ژمارەی وێنەی ئەو سەرۆك عەشیرەتانەو ئەو دیمەنانەی وێنەی گرتون بریتیە لە (٦١)، بەڵام بەداخەوە وێنەکانی کە بریتین لە فۆتۆکۆپیەکی زۆرکاڵ لەو دۆکیومێنتەی لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا هەیە، بویە بەپێی ئەو دۆکیومێنتەی یاداشتەکەی مێجر نۆیلی تیادا بڵاوکراوەتەوە، لە لاپەرە /٢٩دا باسی عەشیرەتی (رشوان)ی کردووە کە ژمارەیان نزیکی (٤٠٠٠ ــ ٤٥٠٠) خێزان بووەو لەم شوێنانەی خوارەوەدا بوون:

یەکەم ـ ئەوانەی لە قەزای (کیاختا)دا بوون و ژمارەی خێزانەکانیان (٢٠٣٠) خێزان بووە لە (٩٤) گوندا.

دوهەم ـ ئەوانەی لە قەزای (حصن منصور)دا بوون ژمارەی گوندەکانیان (١٧) گوند بوومو هەمویان ١٤١٧ خێزان بوون.

سێهەم ـ ئەوانەی لە قەزای (ملاتیە)دا بوون کە لە (١٢) گوندا بوون ژمارەی خێزانەکانیان ٤٥٥ خێزان بووە ئەوانەی قەزای (بیهسین) کە گەرمیان و کوێستانیان کردووەو گوندنشین نەبوون (باسی خێزانەکانیان نەکراوە) بەوپێیە، ژمارەی هەرچوار قەزاکە بریتی بووە لە (٤٠٨٢) خێزان لەناو (١٢٣) گوندا.

مێجر نۆیل لە لاپەڕەی هەمان دۆکیومێنتەکەدا ناوی عێلەکانی ئەو عەشیرەتی (رشوان)ەی بەم جۆرە باس کردووە:

١ ـ عێلی (کارچور) ٢ ـ عێلی (کوتا) ٣ ـ عێلی (علی‌خان) ٤ ـ عێلی (Brincha ـ برنچا) ٥ ـ عێلی (جیلا) ٦ ـ عێلی (زیراوکان) ٧ ـ عێلی (کەوی دوشلت) ٨ ـ عێلی (یارلغ خدرە سوورە) ٩ ـ عێلی (کوچەر خدرە سوورە) ١٠ ـ عێلی (جلێکان) ١١ ـ عێلی (بولام) ١٢ ـ عێلی (ئەلگوران) ١٣ ـ عێلی (مولکان) ١٤ ـ عێلی (مامورك) ١٥ ـ عێلی (گلومان) ١٦ ـ عێلی (مامسوور) ١٧ ـ عێلی (تاشیکان) ١٨ ـ عێلی (داری یوسف) ١٩ ـ عێلی (دالان) ٢٠ ـ عێلی (کوسان) ٢١ ـ عێلی (چاکلان).

نۆیل لە یاداشتەکەیدا ناوی سەرۆکی ئەو عێلانەی باسکردووەو دوورو نزیکی هاوینە هەوارو شوێنی جێی زستانی هەر یەکەیانی تۆمارکردووەو وتوویەتی عەشیرەتی رشوان هەتا بڵێی رەوشتیان بەرزەو میوان دۆستو دڵپاکن‌و بەوەش ناوبانگیان دەرکردووە.

نۆیل لەهەمان یاداشتیا گەلێك زانیاری دەربارەی رشوان کۆکردۆتەوەو باسی کردووە ئەمەی خوارەوە کورتەکەیەتی:

ئاینی رشوان : هەموو عەشیرەتەکەجگە لە بەشی (خدرە سوور) وە نیوەی عێلی بولام، ئەوانی‌تر هەمویان سونی مەزهەبن‌و ئەوانی‌تر کەمایەتین شیعەن‌و ژن‌و ژنخوازی لەنێوان ئەودولایەدا کەمە.

بەرگو پۆشتەنی: شەرواڵەکانیان شاڵەو کراسی رەنگاو ڕەنگی ئاڵۆ واڵا لەبەر دەکەنو چاکەتەکانیان کە پێی دەڵێن (Takulla ـ تاکولا) بەتاڵە دەزووی سور چنراوەو کڵاوەکانیان زیرە کە پێی دەڵێن (chit ـ چت).

شێوەی زمانیان کرمانجیەو رەنگە لە (٦ـ٧٪)ی شێوە زمانەکەیان جیاوازی هەبێت لەگەڵ ناوچەی دیاربکردا، ئەو گوندە وردانەی لەسەر ڕێگای شارەکانا بوون زمانی تورکیان دەزانی بەڵام لەناو گوندەکانی تردا کەم کورد هەیە زمانی تورکی بزانێت.

مێژووی عەشیرەتی رشوان : بێگومان نۆیل وەکوو نموونەی یەکێك لە عەشایرەکانی باکووری کوردستان، باسی عەشیرەتی رشوانی بە دورو درێژی کردووەو لە لاپەڕە/٣٠ دۆکیومێنتەکەدا باسی مێژووی رەشوانی بەم جۆرە کردووە:

سێچوار سەدە لەمەوبەر عەشیرەتی رشوانی یەکێك بووە لەو عەشیرەتە ڕەوەندانەی زستانان لە (Behesne ـ بهسین) دەژیانو هاوینان بەرەو نزیکی (Angora ـــ ئەنقەرە) کۆچیان دەکرد. لە زەمانی کۆندا تورکەکان زۆرجار هێرشیان بردۆتە سەر ئەم عەشیرەتەو لە ئەنجامی ئەوەدا سنوورێك دانراوە بۆ مانەوەیان لە هاوینە هەوارەکانیانو هەندێ لەو عەشیرەتە لە ناوچەی (دەشتی هیمان) نیشتەجێ بوونو هەتا ئیمرۆش (تاکاتی گەشتەکەی نۆیل) هەر لەوێ ماونەتەوە.

بەشە زۆرەکەی ئەم عەشیرەتە گەڕاونەتەوە بەرەو خوار بۆ ناوچە شاخاویەکانی (بیهسنی)و (ملاتیا)و دێهاتی تازەیان ئاوەدان کردۆتەوەو بەشێکی تری ئەم عەشیرەتە لەدەوری (Killis) دائەنیشنو ئەڵێن ئێستە بەشێك لەوانە بوون بە بەشێك لە عەشیرەتی (جلالی)و لەسەر سنوری ئێران دائەنیشنو لە عەشیرەتەکەی خۆیان کە (رشوان)ە دوورکەوتوونەتەوە.

هەڵوێستی سیاسی رشوان: ئەم عەشیرەتە بە ئازاو شەڕکەر ناوبانگیان دەرکردووەو خاوەنی نزیك هەزار تفەنگی تازەو دوو هەزار فیشەکدانو هەرکاتێك بیانەوێ دەتوانن دوو هەزار شەڕکەر ئامادەبکەن. هەتا ئێستە (ساڵی ١٩١٩) نزیکی هەزار سەربازێکیان لەشەر (مەبەستی شەڕی یەکەمی جیهانی) ڕایان

کـردووەو لـەو هـەزارەی تـر کـە ڕایـان نـەکردبوو هـەر (١٠٠) سـەربازێکیان بەسـەلامەتی گەڕابوونـەوەو ئەوانـەی ڕایـانکردبوو حکومـەتی تـورك زۆربـەی ماڵەکانیان سوتێنراون کەئەمە بۆتە هۆی قینێکی زۆر لە تورکەکان.

نۆیـل لـە لاپـەڕە /٣١ی دۆکیومێنتەکـەدا باسـی سـەرکردەکانی ڕشـوانی کردووەکە یـەکێك لەوانە حـاجی بـدر ئاغایـە کـە وتوویـەتی پیـاوێکی باڵابـەرزی ڕووخۆشـەو تەمـەنی نزیـك ٤٥سـاڵەو لـەناو عەشـیرەتەکەیدا زۆر زۆر بـەڕێزەو کاریەدەسـتانی تورکیش دڵـی ڕادەگرن، هەرچەند لەمەوبەر بۆ چەند مـانگێك گیرابوو لەبەر ئـەوەی ژمارەیـەکی زۆر لـە سـەربازەکانی نـاو عەشـیرەتەکەی ڕایکردبوو ئـەویش سـوور بـووە لەسـەر ئـەوەی ئـەو سـەربازانە نەدرێنـەوە بـە حکومەت. براکانی حاجی بدر ئاغـا بریتـی بـوون لـە (زەینـەلْ بـەگ)، زەلامێکـی کەتەو زەبەلاحە، بەڵام لەناو عەشیرەتەکەدا دەستی نـاپاو (حیدربـگ)ی براشـی گەنجێکی شۆخ و فیززلە.

نۆیل لە یاداشتەکەیدا باسی سەنگ و کێشانی ئەو ڕۆژانەی کردووەو وتوویەتی (قیراتێك بریتیە لە شەش کیلۆ)و (٣٢قیرات دەکاتە یەك کتل) کە بریتیە لە ١٩٢ کیلۆ غرام. دەربـارەی پـارەی ئـەو ڕۆژانـە وتوویـەتی لیرەیـەك دەکاتـە حـەوت مـەجیدیو مەجیدیـەك بریتیـە لـە (Piastres ٢٠)و لـیرەی کاغـەز بـە (٣٥ Piastres)و کیسەیەك بایی پێنج لیرەی ئاڵتونە. بێجگە لەوە باسی نرخی هەندێ شـتی کـردووە لەگـەڵ بەرهەمـە سروشـتیەکان وەکـو مـازوو و کـەتیرەو بـەڕوو صنۆبر (وتوویەتی پێی دەڵێن Markh مارخ).

نۆیل لە لاپەڕە /٣٢ی یاداشتەکەیدا باسـی بـەخێوکردنی مـاڵاتی کـردووە کـە چۆن بەهۆی شەڕەوە زۆر کەم بوبووەو باسی دەسڕەنگینێتی ژنی ئەو ناوچانەی کردووە کەبە تەونکاری (چنین)و دروستکردنی فـەرش و جـاجم و بـەڕەو گۆرەوی چنین زۆر چالاك بوون و ڕەشماڵیان لە مووی بزن دروسـتکردووەو ئـەو ڕەنگانـەی لە شتە چنراوەکانا بەکارهێنراوە لە ڕەگی گژوگیا دروستیانکردووە.

مێجر نۆیل لە یاداشتەکانیا لـەدوای عەشـیرەتی (ڕشـوان) باسـی عەشـیرەتی (Atmiئـەتمی) کـردووەو وتوویـەتی : عەشیرەتی ئـەتمی لەناوچـەی (گومیـش معادن) چەند سەدەیەك لەمەوبەر هاتوونە ئەو ناوچەیە کـە ژمـارەی خێزانـەکانی

(٢٥٦٥) خێزانەو لەوانە (١٥٠٥)یان بەدرێژایی ساڵ دەوارنشینن‌و لە قەزاکانی (بازار جیك)و (بەسمە)و (بوستان)و (ئاقچەداغ) دان.

ئەم عەشیرەتە لە شەڕی جیهانیدا (٢٠٠) سەریازیان دابو بە حکومەت بەڵام تائێستە (٣٠) کەسیان بەساغی گەڕاونەتەوە، ئەمانەش وەکوو (رشوان) زمانەکەیان کرمانجی‌یە وەکوو کوردی دیاربکر ئەدوێن. عەشیرەتی ئەتمی نیوەیان سونی‌و نیوەکەی تریان (علوی)ن، بەڵام هیچ کێشەیەك لە نێوانیانا نیەو ژن‌و ژنخوازی‌یان لەگەڵ یەکتردا هەیەو جل‌ویەرگی ئاینی لەناویانا زۆر کەم دەبینرێت.

هەرچەند عەشیرەتی (ئەتمی) بە ئازاو جەنگاوەر ناسراون بەڵام گرانە بزانرێ چەند چەکداریان هەیەو تفەنگێکی تورکی لەم ناوەدا نرخەکەی (٨) پاوەن دەگرێتەوەو فیشەکدانێکی پڕ لە (١٠٠) فیشەك بە (٥ ـ١٠) مجیدی‌یە.

هەتا ئێستە ئەم عەشیرەتە هیچ جورە دوژمنایەتیەکیان بەرامبەر ئینگلیز دەرنەبریوەو پڕۆپاگەندەی ئیسلامیەکان لەو ڕووەوە نەگەیشتووەتە ناوچەکەیان‌و لاشم وایە لەمەودواش کاریان تێ‌ناکا.

دوای ئەوە نۆیل چۆتە سەرباسی عەشیرەتی (Baizik ـ کە هەندێ جار پێشی دەوترێ Beske) کە لە گوندەکانی (سام سات)ی قەزای (حصن المنصور)دا ئەژین‌و وازانراوە لە ناوچەی (بۆتان)ەوە کۆچیانکردووە بۆ هەوارگەکانی ئیمڕۆیان‌و ووشەی (Beske ـ بیزیك ووشەیەکی کوردیەو زۆربەی ئەم عەشیرەتە باڵا بەرزو شۆخ‌و شەنگن. بەشەکانی تری ئەم عەشیرەتە لە ناوچەکانی (خالفاتیا)و (بیرەجەك)و (سیڤرك)و (ئورفە)دا دەژین. هەندێ گوندیشیان لە ناوچەی (izoli) لە قەزای (ملاتیا)دا دەژین.

ئەم عەشیرەتە هەمویان سونین‌و لە گوندەکانیانا مزگەوت بەرچاو دەکەوێت‌و،خەڵکەکەی زۆر هێواش‌و مەنگ‌و ئاشتیخوازن بەڵام هەستی نەتەوایەتی کوردی‌یان تیادا بەهێز نیەو بەشێوەی کرمانجی ئەدوێن‌و تورکیش دەزانن. نۆیل لە لاپەڕە/٤٤ی دۆکیومێنتەکەدا باسی ئەوەی کردووە چون لە گژوگیاو بنێشتەتاڵ داوو دەرمان دروست ئەکەن. نۆیل لەباسی شوێنەوارەکانی ناوچەکەدا باسی دووقەڵای بچوکی کردووە یەکەمیان (Girritelleh –گری تیلە

(مەبەست گردی تیلەیە)، دوهەم (Grra kalahsamsay) کە لە هەردوکیانا شوێنەواری کۆنی بەنرخ هەیە).

تۆیل لە لاپەڕە/٤٦ی دۆکیومێنتەکەدا چۆتە سەرباسی خێڵی (Gurrejik) لە قەزای (ئاقچی داغ) کە چەند سەدەیەك لەمەوبەر یەکێك لە باپیرانی سەرخێڵی ئیمرۆیان کە (ئاصف ئاغا)یە لەناوچەی (درسیم)ەوە هاتونەتە ئەم ناوچەیەو ژمارەی خێڵەکە بە تێکرایی پتر لە (٢٥٢٠) خێزان‌و بەسەر (٣٨) گونددا دابەش بوون‌و نزیکی (٤٩٥) خێزانی تورکیش لە چوار گوندی ئەمانا دەژین‌و کوردنشینەکانی ئەم عەشیرەتە گەرمیان‌و کوێستان دەکەن‌و ٢/٣یان دەوارنشین‌و ئەوانی تر لەژێر کەپرا دەژین.

دەشتەکیەکانی ئەم عەشیرەتە بەزۆری بە زمانی تورکی ئەدوێن‌و (علوی)ن‌و هەتا بڵێی دڵپاك‌و میوانپەرستن‌و دەشتەکیەکانیان بەهۆی ئەوەی زۆر تێکەڵ بوون بەتورك تۆزێك لەو رەوشت‌و خوە لایانداوەو ئەوانەی دانیشتوانی چیاو لاپاڵی چیاکانن خاوەنی خاسیەتی رەسەنی مرۆڤی کوردن.

سەرۆکی ئەم عەشیرەتە (خلیل ئاغای ئابیلو) پیاوێکی بەساڵاچووی پێشکەوتنخوازەو رابردویەکی پوخت‌و بەرزی هەیە، بەڵام عەیبەکەی ئەوەیە زمانەکەی خۆی لەبیرچۆتەوە، هەرچەند ئەندامانی خێزانەکەی بە کوردی ئەدوێن‌و خلیل ئاغا ئێستە دەسەڵاتی هاتۆتە کزی.

لام وایە ئەم عەشیرەتە نزیکی (٢٠٠ ـ ٣٠٠) تفەنگی تازەیان هەیەو لەکاتی شەڕی جیهاندا حکومەتی عوسمانی پتر لە هەزار خانوی ئەم عەشیرەتەی سووتاندبوو چونکە کوڕەکانیان لە سەربازێتی رایانکردبوو، حکومەتی تورك بەوەش وازی لێ نەهێنابوون، بەڵکو (١١) گوندی لێ داگیر کردبوون‌و دانیشتوانی ناوچەکانی تریان لەو گوندانەدا نیشتەجێ کردبوو. چەند ساڵێك لەمەوبەر ئەم خێڵە دژی حکومەتی عوسمانی راپەڕیبوو حکومەت لە ئەنجامی ئەمەدا باجی ساڵانەی لەسەریان لە ٥٪ەوە کردبوو بە لە ٢٥٪.

تۆیل دوای ئەوە چۆتە سەرباسی قەزای (گورجیك) کە نزیکی (١٥٠٠) میلی چوارگۆشەیی دەبێ‌و بەشێکە لە متصریفێتی (مرعش)و ئەم قەزایە سنووری

دەگاتە ئەو ناوچانەی ئەرمەنیەکان مرخیان لێ خوشکردبوو چونکە بە بەشێك لە ئەرمەنیایان دادەنا.

### ج ـ زمانی کوردیو شێوەکانی زمانی کوردی

زمانەوانەکانو شارەزای مێژووی زمانی کوردی شێوەکان (لهجەکان)ی زمانی کوردی یان کردووە بەچەند شێوەیەکەوە کە بریتین لە کرمانجیو گۆرانو لوڕیو، کرمانجی‌یان کردووە بە دوو بەشەوە: کرمانجیی ژوورو و کرمانجی خوارو (کە هەندێ زانا بە سۆرانی‌یان باس کردووە).

ئەوی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە پسپۆڕانو زانایانو مێژوونووسان ئەوەندەی بایەخیان داوە بە مێژووی کوردو بە ڕەگو ڕیشەی کورد، ئەوەندە بایەخیان نەداوە بە زمانی کوردی و بە بەستنەوەی زمانی کوردیی ئێستا بە زمانی باوو باپیرانی.

پوختەی بۆچوونی زانایان لەسەر ئەوەن زمانی کوردی دەچێتەوە سەر ئەو زمانەی میدی‌یەکانی باوباپیری کورد پێی دواونو بە هیچ جۆرێك زمانی کوردی بەشێك نیە لە زمانی فارسیو وەکوو بەرلەمە لەباسی مێژووی کوردا ڕوون بوتەوە زمانی کوردی بەر لە زمانی فارسی هەبووەو کتێبە پیرۆزەکەی زەردەشت (ئاڤێستا)بە زمانی میدیای باوو باپیری کورد نوسراوە.

جارێك تۆفیق وەهبی باسی ئەوەی بۆکردم کە زمانی کوردی زمانێکی کۆنی ڕەسەنەو ئەو گۆڕانکاری‌یەی بەسەر هەندێ لە ووشەکانیا هاتووە تا ئیمرۆ شتێکی ئاسایی‌یەو لە زمانەکانی هەموو میللەتانی تریشدا ڕوویداوەو بۆ بەڵگەی ئەو بۆچوونەی سووکە دەسخەتێکی خۆی نیشاندام وەکوو لیستەیەك چەند زنجیرە ووشەیەکی زمانی کوردی ئیمرۆی بەراورد کردووە لەگەڵ ئەووشانەی لە ئاڤێستاو لە زمانی فارسیی کۆندا بەکارهێنرابوونو، بەپێی ئەوەی تۆفیق وەهبی دەری‌ئەکەوێ ئەگەرچی زمانی کوردی لە ڕیزی زنجیرە زمانەکانی (ئاری)یە، بەڵام زمانی کوردی ووشەکانی لە هەموو شێوە زمانەکانی‌تر نزیك بە ئاڤێستایە وەیا لەیەکتر دەچن (جارێکی تر لەباسی ئاینی کوردا دەگەڕێمەوە سەر ئەوباسەی تۆفیق وەهبی).

ئەمین زەکی لە لاپەڕە/٢٩٧ی کتێبەکەیدا، سەرچاوە/٣٢ بە دوورودرێژی باسی زمانی کوردی کردووەو لێرەدا هەوڵ ئەدەم کورتەیەکی ئەوباسە پێشکەش بکەم کە وتوویەتی :((بەپێی لێکۆڵینەوەکانی دوکتۆر (سپایزر) زمانەکانی چواریەشەکەی شەعبەکانی زاگرۆس کە بریتی بوون لە (لۆلۆ، گۆتی، کاسای، سۆباری) جیاواز بووە لەیەکتر، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا وشەو ناوی وا هەبووەو هەیە نیشانەی ئەوەیە ئەو زمانانە هەموویان لەکاتی خۆیدا لەیەکترەوە نزیك بوون‌و هەندێ لە شارەزایان دەڵێن زمانەکانی ئەو چوار شەعبە لە زمانەکانی (ئاری) دەژمێرێن‌و هەندێکی تر لایان وایە زمانەکانیان دەچنەوە سەر زمانی قفقاسیەکان، ئەگەر چی هەتا ئێستە لە پشکنینی شوێنەوارەکانا بە تەواوی نەگەیشتونەتە بۆچوونێکی یەك گرتوو و هەتا ئێستە شتێکی ئەوتۆش دەربارەی زمانی ئاری کۆن نەزانراوەو هیچ جۆرە بەڵگەیەك لەو ڕووەوە دەسگیر نەبووە چونکە مێژووی فێربوونی نوسین‌و خوێندن لەساڵی ١٤٠٠ی پێش زایین تێپەڕی نەکردووە.

هەرچەند (دارمیس تیتر)ی شارەزاو نووسەری دراساتە ئێرانیەکان وتوویەتی (ئاڤێستا) بەزمانی میدیەکان نوسراوە، بەلاَم هێشتا بەڵگەیەکی تەواو بەدەستەوە نیە دەربارەی زمانی (میدی)یەکان تا ئەو زمانە بەراورد بکرێت لەگەڵ ئەو زمانەی (ئاڤێستا)ی پێ نوسراوە.

(لە پەراوێزی لاپەڕە/٢٦٨ی کتێبەکەی ئەمین زەکیدا وتراوە (نۆلدکە) وتوویەتی هەندێ نووسینی هەڵکۆڵراو دۆزراوەتەوە کە هی زەمانی میدیەکانەو لای وایە ئەوانە بریتین لە شوێنەوارەکانی (هاخا منشی)یەکان کە بنەماڵەی هاخامنشیەکان ـ کیانی ـ هەر لەهەمان میللەتی میدیا بوون‌و لەکاتی خۆیدا گواستنەوەی دەسەلاَت لە (میدی)یەکانەوە بۆ (أنتساف)و لەوانیشەوە بۆ (پارس) هەر بریتی بووە لە گۆڕینی دەسەلاَت لە بنەماڵەیەکەوە بۆ بنەماڵەیەکی ترو ئەم (پارس)ەش هەر بەشێك بووە لە شەعبەکانی میدیاو تەنها لەزەمانی ساسانیەکانەوە بوون بە خاوەن کیانێکی سەربەخۆو زمانێکی تایبەتی.

دەربارەی ئەوەی (نۆڵدکە)، (ئسترابوون)ی جوگرافیاناسی کۆنی یۆنانی کە لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زایندا مردوە وتوویەتی : ((فورسەکان‌و میدیەکان

لەکاتی خۆیدا لەیەکتر دەگەیشـتن‌و بەمـەدا دەردەکـەوێ زمـانی فارسـی‌و میـدی ئەگەر چی لەیەکترەوە نزیك بوون بـەڵام لەیـەکتریش جیـاواز بـوون‌و لـە زەمـانی ساسانیەکانا زمانی فارسی جێگەی زمانی (پهلوی)و (میدی) گرتەوە.

ئەمین زەکی لە لاپەڕە/٣١٠ی کتێبەکـەیدا لیستـەیەکی بچووکـی کـردووە بـۆ بەراورد کردنی شێوەی هەندێ ووشەی کرمانجی باشوور (کە بەشێوەی سلێمانی ناوی بردوە) و شێوەی کرمانجیی ژوروو و زازا لەگەڵ بەرامبەرەکانیانا لە ووشەی (ئابستاق ـ ئاڤێستا)و فارسیدا. لـەو ڕووەوە تۆفیـق وەهبیـش تەقەلایـەکی زۆری داوە بـۆ بـەراوردکردنی هـەندێ ووشـەی کـوردی لەگـەڵ ووشـەکانی ئاڤێسـتاو فارسیدا بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە زمانی کوردی لە هـەموو زمانـە ئاریـەکانی تـر نزیکترە بەو زمانەی ئاوێستای پێ نووسراوەتەوە.

جارێك لە مامۆسـتا تۆفیـق وەهبیـم پرسـی : ئـەو وەکـوو ئەفسـەرێك هـەموو بەشی خۆی لە کاروباری سوپاییدا بردبووە سـەر لـەناو سـوپای عوسمـانیداو لـە دواییشدا بۆ ماوەیەك لەناو سوپای عراقدا، ئایا چی پاڵی پێوە نـابوو خستبوویە سەر کەڵکە لەی بایـەخ پێدان بـە ئاوێسـتا، لـە وەرامـدا فـەرمووی:(کـاتی خـۆی حمدی بابان لە بغداد کتێبخانەیەکی هەبوو پـاش ماوەیـەك هـەمووی فرۆشـت بـە کتێبخانـەی (مرکزی) لـە بغـدادو منیـش فریاکـەوتم یـەکێك لـەو کتیبانـەی کـە نووسەرەکەی (دارمیس تیتر) بوو کڕیم‌و کە خوێندمەوە بۆم دەرکەوت بایەخێکی زۆری دابو بە ئاوێستاو لە سەرەتای کتێبەکەیدا نووسیبووی ئەو کەسـەی بیـەوێ زمانی ئاوێستا فـێربێ پێویسـتە زمـانی‌کوردی بزانێـت‌و منیـش (تۆفیـق وەهبـی) بـەخۆم ووت، مـن کـە زمـانی کـوردی ئـەزانم لەبـەرچی هەوڵنـەدەم زمـانی (ئاوێستا)فێربیم؟ ئیـتر کەوتمـە خولیـای فـێربوونی ئاوێسـتاو لـەدوای پشـکنینی هـەندێ سـەرچاوەی تـر بـۆم ڕوون بـووەوە زمـانی کـوردی، بەتایبـەتی شـێوەی گۆران لەهەموو زمانە ئاریەکانی تر نزیکترە بەو زمانەی ئاوێستای پێ نوسراوەو، چەند لاپەڕەی گەلێك دەسخەتی خۆی پێشاندام کـە بـۆ ئـەو مەبەسـتە ئامـادەی کردبـوو، بـەڵام بەداخـەوە کارەکـەی دوا خسـتبوو لـە دواییـدا نەخۆشـی‌و پـیری زەیفـی لێ سـەندو کارەکـەی تـەواو نـەکردو ئـەو تەقەلایـەی بـە نیوەچڵـی لـەناو کتێبخانەکـەیدا مایـەوەو هەمیشـە خەفـەتی دەخـواردو هەناسـەی بـۆ ئـەوە

هەڵدەكێشا كە نەیتوانیبو ئەو كارە گرنگەی تەواو بكـات. خۆزگـە لاوانـی كـوردو رۆشنبیرانی كورد لە شـارەزایانی زمـانی كـوردی بایـەخ بـدەن بـە ئاوێسـتاو بـەو زمانەی پێی نوسراوەو بتوانن ئەو تەقەلا سەرنەگرتووەی ماموستا تۆفیق وەهبی بەجێ بێنن)).

ئەمین زەكی لە لاپەرە/٣١١ی كتێبەكەیدا لە بەراوردكردنی كوردیو فارسـیدا وتوویـەتی :((ئەگـەر بـەراوردی چـەند ووشـەیەكی فارسـی بكـەین لەگـەڵ زمـانی كوردیو ئەو زمانەی ئاڤێستای پێ نووسراوە بۆمان دەردەكـەوێ زمـانی كـوردی زۆرترو باشتر توانیویەتی خۆی ببەستێتەوە بەزمانی رەگەزی ئـاری وەك لـەزمانی فارسی.

ئەمین زەكی وەرامی ئەوانەی داوەتەوە كە گومان ئەخەنە بەر زمانی كوردی بەبیانووی ئـەوەی جیـاوازی هەیـە لـە نێـوان شـێوەكانیا، كـە هـۆی ئـەو گومـان بردنەیان بەهۆی نەشارەزاییانەوەیە دەربارەی زمانە زیندوەكانو بە باشـیش لـە زمانی كوردی نەگەیشتون، چونكە ئەگەر بە ووردی لە دەستورو بناغەی زانیاریی (فیسۆلۆجیا) بكۆڵرێتەوە ئەوانە بۆیان دەرئەكەوێ زۆر میللـەتی گـەورەی ئیمـرۆ هەیە ئەگەرچی تاڕادەیەك زمـانێكی یـەك گرتویـان هەیـە بـەلآم لەگـەڵ ئەوەشـدا جیاوازیەكی زۆر هەیە لە شێوەكانی ئەو زمانانەدا بە پێـی ناوچـەی دانیشـتوانی. بۆ نموونەی ئەوە بـا سـەیری زمـانی عـەرەبی بكـەین لەگـەڵ ئەوەشـدا زمـانێكی عەرەبی یەك گرتوو هەیە، بەلآم شێوەی زمانی عەرەبی لە زۆر ناوچەیدا لە یـەك ناچێتو جاری واهەیە عەرەبێكی عراقی بە ئاسانی لە میصرییەك یـا سـوورییەك ناگـاتو ئـەو جیاوازیـەی لـە شـێوەكانی زمـانی كوردیـدا بـەرچاو دەكــەوێ لــەو جیاوازییەی نێوان شێوەكانی زمانی عەرەبیدا دوبارە دەبینرێ)).

بێجگە لە ئەمین زەكی، گەلێ نووسەری تر هەریەكەیان بە جۆرێك دەربـارەی زمانی كوردی دواون كە هەوڵئـەدەین كورتەیـەكی ئـەو باسـانەی ئـەو نووسـەرانە نوسـیویانە بیانخەینـە بـەرچاو. (مسـز سـۆن) لـە كتێبەكـەیدا سـەرچاوە/٦٢ دەربارەی زمانی كوردی وتوویەتی ((زمانی كوردی هەتا ئێسـتە شـتێكیكەمی لێ زانـراوەو لای هەندێكـەس، بەتایبـەتی ئەوانـەی بـە كوردسـتانا گـەڕاون زمـانی كوردییان بە زمانێكی رەق ژماردوەو هەندێكی تریان وتوویانە زمانی كـوردی لـە

ووشەکانی فارسیو تورکیو ئەرمەنی پێك هاتووە، کە لە ڕاستیدا ئەو بۆچوونانە هیچیان راست نین چونکە ووردبوونەوەیەك لە زمانی کوردی زۆریاش دەریئەخا زمانی کوردی زۆر جیاوازە لە تورکیو فارسیو ئاشکرایە (میدی)یەکانی کۆن لە سەردەمی خۆیانا هەریەکەیان بە زمانێکی لەیەك نەچوو لەگەلْ ئەوی تردا قسەیان کردووە)).

مارتن ڤان برونسون لە سەرچاوە/٧٢دا، لە لاپەرە/٥٥دا بەم جورەی خوارەوە باسی زمانی کوردی کردووەو کردوونی بەسێ بەشەوە :

**١ ـ دیالێکتی باکورو باکووری رۆژئاوا کە پێی دەوترێ کرمانجی.**

**٢ ـ دیالێکتی خوارو کە زۆرجار پێی دەوترێ (سورانی) کە زاراوی ئەو گروپانەی موکریو سلێمانی دەگرێتەوە.**

**٣ ـ دیالێکتی خواروی خۆرئاوا (مەبەستی ناوچەکانی باشووری خۆرئاوای ئێرانە) وەکوو سنەیی، کرماشانیو لەکی کە لە فارسیی تازەوە زۆر نزیکە.**

لەپالْ ئەو سێ دیالێکتە سەرەکیەدا دەتوانرێ دوو دیالێکتی دیکەش باس بکرێت کە سەر بە لقێکی دیکەی خێزانی زمانە ئێرانیەکانن کە بریتین لە : (زازا)و (گۆران).

مارتن لە باسەکەیدا دەربارەی (زازا) وتوویەتی :ژمارەیەکی زۆر لە خێڵەکانی خۆرئاوای باکووری کوردستان زازان کە بەپێی مەڵبەندەکانیان دەتوانین بیکەین بەسێ دەستە:

**١ ـ درسیمی گەورە کە ناوچەی تونجلیو ئەرزنجانو بەشێکی بنگۆلو دیاربکر دەگرێتەوە.**

**٢ ـ سیڤەرك.**

**٣ ـ (مۆدکی) ـ کە سەر بە (بدلیسە).**

مارتن وتوویەتی: ((گەلێجار دەوترێ زۆربەی علویەکان بە زاراوی زازایی دەدوێن، کە ئەمە شتێکی راستە، بەلاّم علویی واش هەیە بە کرمانجی ئەدوێ نەك بە زازایی، بێجگەلەوە زۆربەی علویەکانی تورکیا کوردنین بەڵکو لە ڕەگەزی تورکنو بوون بە علوی)).

ئەو کوردانەی بە زازایی قسە دەکەن بە ئاسانی فێری کرمانجی دەبن، بەڵام فێربوونی زازایی لەلایەن ئەوانەی بە کرمانجی قسە دەکەن شتێکی زۆر گرانەو هەرچەند بەڵگەیەکی کەم هەیە، بەڵام والێك دەدرێتەوە کە زازاو گۆران لێك نزیکن.

مێجر نۆیل لە یاداشتەکەیدا، سەرچاوە/٢٧ دەربارەی زمانی کوردی وتوویەتی:

((زۆرجار ئەوترێ زمانی کوردی لە زمانێکی ناوچەیی بەولاوە تێپەڕناکاتو شێوەی قسەکردن لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکیتر دەگۆڕێت)).

بەڵێ ئەوە راستە شێوەی زمانی باشووری کوردستان جیاوازیی هەیە لەگەڵ شێوەی کرمانجیدا بەڵام ئەو جیاوازیە شتێکی بنەڕەتی نیەو بیگانەکان بە هەڵە جیاوازیی نێوان شێوەی ناوچەکان گەورە دەکەنو ئەگەر یەکێك فێری یەکێك لە شێوەکان (لهجەکان) بێت ئیتر بە ئاسانی دەتوانێ فێری شێوەکانی تر بێت.

بۆ نموونە : من (مێجر نۆئێل بەرلەوەی بچێتە باکووری کوردستان لە زەمانی شێخ مەحمودا ئەفسەرێکی سیاسی بووە لە شاری سلێمانیداو شارەزای شێوە زمانی باشووری کوردستان بووە) ئەوانەی لەگەڵمان (مەبەست جلادتو کامرانو اکرەمی جمیل پاشا بووە)، زۆرجار کە شیعری کوردیو پەندی پێشینانی ناوچەکەیان ئەنوسیەوە (کە بەشێوەی کرمانجی زۆرو بووە)، ئەوان بە پیتی عربیو منیش بە پیتی لاتینی، هەرچەند من شارەزاییەکی تەواوم نیە لە زمانەوانیدا بەڵام دەمتوانی ئەو شیعرانە لەوان ڕەوانترو باشتر بخوێنمەوە.

دەربارەی بایەخدان بە زمانی کوردیو دەستوری زمانی کوردی، سەرچاوە/٧٤، ماریلا گالیتی لە ساڵی ١٧٨٧دا باسی دەستوری زمانی کوردی کردووەو ئاماژەی بۆ باسی نوسەرێکی تر کردووە کەناوی (Mourizio Gurzoni)بووە کە وتوویەتی قاموسێکی بە نرخو دەستورێکی بۆ زمانی کوردی داناوە لەو ماوەیەدا کە لە شاری (موصل)دا بووە، ئەو قاموسە بە بەرهەمێکی ئێجگار بەنرخ دەژمێرێت لە مێژووی کوردا چونکە یەکەم باسی بێگانەیە دانی بە ڕەسەنێتی زمانی کوردا ناوەو لەسەر بناغەیەکی زانیاریانە نوسیوێتیو هەتا ئەو

قاموسە بلاّونەکرابووەوە هیچ رۆژهەلاّتناسێکی ئەورووپی بیری لەوە نەکردبووەوە قاموسێك بە زمانی کوردی دابنێت.

بەوپێیە ئەو قاموسە کە لە نێوانی ١٧٦٤ ـ ١٧٧٥دا تەواو کراوە بریتی بووە لە (٤٦٠٠) ووشەو باسی دەستوری زمانی کوردیشی تیادا کراوە لە رووی منهجیو لە رووی دەنگەکانەوە. لە پێشەکیی ئەو قاموسەدا وتراوە:((من خۆم خلنی پیا ئەنێم ئەم قاموسە کەموکورتیی تیادایە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا لام وایە کارەکەم بەسوودو سەنج راکێشەر دەبێت، چونکە یەکەم کەسم لە کارەکەمدا پەنام نەبردۆتە بەر هیچ کەسێكو هیچ کتێبو هیچ زمانێکی ترو هەمووی بە تەقەلای خۆم ئامادە کراوەو مەبەستیشم لە نوسینی ئەم قاموسە ئەوەیە میسینرەکان لە دواڕۆژدا سوودی لیّ وەربگرن)).

ماریلا گالتی لە باسی ئەو قاموسەدا وتوویەتی: نووسەرەکەی بە هیچ جۆرێك لەو قاموسەدا دەربارەی ئەدەبی کوردی نەدواوەو باسی ئەوەی کردووە کە کوردەکان بەزۆری لەناوخۆیانا بە فارسی نامە بۆ یەکتر دەنێرن و بە شێوەیەکی ئەدەبی دەنوسنو تەنها هەر زاناکانیشیان لەو جۆرە نووسینە تیّ دەگەن، بەلاّم ئەو کریستیانانەی لەناو کوردەکاندا خەتی (کرشونی) بەکار دەهێنن لەنوسینەکانیانا ناوی نسطوریەکانیش بە کلدانی (سریانیی رۆژهەلاّت)و ئەرتۆدۆکسەکان بە(سریانی رۆژئاوا)و ئەرمەنیەکان بە زمانی ئەرمەنی دەنوسن، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا هەمویان ناچارن زمانی کوردی بزانن چونکە بۆ سوودی بازرگانێتی خۆیان ئەبیّ فێری زمانی کوردی ببن)).

وەکوو ماریلا گالیتی باسی کردووە، دانانی ئەو قاموسە زمانی کوردیی کردووە بە (٥) شێوە، کە بە پێی شێوە زمانی ئەمارەتەکان بووە کە بریتین لە:

١ ـ شێوەی (کاراچوالان ـ کە مەبەستی قەلاّچوالانی پایتەختی ئەمارەتی بابان بووە).

٢ ـ عمادیە ٣ ـ جوّلەمێرگ ٤ ـ جزیرە ٥ ـ بدلیس ـ بتلیس.

ئەوەی ئەو قاموسەی داناوە ماوەیەکی زۆر بەو ناوچانەدا گەڕاوەو لەدوای یەکەم میسینر کە (سولدینی)بووە، نوسەری ئەو قاموسە بەدوهەم میسینر ئەژمێرێت کە چۆتە کوردستانو لە ناوچەی (عمادیە)دا ژیاوە.

**د ـ ئاینی کورد**

بێگومان باسێکی تێرو تەسەل دەربارەی ئاینی کورد لە سەرەتای مێـژووەوە تائیمڕۆ باسێکی دوورودرێژو پڕە لە گرێ کوێرەو تێکەڵ بووە بە گەلێك ئەفسانەو چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیی خۆمانەو بێگانەو ئەو چیرۆکو ئەفسانانەی لە کۆنەوە لەناو کومەڵگای کوردا دەماو دەمی کردووە، یائـەو هـەموو بۆچوونـە پـڕو پووچانەی دوژمنانی کورد دەربـارەی ئـاینی کـورد هـەڵیان بەستوە لای هـەندێ نووسەرانی بێگانە کراوە بە بەڵگەو بە پێی ئەوانە لە ئاینی کورد دواون.

بەرلەوەی بچینە سەر ئەو سەرچاوانەی هەریەکەیان بە شێوەیەکی جیاواز لـە ئاینی کورد دواون، بە پێویستم زانی زنجیرەی ئەو ئاینانەی کورد لـە سـەرەتاوە بخەمـە پێش چـاو بـە پێی ئـەو سـەرچاوانەی لـەو مەبەستە دواون.ئـەوەی لـە سەرچاوەکانا بە شێوەیەکی چڕوپڕ دەربارەی ئاینی زەردەشت دواون، ئەتوانرێ کورد بە یەکێك بژمێرێت لەو میللەتانەی چوونەتە سـەر ڕێبـازی ئـەو ئاینـە هـەتا ئەوکاتـەی ئاینـەکانی تـری وەکـوو کریسـتیانو ئیسـلام لـەناو کوردسـتاندا بلاوبوونەتەوە.

وەکوو لەم باسـەدا، لـە شـوێنی خۆیـا بۆمـان ڕوون دەبێتـەوە ئەوەیـە کـورد بەرلەوەی بچێتە سەر ئاینی زەردەشت، وەکوو زۆربەی میللەتانی تر بت پەرست بووەو بت پەرستیش ڕێبازی خۆی هەبووەو لەناویانا چەند کەسێك خۆیانکردووە بە پارێزەری ئەو ڕێبازە کە پێیان وتراوە (موغ)و لە ئاڤێستادا وەکوو لە شوێنی خۆیـداو لـە باسـەکاندا دەردەکـەوێ. سـاتێك زەردەشـت ئاینەکـەی خـۆی بـلاو دەکـردەوە ئـەو (مـوغ)انـە هـەموو دژی وەسـتاونو بەریـەرەکانی‌یان کـردووەو ڕێگـەیان لـە بلاوبوونـەوەی گرتـووەو کـار گەیشـتوە بـەوەی (زرادشـت) لـەناو بەریەرەکانیکردنی ئەوانـە ولاتـی خـۆی بـەجێ بێلێـت، بـەلام زۆری پـێ نـەچووە (میـدی)یـەکانی باووباپـیری کـورد چوونەتـە سـەرئاینی زەردەشـتو ئـەو ئاینـە بلاوبـووەوە، هـەتا ئەوکاتـەی ئـاینی ئیسـلام گەیشـتە کوردسـتانو بـەناو کـوردا بلاوبووەوە.

بێگومان لە ماوەی نێوان ئـاینی زەردەشـتو ئیسـلامدا ئـاینی (مەسـیحی)ش بلاوبووەوەو هیچ گومـان لـەوەدا نیـە کـوردی واش هـەبووە چووبێتـە سـەر ئـەو

ئاینـه، بـەلاّم کـه ئـاینی ئیسلام بلاّوبـووەوەو پـەرەی سـەند ئیـتر کـورد بـه شێوەیەکی گشتی جگه له (یزیدی)یـەکان کـەلای زۆر نووسـەر وایـه لـەناو کـوردا یزیدی تاکه تاقم بوون لەسەر پەیڕەوی ئاینی زەردەشت مابوونـەوە، ئەگـەرچی هەندێ بیرو بۆچوونو دابو نەریتی کریستیانیو ئیسلامەتی تیـادا تێکـەڵ بـووە به ئاینەکەی باوو باپیرانیان.

بۆ ئاسان کردنی ئەم باسه هەوڵئەدەین به پێی قۆناغی ئاینەکانو پـەیوەندی کورد بەو ئاینانەوە بکەین بەم بەشانەی خوارەوە:

**١ ـ کوردو ئاینی زەردەشت.**

**٢ ـ کوردو ئاینی کریستیان ـ مەسیحی.**

**٣ ـ کوردو ئیسلامو چۆنێتی بوونی کورد به ئیسلامو رێبازەکانی:**

**أ ـ سونی　　　ب ـ شیعه ـ علویو علی ئیلاهی　　　ج ـ یزیدی.**

**یەکەم ـ کوردو ئاینی زەردەشت**

بەڕاستی چاوو دڵم کرایەوە که بۆ یەکەم جار چاوم به بەرهەمی لاوێکی کـورد کـەوت (ئـەنداز حوێزیـی کـوڕی عبدالخـالق حوێزیـی ئـەندازیار) کـه جگـه لـه ماموستایان ئـەمین زەکـیو تۆفیـق وەهبـی کـه شـارەزای ئـاینی زەردەشـتو ئاوێستان (وەکوو له دواییدا باسـی دەکـەین)، ئـەو لاوە کـوردە بـەرگی یەکـەمی کتێبەکەی (ئاڤێستا ـ نامەی مەینەڤی ئاینی زەردەشت)ی لـه سـاڵی ١٩٩٢دا لـه سوید چاپکردووەو وتوویەتی ماوەی هەشت ساڵە خەریکەو بـەدوای سـەرچاوەدا گەڕاوە بـۆ ئـەو باسـەیو هیـوادارم بـەرگی دوهـەمی ئـەو کتێبەشـی تـەواو بکـاو پێشکەشی خوێنەرانی بکات.

نوسەری ئەو کتێبە، سەرچاوە/٩٧ له لاپەڕە/١٢دا وتوویەتی:

((زەردەشت نێوی خۆی له بەشی (گاتا)کانی ئاڤێستادا بـه (Zarethushtra ـ زاراتوشترا) ناوبردوە. مێژووناسی یۆنانی (کسانتوس) لـه سـاڵی ٤٥٠/ی پێش زاینـدا وتوویـەتی: (زەردەشـت ٦٠٠سـاڵ پێش جـەنگی ـ خشیارشـا ـ لەگـەڵ یۆنانیەکان ژیاوە که ئەو شەڕە له ساڵی ٤٨٠ی پێش زایین روویداوە)). (به پێـی ئەم بۆچوونه دەبێ زەردەشت ٤٨٠ + ٦٠٠= ١٠٨٠زاییینیدا هەبوە)، بەلاّم وەکوو

ئەو سەرچاوەیە باسی کردووەو وتوویەتی : بەپێی لێکدانەوەی ئاڤێستا دەتوانرێ بوترێ زەردەشت لە نێوانی سەدەی هەشتەم و یازدەهەمی پێش زایندا ژیابێت.

ئەندازیار لە لاپەڕە/١٢دا وتوویەتی لە نوسراوێکدا بەناوی (ولاتی ماد)ەوە (وتوویەتی بە داخەوە ناوی نووسەرەکەم لانەماوەو بەتەواوەتی لەو ناوەش دڵنیانیم کە وتوویەتی باوکی زرادشت ناوی (Poursh aspa ــ پووروش ئەسپە)بووەو دایکی ناوی (Dughdova ــ دوغدۆڤا) بووەو لە گوندی (هەردشنە)ی نزیك بە ورمیە لەدایك بووە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوەی تری واهەیە دەیبەنەوە بۆ (٦٠٠٠، ٥٠٠٠، ٤٠٠٠)ی پێش زایین.

زەردەشت هەرلە منداڵیەوە زیرەکیو هۆشمەندیی تیادا دیاری داوەو لە تەمەنی (٣٠)ساڵیدا ڕووی لە دەشتو کێوان کردووەو بۆ ماوەی ( ١٠ساڵ ) لەسەر چیایەك ژیاوە کە لە وێژەوانی (مەزدیسنیدا) بە (oshidarena ــ ئۆشی دارینان) کە مانای هۆشبەخش دەگرێتەوە، لەوێ پەیوەندیی بە (ئاهورا مەزدا)وە کردووەو بووە بە پێغەمبەری دینی (مەزدیسنی)و ئەمیش وەکوو پێغەمبەرەکانی تر ژیانی پڕبووە لە ئەفسانە کە ئەمە شتێکی باو بووە لە نیو نەتەوە جیاوازەکانا بۆ نیشاندانی بەرزی.

پاش ئەوەی زەردەشت چۆتە ناو خەڵکەوە هەوڵی داوە ئەو خەڵکە بگۆڕێت. بەڵام بەهۆی ئەوەی لەناو نەتەوەکەیدا سەرکردایەتیەکی ئاینی هەبووە، بۆیە سەرکردە ئاینیەکان دەستیان کردووە بە دوژمنایەتی لەگەڵیاو ناچاریان کردووە بەخۆیو دوستو لایەنگرەکانیەوە سەری خۆی هەڵبگرێو ڕووی کردوتە شاری (بەلخ)و پادشاکەی کە ناوی (ڤیشتاسب)بووە باوەڕی پێ هێناوەو چووەتە سەر ئاینەکەیو لەوێ ماوەتەوە هەتا کاتی کوشتنی لە لایەن (توربراتور)ی (توورانی)یەوە وەکوو لە دواییدا باسی دەکەین، ئەمین زەکی وتوویەتی (ڤیشتاسب ـ و یشتاسب حاکمی باختران بووە).

نوسەری سەرچاوە/٩٧ لە لاپەڕە/٢٠دا باسی ئەوەی کردووە ئیمڕۆ ئاوێستا لە شەش بەشی سەرەکی پێك هاتووە :

١ ـ (گاتا)کان ٢ ـ (یەسنا) ٣ ـ (یەشت) ٤ ـ خوردە ئاڤێستا ٥ ـ ڤیسپەرد ٦ ـ (ماڤەندادی) کە ئەمەی دوایی لە ئاوێستادا بە (Vidaevata ـ ڤیدای ڤاتا) نوسراوە کە مانای : یاسای دژ بە دێو دەگرێتەوە.

ئاوێستا لە یەك زەمانداو بە دەستی یەك کەس نەنوسراوەتەوەو (گاتا)کان کۆنترین بەشەکانی ئاوێستایەو سروود بێژەکەی خودی زەردەشت خۆی بووە. مێژووی بەشی گاتا دەگەڕێتەوە بۆ زەمانی سەدەی دەهەمینی پێش زایین، بەلآم بەشەکانی تری لە دواییداو بە دەستی چەند کەسێك تۆمار کراوە. ئەو زمانەی ئاڤێستای پێ نوسراوە زمانی ئاڤێستای پێ دەڵێن کە زمانێکی کۆنی ڕۆژئاوای ئێرانەو پەیوەندیەکی زۆر بە هێزی هەبووە لەگەڵ زمانی (سنسکریتی)و (پارس)ی کۆن.

(دەربارەی ئەو پەیوەندیەی نێوان زمانی ئاوێستاو سنسکریتیو پارس کە ئەو کتێبە باسی کردووە تۆفیق وەهبی جارێك بۆی باسکردم، ئەوانەی لەو سەردەمەدا بە سنسکریتیو پارسی کۆن دەدوان زمانەکانیان زۆر نزیك بووە لە یەکتری، بەلآم سەیر ئەوە بووە هەمووی ٦٠٠ ــ ٧٠٠ساڵ پاش ئەوە ئەو سێ زمانە لە یەکتری دوور کەوتوونەتەوە لە کاتێکدا بەرلەوە زۆر لەیەکتر چوون وەکوو چۆن ئیمڕۆ روسەکانو پۆلۆنیەکان لە یەکتر ئەگەن ئەوسا ئەوانیش لەگەڵ یەکتردا وابوون، بەلآم بۆچی ئەوان بەو جۆرە لەیەکتر دوور کەوتونەتەوەو ئەمان لە یەکەوە نزیکن هۆکەی نەزانراوە چیبووە).

نووسەری کتێبی (ئاڤێستا)، (یەسنا ـ هات)ەکانو (گاتا)کانی شیکردوتەوەو چەند باسێکی وەرگێڕاوە بۆ زمانی کوردیو لە پاشکۆی کتێبەکەیدا فەرهەنگۆکێکی بۆ ووشەکانی ئاڤێستا کردووە بە زمانی کوردیی کرمانجی خوارو.

لە سەرچاوەکانی پێشوودا، لە باسی مێژووی کوردا زۆرجار باسی (میدی)کراوە کە زۆربەی سەرچاوەکان کوردیان بردۆتەوە سەر (ماد)و لای هەندێکیشیان وابووە ئاوێستا لە دواییدا بە زمانی (ماد) نوسراوەتەوە دەربارەی میدییەکانو ئاینەکەیان (کە بەر لە زەردەشت بووە). نووسەری سەرچاوە/٩٧ لە لاپەڕە/٩دا باسی پیاوە ئاینیەکانی (میدیا)ی کردووە کە چۆن ڕۆڵێکی

گرنگیان بینیوه له ژیان‌و داب‌و نه‌ریت‌و ده‌ستورو رامانی میتۆلۆجی نه‌ته‌وه‌كانی ناوچه‌كانی ئه‌و سه‌رده‌مه‌و پیاوه ئاینیه‌كان هه‌تا دوای روخانی ده‌وڵه‌تی ماد، هه‌ر هه‌وڵی ئه‌وه‌یان داوه هه‌موو شتێك له ژێر ده‌سه‌ڵات‌و كارتێكردنی خۆیانا بمێنێته‌وه.

هه‌روه‌كوو (هیرۆدۆت) باسی كردووه، ساتێك (كوپوچیه)ی كوڕی كوّرۆش به‌ره‌و مصر ده‌ڕوات موغێكی كرد به (پاتی خیشای ئه‌یه ـ كه‌ئیمڕۆ ئه‌و ووشه‌یه كراوه به‌پادشاه) كه ئه‌م موغه‌ش برایه‌كی هه‌بووه ناوی (به‌ردیا)بووه كه شێوه‌ی زۆر له (كه‌پوچیه‌ی كوڕی كوّرۆش) چووه‌و موغوكه لای خه‌ڵك بڵاوی كردۆته‌وه ئه‌م (به‌ردیابه) كوڕی (كوّرۆش)ـه‌كه له مێژووی ئێراندا به (به‌ردیای درۆغین ناوی هاتووه)و هیرۆدۆت به (سه‌مه‌ردیس) ناوی بردوه‌و بۆماوه‌ی حه‌وت مانگ به پادشا ناسرا كه مه‌به‌ستی ئه‌و موغه ئه‌وه بووه ده‌سه‌ڵات دوباره بكه‌وێته‌وه ده‌ست خۆیان كه (ماد)بوون.

ساتێك ئاینی زه‌رده‌شتی له‌ناو ماده‌كانا په‌یدا بوو، موغه‌كان له سه‌ره‌تادا دژی راوه‌ستان‌و زه‌رده‌شت ناچاربوو ولاّتی خۆی به‌جێ بێڵێت‌و پاش ماوه‌یه‌ك ماده‌كان چوونه سه‌ر ئاینی زه‌رده‌شت‌و دوباره توانی‌یان ده‌سه‌ڵاتی ئاینی بگێڕنه‌وه بۆ خۆیان.

ده‌رباره‌ی ئاینی زه‌رده‌شت مامۆستای مێژوونوسی به‌رزی كورد ئه‌مین زه‌كی، له لاپه‌ره/٢٨٠ی كتێبه‌كه‌یدا سه‌رچاوه/٣٢ به دوورو درێژ باسی ئاینی زه‌رده‌شتی كردووه‌و وتوویه‌تی :((له‌ناو میلله‌ته كۆنه‌كانی ئاریدا، زه‌رده‌شت یا ئه‌بێ پێغه‌مبه‌رێك بووبێت یا رێكانیشانده‌رێكی كۆمه‌لایه‌تی ئێجگار به‌رزو لێ هاتوو بووه‌كه له راستیدا نازانرێ كه‌ی‌و له كوێدا له دایك بووه‌و چۆن ژیاوه‌و له‌كام به‌شی ئاریه‌كان بووه‌و له چ كاتێكدا كتێبه‌كه‌ی كه(زه‌ند ئاڤێستا)یه ئاماده‌ی كردووه‌و به‌چ زمانێك نووسیویه‌ته‌وه‌و تا ئێسته پسپۆڕان‌و شاره‌زایان به ته‌واوه‌تی له‌سه‌ر ئه‌وه رێك نه‌كه‌وتون‌و یه‌كێكی وه‌كوو (مستر جاكسون)كه شاره‌زایه‌كی گه‌وره‌یه له‌ئاینی زه‌رده‌شتدا وتوویه‌تی :

زرادشت له‌نیوه‌ی دوهه‌می سه‌ده‌ی حه‌وته‌می پێش زایین له دایك بووه، به‌لاّم له‌گه‌ڵ ئه‌و بۆچوونه‌ی میستر جاكسون، نه‌زانراوه له‌چ ساڵێكدا له‌دایك بووه‌و،

ڕوایەتە زەردەشتیەکان لایان وایە ئەم پێغەمبەرە یا ئەم ڕێ نیشاندەرە لە سەدەی حەوتەمدا لەدایك بووەو لە کەناری دەریاچەی (ورمیە)دا بیروباوەڕەکانی خۆی بڵاوکردۆتەوەو لە ناوەڕاستی نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی پێش زاییین کۆچی دوایی کردووە.

شارەزایەکی تر کە (مستر هول)ـە لە لاپەڕە/٥٥ی کتێبەکەیدا (مێژووی ڕۆژهەڵاتی نزیك) وتوویەتی ڕوایەتە کۆنەکان دەڵێن زرادشت لە ساڵی ٥٩٦ پ.زدا لە دایك بووەو سەرچاوە کۆنەکانی تری زەردەشتی دەڵێن زرادشت کوڕی (پواو شیب)بووەو هەر لە منداڵیەوە موعجیزەی گەورەی تیادا بەدی کراوە کە ئەمە بوتە هۆی ئەوە سیحربازو کاهنەکانی ئەو سەردەمە ڕقیان لێی بووەو هەوڵیانداوە بیکوژن بەڵام تەقەلاکانیان بێ سوودبووە.

ساتێك زرادشت تەمەنی گەیشتوتە بیست ساڵ خۆی لە خەڵك دوور خستوتەوە (لە سەرچاوەی پێشودا ژمارە/٩٧ وەکوو باسمان کرد وتوویەتی لە تەمەنی ٣٠ساڵیدا ڕویکردوتە دەشتو کێو)و چۆتە کەناری ڕوباری (دائیتیا ـ کە پێشی دەڵێن ڕوباری الرس ـ ئاراکس)و لەوێ داوای لە خەڵك کردووە دەس بکەن بە خواناسیو خواپەرستیو (جاویدان)ی پیرۆز زرادشتی بردۆتە خزمەت (ئاهورامزد)و دوای ئەوە چۆتە وڵاتی (توران = سجستان – سگستان)و دەستی کردووە بە بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی بەڵام تەقەلاکانی بێ سوود بووە چونکە پیاوە ئاینیەکان ڕێگەی ئەوەیان لێ گرتبوو.

پاش ئەوە زرادشت بە پێی فەرمانی ئاهورامزد چۆتە لای (ویشتاسب) کە حاکمی (باختر) بووە. (لە سەرچاوەی ژمارە/٩٧دا وتراوە حاکمی باختران بووە)؛ ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەڕە/٢٨٢ی کتێبەکەیدا وتوویەتی هەروەکوو (مستر هول) باسی کردووە ویشتاسب باوکی داریوس بووە. پاش تەقەلادانێکی زۆر زرادشت توانیبوی بەهۆی (جاماسب)ەوە ویشتاسب بخاتە سەر ئاینەکەی خۆیو بەوە ئاینی زەردەشت بەناو ئێرانو تووران‌و ئاسیای بچوکدا بڵاوبووەوە.

زرادشت لە تەمەنی پیریدا لە شەڕێکدا لەگەڵ شەعبی (هیونی)دا کە سەرکردەکەیان (ئاجاسب)بووە کوژراوە(لە سەرچاوەی پێشودا/٩٧ وتراوە لە شەڕی تووڕانیەکانا بە سەرکردایەتی (توربراتور) کوژراوە).

ئەمین زەکی لە لاپەرە/٢٨٣ی سەرچاوە/٣٢دا دەربارەی زەردەشت و ئاوێستا بە دورو درێژی باس کراوەو لەبەر ئەوەی زەردەشتی ئاینی باوو باپیرانی کورد بووە بۆیە بە پێویستم زانی کورتەیەکی ئەو باسەی ئەمین زەکی بخەمە پێش چاوی خوێندەواران کە وتوویەتی:

((بەپێی کتێبی (ئابستاق – ئاڤێستا)و هەندێ کتێبی پەهلەویەکان، تعالیمی زەردەشت جیهانی کردووە بە دوو بەشەوە: رووناکی‌و تاریکی، کە ئەو دو هێزە هەمیشە لەگەڵ یەکتردا ناکۆك بوون‌و لە شەڕدا بوون‌و هەرجارەی یەکێکیان سەرکەوتووەو لەسەر ئەو بناغەیە دنیا بووە بەدوو بەشەوە : هێزی سوپای روناکی‌و هێزی سوپای تاریکی، سەرکردەی هێزی یەکەم (هرمز – ئاهورامزد)بووە و هی بەشی دوهەم (ئاهریمن – ئیگریمنو)بووە. هرمز شەش یارمەتی‌دەری هەبووە پێیان وتراوە (ئیمشپنتان – کە مانای زیندوە پیرۆزەکان دەگرێتەوەو هەر شەشیان هەمیشە ئامادەی بەجێهێنانی فەرمانەکانی (هرمز) بوون‌و هەریەکەیان کارێکی پێ سپێراوە بۆ پارێزگاری کردن لە سروشت)، بۆ نموونە : (بەهمەن) لێپرسراوی ئاگربووە، (ئەسفندیار) لێپرسراوی زەوی بووە. لەپاش ئەو شەشە، تاقمێکی هەبووە کە ژمارەیان زۆربووە بەلام لە ناویانا (یزیت، یزد، ئیزد) لە هەمویان بەناوبانگتر بوون‌و ئەو تاقمە کرابوون بە دوویەشەوە: بەشی ئاسمانی‌و بەشی سەر زەمین. (ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەرە/ ٢٨٤دا وتوویەتی وشەی هرمزو ئاهود رامزد) هەردوکیان هەر ووشەی (یزدان) دەگرێتەوە).

بەرامبەر بە ئاهورامزد، ئەهریمەنیش چەند یارمەتیدەرو سەربازێکی هەبووەکە پێیان وتراوە (دیو – دئو)و یارمەتیدەرەکانی بریتی بوون لە شەش دێو کە ئەوەیان پێ سپێردرابوو رێگە لە کاری خێر بگرن‌و خەریکی خراپەو درۆو تاریکی‌و زۆرداری‌بن‌و هەروەکوو چۆن هرمز ژیانی پێ سپێردرابو، بەرامبەر بەو ئەهریمەنیش مردنی پێ سپێررابوو، لە ئەنجامی کێشەی هەردولادا ئاهورامزاد سەردەکەوێ‌و ئەهریمەن ناچار دەکا بکشێتە دواوە بۆناو دنیای تاریك‌و نوتەك)).

بە پێی باسەکەی ئەمین زەکی، بناغەی ئاینی زەردەشت لەسەر چوار شت پێکهاتووە: ١ – هەوا ٢ – ئاو ٣ –ئاگر ٤ ـ خۆڵ کە ئاگر دروشمی تایبەتی زەردەشت بووە.

ئەمین زەکی ئاماژەی بۆ کتێبی (مێژووی کۆنی رۆژهەڵاتی نزیك) کردووە کە لە لاپەڕە/٥٥٧یدا وتوویەتی: بەر لە دەرکەوتنی ئاینی زەردەشت پیاوە ئاینیەکانی ئەو سەردەمە کە پێیان وتراوە (مغ ـ مەجوس) هەموو شتێکیان موقدەس بووەو بەبێ بڕیاری ئەوان هیچ شتێك نەکراوەو لەوە ئەچێ لە زەمانی زەردوسدا پاشماوەی ئاینە کۆنەکان لەناو چوبێتو زەردەشتی بووە بە ئاینی رەسمی بۆ هەموو ئێران.

دەربارەی ئەو ئاینەی میدییەکان لەسەری ڕۆیشتون وەکوو ئەمین زەکی باسی کردووە، شتێکی تەواو لەو روەوە روون نەبۆتەوە، بەلاّم هەندێ لە پسپۆڕان و شارەزایان دەڵێن میدیەکان پێڕەوی ئاینەکەی هرمزیان کردووەو هرمزیان پەرستوە، بەلاّم هەندێ لە پیاوە ئاینیەکان ئەو ئاینەیان پڕ کردووە لە ئەفسانەو سیحربازیو ساتێك زرادشت هەوڵی داوە ئاینەکەی پاك بکاتەوە لەو سیحرو ئەفسانانە، (موغ)ەکان بەرەنگاری بوونەتەوەو ئەویش ناچار بووە روویکاتە باختران و خۆراسان و تورکستانی ئیمڕۆ.

ئەمین زەکی بە دورو درێژی باسی ناوەڕۆکی ئاینی زەردەشتی کردووە کە ئەمەی خوارەوە کورتەی بەشە گرنگەکانیەتی:

**١ ـ چۆنێتی دروست کردنی دنیا**

هرمز لە پێشدا گیانەکانی دروست کردووەو بۆ ماوەی سێهەزار ساڵ سەرپەرشتی کردون، بەلاّم لە دواییدا ئەهریمەن لەدنیای تارکستانەوە پەیدا بوو دەستی کرد بە دەسدرێژی کردن بۆ سەر دنیای رووناکی لە دوای تەواو کردنی گیانی زیندەوەرەکان، هرمز لەماوەی سێ هەزار ساڵدا دنیای بە سێ قۆناغ دروست کرد کە لە دوا قۆناغیا گیانی مرۆڤی دروست کردو ئەهریمەنیش دەستیکرد بەوێرانکاریو تێکدان و لەگەڵ هرمزدا لە ماوەی سێهەزار ساڵدا کەوتە کیشەوەو دوای ئەوە زەردەشت پەیدا بوو توانی ئەهریمەن لاواز بکاتو ناچاری کرد خۆی بکێشێتەوە بۆ ناو دنیای تاریکستان.

٢ ــ دەربارەی گیانی زیندەوەرو رۆحی زیندەوەر

بەپێی ئاینی زەردەشت، ساتێك زینـدەوەر دەمـرێ، لـەپاش سـێ‌رۆژ بەسـەر جیابوونـەوەی رۆح لـە لـەش، ئیـتر رۆح هەسـت بەخۆشـیو شـادی دەکـاتو دەیگەیەنێتـە پـردی (چینویـت)و لـەوێ سـێ قـازی محاکمـەی دەکـەنو چاکــەو خراپەکانی بە ترازوو دەکێشنو بـە پێـی ئـەو کێشـانە بڕیـار لەسـەر ئـەو رۆحـە ئەدرێتو پاش ئەوە رووەکاتـە پردێکـی تـرو پێوسـتە بەسـەریا بپەڕێتـەوە کـە سـەرێکی ئـەو پـردە لەسـەر لوتکـەی چیـای (بـرز)ەو ئـەوی تـر دەگاتــە ئـاوی (دائیتیا)و ئەگەر خراپەی لە چاکەی زۆرتر بووبێت ئەوا دەکەوێتە خوارەوە بۆناو دنیای تاریکستان.

بەپێی ئاینی زەردەشت، ئەو رەوشتو کردارە باشانەی پێویسـتە لـە مرۆڤـدا هەبن بریتیە لە: نیازی پاك، ووشەی چاك، کردەوەو رەفتاری بـاش کـە بـەزمانی ئاڤێستا ئەو سێ شتە بریتین لە :(هۆمیتە، هوواختە، هودارشتە) مرۆڤ بە پێڕەو کردنی ئەم شتانە دەگا بە شوێنیك کـە لـە زمانـە کۆنـەکانی ئـاریدا پێـی وتـراوە (ئینوە هێشت ـ بەهەشت)و رۆحی تاوانباریش دەچێتە دنیای پڕ لە ئێشو ئـازار کە بریتیە لە (جەهەنەم)، بەلاّم شوێنێکی ناوەندیش هەیە لە نێوانی هەردولادا بۆ رۆحــی ئەوانــەی چاکــەو خراپــەیان وەکویــەك وابووبێــت کــە پێــی دەوترێ:(هیمستیکان) کە لەلای موسوڵمانەکان پێی دەوترێ (الاعراف).

٣ ــ ئیشو کارە باشەکان

بـە پێـی مبادئـەکانی زەردەشــت، باشــترین کــارونیش لــەژیانا بریتیــە لــە کشتوکاڵ کردنو بایەخدان بە ئابووریو پارەدارێتی، کە ئەمانـە بناغـەی ژیـانی مرۆڤ پێك دەهێنن، لەبەرئەوە بڕیاری زەردەشت لەو ڕووەوە بـۆ جوتیـارو فـەلاح ئەوە بووە بەرۆژوو نەبن چونکە رۆژوانەتی هێزو تینیان لێ دەبرێو ناتوانن شـتی باش بهێننە بەرهەم.

٤ ــ پێویستە لەسەر پەیڕەوکەرانی ئاینی زەردەشت چوارشت بپەرستن

هـەوا، ئـاو ، ئـاگر ، خـۆڵ کـە ئـاگر دروشمــی تایبــەتی زەردەشــت بــووەو پیسکردنی ئاوو ناشتنی لەشی مردوو لەناو خۆڵدا بـە تـاوان دەژمێررێ (وادیـارە وەکوو هندۆسەکان لەشی مردوو سوتێنراوە).

دەربارەی ئەوەی لە ئاینی زەردەشدا باس کراوە، وەکوو ئـەمین زەکـی لێـی دولوە، هەندێ شتی لەیەکچوو هەیە لە نێوان ئاینی زەردەشتیو ئاینەکانی تردا، بۆ نموونـە پەڕینـەوەی دوای مـردن بەسـەر ئـەو دوو پـردەی لـەو باسـەدا بـاس کراوەو کێشو پێوانەی چاکوخراپە زۆر لە (پردی سیراط)ی ئیسـلام دەچـێ کـە مرۆڤی خراپەکار ناتوانێ لێی بپەڕێتەوە، هەروەها قەدەغەکردنی ناشـتنی لەشـی مردوو لەناو خاکدا لەگەڵ سوتاندنی لەشی هندۆسەکان لەیەك دەچێت.



میحرابی زەرتوشت – ی لە تەنیشتی خۆرهەلاتی دەربەندی

(قەمچوغە = سەرتەنگ)ی لای – سورداش

پارێزگەی سلێمانی

**دووەم : بڵاوبوونەوەی ئاینی کریستیان و کورد**

لەدوای ئاینی زەردەشت و بەر لە بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام، ئاینی کریستیان لە ساڵی۳۳/ی زایندا گەیشتبووە (ئەرمەنیا) بەڵام هەتا سەرەتای سەدەی چوارەمی زایین ئەو ئاینە سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەخۆوە نەدیبوو، هەتا دوای ئەوە لە رێگای سوریاو ئەرمەنیاو کوردستانەوە پەرەی سەندوە بەهۆی لایەنگریتی و هاندانی حکومەتی (رۆما)وە کە بووە بە کریستیان و لایەنگری بڵاوبوونەوەی لەکوردستان و (تیرداد)ی مەلیکی ئەرمەنی چۆتە سەر ئەو ئاینە تازەیە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و کوششەی قەشەکانی ئەو ئاینەو پروپاگەندە زۆرەکانیان هێشتا دانیشتوانی گوندو کۆچەرەکانی پێدەشت و چیاکان هەرلەسەر ئاینی زەردەشت مابوونەوەو ژمارەیەکی کەمیان بوون بە کریستیان.

ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەرە/۱۲۱ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کتێبی (المسألة الكردستانية والترك)کردووە کە لە لاپەرە/۲٥یدا وتوویەتی ئاسوریەکانی ئێستە لە بنەچەدا هەر لە رەگەزی کورد بوون و چوونەتە سەر ئاینی مەسیحی کە مەڵبەندی بطریارکی نسطوری یەکان لە شاری (قوچان) نزیک رۆژهەڵاتی شاری (جوڵەمێرگ)بووە.

دەربارەی ئەو بۆچوونەی لەو کتێبەدا باس کراوە، (مارشمعون) بەرلەوەی لەگەڵ سمکۆدا تیک بچێ و سمکۆ بیکوژێ، لە گفت و گۆیەکی نێوانیانا هەروەکوو لە لاپەرە/۲۹٦ی کتێبەکەی سمکوو بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد، چاپی ستۆکهۆڵم ساڵی ۱۹۹٦ بە دوورو درێژی باسی ئەو گفتوگۆیە کراوە کە مارشمعون بە سمکۆی وتبوو. ئەم سەرزەمینەی ئێستە ناوی کوردستانە هی هەمومان بووە، بەڵام بەهۆی ئاینمانەوە هەردولامان لێك جیا بوینەوەو بەم حاڵەی ئێستە گەیشتوین.

ئەمین زەکی لە باسەکەیدا لەسەری رۆیشتوەو وتوویەتی:

((بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی (السمعاني)، نسطوریوس سەرۆکی ئەو کوردانە بووە کە بوبوون بە کریستیان و لە ئەنجامی ئەوەدا بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی (Ephossus ئیفوسوس) لە ساڵی ۳٤۱/ی زایندا ئافەرۆزکراوەو بە پێی فەرمان و

بڕیاری (تیودوسیوس) کە لە پێشدا دورخراوەتەوە بۆ (ئەنطاکیە)و دوای چوارساڵ لەوێش دورخراوەتەوە بۆ (لبنان)و نێرراوە بۆ (Thbid ـ ثبد)و لەوێ مردوە)).(وەکوو لەو باسەدا دەرئەکەوێ نسطوریوس بۆیە لەلایەن کریستیانەکانەوە دورخرابووەوە چونکە تاقمی نسطوریی دامەزراندبوو).

ئەمین زەکی لە باسەکەیدا ئاماژەی بۆ دوو جۆرە بۆچوونی السمعانی کردووە دەربارەی چۆنیتی بڵاوبوونەوەی نسطوری لە وڵاتانی ڕۆژهەتدا یەکەمیان ئەوەیە لە شاری (ئەدسا ـــ الرها ـــ ئورفە) قوتابخانەیەکی ئێرانی هەبووە گەنجێکی ئێرانی دەرسی کریستیانێتی تیادا وتووەتەوە کە سەرۆکەکەیان قەشەیەکی نسطوری بووەو بەهۆی (ئیفسوس)ەوە مذهبی نسطوری لە ئێراندا بڵاوبۆتەوە.

بۆ بۆچوونی دوهەم ئاماژەی (Barsuma) ـ باسورما ـ ناوێك کردووە کە لە قوتابخانەی (ئەدسا) دورخرابووەوەو لە ساڵی ٤٢٥ی زایندا هەتا ساڵی ٤٨٩ لە شاری (نصیبین) بە مطرانی مابووەوەو پاش ئەویش (هازیتای) قوتابی بارسوما زۆر چالاك بووە لە بڵاوکردنەوە مذهبی نسطوریدا، ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەڕە/١٢٢دا وتوویەتی بەپێی بۆچوونی (مێجر میلنغن)، نسطوریەکان بە خوێنو رەگەز دەچنەوەسەر (کلدین ـ خلدین) کە باپیریان بەر لە (٢٥)سەدە ژیاونو لەو شەڕەدا کە (زینفون)و خسروی دوهەم بە جووتە هێرشیان بردۆتە سەر ئەو (خلدی)یانەو زینفون بە خسروی وتووە ئەو شاخانەی لێمانەوە دیارن پێیان دەڵێن (شاخەکانی خلدییەکان).

ئەمین زەکی لە باسەکەیدا ئەڵێ : ئەو نسطوری یانەی ئێستا لەوناو شاخانەدا دەژین بریتین لە نەوەی ئەو (خلدی)یە کۆنانەو نسطوریەکان خۆیشیان هەروای بۆ دەچن بەپێی بۆچوونی راهب (کازەجای) نسطوریەکان لە نەوەی ئەو خلدییانەن.

دەربارەی ئەو کلدی ـ خلدی یانە، وەکوو لەمەوپێش لە باسی مێژووی کوردا باسی بۆچوونێکی (مینۆرسکی) کراوە کە وتوویەتی : ئەگەر بە وردی لە مێژووی خلدیەکان بکۆڵینەوە بۆمان دەردەکەوێ خلدییەکان لەگەڵ میللەتی کوردا هەرلە یەك رەگەزو بنچینە بوون. ئەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەڕە/٤٢ی سەرچاوە/٣٢دا وتوویەتی :((زمانی خلدییەکان وەکوو زمانی گورجی وەیا

(اللاظ)ی ئێستە وابووەو بەهیچ جۆرێك زمانەكەیان پێوەندی بە زمانە سامیەكانەوە نەبووە.

سێهەم: كوردو ئاینی ئیسلام

ئەمین زەكی لە لاپەڕە/١٢٢ی سەرچاوەی ژمارە/٣٢دا باسی ئەوەی كردووە چۆن كورد بووە بە ئیسلامو لەبەرئەوەی باسەكە ئێجگار دوورو درێژەو ئێمە مەبەستمانە بەشێوەیەكی تایبەتی دەربارەی باكووری كوردستان بدوێین، بۆیە تەنها زۆر بە كورتی لەو باسەی ئەمین زەكی ئەدوێینو لە باسەكانی داهاتوودا زۆرجار باسی ئیسلامەتی كورد دەكرێت كەچۆن خزمەتی ئاینی ئیسلامەكانیان كردووە بەتایبەتی لە زەمانی ئەیوبیەكانا بە سەركردایەتی صلاح الدین.

كورتەی باسەكەی ئەمین زەكی بریتیە لەوەی ساتێك ئاینی ئیسلام بڵاوبووەوە، كورد پەیوەندی بە پێشڕەوی ئیسلامەكانەوە كردووەو لەبەر ئەوەی كورد بۆی دەركەوتبوو ناوەڕۆكی ئەو ئاینە لەگەڵ خووڕەوشتی خۆیدا یەك دەگرێتەوە بۆیە بە كۆمەڵ بوون بە ئیسلام.

وەكوو مێژوو نووسە عەرەبەكان باسیانكردووە، پێوەندی كردنی كورد بە ئیسلامەوە یەكەم جار لەساڵی ١٨/ی كۆچیدا بووە لەدوای داگیركردنی (حلوان)و (تكریت)، هەروەكوو محمد ئەفەندی ئالوسی لە كتێبەكەیدا (روح المعاني) باسی كردووە لەناو صحابەكانی پێغمبەردا ئەصحابەیەك هەبووە ناوی (جابان — گابان)ی كورد بووەو لە كتێبی (الأصابة في تمیز الصحابة)ی نوسینی (أبن الحجر)دالەدەم گابانە گەلێك حدیثی پێغمبەر لەو كتێبەدا بڵاوكراوەتەوە.

لە دوای شكاندنی (یزدگرد)ی شای ئێرانو داگیركردنی (مدائن — طاقی كسری)و (جلولاء)لە مانگی صفری ساڵی ١٦ی كۆچیدا بەرامبەر مارسی ساڵی ٦٣٧/ی زایین، ئیتر پاش ئەوە كورد پەیوەندی بە ئیسلامەوە كردووەو شاری (نصیبین) لە لایەن (عبدالله بن عتبە)ی سەركردەی هێزەكانی ئیسلام لە زەمانی عمری خطابدا داگیر كراو لەوێوە هێزی ئیسلام روویكردە (ماردینو دیاربكرو ئەرمەنیا)و بەوجۆرە ئاینی ئیسلام لە كوردستاندا (هی باكور) بڵاوبووەوە.

بێگومان ئاینی ئیسلام لەناو کوردا وەکوو میللەتانی تر، لەناو کوردیشدا گەلێك رێبازی جۆر بەجۆر هاتۆتە کایەوە وەکوو سونیو شیعە (بە علویو ئەهلی حقیشە)وەو یزیدیو هەوڵ ئەدەین کورتەیەکی ئەو رێبازانە باس بکەین.

**رێبازەکانی ئاینی ئیسلام**

**أ ـ سونی**

زۆریەی ئەو سەرچاوانەی دەربارەی ئاینی کورد دواون لەسەر ئەوەن زۆریەی کورد موسوڵمانی خاوەن ئیمانو پەیرەوانی هەرچوار ریبازەکەی رێچکەی شافعین. مینۆرسکی لە کتێبەکەیدا کورد، سەرچاوە/٤٣ لە لاپەرە/١٠٧دا لە بەشی ئاینی کوردا وتوویەتی بەشی زۆری کورد موسوڵمانی سونین کە ئەمە لە زەمانی عسمانیەکانا بوبوو بەهۆی ئەوەی تورکەکان (شافعی نەبوون وەکوو کورد بەڵکو حەنەفین) سوودێکی زۆر لەو سونێتیەی کورد پەیدا بکەنو بیانکەن بە هاوکاری خۆیان دژی صفویەکانی فارس لە شەڕی چالدێرانی ساڵی ١٥١٤دا.

**ب ـ شیعەو علویو ئەهلی حەق**

کورد لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامدا لە کوردستان، هەمووی لەسەر رێبازی ئەو تازە ئیسلامانەی گەیشتبوونە کوردستان دەچون بەرێوەو هەموو لەسەر مەزهەبی سونیبوون، بەڵام لەدوایدا بێجگە لە یزیدیەکان کە رێبازەکەیان تاڕادەیەك زۆر دوور نەکەوتبووەوە لە ئاینی زەردەشت هەرچەند هەندێ شێوەی ئاینیئیسلامو کریستیانی تێکەڵ کردبو بەئاینی زەردەشت، ئەوانی تر لە هەندێ شوێنی کوردستاندا، بەتایبەتی لە رۆژهەڵاتی کوردستانو لە باکوردا، بەتایبەتی لەدوای گەرم بوونی کێشەی نێوان دەوڵەتی عوسمانیو صفوی، ئیتر بەئاشکرا شیعەیەتیو علی اللاهی لە هەندێ شوێندا بڵاوبوونەوەو لە باشووری رۆژهەڵاتی کوردستاندا لە سنەوە بەرەوخوار ئاینزای شیعە بڵاوبووەوەو لە باکووری کوردستانیشدا شیعەیەتی (کە لە باکوردا پێی دەوترێ علوی) بڵاوبووەوەو لە هەندێشوێنی کەمی باشووری کوردستانیشدا رێبازی ئەهلی حەق پەیدا بووە.

دەربارەی علوی، مینۆرسکی هەندێ جار بە (قزڵباش) ناوی بردوون‌و وتوویەتی: ئەمانە لە ناوچەی (درسیم)دا دەژین سەر بۆ تورکەکان دانانەوێنن‌و لەو شتە باشانەی قزڵباشەکان (کوردەکانی باکوور ووشەی قزڵباش بە جۆرە ناوێکی سووك دائەنێن بۆخۆیان‌و لایان واباشە هەرپێیان بوترێ علوی)باوەڕیان پێیەتی ئەوەیە خوا بۆیە هاتۆتە سەر زەوی بۆ ئەوەی ئیشی خێر بکات بۆ خەڵك‌و لایان وایە (علی) جەنگاوەرەو شیرە گەورەکەی خۆی داوەبە روسیاو نیشانەیەکی سەوزیشی داوە بە ئینگلیز بۆ ئەوەی بە هەردولایان تورکەکان لەناو بەن (بێگومان ئەگەر ئەمە وابێ، دەبێ بۆچوونی ئەم سەردەمەی دوایی بێ‌و لام وایە ئەوەی مینۆرسکی باسی کردووە جۆرەچیرۆکێکی هەڵبەستراو بووبێت چونکە ئەو شیرەی گوایە علی دابووی بە روسەکان (چ لە زەمانی قیصرەکانا بووبێت یالە زەمانی سۆڤێتدا)و نە ئەو نیشانە سەوزەش کە دابووی بە ئنگلیز هیچیان سودی کوردی تیادا نەبووەو ئەوەی روس هەر بە قسە بووەو هی ئینگلیزەکانیش هەر درۆو دەسبڕین بووەو هەردولایان هەریەکەیان لە قۆناغێکدا دۆستی تورك بوون نەك هی کورد).

مارتن ڤان برونسون جگە لە کورتە باسێك دەربارەی (علوی) لە سەرچاوە/٧٣دا، لە کتێبێکی تریدا سەرچاوە/٦٦ وتوویەتی علویە کوردەکان لە باکووری کوردستاندا لە رۆژئاوای باکووری کوردستاندا لە غازی عنتاب ــ بنگۆل دەژین لەگەڵ مەرکەزی ئیستایان (درسیم) کە بەشێك لە محافظەی تونجلی‌و بەشێك لە سیواس‌و ئەرزنجان‌و ئالاداغ دەگرێتەوە.

مارتن ڤان برونسنیش هەروەکوو مینۆرسکی وتوویەتی علوییەکانی ئیمڕۆ لە کۆندا پێی وتراوە (قزڵباش) کە ئەم وشەیە لای علوییەکان بە شتێکی سووك دەژمێرن‌و وتوویەتی ووشەی (قزڵباش) مانای سەر سوور دەگرێتەوە کە ئەمە بۆ ئەوانە بەکار هێنراوە ساتی خۆی سەربەستەکانیان سووربووەو سەر بە صفوییەکان بوون).

دەربارەی قزڵباش، لای گردلێڤیسکی وەکوو دوکتۆر کمال مەزهەر لە سەرچاوە/٣٤دا، لاپەڕە/٢٣٦ ئاماژەی بۆ کردووە، وتوویەتی :(( لە کاتی چاو پێکەوتنی (علی شان کوڕی محمود پاشا)ی قزڵباشدا کە سەرۆکی هۆزی

قوچگیری)بووه وا رێکەوت رۆژی یەکتر بینینمان لە مانگی رمضاندا بوو پێی
بێتە قزلْباشەکان دان بە مانگی رەمضاندا نانێن‌و لە جیاتی ئەوە لە مانگی
محرمدا تەنها دوو رۆژ بۆ یادی تینوێتی (حسین) لە بیابانی کربلادا یادی
دەکەنەوە. ساتێك داوام لە علی شان کرد باسی (خضر ئەلیاس)م بۆ بکا
رەنگێکی هێناو رەنگێکی بردو وتی ئەوە شتێکی نەهێنی‌و تایبەتیە، مەگەر لە
خەویدا بۆت باس بکەم. بەوەدا بۆم دەرکەوت قزلْباشەکان تاچ رادەیەك لە شتی
نهێنیدا قایمکارن)).

دوکتۆر کمال مەزهەری وەرگێری باسەکەی گردلێڤسکی لە لاپەرە/۲۳۷دا
سەرنجی خۆی بەرامبەر بەو گفت‌و گۆیەی گردلێڤسکی‌و علی شان بەم جۆرە
دەسی کردووە:

((وادیارە گردلێڤسکی نەیتوانیبوو شتێکی ئەوتۆی لە علی‌شان دەسگیر بێت.
جۆیە وادیارە ناچاربووە لە ریگەی ئەرمەنیەکەوە دەمی گەیشتۆتە قزلْباشێکی
تر توانیوێتی چەند شتێکی لەوانەوە دەسگیر بێت، کە ئەو قزلْباشانە بە
گردلێڤسکی‌یان وتووە: قزلْباشەکان لەناو خۆیانا یەکتری باش دەناسنەوە بەوەی
گولیە ئەستێرەیەك بەسەر ناوچەوانی هەریەکێکیانەوە هەیە تەنها خۆیان نەبێ
کەسی‌تر ئەو ئەستێرەیە ناناسێتەوە)).

دەربارەی ریش‌و سمێڵی قزباشەکان، گردلێڤسکی وتوویەتی :((قزلْباشەکان
لە تەمەنی(۳۰)ساڵی‌یەوە رێش دەهێڵنەوەو دەسکاریی ناکەن‌و هی‌وایان هەیە
مووی ریش‌وسمێڵی بەشی دروستکردنی شەرواڵێك دەکات.لای سونییەکان ریش
تاشین رەوایە بەلام لای قزلْباشەکان هێشتنەوەی ریش خێری بەدەمەوەیە
چونکە هەمووتاڵەموویەك (پەری)یەك خۆی پیادا هەڵدەواسیّ، لەبەر ئەوە
تاشینی باش نیەو گوایا ئەڵێن کاتی خۆی کە ئیمامی علی پێغەمبەری شتووە
(دیارە دوای مردنی بووە)، ئاو لە ناوکیا کۆبوتەوەو علی ویستویەتی ئەو ئاوە
وەکوو موفەرکێك بخواتەوە کە دەمی تێناوە مووی ریش‌و سمێڵی علی بەو ئاوە
تەربووەو دوای ئەوە ئیمامی علی هەتا مردنی ریش‌و سمێڵی خۆی نەتاشیوەو،
بەڵگەیەکی تریش هەیە لای قزلْباشەکان بۆ مانەوەی ریشی درێژ کە بریتیە لە

ریشە درێژەکەی حەزرەتی عیسا)). گردلێڤسکی لەوباسەدا ژمارەی (قزلباش ـ علوی)یەکانی بە پتر لە یەك ملیۆن داناوە.

دەربارەی علی ئیلاهی : مینۆرسکی وتوویەتی علی ئیلاهی‌یەکانیش باوەڕیان بە (دۆنادۆن ـ تناسخ الارواح) هەیەو ئاماژەشی بۆ کتێبێکی نوسراویان کردووەکە بەشێوەی (گۆران) نوسراوەو یەکێك لە کتێبەکانیان کە ناوی (سەرەنجام)ە،من (مینۆرسکی)خۆم بە بەختەوەر زانیبوو کە بۆ یەکەم جار دەسنووسیکی ئەو کتێبەم دەسکەوتو لەچاپ درا.

مینۆرسکی باسی ئەوەشی کردووە کە چۆتە بنکەیەکی پیرۆزی علی ئیلاهیەکان لە گوندی (پیرە دیوەر) لە هەورامان کە گۆڕی (باوە یادگار)ی لێیە لەو باسەی مینۆرسکیدا دەرئەکەوێ کەلای وابووە ئەهلی حەق و علی ئیلاهی‌و کاکەیی هەر لەسەریەك ڕیباز بوون.

ج ـ ڕێبازی یزیدی

مارتن ڤان برونسن لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٢ لە کورتە باسیکی دەربارەی یزیدی دواوە کە وتوویەتی : یزیدی (ئێزیدی)یەکان زۆرجار بە ناڕەواو بە تەوسەوە بە شەیتان پەرستیان ناودەبەن (تۆفیق وەهبی باسێکی چاپ نەکراوی هەیە بەناوی ـ یزیدیەکان شەیتان پەرست نین ـ بەداخەوە تا ئێستە چاپ نەکراوە)،هەرچەندە بێ ئاکام دەگێڕرێنەوە سەر ڕەگەزێکی سوننی توندڕەو. بەلاّم لەزۆر ڕووەوە لێکچوونیان لەگەلّ ڕەگەزی شیعەی توندڕەودا هەیەو هەتا واپێدەچێت هەر موسولّمانیش نەبن.

ئەم ئاینە تایبەتە بە کوردو ئێزیدیەکان بە کرمانجی دەدوێن‌و لەوەتەی هەن لەلایەن هاوسێ موسلّمانەکانیانەوە ڕاودەنرێن‌و زۆریان لە ترسانا خاکی ولاّتی خۆیان بەجێ هێشتوەو هەندێکیان لە ترسانا بوون بە موسولّمان یاخود بەفەلەو پێوەندیان لەگەلّ فەلەکانی دەوروبەریانا باشترە وەك لەگەلّ موسولّماندا.

بۆخۆم (مارتن) زۆر فەلەی وام دیوە کە باووباپیرانیان کۆنە یزیدی بوون.

زۆربەی یزیدیەکان لە کێوەکانی (شەنگار ـ سنجار)و ناوچەی شێخان دەژین کە مەزاری پیرۆزی (شێخ عادی)لێیەو لە سالاّنی سی‌و چلەکانی سەدەی رابوردودا (مەبەست سەدەی نوزدەهەمە) لە دەست زۆرو ستەم هاتون‌و لە

قەوقاز گیرسانەوە، لە کوردستانی تورکیاش لە کێوەکانی (تورعابدین)و (باتمان) ێزیدی هەن‌و ژمارەیەکی زۆریان لەتاو جەورو ستەمی موسوڵمانان وەکوو کرێکار ڕوویان کردوّتە ئەڵمانیا (لام وایە راستتر وابوو بیوتایە لەتاو جەورو ستەمی تورکەکان).

دەربارەی یزیدی، ئەمین زەکی لە لاپەرە/٢٩٣ی سەرچاوە/٣٢، ئامـاژەی بـۆ کتێبی (تأريخ الموصل) کردووە کە وتوویەتی نـاوی یزیـدی لـەوەوە هـاتووە کـە بـوەڕیان بە خوایەك هـەبووە نـاوی (یزیـد ــ یـان یـزدان) بـووەو هیـچ پێوەنـدی یەکیان نیە بە (یزید) کە خلیفەی ئەمەویەکان بووە. ئەمین زەکی ئاماژەشی بۆ (ثیوفانیس)ی مێژووناسی یۆنانی کردووە کە لە سەدەی حەوتەمی زایندا ژیاوەو باسی ئـەوەی کـردووە کـە (هراقلیـوس) ئیمـپراتۆر لـە نزیـك شـاری (درسـیم)دا بنکەیەکی سوپایی دامەزراندبوو کە بەپێی بۆ چوونی (میجر راولنسن) ئەم شـارە نزیك موصل بووەو یزیدیەکان لەم شارەدا پەیدا بوون‌و لەوێوە بڵاوبوونەتەوە بـۆ شوێنی تر کە زۆریەیان لە موصل‌و سنجارو قەزای شێخاندا دەژین.

ئەمین زەکی ژمارەی هەموو یزیدیەکانی بـە (٣٠٠)هەزارکـەس دانـاوە (ئـەمین زەکی لە پەراوێزی لاپەرە/٢٩٤دا وتوویەتی (مـس. روزیتـا فوریـس)ی گـەڕیدەی ئنگلیز بەر لە شەڕی جیهانی ژمارەی یزیدیی بە چارەکە ملیۆنیك داناوە.

هەندێ کەس یزیدیـەکان دەبەنـەوە سـەر مذهبـی (المانویـە)و هـەندێکی تـر دەیبەنەوە سەر ئاینی زەردەشتی‌و یزیدیەکان باوەڕیان بە بوونی دوو خوا هەیەو بـە پێویسـتی دەزانـن ڕۆژیـش‌و شـەیتانیش بپەرسـتن‌و ئەمانـەش وەکـوو زەردەشتیەکان باوەڕیان بەخوای روناکی‌و تاریکی هەبووە (هرمـزو ئەهریمـەن)و پەرستنی شـەیتانیان لەبـەر ئەوەیـە لێی ئەترسـن‌و دەیانـەوێ بـەوە خۆیـانی لێ بپارێزن. یزیدیەکان سەرۆکێکی گەورەیان هەیـە کـە لـە ناوچـەی شێخان دەژی‌و پێی ئەڵێن (ئـەمیری شـێخان)و گـەورەترین زەعیمـی هـەمو یزیـدی پـیێ دەڵێـن (باباشێخ).

ئەمین زەکی لە کۆتایی ئەو باسەیدا باسـی هـەندێ نـەریت‌و رەوشـتی یزیـدی کردووە وەکوو سوجدە بردن بو (ملك طاوس)و ئیمانیان بـە (دۆنـادۆن ــ رۆحـی زیندەوەرێك لە دوای مردن ئەچێتـە لـە شـێکی تـروەو کتێبـە پیرۆزەکـەیان پێـی

دەڵێن (جلوە) کە لەلایەن (شێخ عدی)ەوە نوسـراوەو کتێبێکـی پیرۆزیـان هەیـە بـەناوی (مصحفـی رەش) کـە لـە سـاڵی ٧٤٣هـ = ١٣٤٢ز دا نوسـراوە دەربـارەی نەریتو یاسای ئاینی یزیدی لەو سەدەیەدا کە تیایا نوسراوە.

دوا باسێك کە دەیخەینە پێش چاو باسێکی مینۆرسـکی‌یە/سـەرچاوە/٤٣ کە ئەمیش وەکوو ئەمین زەکی باسی (جلـوە)و (مصحفـی رەش)ی کـردووە کـە لـە ساڵی ١٨٩٥دا میسنێرێکی انگلیزی (هـ.باری ـ هـ. ئوبـاری)ئـەو دو کتێبـەی دیـوە کە بـە عـەرەبی نوسـراون بـە چـاپکراویو لەلایـەن (ئەنسـتاس مـاری)کـە رۆژهەلاتناسێکی گاوری عەرەب بووە لە صندوقێکدا لە کنیسەیەکی سـەر چیـای سنجاردا هەڵگیرابوو، وە (ئاماری) توانیبوی پاسەوانی ئەو کنیسەیە رازی بکاتو رێگـەی پێبـدا لـە مـاوەی دووسـاڵدا کۆپیـەکی راسـتی هـەروەکوو هـەردوو دەسنوسـەکە نوسـیبووەوە، بەوەی کاغـەزێکی تـەنکی خسـتبووە سـەرپەرە نوسـراوەکانو بـە ئاسـانی توانیبـوی هـەروەکوو خۆی هـەموو لاپـەڕەکان شـکل نووس بکاتو بەوەش وازی نەهێنابوو بـەڵکو نیشانەکانیشـی لێـك دابـووەوە. لـە دواییدا لە ساڵی ١٩١٣دا لەلایەن (م.بێتنەر)ەوە لە شاری ڤینـا ئـەو تێکسـتانەی هەروەکوو خۆیو بەشێوەیەکی راست بلاّوکردبووەوە.

مینۆرسـکی لـە باسـەکەیدا وتوویـەتی ووشـەی یزیـدی لـە ووشـەیەکی کۆنـی ئێرانییەوە وەرگیراوە کە بریتیە لـە (ئیزید) کـە مانـای خـوا دەگرێتـەوە (وەکـوو لەوەی ئەمین زەکیشدا هەروای بۆ چـوە). مینۆرسـکی لـە باسـەکەیدا وتوویـەتی کتێبی یەکەم جلوە کە لە لایەن (هـ.بـاری)یـەوە نوسـرابووەوە لـە سـاڵی ١٨٩٥د دوای ئـەوەش لـە سـاڵی (١٩٠٩)دا کتێبەکـەی دوهـەمیش (مەبەسـتی مصحفـی رەشە) لە گوڤارێکی ئەمریکی‌دا بلاّوکراوەتەوە.

**هـ ـ رەوشتی کوردو باری کۆمەلایەتی ناو کورد**

هەر لە کۆنەوە هەتا ئیمڕۆ دوژمنانی کورد هەوڵیاندلوە میللەتی کـورد وەکـوو میللەتێکی دڕندەو دواکەوتو لەقەڵەم بدەنو جاریوا هەبووە هەندێ لە گـەڕیدەو میسینەرەکان زۆر درۆو دەلەسەیان لە دوژمنانی کوردەوە بیستوەو لـە یاداشـتو باسەکانیانا تۆماریانکردووە، بۆ نموونەی ئەمـە وەکـوو لەبەشـی مێـژووی کـورد ئامـاژەمـان بـۆ کـردووە دوکتـۆر جمـال نەبـەز بەرپـەرچی هـەندێ لـەو درۆو

ـﻪلەسانەی داوەتەوەو نموونەیەکی تری ئەمە ئـەو درۆو دەلەسـانەیە (کارلمـای)
ئەلمانی بەخەیالّی خۆیو بەپێی ئەو باسـانەی لـە دوژمنـی کـوردەوە بیسـتبووی
کردویـەتی بـەچیرۆكو ئەوانـەی ئـــەوەی کارلمایـــان خوێندبـــووەوە وەکـــوو
سەرچاوەیەك حسابیان بۆ کردووەو بەپێی بۆچوونەکەی ئەو حسـابیان بـو کـورد
کردووەو هەشبووە بـۆ هـەندێ مەبەسـتی سیاسـی هـەوڵی داوە نـاوی کـورد
بزرێنێت، بۆ نموونەی ئەمە، مێجرسۆن بەرلەوەی بکرێت بە ئەفسەرێکی سیاسـی
ـە زەمانی شێخ مەحمودا لەدوای شەڕی جیهانی، لە ساڵی ١٩٠٩دا بەناوی (میرزا
حسین غلامی شیرازی)یەوەچۆتـە باشووری کوردسـتانو گەشـتێکی کـردووە لـە
ساڵی ١٩١٢دا ئەو گەشتەی چاپکردووەو بەئارەزوی خۆی هەندێ درۆو دەلەسەی
هەلبەستوەو وتوویەتی کوردە موسوڵمانە دلّرەقـەکان هـەوڵیانداوە بـە زۆرەملـێ
گاورو جوولەکـەکان بکـەن بـە ئیسـلامو ناچاریـانکردون جلوبەرگـەکانی خۆیـان
بگۆڕنو جلی کوردی لەبەر بکەن، بەلاّم سـەیر ئەوەیـە مێجرسـۆن هـەرخۆی لـەو
کتێبە چاپکراوەیدا خۆی بەدرۆخستوتەوە کە وتوویەتی:

((ساتێك چوومە سلێمانیو دوکانێکم بەکرێ گرت بۆخۆم لە خـانێکدا بـەناوی
بازرگانیەوە، لەو خانەدا یەکدو دراوسێی کریستیانی لێ بوو لەگەڵیانا بوم بەئاشنا
کە یەکێکیان ناوی (متی) بوو، بۆی باس کردم کە ئەمە مـاوەی بیسـت سـاڵە لـە
شـاری سـلێمانیدا خـەریکی کاروکاسـبیی خۆیـەتی بـەبێ ئـەوەی تووشـی هیـچ
گێچەڵێك بووبێـتو لـەوەش سـەیرتر ئـەوەبووە لـەدواییدا کـە شـێخ مـەحمود
حکومەتی کوردیی دامەزراند (خواجـە کریمـی علکـە) کـە کریسـتیانیکی ناسـراوو
بەڕێز بوو شێخ مـەحمود کـردی بـە وەزیـری مالیـەی خـۆی لـەو حکومەتـەدا کـە
مێجرسـۆن خـۆی یـەکێك بـووە لـە دوژمنـانی ئـەو حکومەتـە کوردیـەو لەگـەڵ
ئەدمونسدا هەرچییێکیان لە توانادا بووە بۆ تێکدانی ئەو حکومەتە کردبوویان.

هەرچۆنێك بووبێت، لەم باسەدا هەوڵئەدەم کورتەیەکیئەو باسانە باس بکـەم
کە بێگانەکان دەربارەی ڕەوشتی کورد بە چاكو خراپەوە نوسیویانە :

باسیل نیکتین لە لاپەڕە/٦٥ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٤ باسـی گەڕیدەیـەکی
کردووە (فازر) لە سەدەی نۆزدەدا بە کوردستانا گەڕاوەو نوسیوێتی :

((لەناو کوردەکانا ڕەوشتی دەرەبەگێتی زۆر توندو تیژەو عەشیرەتەکان هەروەکوو سکوتلندیەکان بەر لە چەند سەدەیەك چۆن ڕەفتاریان دەکرد کوردەکانی ئێستە بەوجۆرەن. کورد بە راستگۆو دەسپاك ناسراون‌و بەڵێن‌و پەیمانەکانی خۆیان بەباشی‌و تەواوی بەجێ دەهێنن‌و کەسوکاری خۆیان خۆش دەوێ‌و ڕەوشت‌و ڕەفتارێکی مرۆڤانەیان هەیە بەرامبەر بە ئافرەت‌و حەز لە شیعرو ئەدەب دەکەن‌و ئامادەن گیانی خۆیان بەخت بکەن لەپێناوی عەشیرەتەکەیاناو شانازی بەولآت‌و نەتەوەیەکەیان دەکەن‌و زۆر بە شانازی‌و دڵسۆزیەوە ئەڵێن : ئێمە کوردین. لەگەڵ ئەوەشدا کورد زۆر زوو تووڕە دەبێ‌و هەندێجار لەسەر شتێکی بچوك هەڵدەچێت‌و زۆرجاریش حەزلە گاڵتەو گەپو باسی ئەو هەڵچوون گڕوگەفەی خۆیشی بە پێکەنینەوە دەگێڕێتەوە)).

باسیل نیکتین لە کتێبەکەیدا باسی گەڕیدەیەکی تری کردووە کە فرنسی بووەو ناوی (بندر)بووە لەساڵی ١٨٨٧دا بەکوردستانا گەڕاوەو وتوویەتی : لەگەڵ ئەوەشدا کورد لە حاڵەتی کۆچەریدایە، بەلآم خاوەنی ڕەوشتێکی بەرزە لەڕووی پاراستنی کەرامەتی خۆیەوەو ئەو بەڵێنەی ئەیدا بەتەواوەتی بەجێی دەهێنن‌و ئەگەر بەڵێنی ئەوەی پێدای بتگەیەنێتە شوێنێك، هیچ مەترسەو لەگەڵیا برۆ بۆ ئەو شوێنەی مەبەستتە، بەلآم دووریش نیە ڕۆژێکی تر ئەگەر تۆی بینی ئەگەر پێویست بکا لەوانەیە بەوپەڕی ڕقەوە ڕەفتارت لەگەڵدا بکا.

باسیل نیکتن لە لاپەڕە/٨٦ی هەمان سەرچاوەدا دەربارەی ئافرەتی کورد وتوویەتی :((ئافرەتی کورد لە ڕەوشت‌و ڕەفتاریا بە تەواوەتی دەماری سروشتی کوردایەتی تیادا ڕەنگ ئەداتەوەو لەگەڵ ئەو هەموو ئەرکە گرانەی بەسەرشانیەوەیەتی‌و زۆربەیان سوارچاکن‌و بە سەختترین چیادا هەڵدەگەڕێن‌و یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی کچ‌وژنی کورد داوێن پاکیە کە لەمەدا جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ئافرەتی کوردو ئافرەتی تری ڕۆژهەلآتیەکان‌و لەناو کوردەواریدا کوڕوکچ تێکەڵ بەیەکتر دەبن‌و بەر لە مارەکردن شارەزای خووڕەوشتی یەکتر دەبن)).

دەربارەی ئافرەتی کورد مێجرسۆن لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/١٠٧ لەباسی ئافرەتی کوردا وتوویەتی : ئافرەتی کورد بە پێچەوانەی ژنی فارس‌و تورك،

سانێك میوانێك دەچێتە ماڵێكی كوردو پیاوی ماڵەكە لەوێ نابێ، ژنەكەی بەوپەڕی سەربەستیەوە دەچێت بەپیر میوانەوەكەوەو خزمەتی دەكا هەتا مێردەكەی دێتەوە، ئەوسا جڵەوی ولاخی مێردەكەی دەگرێ‌و دەیباتە ناو تەویلەكەوە)).

مینۆرسكی لە لاپەڕە/١٤٩ی كتێبەكەیدا سەرچاوە/٤٣باسی توڕەیی‌و كەللەڕەقی كوردی كردووەو وتوویەتی :

((چەند كوردێك لەكاتێكدا بەڕێگادا دەڕۆیشتن لەناو خۆیانا لەسەر شوێنی هەڵهاتنی ئەستێرەی گەلاوێژ دەبێ بە مشتومڕ، پێش ئەوەی ئەستێرەكە لە ئاسمان دەربكەوێ یەكدوانێكیان لەگەڵ یەكتردا تێك دەچن‌و لەناو خوێنی خۆیانا دەگەوزێن‌و كە ئەستێرەكەش هەڵدێ شوێنەكەی وەكوو ئەوەی ئەوان نابێ. كوردەكان لەهەندێ شتدا لە (ئەلبانی)یەكان دەچن‌و لەزەت لەوە وەردەگرن بەهۆی فیشەكەكانیانەوە هێزو تواناو دەسەلاتی خۆیان پێشان بدەن، بەلام نابێ ئەوەشمان لە بیربچێت هەموو ساڵێك لەوديوی قەفقاسدا (١٥٠٠)دەكوژرێت كە (٣٨٩)ی لە ناوچەی (ئەلیزابث پول)دا كوژراوە)).

مامۆستا شكور مصطفی لە گۆڤاری كۆڕی زانیاریدا/سەرچاوە/٩٨باسی چەند گەڕیدەیەكی لە توركیەوە كردووە بە كوردی كە بەكوردستانا گەڕاون‌و لەویاسەیدا وتوویەتی :

((سوڵتانە توركەكانی ئەستەمبوڵ هەروەكوو پادشاكانی صفویی ئێران، جگە لەچەند ئاسەوارێك كە بریتیە لە خانووبەرەی بەجێماو هیچ بایەخێكیان نەدابوو بە زانست‌و گەشەپێدانی باری ژیانی دانیشتوان‌و بە تەنگیانەوە نەهاتوون‌و ئەمە بووە بەهۆی ئەوەی گەڕیدە ئەوروپاییەكان بە چاوێكی سووك روانیویانەتە دانیشتوانی سەرانسەری ولات‌و هەندێ لەو گەڕیدانە عەرەبیان بە بیابان گەڕو تەمبەڵ باس كردووەو كوردیان بە جەردەو ڕێگرو توركیان بە تەنگە چێكڵدانەو توورەو تڕۆ باسكردووەو وتویانە ئەگەرچی فارس زۆر درۆزنن بەلام بەرواڵەت خۆش خوو بەئاكارن، ئەوانەی كوردیان بە پیاوخراپ باسكردووەو ناویان زڕاندوە بریتی بوون لە كارگێڕو هەمەكارەی تورك‌و عەجەم‌و چینی بیروكرات‌و بازرگانەكانی ولاتانی دراوسێی كوردو ئەو ناوو ناتۆرانەی لەمانەوە بەسەر كوردا

دابڕاوه گه‌ڕیده‌كانی ڕۆژئاوایی بێ‌سێ‌و دوو پاك‌وپیسییان تۆمـار كردووه له‌سه‌ر حسابی كوردیان ژمـاردوه. بێگومـان درۆزریگـر نـه‌ك ته‌نـها لـه ڕۆژهـه‌لاتدا، بگره له‌سه‌رانسـه‌ری ڕۆژئاواشـدا هـه‌بووه، بـه‌لام سـه‌رله بـه‌ری نه‌ته‌وه‌یـه‌ك به‌ئه‌شـقی له‌قه‌له‌م دان كارێكی ناڕه‌وایه‌و دژی بیری زانسته.

به‌تێكڕایی، عه‌ره‌بی شارستانێتی یاخود بازرگانی عه‌جـه‌می چه‌كمـه‌ڕه‌ق‌و بـه گیرفان‌و باخه‌ڵی پڕ له زێڕو پاره‌ی شاراوه، به‌تایبه‌تی زستانان كـه بـه چیاكـانی كوردستانا تیپه‌ڕیانكردووه، هه‌موو سامیان لێ نیشـتوه‌و زاره‌تـره‌ك بـوون‌و بـه‌بێ ئه‌وه‌ی كه‌سیش ڕێگـه‌یان پـێ بگرێـت هه‌رلـه خۆیانـه‌وه دڵیـان كرمـێ بـووه‌و لـه ڕووتكردنه‌وه زنده‌قیان چـوه)). بـه‌لام سـه‌یر ئه‌وه‌یـه هـه‌تا ئێسـته لـه یاداشـتی تۆماركراوی هیچ گه‌ڕیده‌یه‌كدا یاداشتی یه‌كێكیان له‌وه نه‌دواوه كه لـه شـوێنێك ڕیگه‌ی پێ گیرابێ‌و ڕوتكرابێته‌وه.

له‌ڕاستیدا ئه‌م هه‌موو ورێنه بێ سه‌روبه‌رانه هـه‌مووی لـه سـام‌و دڵ پیسـیه‌وه چه‌كه‌ره‌ی كردووه‌و له‌و ڕووه‌وه ئارشاك سافرستیان وتوویه‌تی :((له سه‌رده‌مێك كه دوو ده‌وڵه‌تی ده‌سه‌لاتداری گه‌وره‌ی دراوسێی كورد دانیـان بـه‌وه‌دا نـابوو كه كورد شارستانیه‌تێكی خۆماڵیی كوردیان دامه‌زراندبوو، هه‌روه‌كوو ئه‌ولیا چلبی له گه‌شته‌كه‌یدا لێی دواوه. به‌لام زۆری پێ نه‌چووه پاشاو سوڵتانه‌كانی هـه‌ردولایان میرنشینه‌كانی كوردیان خسته ژیرده‌سه‌لاتی خۆیـان‌و سـه‌ربه‌خۆییان لێ داڕنـین‌و ولاته‌كه‌یان پێخوست كـردن‌و سـه‌ره‌ڕای ئـه‌وه كارگێڕه‌كـانی عوسمـانی‌و عه‌جـه‌م كوردیان به یاخی‌و ڕێگر ناوبردوه‌و ناویان زڕاندوه)).

ئه‌ولیا چلبی ده‌رباره‌ی هه‌ڵوێستی تورك‌و عه‌جه‌م به‌رامبه‌ر به كورد وتوویه‌تی هه‌ر میرنشـینێكی كـورد لـه ڕووی بۆجه‌و گومـرگ‌و بـاج سـه‌ندنه‌وه هه‌ریه‌كـه‌یان بۆخۆی ده‌وڵـه‌تێك بـووه‌و پادشـای تـورك‌و خـانی عه‌جـه‌م‌و كاربه‌ده‌ست‌و هه‌مه كاره‌كانیـان ئـه‌و بـارو دۆخـه‌ی كوردیـان پـێ قـووت نـه‌ده‌چوو چاویـان بـه‌رایی نـه‌ده‌هێنا میره‌كـانی كـورد بـه‌وجۆره ببینـن‌و باج‌وگومرگ لـه كـاروان‌و قـه‌تاری بازرگانی‌و قه‌ڵه‌مچی بسێنن بۆیه مافی كـورد بـۆ كۆكردنـه‌وه‌ی گومـرگ‌و بـاج بـۆ به‌ڕێوه‌بردنی كاروباری ناوچه‌كانیان ئه‌مه‌یان بـه دزی‌و جـه‌رده‌یی دانـاوه‌و ته‌نـها هه‌ر بیریان له پركردنی گیرفان‌و باخه‌ڵی خۆیان كردوته‌وه.

ئەوليا چلبى لە گەشتەكەيدا هۆى راپەرينو ئەوشۆرشانەى كە لە سالّى ١٦٥٤دا لەنێوان مەليك ئەحمەد پادشاى كاربەدەستى توركو (ئاودال خان)ى كوردو ميرى بدليس ئەوەبو ئەو ميرە كوردە زۆر زۆر زاناو سەرراستو دەولّەمەند بومو چەند كۆمەڵە كتێبو تاقمە شتى هونەركاريى ئەوتۆى هەبووە كە لەو سەردەمەدا هاوتايان نەبووە.

مامۆستا شكور مصطفى لە كۆتايى باسە وەرگێراوەكەيدا باسى چەند گەريدەيەكى رۆژئاوايى كردووە كە ياداشتەكانيان كراون بە توركىو ئەميش كردونى بە كوردى وەكوو :

١ - (بازرگانى بىّ ناوى ڤەنديك - ى ئيتالى - كە بەكۆنترين گەريدە دەژمێرێت كە لە سەدەى شازدەهەمدا بە كوردستانا گەراوەو ياداشتەكەى لە سالّى ١٥٥٩دا لە ئيتاليا بلاّوكراوەتەوە كە باسى كۆشكو تەرارە جوانەكەى ميرى سليسى كردووەو چۆن شاە ئيسماعيلى صفوى شەش هەزار سوارى ناردوّتە سەرى، بەلاّم كە شەرِى عوسمانىو صفوى دەستى پێكردووە شاە ئيسماعيل ناچاربووە هێزەكەى بكێشێتەوە.

٢ - (مستر ئەفونسو) كە خەڵكى ولاّتى پورتوغال بووەو لە سالّى ١٥٦٥ لە گەرانەوەيدا بەگەشت لە هندستانەوە بەناو (بدليس)دا تێپەرِى كردووەو باسى قەلاّيەكى كردووە كە لەسەر دوندى بەردەلاّنێك دروست كرابوو، بورجەكانى سەريان لە ئاسمان دەسوو شوورەكەى لەداگيركردن نەدەهات.

٣ - (پترو ديلاڤال) لاوێكى ئەرستۆكراتى رۆمانيى بووە لە گەشتەكەيدا گەيشتوەتە قەسرى شيرينو لايداوەتە مالّێك مێردەكەى لەمالّەوە نەبووە بەلاّم ژنەكەى كە (خانم سولّتان)بووە نانى ئێوارەى بۆ كردووەو خواردەمەنيى كوردەوارى بۆ داناوەو ديلاڤال لە ياداشتەكەيدا باسى خواردەمەنى كوردو زمانى كوردىو بارى ژيانى ناو كوردەواريى كردووەو وتوويەتى كوردەكان زمانى خۆيان هەيە لە زمانى دراوسێكانيان ناچێتو زۆريان شوانكارەنو گەرميانو كوێستان ئەكەنو ساتێك چوومە ئەستەمبولّ، لەوێ چاوم بەخانى (بدليس) كەوت كە يەكێكە لە دەسەلاّتدارانى كوردو خاوەنى ١٠ ــــ ١٢هەزار چەكدار دەبێت. دەسەلاّتدارەكانى كورد هەروەكوو سنيۆرەكانى ئەوروپا خۆيان پێشان ئەدەن

هەرچەند لە ژێر سایەی شاکانی عجەمو عوسمانیشدان. دەسەڵاتدارەکانی کورد وەکوو میرەکانی ئیتاڵیا رەفتار دەکەنو ئەمانیش لە پێناوی سوودی خۆیانا ناوبەناو لایەنگر گۆڕکێش دەکەن. ژنی کورد لەناو شارەکانیشدا سەربەخۆیەو بەبێ پەچەو چارشێو دەگەڕێنو دەتوانن لەگەڵ پیاوی بێگانەو نا مەحرەمدا بێپەروا یەکتر ببینن و گفتو گۆیان لەگەڵ بکەن)).

ژنەکەی مێجرسۆن لە محاضرەکەیدا ، سەرچاوە/٦٢ دەربارەی ئەو رەخنانەی لەکورد گیراوە وتوویەتی :((هەندێکی تر بە وێرانکەرو کاولکەر ناویان بردونو هەندێکیان کوردیان بە خوێنرێژو دەستدرێژیکەر باسکردووەو هیوایان هەبووە شوڵی لێ هەڵکێشاوەو وتوویەتی کورد توزێك لە حەیوان باشترن، ئەوانە هەرچۆنێکیان باس کردبێت، ئەبێ راستیەکیش هەیە پێویستە بخرێتە بەرچاو کە ئەو خراپکارییەی بەهۆی هەندێ کوردەوە روو ئەدا ئەگەر دەوڵەتێکی ئەورووپاییش لە هەمان بارو دۆخی کوردا بژی ئەوا تاوانو پیاوکوژیو دەستدرێژی کردن لەناو ئەو دەوڵەتە ئەورووپاییەشدا لەوەی ناو کورد زۆرتر دەبێت.

کورد لەناو خۆیدا نارێکو یەك نەگرتوون هەرلەبەر ئەوەش بووە کاتی خۆی بوبوو بەهۆی سەرنەکەوتنی شێخ محمودو شێخی بارزانو فارسو تورکو عراق توانیبویان بەسەر کوردا زاڵ بن.

بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو شتانەشدا یەکێك لە سروشتەکانی کورد ئەوەیە ئێجگار زۆر حەز لە گاڵتەو گەپ دەکەنو لەورووەوە گەلێك سەرگورشتەی سەیرو پڕ لە پێکەنین دەگێڕنەوە کە ئەمەی خوارەوە یەکێکە لەوانە :

(کوردەکانی تورکیا دەگێڕنەوە وەختی خۆی باپیری یەکێك لە سەرکردەکانی عەشیرەتی (تاپۆ) باردەکات بۆ ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی عەشیرەتێکی تورك کە ناوی (ئیل بیکلر)بووە، سەرۆکی عەشیرەتە تورکەکە کوردەکان دەعوەت ئەکا بۆ ئاهەنگێكو کوردەکان دەچنو لەدوای چەند رۆژێك کوردەکان بڕیارئەدەن ئەوانیش تورکەکان دەعوەت بکەنو هەواڵیان بۆ دەنێرن لە فلان رۆژدا بچن بۆ دەعوەتەکەیانو ساتێك ئەو زەلامەی ئەی نێرن بولای تورکەکان کەوا چاوەڕوانی هاتنیان دەکەن بەو زەلامە ئەڵێن : ئێمە چۆن زیافەتی ئێوە قبوڵ دەکەین؟

زەلامە کوردەکە کە گوێی لەو وەرامە ئەبێ بەردەبێتە گیانی تورکەکان و ژمارەیەکیان پەرێشان دەکات و دەگەڕێتەوە.

بەرامبەر بەوە، سەرۆکی تورکەکان پیاوەکانی خۆی رادەسپێرێ تاقمێك بچنە سەر کوردەکان و لە هەوارەکەیان دەریان پەڕێنن، بەڵام پیرەکانی ئەو تورکانە مقصەی سەرۆکەکەیان ناکەن و ریشسپیەکیان پێی دەڵێ : ئێمە چۆن بچین بەگژ تقمێکی وادا کە تاقە زەلامێکیان توانیبێتی بچێت بەگژ (٣٠)کەسماناو باشترین شت ئەوەیە ئێمە خۆمانیان لێ دووربخەینەوەو هەوارەکەمان بگوێزینەوە.

دەربارەی ئەو ئازایەتیەی خاتو سون باسی کردووە کاشکی کورد بەقەد ئەوەش یەك گرتوویوایە).

ژنەکەی سون لە محاضرەکەیدا دەربارەی ئافرەتی کورد وتوویەتی :((ژنی کورد بە پەچەو ڕووپوشی نیەو لەناو کوردا ژن و ژنخوازی بەوپەڕی سەربەستیەوە دەکرێ و ژن دەسەلاتێکی زۆری هەیە لە هەڵبژاردنی ئەو مێردەی شووی پێدەکا. ژنی کورد زۆریەی سوارچاکەو دەتوانێ چەك هەڵبگرێ زۆرجار ژنی کورد لە شورش و ڕاپەرینەکاندا بەشداربوون)).

لەکۆتایی ئەم باسەدا، بە پێویستم زانی چەند سەرنجێکی دوکتۆر جمال نەبەز بخەمە بەرچاو کە لە لاپەڕە/٣٢ی سەرچاوە/٣١دا باسی چەند بێگانەیەکی کردووە دەربارەی ڕەوشتی کورد دواون:

١ ـ مینۆرسکی لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ باسێکی (ئابۆڤیان)ی ئەرمەنی کردووە کە وتوویەتی : مرۆڤ بەمانای ووشە دەتوانێ کوردەکان بە شۆڕە سوارەکانی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست نێو ببات کە میللەتێکی پەیمان نەشکێنن و میوان دۆستێکی بێ وێنەن.

٢ ـ زانای ئەڵمانی (Mortin Hortman) لە کتێبەکەیدا ـ پێنج ڕاپۆرت دەربارەی ئیسلام چاپی ساڵی ١٩١٢وتوویەتی :((ئەگەر بڵێم کوردەکان نەتەوەیەکی وان کولتوری ئەورووپی بە ئاسانی وەردەگرن، ڕەنگە هی واهەبێ بەرپەرچم بداتەوە، بەڵام ئەو بێگانانەی بەکوردستانا گەڕاون لەوباوەڕەدان نەتەوەی کورد لەژێر ئەو توێکڵە ڕەقەیانەوە دنیایەك بیری وردو هەستی قووڵیان

حەشارداوەو زۆر لەوانە گەواهی ئەوە ئەدەن کوردەکان ژیریەکی خۆڕسکارانەو توانای شیکردنەوەو تێگەیشتنێکی خێراو رەوشتێکی بەرزیان هەیە)).

٣ ـ لەو راپۆرتەی لە ساڵی ١٩٢٤دا لەلایەن عصبة الامموە دەربارەی عراق ئامادە کراوەو وتوویەتی :((لەگەڵ ئەوەشدا کوردەکان شەڕانیو خۆ بەدەستەوە نەدەرنو بەلاًم دەتوانن بە ئاشتیو هێمنی لەگەڵ کەمەنەتەوەییو ئاینەکانی هاولاًتیاندا هەڵکەن. ئێمە دەتوانین گەواهی ئەوە بدەین کوردەکان لە هەموو نەتەوەی موسوڵمانی تیکە چێتر لەگەڵ دیانەکانا رەفتار دەکەن (ئەمە دوبارە بەرپەرچدانەوەی یەکێك لە درۆکانی مێجرسۆنە کە دەربارەی کورد هەڵی بەستبوو).

٤ ـ ژنەکەی مێجرسۆن لەو محاضرەیدا لە سەرچاوە/٦٢دا باسمانکردووەو دوکتۆرجمال نەبەزیش لە سەرچاوە/٣١دا ئاماژەی بۆ کردووە وتوویەتی :((کورد مرۆڤێکی ڕاست گۆو سەرڕاستن، رقیان لە درۆو تەڵەکەبازیە، ئەگەر جارێك پێویستی بەوە بکا درۆیەك بکەن نازانن چۆن ئەو درۆیە پینە بکەن)).

٥ ـ هاملتن لە کتێبەکەیدا (Road Through Kurdistan) چاپی لندن ١٩٥٨ وتوویەتی :(کوردەکان کەژو کێو نشینن، جوداوازن لە عارەبو تاڕادەیەك خۆگرن، زێتر لە سکۆتلندیەکان دەکەن، لە عارەب کەمتر بەتەنگ ژیانەوەن. حەزیان لەگاڵتەو بازیە بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە خۆیانو گەلەکەیانەوە بێ. تا ئەندازەیەك باوەڕیان بە ئاینو فەلسەفەو چارەنووس زۆرە، ئەگەر بتوانی بیانکەی بە دۆست ئیتر دۆستایەتیەکەیان هەتا سەرەو لەهی عەرەب راسترە. رێژگاو وگێل نین، بە وردی دەڕواننە بوونو ژیان، بە پێچەوانەی سەرەتاییو دواکەوتوویی وڵاتەکەیانەوە زۆر حەزیان لە زانستی نویو پێشکەوتنو پێشەسازیە)).

٦ ـ (G.J.Muller) لە باسێکدا چاپی (شتوتگارت) ساڵی ١٩٥٩ وتوویەتی :((ئەوی توشی کوردێکی ڕاستەقینە ببێ، ئیدی ئەوکەسە کوردو کوردستانی خۆش دەوێ، کورد مرۆڤی چاوگەشن، بە هۆشو کەللە ڕەقن، خاوەنی تواناو هێزێکی بەکارنەهێنراون)).

٧ ـ (توماس پوا)ی رۆژهەڵاتناس و لاهووت و دەروونناسی فەرەنسی دەربارەی سەرباز وتوویەتی :((سەربازێکی لاوی پۆڵۆنی کە کارەساتەکەی جەنگ گەیاندبوویە عراق (مەبەستی شەڕی جیهانی دووەمە کە هەندێ سەربازی پۆڵۆنی هاتبوونە دەوروبەری خانقین) پێی وتم : لەنێو هەموو گەلەکانی رۆژهەڵاتدا کە جۆی پێیان کەوتووە، کوردی لەهەموویان پێباشترە، من(توماس پوا) پێ لەسەر ئەوە داناگرم کە بزانم هۆی ئەمە چییە، چونکە پێم وایە ئەو قسەیەی لە خۆیی و بێ تەجروبەییەوە نەبووە)).

٨ ـ (Helgo Klamer) لە کتێبەکەیدا چاپی سبتمبری ساڵی ١٩٧٠ وتوویەتی :((گەر وەك دۆست بچیتە لای کوردەکان ئەوا میواندۆستێکی بێ هوتان، هەرکە بۆ ئوتێل گەڕای داوەتی ماڵەوەت دەکەن، چەندە لە دوژمنایەتیدا خەتەرناکن ئەوەندەش لە دۆستایەتیدا کەم وێنەن)).

٩ ـ دوکتۆر شاکر خصباك لە کتێبەکەیدا الكرد والمسألة الكردية چاپی بغداد ساڵی ١٩٥٩ وتوویەتی :((بەراستی کوردەکان سەربازی نەناسراون، زۆرجار بە حرابە باس دەکرێن، بەڵام لەڕاستیدا کوردەکان ڕووخۆشن، دڵپاکن، بەخشندەو لێبوردەن، خێزانی خۆیان خۆش دەوێ و وڵاتەکەیان دەپەرستن زۆر بە نەتەوەی خۆیانەوە دەنازن)).

١٠ ـ هوست برونگ لە کتێبەکەیدا چاپی ساڵی ١٩٦٣ وتوویەتی :((ساتێك کوردەکانم بینی هەستم کرد لەو گێژەنی ڕۆژهەڵاتەدا لەپڕ ڕوو بەڕووی کەسانێك دەبمەوە کە بەتەواوی پشتیان پێ دەبەسرێ)).

١١ ـ خاتو زینب لە گفتوگۆیەکدا لە ڕۆژنامەی (النور)لە بغداد/ژمارە/٢١٨ی ڕۆژی ١٩٦٩/٧/٩ وتوویەتی :

((ئیمە ئافرەتی کورد ژیرن، پێشکەوتوون و هەوڵی ڕزگاربوونی خۆیان لە زۆر کۆت و پێوەند دەدەن، باشترین نموونەن بۆ ئەوەی ئافرەتانی وڵاتەکەم چاویان لێ بکەن، ئاواتەخوازم ئافرەتی عەرەب بەلای کەمەوە بە بەشێك لەو سەربەستیەی ئافرەتانی کورد بگەن)).

١٢ ـ پرۆفیسۆرخالفین : وتوویەتی بەشێکی زۆر لە سەرچاوە رۆژ ئاوایەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا کوردیان بە درۆ جەردە ناوبردوە، بەلام ئەوجۆرە نێو نەتۆرانە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ راستیدا یەك ناگرنەوە.

١٣ ــ (ئیلون ئالبیك) ئەندامی سەرکردایەتی پارتی سوشیالستی سویدی وەکوو لە رۆژنامەی (التاخی)دا/ژمارە٢٧٦ لە ١٩٧٠/٧/١ بلاوکراوەتەوە وتوویەتی : نەتەوەی کوردم زۆر لاپەسەندەو رەوشت بەرزن‌و ئەم راستیەم لە زۆر سەرچاوەوە هەڵکۆڵیوە. ئەم رەوشتەیان لەگەڵ ئەو هەموو بارە گرانەی شەڕو ئابوری‌و جوگرافیدا هێشتا خۆڕاگرن‌و خۆبناسێنن کەئەمە نیشانەی رێکوپێکی‌و هەست کردنیانە بەلێ پرسینەوە)).

١٤ ــ (Gerald Reitlinger) لە کتێبەکەیدا چاپی/سالی ١٩٣٢ لە لاپەرە/٢٠٥دا وتوویەتی:

((بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەوروپاییەکان، کوردەکان گەلێك ژیرو وریان. جوداوازی نێرو مێیان لەلا نی‌یە، ژنان چارشێو ناگرنەوە، ئەمانە بۆ ئەو کەسەی گەشتی رۆژهەلات دەکا رووداوێکی رومانتیکیانەن، لەگەڵ ئەوەشدا نێوبانگیان بە چاکی نەڕۆیشتوە کەچی زۆر سەرنج ڕاکێشن)).

## بەشی سێهەم

# ڕەگەزی تورك‌و طورانی‌و لێشاوی هاتنیان بەرەو ڕۆژئاوای ئاسیا

هەرچەند لەم کتێبەدا مەبەستی سەرەکیمان باسی مێژووی کوردو کوردستانە بەشێوەیەکی گشتی‌و هی باکوری کوردستان بەشێوەیەکی تایبەتی، بەلاَم لەبەر ئەوەی هاتنی لێشاوی تورك بەرەو ڕۆژئاوای ئاسیاو داگیرکردنی کوردستان‌و نیشتەجێ بوونیان لەناو خاکی باکوری کوردستانداو لە ئازربایجاندا کارێکی گەورەی مێژوویی کردۆتە سەر میللەتی کوردو لەوساوە ئەوان بوون بە دەسەلاَتدار، کورد تووشی سەدان شەڕو کارەسات‌و ماڵ کاولی بووەو بەهۆی ئەوەی ئەو تورکانە بوبوون بە ئیسلام‌و ئالاَی ئیسلام‌و خلافتی ئیسلامیان بەرزکردبووەوە، ئیتر کورد هەموو توانای خۆی بۆ ئەو دەوڵەتە بەناو ئیسلامە تەرخان کردووە.

بێجگە لەوە ئیمڕۆ بەئاشکرا لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژ ڕۆژی ئازادی‌و سەربەستیەو ڕۆژی مافی چارەنوسی گەلانە، کەچی کورد لە باکوری کوردستاندا بە تورکی کێوی لەقەڵەم ئەدەن‌و دان بەبوونی کوردو بەمافی کوردا نانێن‌و وای لێ هاتووە ماڵ لەخاوەن ماڵ حەرامەو داگیرکەر بووە بەخاوەن ماڵ، لەبەر ئەوە کورد پێویستە مێژووی خۆی بزانێت، پێویستە مێژووی دوژمنە داگیرکەرەکەشی بزانێت تابزانێ چۆن ئەو داگیرکەرانەی لەژێر ناوی ئیسلام‌و خلافتی ئیسلامدا بۆ ماوەی (٥ ـ ٦)سەدە کورد بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو ئیمڕۆش لەژێر باری گرانی ئەو داگیرکەرەدا دەناڵێنێت.

وەکوو لەبەشەکانی ئەم باسەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، سەرەتای هاتنی تورك لە شێوەی هاتنی لێشاوی عەشایرەکانی (غوز)ەوە دەستی پێکردووەو بە

زنجیرە سلجوقیەکانو مەغۆلەکانو عوسمانیو تاتارەکان پاش ئەوەی هەریەکەیان لەکاتی خۆیدا گەشتی خۆی کردووەو لەگەلّ ئەوەشدا ئەولنە هەموویان لەناو خۆیانا نارێك بوونو لە شەڕێکی هەمیشەییدا بوون،بەلاّم لە ئەنجامدا هەموویان لەبوتەی دەولّەتی عوسمانیدا جۆش درانو ئەو ئیمپراتۆریەتە گەورەیان لیّ پەیدابوو کە بۆ ماوەیەکی زۆر رۆژهەلاّتو رۆژئاوایان تووشی سەدان شەڕو کاولکردنو کوشتارو ئاوارەکردن کرد.

بۆ ئاسان کردنی ئەم بەشەو بۆ ئەوەی هاتنی تورکەکان بە زنجیرە بخەینە پێش چاو کردمان بەم باسانەی خوارەوە

١ـ رەگەزی تورکو قۆناغی هاتنی پێشرەوی عەشایری (غز ـ غوز)

کەلە راستیدا هەتا کاتی عوسمانیش کۆچیان لەئاسیای ناوەڕاستەوە بەرەو رۆژئاوای ئاسیا زنجیرەی نەپچڕاوە.

٢ـ سلجوقیەکان

ئەمانە ڕۆلّێکی زۆر گرنگیان بینیوە لە بەڕێوەبردنی کاروباری هەندێ ولاّتانی ئیسلامیو خۆشیان چەند دەولّەتێکیان پێکەوە نابوو وەکوو سلجوقی عێراقو سلجوقی رۆم.

٣ـ مەغۆلەکان

مێژووی مەغۆل شتێکی شاراوە نیەو لاپەڕەکانی مێژوو پڕن لەو کوشتارو تالاّنیو راوو رووتکردن کاولکاریانەی مەغۆلەکانو تا تارەکان لە زۆر ولاّتـد کردویانە.

ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە غوزەکان لە زەمانی سلجوقیەکانو مەغۆلو عوسمانیەکاندا هێشتا لێشاوی هاتنیان هەریەردەوام بووە وەکوو لە پێشیشدا باسمانکرد، لە ئەنجامدا ئەمانە هەموویان لەناو بوتەی دەولّەتی عوسمانیدا توانەوەو بە هەمویان دەولّەتێکیان پێك هێنا کە (عوسمانی)بووە.

ـمكوو لەبەشی چوارەمدا بەناوی دەوڵەتی عوسمانیەوە بە دوورودرێژ باسی ـەکەین.

**یەکەم ـ مێژووی ڕەگەزی تورك و لێشاوی (غز ـ غوز)ەکان**

بەرلەوەی باسی هاتنی لێشاوی عەشیرەتەکانی (غز ـ غوز) بکەین ـەلوەراستی ئاسیاوە بەرەو رۆژئاوای ئاسیا، بە پێویستم زانی هەندێ لەو ـەرچاوانە بخەمە پێش چاو کە باسی نیشتمانی سەرەتایی تورکو مێژووی تورك ـە هەندێ سەرچاوەدا باسکراون‌و هەوڵ ئەدەین لەم باسەدا کورتەیەکی ئەو ـەرچاوانە بخەمە پێش چاو:

ئەمین زەکی لە لاپەڕە/٥٨ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣٢ وتوویەتی تورکەکان ـەپێی لەیەکچوونی ووشەکان بنەچەو ڕەگەزی خۆیان دەبەنەوە سەر (هون ـ ـمیا قۆن)کە لە بنەچەی (شانغ یونغ)ن کەلە دەوروبەری روباری (ئورخون)دا لە ـکوری چیندا بوون، بەو پێیە دەتوانرێ بوترێ سەدەی ٢٨/ی پێش زایین بە سەرەتای دەرکەوتنی تورك دائەنێن)).

بەڵام سعید احمد برجاوی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٢ بەشێوەیەکی تر ـاسی ڕەگەزی (تورك ـ طوران)ی کردووە کە وتوویەتی مێژوونووسان دەربارەی ڕەگەزی تورك گەلێك بۆچوونی جۆر بەجۆریان هەیەو لە راستیشدا ڕەگەزی تورك هێشتا بەتەواوەتی ڕوون نەبوتەوە.

ئەو گەلانەی لە باکوری رۆژهەلاتی (ئوراسیا)دا کە دارستانەکانی سیبریای تیادا بلاوبوتەوە لە کاتێکی نەزانراودا ئەوشوێنانەیان بەجێ هێشتوەو لە نزیك سەدەی یەکەمی میلادیدا بەرەو (تیان شان)و پانتاییەکانی دەوروبەری گۆلی (بالکاش) رۆیشتون‌و لەوێ جێگیر بوون‌و زۆری پێ نەچوو تێکەل بەو عەشایرە (بەربەر)انە بوون کەلە نێوانی گۆلی (ئارال)و (بالکاش)دا دەژیان.

ساتێك ئەو تورکانە مەترسیان بۆ سنوورەکانی ولاتی چین پەیدا کرد، دامەزرێنەری بنەماڵەی پادشایەتی چوارەمی چینی کە (پرنس شی هوانغ) بوو شورەیەکی درێژی لە سنوری چیندا دروست کرد بۆ ئەوەی رێگە لە هێرشی ئەو تورکانە بگرێ کە بەدرێژایی شورە دروستکراوە کە (١٢٥٠میل) بووە ژیابوون‌و ئەو شوورەیە لە نێوان ٢٢١ ـ ٢١٠ی پێش زایین تەواوکراوە.

لەئەنجامی تێکەڵ بوونی ئەو تورکانە لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچە تازانە گەلێك شەڕو کێشە پەیدا بووەو بۆ دەسەلاتدارێتیو دەسگرتن بەسەر ناوچەکان چەند گەلو نەتەوەیەك پەیدا بوونو لەناوخۆیانا لەبین بڕکێدا بوونو لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی ئەوهەموو چیرۆكو ئەفسانانەی دەربارەی ئەو دانیشتوانە بلاو بوبووەوە نەتوانراوە ئەو گەلو میللەتە تێکەڵ بوانە لە یەکتری جیابکرێنەوە. بەلام هەندێ مێژوونووسان لایەن وایە ئەوانەی دەسەلاتداربوون لەوناوچانەدا توانیبویان دەس بگرن بەسەر شوێنە بەرزاییەکاندا کە ئەو دەسەلاتدارانە بریتی بوون لە (کساس Cases و توکارین Tokarians و سیتس Scytes و نایمنو هونو ئەڤارسو کیبشاكو هونغ نۆو تاتارو کیرغیزو تیبگاچسو هتالیتو هەندێکی تر.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جیاوازی هەبوە لە شێوەی ژیانو جیاوازیی ناوەکانو رادەی دەسەلاتدارێتی هەندێکیان، بەلام دەتوانرێ هەموویان ببرێنەوە سەر سێ تاقمی لەیەك نزیك کە بریتی بوون لە : مەغۆل، تورك، تونغوز کە هەریەکەشیان لکێکە لە رەگەزی طورانی وەیا (ئورالو ئالتاییك oralo Altaique).

بۆ یەکەم جار نوسەرەکانی چین ناوی تورکەکانیان بە (TorKiou ـ تورکیو ناوبردوە کە ئەمە ووشەیەکی مەغۆلییە کە بە (تورك ئوت Turk ut) ناویان بردوە.ئەو تورکانە هەر لە سەدەی چوارەمی پێش زاینەوە بەبێ ووچان دەسدرێژی یان کردۆتە سەر ولاتی چینو لە دواییدا لە سەدەی شەشەمی میلاد ئیمپراتۆرێتی تورکیان دامەزران کە سنوورەکەی لە منغۆلیاوە دەگەیشتە ئێران (لە چیرۆکە کوردیەکانو فارسیدا، بەنموونە شانامەی فیردوسی باسی شەڕو کێشەی ئێرانو تووران کراوە کە رەنگە مێژوەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو دەمەی لەو سەرچاوەدا باسی کردووە).

نوسەری سەرچاوە/٨٢وتوویەتی : بەلام زۆری پێ نەچوو بەشی رۆژهەلاتی ئەو ئیمپراتۆریەتە کەوتە ژێر دەسەلاتی چینەوەو بەشەکەی رۆژئاوای کە بریتی بوو لە هەندێ عەشایری کۆچەری تێکەڵ بوون بە گەلانی ئێرانو لەناویان نیشتەجێ بوون.

جارێکی تر لە ساڵی ٧٤٥ی زاینیدا بەشەکەی ڕۆژهەڵاتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی عەشیرەتی (ویغور)و (قارلوق)ی تورکیەوە کەلەو ڕۆژانەدا ئاینی ئیسلام بەوناوچانەدا بڵاوبووەوەو لە زەمانی (ئەموی)یانا لە ساڵی ٧٠٥ی زاینیدا (قتیبە بن مسلم)ی سەرکردەی هێزەکانی عەرەب گەیشتە ئەوپەڕی ڕوباری جەیحون ـ ئەموداریا)و ئاینی ئیسلامی لەو ناوچانەدا بڵاوکردەوەو تورکەکانی بەشی ڕۆژهەلات چوونە سەر ئاینی ئیسلامو لەو ڕۆژەوە ئیتر تاقم تاقم لەو تورکانە ڕوویانکردە ولاتانی ڕۆژئاوای ئاسیاو بوون بە ئیسلام وەیا وەکوو(ممالك) لەرامبەر بەدانی (جزیە) لەو شوێنەدا جێگیربوونو بەو شێوەیە لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی زاینیدا ژمارەیەك لە تورکەکان لەناو دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامیدا گەیشتبوونە پلەو پایەکی بەرز کە لەوانە (زید بن الترکی)بووە کە کراوە بە والی (همدان)و لە دواییدا بووە بە والی موصلو (حماد الترکی) کە بەشداریی کردبوو لە دروستکردنی شاری بغدادا لە زەمانی خلیفە منصور لە ساڵانی (١٣٧ ـ ١٥٨ کۆچی).

بەوجۆرە لەو دوو سەرچاوەیەی پێشودا، ئەمین زەکی وتوویەتی تورکەکان دەچنەوە سەر (هدن)وەیا (قون) کە لە بنەچەی (شانغ یونغ)ن، وسعید احمد برجاوی وتوویەتی تورکەکان دەچنەوە سەر سێ تاقمی لەیەك نزیك کە بریتی بوون لە مەغۆلو تورکو تونغوز کە هەریەکەشیان لکێك بووە لە ڕەگەزی طورانی یا (ئورالو ئالتیك)، بەلام دوکتۆرە زبیدەلە سەرچاوە/٨٣دا وەکوو سید ئەحمەد برجاوی وتوویەتی تورك دەچێتەوە سەر (ural Altic ئورال ئالتیك) کە سنوری دەسەلاتیان گەیشتبووە شاخەکانی ( Kirr- gan) کە بەرزاییەکانی (بامیر)و (تیاشان) لێکی جیا دەکردنەوەو چینیو مەغۆلیش لەو ناوچانەدا دەژیان.

دەربارەی مێژووی سەرهەڵدانی تورك بەڵگەیەکی وانیە بەهۆیەوە بزانرێت کەی بووە، بێجگە لە هەڵکەنراوەکانی (ئارخون) کە بە یەکەم نەقشی هەڵکەنراو دەزانرێت کە بەپێی ئەوانە دەرکەوتووە تورکەکان لە سەدەی شەشەمی زاینیدا ئیمپراتۆریەتێکیان دروست کردووە.

سەرچاوە چینیەکان ئەڵێن تورکەکان بەر لە سەدەی شەشەم بریتی بوون لە چەند عەشیرەتێکی کۆچەری لە سنوری چیندا ژیاونو لەگەڵ هەندێ ناوچەی (تستبس) لە ناوەڕاستی ئاسیادا کە بەدوای لەوەڕدا دەگەڕانو عەشیرەتەکانی

مەغۆل (یورتا   Yurta)ی کۆچەری چوونەتە ژێر دەسەڵاتی (خان)ەوە کەبە زمانی تورکی قسەیان دەکرد.

بە پێی سەرچاوە چینیەکان وەختی (Topa ـ توپا) لە ئیمپراتۆریتی چینی جیابووەوەو بە ئیمپراتوریتی (توپا) ناوبرا کە سەرکردەیەکی تورکیش کە ناوی (Tu man) بوو عەشیرەتەکانی تورکی یەك خستوو دەستی بەسەر ئاسیای ناوەڕاستدا گرتو بوو بە دوستو هاوکاری ئیمپراتۆریتی (توپا) لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمدا کەلە دەوروبەری (oxus)دا بووە.

خانی تورك بە قەومەکەی خۆی وتووە (تروك)و لە سەدەی دەهەمدا ئیمپراتۆری بێزەنتی لە نوسینەکانیا ناوی تورکی بەکارهێناوەو روسەکان پێیان وتووە (Torki)، بەڵام ئەوروپاییەکان ووشەی تورکیان تەنها هەر بۆ سلجوقیەکان بەکار هێناوەو عوسمانیەکانیان بە ڕەگەز بردۆتەوە سەر (غوز)ەکان.

بەر لەوەی بچینە سەرباسی عەشایرەکانی غوزو چۆنێتی کۆچکردنیان بۆ رۆژئاوا باسێکی مامۆستا رفیق حلمی ئەخەینە پێش چاو کەلە لاپەرە/١١٢ی یاداشتەکانیا باسی ئەوەی کردووە هەروەکوو چۆن چینیەکان لە سنوری خۆیان ئەو شوورە بەناوبانگەی خۆیان دروستکرد بۆ ئەوەی رێگە لە دەست درێژیی تورك بگرن، لەکاتی هاتنی لێشاوی تورکەکان بەرەو رۆژئاواو پەڕینەوەیان لە ناوچەکانی قفقاسداو لە قفقاسیش سەدێك دروست کراوە بۆ ڕێگا گرتن لەو تورکانەو وتوویەتی :

((قفقاس لە مێژووی خۆرهەڵاتا جێگەیەکی تایبەتی داگیر دەکا کەلە چیرۆکی پروپیرێژنان دا ناوێکی سیحراویو ئەفسانەیی هەیەو بەقسەی زانا گەورەکان (سدّی یأجوج و مأجوج)لە کێوی قفقاسدا بووەو لە دێرزەمانا بۆ رێگرتن لەو تایەفە کێوییە دروستکراوە کەلە سنوری چینو تورکستانەوە هێرشیان بردۆتە سەر ولاتی رۆژئاولو لە کێوی (قاف ــ قفقاس)ەوە بەرەو رۆژئاوای ئاسیا هاتونەتە خوارەوەو، بەپێی چیرۆکی پیرێژنان گوایا جنۆکەکانی پشت کێوی قافو دێوی سپی (مەبەست ئەوانەی لە تورکستانەوە هاتبوون) کەلە تەوراتو لە قورئانیشدا ناویان هاتووە، ئەو تایەفە کێوییە بەشێك بوون لە مەغۆلەکان کە

ـەگەلێك نـاوی وەكـوو (میگــر، تاتــار، ســیتهین) ناویــان هــاتووه لــه لایــەن
چتانیەكانەوه كه (٦٠٠)ساڵ پێش زایــین لەرێگـەی قفقاسـەوه هێرشیان بردوته
ـەر ئاسیای رۆژئاواو ئەم ناوه له بەرده نوسراوەكانی داریوسیشـدا (ئێسـتەخر)
ـسی كراوه.

هەندێ له مێژوونووسان لەو باوەڕەدان دانیشـتوانی دەوروبـەری كێـوی قـاف
ـەم توركانه بێزار بوون و پەنایان بردوته بەر (كۆرش)ی شای ئـێران و ئـەویش بـۆ
ڕێگرتن له هێرشی ئەم درندانه له دەربەندەكانی كێـوی قـافدا سـەدی لـه ئاسـن
ـروستكردووه كه ئەبوایه لەشته عەجاییەكانی دنیا حساب بكرایه كەلـه قورئـاندا
ـه (سدّی یـأجوج و مـأجوج) نـاوی هێـنراوەو تـائیمرۆش هـەندێ شـوێنەواری لـه
قفقاسدا هەرماوه.

بەیەكخستنی ولاّتەكانی مادو فارس لەلایەن (كۆرش)ەوه ئیمپراتۆریتی ئـێران
ـەلایـەن كۆرشـەوه دامـەزراوەو ناویـانگی بـه هــەموو لایـەكدا بلاّویـووەوەو بــه
ـروستكردنی ئەو سەده دنیای خسته لەرزەوەو توانی بەوسەدە ولاّتەكانی باكور
ـه هێرشی مەغۆلەكانی چین و توركستان رزگار بكات بیانخاته ئاسوودەییەوه)).

لەدوای باسی رەگەزی تورك (طورانی)و شوێنی باوو باپیرانیان دەچینه سـەر
كورتـه باسێكی عەشـایرەكانی (غــوز – غـز) كـه سـەرچاوەكان هەریەكـەیان
بەشێوەیەك باسی لێشاوی ئەو عەشیرەتانەیان كردووه بەرەو رۆژئاوای ئاسیا كه
هەتا كاتی دروست بوونی دەوڵەتی عوسمانیش زنجیرەی هاتنی ئەو غوزانـه هـەر
درێژەی كێشاوه.

ئـەمین زەكـی لـه لاپـەڕە/١٣٦ی كتێبەكـەیدا لـه باسـی غوزەكانـا وتوویـەتی
ئەمانه پێشڕەوی سلچوقیەكان بوون كه له ســاڵی٤٢٠ی كۆچـی بەرامبـەر ١٠٢٩ی
زایین دەستیانكرد به پەلاماردانی ولاّتانی رۆژئاوای ئاسیاو له رێگەیانا یـەكێك لـه
سەركردەكانی (غزنوی) كه ناوی (طاش فراش)بووه (محمد علی عونی وەرگێڕی
كتێبەكـەی ئـەمین زەكـی لـه پـەراوێزی لاپەڕەیەكدا وتوویــەتی نــاوی صــاحب
السلطان مسعود بـوه) بـەخۆی و سیّهەزار سـوارەوه كـه زۆریـەیان كـورد بـوون
بەرەنگاری (غز)ەكان بوونەوه بەلاّم لەو شەڕەدا سەركردەی كوردەكانی ناو ئـەو
هێزەی غزنوی بەدیلی گیرا لەلایەن غوزەكانەوەو ناچاریانكرد نامەیەك بنێری بۆ

کوردە چەکدارەکان واز لە شەڕ بێنن‌و تورکەکان سەرکەوتن‌و بەرەو پێشەوە رۆیشتن تا لە ساڵی ٤٢٩ی کۆچی بەرامبەر ١٠٣٧/ی زایین گەیشتنە دەوروبەری (مەراغە)و لەوێ دەستیانکرد بە کوشتارو تاڵانیکردن.

دوای ئەوە غوزەکان پەلاماری عەشیرەتی (هزبانیە)ی کوردیان داو زۆریان لێ کوشتن‌و لە ئەنجامدا کوردەکانی ئەو ناوچانە یەکیان گرت‌و لەگەڵ حاکمی ئازربایجان (محمد علی عونی لە پەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا وتوویەتی ئەو حاکمی ئازربایجانە ناوی (وهوذان) کوڕی (مهلان)بووە هەروەکوو لە کتێبەکەی (( أبن الأثیر ))دا باس کراوە)،بە هەموویان توانی‌یان غوزەکان بشکێنن‌و پاشەکشەیان پێ بکەن، بەڵام تاقمێکیان توانیبویان بگەنە (ئەرمەنیا)و کوشتارێکی زۆر دەکەن‌و ولاتەکە کاول دەکەن‌و لە دەوروبەری (ورمیە)دا ڕووبەڕووی کوردەکان دەبنەوە بە سەرکردایەتی (أبوالهیجاء) کە خوشکەزای (وهوذان) بووە لەو شەڕەدا کوردەکان دەشکێن‌و غوزەکان سەردەکەون.

بەڵام جارێکی تر لە ساڵی ٤٣٢/ی کۆچی بەرامبەر بە ١٠٤٠/ی زایین کوردەکان بە سەرکردایەتی (وهوذان) پەلاماری غوزەکان ئەدەن‌و دەیان شکێنن‌و ئەوانەی لە کوشتاری ئەو شەڕە رزگاریان دەبێ کوڵ نادەن‌و بەرەو پێشەوە دەڕۆن‌و بەوجۆرە ئەو پاشماوەیەی غوز دەگەنە (هەکاری)و تاڵانی دەکەن‌و ناوچەکە وێران دەکەن بەڵام کوردەکان دەوریان ئەدەن‌و شەڕێکی گەورە دەکرێ‌و (١٥٠)غوز دەکوژرێ‌و (١٥٠٠)یشیان لێ بەدیل دەگیرێت کە لە ناویانا حەوت سەرکردەی غوزی تیا بووە.

ئەو غوزانەی لە کوشتن‌و بەدیل گرتن دەرباز بوبوون، ساتێك بیستیان سوپای (طغرل بەگ) بە سەرکردایەتی (ئیبراهیم ینال) کە برای طغرل بووەپەلاماری ئەدەن بەپەلە رویانکردۆتە رۆژئاواو تاقمێکیان بە سەرکردایەتی (منصور) لە رێگەی (زوزان)ەوە ڕوویانکردە جزیرەی أبن عمرو تاقمێکی تریان بە سەرکردایەتی (بوقا ــ بوغا) پەلاماری دیاربکریان داو دەستیان کرد بە کوشتارو تاڵانی لە ناوچەی (قردی ــ بقردی ــ کردا ــ کارودا) لە رۆژ هەڵاتی جزیرەو (بازبدا)و (حسینیە) کە (یاقوت الحموی وتوویەتی حسینیە لە نێوان موصل‌و جزیرە)دا بووەو لە پێشخابور (فیشخابور ــ کە روبارێکە دەڕژێتە

ورلتەوە ـ خابوورێکی تریش هەیە لە ناوچەی هەکاریدا بویە بەوەی پێشوو
وتراوە فیشخابوور ـ، ساتێك سلیمان کوڕی ناصر الدولـەی کـوڕی مـروان
پەلاماری غوزەکانی دا، کوردەکانی (بشنویە) کە خاوەنی قـەڵای (فینیـك) بـوون
کە قەڵایەکی مێژووییە لە جزیرەی ابن عمرو شوێنێکی زۆر سەختە، یارمەتی
هێزەکەی سلیمان ئەدەن کە سەرکردەکەی (منصور قزعلی)بوو لەو شەڕەدا
غوزەکان ڕاودەنێن‌و تـا (نصیبین) دەریان دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو
کوشتارو ڕاونانەی (غوز)دا وڵات ڕزگاری نەبوو لە دەسدرێژیکردنیان‌و خۆیان
گەیاندە دیاریکرو دەستیانکرد بە تاڵانی‌و کوشتار لە دانیشتوەکانی)).

حسێن حوزنی موکریانی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٩١ لە باسی هاتنی
غوزەکانا بەرەو ئازربایجان وتوویەتی کە غوزەکان ڕوویانکردە ڕۆژئاوا بوون بە
دوو بەشەوە، دەستەیەکیان ژمارەیان (١٥٠٠)کەس بووەو سەرکردەکەیان
(قزل)بووە لە ڕێگادا مانەوەو جێگیر بوون بەڵام دەستەی دوهەم بە
سەرکردایەتی (بوقا)و (گوگتاش)و (منصور)و چەند کەسێکی تریان زۆر بە هێز
بوون‌و ڕوویانکردە ئازربایەگان (ئازربایجان)و لە ساڵی ٤٢٩/ی کۆچیدا گەیشتنە
ئەوێو چوونە لای (وهوذان) و ئەویش بەخۆشی‌و شادیەوە لای خۆی گلی
دانەوەو نیشتەجێی کردن، بەڵام ئەو غوزانە هەروەکوو خورەوشتی هەمیشەییان
دەستیانکرد بە جەردەیی‌و ڕەفتاری خراپ‌و پەلاماری خاکی (واسپورگان)و
ئەرمەنستان‌و هەندێ شوێنی تریان دا.

دەربارەی ئەو پێشوازی کردنەی (وهوذان) لە غوزەکان، أبن الأثیر لە
کتێبەکەیدا (الکامل ـ جلدی نۆهەم، لە لاپەڕە/١٤٥دا بە (وهوذان مهلان) ناوی
بردوە ـ لە کاتێکدا لەوەی ئەمین زەکیدا لە پەراوێزەکەیدا بە (وهوذان مهلان)
ناوی بردوە، وتوویەتی وهۆزان ژمارەیەکی لە غوزەکان میوانداری کردو پاش
خواردن‌و خواردنەوە (٢٠)کەسی لە گەورەکانی (غز) گرت‌و خستنیە زیندانەوەو
زۆریشی لێ کوشتن‌و ئەوانەی لە ورمیەدا مابوونەوە ڕوویانکردە هەکاری‌و
پەلاماری کوردیان داو تاڵانیان کردن‌و ژمارەیەکیان لێ کوشت، بەڵام زۆری پێ
نەچو کوردەکان خۆیان کۆکردەوەو پەلاماری (غز)ەکانیان داو حەوت ئەمیریان
لێ بەدیل گرتن‌و ئەوانی‌تر بەناو کێوەکاندا بڵاوبوونەوە.(هەندێ لەوەی حسین

حوزنی باسی کردووه لەگەڵ ئەوەی ئەمین زەکیدا یەکناگرێتەوە کە ئەمین زەکی باسی ئەوەی نەکردووە لە دوای نان خواردن غوزەکانی کوشتوە بەڵکو وتوویەتی لە دواییدا وهوذان چوە بەگژیاناو بە فێڵ گرتنــی). حسـێن حوزنـی موکریـانی لە لاپەرە/٢٧٤ی هەمان کتێبدا باسی هاتنی لێشاوێکی تری غوزەکانی کردووە کە لە ساڵی ٤٣٠/ی کۆچیـدا لـە ئازربایەگانـەوە رووبانکردۆتـە (قزویـن)و (همـدان)و هەموویان لە دەوری (قزل)ی ئەمیریان کۆبوونەوە.

پـاش هـاتنی ئـەو دوو لێشـاوەی غـوز، حسـێن حوزنـی، لـە هـەمان کتێبـدا سەرچاوە/٩١باسی کێشـەیەکی کـردووە کـە لـە نێـوان غوزەکـانو سـلجوقیەکان رویـداوە سـلجوقیەکان بـە سـەرکردایەتی (ئیـبراهیم ینـاڵ)ی بـرای طغـرل بـگ غوزەکانیان ڕاونابوو ناچاریـان کردبـوون کەلـە سـاڵی ٤٣٣دا بگەنـە ئازربایجان بەڵام لـەوێش نـەیان توانیبـوو جێگـیر بـبنو بـەهۆی درندەیـەتیو کـردەوە نارەواکانیانــەوە نــەیانتوانیبو لــەوێ بحەوێنــەوەو روویــانکردە ئەرمەنسـتانو ناوچـەی دیـاربکرو جزیـرەو لـەوێش شـەڕ لـەنێوان ئـەوانو (وهـوذان) دا روویـدو غوزەکان شکێنرانو لەگەڵ (نصر الدولە) کە پادشای ئەو ناوچانە بوو گەلێ شەڕ هەرا ڕوویداو پـاش ئـەوە (ئـەمیر قـراوش) هـێزێکی گـەورەی لـە کـوردو عـەرەب پێکەوەناو لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٢٥/ی کۆچیـدا پـەلاماری غوزەکانیـان دو زۆریان لێ کوشتنو ژمارەیەکی کەمیان خۆیـان رزگـار کـردو گەیشـتنە دیـاربکر پـاش ئـەوە نـە لـە موصـلو نـە دیـاربکر خۆیـان پـێ ڕانـەگیراو روویـانکردە ئەرمەنستانو لەوێوە گەڕانەوە بۆ ئازربایەگان ـ ئازربایجان.

ئەوی شایانی باسـە لـەم باسـەی ئـەمین زەکـیو حسـێن حوزنـی موکریـانیو سەرچاوەکانی تردا کە باسـی هـاتنی غوزەکانیـان کـردووە چـۆن لـە ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا هەرجارەی بەشێوەیەك لــە تورکسـتانەوە هـاتونو لە ئەنجاما لە ئازربایجاندا کۆبوونەوەو بەوە کارێکی وایان کردووە لەو سـەردەمەوە ئازربایجان شەقڵێکی تورکمانێتی پێوە دیاربێ کە بەرلـەوە هیـچ پێوەندییـەکی بە ئازەربایجانەوە نەبووە.

## دوهەم : سلجوقیەکان

ئەو سەرچاوانەی باسی مێژووی سلجوقیەکانیان کردووە لەسەر ئەوەن سلچوقیەکان بریتی نەبوون لە عەشیرەتیکی تایبەتی و ووشەی (سلچوق) لەناوی هیچ عەشیرەتێکەوە پەیدا نەبووە، بەڵکو وەکوو لەو سەرچاوانەی باسیان دەکەین بۆمان دەردەکەوێ سلچوقیەکان هەر لەو عەشیرەتانەی غوزو عەشیرەتە تورکەکانی ترەوە پەیدا بوون و بوون بە ئیسلام و ڕوویانکردۆتە ولآتانی ئیسلامی ڕۆژئاواو لەو شوێنانەدا هەر تاقمەیان لە شوێنێکدا دەوڵەتێکیان بەناوی سلچوقیەوە دامەزراندوەو ئەو سلچوقیانەی لەناو هێزەکانی سوپادا بوون و بە سەرکردە پێیان وتراوە (سوباش).

لە گۆڤاری هەلالی ساڵی ١٩٠٩دا سەرچاوە/٨٨ باسی چۆنێتی هاتنی سلچوقیەکانی کردووە لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بۆ ڕۆژئاوای ئاسیاو ئاسیای بچووک تورکیای ئێستە کەبە پێی ئەو سەرچاوەیە پاش ئەوەی سلچوقیەکان ڕویان کردە ڕۆژئاوای ئاسیاو زۆری پێ نەچوو هەریەشەیان کەوتە ژێر دەسەلآتی سەرکردەو مەمالیکێکەوە کە پێیان دەوترا (ئەتاجك)و بەشەکانی سلچوق بریتی بوون لە: ـ

**تاقمی یەکەم: ئەوانەیان بوون کە دەسەلآتیان بەسەر ناوچەی (کرمان)دا هەبوە.**

**تاقمی دوهەم: ئەوانەی لە (سوریا)دا بوون بە دەسەلآتدار.**

**تاقمی سێهەم: ئەوانەی لە عێراقدا بوون بە دەسەلآتدار.**

**تاقمی چوارەم: ئەوانەی لە ئاسیای بچوکدا (تورکیا)دا بوون بە دەسەلآتدار کە پێیان دەوترا (سلچوقی ڕۆم) کە ئەمانەش بوبوون بە هەشت بەشەوەو هەروا بەبەشکراوی مابوونەوە هەتا دەوڵەتی عوسمانی دروست بوو بەهێز بوو ئەوسا هەموویان چونە ژێر دەسەلآتی عوسمانیەوە.**

لەبەر ئەوەی ئەو سەرچاوانەی دەربارەی سلچوقیەکان دواون هەریەکەیان بە شێوەیەکی جیاواز باسیانکردووە بۆیە پێوستم زانی کورتەی هەریەکێکیان بخەمە بەرچاو:

دەربارەی سلچوقیەکان لە لاپەڕە/٦١ی سەرچاوە/٥٨دا وتراوە بنەماڵەی سلچوقی لە زەمانی ابو جعفر عبدالله کە بەقائم بأمر الله بەناوبانگ بووە دەستی

پێكردووه كه بنەماڵەكەیان بە (دقاق) ناسرابوون‌و لەو عەشیرەتانەی تورك بوون كە ولاتی (كشغر)ەوە هاتبوون (كشغر شارێكی كۆنی ئیسلامە لە رۆژئاوای چین‌و سەرسنوریا لەگەڵ روسیا لەسەر كەناری روباری (قزل صو ــ ئاوەسوور) كە چینیەكان پێیان وتووە (Sutu).قائم بأمر الله كوڕێكی دەبێ ناوی دەنێ (سلچوق)، لەبەر ئەوە ئەو كوڕە لەدواییدا زۆر لێ هاتوو دەبێت مەلیكی ئەوسای تورك كەناوی (بیغو)بووە پێشی دەخات‌و ناوبانگی بەرز دەبێتەوە، پاش ئەوە ئەو سلچوقە ئەو ناوچەیە بەجێ دێڵێت‌و ڕوو دەكاتە ولاتەكانی ئیسلام‌و لەوێ خۆی‌و تاقم‌و عەشیرەتەكەی دەبن بە موسوڵمان.

(دەربارەی ئەو سلچوقەی لەو سەرچاوەدا باسی كردووە، لە لاپەڕە/٣٢٥ی سەرچاوە/٨٨دا وتراوە سلچوق دامەزرێنەری ئەو حكومەتە بووە كە لە ئاسیای بچووكدا دامەزرێنرا كە بەرلەوەی ئەو دەوڵەتە دامەزرێنیت وەكوو ئەمیرێك وابووە لە خزمەت (خان)ەكانی توركی ئاسیای بچووكدا.(بەم پێیە سەرچاوە/٥٨و٩٨ ئاماژەیان بۆ ئەوە كردووە كە سلچوقیەكان بەناوی ئەو سلچوقەوە بووە كە دەوڵەتی سلچوقی ڕۆمی دامەزراندبوو).

بەلام دوكتۆرە زبیدە عطا لە لاپەڕە/٣٨ی سەرچاوە/٨٣دا دەربارەی سلچوق وتوویەتی :

((سلچوقیەكان بەشێك بوون لە عەشیرەتەكانی (غوز ـ غز) كە ڕوویان كردە ڕۆژئاوای ئاسیا بەلام مێژوونوسان ووشەی سلچوقیان بەگەڵێ جۆر باسكردووە :

محمود الكشغری وتوویەتی : سەرۆكی عەشیرەتی (غز) پێی ووتراوە (سوباش) كە مانای سەركردەی گرتوتەوە، بەلام (فامبری)ی مێژوونوس وتوویەتی (بغو) سەركردەی هێزێك بووە كە سەرچاوە توركەكان ئەو (بغو) یەیان بە (Selt Chiuk سلچوق) ناوبردوەو سەرچاوە ئیسلامیەكان وتویانە سەركردەی ئەو عەشیرەتانەی سلچوقیان لێ پێك هاتووە ناوی (سلچوق) كوڕی (دقاق) بووە كە عەشیرەتەكانی (غوز)ی یەكخستوەو بەرەو ولاتانی ئیسلامی بردوونی ولای روباری (سەلچون) نیشتەجێ بوون.

دوكتۆر كمال مەزهەر لە سەرچاوەی ژمارە/٢٤دا لاپەڕە/٢٢٣ باسێكی گرنگی دەربارەی سلچوقیەكان بلاوكردۆتەوە كە سوودێكی زۆری لە كتێبەكەی

گرنلیڤسکی) وەرگرتوە بەناوی سـلجوقیەکانی ئاسیای بچووكو هـەروەکوو لـە بەرنوێزی هەمان لاپەڕەدا باسـی کـردووە سودیشـی لـەکتێبیکی (أ.د.نوڤیچیـڤ) وەرگرتووە کەلە مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٦٥دا چاپکراوەو دوکتۆر کمال ووتوویەتی :

((سلجوقیەکان بەشێك بوون لە هۆزە تورکمانە کۆچەریەکان کەلـە سـەرەتادا لە ناوەڕاسـتی ئاسـیادا لـە شـوێنێکدا کـە کـەوتبووە لای ڕاسـتی روبـاری (مرنەفشان) لە نێوان (بخاری)و (سمرقنـد)دا دەژیـان لـە دەورووبـەری سـەدەی دەیەمی زاینـدا ئـەو سلجوقیانەی بوبـوون بـە ئیسـلام ئـاڵوگوڕێکی بنـەڕەتی لـە ژینیانا دەستی پێکردبوو سەرکردەکانیان لەژێر ئالآی ئیسلامدا وایـان لێ هـاتبوو خاسانی دەگەیشتنە زەوی‌و زاری گەلە ناموسوڵمانەکان‌و ئەم بارودۆخـە بوبـوو بە هۆیەکی گەورە بۆ راکێشانی سـلچوقیەکان بـەرەو ئاسـیای بچووك (تورکیـای ئێستە) کە بەشی زۆری بەدەس عیساییەکانەوە بووە (مەبەستی بێزەنتیەکانە).

لە سەدەی یازدەهەمدا سـلچوقیەکان لـە پێشـدا رویـانکردە ئێرانی نزیـك بـە خۆیـان‌و لـەماوەی (١٥)سـاڵدا دەسـتیانگرت بەسـەر هـەموو ئێرانـاو دوای ئـەوە رویـانکردە ئازربایجان‌و کوردسـتان‌و ئەرمەنسـتان‌و لـەنێوان سـاڵانی ١٠٤٢ ـــ ١٠٥١دا بەشـی زۆری کوردسـتانیان داگیر کـردو خسـتیانە سـەر دەوڵەتەکـەی خۆیان‌و بە داگیرکردنی بغداد ساڵی ١٠٥٥ ئەوندەی تر بەهێز بوون.

ئاسیای بچووك دەوڵـەتێکی فـراوان‌و دەوڵەمـەند بـوو، ژمـارەی دانیشـتوانی ئەوسای کەم بووەو لە دەمێکەوە فەرمانڕەوایانی ئیسلام بیریان لەوە کردبووەوە ئەو شوێنە گرنگـە داگیر بکـەن چونکـە بوبـوو بـە بنکەیـەکی تـرس لێکـراوی عیساییەکان کە دەیان ویست لەوێوە بگەنە شوێنە پیرۆزەکانی ناو فلسطین.

سەرکردەکانی سـلچوقیەکان لـەوە گەیشـتبوون دەتوانـن بـە ئاسـانی ڕەوەی خەڵکی سادەو ساکار بەرەو ئەو ناوچانە بنێرن بۆ ئەوەی بەوە ناوبانگیان بـەناو هەموو موسوڵمانانی جیـهانا بەرزبێتـەوە. لـە نـاوەندی سـەدەی یازدەهەمینـەوە سلچوقیەکان بۆ یەکەم جار هێرشیان بـردە سـەر ئاسیای بچووك‌و زۆرجـار ئـەو شەڕانەی کە دەکران لەناو خاکی کوردستاندا روویان ئەدا.

لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی یازدەهەمەوە سلچوقیەکان توانی‌یان بنکـەی چەسپاو بـۆ خۆیـان دامـەزرێنن‌و لـە سـاڵی ١٠٧١دا لـە نزیـك (مـلاز گـرد ـــ

مەنازکرت)ی ناوچەی کوردنشیندا لە شەڕێکدا بێزەنطیەکان شکاو لەدوای دەساڵ (ئیزنیك)یان داگیرکردو بەوپێیە دەوڵەتی سلچوقی لە ئاسیای بچووکدا دامەزرا کە پێی ئەوترا (میرنیشینی سلچوقی)و (هەروەکوو عبدالرقیب یوسف لەکتێبەکەیدا ـ الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى بەشی یەکەم چاپی بغداد ساڵی ۱۹۷۲ وتوویەتی سلچوقیەکان لە دەوروبەری (٤٧٦ ـ ٤٧٨ی کۆچیدا ـ بەرامبەر ۱۰۸۲ – ۱۰۸٥ی زایین) ئەمارەتی (دۆستکی)ی کوردیان لەناو بردوەو دوکتۆر کمالیش لە پەراوێزی لاپەڕە/۲۲۷ ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە).

دوکتۆر کمال لە باسی سلچوقیەکانا وتوویەتی : لە ساڵی ۱۱٤٦دا سلچوقیەکان شاری (قونیە)یان کرد بە پایتەختی خۆیانو لە ساڵی ۱۱۸۰دا میرنشینی (دانشمند)یان لەناو برد کە میرنشینێکی تورك بوو پاش ئەوە شاری (سیواس)یان کرد بە پایتەختو بەوجۆرە لە کۆتایی سەدەی دوازدەهەمو سەرەتای سەدەی سیازدەدا دەوڵەتێکی گەورەی تورك بە سەرکردایەتی بنەماڵەی سلچوقیەکان لە ئاسیای بچوکدا دامەزرێنراو لەکاتی فرمانڕەوایی (سوڵتان علاءالدین کیقبادی یەکەم ـ لەنێوان ساڵانی ۱۲۱۹ ـ ۱۲۳٦دا ئەو دەوڵەتە گەیشتە چڵەپۆپەی دەسەڵاتداریتی، بەڵام لە دەوروبەری ناوەندی سەدەی سیازدەدا کە هێرشی مەغۆلەکان دەستی پێکرد ئیتر دوای ئەوە دەوڵەتی سلچوقی رویکردە کزیو لاوازبوونو لە سەرەتای سەدەی چواردەدا شیرازەی تێکچوو و لە ساڵی ۱۳۰۷دا بوو بە چەند میرنشینێکی بچوكو زۆری پێ نەچوو عوسمانیەکان بوون بە میراتگر لە شوێنی ئەوان.

دوکتۆر کمال لە لاپەڕە/۲۲۸ی باسەکەیدا کێشەی سلچوقیەکانو کوردەکان، بەتایبەتی ئەیوبیەکانی بەم جۆرەی خوارەوە کردووە :((دوای ئەوەی سلچوقیەکان چوونە ناو خاکی کوردستانەوە (مەبەست باکورە)، ئیتر خۆیان ئامادە کرد بۆ داگیرکردنی (ئامد ـ دیاربکر)و ئەو خۆ ئامادە کردنە بوو بەهۆی کێشەی نێوان ئەوانو ئەیوبیەکان، بەڵام سوڵتان علاءالدین کیقباد نەیتوانی داگیری بکات، تا لەدواییدا (کەیخسرەو)ی کوڕی داگیری کردو پاش ئەوەی هەرلو بگری هێرشی مەغۆلەکان پەیدا بوو (ملك کامل)ی ئەیوبی کە دوژمنی سلچوقیەکان بوو دەستی بەسەر (ئامد)دا گرت، بەڵام زۆری پێ نەچوو

هۆلاکۆخان دووبارە ئەو شارەی دایەوە دەس سلچوقیەکان بە سەرکردایەتی (کیکاوسی دوهەم ـ کەبە سوڵتان عزالدین ناسراوبووە لە نێوانی ١٢٤٩ ــ ١٢٥٧ لەگەڵ (رکن الدین قلیج ئەرسلانی چوارەم‌و لە ساڵی ١٢٨٠دا ئامەد بەدەس کیخسروی سیٚهەمەوە بووە و سلچوقیەکان زۆر شانازیيان بە داگیرکردنی ئامدەوە کردبووە)).

هەروەکوو دوکتۆر کمال ئامـاژەی بـۆ کتێبەکـەی گردلێڤسـکی کـردووە، وتوویەتی کیخسروی دوهەم ناوی خۆی نابوو (قـاتل الکفـرة والمشـرکین وسـلتان الروم وەئەرمەنیاو دیـاربکرو ئـەمیری سـواحل). لەڕاسـتیدا شـانازی کردنـی سلچوقیەکان بە داگیرکردنی (ئـامد) بەخـۆڕایی نـەبووە، چونکـە ماوەیـەکی زۆر قەڵای ئامد خۆی نەدابوو بە دەستەوەو بەرگری کردبوو تا ئەوکاتـەی یـەکێك لـە سەردارانی کورد کـە نـاوی (آبـن الدینـار)بـووە لـە ژێرەوە لەگـەڵ سلچوقیەکانا ڕێکەوت‌و دەرگای قەڵاکەی بۆ کردەوەو بەوە دەرگای شارەکە خرایـە سەرپشـت بۆ سلچوقیەکان.

سوڵتانی سلچوقی ئەوەندە بایەخی دابوو بـە داگیرکردنی ئـامد، دەسـتی لـە وێرانکردنـی بـاخ‌و بێسـتانەکانی هـەڵگرتبوو لـە کـاتێکدا سـلچوقیەکان بەرلـەوە هەرشوێنێکیان داگیربکردایە بیٚ بەزەییانـە کاولیـان دەکـردو ڕەگـو ڕیشـەی دارو درەختەکانیشیان لەبن دەردەهێنا.

پاش ئەوەی سلچوقیەکان جیٚپێی خۆیان لـە ئاسیای بچووکدا بـەهێز کـردو دەسەڵاتی تەواویان پەیدا کرد، ئیتر ئاغاو بەگـو میران‌و خەڵکی ساکاری گـەلانی تر هەریەکەیان بۆ سوودو مەرایی خـۆی لـە سـلچوقیەکان کۆبوونـەوەو کوردیـش دەبوایە لەوەدا بەشـی خـۆی هەبوایـەو هـەروەکوو گردلێڤسبکی باسـی کـردووە، سـاتێك سـوڵتان علاءالدیـن کیقبـاد چوویـوو بـۆ (ئوبـروك)، لـەو چوونـەیدا (٥٠٠) ئەفسەرو سەرهەنگی روسی‌و گورجی‌و کوردو دیلەمی‌و گورگانی‌و قزوینـی گـوری (ئەمەیان ئەفغانی بووە) چواردەوریان دابوو ئاگر لە چاویان دەباری لـە کـاتێکدا کە ڕێگەیان بۆ سوڵتان دەکردەوە کە بەناو خەڵکەکەدا بڕوا.

بەشێك لە میرنشـینی ئاسـیای بچـووك جـاری وا هـەبوە ژمـارەی گەیشـتۆتە (٢٥٠)هـەزار کـە زۆربـەی لـە هۆزەکـانی کوردسـتان پێـك هـاتبوو، بەتایبـەتی

ئەوانەیان لە ئامدو مەڵبەندەکانی دەوروبەریا دەژیـانو فرمانڕەواکـانی ئـەو میرنشینە لەکاتی تەنگانەدا پەنایان دەبردە بەر چەکدارانی کورد بە تایبەتی لەکاتی راپەڕینەکەی (بابا ئیسحاق)دا.

دەربارەی ئەو بابا ئیسحاقە وەکوو گردلێڤسکی باسی کردووە، ساتێك جەورو ستەمی کاربەدەستـانی سـلجوقی بـۆ سـەندنی بـاجو سـەرانەیەکی زۆریـەی دانیشتوان گەیبوە رادەیەك لەساڵی ١٢٣٩دا ئاگری راپەڕینێك کارێکی وای کرد زۆریەی دانیشتوانی ناوچەکانی ئاسیای بچووك بگرێتەوە کە بابا ئیسحاق سەرکردەی ئەو راپەرینە بووە.

بابا ئیسحاق خۆی بە نیمچە پێغەمبەرێك دانابوو لایەنگرێکی زۆری هەبوەو هەمویان بە ژنو منداڵانیانەوە بۆ ماوەیەکی باش هێرشیان بردبـووە سـەر قـەڵاو زەویو زاری دەرەبەگەکانو پاش سەرکەوتنی راپەڕینەکە شۆڕشگێڕەکان بانگی خەلیفایەتی بابا ئیسحاقیان بڵاوکردەوەو راپەرینەکە بەجۆرێك پـەرەی سـەندبوو خەرێك بـوو گلۆڵـەی میرنشینی سلجوقی ئاسیای بچووك بخاتـە لێژی، ئەوسا کەیخسرەوی دوهەم کەوتە خۆیو لە (ملاطیە)وە داوای یارمەتی لە تورکو کـورد کـردو بەسـەر بابـا ئیسـحاقدا سـەرکەوتو گرتـیو هـەڵی واسـیو راپەرینەکـەی دامرکێنرایەوە.

گردلێڤسکی لەو باسەیدا باسی کارگێڕیو رووناکبیری کوردی ئەو سەردەمەی کردووە لە ناوچەکەداو وتوویەتی :

((سلجوقیەکان لـە خـاکی نیشـتمانی یەکـەمیانا کـە (زەرئەفشـان)بـووە، بە کۆچەریو بەخێوکردنی ئاژەڵو تۆزێك کشتوکاڵ کردن ژیابوونو کە گەیشتبوونە ئاسیای بچـووك لـەروی ژیاریـیەوە زۆر دواکـەوتوو بـوونو زۆرشـت لـە مـەلاو دەروێشەکانی کوردو عەرەبو ئازەریەوە فێر دەبوون، ئەو دەروێشانەی دەهاتنە ئاسیای بچووك تەنها هەر مامۆستاو فێرکەری ئـاینی نـەبوون، بـەڵکو دەشبوونە رێ نیشـاندەری کـارگێڕیو روناکبـیریی کۆچەریـەکانی ئـەو مەڵبـەندەو دژی مەغۆلیـەکان دەیـان بزوانـدن کـە راپەڕینەکـەی بابـا ئیسـحاق بەشـێك بـوو لـەو کارتێکردنەی ئەو دەروێشانە کە شارەزابوون بەبیرو باوەڕی ئاینی دژ بە سۆفیزم

کەلە هەولێرەوە دەگەیشتە ئاسیای بچووكو، وادیاربووە لەو ڕۆژانەدا دانیشتوانی هەولێر مەیلداری شیعە بوون)).

بێجگە لەوباسە گرنگەی گردلێفسکی کە باسی چۆنێتی هـاتنی سلچوقیەکانی کردووە، گەلێك سەرچاوەی تـر لەوباسـە دواون و ئـەوەی ئێمـە مەبەسـتمانە لـەم باسـەدا لێـی بدوێـین تەنـها بریتیـە لـە کورتـەی ئـەو سـەرچاوانەی لـە ڕوی سلچوقیەکان دواون لە کوردستاندا، بەتایبەتی لەباکوردا (ئاسـیای بچـووك) لـەو ڕوەوە السـید البـاز العریـن لـە سـەرچاوە/٨٦دا وتوویـەتی سـلچوقیەکان لـە ناوەڕاستی ئاسیاوە هاتن بەرەو ڕۆژ ئاواو لە ساڵی ١٠٧١دا بەناوی پـەرەسـەندن بەئاینی ئیسلام بەشـێکی زۆری ئاسـیای بچووکیـان داگیر کـردو هەڕەشـەیان لـە (قسطنطینە)کردو لە زەمانی (ملکشاه)دا لە مـاوەی ١٠٧٢ ــ ١٠٩١دا دەسـەلاتی سلچوقیەکان لە ولاتی (ئیغور)ەوە گەیشتە دەریای سپی ناوەڕاست، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا نـەیانتوانی هـەموو تورکـە موسـوڵمانەکان لـە دەوڵـەتێکی یـەکگرتودا کۆبکەنـەوە. سـلچوقیە ڕۆمـەکان لـەدوای شـەڕی (مـانزیگرت ــ مەبەسـتی ملازکردە)و سەرکەوتنیان بەسەر بێزەنطیەکانا ئیتر بەناو بەرزاییەکانی ئەنادوڵدا بلاویوونەوە.

لە باسێکی تردا، سەرچاوە/٥٨ ـ فرید بگ المحامی وتوویەتی : دوای ئـەوەی سـلچوقیەکان ولاتـی خۆیـان لـە ئاسـیای ناوەڕاسـتدا بەجێهێشـت، ڕوویـانکردە ولاتانی ئیسلامو لە ڕێگـەدا لـە نزیـك شـاری (بخـاری) لەگـەڵ سـوڵتان محمـودی غەزنەویدا بوو بە شەڕیانو لەوێوە ڕوویانکردە ئاسیای بچووكو شـاری قونیـەیان دروست کرد، بەلام بـەهۆی نـاکۆکی نێـوان بنەماڵـەکانی سـلچوقی لـەناو خۆیانـا نەیانتوانی بەشداری بکەن لە شەڕی خاچ پەرستەکانا هەتا ئەوکاتی (عمـادالدین زنگی) توانی لە موصلدا بـەرەنگاری خـاچ پەرسـتەکان بێتـەوەو ئـەو شـوێنانەی داگیریان کردبوو لێیان بسێنێتەوە.

نوسەرێکی تر، دوکتۆر زبیدە عطا لە لاپـەڕە/٣٨ی سـەرچاوە/٨٣دا بـە دوورو درێژی باسـی چۆنێتـی هـاتنی سلچوقیەکانی کـردووە تـا گەیشـتونەتە ئاسـیای بچووكو ئاماژەی بۆ کتێبی (السـلوك)ی (مقریـزی) کـردووە کـە سـلچوقی کـوڕی دقاق هەموو عەشیرەتە تورکـەکانی یەکخسـتوەو بـە کۆمـەڵ چونەتـە نـاو ڕیـزی

ئیسلامەوەو لە رێگایانا (قرخانی)یەکانو محمودی غزنوی یەکیان گرتوەو سلچوقیەکانیان شکاندوە، بەلاَم بە شکاویش هەر کۆڵیان نەداوەو (طغرل) گەیشتوتە خۆراسانو لە ساڵی ١٠٣٧دا بووە بە والی خۆراسانو لەوێوە بەرەو قەزوین و ئازربایجان رۆیشتوەو هەندێکیان چونەتە ناو خاکی بیزەنطیەکانەوە بەشێکی تریان لە ئاسیای بچووکدا دەوڵەتێکیان دامەزراند کەلە نێوانی (١٠٧٥ هەتا ١٣٠٢)ی زایین دا درێژەی کێشاو دانیشتوانی ئەو ناوچانەی دەستیان بەسەراگرتبوو کردیانن بە تورك.

ئەو سلچوقیانەی رووبانکردبووە ئاسیای بچووك دووتاقم بوون، تاقمی یەکەمیان کە پێشەنگی هەموویان بوو بە شەرێکی پچرپچر توانییان خۆیان بگەیەننە ناوچەکانی (ئەنادۆل) بۆ ئەوەی شوێنێکی باش بدۆزنەوە بۆ نیشتەجێ بوونیان لە ماوەی( ١٠١٨ ــ ١٠٤٠)دا. تاقمی دوهەمیان لە ساڵی ١٠٤٠دا هەتا ١٠٧٥دا توانیبویان بیزەنطیەکان لەزۆر شوێنی ئاسیای بچووکدا دەرکەنو خۆیان لە شوێنەکانی ئەوانا نیشتەجێ بوون.

نووسەر لە باسەکەیدا وتوویەتی: ئەوەی کاری سلچوقیەکانی ئاسان کردبوو توانیبویان خۆیان نیشتەجێ بکەن ئەوەبووە بەرلەوەی خۆیان بچنە ناوچەکانی ئاسیاوە توانیبویان دەس بەو عەشایرە تورکمانانەوە بنێن کە کاتی خۆی (طغرل بگ)و (ئالب ئارسلان)و (ملکشاە) بە ترسناکترین دوژمنی خۆیان دانابوونو ئەوانە کە گەیشتبوونە ئاسیای بچووك توانیبویان دەس بەسەر زۆر شوێندا بگرنو دانیشتوەکانیان بەزۆر کردبوو بە تورك. دوای ئەوەی سلچوقیەکان گەیشتنە ئاسیای بچووك، لە ساڵی ١٠٤٨ زایندا شاری ئەرزرۆمیان دروستکردبوو لەساڵی ١٠٥٤دا شاری (قرسیا)و لەساڵی ١٠٥٧دا شاری (ملاطیە)یان دروستکردو شارەکانی تریش وەکوو سیواسو قیصریو قونیە، یەك لەدوای یەك لە ساڵانی (١٠٥٩، ١٠٦٧، ١٠٦٩)دا دروست کران. (ئەمەی قونیە کە وتوویەتی لە ساڵی ١٠٦٩دا دروستکرا، لەو باسەی گردلێڤسکی کە بەرلەمە باسمانکردووە وتوویەتی سلچوقیەکان لەساڵی ١١١٦دا شاری قونیەیان کردبوو بە پایتەختی خۆیان).

نوسەری سەرچاوە/٨٣ دوکتۆرە زوبیدة وتوویەتی : بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٠٢١ زاینیدا ناوی تورك لە ئاسیای بچووکدا لە زەمانی (باسیل)ی ئیمپراتۆرێتی

بێزەنطی هـاتووە کەلـەو سـاڵەدا سـلچوقیەکانو تورکمانـەکان هێرشـیان بردوتـە سەر ئەرمەنیاو حاکمەکەیان کـە نـاوی (حنـا سمبـاد)بـووە وازی لـە ئەمارەتەکـە هێناوە بۆ (باسیل) کە ئەم باسیلە لە بنەماڵەیەکی ناسیاوی (مکدونیا)بـووە کـە لـە سـاڵی ١٠٣٥ی زایـنـدا بــووە بــە حوکمــداری بێزەنطیــەکان. پـاش ئــەوەی سلچوقیەکان بەهێزبوونو دەستیانگرت بەسەر زۆربەی ئاسیای بچووکداو خۆیـان ولپێشاندا کە پارێزەری ئاینی ئیسلام بوون دژی کریستیانەکان، ئیـتر قۆنـاغێکی تر هاتە پێشەوە دەربارەی بێزەنطیەکانو سلچوقیەکان کە ئـەوە پـەیوەندی بـە باسەکەی ئێمەوە نیە.

### سێهەم : مەغۆلو تاتارەکان

لەدوای هاتنی لێشاوی غوزەکانو سلچوقیەکان لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بەرەو رۆژئاوای ئاسیا بە پێی ئەو سەرچاوانەی بەر لەمە باسمانکردووە، ئیـتر لێشـاوی مەغۆلو تاتارو ژمارەیەکی تری عەشایری تورکو تورکمان بەهەمان شێوەی غوزو سلچوقیەکان لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بە لێشاو ڕوویانکردۆتە رۆژئاوای ئاسیاو بەو هەموو شوێنانەی تیایا تێپەڕیون هەتا گەیشتونەتە رۆژئاوای ئاسـیا ڕوو بـەڕووی ئەو نەتەوانە بوونەتەوە کە لە ڕێگایانا بەرهەڵستی هاتنیان کردبوونو سـەرچاوە مێژووییەکان باسی سەدان کارەساتو بەسەرهاتو ماڵ کاول کردنو شارو دێهات وێرانکردنی ئەوانەیان تۆمارکردووەو باسی هۆلاکۆو جەنگیزخانو تەیموری لەنگ بە سەدان باسو کتێبیـان لەسـەر نووسـراوەو ئـەوەی ئێمـە لێرەدا مەبەسـتمانە باسی بکەین بریتیە لە کورتە باسێکی رەگەزو بنەچەی ئەوانەو ئەو شوێنەی لێی هـاتون هـەتا گەیشتنیان بـە رۆژئـاوا، بەتایبـەتی بـۆ ئاسـیای بچووکو بـاکوری کوردستان کە مەبەستی باسەکەمانە.

لەڕاستیدا مەغۆلەکانو تاتارەکان کە بەلێشاو ڕوویانکردۆتـە رۆژئـاوای ئاسـیا وەنەبێ لەناو خوشـیاناو لەگـەڵ عەشـیرەتەکانی غـوزو سـلچوقەکانی هاوزمـانی خۆیانو هاووڵاتی خۆیانا کوکو ڕێك بووبن، بەڵکو زۆرجار کێشەی ئەمانـە لەگـەڵ سلچوقیەکانا بۆ نموونە زۆر توندو تیژتر بـووە وەك لـە کێشـەی نێوانیـان لەگـەڵ

میللەتانی تر کەبەناو ولآتەکانیان تێپەڕیانکردووەو کاولیان کـردووەو کوشـتاریان کردووە.

دەربـارەی شـوێنی سـەرەتایی مـەغۆلو تاتاراکـان، هـەروەکوو هـی غـوزو سلچوقیەکان هـەر بریتـی بـووە لـە بـاکورو رۆژئـاوای چینو ناوەڕاسـتی ئاسـیاو دەربارەی ئەوە باسێکی الدکتور السید الباز العرین/سەرچاوە٨٦ ئەخەینە پێش چاو لە کتێبەکەیدا (المغـول) چـاپی بیروت سـاڵی ١٩٨٦ بـە دوورو درێـژی باسـی مەغۆلەکانی کردووە. ئێمە لـەو کتێبـەدا ئـەوەندەمان مەبەسـتە کورتـە باسێکی شوێنی سەرەتایی ئەوانەو چۆنێتی هاتنیان بەرەو خۆرئاوا بخەینە پێش چاو کـە بێگومـان کوردسـتانیشو میللـەتی کوردیش وەکـوو ولآتـانو میللـەتانی تـری رۆژئاوای ئاسیا پریشکی تاوانی ئەوانەی بەرکەتوەو تووشی ماڵ کـاولیو کوشـتار بووە.

نووسەر لە باسەکەیدا وتوویەتی:

بزوتنەوەی مەغۆل بە سەرکردایەتی جنگیزخـان (١٢٠٦ ــ ١٢٥٧)و ئەوانـەی دوای ئەو وەکوو (ئۆکتای)و (کیوك)و (مونکو) لە ئاسیای ناوەڕاسـتەوە دەستی پێکـردووە کـە رووبانکردۆتـە رۆژئـاوای ئاسـیاو لـە پێشـدا دەسـتیان بەسـەر ئیمپراتۆریتی (خـوارزم)دا گرتو رووبـانکردە دەوڵـەتی سـلچوقی لـە ئاسـیای بچووکداو لەوێوە بەناو رۆژهەلآتی ولآتانی ئـەورووپادا بلآوبوونەتـەوەو هـەندێکیان گەیشتنە روسیاو پۆلندەو مجرستان.

نووسەر لە لاپەڕەی/٥دا دەربارەی شوێنی مـەغۆلو عەشـیرەتەکانی مـەغۆل وتوویەتی : مەغۆلەکان بەر لەهاتنیان بۆ رۆژئاوای ئاسیا لەو شـوێنانەدا دەژیـان کە بە هاوین زۆرگـەرم بـووەو زستانەکەشـی زۆر سـارد بـووەو هەمیشـە کێشـەی نێوان ئەوانو دانیشتوانی ئەو ناوچانەی لەوەڕی تیا بووە درێژەی کێشاوەو بووە بەهۆی ناکۆکیو نا ئارامی.

عەشـیرەتی (هیوتـج نـو ــ هـون)ی مـەغۆلی لـە سـەدەی سـێهەمی زاینـد دەرکەوتونو عەشیرەتی (جوان جوان ــئاڤار) کە هەر مەغۆل بـووە لـە سـەدەی پێنجەمدا دەرکەوتووەو عەشیرەتی (تورکیو) لە سەدەی شەشەم داو (نایمان) لە سـەدەی دوازدەهـەمدا پـەیدا بـووە کـە هـەمویان مـەغۆل بـوون، جگـە لەوانـە

عەشـیرەتی (ئویغـور)و (خطـا)ش پـەیدابوون‌و لــە ســەدەی ســیازدەهەمدا جنگیزخانی مەغۆلی دەرکەوتووە.

ئەو هەموو عەشیرەتانە، ئەگەرچی بە رەگەز تورکیش بـوون بـەلاّم تێکـەلاّوی یەکتربوون. بۆیە ناتوانرێ بەئاسانی شوێنی سەرەتای دەرکەوتنیان دەسنیشـان بکرێت‌و شوێنەکانیان لێك جیا بکرێتەوە کە هەموویان مەغۆل‌و (تونجـور)بـوون‌و ئێستەش (تونجور) وەکوو تاقمێکی بچووکی پچرپچر لە باکوری ولاّتی منغوّلیاداو لە رۆژهەلاّتی سیبریا و ناوەراستیا هەرماون.

لەگەلّ ئەوەشدا مغۆلیەکان دراوسێی چینەکان بوون‌و تێکـەلّیان بـوون‌و لـەو سەردەمەدا چـین لـەچاو خۆیـدا مەلّبـەندی شارسـتانی بـووە کـەچی مەغۆلـەکان شتێکی زۆر کەمیان لێوە فێربوون. (لەباسی یەکەمدا ــ مێـژووی رەگـەزی تـورك باسی هۆی دروستکردنی شووره بەناوبانگەکەی چین کراوە کـە چـۆن چینیـەکان لەتاو درندەیەتی تورك ئەو دیوارە درێژەیان دروستکردبوو بـۆ ئـەوەی تێکـەلّیان نەبن‌و دووربن لـە دەسـدرێژیکردنیان. ئیـتر دیـارە ئـەبێ تـورك لـەو هەلّوێسـتەدا نووسەری سەرچاوە /٨٦وتوویەتی : سەیر ئەوەیە ئیمپراتۆرەکـانی تورکـی دوای مەغۆل زۆر رقیان لەوە دەبووەوە کە بەرەگەز ببرێنەوە سەر مەغۆلیەکان.

دەربارەی رەوشتی مەغۆلەکان نووسەر وتوویەتی: مەغۆلـەکان لایـان وابـووە بە کاولکردنی ئەو شـوێنانەی بـەناویا تیپـەریان دەکـرد، دەبـووە هـۆی مسـوگەر کردن‌و ئاسایش بۆ خۆیان.

لەسەرەتای سەدەی یازدەهەمدا تا کۆتایی سەدەی دوازدەهەم (کرایت)ەکان کە لە دەسەلاّتدارە بەناوبانگەکانی مغۆل بوون لە نێوانی (١٠٠٧ ــ ١٠٠٩) زایـنـدا، بـەهۆی ئوسـقوفێکی نسـطوری‌یەوە کـە دانیشـتوی شـاری (مـرو)بـوو بـوون بـە کریستیان‌و وایان لێهات سەرکردەکانی کرایت ووشە مەسیحیەکانیان هـەلّدەبژارد بۆ نازناوی خۆیان.

(طغرل) کەلە (کرایت)ەکان بوو بەیارمەتی (یسوکاری) کە باوکی جەنگیزخان بوو توانی بەسەر مامی خۆیدا سەربکەوێ‌و توانی لە شەرێکدا لەگەلّ (تاتار)ەکانا بەسەریانا سەرکەوێ‌و بەوە (یسوکای)بوو بە گەورەترین هێز لـە مـەنغولیاداو لـە پاداشی ئەوەدا (کـین)ی مـەلیکی چـین لەقـەبی مـەلیکی پێـداو کرا بـە مـەلیکی (وانج).

نووسەر دەربارەی جەنگیزخان وتوویەتی لە پێشدا ناوی (تیموجین)بووەو لە ساڵی ١٢٠٦دا قانونێکی دەرکرد کەبەو قانونە دەوترا (یاسا)کە ووشەیەکی مغۆلی بووە (بێگومان ئەو ووشەی یاسایەی ئیمڕۆ لەناو کوردو فارسدا بەکاردەهێنرێت هەرلەو ووشە مغۆلیەوە وەرگیراوە).

ئیسماعیل حقی ئۆزون لە کتێبەکەیدا/سەرچاوە/٩٠، لە لاپەڕە/٩دا دەربارەی چۆنێتی چوونی مغۆلەکان بەرەو رۆژئاوا وتوویەتی: ساتێك سلجوقیەکان لەهەندێ ناوچەی ئەناتولیادا بوبوون بە دەسەلأتدار لەورۆژانەدا لێشاوی مغۆلەکانو هێرشەکانیان بەرەو رۆژئاوا دەستی پێ کردبوو پاش ئەوەی جلال الدین خوارزم شاه لە ساڵی ١٢٣١ زایندا مرد ئیتر رێگا بۆ مغۆلەکان خۆش بوو بە سەرکردایەتی (جوماغون نویان) ئەرزنجانیان داگیر کردو بەرەو پێشەوە رویشتن تا گەیشتنە (سیواس)و هێزێکی مەغۆلی کە سێ‌هەزار کەس بوو بە سەرکردایەتی (بایجونویان) ئەبلۆقەی (ئەرزرۆم)یدا وتوانی بچێتە ناو قەلأکەیەوە کە پێی دەوترا (دژ)و هەرچی تیابوو بە مندالێ شیرەخۆرەشەوە کوشتنیانو ئافرەتەکانیان بەدیل گرتو شارەکەیان کاول کرد.

(غیاث الدین خسرەو ـ کە دیارە سلچوقی بووە) کە هەوالێ ئەو تاوانەی مغۆل بیست لە تموزی/١٢٤٣دا لە نزیك (کوسەطاغ) لە ژوور گوندی (زارا)ی نزیك بە شاری (سیواس) پەلاماری مغۆلەکانیدا و شکێنران، بەلأم زۆری پێ نەچوو مغۆلەکان خۆیان کۆکردەوەو سلچوقیەکانیان شکانو گەیشتنە (توقات)و (قونیە)و بۆ ماوەی سێ رۆژ ناوشاری سیواس تالأنکراو پاش ئەوە مغۆلەکان بە سەرکردایەتی (بایجو)گەڕانەوە بۆ دەشتی (مغان) لە ئازربایجانو ئەوێی کرد بە بنکەی خۆی.

دەربارەی هاتنی مغۆلەکان بۆ رۆژئاوای ئاسیا نووسەرێکی تر، لە سەرچاوە/٨٣دا ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (مقریزی کردووە ـــ السلوك) کەلە لاپەڕە/٢٢٨ی بەرگی یەکەمدا وتراوە مغۆلەکان لەدوای ئەوەی لە ساڵی ٦٢٨ی کۆچیدا جلال الدین خوارزمیان شکان لە شەڕی (میافارقین)ی بەناوبانگ- لەوێوە روویانکردە شاری ئەربیلو لە ساڵی ٦٢٩ی کۆچیدا چوونە ئاسیای بچووكو ئەرمەنیایان داگیرکرد.

نووسەر باسی هێرشەكانی توركی مغۆلی كردووە بە دوو بەشەوە كە بەشی یەكەم ئەوانەیان بوون ڕوویانكردبووە روسیاو بۆ ماوەی دوو سەدە زۆرشوێنی روسیایان لەژێردەستدا بووەو لەوێوە پەلاماری بوهیمیاو موراڤیاو هنگاریایان دابوو ئەملاولای روباری (دانوب)یان خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوەو گەیشتبوونە دەریای ئەدریاتیك بەشی دەهەمیان ئەوانە بوون لە ساڵی ٦٣٥ی كۆچیدا بەرامبەر ساڵی ١٢٤٢ زایین چوونە (ئەنادۆل)و ئەو شوێنانەیان داگیركرد كە بەدەستی سلچوقیەكانەوە بوو لەساڵی ١٢٤٣/ی زایندا بەسەركردایەتی (بیجونین) لە شەڕێكدا دژی سلچوقیەكان لە (كوسیداغ)دا بەسەر سلچوقیەكانا سەركەوتن (سەرچاوەی پێشووی ژمارە/٩٠ ئەو سەركردەیەی بە (بایجونیان)ناوبردوە)و سەركردەی سلچوقیەكان (كەیخسرەو) رایكرد بۆ قسطنطنیە بۆ ناو بێزەنطیەكان بەوجۆرە دەستیان بەسەر ئاسیای بچووكدا گرتو گەیشتنە (تراكیا).

سەرچاوەیەكی تر سعید احمد برجاوی لە لاپەڕە/١٩ی سەرچاوە/٨٢دا باسی ئەو عەشایرە توركمانانەی كردووە كە گەیشتبوونە ئاسیای بچووكو لەوێ نزیكی (٢٠) ئەمارەتی بچووكو پچڕپچڕیان دامەزراندبوو كەلە كتێبەكەیدا باسی ئەم ئەمارەتانەی كردووە.

**١ ــ ئەمارەتی (قرمان) بنكەكەیان لە شاری (قونیە)دا بوومو ئەمیرەكەیان (محمود ئال قرمان)بووە.**

**٢ ــ حمید ئیلی ــ بنكەكەیان لە (یگی شهر)بوومو ئەمیرەكەیان (ئال حمید بووە).**

**٣ ــ گرمیان ــ یاجرمیان ــ بنكەكەی لە (كوتاهیە)بوومو ئەمیرەكەیان (ئال گرمیان)بووە.**

**٤ ــ تكە : بنكەكەیان لە (ئەزالیە ــ ئەضالیە)بوومو ئەمیرەكەیان (تكە بەگ)بووە.**

**٥ ــ منتشا : بنكەكەیان لە (میلاس)بوومو ئەمیرەكەیان ناوی (منتشا بگ كوڕی بهاءالدین كوردی)بووە.**

**٦ ــ ئایدن : بنكەكەیان لە (ئەزمیر)بوومو ئەمیرەكەیان (ئایدن)بووە.**

٧ ـ صاروخان : بنكەكەيان لە ( مغنيسيا )بووە لە ناوچەی ( ليديا ) و ئەميرەكەيان ( صاروخان )بووە.

٨ ـ قرەسی : بنكەكەيان ( بالكيس )بوومو ئەميرەكەيان ( عجلان بگ )بووە

٩ ـ بافلاغونيا : بنكەكەيان لە ( قسطمونی )بوومو ئەميرەكەيان ( ئەسفنديە ئۆغلو )بووە.

نوسەری سەرچاوەكە وتوويەتی : بەدوای مردنی جەنگيزخان ئيتر مغۆلەكان دەستيانگرت بەسەر هەموو ئاسيای بچووكداو ولاَتی (فارس)و (گرجستان)يشيان خستە ژێر دەستی خۆيانەوەو رووبيانكردە عێراقو حرانو ئامدو دياربكرو نصيبينو رهاو سروج.

(سموط)ی كوڕی هولاكۆ رويكردە شامو بەوجۆرە مغۆلەكان لە ماوەيەكی كەمدا دەستيانگرت بەسەر دياربكرو ديار ربيعەو شام داو پاش ئەوی عوسمانيەكان بوون بەدەسەلاَتدارو هەموو ئەمارەتەكانی مەغۆل يەك لەدوای يەك چوونە ناو ئەودەولەتەی عوسمانيەوە)).

لە باسی داهاتوودا كە بريتيە لە دەولەتی عوسمانی باسی كێشەی پاشماوەی مەغۆلەكانو عوسمانيەكان دەكەين.

# بەشی چوارەم

# ڕەگو ڕیشەی عوسمانیو چۆنێتی دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی

ڕەنگە هیوا هەبێ لای وابێ کە وترا عوسمانیو دەوڵەتی عوسمانی، ئیتر ئەو ووشەیە هەرئەو خێڵو بنەماڵەیە دەگرێتەوە کەلە دواییدا دەوڵەتێکیان دامەزراند بەو ناوەو بەژمارەی ئەو خێڵەی ڕەشماڵەکانیان لە ناوەڕاستی ئاسیاوە هاتنە ئاسیای بچووک توانیبویان ئەو ئیمپراتۆریەتە گەورەیەی بۆ ماوەی پتر لە شەش سەدە گەورەترین ڕۆڵیان هەبوەو ڕۆژئاوای ئاسیاو ڕۆژهەلاتی ئەوروپایان شلەقاندبوو بوبوون بەهۆی ڕوودانی سەدان شەڕو کارەسات.

لە ڕاستیدا پێك هاتنی دەوڵەتی عوسمانی، وەکوو لە دوایدا لە شوێنی خۆیا باسی دەکەین کە بوبوون بە میراتگری هەموو عەشایرەکانی غوزو سلچوقیەکانو مغۆلەکان، هەروا لەخۆیەوە پێك نەهاتبو بەڵکو گەلێ هۆ هەبوە بۆ دروست بوونیو مانەوەی بۆ ئەو ماوە دوورو درێژە.

بێگومان کێشەی نێوان بێزەنطیەکانو پاپا لە ڕۆما لەلایەکەوەو لاواز بوونی خەلافتی عباسیو ئەوانەی بوبوون بە جێگریان بۆشاییەکی تەواوی پەیدا کردبوو بۆ دەرکەوتنو سەرکەوتنی عوسمانیەکان جگە لە کێشەی نێوان سلچوقیەکانو مغۆلەکان، ئەمانە هەموویان بوون بەهۆی ئەوەی عوسمانیەکان ببن بە میراتگری ئەو هەموو تورکانەی بەرلە خۆیان وەکوو لە باسەکانی پێشودا باسمانکردبوونو گەیشتبوونە ئاسیای بچووك، بەوە تورکە عوسمانیەکان هەلو دەرفەتێکی زۆریاشو لەباریان بۆ هەڵکەوت ئەو دەوڵەتی عوسمانیە دروست بکەن کە بێگومان کوردیش لە باکوری کوردستاندا ڕۆلێکی گەورەی بینیوە لە پەرەسەندنو چەسپاندنی ئەو دەوڵەتەی ئالأی ئیسلامو ئالأی خەلافتی ئیسلامیان هەڵکردبوو کە هەمیشە کورد لە هەموو نەتەوەکانی تر دڵسۆزی ئەو

ئاینە بووەو سەری پێوە نەبووە بۆ هەموو جۆرە فیداکاریەك لەپێناوی سەرکەوتنیا.

بۆ ئاسکردنی ئەم باسەی دەوڵەتی عوسمانی، هەوڵئەدەین بە کورتی باسەکە بکەین بە دوو بەشەوە :

١ ــ ڕەگو ڕیشەی بنەماڵەی عوسمانیو چۆنێتی هاتنیان لە ئاسیای ناوەڕاستەوە بۆ ئاسیای بچووك کە ئەوسا پێی وتراوە (ئەرزن ڕۆم ــ ئەرزڕۆم).

٢ ــ چۆنێتی دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانیو پەرە سەندنی کە لەم بەرگی یەکەمەدا تەنها باسی تا شەڕی جیهانیی یەکەم دەکەین.

### یەکەم : ڕەگوڕیشەی بنەماڵەی عوسمانیو چۆنێتی هاتنیان بۆ ئاسیای بچووك

دەربارەی ڕەگو ڕیشەی عوسمانی، مێژوونووسان بە گەلێك شێوە باسیانکردووە. لەم باسەدا هەوڵ ئەدەین کورتەی بۆچوونی هەندێکیان بخەینە بەرچاو:

پرۆفیسۆر ئیسماعیل حقی‌ئوزون، لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٩٠ بەدوورو درێژی باسی عوسمانیەکانو ڕەگەزی عوسمانی کردووەو وتوویەتی :((تورکەکان کەلە ئەنادۆڵدا نیشتەجێ بوون، ئەمانە وەنەبێ هەموویان لە یەك کاتداو پێکەوە ڕوویانکردبێتە ئەنادۆڵ بەڵکو بەشێوەکی پچڕ پچڕو هەرجارەی تاقمێکو تیرەیەکیان هاتووە کە (غوز)ەکان پێشەنگیان بوون کە بریتی بوون لە (٢٤)تیرە)).

نووسەر لە باسەکەیدا بە دوورودرێژی باسی ئەو تیرانەی کردووە، بەڵام ئەوەی ئێمە مەبەستمانە لێی بدوێین بریتیە لەو تیرەیەی کە ناوی (قایی)بووە کە بنەماڵەی عوسمانی لەو تیرەیە بوون. نووسەر لە باسەکەیدا وتوویەتی: ((هەرچەند ئەو سەرچاوانەی باسەکانیان جێگەی دڵنیایین وتوویانە عوسمانیەکان لە تیرەی (قایی) بوون کە بەشێك بووە لە عەشیرەتی غوزو پێی وتراوە (گول خان)، بەڵام شارەزایەکی وەکوو پرۆفیسۆر (پرۆفیسۆر ویتنك) لای وایە عوسمانیەکان نەك هەر لە تیرەی قایی نەبوون، بەلکە پێوەندیشیان بە

غوز)ەکانیشەوە نەبووەو لە غوزەکان نەبوون‌و ووشەی (قایی) بە کەسیکی دەسەلأتداری لیهاتوو وتراوە)).

نووسەر لە لاپەڕە/١١٨دا نووسەر وتوویەتی: لە کاتێکدا لە دەوری شەڕی ملازگرد) لە ساڵی ١٠٧١دا کە سلجوقیەکان دەستیان بەسەر ئەنادۆڵدا گرت‌و ئیلیا نیشتەجێ بوون، لەو سەردەمەدا حاکمنیشینەکانی عوسمانی کە لە تورکەکانی ناوچەی ئەنادۆڵ بوون توانیبویان حاکمنیشینەکانی عوسمانی دەزرێنن، لە کاتێکدا (قایی)کان لە سەدەی نۆهەمدا لەگەڵ سلجوقیەکان لە ڕوباری (جیحون) پەڕیبوونەوەو ڕوویانکردبووە ئێران‌و چووبوونە ئازربایجان‌و ئەخلاطو بە پێی بەڵگە مێژووییەکان تیرەی قایی لە زەمانی دەسەلأتداریتی (علاءالدین کیقباد)دا لە ساڵانی ١٢١٩– ١٢٣٤دا ئەوسا لە نزیک (قرەجەداغ) لە خۆرئاوای ئەنقەرەدا جێگیربوون‌و دوای ئەوە (سگوت)و (مینیج)یان خستە ژێر دەسەلأتی خۆیانەوەو ئەوەی زانراوە ئەوەیە ئەو (قایی)یانە بریتی بوون لە (٤٠٠) خێزان.

نوسەری ئەو سەرچاوەیە دەربارەی بنەماڵەی عوسمانی ئاماژەی بۆ هەندێ سەرچاوە کردووە وەکوو شرفنامەی شرفخانی بدلیسی وە نوسینەکانی محمد ابن خواجە خلیل قرنوسی‌و لطفی پاشاو محی‌الدین جمال‌و ابن کمال‌و خواجە صدرالدین هەموویان لایان وابووە گوایە (سلیمان شاه کە باوکی (ئەرطغرل)بووە لەکاتی پەڕینەوەیدا لە ڕوباری (فرات) خنکاوەو لە وێدا نێژراوە کە تورکەکان بەو شوێنە دەڵێن (تورك مزاری).

نووسەر ئەڵی: لە ڕاستیدا نەزانراوە ناوی باوکی (ئەرطغرل)کێ بووەو من گومانم هەیە لەوەی کە سلیمان شاه بوویێت‌و هەندێ سەرچاوەی تر وەکوو کتێبی تأریخ محمد پاشا، أنتشارات أنجمن تأریخ ترك شمارە/٧٩، وەلاپەڕە/٨١ی کتێبی (دستور نامە)ی پرۆفیسۆر خلیل وتأریخی (ئال عوسمان)ی نوسینی (روحی) لەمانەدا هەموویان (گوندوز ئالپ)یان بە باوکی ئەرطغرل داناوە نەك سلیمان شاه.

بەپێی چیرۆك‌و ئەفسانە ناوچەییەکان دایکی ئەرطغرل ناوی (حیمەئان)بووە کە شوێنی گۆڕەکەی لە گوندی (جهارستن) دایەو لە ساڵی ١٨٩٢دا بە فەرمانی

سوڵتان عبدالحمید گۆڕەکەی تازە کراوەتەوە. ساتێك شەر لە نێوانی (علاءالدین کیقباد)و سلچوقیەکانو (ئەزنیق ـ ئەزنیك)ی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دەستی پێکرد ئەرطغرل بوو بە لایەنگری کیقبادو ئەرطغل (قرجە حصار)و سگوت)ی داگیرکردو بەرامبەر بەوە سلچوقیەکان (سگوت ـ سکوت) یان بەخشی بە ئەرطغرل.

ئەرطغرل لە تەمەنی (٩٠)ساڵیدا مردوەو (عوسمان)ی کوڕە بچووکی بەهۆی لێهاتووییەوە لەلایەن عەشیرەتەکەیەوە کراوە بە سەرۆكو عوسمان لەوە ترساوە (دندان)ی برای بەرهەڵستی بکات بۆیە لە ساڵی ١٢٩٨ی کۆچیدا دنداری برای کوشتوە. بەپێی بۆچوونی مێژوونوسان (عوسمان بەگ) لە ساڵی ١٢٥٨ی زایندا لە شاری (سکوت) لە دایك بووەو لە تەمەنی ٢٣ساڵیدا کراوە بە سەرۆکی عەشیرەتەکەی.

نوسەری سەرچاوە/٩٠، لە باسی ڕێبازەکانی ئەو سەردەمەی ناوچەکەدا وتوویەتی دوو ڕێباز هەبوە، یەکەم (ئەخیگری) دوهەم (بابیگری) کە (شێخ ئاطەبالی) یەکێك بووە لە سەرۆکەکانی (ئەخی ــ ئەخگیری) کەلە (ئیست بورنی)دا ژیاوەو لە نزیك (ئەسکی شهر) خانەقایەکی هەبوەو یەکێك بووە لە دەسەڵاتدارانی ناوچەکەو عوسمان بەگ کچێکی شێخ ئاطەبالی هێناوە کە ناوی (ملحون خاتون)بووە کە لە میصر خوێندبووی‌و عوسمان بەهۆی ئەوەوە سوودی لە (ئەخی)یەکان دەسگیربووە.

پاش ماوەیەك بە پێی فەرمانی (غیاث الدین مسعود)ی حکومداری سلچوق، شارەکانی (سگوت)و ئینونۆ، ئەسکی شەهر) هەمووی بەخشراوە بە عوسمانو کراوە بە حاکمی سەر سنوورو لە ساڵی ١٢٩١دا عوسمان (قرجەحصار)یشی خستوتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

پرۆفیسۆر ئیسماعیل حقی ئوزون لە لاپەڕە/١٢٨دا باسی تەقەلای کوشتنی عوسمانی کردووە لەلایەن بێزەنطیەکانەوە لەبەر ئەوەی لە سەرکەوتنەکانی عوسمان سڵەمیوونەتەوەو بەنیازی کوشتنی دەعوەتیان کردبوو بۆ زەماوەنێکو حاکمی شاری (ینی شهر ـ قرجە حصار)یان راسپاردبوو لە گەیشتنی عوسمان بۆ ئەو زەماوەند بیکوژن، بەڵام (میخائیل غازی)ی حاکمی (خرامان قیە)کە ئەویش بۆ هەمان شایی بانگ کرابوو ئاگاداری پیلانی ئەو کوشتنە بووەو عوسمانی

ئاگادار کرابوو هەوالی پیلانەکەی پێ گەیاندبوو، بەرامبەر بەوە عوسمان پەلاماری (یار حصار) ئەداو ((بیلەجەك) داگیر دەکاو کچەکەی حاکمی یار حصار کە بڕیار بووە بۆ ئەو زەماوەندە بدرێ بە حاکمی بیلەجەگ، عوسمان ئەو کچە کە ناوی (هولوفرا ـ نیلوفر)بووە لە ئۆرخانی کوڕی خۆی مارە دەکا. لەساڵی ١٢٩٩ی زایندا (أبن بطوطه)کە لە ساڵی ١٣٣٣زایندا چاوی بەو نیلوفەرە کەوتووە لە کتێبەکەیدا باسیکردووە)).

لە سەرچاوە/٨٩دا، دەربارەی ڕەگەزی عوسمانی، بە جۆرێکی تر باسی کردووەو وتوویەتی عوسمانیەکان بە ڕەگەز دەچنەوە سەر ئەو تیرەیەی لە دەستەکانی ( Kayi ـــ قایی)دا بوون کە تورکەکانی (غوز)یشی تیادا بووەو ڕوویانکردۆتە ئاسیای بچووك‌و لە سەدەی سیازدەهەمدا مەغۆلەکانیان لە ئاسیای بچووك دەرکردبوو.

نوسەری سەرچاوە/٨٩ئاماژەی بۆ باسێکی (محمد فؤاد کوپرولو) کردووە کە وتوویەتی ووشەی عوسمانی ووشەیەکی سیاسی بووە نەك ڕەگەزی‌و لەوەوە هاتووە کە (طغرل)ی باوکی عوسمان لەلایەن سلجوقیەکانەوە کرابوو بە پاسەوانی ناوچەکانی سەرسنوری باکور لەگەل تاقمێکی تورکماناو لەدوای طغرل عوسمانی کوڕی جێی گرتۆتەوەو ئەو دەوڵەتەی دایمەزراندبوو بەناوی ئەوە ناونراوە کەلە ساڵی ١٢٩٩زایین هەتا ساڵی ١٣٢٦ عوسمان دەسەلاتداریتی کردووە)).

سریا بدرخان لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٩ لە باسی عوسمانیەکانا وتوویەتی لە ساڵی ١٢٨٨دا بە سەرکردایەتی (Ertogol ـ ئرتوگول ـ مەبەست طغرل)ئەو خێڵەی کە بریتی بوون لە (٤٤٤)ڕەشمال لە ناوەڕاستی ئاسیاوە ڕوویانکردە ناوچەی (سوگیوت) کە دەکەوێتە نێوانی ئەنقەرەو بروسەو تیایا نیشتەجێ بوون (لە باسەکەی پرۆفیسۆر ئیسماعیل حقی ئوزوندا وتراوە لە نزیك (قرەچەداغ) لە خۆرئاوای ئەنقەرەدا نیشتەجێ بوون)و چوونە سەر ئاینی ئیسلام‌و لە زەمانی ئۆرخانی دوهەمین سوڵتانی عوسمانی کە لە ١٣٢٦ ـــ ١٣٥٩ فەرمانڕەوای کردووە، لە ساڵی ١٣٥٢دا فەرمانێکی دەرکرد کە پێویستە ئەو کریستیانانەی لەژێر دەسەلاتیانا بوون منداڵەکانیان لە تەمەنی ٧ ـــ ١٠ساڵیەوە بدرین بە

حکومەت‌و لە ژێر چاودێریی حکومەتدا پەروەردە بکرین (هەرچەند سریا بدرخان ئاماژەی بۆ هیچ سەرچاوەیەك نەکردووە دەربارەی ئەو فەرمانە، بەڵام وابێ ئەم بڕیارەی حکومەتی عوسمانی لە دوایدا خراپەکار کە بەپێی ئەوە هێنرا ئەنکشاری هێنرا کەلە شوێنی خۆیدا باسی ئەنکشاری دەکەین).

سریا بدرخان لە باسەکەیدا ویستویەتی ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەو کاربەدەستەکانی عوسمانی بەرەگەز بباتەوە سەر ئەو میللەتانەی کە تورکەکان بەزۆر کردبویانن بە تورك وەیا هەرلە منداڵیەوە لە ژێر چاودێریی تورکدا منداڵە بێگانەکان پەروەردە کرابوون‌و کرابوون بە تورك‌و ناوی چەند کەسێکی بە نموونە هێناوەتەوە وەکوو :(شوکت)و (پرنس حلیم) کە هەردوکیان بە رەگەز عەرەب بوون، مصطفی کمال کورەزای یەکێك بووە لە (کروات)یە تێکەڵاوەکانی ناوچەی (نیش)، (لە بەرگی دوەمدا لە باسی کمالیەکانا لەمێژووی ژیانی مصطفی کمال ئەدوێین)، عصمت ئینونوی سەرەك وەزیران لە کوردەکانی (Rafan ـ رافان) بووەو (فوزی) کە ئێستە (مەبەستی کاتی نوسینی کاتی کتێبەکەی بووە کە فلادلیفیا چاپی کردووە) سەرۆکی ئەرکانی حەربە لە کوردەکانی ناوچەی (تارجان Tarjan)ەو (رؤف) کە ساتی خۆی یەکێك بووە لە سەرکردە هاوکارەکانی مصطفی کمال‌و ئێستە ئاوارەیە لە (جرکس)یەکانەو هەرئەمانە بوون کاروبارە گرنگەکانی دەوڵەتیان بردوە بەڕێوەو بوون بە هۆی سەرکەوتنی عوسمانی)).

لە کۆتایی ئەم باسەدا کورتەیەکی ئەو باسەی ئەولیا چلبی لە گەشتەکەی تۆماری کردووە /سەرچاوە/٥١ پێشکەش دەکەین:

((یەکەم شای گەورە (محمد کوڕی دانیشمند) لەساڵی ٥٨٣ی کۆچیدا شاری (ملاتیە)ی دروست کرد (لە باسی سلجوقیەکانا باسی میرنشینی دانشمند کراوە کە سلجوقیەکان لەناویان بردبوو، وەوترابوو شاری ملاتیە لە ساڵی ١٠٥٧ی زاینیدا دروستکرابوو)، کە عەجەمەکان بە مەلاتیە دەڵێن (ئەسپەزانی)و تورکمانەکان پێیان وتووە (مەئاتیە)و یونانیەکان بە (رەقەبە)و عەرەبەکان بە ملاطیە ناویان هێناوە. لای نووسەرە یۆنانیەکان وایە شارەکە یەکەم جار لەلایەن (رەقەبە) ناوێکەوە دروستکراوە کە لە تاقمی (یونس پێغەمبەر)بووە.

ساتێك باپیرە گەورەی عوسمانیەكان كە (شاه سلیمان) بووە بەخۆی و ۷۰۰)كەسی دەستو پێوەند لەسەر ئیزنی (خواجا ئەحمەدی یەسەوی) كە سەركردەیەكی تورك بووە لەگەڵ محمد كوڕی دانشمندو تاقمەكەیدا لەكاتی پەڕینەوەی لە رووباری فوراتدا خنكاوە، ئیتر (ئەرطغرل)ی كوڕی تەرمەكەی خوكی كە شاه سلیمان بووە لەبن دیواری قەڵای (جەعبەر)ی سەركەناری رووباری فورات ناشتو هەموو هۆزەكە كە ئەرطغرلیان لەجیاتی باوكی كرد بە بەگو عوسمان بوو بە عوسمان بەگ، بەڵام ئەو شوێنەیان بە جێگایەكی شوومو نەگبەت زانی بۆیە باریانكردو چوونەلای علاءالدین سلچوقی و كران بە (بۆی بەگ).

لە ساڵی ٦٠٠/ی كۆچیدا دەسەڵاتی سلچوقیەكان كوتایی پێهاتو ئەرطغرل بوو بە (بۆی بەگ)ی راستی و پاش ئەو (عوسمانوك) بوو بە خاوەنی سكەو پارەو ئیتر لەوساوە ئەم خێڵە بەناوی (عوسمانی)یەوە ناوبانگی دەركردو بوو بە دەوڵەتێكی هەتا هەتایە (ئەولیا چلبی لەو رۆژانەدا لای وابووە عوسمانی هەتا سەر دەمێنێت).

ساتێك عوسمانیەكان بەسەركردایەتی طغرل ناوچەكەیان بەجێ هێشتو چوونە لای سوڵتان علاءالدین، دانشمندەكان كەلە گەڵیان بوون لە شوێنی خۆیانا مانەوەو كۆچیان نەكرد بۆ شوێنی تر چونكە شوێنەكە ئەوەندە سازگارو بژوێن بوو بەشی خۆیانو مەڕو ماڵاتەكانیانی دەكردو پاش ماوەیەك هەواڵی دەوڵەمەندبوونی ئەو دانشمندیانە گەیشتە (ماهان) كە شوێنی پێشوویان بووە لە ناوەڕاستی ئاسیادا، ئیتر بە هەزاران لەوێوە دەستیانكرد بەكۆچكردنو گەیشتنە (ئورفە)و لەقەڵای (بیرەجەگ)دا گیرسانەوەو هەتا دەهات ژمارەیان لەپەرەسەندندا بووەو ساڵی ٥٨٣ی كۆچی محمدی كوڕی دانشمند قەڵای (ملاطیە)ی ئاوەدان كردەوە)).

### دوهەم: چۆنێتی دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی و پەرەسەندنی

دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر بناغەی ئەو توركانەی لە زەمانی غوزەكانەوە هەتا كاتی دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی لە ئاسیای بچووكدا لە

دوای دەرکردنی بێزەنطیەکان‌و یەکخستنی هەموو ئەمارەتەکانی تورك کە پاشماوەی سلجوقیەکان‌و مەغۆلەکان بوون ڕووداوێکی مێژوویی زۆر گرنگ بووە بەتایبەتی بۆ کوردی باکوری کوردستان کە دراوسێی ئەو دەوڵەتە بوون‌و زۆری پێ نەچوو لە ڕێگەی ئیدریسی بدلیسیەوە هەموو ئەمارەتەکانی کورد چوونە ژێر باڵ‌و دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەوە هەروەکوو لە دوایدا بەدوور درێژی باسی دەکەین چون ئەو کارەی بدلیس بوو بە بەسەرهاتێکی پڕ لە نەگبەتی‌و ماڵ کاولی بۆ کورد بەشێوەیەکی گشتی‌و بۆ کوردی باکوری کوردستان‌و کورد لەو ماوە دوور درێژەی کە عوسمانی باڵی رەشی بەسەرا کێشابوو لە دواکەوتن‌و نەخوێندەواری‌و هەژاری‌و ماڵ کاولی بەلاوە هیچی دەسگیر نەبووەو هەموو شوێنەوارو دەسکەوتێك کە کورد لە دەوڵەتەوە بۆی مابووەوە بریتی بووە لە چەند مزگەوت‌و تەکیەیەك‌و ئەو قەڵاو بنکە سوپاییانەی هێزەکانی عوسمانی لە ناو کوردستاندا دروستیانکردبوو بۆ لێدانی بزوتنەوەکانی کورد.

لە ئەنجامی دەربڕینی بێزاری کورد بەرامبەر بە رەفتارەی کاربەدەستانی عوسمانی، لەبەر ئەوە بە شتێکی پێویستم زانی بە دووردرێژی باسی دەوڵەتی عوسمانی‌و هەڵوێستی کورد بەرامبەر بەو دەوڵەتەی بۆ ماوەیەکی دووردرێژ دروشمی خلافتی ئیسلامی‌و پاراستنی ئاینی هەڵگردبوو بکەم، کە لەم بەرگی یەکەمەدا هەتا شەڕی جیهانی ئەخەمە پێش چاو لە بەشی دوهەمدا دەچینە سەر باسی پاشەبەرەی ئەو دەوڵەتەو دروستبوونی دەوڵەتی جمهوری تورکیای تازەو ئەو بەسەرهاتانەی بەسەر میللەتێکی کوردا هاتبوو هەتا شەڕی دوهەمی جیهانی

دەربارەی چۆنێتی دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی هەموو سەرچاوەکان لەسەر ئەوەن عوسمان دامەزرێنەری دەوڵەتەکە بووەو گەلێك سەرچاوە بە دوور درێژ لەوە دواوە ئەو دەوڵەتە، کەی‌وچۆن دامەزراوەو لەبەر گرنگێتی هەندێ لەوباسانە هەوڵئەدەم کورتەی هەندێکیان بخەمە پێش چاو.

پرۆفیسۆر ئیسماعیل حقی ئوزون لە سەرچاوە/٩٠دا بە دوور درێژی باسی چۆنێتی دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی‌و چۆنێتی بوونی عوسمان بە دامەزرێنەری ئەو دەوڵەتەی باسکردووەو بەر لەمەش لەباسی رەگەزی عوسمانیەکانا لەوە دواین زۆربەی سەرچاوەکان بنەماڵەی عوسمانیەکانیان

ڕبوتەوە سەر(سلیمان شاه)ی باوکی ئەرطغرلو باپیری عوسمانو هەروەکوو ئیسماعیل حقی ئوزون باسی کردووە کە وتوویەتی:

((دەربارەی دانانی جێ نشینی سوڵتان هیچ جۆرە یاسایەکی دەسنیشانکراو نەبوو ساتێك سوڵتانێکیان چوتە سەر تەخت ئیتر ئەو سوڵتانە بە هەموو جۆرێك هەوڵی داوە هەموو براکانی خۆی لەناو ببات بۆ ئەوەی تەنها هەر خۆی بمێنێتەوە (کە یەکەم نموونەی ئەمە وەکوو لە باسی ڕەگەزی عوسمانیدا خراوەتە بەرچاو کوشتنی (دوندار)بووە لەلایەن عوسمانی برایەوە).

سوڵتانی عوسمانی هەمیشە خۆی بە خاوەنی هەموو موڵكو ماڵاتی ناو دەوڵەتەکەی ژماردوەو دەستی خستوتە هەموو کاروباری وڵاتەوەو بڕیارەکانی سوڵتان بەیاسا دانراوەو خۆی نەبوایە کەسی تر توانای گۆڕینی نەبوەو نەیتوانیوە دەسکاری بکاتو خۆی بە سەرکردەی هەموو هێزەکانی دەوڵەت ناوەو خۆی بڕیاری دەسپێکردنو راوەستانی شەڕی داوەو پەیمانو ڕێکەوتنەکانیشی هەرخۆی مۆری کردووە.لە باسی ڕەگەزی عوسمانیدا باسی ئەوەمان کرد چۆن عوسمان بوو بە جێگری ئەرطغرل باوکی.

هەروەکوو لە سەرچاوە/۸۲دا باسی کراوە، ساتێك عوسمان چووە جێگەی باوکی، یەکسەر هێزەکانی خۆی ئامادەکردو چوو بەگژ بێزەنطیەکاناو زۆرکەس بەدەم بانگەوازەکەیەوە چوون کە بە ناوی غەزای ئیسلامەوە شەڕی دەکرد. لە ساڵی ٦٩٩ی کۆچیدا بەرامبەر/١٣٠٠ی زایین عوسمان هەموو ناوچەکانی (ئیفریجیا)و (بثینا)ی داگیر کردو لە شاری (ینی شهر)ەوە پەلاماری شوێنەکانی تری ژێر دەسەڵاتی بێزەطیەکانیدا.

لەدوای ئەوەی دەسەڵاتی عوسمان بەهێز بوو پەرەی سەند هەواڵی نارد بۆ هەموو ئەمیرەکانی (رومی تکفیری) لە (بروسە،ئەزمیر، ئەزنیق) ئیتر دەبێ یان هەموویان ببن بە موسوڵمان وەیا دەبێ سەرانە بدەن وە یا شەڕیان لەگەڵدا ئەکا، هەندێکیان بوون بە موسوڵمانو هەندێکی تریان بە باجو سەرانەیان داو ئەوانی تر پەنایان بردە بەر مەغۆلەکان لەگەڵ عوسمانیەکانا نەیار بوون، بەلام عوسمانیەکان لەمانەیان داو پەرشو بڵاویانکردنەوەو پەلاماری قەڵای

(ئەردنوس)ىدا كە لەسەر لووتكەى چیای (ئولومپ)بوو، شاری (بوجـە)شـی بۆ ماوەی دووسالْ ئابلْوقەدا كە لەدواییدا ئۆرخانی كوڕی عوسمان داگیری كرد.

لـەدوای داگـیركردنی (بورصــە) ئیــتر (ئــەفرینوس)ی ئیمــپراتۆرو هــێزی سەركردەی بێزەطی بوو بە موسولْمان لەگەلْ ژمارەیەك لە یونانیەكان (بێگومـ نەوەی ئەوانە ئیمرۆ هەموو بە تورك دەژمێررێن) كەلەگـەلْ ئیمپراتۆردا بـوون بـ موسولْمان.

نوسەری سەچاوە/٩٠ پرۆفیسۆر ئسماعیل حقی ئوزون باسی ئەوەی كردوو چۆن لە بەختی توركەكان، بێزەنطیەكان لەناو خۆیانا تێكچوون و ئۆرخانی كوڕ عوسمـان سـودی لـەو ناكۆكیـە وەرگرتـوەو (تیـودورا)ی كچـی (كۆنتـا كوزیـن بێزەنطی مارە كردووە لە (ئۆرخان)ی كوڕیو لە پاداشی ئەمەدا ئۆرخان هێزێكو دەهەزار كەسی ناردوە بـۆ كۆنتـا كوزیـن كـە دژی بێزەنطیـەكی تـر كـە (حفلـ سافۆ)بووە شەڕی كردووەو ئەمەی دوایش داوای یارمەتی لە (صاروخان)كردوو كە ئەمیری (لیدیـا)بـووە. لەسـالْی ١٣٤٩دا بیسـت هـەزار سـەربازی تـر نـێررا بـ (كۆنتاكوزین)و ئەو هێزە دەستی گرت بەسەر دردنیلداو بێزەطی بەشـی ئـەوروپ لەلایەن ئەو هێزەوە تالأنكراو كاول كرا.

نووسەر باسـی ئـەوەی كـردووە كەلـە ئـەنجامی ئـەو هەلْوێسـتەدا هـەندێ ئەوروپاییـەكان بـەلْێنیان دا بەتـەیموری لـەنگ یارمـەتیی بـدەن و تیمـوری لـە هێزێكی نارده سەر ئەنقەرەو هەندێ لـە هێزەكـانی سـولْتانی عوسمـانی كـە رۆژەدا (سولْتان بایزید)بووە چۆتە پالْ هێزەكەی تیموری لەنگو ئـالأی تیمـو لـەنگ بەسـەر قـەلأكانی قسـطنطنیەو (پـیرا Pera) دا بـەرزبووەوەو نامـ دۆستایەتی لەلایەن شارلی شەشەمی پادشای فرنسـەو هێنری چوارەمـی مـە ئنگلـیزو هـنری سـێهەمی مقاطعـەی (كاسـتیل) نـێررا بـۆ تیمـوری لـە (نورالدین)ی كوڕی تیموری لەنگ شاری (ئزمیر)ی گرتوو لەو شـەڕەی ئەنقـە روویدا (سولْتان بایزید)ی عوسمانی بەدیل گیراو مـرد، بـەلأم تیمـوری لـەنگ ناوچانەدا نەمایەوە بەلْكو لە سالْی ١٤٠٥دا خۆی كێشایەوە بۆ (سمرقند)و لـ مرد.

ـەدوای کشـانەوەی تیمـووری لـەنگ دوبـارە هـەلێکی بـاش‌و لـەبار بـۆ عوسمانیەکان رەخساو سولتان محمدی دوهەم ئەمارەتەکانی تورکی خستە ژێر دەستی خۆی‌و لە زەمانی سولتان محمدی دوهەمدا کە بە (سولتان محمدی فاتح) دەنگ بووە دەسکرا بە داگیرکردنی قسطنطنیەو بەرامبەر بەوە ئیمپراتۆری بیزەنطی (قسطنطین) داوای لە دەوڵەتە لاتینیەکان کرد کەنیسەی هەردولا (هی بیزەنطی‌و ڕۆما) هەمویان لەژێر سایەی (پاپا نیکولای پێنجەم)دا یەك بگرن بەلاّم بیزەنطیە ئۆرتۆدۆکسەکان بەو بڕیارەی ئیمپراتۆرەکەی خۆیان قایل نەبوون‌و حەزمیان لا باشتر بووە قسطنطنیەیان لەکیس بچێت‌و لەژێر دەستی تورکدا بێت نەك لەژێر دەسەلاّتی لاتینیەکانا (مەبەست پاپاو لایەنگرانی بووە)، کە سەرچاوەی نووسەر بۆ ئەمە بریتیە لە کتێبی (Reme crousset Empire Du la...) بەو جۆرە قسطنطنیە داگیر کراو ناوی گۆڕا بە (ئەستەمبول).

(لەشوێنی خۆیدا باسی ئەوە ئەکەین چۆن ناکۆکی نێوان بێزەنطیەکان‌و ئەمی سەر بە ڕۆما یەکێك بووە لەو هۆ گرنگانەی یارمەتی عوسمانیەکانی دابوو بە تەواوی دەس بەسەر ئاسیای بچووکدا بگرێ‌و عوسمانی بەمەشەوە نەوەستا بەڵکو دەستیانکرد بە هێرش بردن بۆ سەر ولاّتانی ڕۆژهەلاّتی ئەورووپاو لە دواتاغێکدا گەیشتبوونە نزیك دەروازەکانی ڤینا، هەرچەند ئەو سەرکەوتنانەیان هەتا سەر نەبووەو یەك لەدوای یەك دەوڵەتەکانی ڕۆژهەلاّتی ئەورووپا توانیبویان تورکەکان لە خاکی خۆیان دەربکەن.

دەربـارەی سـولتانەکانی عوسمـانی‌و باسـی ژیانیـان‌و شـەڕەکانیان‌و ڕەفتارەکانیـان باسـێکی ئێجگـار دوورو درێـژەو ئـەوەی ئێمـە مەبەستمانە لێیـان بدوێین بریتین لە سولتان سەلیم کە لەزەمانی ئەودا ئیدریسی بدلیسی هەموو ئەمارەتەکانی باکوری کوردستانی بەستەوە بە دەوڵەتی عوسمانیەوەو سولتان عبدالحمیدی یەکـەم‌و دوهـەم‌و ئەوانـەی دوای ئـەوان هـاتون هـەتا کـاتی هەڵوەشانەوەی خلافـەتی عوسمـانی کـە لـە باسـەکانی داهـاتودا باسـی ئەوانـە دەکرێت‌و پێویست ناکات لێرەدا دوبارەیان بکەینەوە.

کوردەکـان جگـە لـەو کێشـەیەی توشـی بوبـوون لـە ئـەنجامی بـەین برکێـی صفویەکان‌و عوسمانیەکاندا زۆرترین شوێنی کوردستان توشی کێشەیەکی تر بوو

لە کێشەی نێوان قرەقوینلوو ئاق قوینلوو کە لەناو ئەمارەتەکانی باکوری کوردستاندا ڕەنگی دابووەوە، بڵاوبوونەوەی ئاینزای شیعە لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا بەهۆی صفویەکانەوە کارێکی وای کرد لەناو باکوری کوردستاند کێشەی نێوان سونیو علوی پەیدا بێت کە زیانێکی زۆری گەیاند بە کورد لە باکوری کوردستاندا چ بەهۆی سوارەی حمیدیەوە کەتەنها قەدەغە کرابوو بۆ کوردو سونیەکانو علوییەکانی لێ بێ بەش کرابوو، ئەو هەڵوێستە بوو بەهۆی ڕوودانی لێک پچڕانو هاوکاری نەکردنی هەردوولایان لەو شۆڕشانەی کورد بەرامبەر بە تورکەکان کرابوو کە بەڕونی ئەوە لە شۆڕشەکەی شێخ سعیدی پیران ساڵی ١٩٢٥دا خۆی ئاشکرا کردبوو لە باسی ئەو شۆڕشەدا بە دورو درێژی باسی دەکەین.

بەرلەوەی بچینە سەر باسێکی تر هەوڵ ئەدەین لە دوو سەرچاوەدا باسی هەندێ لە ڕێکخراوو دەزگاکانی سولتانی عوسمانیو ڕەوشتو ڕەفتاری سوڵتانەکانو پیشەیان بۆ لەناوبردنی کەسو کاری خۆیان بخەینە بەرچاو لە باسەکانی تری داهاتوودا کە پەیوەندیان بە سوڵتانەکانی عوسمانیەوە هەیە لە ڕوودلوەکانا هەندێ ڕەفتارو کردەوەی تریان دەردەکەوێ دەربارەی ڕێکخراو دەزگاکانی دەوڵەتی عوسمانی، پرۆفیسۆر ئیسماعیل حقی ئوزون/سەرچاوە ... وتوویەتی:

((کوڕانی پادشاکانی عوسمانی کە پێیان وتراوە (شاهزاد)، لە سەرەتای سەدەی چواردەهەمی زایینو لە سەدەی شازدەهەمدا ئەو شازادانەی لە ئەناتۆلیادا نیشتەجێ بوبوون پێیان دەوترا (چەلەبی). سوڵتانەکانی سەرەتا هەریەك وەزیریان هەبوەو لە دواییدا کە ژمارەی وەزیرەکان زۆرکرا بە سەرۆکی وەزیرەکان دەوترا (وزیر أعظم ـ کەلە دواییدا کرا بە صدر أعظم).

لە سەرەتای دوروستبوونی عوسمانیدا تەنها هەریەك (بیگلر بگ) هەبوە کە سەرکردەی هەموو سوپاکانی عوسمانی بووەو لەدوای سوڵتان قسەی فەرمانەکانی ئەو لە زوور هی هەموو کەسێکی ترەوە بووە، کە لە سەرەتای عوسمانیەکان لاسایی سلجوقیەکانیان کردۆتەوە لەگەڵ هی ئێلخانیەکانو مالیکەکانی میصر کە شێوەی هێزەکانیان سێ جۆر بووە:

ـ نیروی (قاپی قولی) ئەم هێزە بریتی بووە لە پیادەی نیزامی (یەنیچەری) ولە (جەجی) و (طوپچی) و (ئاتلی بلووك = دستە سوارە) کە سوڵتان خۆی سەرپەرشتی ئەم بەشەی کردووە.

ب ـ (ئەیالت هێزی) لە سەربازی سوارە پێك دەهات کە بریتی بووە لە: (سوپای تیمرلی)، (یایا)، (سەڵت پیادەیی)، (ئاقینجی ـ تورك ئاقینجی = سوارەی سووك و ...) ئەمانە لە سنووری (رۆملی)دا جێگیر بوون (مەبەست بەرامبەر بە بێزەنطیەکان ...).

٢ ـ هێزی دەریایی ـ بریتی بووە لەو هێزی سەربازانەی لەناو کەشتیەکانی دەوڵەتدا بوون.

نووسەری هەمان سەرچاوە لە دوای باسی هێزەکانی دەوڵەت باسی کاروباری جووتیاری ئەو سەردەمەی کردووەو تووی‌یەتی: ((عوسمانیەکان هەروەکوو سەلجوقیەکان لە شارەکانا هەر زەوی‌وزارێکی دوژمنەکانی خۆیان داگیر بکردایە دەستیان بەسەردا دەگرت‌و دابەشیان دەکرد بەسەر گەورەو سەرکردەکانی ئەو هێزەی ئەو شوێنانەی داگیرکردووە.

لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا سێ‌جۆر زەوی‌وزار هەبوە: ١ ـ خەراجی ٢ ـ عوشری ٣ ـ ئەمیری. زەوی‌وزارەکانی ئەمیری پێی وتراوە زەوی مەملەکەت‌و ئەوانەی لە زەوی زاری مەملەکەتدا کشت‌وکاڵیان بکردایە پێیان دەوترا(رەعیە ـ کە مانای دەست‌و پێوەند)بووە. ئەو زەوی‌وزارانەی پشتاوپشت بۆ کوڕو کوڕەزاکانی ئەو کەسانە دەمایەوە بە مەرجێك ئەو باجانەی لەسەریان دانرابوو بیدەن بە دەوڵەت. جگە لە زەوی‌وزاری میری، زەوی‌وزاری (وقف)یش هەبوە کە دەدران بەچەند دەزگایەك یا چەند کەسێك‌و ئەمانە بۆیان هەبوە جووتیارو پاڵە بەکرێ بگرن‌و لەو زەوی‌وزارانەدا بەکاریان بێنن)).

لەبەشی شازدەهەمی ئەم بەرگەدا باسی کارو فەرمانی ناو سوپاکان‌و ناو دەزگاکانی دەوڵەت ئەکەین‌و پێویست ناکات لێرەدا دوبارەی بکەمەوە. لە باسەکانی داهاتودا، لە زۆربەی ئەو باسانەی لە مێژووی سوڵتانەکانی عوسمانی‌و رەفتارەکانیان دواون، رەوشتی خوێنڕێژانەی ئەوانەی دەبوون بە سوڵتان نێتە بەرچاوو لێرەدا کورتە باسێکی گۆڤاری هلال میصری ساڵی ١٩٠٩/سەرچاوە/٨٨

دەخەینە پێش چاو دەربارەی رەفتاری خەلیفەکانی عوسمانی کە چۆن رەفتاریان لەگەڵ براو کەس‌وکاری خۆیانا کردووە تەنها بۆ ئەوەی خەلافەت بۆ خۆیان بپارێزن کە وتوویەتی:

((دوای ئەوەی عوسمانیەکان بوون بە دەسەڵاتدار، بۆ ئەوەی ئەمانیش وەکوو سلجوقیەکان بەش بەش‌و لیك دابراو نەبن، وایان بەباش زانیبوو هەموویان لەژێر دەسەلاتی یەك دەسەلاتداردا بن‌و ئەگەر ئەو دەسەلاتدارە مرد یەکێك لە کوڕەکانی ببێت بە جێگری.

یەکەم کەس کە ئەم ڕێگەیەی گرتەبەر (سوڵتان بایزیدی یەکەم) بوو کە کوڕی سوڵتان مراد بوو کە لە ساڵی ١٣٨٩زایندا بوو بە سوڵتان‌و گوایە بۆ ئەوەی هەراو پشێوی ڕوونەدات بەرلەوە چی بە پێویست بزانرێت بۆ ئەمە پەنایان بردۆتە بەر ئەو ئایەتی قورئانەی کە ئەلێ: (وان فتنة أشدّ من القتل)بەوجۆرە هێشتنەوەی یەك کەس کە ببێت بە خەلیفەو لەناوبردنی ئەوانی‌تر بوو بە یاسایەك کە سوڵتانەکانی عوسمانی بەزۆری لەسەری ڕۆیشتوون‌و ئەگەر سوڵتانێك بمردایەو یەکێك بوایە بەجێگری ئیتر ئەبوایە براکانی تازە سوڵتانەکە لەناو ببرانایە ئەگەر چی هی شیرەخۆرەشیان تیادا بووبێت، بۆ نموونە سوڵتان محمدی فاتح برایەکی شیرەخۆرەی خۆی کوشت کە ناوی (ئەحمەد)بوو.

ساتێك سوڵتان سەلیمی غازی کوڕی بایزیدی دوەەم بوو بە سوڵتان کوڕەکەی خۆی کە ناوی (سلێمان)بوو بۆ ئەوەی لەخۆی دووریخاتەوەو چاو نەبڕێتە شوێنەکەی، کردی بە حاکمی قسطنطنیە (کە ئەوسا پایتەخت نەبوو)و هێزیکیشی نارد بۆ ئەوەی براکانی تری لەناوبباو هەرخۆی بمێنێتەوەو ئەو پێنج برایەی خۆی کەلە شاری (بورصە)دا بوون هەموویانی کوشت‌و تاقە برایەکی کە ناوی (کرکود)بوو رایکردبوو پەنای بردبووە بەر چیاکان‌و لەویش وازی لێ نەهێنراو ئەویشی گرت‌و کوشتی.

لە هەموو سوڵتانەکانی تری عوسمانی کە زۆر دڕندە بووە (سوڵتان محمدی سێهەم)بووە کە لە ساڵی ٥٩٥ی کۆچیدا بوو بە سوڵتان‌و بەرلەوەی جەنازەکەی باوکی بنێژرێت (١٩)براکەی خۆی هەموویان‌و خوشکەکانیشی کوشت‌و لە (ئەیاصوفیا)دا هەموویان نێژران.

ـوسەری ئەو سەرچاوەیە وتوویەتی: ساتێك سولتان محمدی سێ‌هەم دەمرێ، ـحمەدی کوڕی کەلە ساڵی ۱٦۰۳/ی کۆچیدا بووە بە سولتان، ئەمەیان تۆزێك لـە ـولتانەکانی بەرلەخۆی ژیرتر دەبێت‌و لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی (١٤)ساڵ بـووە، ـیەکی لەخۆی بچووکتری هەبوە (مصطفی) ئەو برایەی نەکوشتووە بەڵکو بەوە ـتی لێ هێناوە دەست بگرێ بەسەریاو بیخاتە ژێـر چـاودێری خۆیـەوەو وادیـارە ـتر پاش ئەمە سولتانەکانی‌تر براکانی خۆیان نەکوشـتوە بـەڵکو هەریـە دەسـت ـسەری لەناو کۆشکەکانیانا دەیان هێشتنەوە.

ـووسەری ئەو سەرچاوە لیستەی ناوی هەندێ لە سولتانەکانی بڵاوکردۆتـەوە ـە لە دواییەکەیان لە مێژووی دەرچوونی گوڤارەکە لە ساڵی ۱۹۰۹دا بریتی بووە ـە سولتان عبدالحمیـدی دوهـەم کەلـە سـاڵی ۱۸۷٦دا بوبـوو بـە خەلیفـەی ـوسمانی.

ـە گۆڤارەکەدا وتراوە (محمد رشاد) کە ئێستە ولیعهدە، تەمەنی دوو ساڵ لـە ـعدالحمیـد بچووکـترە کە٦٥سـاڵەو تـا ئێسـتە ئـەوا مـاوەی (۳۰) سـاڵە لـە ژێـر ـچاودێریدایەو کونج نشینەو لەو ساڵەوە کە عبدالحمید بـووە بـە خەلیفـە رشـادی ـرێ لە (سەرای دولمە باغچەسی) بەزۆرەملێ نیشتەجێ کراوەو یاساولی تایبەتی ـەدیارەوە دانراوەو هەموو دەوری بەسیخوڕ تـەنراوەو لـە دوکتۆرەکـەی بـەولاوە ـێگەی پێ نادرێ چاوی بەکەس بکەوێ‌و بۆ ئەوەش دەبوایە ئەو چاوپێکەوتنە لە ـێگەی فەرمانبەرەکانی ئەو کۆشکە بوایە کە بەو جۆرە فەرمانبەرانەیان دەووت: (مابین).

دەگێڕنەوە لەرۆژێکی جەژندا رشاد ئەفەندی‌و کمال ئەفەندی برای (کە دیـارە ئەمەشیان هەر برای بـووە) بـۆ پیرۆزبـایی جـەژن دەچنـە لای سـولتان‌و لـەکاتی دانیشتندا دەرگایەك دەکرێتەوەو دوو ئافرەتی لێ دێتە دەرەوەکە ناویان (سنیە سلطان)و (جمیل سلطان) بووەو هەردوکیشیان کچی سولتان عبدالحمیـد دەبـن، کە چاویان بەیەکتر دەکەوێ هەردوو کچەکە شەرم دەیـانگرێت‌و محمد رشـادیش بەئارەزوو پشت گوێیان دەخات چونکە مـاوەی (۱٥)سـاڵ بـووە مـام‌و برازاکـان یەکتریان نەبینیبوو. هەرکاتێ محمد رشاد بچوایەتە دەرەوە دەبوایە پـەنجـەرەی

عەرەبانەکەی بە پەردە داپۆشرێت وەچەند سیخوڕێك بە بیانووی پارێزگاری کردنەوە دوای دەکەوتن)).

لە سەرچاوەی/٨٢دا نوسینی سعید احمد برجاوی ناوی ئەو سێ برایەی سوڵتان مرادی سێهەمی باسکردووە کەلە گۆڤاری هلالدا وتبووی کوژرابوون کە بریتی بوون لە محمد، سلیمان، مصطفی، جهانگیر، عبدالله، ئەوەی شایانی باسە ژمارەی ئەو برایانەی سوڵتان محمدی سێهەم کوشتبوونی کەلە گۆڤاری هلال بە (١٩)برا باسی کردون، لە کتێبەکەی سعید احمد برجاویدا وتوویەتی (٩)برابوون، کە وادیارە ئەبێ یەکێکیان هەڵەی چاپەمەنی بێت.

هەتا ئێرە بریتی بوو لە ڕەگەزی تورك‌و طورانی‌و باسی هاتنی عەشیرەتەکانی غوزو سلچوق‌و مەغۆل‌و عوسمانی کە بە زنجیرە لە سەدەی یازدەهەمی زاینەوە لە ناوەڕاستی ئاسیاوە ڕوویانکردۆتە ڕۆژئاوای ئاسیە ئاسیای بچووك (تورکیا)یان کردووە بە دوا بنکەی گرنگ بوخۆیان‌و ئەو ئیمپراتۆرەیان تیادا دامەزران...

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە کە بریتیە لەوەی ئایا ئەو عەشیرەتە تورکە کۆچکردووە تالانکەرو ماڵ وێرانکەرانەی لە ئاسیای ناوەڕاستەوە ولاتی خۆیان بەجێ هێشتوو بەناو ئەو هەموو میللەتانەدا کە ولاتەکانیان کەوتبووە سەر ئەو ڕێگە دوورو درێژەی بڕیبویان‌و بەناو هەموویانا بێ ووچان کۆچ‌و باریان ئەوەستاوەو بەگژ ئەو هەموو میللەتانەدا چوون‌و کوشتاریان لێ کردن لەخۆشیان کوژراوەو ڕێگەیان پێ گیراوە کەچی هەرکوڵیان نەداوەو ئەوی کوشتاری سەر ڕێگایانا ڕزگاری بووبێ خۆی گەیاندوتە ئاسیای بچووك‌و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو عەشیرەتانە زۆرجار لەگەڵ یەکتردا ناڕێك بوون‌و بەگژ یەکتردا چوون‌و جاری واهەبوە هەندێکیان بوون بە لایەنگری ئەوانەی دوژمنی تائیفەی تورك بوون، ئایا ئەو هۆیانە چی بووە یارمەتی ئەو تورکانەیان داوە کوڵ نەدەن لە ئەنجامدا هەموویان لە ژێر سایەی هێزێکی دەسەلاتداردا یەکیان گرتو بوون بەو دەوڵەتەی کە ئیمپراتۆرەکەیان بۆماوەیەکی دوورو درێژ ژیاوەو پاش خۆشیان بنکەیەکی پتەوو بەهێزیان دامەزراندوە بۆ ئەوانەی پاشەبەرەی دەوڵەتی عوسمانی بوون‌و توانیویانە پاش ئەو شەرە گەورەیەی یەکەمی جیهان کە تیدا

ـکـو بەشێکی زۆری ئەو وڵاتانەی لە ژێر دەسیانا بوو لە کیسیان چوو، بەڵام
ـکـ سەرەکیەکەیان کە تورکیای ئێستەیە تونـرا بپارێزرێو دەوڵـەتێکی تـازەی
ـیـد بێتە کایەوە بەناوی جمهوریەتی تورکیاوە؟؟

بەکورتی دەتوانین لە باسی هـەندێ هۆی سـەرەکی بدوێـین کـە بوونـە هـۆی سەرکەوتنی ئەو تورکانە:

١ ـ بەرلەهەموو شتێك وەنەبێ ئەو تورکانـەی لـە ئاسـیای ناوەڕاسـتدا بـوون ـمویان لەگەڵ یەکتردا ڕێك بووبن، بەڵکو هەمیشە لەسەر سەرکردایەتیو لەسەر ـوێنی لەوەڕ لەگەڵ یەکتردا ناکۆك بوونو بەگژ یەکتردا چوونو ئەو هەموو مەڕو ـلاتـو ئاژەڵانەی هەیان بوایە لەناو وڵاتەکەی خۆیانا ئـەوەندە پـووشو پـاوەنو ـومەڕی تیادا نەبووە بەشی ئەو مەڕو ماڵاتو بەرزە وڵاخانەی هەیان بووە بکـات ـە ئێستەش وڵاتیکی وەکوو منغولیـای ئیمـڕۆ وەکـوو هـەندێ سـەرچاوە دەڵێـن ـمارەی بەرزەوڵاخەکانیان لە ژمارەی دانیشـتوەکانیان زۆرتـرەو، سـاتێك ئـاینی ئیسلام بـە ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیادا بڵاوبـووەوەو هـەندێ لـەو تورکانـەی ئاسـیای ناوەڕاست بوون بە ئیسلام ئیتر دەرگـای ڕۆژئـاوای ئاسـیا لـە ژێـر سـایەی ئـاڵای ئیسلامدا واڵابووەو لەگەڵ هێزەکانی ئیسلامدا لەگەڵ ئەو هـەموو بەربەرەکانیـەی هاتوتە سەر ڕێگەیان بەوێنە ئـەو بەرهەڵسـتیەی تورکـەکان لەلایـەن جـلال الدیـن خوارزمییەوەو لەدوای ئەویش لەناو خاکی ئێرانو ئازربایجانو ئەرمەنیاو ئاسیای بچووکدا بە بێزەنطیو بە کوردەوە، بەڵام هەرکوڵیان نەداوەو خۆیـان گەیاندۆتـە ئاسیای بچووکی بـە ژمـارەی دانیشـتوان کـەمو بـە پیـتو فـەڕو لـەوەڕ زۆر، توانیویانـە خۆیـان دامـەزرێننو لـە کۆتـاییدا هـەموویان لـە بۆتـەی دەوڵـەتی عوسمانیدا توانەوەو بەناوی (تورك)ەوە هـەموویان یـەکیان گـرتو ئـەو دەوڵەتـە گەورەیەیان دامەزراند.

٢ ــ لاواز بوونـی خەلافـەتی عباسـیو گـەندەڵ بوونـی دەزگاکـانی لـە دوارۆژەکانیا، بەهۆی ناکۆکی ناوخۆیانو بەهۆی ئەو هەموو هێرشو پەلامارانـەی لەلایەن غوزەکانو سلچووقیو مەغۆلو تاتارەکانەوە کرابوونە سەر وڵاتـانی ژێـر دەسـەڵاتی عباسـی کـارێکی وای کردبـوو تەنـها هـەر قاوغەکـەی مـابووەوەو خەلیفەکانی عباسـی دوایـی وەکـوو متوکـلو معتصـم وایـان لێ هـاتبو گیریـان

خواربىوو بەهۆی ئەو توركانەی دەمیان ژەندبووە ولأتەكەیانو بوبوون بە كەلەگای ئەو رۆژانە كە لەو رووەوە شاعیرێكی عەرەب پێی وتوون:

خلیفة فی قفص بین (وصیف)و (بغا)

یقول ما قال له كما تقول الببغا

(وصیف)و (ببغا) دوو توركی دەسرۆیو بوون كە بە پلانی ئەوان لە سالی ۲٤۷/ی كۆچیدا خلیفە متوكل كوژرابوو، لە ئەنجامدا دوا خەلیفەی عباسی كە (معتصم)بووە هەر بە دەردی ئەوان چووە. ئەو لاواز بوونەی عباسیو لەناو چوونی رێگەیەكی تەواوی بۆ توركەكان خۆشكرد، بەتایبەتی سلچوقیەكا۔ توانیبویان لەزۆر شوێنی ولأتانی جارانی سەر بە عباسی چەند حكومەتێكو چەند ئەمارەتێكی تایبەت بەخۆیان دروست كردبوو.

۳ ـ كێشەی نێوان ولأتانی فارسو بێزەنطی لە سەرەتاداو ناكۆكی نێو۔ بێزەنطیەكان كە ئاسیای بچووكیان لە ژێر دەستدا بووەو ئەو ولأتە بە (ئەرزرۆم ـ ئەرزەن روم) ناسراوبووە لەگەلْ ولأتانی لاتینیی سەر بە پاپای رۆم۔ كارێكیوای كردبوو توركەكان توانیبویان لە ئەنجامدا دەس بەسەر هەموو ئاسیای بچووكدا بگرنو قسطنطنیە داگیر بكەنو ناوەكەی بكەن بە (ئەستەمبولْ)و دوا شوێنی بێزەنطیەكان لە توركیادا بریتی بووە لە كنیسەی (ئەیا صوفیا) بكرێت بە مزگەوتی موسولمانەكانو هیچ شەقلێكی كریستیانەكانی پێوە نەمێنێتو توركەكان بوون بە میراتگری دەولەتی عباسیو لە بریتی ئەو۔ ئالأی ئیسلامیان بەرزكردەوەو كردیان بە دروشمی خۆیان بەناو بۆ پارێزگاری كردنی شوێنە پیرۆزەكان لە قدسدا (كەلە راستیدا ئەو ئەركە لەلایەن ئەیوبیە كوردەكانەوە جێ بەجێكرا كە بەوپەڕی دلسوزییەوە وازیان لە هەلگرتنی دروشمی نەتەوایەتی خۆیان هێنابوو بوبوون بە سەربازی نەناسراو لە كۆڕی ئەم هەموو شەڕانەدا كە لەگەلْ خاچ پەرستەكاندا دەكرا).

٤ ـ كێشەی نێوان بێزەنطیە ئەرثوذۆكسەكان لەگەلْ دەولەتە لاتینیە كاثولیكەكانی ئەوروپا بەسەركردایەتی پاپا وەكوو بەر لەمە باسمانكرد هۆیەكی گەورە بووە كە توركەكان سودیان لێ وەرگرتووەو كار گەیشتوە بەوەی هەندێ لە بێزەنطیەكان بوون بە ئیسلامو لەناو كۆمەلگای توركی ئیسلامدا تواونەتەوە.

٤ - بێ دەسەڵاتی و بێ هێزیو پچڕپچڕی کورد لە باکوری کوردستاندا کە
ـە تاقمە بەجیا بۆ خۆی لە شوێنێکدا جۆرە ئەمارەتێکی پێکەوە نابوو کە هیچ
ـرمتێکیان لەگەڵ ئەوی تردا ڕێك نەبوەو بەخوێنی سەری یەك تینوو بوون و
ـتێك هەڕەشەی سەری صفویەکانی ئێران میللەتی کوردیشی گرتبووەوە، ئەمە
ـو بە هۆی ئەوەی ئیدریسی بدلیسی هەموو ئەمارەتەکانی کورد لەجیاتی
ـوەی لەژێر سایەی خۆیدا یا لەژێر سایەی کوردێکدا یەکیان بخات و حکومەتی
ـربیی یەك گرتویان لێ پێك بێنێت قەواڵەی طاپۆکانی هەموو کوردستانی
ـۆشت بە سوڵتان سەلیمی عوسمانی و گەورەترین هەلی بۆ تورکەکان ڕەخسان
ـو پوەوە.

## بەشی پێنجەم

## کێشەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و صفوی و ڕۆڵی کورد لەو کێشەیەدا

بەشێکی زۆری کوردنشینەکانی باکوری کوردستان ناوچەکانیان کەوتبوە سەر سنوری نێوان عوسمانی و صفوی و بەرلە دەسپێکردنی شەڕی عوسمانی و صفوی کوردەکانیان لە ئامارەتەکانی خۆیانا جۆرە سەربەخۆییەکیان هەبو، بەڵام لە کێشەی ئەو دەوڵەتە پەرەی سەند، هەردولایان چاویان بڕیە سەر داگیرکردنی خاکی یەکتری و ئەم هەڵوێستە میللەتی کوردو خاکی کوردیشی گرتەوەو لەبەر ئەوەی کوردو عوسمانیەکان سونی بوون بۆیە کورد مەترسی شیعەکانی صفوی لێ نیشتبوو لەگەڵ ئەوەشدا کوردێکی زۆری سەر سنورەکەی هەردولا تەقەلای ئەوەیان دابوو بتوانن کارێکی وا بکەن خۆیان لەگەڵ هەردولا بگونجێنن بۆ ئەوەی خۆیان لە شەڕوبەڵای هەردوکیان دوربخەنەوەو لەو ڕووەوە نوسەری سەرچاوە/٧٤ لە لاپەڕە/٢٦٣ی باسەکەیدا کە بریتیە لە گەشتێکی خۆی بە کوردستاناو شارەکانی ئەرزنجان و بدلیس و کسام و موکس گەڕاوە کە شوێنەکانیان لەنزیک سنوری هەردولادا بووە، لە یاداشتەکەیدا وتوویەتی ئەگەر لە کوردەکانی ئەو ناوچانەت بپرسیایە: ئایا هەڵوێستی کورد بەرامبەر بەو دولایە چۆنە؟ لە وەرامدا پێیان دەوتیت: ئێمە ناچارین لەگەڵ هەردولادا خۆمان بگونجێنین بۆ ئەوەی پریشکی ئەو شەڕەیان ئێمەش نەگرێتەوە.

نووسەر ئەڵێ: ((لە ڕاستیدا کوردەکان کێش و قەوارەیەکی تایبەت بە خۆیان هەبوە و ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوەو لەپاش سەرکەوتنی سوڵتان سەلیمی یەکەم بەسەر صفویەکانا لە ساڵی ١٥١٤دا ئیتر باری کوردستان گۆڕاوە

ـەکوو (ساتونو) باسی کردووە کوردەکانی (Zena ـ زینـا) لـە دیـاریکردا لـە ـرتیانا بووە (١٤)هەزار سواری خۆیان ئامادە بکەن)).

ـۆریەی سـەرچاوەکان باسـی ئـەوەیان کـردووە عوسمانیـەکان زۆرتـر زیـرەك ـتر وەك لە صفوییەکان لە رەفتاریانا بەرامبەر بە کـوردو توانییویـان هەسـتو ـی کوردەکـان باشـتر رابگـرن هـەتا ئـەو کاتـەی بەتـەواوی زالْ بـوون بەسـەر صفویەکاناو پاش ئەوەی ئیشیان بە کورد نەما ئیتر وردە وردە لـە هەڵوێسـتو ـێنـەکانی خۆیـان بەرامبـەر بـە کـورد پاشـگەز بوونـەوەو دەسـتیان کـرد بـە هەڵوەشانەوەی ئەمارەتەکانی کورد.

دەربارەی صفویەکان ئەمین زەکی لە لاپەڕە/١٦٢ی سەرچاوە/٣٢دا بە دوورو ـرێـژی باسـی کـردووە ئـەم بنەماڵـەی صفویـە لـە (شـێخ صفی‌الدیـن)ی ئەردەبیلی)یەوە دەستی پێکردووە کە شیعەیەکی ناسراو بـووە زۆر لەخواترس ـووە وای ڕاگەیاندبوو ئیمامی حەوتەمە (مەبەستی ئیمام موسی‌کاظم)بووە، سـێ کوڕی هەبوە : علی و ئیبراهیمو جنێد کـە هەرسـێکیان بـە ئـاینداریتی‌و تصـوف ـوبانگیان بلاْو ببووەوە: بەتایبەتی شێخ جنێد لەناوچەکەدا زۆر ناسـراو بـووەو سوڵتان جهانشاه)ی قرەقۆینلو هەڕەشەی لێکردبوو لەترسا پەنای بردبووە بـەر حسن الطویل (لە سەرچاوەکانی تردا بەئوزون حسن ناسراوبووە) کەلە دیاریکردا ـووە (دیارە شیعە بووە)و کچێکی خۆی لە کوڕێکی حسن الطویل مارە کـردووەو کوڕێکیان بووە (ئیسماعیل)، کە دیارە ئەبێ ئەو ئیسماعیلە بێ کە بووە بە شاە ئیسماعیلی صفوی.

(سـەیر ئەوەیـە کـە مـارتن ڤـان برونسـون لـە لاپـەڕە/٣٦٢ی کتێبەکـەیدا سەرچاوە/٣٧ وتوویەتی صفی‌الدین (سونی)بووە، لام وایە ئەوەی ئـەمین زەکـی ڕاستر بێت چونکە بڕوا ناکەم ئەو بنەماڵەیە وا بەزوویی دوای ئەو ببن بە شـیعە (هیچ دووریش نیە وەکوو مارتن وتوویەتی شـێخ صفی‌الدیـن لـە سـەرەتادا سـونی بووبێ‌و لە زەمانی جنێدی کوڕیا ئەو شیعەیەتیە بەهێز بووبێت).

مارتن ڤان برونسون لە لاپەڕە/٣٦٣/ی کتێبەکەیدا وتوویەتی:

((ئیمپراتۆریـەتی صفـوی بـەناوی ئـەو سـەرۆك هـۆزەوە نـاونراوە کـە نـاوی (صفی‌الدین)بووە، صوٚفی‌یەکی خـاوەن شـکۆی نورانـی بـووەو لـەنێوان سـاڵانی

١٢٥٢ ـ ١٣٣٤زایندا لە (ئـەردەبیل)دا ژیـاوەو پیـاوێکی سونی بـووە. هەرچەند صفی‌الدین هیـچ ڕێبـازو ڕێنماییـەکی تایبـەتی نـەبوە بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا خەڵکێکی زۆر لەدەوری تەریقەتەکەی خڕ بوونەوەو خۆیان بە وابەستەو ملکەچی لایەنگری ئـەو دەزانـی (ئـەردەبیل)بوبـوو بـە ناوجەرگـەی بڵاوکردنـەوەی ئـەو تەریقەتە.

سـاتێك لەسـاڵی ١٤٤٧دا (جنیـد)بـوو بـە ڕێبـەری ئـەو تەریقەتـە ئیـتر گۆڕانکاریەکی بنبڕو ناکاو لە هەناوی ئـەو تەریقەتـە سۆفیزمەدا پـەیدابوو، شێخ جنیـد کابرایـەکی سەوداسـەری سـەرەڕۆیی‌و شـەڕانی بـووەو زۆرتـر سـەرگەرمی گەڕان‌و سوڕانەوە بووە، بەتایبەتی پاش ئەوەی (جیهانشاه)ی سەرکردەی قەرە قۆینلـوی لـە ئـەردەبیل دەرکـردو لەگـەڵ (ئـوزون حسـن) کـە خوشـکێکی خـۆی دابوویە، دۆستایەتی‌و پێوەندیـی پێکـەوەناو سـەرکەوتوانە هـەوڵیدا لـەناو هـۆزە تورکە ڕەوەندەکانی ناوەندو خوارووی ڕۆژئـاوای لـە ئـەنادۆڵدا لایـەنگری ئەوتۆ بۆخۆی مسۆگەر بکات.

ئەو هۆزانە تەنها بەسەرزارەکی بوبوونە موسـوڵمان‌و زۆرتـر بـەرەولای لادانو گومڕاییـەك دایـان دەشـکان‌و هـەرزوو بزوتنـەوە شـیعەگەرییە توندڕەوەکـە لایەنگری شەیدای لەناو ئەو هۆزانەدا پەیدا کردبـوو کـە ڕەنگـە ئەمـە یـەکێك لـە هۆکارانـە بووبێـت کـە شـێخ جنیـد خـۆی‌و لـەدوای ئــەویش (حیـدر)ی کـوڕی‌ئـەو ئیسماعیلی کوڕەزای بەهەمان جۆر ڕێبازێکی لانەدەرانەیان هەڵبژارد.

مارتن لە لاپەڕە /٥٠٠ی کتێبەکەیدا لە باسی شێخ جنیـدا وتوویـەتی بـە پێـی وتـەی (فضل‌اللـە کـوڕی ڕوزبـەیانی خونجـی) کـە سـونی‌یەکی ئـایندارو دژێکـی سەرسەختی صفوی‌یەکان بوو لە سەدەی شازدەهەمدا، لایەنگری شێخ بەئاشکرا (شێخ جنید)یان بەخوا داناوەو بە (ألاه) ناویان بردوەو کوڕەکەیان بە کوڕی خوا ناوبردوەو وتوویانە هەمیشە زیندوەو لەو زیاتر هیچ خودایـەکی تـری نیـە وەکـو مینۆرسـکی لـە لاپـەڕە/٦٦ی چاپـە فرنسیەکەیدا باسـی کـردووەو کەلـە سـاڵی ١٩٧٥دا چاپ کراوە.

لایەنگرانی ئەم شێخە صفویە لـە دیـاردەی ئـەو شـەدە سـوورە (سەریەسـتی سوور) کە هۆزە تورکە تازە باوەڕ هێنەرەکان دەیان بەست بەسەریانەوە (کەب

قزلباش ناودەبرێن). ساتێك باوكی شاه ئیسماعیل لەناوچەرگەی شەڕی شیروان)دا كوژرا ئیسماعیل رایكرد بۆ (گیلان) كە شاری شیعەكان بوو چونكە ئاق قوێنیلو)ە سونییەكان دەستیان بەسەر ئەردەبیلدا گرتبوو، ئەمانە ترسیان ە تەریقەتی صفوییەكان هەبوو بۆیە دەیانویست ڕیشەكێشی بكەن، بەلآم لە سالی ١٤٩٩دا كە (ئاق قوێنیلو)ەكان بەهۆی دووبەرەكی ناوخۆ دەسەلآتیان كزبوو ئیتر ئیسماعیل لە حەشارگەكەی هاتە دەرەوەو گەڕایەوە بۆ ئەردەبیلو بەهاری دواییدا چووە ناو ئەنادۆڵ بۆ ئەوەی سوپا گوێ ڕایەڵەكەی لەخۆی كۆبكاتەوەو لە ماوەیەكی كەمدا ئیسماعیل بوو بە سەركردەی حەوت هەزار لایەنگرو لە هەموو ناوچە جۆریەجۆرەكانی ئەنادۆڵ بەتایبەتی ڕەوەندو وەزیرە توركەكان لەدەوری خڕ بوونەتەوە.

مارتن ڤان برونسون ئەڵێ : هەرچەند لە ریزی ئۆردوەكەی ئیسماعیلدا ناوی كورد نەهاتووە، بەلآم چەند سالێك پاشتر لەریزی قزلباشەكانا هەمیشە نێوی دوو هۆزی كوردی باكوور دووبارە دەبنەوە كە بریتی بوون لە (چەمشكەزەك)و (خنسلون). ئیسماعیل یەكەوراست شالآوی نەبردوتەسەر (ئاق قوێنیلو) بەڵكو لەسەرەتادا هێرشی بردەسەر (شیروان)و داگیری كردو (ئەلوەند)ی دوا حكومڕانی ئاق قوێنیلو لە ئازربایجان بە لەشكرێكەوە پەلاماریدا بەلآم ئیسماعیل ئەو لەشكرەی شكانو بە ئاسانی ئازربایجانی دەسگیر بوو تاجی پادشایەتی لەسەرناو لە سالی ١٥٠١/ی زایندا ڕێبازی شیعەی دوازدە ئیمامی كرد بە ئاینی ڕەسمی ولآتەكەی.

بەلآم شاه ئیسماعیل كوردستانی بەو ئاسانیەی ئازربایجان بۆ نەخرایە ژێر دەستەوە چونكە لەمێژ بوو كوردەكان بە ئازادیو سەربەخۆیی حوكمڕانیی خۆیان دەكرد.

(ئەمیربگ موصلوی) كە فەرمانداری دیاربكربوو ملكەچی خۆی بۆ شاه ئیسماعیل ڕاگەیاند بەلآم شاه ئیسماعیل ئەو میربەگەی لە كوردستان دوورخستەوە بۆ خۆراسانو لە بریتی ئەو (محمد بگی ئوستاجلو)ی زاوای خۆی كرد بەوالی دیاربكرو محمد بگ دەسەلآتی خۆی بەسەر ماردینو جزیرەو موصلدا سەپانو ژمارەیەكی زۆری لە كوردەكان كوشتو ماڵەكانی تالآن كردن.

سیاسەتی شاە ئیسماعیل بەرامبەر بە کورد هەروەکوو سیاسەتەکەی (ئوزون حسن)وابوو هەردوکیان سەرۆك هۆزەکانی کوردیان لە شوێنەکانی خۆیان هەڵدەکەندو دەستنیژی خۆیان لە شوێنی ئەوان دادەناو هەر سەرۆك هۆزێکی کورد دژی ئەو سیاسەتە بوەستایەو هەوڵی پاراستنی ئازادیو سەربەخۆیی بدایە بەوپەڕی دڵڕەقیەوە سەرکوت دەکرا.

وەفدێکی کورد لە (١٦) سەرۆك هۆز بەهیوای ئەوەی شاە ئیسماعیل دۆستانەو بەنەرمی رەفتاریان لەگەڵ بکاو بتوانن خۆیانی لێ بپارێزن چوونە بارەگاکەی شاە لە (خۆی)و ملکەچی خۆیان بۆ دەربڕی ، کەچی هەمووی گیرانو خرانە بەندیخانەوەو شاە هەندێ لە قزڵباشە متمانە پێکراوەکانی خۆی ناردە شوێنی ئەو میرە کوردانەو کردنی بە فەرمانبەرو ڕای سپاردبوون هەر میرێکی کورد سەرپێچی بکا بکوژرێو هەرشارێك دژیان راوەستا هەمووی وێران بکرێت، بەڵام (میرشرف پاشا)ی جزیرە سەری نەوی نەکردو ئامادە نەبوو بیانە بۆ محمد بەگی ئوستاجلو بنێرێتو بەرامبەر بەوە محمدبەگ لەشکری کردە سەریو میر شرف شکاو وڵاتەکەی داگیرکراو ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی کوژراو قەشەو شەماسو منداڵو جووتیارو پیشەسازوو لاووپیرێکی ئێجگار زۆر کوژراو سەربڕانو گوندەکانیان سوتێنراو کەنیسەو پەرستگاکانیان وێرانکران گەنجو ژنێکی زۆری بە یەخسیریو کۆیلەیی گرتو لە ئەنجامدا میر شرف ناچاربوو لەگەڵیا ڕێك بکەوێ و خوشکەزایەکی خۆشی دایە، بەڵام لەدوای ساڵێك میر شرف لێی هەڵگەڕایەوەو جارێکی تر محمد بەگی ئوستاجلو لەشکرێکی تری ناردە سەر (بوتان)و لەو شەڕەدا موسوڵمانو فەلەیەکی زۆر کوژراو بە پێی بڕیاری میر شرف شارەکە چۆڵکراو خەڵکەکە شارەکەی خۆیان بەجێ هێشت ئاگریان تێبەرداو ساتێك قزڵباشەکان شارەکەیان بەوجۆرە بینی خەڵکەکەی ناچارکرد بگەڕێنەوەو شارەکە ئاوەدان بکەنەوە)).

دەربارەی رەوشتی شاە ئیسماعیل بەرامبەر بە کورد هەر لەبەرئەوەی (سونی)بوونو بە پێچەوانەی کورد لەگەڵ تورکمانە شیعەکانو رافیزیەکان بەباشی رەفتاری دەکرد، ئەمین زەکی لە لاپەرە/١٦٤/ی کتێبەکەی سەرچاوە/٣٢باسی هەڵوێستی شاە ئیسماعیلی کردووە کە ساتێك (١٠) میری

کورد چوونەلای بۆ ئەوەی دڵسۆزیی خۆیانی بۆ دەربخەن (مارتن ڤان برونسون ژمارەی ئەو سەرکردانەی بە/١٦سەرکردە باسکردووە/، هەموویانی گرت کە یەکێك لەو میرە کوردە گیراوانە (ملك خليل)بووە کە حاکمی شاری (حصن کیف)بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ملك خليل مێردی خوشکی شاە ئیسماعیل بووە، بۆ ماوەی سێ ساڵ لە بەندیخانەی تەورێزدا هێشتیەوە هەتا ئەو کاتەی شاە ئیسماعیل لە شەڕی (چاڵدێران)دا شکاو ئەوساڵە دیلێتی رزگاری بووە.

یەکێك لە سیاسەتەکانی شاە ئیسماعیل ئەوە بووە هەموو ئەمارەتە کوردەکان لەناو ببات بۆ ئەوەی قزڵباشە شیعەکان ببن بەدەسەڵاتدار کە ئەمە پێچەوانەی هەڵوێستو رەفتاری عوسمانیەکان بوە لەگەڵ کوردەکانا لە سەرەتاداو عوسمانیەکان لە پێشدا هەوڵیان دابوو دڵی کوردەکان رابگرنو کارگەیشتبووە رادەیەك سوڵتان سەلیمی عوسمانی چەند جارێك شێخ ئیدریسی بدلیسی کردبوو بە نوێنەری خۆی بۆ ئەوەی بەناوی سوڵتانەوە پێوەندی بە عەشیرەتەکانی کوردەوە بکات بۆ ئەوەی هانیان بدا دژی صفوییە شیعەکان بووەستنو ئەو تەقەلایەی سوڵتان سلیم بەباشی سەری گرتبوو)).

مارتن ڤان برونسون لە لاپەڕە/٢٧٣ی کتێبەکەیدا بە دوورودرێژی باسی ئەوەی کردووە کوردەکان لەئەنجامی ئەو رەفتارەی شاە ئیسماعیل لەگەڵیانا ناچاربوون پەنا بەرنە بەر عوسمانیە سونییەکانو لەو روەوە وتوویەتی:

((هەتا سوڵتان بایزیدی عوسمانی لەسەر حوکم بوو لەنێوان ١٤٨١ ـــ ١٥١٢دا نێوانی ئەوو شاە ئیسماعیل باشبوو تیك نەچووبو، بەڵام سوڵتان بایزید پیرو کەنەفت بوبوو، هێشتا خۆی لەژیانا بووە کوڕەکانی لەناو خۆیانا لەسەر سەرکردایەتی نارێك بوونو ویلایەتەکانی خورهەڵات لەئەنجامی ئەمەدا ئاشووبی تێ کەوتو شاە ئیسماعیل ئەوەی بە دەرفەت زانیو (نورعلی خلیفەروملو)ی نوینەری خۆی نارده ئەرزنجان بۆ ئەوەی کۆمەك بە قزڵباشە راپەڕیوەکان بکاتو ناڕاستەوخۆ پشتگیری بکات لە (مراد)ی کوڕەزای بایزید کە یەکێك بوو لەوانەی دلوای تەختی سوڵتانیان دەکرد.

نور علی بە پشتیوانیی قزڵباشەکان توانی چەند تیپێك لە سوپاکەی عوسمانی بشکێنێت، بەڵام کە (سەلیمی یەکەم) کەبە (تەنگە تیلکە) بەناوبانگ

بووەو دوژمنێکی سەرسەختی شاە ئیسماعیل بووە، هێرشی بردە سەر خاکی صفوی‌و ژمارەیەکی زۆری لە قزلْباشەکان کوشت کەبە قسەی هەندێ سەرچاوە (٤٠)هەزاری لێ کوشتن پاش ئەوە محمد خانی ئوستاجلو خۆی ئامادە کرد بۆ رووبەڕوو بوونەوەی سوڵتان سلیم‌و لە زستانی ساڵی ١٥١٣ ــ ١٥١٤دا سوڵتان سلیم خۆی کۆکردەوەو بە (١٠٠) هەزار کەسەوە روویکردە هێزەکەی محمد خانی ئوستاجلوو ئەمەی دوایی خۆی پێ نەگیراو ناوچەکەی چۆڵکردو هەموو دانیشتوانی بەرزاییەکانی ئەرمەنیای ناچار کرد کۆچ بکەن بۆ ئازربایجان‌و هەرچی بۆ خواردن بشیایە هەمووی سوتێنرا، بەلاّم سوڵتان سەلیم توانی بەقەد باری (٦٠)هەزار حوشتر ئازوقە بۆ ئەو ناوچانە پەیدا بکات‌و لەشکری هەردولا لە مانگی ئابی (١٥١٤)دا لە (چالْدێران)دا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوەو محمد خانی ئوستاجلو لەو شەڕەدا کوژراو (شاە قرەبەگ)ی برای چوە جێگەی).

دەربارەی‌شەڕی چالْدێران، سعید احمد برجاوی لە سەرچاوە/٨٢دا باسی ئەوەی کردووە لەو شەڕەدا شاە ئیسماعیل داوای لە ممالیکی میصر کردبوو هاوکاری لەگەلاّبکەن بۆ ئەوەی سنورێك بۆ دەسەلاّتدارێتی عوسمانیەکان دانرێت‌و سوڵتان سلیم دەستی کرد بەکوشتار لەناو ئەو قزلْباشانەی شاە ئیسماعیل ناردبوونی بۆ ئەوەی ئاینزای شیعە لەنێوان دانیشتوانی ئاسیای بچووکدا بلاّویکەنەوەو (٤٠)هەزاری لێ کوشتن‌و لە ٢٢/ی محرمی ساڵی ٩٢٠ی کۆچی بەرامبەر بە ١٥١٤زایین سوڵتان سلیم لە شاری (ئەدەنە)وە بە هێزێکی گەورەوە روویکردە (تەورێز) کە پایتەختی شاە ئیسماعیل بوو، هێزەکەی عوسمانی کە (١٤٠) هەزار بوو زۆرگەورە بوو شا ئیسماعیل بەرگەی نەگرت‌و ناچاربوو کشایە ناوچە شاخاویەکانی ئێران بۆ ئەوەی هێزەکەی سوڵتان سلیم بەکێش بکات بۆ ئەو ناوچە سەختانەو بەمە کێشەیەکی گەورەی بۆ سوڵتان سلیم نایەوەو هەندێ لە سەربازەکانی یاخی بوون‌و داوایان کرد بگەڕێنەوە، بەلاّم سوڵتان سەلیم دەسبەجێ فەرمانی کوشتنی ئەوانەی دەرکردو دوای هێزەکەی شاە ئیسماعیل کەوت‌و لەنزیك (تەورێز) لەدەشتی (چالْدێران) کە دەکەوێتە نێوان گۆلی ورمیەو تەورێز، لە رۆژی ٢/ی رەجەبی/٩٢٠ی کۆچی بەرامبەر ١٥٤١/٨/٢٣ عوسمانیەکان سەرکەوتن‌و شاە ئیسماعیل رایکردبوو ژمارەیەکی

زۆری هێزەکەی کوژرا یا بەدیل گیران کە زۆریەیان لە قزلباشەکان بوون و هێزەکەی سولتان رۆژی ١٤/ی رەجەبی بەرامبەر /٤/ی ایلولی ١٥١٤ چوونە ناو شاری تەوریزەوەو دەستیانگرت بەسەر موڵکو سامانی شاە ئیسماعیل داو سامانەکەی نێررا بۆ ئەستەمبول هەندێ شارەزاو دەس ڕەنگینی پیشەسازی ئەو ناوچەیەشیان لەگەڵ نارد بۆ ئەستەمبول و بەو جۆرە ئەو شەڕە مێژوییە بە سەرکەوتنی عوسمانیەکان بەسەر صفویەکاندا کۆتایی هات)).

صادق شرفکندی لە لاپەڕە/٦٢ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٧١ دەربارەی شوێنی چاڵدێران کە ئەو شەڕە مێژووییەی تیادا کراوە وتوویەتی : (چاڵدێران) بریتیە لە پێدەشتێك کە (٧٥) کیلۆمەتری چوارگۆشەیی دەبێ کە دەکەوێتە بەشی باکوری خۆرئاوای شاری (خۆی)و نزیکی (١٢٠)کیلومەتر دوورە لە شاری تەورێزەوە لەو دەشتەدا (٨٤) گوند هەیە کە بەهەمویان ناوچەی (سیا چەشمە) پێك دەهێنن. (بە پێی بۆچوونی محمد جمیل رۆژبەیانی ووشەی (چاڵدێران) لە ووشەی (چاردەران)ەوە هاتووە کە مانای چوار شیو دەگرێتەوە).

## بەشی شەشەم

## ئەمارەتەکانی کورد لە باکووری کوردستاندا

مرۆڤ ساتێك مێژووی کورد دەخوێنێتەوەو بەسەرهاتو رووداوەکانی رۆژانی رابوردوی بۆ روون دەبێتەوە، دەمو دەس ماتەمینێکی قوولْ دای ئەگرێو چەند پرسیارێك بە مێشکیا دێو لەخۆی ئەپرسێ: ئایا لەبەر چی میللەتێکی دێرینی وەکوو کورد کە خاوەنی نیشتمانی خۆی بووەو بەرلە زۆربەی میللەتانی تر باوو باپیری کورد کە میدیەکان بوون حکومەتی خۆیان هەبوەو زۆربەی مێژوونووسان کوردیان بە میللەتیکی رەسەن باس کردووەو بە ئازاو لەخۆ بوردوو بە شۆڕەسوارەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست ناوبانگی دەرکردووەو (وەکوو سافرستیان باسی کردووە) ئەو هەموو کارەساتو بەسەرهاتانەی بەسەر خۆیو ولاتەکەیدا روویداوە توانیوێتی هەویەی بوونی خۆی بپارێزێو زمانەکەی بە پوختەیی بمێنێتەوەو ئەو هەموو تەقەلایانەی دوژمنانی داگیرکەر داویانە بۆ تواندنەوەیو بۆ لەناوبردنی هەمووی بێسوود بووە، کەچی لە حکومەتەکەی (مید)یای باپیرەگەورەی بەولاوە نەیتوانیوە حکومەتێکی تری کوردیی سەربەخۆ دامەزرێنێتو ئەو ئەمارەتە بچوکانەی بۆ ماوەیەکی کورت لەژێر سەرکردایەتی سەرکردەیەکی لێهاتوودا دروست بووە هەمیشە بەهۆی ناڕێکی دوژمنایەتی میرەکانی کورد لەناو خۆیانا زۆری پێنەچوە ئەو ئەمارەتانە لاواز بوونو دوژمنانی کورد دەستیان بەسەردا گرتوەو ئەو هەلە کەمە باشانەش کە بۆ کورد هەلکەوتووە کە دەیتوانی ئەویش وەکوو میللەتانی تر حکومەتێکی کوردی یەك گرتووی سەربەخۆ دامەزرێنێت لەکیس چووە کە نموونەی ئەمە لە دەسەلاتدارێتی صلاح الدینی ئەیوبیو کریم خانیزەندو هەندێ کەسی تری وەکوو ئیدریسی بدلیسی لە مێژوودا شتێکی روونو ئاشکران.

شارەزایانی بێگانە لەکورد خۆی باشتر لەهۆی ئەوە گەیشتبوون بۆچی میللەتی کورد هەتا ئێستە یەکی نەگرتوەو نەیتوانیوە مافە رەواکانی خۆی دەسگیربێتو لە بۆچوونو لێکدانەوەکانیانا دەستیان خستۆتە سەر زامەکانی لەشی میللەتی کورد لە دێرزەمانەوە کە بەداخەوە ئەو زامانە هەروەکوو شێرپەنجە هەمیشە لەشی کوردی دارزاندوەو ووزەو توانای ئەوەی لێ بڕیوە وەکوو میللەتانی تر یەك بگرێتو رووداوو بەسەرهاتەکانو ناکۆکیەکانی کورد لەناو خۆیدا وەکوو خەرەك هەموو جارێك بەشێوەیەك میللەتی کوردی بەقوڕا بردوەو هیچ جارێکیش پەندو دەرسی لە هەڵەکانی رابردوو وەرنەگرتوە.

دەربارەی ئەمارەتەکانی باکووری کوردستان گەلێ سەرچاوەبە دوورو درێژ باسیانکردووەو بەرلەوەی بچینە سەر باسی ئەمارەتەکان یەك بەیەك کە ئەو سەرچاوانە باسیانکردون، باسێکی زۆر گرنگی دوکتۆر جلیلی جلیل دەخەینە پێش چاو، سەرچاوە/٩٣ ــ بەناوی ئەمارەتەکانی کورد لە ئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا کەلە لاپەڕە/٣٣دا دەستی پێکردووەو وتوویەتی:

((کاتی خۆی سوڵتان موورادی سێهەم (١٥٧٤ ــ ١٥٩٥زایین) وڵاتی عوسمانیی کردبوو بە (٢٦) ئەیالەتو هەرئەیالەتێکیش کرابوون بە چەند لیوایەك کە ژمارەی هەموو لیواکان گەیشتبووە نزیکی (١٨٠٠)لیواو ئەو دابەش بوونە هەتا ساڵی ١٨٣٤ مایەوە تا لەدوای ئەوە چەند گۆڕانێکی تر ڕوویداو لە ساڵی ١٨٦٤دا هەندێ لەو ئەیالەتانە خرانە سەر یەکتریو کران بە ولایات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چوارچێوەو سنووری ئەو ویلایەتانە بەپێی ئارەزوو دەسەڵاتی ئەو دەرەبەگو دەسڕۆیوانەی هەبوون گۆڕینی بەسەراهاتووە.

جلیلی ئاماژەی بۆ کتێبی (ئیمپراتۆرێتی عوسمانی) کردووە کە وتوویەتی دەوڵەتی عوسمانی یەکێك بووە لەو دەوڵەتانەی ژمارەی دانیشتوانو ڕوو پێوانەکەی نەزانراوەو هەرحاکمێکی تازە دابنرایە بۆ ویلایەتێك بەئارەزووی خۆی دەسکاری سنووری ویلایەتەکەی کردووەو لێی زیادکردووە یا لێی کەم کردۆتەوەو لە هەندێ ناوچەدا جۆرە ڕێکەوتنێك هەبوە لە نێوان کاربەدەستانی حکومەتو دەرەبەگە دەسەڵاتدارەکان بۆ بەڕێوەبردنی کاروبار.

جلیلی لە لاپەڕە/٣٤ی کتێبەکەیدا لەسەری ڕۆیشتوەو وتوویەتی:

ئەو زەوی‌و زارانەی کاتی خۆی دەدران بەوانەی لە خزمەتگوزاریی لەشکرکێشیدا بەشدار دەبوون لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا ئەوە نەماو زەوی‌وزارەکان کەوتنە ژێر دەسەلاتی خاوەن موڵکی تازەوە. ئەو دەرەبەگانەی زەوی‌وزاریان پێ درابوو بەرامبەر بەوەی دانیان نابوو بە دەسەلاتداریتی سولتاندا هەوڵیاندابوو پەرە بەسنوری زەوی‌وزارەکانیان بدەن‌و زۆرجار دەسەلاتی سولتان لەناو سنوری ئەو دەرەبەگانەدا هەر بەناو مابوو، ئەمیرو دەسەلاتدارە کوردەکان تەنها جۆرە دیاری‌یەکیان ناردوە بۆ سولتان یابۆ کاربەدەستە بلندەکان.

لەو روەوە (ب.ی.ئەڤریانۆف) وتوویەتی : (کوردەکان بۆ ماوەی سالەها توانیبویان خۆیان لە دەسەلاتداریتی ئێران‌و تورک رزگاربکەن‌و لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بەشێکی زۆری کوردستان جۆرە سەربەخۆییەکی تیاد بووەو ئەوەی دابویان بە کاربەدەستانی دەوڵەت بریتی بووە لە دانی‌چەند بەرتیل‌و دیاری‌یەك لەگەڵ ناردنی چەکدا لە کاتی پێویستدا).

جلیلی دوای ئەوە چوتە سەرباسی هەڵوێستی هەندێ لەو دەرەبەگانەی ئەو سەردەمەو ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (ی.ن.بیرزین) کردووە کە وتوویەتی لە سالانی سییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا دەرەبەگەکان هەریەکەیان شێوە سەربەخۆییەکی خۆیان هەبوەو دەسەلاتی حکومەت لەناویانا زۆرکزو لاواز بووەو (أ.ئو.بیتشتی) لەباسێکی ئەو رۆژانەدا وتوویەتی چەند گوندێکی سەرژمێر کردووەو دیوێتی دەرەبەگەکان لە گوندەکانیانا چەکداری تایبەتی خۆیان هەبوەو گوێیان نەداوەتە فەرمانەکانی سولتان‌و هی واشیان هەبوە باجیشی بە دەوڵەت نەداوەو هەریەکەیان بەئارەزووی خۆی جۆرە یاسایەکی بۆ کاروبار خۆی داناوەو گوێی نەداوەتە کاربەدەستانی حکومەت.

جلیلی لە باسەکەیدا دەربارەی کوردەکانی ئەو رۆژانە وتوویەتی: لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە سەروك عەشیرەتەکانی کورد زۆریان لە کۆچەرێتیەوە بوون بە نیشتەجێ بووی زەوی‌وزارو دەرەبەگەکان بایەخیان داوە بەکشت‌وکاڵو دەرەبەگی تازە جێگەی کۆنەکانیان گرتوتەوە.

لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا حکومەتی عوسمانی یاسایەکی دەرکرد بەناوی (تنظیمــات)ەوە بــە پێــی ئــەوە جــۆری زەوی‌وزار وەکــوو خــوارەوە دەستنیشان کرابوون.

**١ ـ زەوی‌وزاری تایبەتی (شخصی).**

**٢ ـ زەوی‌وزاری میری.**

**٣ ـ زەوی‌وزاری وەقف.**

**٤ ـ ئەو زەوی‌وزارانەی بێ خاوەن بوون.**

بەپێی شەرعیەتی ئاینی ئیسلام سوڵتان خۆی بەخاوەنی هەموو زەوی‌وزارێك دەزانی و پیاوە ئاینیەکانیش بەهۆی‌زەوی‌و زارەکانی ئەوقافــەوە زۆریـان بوبـوون بە دەرەبەگو دەستیانکردبوو بەکڕینی موڵکی تر لـە شـارەکانا. بـەهۆی ئـەوەی خاوەنی زەوی‌وزارە بچووکەکان هەمیشە لەژێر فشاری دەرەبەگەکانا بوون، بۆیە ئـەوەیان لاباشـتربووە زەوی‌وزارەکـانی خۆیـان بفرۆشـن بـە پیـاوە ئاینیـــەکان‌و زۆرجـار هـەر ئـەو پیـاوە ئاینیانـە زەوی‌وزارە کڕراوەکانیـان بـەکێ ئەدایـەوە بـە خاوەنەکەی پێشوویان بەنرخێکی هەرزان‌و بــەوە خـاوەن زەوی‌وزارە بچوکـەکان خۆیان رزگارکردووە لە دانی باجی حکومەت.

ئەم بارودۆخ‌و هەڵوێستە کێشەیەکی گەورەی بۆ حکومەت پەیدا کردو سوڵتان (عبدالمجید) بۆ چارەسەرکردنی ئەوە فەرمانێکی دەرکرد کەلە مێژوودا بــە (خـط شریف) ناسراوە کەلە رۆژی ١٨٣٩/١١/٣دا دەرچوە کە ئەڵێ:

((ماوەی (١٥٠)ساڵی رابوردودا بەهۆی هەندێ رووداوەوە زۆرکەس لە یاسـای پیرۆز لایان دابوو، کڕین‌و فرۆشتنی موڵك‌و زەوی‌وزار بوبوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی برسێتی لەبەر ئەوە ئەمانەی خوارەوە بە پێویست زانرا جێ‌بەجێ بکرێت.

**١ ـ دابینکردنی ژیانی دانیشتوانی وڵات‌و پاراستنی خۆیان‌و ماڵ‌و موڵکیان.**

**٢ ــ دانـانی پرۆژەیـەکی دروست‌و بـاش بـۆ دانـانی بـاج‌و کۆکردنـەوەی لەلایــەن حکومەتەوە.**

**٣ ــ دەستنیشـانکردنی باشـترین رێگـا بـۆ چۆنێتــی وەرگرتنــی ســەربازو مــاوەی خزمەتیان لەناو سوپادا.**

بەڵام خط شریف تەنها بریتی بوو لە بڕیارێکی سەر کاغەزو لەزۆر شوێندا بەئارەزوی کاربەدەستان لێك دەدرایەوە. لەو ڕووەوە لە یاداشتێکی (فؤاد پاشا)دا لە ١٨٦٧/٤/١٥دا دان بەوەدا نراوە خط شریف تەنـها بۆ هێورکردنەوەی خەڵك دەرچووبوو کاری پێ نەکرابوو، تەنها ئەمەیان نەبێ کە ووتبووی :

(ئەوانەی موسوڵمان نین لەناو وڵاتی عوسمانیدا لەجیاتی ئەوەی کە ناگیرێن بە سەربازن، پێویستە باجێکی تایبەتی بدەن بە حکومەت کە پێی وتراوە (بدل)و ئەو بڕیارە بوو بە هۆی زۆربوونی جەورو ستەم و نەمانی ئاسایش و ترسێکی زۆری خستە دڵی خەڵکەوە.

جلیلی ئەڵێ: بەوجۆرە کار گەیشتە رادەیەك حکومەت نەیدەتوانی باجی زەوی وزارەکان کۆبکاتەوەو بیگەیەنێتە ئەو ڕادەیەی بە باجە کۆکراوەکان کاروباری ڕۆژانەی دەوڵەتی پێ ببرێ بەڕێوەو لە گێژاوی ئەمەدا دەوڵەتە بێگانەکان لە ڕیگەی بازرگان و کۆمپانیاکانیانەوە دەستیان خستە ناو کاروباری دەوڵەتی عوسمانیەوەو بەئاسانی بەرهەمە پیشەسازیەکانی خۆیانیان لەناو وڵاتا دەفرۆشت و کەرەسەی خاوی هەرزانیان بەنرخێکی هەرزان دەکڕی و دەیان نارد بۆ کارگە پیشەسازیەکانی خۆیان)).

دەربارەی ئەمارەتەکانی کورد لەباکوری کوردستاندا گەلێك سەرچاوە بەدوورودرێژ باسیانکردووەو هەوڵ ئەدەین کورتەیەکی ئەوسەرچاوانە لە ئەمارەتەکان دواون بەپێی ئەمارەتەکان باس بکەین.

## یەکەم ـ ئەمارەتی حکاری ـ هەکاری

ئەمارەتی هەکاری وەکوو زۆربەی سەرچاوەکان باسیانکردووەو بایەخیان پێداوە، یەکێك بووە لە گەورەترین ئەمارەتەکانی باکوری کوردستان و هەوڵ ئەدەین کورتەیەکی ئەو سەرچاوانە دەربارەی هەکاری بخەینە پێش چاو.

دوکتۆر جلیلی جلیل لە لاپەڕە/١٢١ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٢١ وتوویەتی ئەم ئەمارەتە وڵاتێکی شاخاویە خواروی گۆماوی (وان)و (جوڵە مێرگ ـــ کەناوە کۆنەکەی چۆڵە مێرگ بووە).

پایتەختو شوێنی بارەگای میری هەکاری بووەو (قەلای ئیستادیل) لەسەر گوتکەیەکی رۆژئاوای شارەکەدا بووەو ناو شارەکە چەند مزگەوتو قوتابخانەو حزگای تیادا بووە کە میری کورد دروستی کردبوون. لە زەمانی (ئاق قونیلو)ەکانا بنەماڵەی سەرداری هەکاری ناوی (شامبۆ)بووە (دەربارەی ئەوە شەرەف خانی بدلیسی لە شرفنامەدا لەسەر واتای کتێبی (زەفەرنامە)ی مولانا شرف الدین علی یزیدی ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە میرەکانی کوردو تیموری ـەنگیش سەرداریتی هەکارییان کردووەو لە زەمانی (ئاق قوێنیلو)ەکانا ـەرکردایەتی میرنشینەکە کەوتوتە دەست سەرۆکەکانی (دومبلی ــ کەلە ـنجیرەی چوارەمی ئەمارەتەکانا باسی ئەمارەتی دومبلی دەکەین).

دەربارەی ئەوەی شرفخان باسی کردووە کە تیموری لەنگ سەرداریتی ئەم ـمارەتەی کردووە، مارتن ڤان برونسون لە لاپەڕە/۳۸۷ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/۷۳ وتوویەتی میرنشینی هەکاری ماوەیەکی زۆر لەژێر دەسەڵاتی صفویەکانا بووەو هەروەکوو ناوچەیەکی سەر سنووری عوسمانیو صفوی ـەردولایان چاویان تێبڕیوەو بەشێکی زۆر لە ئاشوریش لەم ناو ئەمارەتەدابوون کە بەزمانی ئارامی دواون و رۆڵێکی گرنگیان هەبوە لەو ئەمارەتەدا.

جلیلی لەباسەکەیدا وتوویەتی: بەلام دانیشتوانی هەکاری سەریان بۆ ـگیرکەران دانەنواندوەو دوامیری (دومبلی)یان دەرکردووە کە رۆژی ئەو ـەرکردنە ڕێکەوتی رۆژی شەممە بووە، هەرلەبەر ئەوەش بووە سەرداری هەکاری کە چوتە جێگەی میری دومبلی بە (شەنبۆ)ناویراوە.

دەرباری ئەو (شەنبۆ)یەی جلیلی باسی کردووە، ئەمین زەکی لە بەرگی ـوەمی سەرچاوە/۳۲دا شەمبە ووشەیەکی ئاشووری بووە، لەبەر ئەوە ئەو میرە ـەبێ ئاشوری بێت، بەلام ئەمین زەکی ئەو بۆچوونەی (دوکتۆر فریج)ی پووچەڵکردۆتەوە چونکە ووشەی (شەمە ــ شەنبە) بەهیچ جۆرێك ووشەی ئاشوری نەبوەو شرفخانی بدلیسیش لە شەرەفنامەدا لەباسی ئەمیرەکانی (کلس)دا هەروای بۆچوە کە مەبەست رۆژی شەمەی ڕێکەوتی دەرکردنی میری دومبلی بووە کە ووشەیەکی کوردییە.

جليلی ئاماژەی بۆ باسەکەی (ئی. سون)کردووە کە بەووردی لە بنەماڵەی هەکاری کۆڵیوەتەوەو وای بۆچوە نەوەکانی (قەرەبولبوك عوسمان) کە متصریف‌و نوێنەری تیموری لەنگ بوون لە هەکاریدا لەناو کوردەکانا واونەتەوەو لەدوایدا ناوناوی (میر)یان لێ نراوەو سەردارێتی‌یان لەناوچەکەدا هەتا سەدەی نۆزدەهەم درێژەی کێشاوە.

سەرچاوە رۆژهەڵاتناسەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی لایان وابووە دانیشتوە کوردەکانی هەکاری لە بنەرەتدا هەر لە یەکێتی عەشیرەتەکانی هەکاری بوون‌و بەواتەی (ئینسفورت) لەو ئەمارەتەدا ناوی (٢٤)عەشیرەت هاتووە کە بریتی بوون لە : تەیاری، توبی ــ توبە، توخما، جەلاوی، بینبانیشی، ئەلتووشی، ئەرتوش، باشی ــ بازی، ساتی، ئوماری، جوڵەمێرگی، جیلوو، دێر، سیلیانك، بەرواری، مانیس، ناودی، هەسنان، دەپراشین، بوو روو رو، ئیلباك، شیمزدین، شایات، برات سید ناوی).

جليلی لە لاپەرە/١٢٢دا وتوویەتی زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکانی تەیاری ــ تیاری، توبی، داپراشین ئاشووری بوون (لام وایە جگە لەوانەی جليلی باسی کردووە وەکوو: توخما، بازی، جیلوو هەندێکی تریش ئاسووری بوون‌و هەندێکیشیان ئەرمەنی بوون).

وەرگێری کتێبەکەی جليلی، دوکتۆر کاوس قەفتان لەپەراوێزی لاپەرە/٣٠٦دا دەربارەی ئەو تێکەلاو بوونەی کوردو ئەرمەنی‌و ئاسوری وتوویەتی: ئەو تێکەلاوبوونەیان مانای ئەوە بووە هەتا ئەوکاتەی میسینێرەکان بەڕاسپاردەی دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان نەگەیشتبوونە ئەو ناوچانە، هەموو دانیشتوان بێ گێچەڵ‌و ئاسایش لەگەڵ یەکتردا ژیاون‌و هیچ هەرایەك لەناویانا نەبوەو لە دوایید بەهۆی ئەوانەوە کێشەو هەرا لەنێوان کوردو ئەرمەنی‌و ئاسوریدا پەیدا بووە.

جليلی لە لاپەرە/١٢٣دا /سەرچاوە/٢١ وتوویەتی هەرچەند لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا لە سەدەکانی ناوەڕاستا زۆرجار میرو سەردارەکان لابراون، بەلام دەسەلاتی میری هەکاری لەگۆڕین نەدەهات‌و هەروەکوو خۆی مابووەوەو سوڵتانەکانی عوسمانی دلنیان بەوەدا نابوو میرنشینەکانی هەکاری پشتاوپشت

ـوباری ناوچەکانی خۆیان ببەن بەڕێوەو لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا حەسەلاتدارێتی میری هەکاری دەسەلاتی هەبوە بەسەر ناوچەکانی ژێر دەستی.

بەلام لەبەشی دوهەمی سەدەی نۆزدەدا هێزەکانی تورك بەسەرۆکایەتی والی وان) پەلاماری سەردارە بچوکەکانی باکووری هەکاریی داو لە ئەنجاما چەند ەڵیەك وێران کراو بەگە کوردە سەربەخۆکان خرانە ژێر دەستی عوسمانیەوەو ـیری هەکاری ئەوەی بەهەل زانیو توانی ئەو بەگە کوردانە بۆلای خۆی ـکێشێو بیانکا بەلایەنگری خۆیو لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە ناوچەی ـیوکیوس ـ موکس) هاتبووەوە ژێر سایەی میری هەکاری کە جاران دانیان ـەمسەلاتی میری (بوتان)دا نابوو.

دەربارەی پەیوەندی کوردو ئەرمەن لەو ئەمارەتەدا ئاماژەی بۆ باسێکی ـێنجیجان) کردووە کە وتوویەتی کوردو ئەرمەن پێکەوە دۆستانە ژیاونو ـوباری جەنگی (لەشکرکێشی) بەدەس (مەلیك)وە بووە (ئەرمەنیەکان ـەرکردەکانی خۆیان ووتووە مەلیك). کەلەلایەن ئەرمەنیەکانەوە هەڵدەبژێرراو ـەویش کاروباری بەناوی میری هەکارییەوە جێبەجێ دەکرد.

بەوجۆرە ناوچەکانی نێوان گۆماوی ورمیە ــ وان، سەرومڕ بەدەست میری هەکاریەوە بوو، بەواتای چەند سەرچاوەیەك میری هەکاری توانی ئەوەی هەبوە ٤٠)هەزار چەکدار کۆبکاتەوەو ئێرانیەکان هەوڵێکی زۆریان دابوو بەلای خۆیانا ـبکێشنو بۆ ئەو مەبەستە سەرداری ئازربایجان کە نوێنەری شای ئێران بوولەو ـوەوە تەقەلایەکی زۆری دابوو.

ساتێك عباس زادە لەگەڵ رۆمەکانا کەوتە شەڕەوە ئێران هەوڵیدا سوود لە جەنگاوەرەکانی هەکاری وەربگرێو بۆ ئەو مەبەستە چ بەناردنی دیاریو دەم چەورکردنەوە هەتا پیلانگێڕانو هەڕەشە کردنیان بەکارهێناو لە ئەنجامدا توانی ئەو عەشیرەتە گەورەیەی لەناوچە دەشتاییەکانا بوون بەلای خۆیا رایکێشێت.

عەشیرەتی (بەیلام) کە بەناوی قەلا سەختەکەی بەیلامەوە ناونرابوو لە شاخی زاگرۆسدا لەلایەن ئیسماعیل بەگەوە پشتگیریی لێ دەکرا بۆ ئەوەی سەربەخۆی خۆی بپارێزێتو ئیسماعیل بەگیش بۆ ئەوەی خۆی لە میرنشینی هەکاری بپارێزێ خۆی خستبووە ژێر سایەی (شازادە عباس میرزا).

عەشیرەتی بەیلام تەنها بەڵێنی ئەوەی دابوو بەشازادە عباس لەکاتی شەڕدا یارمەتی سەربازی بۆ بنێرێتو بە پێی واتەی (گ.درو وێل)ئەو عەشیرەتە هێزێکی زۆرباش‌و ئازای مەشق پێکراوی ناردبوو بۆ عباس میرزا کە بریتی بووە لە (١٥)هەزار سواری پڕ چەك کراو تا ئەو هێزە لە سنووردا بووبن مووچەیان لە عباس میرزاوە وەرگرتوە.

بەرامبەر بەو هەڵوێستەی ئیسماعیل بەگ، میری هەکاری بڕیاریدا سزای ئیسماعیل بەگ بداو بەسەرکردایەتی (باباخان)ی کوڕی هێزێکی نارده سەرقەڵای بەیلام، بەڵام میری هەکاری لەو شەڕەدا شکا لەساڵی ١٨١٠داو بۆ چاوترساندنی ئەو میرە عباس ئاغا هێزێکی بیست هەزار چەکداری کرده سەر میری هەکاری‌و میریش (١٢)هەزار پیادەی ئاسوری‌و دوو هەزار کوردی ئامادەکرد بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو هێزەو فارسەکان شکان‌و گەڕانە دواوە، بەڵام دوای ئەوە عباس میرزا توانی چەند عەشیرەتێکی سەر بەمیری هەکاری بکات بەلایەنگری خۆی‌و زۆری پێ نەچوو (مصطفى پاشا)ش بوو بە دۆست‌و لایەنگری ئێران)).

مارتن ڤان برونسون لە لاپەڕە/٣٨٨ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٢ باسی کێشەی نێوان تەیموری لەنگ‌و میری هەکاری کردووە لەساڵی (١٨٢٧دا ـ لە کتێبەکەی مارتن دا بەهەڵە نوسراوە/١٣٨٧کە دیارە هەڵەی چاپەمەنیە) تیموری لەنگ پەلاماری ئەو ناوچەیەی دابو کە (میر عزالدین) فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە بووەو میر نەیتوانیبوو بەرگەی هێرشەکەی تیموری لەنگ بگرێت‌و ماوەیەکیش (نصرالدین)ی خزمی میر عزالدین لە قەلا سەختەکەی (وان)دا دژی تیموری لەنگ ڕاوەستا بەڵام خۆی نەگرت‌و شکاو بەرەنگار بوونەوەکەی خامۆش کرا.

هەرچەند تیموری لەنگ بەناو هەکاری کردبوو بەوڵاتێکی ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵام دانی بەسەرکردایەتی عزالدیندا نابوو سامانەکەی خۆی پێ بەخشیەوەو ساتێك (شاروخ)ی کوڕی تیموری لنگ لەشکری نارده سەر (قرە یوسف)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی (قرە قونیلو)، محمودی کوڕی عزالدین چوە لای‌و گوێ ڕایەڵێتی خۆی بۆ دەربڕی‌و ئەویش خەڵاتی کرد.

پاش ئەوەی (ئوزون حسن)ی سەرکردەی قرە قونیلو تورکەکانی سەربەخۆی ڕاسپارد (جوڵەمێرگ)ی پایتەختی هەکاری بگرن‌و خۆیشی پەلاماری

ـەرەکەی داو میری هـەکاری کوژرا، ئیـتر هێزەکـەی هـەکاری بەرگـەی دوژمنـی
ـگرتو هەرێمەکە کەوتە ژێر دەسەلاتی (دومبلی)یەکان کە تاقمێکی دەمارگرژی
ـەکی دەوروبـەری جزیـرە بـوون‌و مەڵبـەندو ناوچـەکانی هـەکاری کەوتنـە ژێـر
ـەسەلاتی ئەوانەوە. مارتن ڤان برونسون لە لاپەڕە/٢٩٢ سەرچاوە/٧٢دا باسـی
ئەوەی کردووە چۆن کێشەی نێوان عوسمانی‌و صفویەکان لەسەر مەڵبەندو سـەر
ـنورەکانی نێوان هەردولایان کارێکی وای کـرد گیـانی دوژمنایـەتی‌و ڕقەبـەرێتی
ـەـوادەکانی ئـەو ناوچانـە پـەیدا ببێـت‌و یـەکێك لـە کوڕەکـانی (مـەلیك بـەگ)
چوەپالْ شاە طهماسبی کوڕی شاە ئیسماعیل‌و کوڕێکی تری چوە دیاربکر بۆلای
عوسمانیەکان‌و زەوی‌وزارێکی زۆری لە عوسمانیەکان دەست گیر بوو.

ئەمین زەکی لەسەرچاوە/٣٢ لە لاپـەڕە/٢٨٠دەربـارەی ئـەمارەتی هـەکاری‌و
ئـەو بنەماڵەیـەی ئەمارەتەکـەی دروسـتکردبوو لای وایـە بنەچـەی ئـەو خێزانـە
ـەەولوی ڕوون نەبۆتەوە ئەگەرچی لەشەرفنامەدا وتراوە باپـیری ئـەو بنەماڵەیـە
ـوی (شمـس الدیـن)بـووەو، بـۆ جـاری دوهـەم ئەمارەتەکـە لەلایـەن (أسـدالدین
کلابی)یەوە بووژێنراوەتەوە کە بە (زێرین چنـگ) ناسـراوبووەو لـەدوای أسـدالدین
ملك عزالدین شێر ـ یزدان شێر فەرمانڕەوایی ئەوئەمارەتەی بۆ ماوەی (٦٠)سـالْ
کردووە. (ئەم عزالدین شێرە جیاوازە لەوەی خیانەتی لە میرخـان پاشـای مـامی
کردبـوو وەکـوو لـە شۆڕشـەکەی بدرخـاندا بـەدووروودرێژ باسـی ئـەو خیانەتـە
دەکەین).

لەدوای عزالدین شێر، (زاهد بـەگ)چوتـە جێگـەی کـە بـەوە قـایل بـووە شـاە
ئیسماعیل پارێزگاری ئەمارەتەکەی بێ دوای ئـەو هـەردوو کوڕەکـەی کـە ناویـان
(ملك بەگ)و (سید محمد بگ)بـوون فـەرمانڕەواییان کـردووەو پشتاوپشـت هـەتا
سەدەی نـۆزدەی زایـین ئـەو ولاتـەیان بـردوە بـەڕیوەو پـاش ئـەوە (زکریابـەگ)
(ئیبراهیم بەگ)لە (جۆڵەمێرگ)و(ئەلباق)دا لەزەمانی شرفخانی بدلیسیدا (١٠٠٥ی
کۆچی) حکومدارێتیان کردووە. (وەرگێڕی کتێبەکـەی ئـەمین زەکـی محمد علی
عونی وتوویەتی قەلای ئەلباقی کۆن لە ویلایەتی وانی ئێسـتای تورکیـادا بـووە)و
نورالله بەگی حاکمی (بختان ـ لامولیە کە مەبەستی بۆتان بووە) دوا حاکمی ئەم
ئەمارەتە بووە.

ئەمین زەکی لە لاپەڕە/٢٨١ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ بەرگی تۆهەمی کتێبەکەی (هاممر)ی مێژوونوس کردووە کە وتوویەتی (عمادالدین) یەکێك بووە لە میرەکانی هەکاری لەساڵی ١٠٤٩کۆچیدا لەلایەن صدری اعظمەوە (هی عوسمانی) کوژراوە. ئەولیا چلبی لەگەشتەکەیدا سەرچاوە/٥١ لەباسی ناوچەی هەکاریدا وتوویەتی میرەکەی هەمیشەو لەکاتی ئاشتیدا خاوەنی دەهەزار چەکدار بووە بەلاّم لەکاتی شەڕدا لەتوانایدا بووە (٥٠)هەزار چەکدار ئامادە بکا.

شرفنامە لە لاپەڕە/٧٩٨دا باسی ئەمیرەکانی هەکاری کردووە کە وتوویەتی بە (شەنبۆ) ناسراویوونو ناوی ئەو ئەمیرانەی کردووە کە فەرمانڕەوای ئەمارەتەکە بوون هەتا ساڵی ١٠٠٥/ی کۆچی کە ساڵی تەواوکردنی نوسینی شرفنامە بووە کە بریتی بوون لە : ئەسدالدین کوڕی گولاوی، عزالدین شێر کوڕی ئەسدالدین، زاهد کوڕی عزالدین، مەلیك کوڕی زاهد، سید محمد کوڕی زاهد، زەینەلّ کوڕی مەلیك بەگ، زکریا کوڕی زەینەلّ.

### دوهەم ـ ئەمارەتی جزیرەو فەرمانڕەواکانی

ئەمارەتی جزیرە یەکێك بووە لەو ئەمارەتانەی کورد چ لەڕووی سیاسیو شۆڕشگێڕیەوەو چ لەڕووی ڕۆشنبیریەوە ڕۆلێکی ئێجگار گەورەی بینیوە. کۆنترین سەرچاوەیەك دەربارەی ئەم ئەمارەتەی نوسیبێ شرفنامەی شرفخانی بدلیسیەکەلە لاپەڕە/٧٥ وەرگێڕاوەکەی هەژاردا بەدورو درێژی باسی کردووەو لە پێشەکی ئەو باسەیدا وتوویەتی:

((لەوتاری هێژاو بایەخدارو بەنرخو سەنگینی باوەڕ پێکراوانەوەو لە ڕووپەڕە نوسراوی رەنگینی کۆنە پیاوانەوە وامان بۆ دەرکەوتووە زنجیرەی بنەچەی فەرمانڕەوایانی جزیرە، سەری ئەوسەری بە خالیدی کوڕی وەلیدی هەواڵی پێغەمبەرەوە بەسراوە)).

دەربارەی ئەو بۆچوونەی شرفخان لە شرفنامەدا باسە گرنگەکانی (مقدمە أبن خلدون )دەهێنێتە پێش چاو کە بەدورو درێژ نموونەی چەند عەشیرەتێکی باکوری ئەفریقای هێناوەتەوە کەبە درۆ بنەو بنەچەی خۆیان بردوّتەوە سەر عەشیرەتەکانی عەرەبی عەرەبستان کەلە راستیدا هیچ پەیوەندیەکیان بە

ڕەگەزی عەرەبەوە نەبوەو لە دانیشتوانی دێر زەمانی ئەفریقا بوون و تەنها سەرکردەکانیان بۆ سوودی خۆیان بۆ خۆ نزیکردنەوە لە ئیسلام ڕەگەزی خۆیان گەڕنوتەوە سەر عەرەب و بێگومان شرفخان ئەوەی لەم بارەوە وتوویەتی لە هەموزمانی چەند کەسێکەوە بیستوە کە ویستویانە خۆیان ببنەوە سەر عەرەب جگەش ئەوەی ئاینی ئیسلام لەو ناوچانەدا بڵاوبوتەوەو ئاماژەی بۆ هیچ جۆرە بەڵگەو سەرچاوەیەکیش نەکردووە.

دەربارەی ئەو بۆچوونەی شرفخان، ماموستا جمیل ڕۆژبەیانی لە پەراوێزی لاپەڕە/٢٧٢ی شرفنامەی چاپکراوەکەی هەژار کە چەند سەرنجێکی ڕۆژبەیانی تێدایە وتوویەتی :

((ئەم چیرۆکەی شرفخان باسی کردووە درۆیەو هیچی بەسەر هیچەوە نییە چونکە خالیدی کوڕی ولید نەکو تەنها هەر کوڕی نەبوە بەڵکو هیچ نەوەیەکی لێ نەکەوتوتەوەو تەنانەت کە مردوە میراتگریشی نەبوەو هەرچی موڵک و ماڵێکی کەلە (مدینە)دا هەبوە (عبداللە سەلمەی کوڕی عبداللە) دەستی بەسەرا گرتوە کەلە نەوەی ئەو نەبوە).

لام وایە ئەو هۆزەی ئەمەیان بۆ خۆیان هەڵبەستوە پاشماوەی (خلدی ـ ملدی)یەکانن کەلە باوو باپیریانەوە کورد بوون و ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێ ئەم دواییەش لەسەر ئاینی (یزدی ـ یەزدانی)مابوون و لەوەش ئەچێ سەرەک هۆزی پێشوویان ناوی خالد بووەو لەبەر ئەوەی خالیدی کوڕی ولیدیان لەلا کوڕێکی ئازا بووەو لایان وابووە ئەگەر خۆیان ببەنەوەسەر ئەو ئیتر بەوە دەبوون بە نەجیب زادە.

لە پەراوێزی لاپەڕە/١٨ی پێشەکیەکەی وەرگێڕانەکەی هەژاردا وتراوە کە وەرگێڕ (هەژار) کاتی خۆی مامۆستای شێخ عومەری وجدی کەکاتی خۆی مامۆستای (رواق الاکراد)بووە لە جامیعەی ئەزهەر بیستویەتی ئەو بنەماڵەیە هیچ جۆرە پێوەندیەکیان بە خالیدی کوڕی ولیدەوە نەبوە.

شرفنامە لەباسی شاری (جزیرە)دا وتوویەتی : ((شاری جزیرە لەکەناری ڕوباری دجلەدا دروست کراوە، ساتی خۆی سوپای ئیسلام بەسەرکردایەتی (ئەبو

موسی ئەشعەری)و (سعد عیاضی کوڕی عوسمان) بەبێ شەڕ دەستیان بەسەر ئەو شارەدا گرتوەو باجو سەرانەیان لە خەڵك سەندوە.

یەکەم سەروەرێك کە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی جزیرە دانیشتوە ناوی سلیمان کوڕی خالد بووە کە سەردەمێك ئەو خانەدانە خاوەن پایەیە چووبوونە سەر ڕچەی ئاینی یزیدەکانو پشتیان بەڕەوشتی ئەوانەوە دابوو لەگومڕاییدا دەسووڕانەوە بەڵام لەدواییدا خوا خستنیەوە سەر ڕێگەی راستو بوون بە سونی مەزهەب (ئەمەش دوبارە بەڵگەیەکی ترە کەئەو بنەماڵەیە پەیوەندیان بە خالیدی کوڕی ولیدەوە نەبووە).

فەرمانڕەوایانی جزیرە کەبە (عزیزان) ناودەبران، میر عبدالعزیزو لەدوای خۆی هەردوو کوڕەکەی (سیف الدین)و (میرمجدالدین) فەرمانڕەواییان کردووەو دوای ئەوانیش پشتاو پشت ئەو بنەماڵەیە میرایەتی ناوچەکەیان کردووە.

لە زەمانی (میر بدریگ)دا میر محمدی کوڕی بوو بەفەرمانڕەوایەکی سەربەخۆ لە جزیرەوبوتانداو بۆ ماوەی حەوت ساڵ بەبێ دەردی سەری فەرمانڕەوایی کردووەو لەنێوانی ٩٨٦ی کۆچی ئەو لەشکرەی سوڵتان مراد بەسەرکردایەتی مصطفی پاشای دوهەم ناردبووی بۆ (شیروان)و (گورجستان) لەو شەڕەدا ئەو میر محمدە بەشداریی کردووە.

شرفنامە لە لاپەڕە/٧٩٨دا ناوی فەرمانڕەواکانی جزیرەی باسکردووە تا ئەو کاتەی لەساڵی ١٠٠٥ی کۆچیدا باسەکە تەواو کراوە کە بریتین لە: سلێمان کوڕی خالد، میر سیف الدین کوڕی عبدالعزیز، عیسا کوڕی مجدالدین، بەدرالدین کوڕی عیسا، میر ئابدال کوڕی میر بدر، عزالدین کوڕی ئابدال، ئابدال کوڕی عزالدین، ئیبراهیم کوڕی ئابدال، میر شرف کوڕی ئیبراهیم، میر بدر کوڕی ئیبراهیم، کاك محمد کوڕی ئیبراهیم، شرف کوڕی بدر، شا عەلی کوڕی بدر، بدر کوڕی شا علی، محمد کوڕی بدر، سوڵتان کوڕی میر محمد، ناصر کوڕی شاعەلی، عزیز کوڕی کاك محمد، محمد کوڕی خان ئەبدال.

وادیارە شرفخانی بدلیسی لە باسی ئەمیرەکانی جزیرەدا کە ناوی بردون ئەمانەی هەروەکوو میرنشینێکی ناوچەیی حسابکردونو لە لاپەڕە/٤٠ی وەرگێڕانەکەی هەژاردا ئاماژەی بۆ فەرمانڕەوایەکی تر کردووە کە ناوی

ئەحمەدی کوڕی مروان بووە (لام وایە لەوە ناچێ ئەم فەرمانڕەوایە لە بنەماڵـەی عەزیزان بوو بێت کە شرفخان لە شرفنامەدا وتوویەتی:

((یەکـەمین کوردێـک لـە وڵاتـی دیـاربکرو جزیـرەدا لەسـەر تـەختی فەرمانڕەواییـەکی سـەربەخۆ دانیشـتوەو بـە پادشـاه ناوبـانگی دەرکـردووە ئەحمەدی کوڕی مروان)بووە لە حکومەتەکەی لەسـەر داروپـەردووی حکومـەتی عەیک هەڵوەشاوی (دۆستەکی) دامەزراوە کە حکومەتی دۆستەکی لەکاتی خۆیدا لە ساڵی ٣٢١/ی کۆچـی بەرامبـەر ٩٣١دامـەزراوە (دەربارەی ئـەو حکومـەتی دۆستەکیە لەباسـی سلچوقیەکانا ئاماژەمـان بۆ کتێبەکـەی عبدالرقیـب یوسـف کردووە کـە وتوویـەتی حکومـەتی دۆسـتەکی لـەنێوان سـاڵانی ٤٧٦ ـــ ٤٧٨دا لەلایەن سلچوقیەکانەوەلەناو براوە (بەرامبەر بە ساڵی ١٠٨٣ ـ ١٠٨٥/ی زایین).

دەسـەڵاتی ئەحمـەدی کـوڕی مـروان لـە زەمـانی (القـادر باللـه)ی خلیفـەی عەباسیدا گەیشتبووە چڵە پۆپـەی و خلیفـە نازنـاوی (نصراللـه)ی بەخشـیبو بـە ئەحمەدی کوڕی مروان.

منذر الموصلی لـە کتێبەکـەیدا سـەرچاوە/٢٥وتوویـەتی (ئـەمارەتی جزیـرەو بۆتـان کۆنـترینو بـەناوبانگترین ئـەمارەتی کـورد بـووە لـە جزیـرەی أبـن عمـردا بوتان وجوڵەمێرگ)لە کەناری روباری دیجلەدا کە ئەو ناوچەیـە شـوێنی ڕەگـەزی خێزینی کورد بووە.

لەدوای مردنی دامەزرینەرەکەی کە (سلیمان خالد)بووە سـێ کـوڕی هـەبوە : میر العزیز، میر حـاجی بـدر، مـیر عبـدال ــ ئـابدالو ئـەو سـێ برایـە وڵاتەکـەیان کردووە بەسێ بەشەوەو وڵاتەکەی کەوتوتە ژێر دەسەڵاتی سێ بنەماڵە کە بریتی بوون لە (العزیز، حاجی بدر، عبدالله) بەڵام لـەدواییدا هەرسـێکیان لـەناو خۆیانـا تێکچوونو بەگژ یەکتردا چـونو (عزیـزی)یـەکان بەسـەرلاکانی تـردا سـەرکەوتنو ئەمارەتەکە لەژێر دەسەڵاتی میر عبدالعزیـزدا مایـەوە هـەتا ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدە کەبە شکانی شۆڕشەکەی بدرخـان بـەگی کـوڕی عبدالخـالق بـەگی عزیـزی لەساڵی ١٨٤٧دا کوتایی بەم ئەمارەتە هێنراو بنەماڵەی بدرخانی بەسـەر وڵاتـانی دەرەوەدا پەرشو بڵاوبوونەوە)).

لەکۆتایی باسی ئەم ئەمارەتەدا کورتەیەکی ئەو باســە دوورو درێـژەی دوکتـۆر جلیلـی لـە کتێبەکــەیدا ســەرچاوە/٢١ئەخەینــە بــەرچاو کەلــە لاپــەڕە/١٢٦دا وتوویەتی:

میرنشـینی جزیرە پایتەختەکـەی شـاری (جزیــرە)بــووە کــە پلەیــەکی زۆر گەورەی هەبوە لە مێژووی نەتەوەیی‌و ڕۆشنبیری کوردا.

میرنشینەکە کەوتبووە ڕۆژئاوای میرنشینی هەکاری‌و بادینان‌و لـە شـرفنامەدا باسـی ئازایـەتی‌و چـاو نەترسـیی کـوردی ئـەم ناوچەیـەی کـردووە کـە نازنـاوی (بۆتان) لــە عەشـیرەتی نـاودارو بەدەسـەڵاتی کـوردەوە بـووەو شـرفنامە باسـی شۆڕە سوارانی بوتانی کردووە کە ئامادەبووە سـەروماڵی بـدا بـۆ کڕینـی چـەکی باش‌و گرانبەهاو جبە خانەو ولآخی ڕەسەنی عەرەبی‌و شیری میصری‌و خەنجەری دمشـقی‌و لـەکاتی شـەڕدا هـەروەکوو شـوورەو دیوارێکـی قـایم بەرامبـەر دوژمــن وەسـتاون‌و خۆیـان بەدەسـتەوە نـەداوە کـە بەمـە لـە هـەموو دانیشـتوانی تــری کوردستان جیا دەکرانەوە.

بێجگە لەعەشیرەتی بۆتان چەند عەشیرەتێکی تریش لەژێر سایەو دەسەڵاتی میری بۆتاندا بووە وەکوو: پلیکان، دومبلی، نووکــی، مـەحمودی، شـێخ تـارانی، ماسـاکی، ڕەشـکی، والآن، بلاسـتووران، شـیرووپان، دوو تـووران، بۆتـان بریتـی بووە لەچوار ناوچە کە دەوری شـاری جزیرەیـان دابـوو، هـەر ناوچەیـە خـاوەنی مەرکـەز وقـەڵای خـۆی بـووە. لەناوچـەی بۆتـاندا ژمارەیــەکی کــەم ئەرمــەنی‌و ئاسـوری‌و عـەرەب‌و کریسـتیان هـەبوە کـە بـە زۆری لـە ناوچـەکانی (حــەیتام)و (شاخ)دا دەژیان. بۆتـان لـە ڕۆژانـی دێرینیـدا میسـۆپۆتامیای لـە ئەرمـەنیا جیـا کردۆتەوەو بنەماڵەی عزیزانــی کـوردو نـەوەکانی فـەرمانڕەوای میرنشـینی بۆتـان بوون (ئەمین زەکی‌و ژمارەیەك لە نوسەرانی تر ووشـەی عزیـزان دەبەنـەوە سـەر یەکێك لە دامەزرێنەرانی میرنشینی بۆتان کە عبدالعزیــزی کـوڕی خـالدی خـەڵکی جزیرە بووە).

جلیلی لەباسەکەیدا ئەڵی: بەواتەی کامران بدرخان، ئەم بنەماڵەیە ـــ عزیـزان لەناوی گوندێکی بچووکەوە هاتووە کە ناوی ئەزیزان بووە لە نزیك شاری جزیــرە

ک ئەمەی بدرخان لەگەڵ سەرچاوەکانی تردا یەك ناگرێتەوە کە وتویانە بەناوی عبدالعزیزی کوڕی سلیمانەوە بووە).

جلیلی لە باسەکەیدا باسی گرنگی شاری جزیرەی کردووە کە مزگەوتو کەنیسەو گەرماوی تیادا بووەو شوێنی بازرگانیو پیشەسازیەکی گەرم بووەو بازرگانەکان ماڵی بازرگانیی خۆیان بە کەڵەك ناردوە بۆ موصلو بغدادو بصرەو هەروەکوو (ئینجیجیان) باسی کردووە سەرداری جزیرە سوودێکی زۆری لە هەڵکەوتی شوێنی شارەکە دەست گیربووە کە کەوتبووە سەرە ڕێگای کاروانەکانی نێوان بەغدادو ئەستەمبولو کاروانەکان لەرێگایانا ناچاربوون باج وەکوو ترانسێت) بدەن بەرامبەر بە پەڕینەوەیان لەو پردەی لەسەر روباری دیجلەدا دروستکرابوو کەلە پێکەوەلکانی چەند بەلەمێك بەسیم ئامادە کرابوو.

جلیلی لە پەراوێزی لاپەڕە/٣٠٠دا باسی پردێکی تری کردووە کە (بارونات مۆگ نیرووخان) باسی کردووە کە کاتی خۆی سەری لەوشارە داوەو ئەوپردەی بووە لە داروتەختە دروستکراوەو بەشەو ئەو پردە بەرزکراوەتەوە (دیارە بۆ ئەوەی بەلەمی ناو ئاوەکان لەو شوێنانەوە تێپەڕ بکەن).

شاری جزیرە بەشوورەیەك دەورە دراوەو بورجی گەورە لەسەر شوورەکە هەبوەو کاتێك رشید پاشای عوسمانی هێرشی بردۆتەسەر کوردەکانی شاری جزیرە ئەو شوورەیەی ڕووخاندوە. لە باکووری شارەکەدا قەڵایەکی سەخت لەسەر تاشەبەرد دروستکرابوو چووبوو بە ئاسمانا (قەلای فینك) رۆژانی پڕ لە مەترسی سەرداری بۆتان خۆی لەو قەڵایەدا حەشارداوە.

جلیلی باسی کۆنفیدرالیەکی عەشیرەتی (میللی) کردووە کە دراوسێی بۆتان بووە لە سنجاقی ماردینداو (وادیارە جلیلی پەیوەندی نێوان میرنشینی جزیرەوبوتانو میللیەکانی بەجۆرە فیدراڵیەك حسابکردووە). تیمور پاشای سەرۆکی عەشیرەتی میللی دەستێکی باڵای هەبوە لە بەڕێوە بردنی کاروباری سیاسیی ماردینو دەوروبەرەکەیو هەرچەند ژمارەی ئەو عەرەبو تورکانەی لە ناوچەکانی سەر بە عەشیرەتی میللی کەم نەبوو بەڵام میللیەکان دەسەڵاتو توانای هێزێکی ئاشکرای جەنگیان هەبوەو توانیبویان دەست بەسەر ناوچەکەدا

بگرن‌و سەرۆکی ناوچەکانی دراوسێی میللی حسابیان بۆ هێزو دەسەلاتی تیمور پاشا کردووە.

عوسمانیەکان چاویان لەوە بووە دەسەلاتی تیمور پاشا کزو لاواز بکەن‌و بۆ ئەوە لەساڵی ١٧٩١دا سلیمان پاشای والی عوسمانی لە بغدادو بەرەزامەندی سوڵتانی ئەستەمبولْ بەلەشکرێکی گەورەوە بەرەو ڕووی عەشیرەتی میللی کەوتە ڕێ‌و لە موصڵدا هێزێکی (٣٠)هەزار کەسی لەو عەشیرەتە کوردانە کۆ کردەوە کە بەدەنگیەوە چوویوون‌و لەوانە بوون، بارەها هەواڵی زەبروزەنگی تیمور پاشایان بیستبوو، والی حلبیش (کوسە معطف پاشا) لەگەڵ رشید زادە عمر پاشای والی (ملاطیه) چوونە پاڵ هێزەکەی سلیمان پاشای والی بغدادو لەو ڕوو بەڕووبوونەوەیەدا تیمور پاشا بەرگەی نەگرت‌و قەلاگەی خۆی بەجێهێشت‌و ڕوویکردە حلب‌و سلیمان پاشا بێ بەزەییانەو دڵرەقانە دەستی کرد بەکوشتار لەناو (میللی)یەکاناو ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن‌و بەدیل گرتن‌و ئەوانەش کە میللی نەبوون‌و لایەنگری تیمورپاشا بوون لە سزای والی رزگاریان نەبوو.

سلیمان پاشا دوای ئەو کوشتارە ئیبراهیم پاشای برای تیمور پاشای کرد بەسەرداری هەموو میللی‌یەکان (بێگومان ئەبێ ئیبراهیم پاشای برای تیمور پاشا بەنەهێنی یا بە ئاشکرا لەگەڵ والیی عوسمانیدا بووەو دژی براکەی خۆی بووبێت بۆیە کراوە بە سەرداری میللی دوای ئەو هەموو کوشتارەش).

عوسمانیەکان لە دواییدا لەساڵی ١٨٠٠دا تیمورپاشایان لەخۆیان نزیک کردەوەو کردیان بەوالی (رەقەبە)و لەساڵی ١٨٠٢دا کرا بەوالی (سیواس)و پاش ئەوە ئەیوب بەگ کرا بە سەرداری میللی)).

دەربارەی کێشەی میللی‌یەکان‌و عوسمانیەکان، ئەمین زەکی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٣٢باسی لێ هاتوویی وریایی‌و زیرەکێتی ئەیوب بەگی کردووە کەچون بەوپەڕی لێ هاتووییەوەو بەشێوەیەکی زانایانە توانیبووی خۆی بەهێز بکاو دوور لە دەسەلاتی کاریەدەستانی عوسمانی توانیبووی فەرمانڕەواییەکەی خۆی ببات بەڕێوە کەئەمە دەسی نەدابوو بۆ عوسمانیەکان بۆیە هێزێکیان ناردە سەری‌و ئەیوب بەگ گیراو لە قەلای دیاربکردا زیندان کراو لە جیاتی ئەو (تیماوی) بەگی کوڕەزای تیموریان لە جێگەی ئەیوب بەگ دانرا.

جلیلی له لاپەڕە/١٣٠ی کتێبەکەیدا باسی ئەوەی کردووە چۆن والیەکانی عوسمانی دەستیانکردبوو بەخۆشکردنی ئاگری دووبەرەکی لەنێوان میرەکانی خێڵو بەگژ یەکتریانا دەکردنوله ئەنجامدا میرنشینەکانی بابانو بۆتان له پێش ھەموویانەوه دەلاقەیان تێکەوت.

**سێهەم ـ ئەمارەتی بدلیس (بەتلیس)**

دەربارەی سەرەتای ئەمارەتی بدلیس، هەروەکوو ئەولیا چلبی له لاپەڕە/١٠٢ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥١ ئاماژەی بۆ زەمانی ئەسکەندەری ذو القرنین کردووه که چۆن رەفتاری لەگەڵ بدلیس دا کردووه (که دیاره فەرمانڕەوای ئەو رۆژانه بدلیس بووه)و ئەولیا چلبی لەگەشتەکەیدا وتوویەتی:

((ئەوانەی دەربارەی رۆمو عەجەم نوسیویانە، هەروەکوو مقدسیو سوڵتان شرف الدینی خاوەنی شرفنامه (مەبەست شرفخانه) ووتویانەو باسیانکردووه، ئەسکەندەر دوو زیادە گۆشتێ لەملاولای سەریەوه دەرچوو بوو که وەکوو دوو شاخ وابوون لەبەر ئەوه پێی وتراوه ئەسکندەری ذو القرنین، بەلأم هەندێکی تر لایان وابووه هەموو (٣٢) ساڵێکی ئەوسەردەمە بریتی بووە له قەرنێك (سەدەیەك) لەبەر ئەوه ئەسکندر ماوەی (٦٤) ساڵ فەرمانڕەوایی کردووه که بریتی بووه له دووجار (٣٢) ساڵ بۆیه پێی وتراوه ذو القرنین (ئەمە مانای ئەوەیه دوای مردنی که ٦٤ساڵەکەی تەواو کردووه ئەوسا پێی وتراوه ذو القرنین).

ساتێك ئەسکندر شاری (بدلیس) دەگرێت بانگ ئەکا: ئادەی بدلیسی تۆکەرم حرمەتکارم) بۆ بانگ بکەنو ساتێك بدلیس ئەچێتەلای ئەسکەندر پێی ئەڵێ: نۆکەرە دڵسۆزەکەم (دیارە ئەسکەندەر که بدلیسی گرتوه، بدلیس بەگژیا نەچووه بۆیه به دڵسوزەکەی ناوی بردوه)، لەماڵ لەپارە چەند هەزار کیسەت پێویسته خەرجی بکه بۆ ئەوەی لەم شوێنەدا قەلأیەکی وا سەخت دروست بکەی به مەرجێك ساتێك لەوسەرەوە دەگەڕێمەوه بۆ ئێرە بە هەموو هێزو توانای خۆمەوە نەتوانم ئەو قەلأیه داگیربکەم.

بدلیسیش لەسەر ئەو فەرمانەی ئەسکندەر (کەلە ٨٨٢ ساڵ پێش هاتنی پێغەمبەری ئیسلام مردوه) قەلأکه دروست دەکاو دوای ئەوەی ئەسکندر له

شەڕی (چەماپوور) دەگرێتەوە گەمارۆی ئەو قەڵایە ئەدا کە بدلیس لەسەر خواستی ئەسکەندەر دروستی کردبوو، هەرچەند هەوڵ ئەدا قەڵاکەی بۆ داگیر ناکرێت و دوا لە بدلیس دەکا لەقەڵاکە بچێتە دەرەوە، بەڵام بدلیس گوێ ناداتە داخوازیەکەو ئەسکەندەر لای وائەبێ بدلیس بەراستی لێی یاخی بووەو شەبەیخوون بە هەموو هێزەکەیەوە پەلاماری قەڵاکە ئەدا بەڵام تەقەلاکەی بێ سوود ئەبێ و نامەیەك دەنێرێ بۆ بدلیسی ئەگەر لە قەڵاکە بچێتە دەرەوە لە یاخی بوونەکەی خۆش دەبێ، بەڵام بدلیس دوبارە گوێ ناداتێ و لە قەڵاکەیەوە بە مەنجەنیق بەردەبێتە گیانی لە شکرەکەی ئەسکەندرو ژمارەیەکی زۆریان لێ دەکوژێت و ئەم هەرلو بەزمە (٤٠)رۆژ دەخایەنێ و لەدوای ئەوە بدلیس بەخۆی و شەرکەرەکانیەوە لە قەڵاکە دەچێتە دەرەوەو کلیلەکانی قەڵاکە دەخاتە سەر قاپێکی زێڕو دەیباتە بەردەمی ئەسکندرو کڕنوشی بۆ دەباو بە ئەسکندر ئەڵێ قوربان تۆ لەبیرت نایە خۆت فەرمووت قەڵایەکی وا دروست بکەم خۆشت نەتوانی بیگری؟ ئەسکەندەر لێی خۆش دەبێ و فەرمانڕەوایەتی قەڵاکەو ناوچەکە ئەداتە دەس بدلیس و ئەولیا چلبی لە یاداشتەکەیدا ئەڵێ: بەوجۆرە ووشەی بدلیس بەهەڵە کراوە بە بەتلیس (لەراستیدا گۆڕینی پیتی (د) لەلایەن تورکەکانەوە بۆ پیتی (ت)شتێکی ئاساییەو محمد ئەکەن بە مەمەت).

بە پێی ئەو باسەی چلبی دەبێ ئەو بەدلیسە باپیرە گەورەی بدلیسییەکانی دوایی بووە کە مەلا ئیدریسی بدلیسی و شرفخانی بدلیسی دوورنیە لەو بنەچەیە بووبن.

شرفخانی بدلیس لە شرفنامەدا، لاپەرە/٧٢٨ی سەرچاوە/٧٥دا بە دوورو درێژی باسی کێشەی نێوان میری بدلیس و میر ئیبراهیمی کردووە کە بووە بەهۆی ئەوەی ئەمارەتەکە لەناو چوەو بە دوورو درێژ باسی ئەو کێشەیەی بەم جۆرەی خوارەوە کردووە لە شرفنامەدا کە وتوویەتی:

((ساتێك باوکی ئیبراهیم دەمرێ، ئەگەرچی ئیبراهیم ئەوکاتە منداڵیش بووە بەڵام دەکرێت بە جێنشینی باوکی و کاروباریش دەدرێتە دەست عبدالرحمن ئاغای قوالیس و چەند ئاغایەکی (رۆژەکی) بەرلەوە (میرشرف) لە زەمانی (میر شامحمد)دا ناوچەی مووشی پێ سپێردرابوو، پاش ماوەیەك ئیبراهیم بەیارمەتی

عبدالرحمن ئاغا پیلانیك سازدەكا كە میر شرف بـانگ بكرێـت بـۆ بدلیـس‌و لـەوێ جلوی هەڵكوڵرێ‌و بۆ ئەو مەبەستە ئیبراهیم نامەیەك دەنێرێ بـۆ میرشـرف الدیـن كە بچێت بـۆ بدلیـس بۆ چـەند ڕۆژێـك دیدەنـی بكـا، بـەڵام مـیر شـرف نـاچێت‌و ئیبراهیم لە ڕقی ئەوە لەشكر دەنێرێتە سـەری. بـەڵام پیـاو مـاقووڵانی ڕۆژەكـی دەبن بە لایەنگری میر شرف الدیـن‌و ئیـبراهیم لـەو شـەڕەدا دەشـكێ‌و ئیـبراهیم دەگیرێ‌و حەوت ساڵ لە قەڵای بدلیس دا دەمێنێتەوە.

لـەدوای ماوەیـەك شـاه ئیسـماعیل صفـوی مـیر شـرف دەگرێــت‌و دەیخاتــە زیندیخانەی تەوریزەوەو هێزێك بـە سـەركردایەتی (چاپـان سـوڵتان ئیسـتاجلو) دەنێرێتە سەر بدلیـس‌و دەوری قەڵاكـە دەدا بـۆ مـاوەی دوسـاڵ‌و ئیـبراهیم (كـە ئەمجارە دوای بەربوونی چوّتە جێگەی میرشرف) نەیتوانیبوو بەرگـەی قزڵباشـەكان بگرێت (مەبەست هێزەكەی جابان سوڵتان ئیساتجلو بووە).

شرفنامە لە لاپەڕە/٧٤٧دا باسی ئەوەی كردووە لـەدوایدا مـیر شـرف (دیـارە ئەوكاتە بووە لە زیندانی تەوریز ڕزگاری بووە) بە هاوكاری چـەند مـیرێكی كـورد دەوری قەڵای بدلیس دەداو قزڵباشەكان ناچاردەكرێن بگەڕێنەوە بۆ ئێران پاش ئـەوەی (مـیر محمــدی شـیرەوەیی) دەســتەبەری ئـەوە بـووە مــاڵ‌و منداڵــی قزڵباشەكان بپارێزرێن لەكاتی گەڕانەوەیاناو ئیتر لەوساوە پاراستنی ئەو سنورانە لەلایـەن سـوڵتانەكانی عوسمانیـەوە سـپێردرا بـە مـیر شـرفـو كارەكــەی خــۆی بەباشی بەجێ هێنا.

شرفنامە دوای ئەوە لەوە دواوە چۆن میر شرف الدین بووە بە (شرفخان)و لە لاپـەڕە/٧٦٤دا باسـی قـەڵای (ئوختومـار)ی كـردووە (ئـەو ئوختومـارە دێرێكــی بـەناوبانگی تیـا بـووە بـەناوی دێـری ئوختومــار كەلـە سـترانە بەناوبانگەكـەی مطرانۆدا كە باسی مریم‌و علی قول ئاغایی تیادا كراوە).

شرفنامە ئـەڵێ: پـاش ئـەوەی (شـرفخان) لـە (تـاتیكی)دا شـەهید دەكرێـت، هۆزی ڕۆژەكـی دەچـن بـەدوای (مـیرشمس الدیـن)داو دەیكـەن بـە فـەرمانڕەوای خۆیان لە بدلیس.

لە كۆتایی ئەم باسەی شرفخانی بدلیس كەلـە شـرفنامەدا باسـی ئـەمارەتی بدلیســی كـردووە، دەچینــە ســەر ئـەو باســەی شـرفخان خــۆی دەربــارەی

فەرمانڕەوای خۆی کردووە کەلە پێشدا لە خزمەتی شاکانی ئێراندا بووەو لە دواییدا لەگەڵ ئێرانیەکانا تێکچوە ئیتر بەپێی فەرمانی سولتان مرادخانی عوسمانی گەڕاوەتەوە بۆلای عوسمانیەکان.

(( باوکی پایە بەرزو گەورەم لە سالی ٩٦١/ی کۆچیدا خۆی لە خزمەت (مەبەستی شای ئێران بووە) دوورخستەوەو کونج نشینی بۆ خۆی هەلبژاردو پاش ئەوە هۆزی (رۆژەکی) ڕوویان لە (شا توماسب ــ کە مەبەستی شاه طهماسپە)نا من بە سەرۆك دابنرێمو پادشاش لەسەر تکای ئەوان هەرچەند من تەمەنم (١٢)سالّ بوو، پلەی (میرێتی) بەمن دراو (سالیان)و (محمود ئاباد)یشم پێ بەخشرا لە ناوچەی شیروانو لەماوەی سێ سالداو لەو ناوەدا مامەوەو محمد بەگی خالۆم کە حاکمی همدان بوو کچێکی خۆی لێ مارە کردمو پاش ماوەیەك وایان لە شا گەیاندبوو منو قزلباشەکان نیازمان وایە (سولتان حسێن میرزا)ی برای شا بکەینە شا، قزلباشەکانی سزا داو منیشی کرد بە لێپرسراوی (نەخچوان) بۆ ئەوەی دوورم بخاتەوەو کە چومە نەخچوانو سالێكو چوار مانگ مامەوە نامەیەکی میری میرانی (وان) کە زەینەلّ بەگی هەکاری بوو لەگەڵ نامەیەکی حسن بەگی محمودیم پێ گەیشتو مژدەی ئەوەیان دامێ سولتان مراد خان فەرمانی بۆ دەرکردوم بۆ فەرمانڕەوایەتی بدلیسو منیش شەشەم رۆژی شەشەلانی سالی ٩٨٦/ی کۆچی بەرامبەر ١٥٧٥زایین لەگەڵ (٤٠٠)کەسی هاوڕێم کە (٢٠٠)کەسیان رۆژەکی بوون لە نەخچوانەوە بە یارمەتیو کۆمەکی میرومەزنانی کوردستان گەیشتمە شاری (وان)و لەوێ خەسرەو پاشام بینیو پێشوازی لێ کردمو خەلاتی فەرمانڕەوایی کە بریتی بووە لە شیرێکی زێڕین وەرم گرت).

پاش ئەوە شرفخان وەکوو لە شرفنامەدا باسی کردووە کە وتوویەتی:

((بۆ ماوەی دەسالی بێ پسانەوە لە زۆربەی هێزو شەڕەکانی سولتان هاوکاریم کردووەو هیچ میروفەرمانڕەوایەکی تر بە گوێرەی من لەپێش نەبومو ئیمڕۆ کە سالی ١٠٠٥/ی کۆچیە لەسایەی شای سایە چەورو گەورە (أبو المظفر - سولتان محمدخان) فەرمانڕەوایی چەند سالە لەدەستی مندایە)).

شرفخانی بدلیسی له شرفنامەدا بە دوورودرێژی باسی چەند میرێکی بدلیسی کردووە کە بریتی بوون له مەلیك ئەشرەف،شرف کوڕی ضیاءالدین، شمس الدین کوڕی شرفخان، شرف کوڕی شمس الدین، میر ئیبراهیم کوڕی حاجی محمد.

**چوارەم : ئەمارەتی (دنبلی ـ دمبلی)**

دەربارەی ئەم ئەمارەتە ئەمین زەکی لە لاپەڕە/٣٨٢ی سەرچاوە/٣٢دا وتوویەتی دوکتۆر (فریچ) لە کتێبەکەیدا (کوردلر) شتێکی کەی باسکردووە دەربارەی ئەم ئەمارەتە، بەڵام لە کتێبی (آثار الشیعة الامامیة)دا باسێکی دوورو درێژی لە شرفنامەوە وەرگرتووەو وتوویەتی عەشایری دنبلی لە ناوچەی هەکاریەوە ڕوویانکردۆتە ئازربایجان، بەڵام (ئەمیرعیسی)ی باوکی (ملك طاهر) لە شاری جزیرەوە چوّتە ئەو ئەمارەتە کە ئەو میر عیسایە وەکوو لەکتێبی (ریاض الجنة)دا کەنوسەرەکەی (عبدالرزاق کوڕی نجفقلی دنبلی)ی حاکمی شام بووە، هەندێ سەرچاوە وایان باسکردووە لەنەوەی (یحي البرمکی) بووە کە ساتی خۆی وزیری هارون الرشید بووەو لەکتێبی (أنساب الأکراد)ی (ئەبی حنیفەی دینوری)دا وتراوە بنەماڵەی دونبلی دەچنەوە سەر برمکییەکان.

بە پێی باسەکەی ئەمین زەکی ئەم بنەماڵەیە چەند لکێکی لێ بوّتەوە، بەناوبانگترینیان (دنبلە مسیحی) بووە کەلە نەوەکانی ئەمیر مسیحی بوونو (شمسکی) لە نەوەی شمس الملك جعفر بووەو (عیسی بکلو) لە نەوەی عیسی بوونو (بگزادە) لەنەوەی ئەمیر فریدونو ئایونجانی بوون.

ئەم جیابوونەوەو لێك ترازانەیان لە یەکتری بەهۆی ئەوەوە بووە لەلایەن خلیفەو مەلیکەکانی وەکوو خەلیفە مأمونی عباسیو تیموری لنگو سوڵتان سلیمی عوسمانیەوە ئاوارە کرابوون بۆ ناوچەکانی: کشان، خۆراسان، خبوتان، شیروان، کنجە،قرەباغ، قرەچەداغو ئەمیرەکانی ئەم بنەماڵەیە لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچیدا توانیبوون ڕێکخراوێکی سەربەخۆ لە کوردستانو ئازربایجاندا دروست بکەن هەتا ئەو کاتەی شێخ حیدری صفوی پەیدا بوو کە دوا ئەمیریان (بهلول دنبلی) بووە سەری بۆ شێخ حیدر دانەواندوەو ئەمارەتەکە بووە بەشێك لە حکومەتی صفوی.

ئەمین زەکی لە لاپەڕە/٢٨٤ی بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣٢ ناوی چەند میرێکی ئەم ئەمارەتەی هێناوە وەکوو: میر محمد کە چوارەمین ئەمیری ئەم بنەماڵەیە بووە لەشام‌و توانیبوی هەندێ لە قەڵاکانی ولاتی هەکاری داگیر بکات‌و ئەم میرە گەلێك نووسینی هەبوە دەربارەی زانیاری‌و هونەری‌و گەلێك شوێنەواری لەپاش بەجیماوە وەکوو قەڵای (بای) کە ساتێك خۆی مردوە لەو قەڵایەدا نێژراوە.

ئەمین زەکی لەدوای میر محمد باسی میر سلێمانی کردووە کە دەسەڵاتێکی زۆری هەبوە لە کوردستان‌و ئازربایجان شام‌و لە (سنجار) کۆشکێکی دروستکردووە ناوی ناوە (سەرای سلێمان) کەلە ئێرانەوە بەنای شارەزای هێناوە بۆ دروست کردنی ئەو کۆشکە. لە لاپەڕە/٢٨٥دا باسی میر جعفری دووەمی کردووە کەلە زەمانیا لەشاخی (سنجران)دا ئاڵتون دۆزراوەتەوە لە نزیك (قەڵای دونبل)و لە ساڵی ٤٤١ی کۆچیدا مردووە.

دوای ئەوە ئەمین زەکی بەڕیزە باسی میرەکانی تری دونبلی کردووە کە بریتی بوون لە: میر یحیی، میر جعفر (کە بەشمس الملك ناسراوبووە)، ئەمیر بەگ،میر ئەحمەد، میر ئیبراهیم، میر جمشید، ئەمیر بهلول، شاه منصور، میر محمد، ئەمیر وەلی، حاجی بەگ،سوڵتان علی، ئەمیر نظیر، ئەمیر فەریدون، ئەمیر بهلول، ئەمیر روستم، ئەمیر بهروز، ئەیوب خان، شاهند خان، بهروز خان، علی خان، مرتضی قولیخان، غیاث بگ، ئەحمەد خان، کوچوك خان، محمود خان، شاهباز خان.

بەڵام لە شرفنامەی شرفخانی بدلیس دا لە لاپەڕە/٥٦٩ی چاپەکەی وەرگێڕانی هەژار ناوی ئەمیرەکانی دونبلی لەگەڵ ئەوەی ئەمین زەکی‌دا هەندێ جیاوازی هەیە، بۆ نموونە ئەمین زەکی دوانیانی بە میر ئەحمەدو ئەمیر بهلول ناو بردوە لە کاتێکدا لە شرفنامەدا بە شێخ ئەحمەدو شێخ بهلول ناوی بردون، جگە لەهەندێ جیاوازیی تر کەلە بەراوردکردنی ئەوەی ئەمین زەکی‌و ئەمەی شرفخاندا کە وەکوو خوارەوە ناوی هێناون جیاوازیەکە دەردەکەوێ:

شێخ ئەحمەد، شێخ بەهلول، حاجی بەگ کوڕی شێخ بەهلول، ئەحمەدی کوڕی بەهلول‌و منصور بەگ وەلی بەگ کوڕی منصور بەگ، حاجی بەگ،

سولتان علی بەگ، نەظەر بەگ، کـوڕی سـولتان علـیو قلیج بـەگ سـولتان علـی بەگ.

ئـەوەی شـایانی باسـە، هــەروەکوو لەپــەراوێزی لاپــەڕە/٥٨١ی چاپــە وەرگێڕاوەکەی هەژاردا وتراوە سەرچاوەی ئەو ناوانەی ئەمین زەکی باسی کردوون بریتیە لە: تأریخی دولو ئـەماراتی کـوردیو مشـاهیر الکردوکوردستان وتـأریخی جونبلی نوسینی شازادە نادر مرزای قاجارو کتێبەکەی ناودارانی کـوردی حسـێن حوزنی موکریانی.

### پێنجەم ـ ئەمارەتی برادۆست

شرفنامە لە لاپەڕە/٥٤٦ کورتە باسێکی ئەم ئەمارەتەی خستوتە پێش چـاو کە وتوویەتی بـەرەبابی میرەکـانی برادۆسـت دەچنـەوە سـەر هیـلال کـوڕی بدر کوڕی (حەسنەوییە)کـە فەرمانڕەوایـەکی دینـەوەرو شـارەزوور بـووەو هیـلال لـە شەڕێکدا لەگەڵ (شمس الدولەی دیلەمی) والی همدان کردبووی کوژرا.

بەپێی کتێبەکەی ئەمین زەکی لە لاپەڕە/٣٨٨دا وتوویەتی (هلال کوڕی ناصر الدولە بووە) کە مردوە سێ کوڕی لەپاش بـەجێماوە هەرسێ کوڕەکـە چوونەتـە (برادۆست) یـەکێکیان بـووە بـەجێ نشـینی بـاوکی لـە شـارەزوور کـەناوی (طـاهر)بووەو کوڕەکـەی تـری سـەرۆکی عەشـیرەتی (ئـاکور) بـووەو کـوڕی سێهەمیان چوتە (سەلماس)و دەستی بەسەردا گرتوە.

بەناوبانگترین ئەمیری ئەو بنەماڵەیە (غازی قـران)ی کـوڕی سولتان ئەحمـەد بووە کە شاە ئیسماعیلی صفـوی لـە سـەرەتادا ڕقـی لێی بـووە بـەڵام لـەدواییدا بوون بەدۆستی یەکتریو نازناوی (غازی قران)ی پێداو ناوچـەکانی (تەرگـەوەڕ)و (صوماي)و (دول )ی پێداوە، میرێکی زۆر ئازاو لێ هاتوو بووەو لـەدوای شـەڕی چـالدێران هـەروەکوو ئـەمیرەکانی تـری کـورد چوتــە ژێـر سـایەی دەوڵــەتی عوسمانیـەوەو سـولتان زۆر ڕێـزی لێ گرتـوەو گـەلێك شـوێنی لـە ئایالەتـەکانی ئەربیلو بغدادو دیاریکری داوەتێ.

شرفنامە لە لاپــەڕە (٥٤٨ ــ ٥٥٦)دا کورتـە باسـێکی دەربـارەی هـەندێ لـە میرەکانی برادۆست کردووە کە بریتی بوون لە: شاە محمد بەگ کوڕی غزی قران،

بوداغ بەگ کوڕی شا محمد بەگ، حسن بەگ کوڕی شاەمحمد بەگ، علی بەگ کوڕی غازی قران، ئەولیا بەگ، ناصر بەگ، ئەمیر خانی یەك دەست، ئولوغ بەگ.

**شەشەم : ئەمارەتی ( حسن کیف ــ حصن کیف ) ــ کە شرفنامە وتوویەتی بە ( ملکان ) بەناوبانگن**

شرفنامە لە لاپەڕە/٣٢٦دا دەربارەی ئەمارەتی حسن کیف لە پێشدا قوڕی پێواوە بۆ لەناوچوونی بنەماڵەی ئەیوبیو وتوویەتی:

((لەدوای ئەوەی گەردونی چەپگەردو ڕۆژگاری دڵڕەق ڕووی لەبنەماڵەی پادشایانی ئەیوبی وەرگێڕاو ڕووی کامەرانیی لە ساڵی ٦٢٢ی کۆچی بەرامبەر بە ١٢٦٣ ـ ١٢٦٤ز لێ هەڵگەڕانەوەو بۆ خەڵکی کوردەواری بوو بەسەرگەردانیو خاکەسەریو لەو ساڵە تووشو شوومەدا ئەو خانەدانە ئاوەدانو پڕ بەروبوومە تەمو مژی ماتەمینی دایگرتو لەبەر تەوژمی ڕەشەبای چارەڕەشیدا چەمایەوە، ئیتر بنەو باریان پێچرایەوەو ئەو خانەوادەیە هەتا ماوەیەك بە نهێنی لەشاری (حەما)دا ژیابوو، دوای ئەوە ڕوویکردە قەڵای ماردینو لەوێ قەڵاو مەڵبەندی پێ سپێرراو ماوەیەك لەوێ مابووەوە، بەڵام دڵی لەوێش هەڵکەنراو ڕویکردە رأس الغول ـــ سەری دێوەزمە کە ئێستە بە (حەسەنکیف) دەناسرێ. ئەو خانەوادەیەی شرفنامە باسیکردووە ناوی ملك خلیل بووە وەکوو منذر الموصلی لەسەرچاوە/٢٥دا باسی کردووە).

شرفنامە لە باسەکەیدا وتوویەتی: ساتێك سەرداری ماردین پەلاماری ملك خلیلیدا خۆی شکاو ناچاربوو پاشەکشە بکات. شرفنامە لە لاپەڕە/٣٣٠دا ناوی هەندێ لە هۆزوتیرە گرنگەکانی ناوچەی حەسنکیف هێناوە وەکوو: ئاشیتی، محەلمی، میهرانی، بەجنەوی، شقاقی، ئەستورکی، کوردلی مەزن، کوردلی گچکە، ڕەشان، کێشکی، جلەکی، خەندەکی،سوهانی، بیدیان.

لە شرفنامەدا لەباسی فەرمانڕەوایانی حەسەنکێفدا وتوویەتی ئەمانە بە (ملکان) بەناوبانگنو مامۆستا محمد جمیل ڕۆژبەیانی لە پەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا (ج ـ کە جمیل بەندییە) لەو باسەی ئەمین زەکی دواوەو کە لە لاپەڕە/٢٧٣ی بەرگی دوهەمی سەرچاوە/٣٢دا وتوویەتی ئەو (ملکانە)ی شرفنامە باسی کردووە مەبەست لە (پادشاە)بووە، ڕۆژبەیانی ئەڵێ: بەڵام من لام وایە ئەو ووشەیە لە

ملكاتی)یەوە هاتووە کە یەکێکە لە سێ مەزەبی فەلەکان کە بریتین لە: مەلکاتی،یعقوبی،نسطوری کە سەریە (قەدیس ئەنتونیوس)ن‌و هەندێ لە کوردە مەسیحیەکان بەناوی مەزەبەکانیانەوە ناوبراون‌و کۆمەڵێك لە مێژوونوسان لایان وایە نسطورییەکانی موصلّ کە ئێستە بەخۆیان ئەڵێن ئاشوری‌و فەلە یعقوبیەکان کە سەردەمیك پێیان دەوتن جوزقان بەرەسەن کوردن.

دەربارەی ئەو سەرنجەی مامۆستا جمیل رۆژبەیانی، لام وایە ئەمین زەکی وەکوو لەدوای ئەمە باسەکەی دەخەینە پێش چاو، بەخۆڕایی نەیوتووە ئەو وشەی (ملکان)ی کە میرەکانی حسن کێفی پێ ناسرابوون مانای پادشا دەگرێتەوە وەکوو رۆژبەیانی لە پەراوێزی لاپەرە/٢٢٦ی چاپەکەی هەژاردا باسی کردووە، ئەو ئەمیرە ئەیوبیانەی لە دواییدا لە ئەمارەتی حسنکێفدا فەرمانڕەوا بوون‌و بە ملك ناویان هاتووە کەلە شرفنامەدا هەموو فەرمانڕەواکانی حسنکێفدا بە ملك ناوبراون‌و وەکوو ملك طلب،ملك حوسین، ملك سولیمان ملك محمد، ملك سولتان‌و ئەرمەنیەکانیش بە سەرکردەکانی خۆیان ووتووە ملك کە نازناوێکی بەڕێوەبەری کاروباری ئیداری‌و سوپایی بووەو نازناوی ئاینی نەبوە.

ئەمین زەکی لە لاپەرە/٣٧٣ی بەرگی دوهەمی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣٢ فەرمانڕەوایانی ئەم ئەمارەتەی بردوّتەوە سەر نەوەی ئەیوبیەکان‌و وتوویەتی یەکەم حاکمێکی ئەم بنەماڵەیە (ملك سبحان) بووە کەلە زەمانی جەنگیزیەکانا بووە بە مەلك‌و بەوپێیە دەبێ ساڵی ٧٣٦ی کۆچی ئەو ساڵە بووبێ کە ئەو ئەمارەتەی تیادا دروستکراوە.

پێوەندی نێوان ملك محمدی کوڕی ملك سلیمان لەگەلّ مغۆلیەکان‌و ئێرانیەکانیشدا بە دۆستایەتی براوەتە سەرو لەکاتی تەیموریەکانا ملك ئەشرەفی کوڕەزای، ملك محمد کوڕی سلیمان حاکم بووەو لەشاری ماردیندا چاوی بە تیموری لەنگ کەوتووەو دڵسوزی خۆی بۆ دەربڕیوەو پاش خوشی (ملك خلف ـــ ئەبو سفین)ی کوڕی ملك خلیل کە مرۆڤێکی زۆر لێهاتوو ئازاو بەجەرگ بووە توانیبووی بەرگری لە هێرشی (ئاق قونیلو)ەکان بگرێت بۆ ئەوەی قەڵای حسنکێف دا گیرنەکەن بەڵام یەکێك لە سەرکردەکانی ملك خلیل خیانەتی لێ

کرابووەو قەلاّکە داگیر کراوەو بوّتە هوّی نەمانی دەسەلاّتی ئەیوبییەکان بوّ ماوەیەك.

پاش ئەوەی ئاق قوّنیلوەکان لەناو خوّیانا تیّکچوون (ملك خلیل) کە کاتی خوّی زگاری بوبوو چوبووە شاری (حماه) ئەوەی بەهەل زانیو گەڕایەوە بوّ کوردستانو (سعرد ــ سعرت)ی داگیرکردووەو قەلاّی حسنکیّفی گرتەوەو سەرلەنویّ ئەمارەتەکەی بووژانەوە.

لەگەلّ ئەوەشدا ملك خلیل پیّوەندی لەگەلّ شاە ئیسماعیل صفویدا باش بووە بەلاّم ئەو دوّستایەتیە بەکەلّکی نەهاتووەو شاە ئیسماعیل گرتوویەتیو لە بەندیخانەی تەوریّزدا تا دوای شەڕی چالّدیّران ماوەتەوەو ئەوسا گەڕاوەتەوە بوّ ئەمارەتەکەی خوّیو سولّتان سلیمی عوسمانی گرتیە خوّیو پاراستیو بوّ ماوەیەك ئەم ئەمارەتە لەلایەن ئەوەکانی خوّیدا مایەوە تا ئەو کاتەی عوسمانیەکان ئەم ئەمارەتەشیان وەکوو ئەمارەتەکانی تر کورد لەناوبرد.

منذر الموصلی لە کتیّبەکەیدا سەرچاوە/٢٥ لە لاپەڕە/٢٠٧دا لەباسی ئەم ئەمارەتەدا وەکوو سەرچاوەکانی تر وتوویەتی فەرمانڕەواکانی لە ئەوەی ئەیوبیەکان بوون کە ئەمارەتەکەیان لەناوچەی (سعرد ــ سعرت)دا لەنیّوانی دیاربکرو جزیرەی أبن عمردا بووەو لە سالّی ٨٠٠/ی پیّش زایندا لە زەمانی روّمانیەکانا روّلّیکی زوّر گرنگی هەبوەو دوای ئەوەش لەزەمانی ساسانیەکانو حمدانیەکانو مروانیەکانیشدا بایەخیّکی زوّری هەبوە. لەزەمانی (تورانشاە)دا سلجوقیەکانی روّم شاری (ئامد)یا داگیرکردو دوای ئەوانیش تاتارەکانو مەغوّلەکان یەك لەدوای یەك دەستیان بەسەردا گرتوە.

لەسالّی ١٤١١/ی زاندا (ئوزون حسن)کەلە ئاق قوّنیلوەکان بووە حسنکیّفی داگیرکردووەو لەدوای بیست سالّ دوبارە ئەیوبیەکان دەستیان گرتەوە بەسەر ئەمارەتەکەداو لەکوّتاییدا کە عوسمانیەکان بوون بە دەسەلاّتدار ئەم ئەمارەتەشیان لەناو برد کە ئەم ئەمارەتە تاقە ئەمارەتیّکی کوردی بووە کە ئەیوبیەکان لەناو خاکی کوردستانا دایان مەزراندبوو.

بیّجگە لەو ئەمارەتانە،سەرچاوەکان بەکورتی باسی چەند سەرچاوەیەکی تریان کردووەو ئیّمەش لیّرەدا کورتەی هەندیّك لەو ئەمارەتانە باس دەکەین.

أ ـ ئەمارەتی سلێمانی

(کەلەشرفنامەدا لە لاپەڕە/٤٧٢دا بەسلیمانی ناوی هێناوە بەلاّم لە کتێبەکەی منذر الموصلی لە لاپەڕە/٢٠٨ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٥بە (سلیڤانی)ناوی هێناوە کە وتوویەتی دامەزرێنەرەکەی (مروان کوڕی محمد الحجدی)بووە لە خوچەی (قولب) لە ریزی عەشایری (بانوکی ـ بانەکی) لە ویلایەتی بدلیسدا.

لە شرفنامەدا وتوویەتی مروان لە سەرەتای ساڵی ١٢٧ی کۆچیدا بەرامبەر بە ٧٤٤/ی زایین بووە بە پادشاوچوەتە سەرتەخت بەلاّم لەدوای پێنج ساڵ (عباسی سفاحی) لێ ڕاپەریوەو ناچاری کردووە ڕووبکاتە میصرو لەوێش وازیان لێ نەهێناوەو ساڵی ١٣٢ی کۆچی کوشتویانەو دوو کوڕی هەبوە (عبداللەو عبیدالله) بەپێی شرفنامە هەردوکیان پەرەوازە بوون.

ب ـ ئەمارەت و بنەماڵەی مەحمودی

بەپێی لاپەڕە/٥٥٧ی شرفنامە فەرمانبەرانی هۆزی محمودی سەری خۆسەریان دەگاتە پادشایانی مروانی و هەندێکیش دەڵێن لەگەڵ میرانی جزیرەدا پس مام بوون، کە دامەزرێنەرەکەی (شێخ مەحمود)بووە کەلە شامەوە یالە جزیرەوە لە زەمانی قرەقۆنیلودا لەلایەن (قرەیوسف)ی تورکمانی جێی صغری و خزمەکانی لە ئازربایجاندا کردۆتەوەو لە دواییدا (ئاشوت)و (خوشاب)ی بە میرایەتی داوەتێ و نازناوی مەحمودی لە هۆزەکەی ناوە.

بەلاّم هەروەکوو ئەمین زەکی ئامازەی بۆ کتێبەکەی (دوکتۆر فریج)کردووە، دامەزرێنەری ئەمارەتەکەی بە (بهلول بگ)ی سلیمانی ـ سلیڤانی دانـاوە کەلە نەوەی مروانی کوڕی محمدی دوا خلیفەی ئەمویەکان بووە کە ئەمە لەگەڵ ئەوەی شرفنامەدا یەك ناگرێتەوە.

ئەمین زەکی لە لاپەڕە/٣٨٢وتوویەتی دوای شێخ محمود ئەمیر حەسەنی کوڕی پەرەی بە ئەمارەتەکە داوەو ساتێك شەر لە نێوانی ئەمیر حسن و (عزالدین شێری هەکاری)دا ڕوویدا میری بدلیس بوو بە لایەنگری عزالدین شێرو لەو شەڕەی ڕوویدا لەسەر ڕوباری (خوشاب)میر حەسەن کوژراو ئەمارەتەکەی بوو بە دوویەشەوەو پاش ئەوەبوو بەسێ بەشەوەو درێژەی کێشا هەتا ناوەڕاستی زەمانی عوسمانیەکان.

ئەولیا جلبیش لـە کتێبەکـەیدا باسـی بـەهێزیی ئـەم ئەمارەتـەی کردووە کـە کەوتبووە لای ڕۆژهەڵاتی ویلایـەتی (وان) کـە بریتـی بـووە لـە سـەد عەشـیرەتی بەهێزو لەکاتی ئاشتیدا شەش هەزار سواری هەبوە.

ج ـ ئەمارەتی (ساسون)

کەلە شرفنامەدا وتراوە لەدواییدا ناویان بـووە بـە (حـەزۆ) بـەپێی شـرفنامە، لاپـەڕە/٣٨٠، خانەدانـەکانی (ساسـون)و میرەکـانی بدلیـس پشـتی پێشـووی هەردوکیان لەیەك هێشوو بووەو لەدواییدا لێك جیابوونەتـەوە کـە ئـەو ئەمارەتـە لەدوو براوە پەیدا بووە عزالدین‌و میر ضیـاءالدین‌و هـەردوو براکـە لـە پایتـەختی ئەرمەنەوە کە ئەوسا (ئەخلات)بوو چووبوونە بدلیس‌و قـەڵای (ساسـون)یـان لـە (تاویت) ناوێکی گورجـی داگیرکردووە، لەبـەر ئـەوەی کـورد بـە عزالدیـن دەڵێـن (عـیززین) بۆیـە ئـەو فەرمانڕەوایانـە بـە (عـیززانی) ناسـراون‌و فـەرمانڕەوایانی ساسـون لەکوردسـتانا بـە بەخشـندەیی‌و سـەربەرزی ناسراون‌و پادشـایانی ئـاق قونیلی‌و قزڵباش‌و عوسمانیەکان کە هێرشیان بردوتە سەر کوردسـتان دەسـتیان بۆسەر مەزنەکانی ساسون نەبردوەو بـە نـەرم‌و نیـانی لەگـەڵیانا جووڵاونەتـەوەو ڕێزیان لێ گرتوون.

یەکەم فـەرمانڕەوایان (میرئـەبوبکر)بـووە کـە دوو کـوڕی هـەبوە (خدریـەگو علی‌بەگ)ساتێك میرو مەزنەکانی کوردستان بۆ خۆ نزیك کردنەوە چونـەلای شـاە ئیسماعیل‌و زۆریەیانی گرت، شا عەلی بەگ (کە کوڕی میر ئەبوبکر بـووە) وەکـوو ئەوانی‌تر معامەلەی لەگەڵا نەکراو بەدڵی شابوو، تەنانەت بووش بوو بەهاونشـین‌و هاو پیاڵەی شەووڕۆژ لەگەڵیا بووە. ئەو علی بەگە لەگەڵ شرف بەگی بدلیسیشدا زۆر ئاشنا بووەو شرف بەگ کچێکی ئەوی هێنابوو.

شرفنامە دوای ئەوە بە زنجیرە باسی کردووە کە علی بەگ سێ کوڕی هەبوە: محمد بەگ، خدر بەگ، شاوەیی بـەگ. شـرفنامە لـە لاپـەڕە/٣٨١ ـ ٤٠٠ باسـی ژیانی چەند میرێکی ئـەو ئەمارەتـەی کردووە کـە وتوویـەتی ئێسـتە (مەبەسـتی کـاتی نوسـینی شـرفنامە بـووە)ئەحمـەد بـەگیان لەناوچـەی (حـەزۆ)دا فەرمانڕەوایەکی سەربەخۆیە.

**د ـ ئەمارەتی بازوکین (سوێدی)**

شرفخانی بدلیسی لە لاپەڕە/٤٥٨ی شرفنامەدا ئەم ئەمارەتەی بەناوی (سوێدی)یەوە باسکردووە کە دەچنەوە سەر بەرمەکییەکانو هەندێ چیرۆك وا دەگێڕنەوە سێ کوڕی برمەکی لە ترسی هارون الرشید لە بغدادەوە خۆیان گەیاندبووە کوردستانو لە چیای (شەفتالۆ)لە (کنج). گیرساونەتەوەو هۆزی سویدی داوایان لە شێخ شەهاب کرد (دیارە یەکێك بووە لەو سێ کەسە) بچێتە ناویانەوەو ئەویش چوە (خان چوك)و لەوێ قەڵایەکی پتەوی دروست کردو بوو بەرابەرو پێشەوای سویدیەکان.

پاش ئەوە شرفنامە بەدوورو درێژی باسی ئەو میرانەی تری کردووە کەلەدوای شێخ شەهاب فەرمانڕەواییانکردووە :

میر حسن کوڕی میر فخرالدین، میرفخر الدین کوڕی میر حسن، ئەبدال بەگ کوڕی میر محمد، سوبحان بەگ کوڕی ئەبدال بەگ، سوڵتان ئەحمەد کوڕی ئەبدال بەگ، مقصود بەگ کوڕی سوبحان بەگ، مراد بەگ کوڕی سوڵتان ئەحمەد بەگ، سلیمان بەگ کوڕی مراد بەگو وتوویەتی ئیمرۆ کە سەرەتای مانگی نیوجەژنانی ساڵی (١٠٠٥/ی هیجرییە مەزنی هەر لە سلیمان بەگ دەوەشێتەوە، یاخوا هەر سەرکەوتوو بێت.

بەڵام ئەمین زەکی لەسەرچاوە/٣٢ لە لاپەڕە/٣٧٠دا بەرگی دوهەم ئەم ئەمارەتەی بە (بازوکی) ناوبردوە ووتوویەتی:

((هەندێ ریوایەت ئەڵێن عەشیرەتی بازوکی لە ئێراندا بووەو هەندێ سەرچاوەی تر دەڵێن میرەکانی ئەم ئەمارەتە لە عەشیرەتی (سویدی)بوون کە لەژێر دەستی عوسمانیدا بووە.

عەشیرەتی بازوکی لە دوو ناوچەدا بوون، بەشی یەکەم (خالد بکلو: لەناوچەکانی خنس، ملازکردو لەبەشێکی مووش دا بوون، بەڵام بەشی دوهەم لەژێر دەسەڵاتی میری بدلیسیدا بووەو شارەزاییەکی تەواو دەربارەی ئەم ئەمارەتە نیە لەکۆنداو تەنها هەر ئەوە زانراوە دامەزرێنەری بەشی یەکەم (حسین علی بەگ)بووە شاسواری کوڕی لەژێر سایەی شاە ئیسماعیلدا بووەو هاوکاری بووەو زۆر ئازا بووەو لە شەڕێکدا دەستی پەڕیوەو لەوەوە بەیەك دەست

بەناوبانگ بووەو بەرامبەر بەو ئازایەتیەی شاە ئیسماعیل شاری (خنس)و (ملازکرد)ی پیّ بەخشیوە لەگەلّ ناوچەکانی (ئوخنکان ــ وەرگیّڕی کتێبەکەی ئەمین زەکی محمد علی عونی لە پەراوێزی لاپەڕە/٣٧١دا وتوویەتی : ئەو ناوە بە (ئوحکان موش....و هەندێجار ئوجکان موش ناوی هاتووە لە چاپە جۆریەجۆرەکانی شرفنامەدا)، بەلاّم لەدواییدا شاە ئیسماعیل هەلگەڕایەوەو بانگەوازی سەربەخۆی خۆی بلاّوکردەوەو پەنای بردە بەر (سولّتان سلیم یاوز ـ ی عوسمانی) بەلاّم لەویش هەلگەڕایەوەو ئەویش گرتیو کوشتیو لەزەمانی (قلیج)بەگدا هەندیّ لەم عەشیرەتە چوونە ناوچەکانی عەشیرەتی (دومبلی)و تێکەلّ بەوان بوونو بەو جۆرە هەموویان چونە ژێر سایەی عوسمانیەوە.

**هـ ـ ئەمارەتی (مردوسی) ـ کەبە (مرداسیوە یابە مرد سیس)یش ناسراوبوون**

شرفخانی بدلیس لە لاپەڕە/٢٥٩دا لە باسی ئەو ئەمارەتەدا وتوویەتی دامەزرێنەرەکەی (پیر میر نصور)بووە کەلە پێشدا لەهەکاری ژیاوەو لەوێوە روویکردۆتە (ئەگیل)و لە گوندی (پیران)دا ژیاوەودەروێشو مریدێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەتەوەو لەدوای خۆی (پیرموسی)ی کوڕی جێگەی گرتەوەو لەکۆتایی ئەو باسەدا وتراوە: (پیر بدر) کە قەلاّو مەلّبەندی خستبووە ژێر دەسەلاّتی خۆیەوەو ماوەیەك فەرمانڕەوایی کرد، یەکێك لە پادشاکانی سلچوقی چاوی برپە ولاّتەکەیو قەلاّی لەژێر دەستی دەرهێناو ناچاری کرد ئەو ناوچەیە بەجیّبێلّێت (مامۆستا رۆژبەیانی لەپەراوێزی لاپەڕە/٣٦٢ی وەرگێڕاوەکەی هەژاردا وتوویەتی رەنگە ئەو پادشا سلچوقیە (تەتش کوڕی ئەلپ ئەرسلان) بوویبێت کەلە سالّی ٤٧٨ ـ ٤٨٨دا پادشایەتی کردووە).

ئەمین زەکیو منذر الموصلي هەردوکیان لەباسی ئەو ئەمارەتەدا ئاماژەیان بۆ شرفنامە کردووەو ئەمین زەکی وتوویەتی (پیر بدر)ناچار بوو روویکردە (میافارقین)و ساتێك ئەلپ ئارسلان پەلاماری (میافارقین)یدا پیر بدر لەو شەڕەدا کوژراو دوای ئەو (بولدق)ی کوڕی پیر بدر بناغەی بنەمالّەی (ئەکبیل)ی دامەزران کە دوو بنەمالّەی لێبووەوەکە بریتی بوون لە (پالو)و (چرمیك ـ چیرمیك ـ چرموق)و هەموویان لە زەمانی شاە ئیسماعیلی صفویدا چونە پالّ عوسمانیەکان.

# بەشی حەوتەم

# ڕۆڵی ئیدریسی بدلیسی لە بەستنی ئەمارەتەکانی کورد بە دەوڵەتی عوسمانیەوە

لە باسەکانی پێشودا لەوە دوایـن چۆن ئەمارەتـەکانی کـورد کەوتبوونـە ژێـر گێروگازی دوو دەوڵەتی دژ بەیەکو زۆرجارمیرو سەرکردەکانی ئەو ئەمارەتانە بـۆ سوودی خۆیان لایەنگرتنیان لەگەڵ ئەو دوو دەوڵەتەدا جێ گۆڕکێیان کردووە تا ئەوکانەی هەتا ڕادەیەك هەڵوێستی هەردولا بۆ هەندێ لەسـەرۆك عەشـیرەتەکانی کورد ڕوون بووەوە دوای ئەو ڕەفتارەی صفوییـەکان لەگەڵیانا دەیکـرد وەکـوو ەباسی کێشـەی نێوان صفویو عوسمـانیدا باسـکراوە، ئیـتر ئەوسـا لەڕێگـەی ئیدریسـی بدلیسـیەوە ئەمارەتـەکانی بـاکوری کوردسـتان چوونـەپاڵ دەوڵـەتی عوسمانیو بوون بە وابەستەی ئەو کە هـەردولایان سـونی بـوونو بەئاشـکرا دژی شیعەیەتی صفوییەکان بوون.

دەربـارەی بەسـتنی ئەمارەتـەکان بـە دەوڵـەتی عوسمانیـەوە لـە ڕێگـەی ئیدریسـی بدلیسـیەوە گـەلێك سـەرچاوە باسـیانکردووە ئێمـەش لـێرەدا هـەوڵ ئەدەین کورتەیەکی ئەو سەرچاوانە پێشکەش بکەین.

ئەمین زەکی لە لاپەڕە/٧ی بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣٢ئاماژەی بۆ (سلیم نامـە)ی مـەلا ئیدریسـی بدلیسـی کـردووە کەلـەو کتێبـەیدا باسـی تەقەلاکانی خۆی کـرد وەبـۆ بەسـتنی ئەمارەتـەکانی کـورد بـە عوسمانیـەوە کـە وتوویەتی:

((لـەدوای ئـەوەی لـە شـەڕی داگـیر کردنـی تـەوریز بوینـەوە (مەبەسـت داگیرکردنی لەلایەن عوسمانیەکانەوە)، سوڵتان سـەلیمی یەکـەم (کەبـە سـوڵتان

یاوزی دڵرەق بەناوبانگ بووە)فەرمانی پێدام هەوڵبدەم هەموو ئەمیرەکانی کورد لەناوچەکانی ورمیەو شنۆو دیاربکر هەتا دەگاتە ملاطیە هەموویان والیٚ بکەم قایل بن بچنە ژێر سایەی دەوڵەتی عوسمانیەوەو بەپێی ڕێکەوتن بەڵێن‌و پەیمان‌و مەرجی ئاینی ئیسلام دڵی هەموو لایەکیان رابگرێت‌و دەسەڵاتی کاروباری ناوخۆیان بەدەست خۆیانەوە بیٚ)).

محمد علی عونی، وەرگێڕی کتێبەکەی ئەمین زەکی بۆ عەرەبی، لەپەراوێزی لاپەرە/٧دا وتوویەتی ئەو سلیم نامەیە هی ئیدریسی بدلیسی نەبوە بەڵکو هی محمد أبو فضلی کوڕی ئیدریسی بدلیسی بووەو محمد أبو الفضل ئەو سلیم نامەیەی بۆیە نوسیوە بۆ ئەوەی بیلکێنیٚ بە کتێبەکەی باوکیەوە کەناوی (هەشت بەهەشت)بووەو ئێستە دەسخەتێکی فارسی ئەو کتێبە لە (دار الکتب المصریة)دا هەڵگیراوە.

ئەمین زەکی پاش ئەوە لە لاپەرە/١٦٢بەدواوە چوتە سەر باسێکی چۆنێتی بەستنی ئەمارەتەکانی کورد بە دەوڵەتی عوسمانیەوەو وتوویەتی ((صفوی‌یەکان تەقەلایەکی زۆریان دا بۆ لەناوبردنی هەموو ئەمارەتەکانی کورد بۆ ئەوەی هەمویان راستەخۆ بخرێنە ژێر دەسەڵاتی قزڵباشە شیعەکانەوە، بەلاّم عوسمانیەکان بە پێچەوانەی صفوی‌یەکان بەهۆی هەوڵ‌و کوششی ئیدریسی بدلیسیەوە توانی‌یان کارێکی وا بکریٚ دڵی کوردەکان ڕابگیریٚ‌و کوردەکانیان بەلای خۆیانا داشکان‌و بوون بەلایەنگری عوسمانی‌و ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی سوڵتان سلیمی عوسمانی لەو شەڕەدا ئیدریسی بدلیسی نارد بۆ لای هەموو عەشیرەتەکانی کورد بۆ ئەوەی پەکیان بخاو بە شێوەیەکی یەکگرتوو دژی شاە ئیسماعیل ڕاپەڕین‌و شەڕ بکەن‌و لەدوای شەڕی چاڵدێران خەڵکی دیاربکر ئالاّی شۆڕشیان دژی صفویەکان بەرزکردەوەو نوێنەری شای ئێران لەویٚ کە (محمدخان ئوستاجلو) بوو دەرکراو بانگەوازی دڵسۆزیی خۆیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەربڕی. ئیدریسی بدلیسی کە خۆی ئەمیری بدلیس بوو ئالاّی دەوڵەتی عوسمانیی بەسەر قەڵاّکانی ئەمارەتەکەیدا هەڵکردو (خالد بەگ)ی برای محمد خانی ئوستاجلو کەلەلایەن عەجەمەکانەوە کرابوو بەمیری وڵاتەکە ئەویشیان دەرکردو لەولاشەوە (ملك خلیل)کە میراتگری ئەمارەتی (حسن کێف)و

ـحرد)بوو له بنەچـەی ئەیوبیـەکان بـوو وڵاتەکـەی خـۆی لـەدەس عەجەمـەکان ـگر کرد، هەروەها محمد بـەگی ئـەمیری (سامسـون ناوچـەی هـەزن ــ ئـەرزنی ـیریکری کەوتەوە دەستو سەید ئەحمەد بەگی زرقی بە یارمەتی دانـی خـەڵکی ـیـریکر توانـی هـەردوو شـاری (ئاتـاق ــ عتـاق)و (میـا فـارقین) بخاتــەوە ژێــر ـحسـەلآتی خـۆیو قاسم بـەگ قـەلآی (گیـل)ی داگیرکردەوەو (جمشـید بــەگی ـ.ـیمـی) شـاری (پـالو)ی بـەناوی سـوڵتان سـلیمی عوسمانیـەوە داگــیر کــردو ـەختی بەگ) توانی سەرکردەی هـێزی ئێرانیـەکانو ئەوانـەی لەگـەڵیا بـوون لـە ـریرەی أبن عمر دەریان بکا. ئەمین زەکی لەباسەکەیدا لەسـەری ئـەڕواو ئـەڵێ: ـستێك ئیدریسی بدلیسی لەسەر داخوازیــی سـوڵتان دەچێت بـۆ (حسـن کیـف)، ـحۆێ نامەیەکی پێ ئەگاو لەو نامەیەدا ئاگاداری دەکا ئەوا هێزێك بەسەرکردایەتی محمد پاشای بیقلی = محمد پاشـای سمێـڵ زل) بەرێگەوەیـەو دەگاتـە دیـاربکر کەوا دیارە شـارەکە ئابڵوقـە درابـوو)و ئـەویش ئـەو هەواڵـەی سـوڵتان بـە بـاڵی کۆترێکدا ئەنێرێ بۆ ئابڵووقــە دراوەکـانو بـە گەیشـتنی ئـەوە هـێزو تینیـان تـێ ـمکەوێو زۆری پێ ناچێ لەشــکرێکی دە هەزارکەسـی بـە سـەرکردایەتی (قاسـم ـەگـو جمشید بەگـو حسین بەگ)کە هەموویان لە میرەکانی کورد بوون پەلاماری ـیزەکەی ئێران ئەدەن کەبـە سـەرکردایەتی (قوردیـك)بـوو، لەشـکرەکەی ئـێران ـ.ەشکێو ئەو هـێزەی ئـێرانیش کەبـە سـەرکردایەتی (قرەخـان) لـە دەوروبـەری ـیاربکردا بوو دەشکێو ڕوودەکاتـە مـاردینو بـەیانێك ــ نامەیـەك کەبـە ئایـەتی قورئانو حدیثی پێغەمبەر ڕازێنرابووەوە لـە سـەر پێشـنیازی ئیدریسـی بدلیسـی ـێررا بۆ خەڵکی ماردین کە شتێکی زۆر کاریگەربوو، ماردینیەکان نوێنەری خۆیان کە (سید علی) بوو ناردیان بۆ لای ئیدریسی بدلیسیو داوای لێ خوشبوونی کـرد بۆ خــەڵکی شـارەکەو بـەوجۆرە دەرگـای (مـاردین) کرایـەوەو (قرەخـان) بـەرەو ـناچار رایکردو بەوجۆرە هـەموو ناوچـەکانی کوردسـتان کەوتـە ژێـر دەسـەلآتی عوسمانیەوە.

پاش ئەوەی بدلیسی کاروباری کوردستانی ڕێکخسـتن، بەدەستی خـۆی ئـەو تـەپڵو ئالآیانـەی لەلایـەن سوڵتانەوە بـۆی هـاتبوو هـەمووی دابەشـکرد بەسـەر

ملوك‌و ئه‌میره‌كانی كوردا كـه (ملك خليل)دواكـه‌س بـوو لـه كوره‌زاكـانی صـلاح الدينی ئه‌یوبی ئه‌و خه‌لآت‌و دیاری یه‌ی سولّتانی پیّ به‌خشرابوو.

ئه‌مین زه‌كی له‌باسه‌كه‌یدا له‌و دیاریانه دواوه كه سولّتان ناردبووی بۆ بدلیسی كه بریتی بـووه لـه (٢٥هـه‌زار دۆقـه ئـالّتون) له‌گـه (١٧ئـالآ ـ كـه دیـاره ئـالآی عوسمـانی بـووه)و (٥٠٠خلعـه)، (كـه دیـاره لـه‌وجۆره جبانـه بـووه كــه پیــاوه ئاینیه‌كانی ئه‌و سه‌رده‌مه له‌به‌ریانكردووه) بۆ ئه‌وه‌ی دابه‌ش بكریّن به‌ســه‌ر مـیرو پیاوه ئاینیه‌كانی ناو ئه‌ماره‌ته‌كانی كورد).

ده‌رباره‌ی ئه‌و دیاریانه‌ی سولّتانی عوسمانی ناردبوی بـۆ ئیدریسـی بدلیسـی، دوكتۆر جمال نه‌به‌ز له لاپه‌ره/٨١ی كتێبه‌كه‌یدا سه‌رچاوه/٣١وه‌له په‌راوێزی ئه‌و لاپه‌ره‌یه‌دا وتوویه‌تی سولّتان سلیمی تورك به به‌رتیل‌و ده‌م چـه‌ور كـردن وای لـه زانای كورد ئیدریسی بدلیسی كرد هه‌موو میر نشینه‌كانی كورد هان بدا له ده‌وری ئیمپراتۆریێتی عوسمانی خربینه‌وه‌و پشتگیری لیّ بكـه‌ن‌و ئـه‌و به‌رتیلـه‌ی سـولّتان سه‌لیم دابووی به ئیدریسی بدلیسـی لـه‌و نامه‌یـه‌دا ده‌رده‌كـه‌ویّ كـه ده‌قه‌كـه‌ی بـه‌توركی لـه كتێبه‌كـه‌ی تـاج التواریخـی خواجـا سـعدالدین، جلــدی دوهــه‌م لــه لاپه‌ره/٣٢٢دا چاپی ئه‌سته‌مبولّ سالّی ١٢٧٩ی كۆچی به‌رامبه‌ر ١٨٦٢ی زایین دا باس كراوه.

ئه‌وه‌ی شایانی باسه، محمد علی عونی وه‌رگێری كتێبه‌كه‌ی ئه‌مین زه‌كی لـه لاپه‌ره‌كانی١٧٤و١٧٥ی به‌رگی یه‌كه‌می كتیبه‌كه‌دا ئه‌و نامه توركیه‌ی كردووه به عه‌ره‌بی‌و له‌و په‌راوێزه‌ی محمد علـی عونیـدا ده‌رده‌كـه‌ویّ كـه نامه‌كـه‌ی سـولّتان سه‌لیم له شـاری (ئه‌درنـه)وه لـه رۆژی ناوه‌راسـتی مـانگی شـوالی سـالّی ٩٢١/ی كۆچی به‌رامبــه‌ر بـه سـه‌ره‌تایی سـالّی ١٥١٥ی زایـین نوسـراوه كـه سـالّیك دوای شه‌ری چالّدێران بووه.(له‌باسی هه‌لّسه‌نگاندنی ئــه‌وكاره‌ی ئیدریسـی بدلیسـی لـه كۆتـایی ئـه‌م باسـه‌دا دوبـاره ده‌چینـه‌وه سـه‌ر ئـه‌و ره‌خنانــه‌ی لــه‌و رووه‌وه لــه ئیدریسی بدلیسی گیراوه).

ده‌ربـاره‌ی ئـه‌و رێكه‌وتنـه‌ی سولّتان سـلیمی عوسمــانی‌و میره‌كـانی كـورد له‌رێگه‌ی ئیدریسی بدلیسیه‌وه سریا بدرخان له كتێبه‌كـه‌یدا سـه‌رچاوه/٧٩باسـی هۆی ئه‌و رێكه‌وتنه‌و ماده‌كانی ئه‌و رێكه‌وتنه‌ی به‌م جۆره باسی كردووه.

لەساڵی ١٥١٤دا سوڵتان سەلیمی بەتواناو بەهێز چووبەگژ شاه ئیسماعیلداو
لە ڕێبازەی کە ئەبوایە هێزەکانی عوسمانی پیایا بڕۆشتایە بەرەو هێزی
ئێرانییەکان دەبوایە بەناو خاکی نیوە سەربەخۆو بەهێزی کوردا تێپەڕی بکردایەو
لەم بارودۆخەدا شتێکی ئاسان نەبوو بۆ کوردی بێ لایەن بیێو یا دەبوایە
لایەنگری عوسمانی سونە بێ کە کوردیش سونی بوو یا دەبوایە ببێت بە
لایەنگری ئێرانی شیعە بیێو لەئەنجامدا بوو بەهاوکاری عوسمانیو لەدوای
سەرکەوتنی هێزی تورکو گەڕانەوەی بەناو خاکی کوردستاندا، کوردەکان
بەرپەڕی دەس بلاوییو خواردەبیەوە پێشوازیان لەو هێزە کردو چون بە
دیارییەوەو خلیفەی عوسمانیش بەرامبەر بەوە بەڵێنیدا بە کوردەکان پاڵ پشتیان
بێو ڕێزیان لێ بگریێو سەربەخۆییان بهێڵێتەوە لەناو خاکی خۆیدلو کوردیش
بەرامبەر بەو بەڵێنانە ڕێزیان لەو سوڵتانە گرت لە ڕووی سوپاییو سیاسیەوە.

بەوجۆرە لەساڵی ١٥١٤دا لەنێوان (٢٣) ئەمارەتی کوردو حکومەتی تورکدا
پەیمانێك بەسرا کە ناوەرۆکی ئەو پەیمانە لەلایەن ئیدریسی بدلیسیەوە وەکوو
خوارەوە ئامادە کرابوو:

١ ـ ئەو هەموو ئەمارەتە کوردانەی ئەو پەیمانەیان مۆرکردووە سەربەخۆییان
دەپارێزرێ.

٢ ـ هەموو ئەمیرێك لە ئەمارەتەکەی خۆیدا بە (وراثی ـ پشتاو پشت) دەبێ بە
میر وەیا بە پێی یاسا دەکرێ بە ئەمیرو سوڵتانیش ئەو میرە تازەیە قبوڵ دەکا کە
دەچێتە جێگەی میرەکەی پێشوو.

٣ ـ کورد بەشدارو هاوکاری هێزەکانی عوسمانی دەبێت لە شەڕەکانیا.

٤ ـ حکومەتی تورك ئەمارەتەکان دەپارێزێت ئەگەر هێزێکی بێگانە دەستدرێژیی
کردە سەریان.

٥ ـ میرەکانی کورد لەوباجەی (زەکاتی سالانەیە بە پێی ئاین) کە دەستیان
دەکەوێ، هەموو ساڵێك هەروەکوو دیاری هەندێکی دەنێرن بۆ خەزێنەی خەلیفە.

هەروەکوو ئەمین زەکی لە لاپەرە/١٧٢ی کتێبەکەیدا، سەرچاوە/٣٢ باسی
کردووە، پاش ماوەیەك تورکەکان دەستیان خستە ناو کاروباری ناوخۆی ئەو
ئەمارەتانەو ولایەتی دیاریکرا بە (١٩)سنجاق کە (١١)سنجاقیان یەکسەر

خرانە ژێر ئیدارەی تورکەوەو (٨)یان بە سەربەخۆیی مانەوە کە بریتی بوون لـە: صمغان، قوڵب، مهرانیە، ترجیل، ئاتاق، پرنگ، چیاتچور، چرمیك.

بێجگـە لـەو ئەمارەتانـە، لـەو ویلایەتـەدا پێنـج حکومـەت هەیـە کـە یەکسـەر بەسرابوون بە سوڵتانەوە کە بریتی بوون لە: ئـەگیل، پـالو، جزیـرەی أبـن عمـر، حازو، گنج‌و بە پێی ریوایەتی کتێبی (جهان نما) دوو حکومـەتی تریش خرایـە سەر ئەوانە کە بریتی بوون لـە حکومـەتی (خـابور)و (مالشـکرد)، سـەرۆکی ئـەو حکومەتانە لەپلەی (میری مـیران) دەژمـێران‌و لـەڕووی بـەڕێوە بردنـی کاروبـاری ناوخۆوە تەواو سەربەخۆ بوون.

بێجگە لەو دابەشبوونەی دیاریکر ولایەتی (وان)یش کرابە (٣٧)سنجاق‌و چوار حکومەتی تیادا بووە یەکسەر بەسرابوونەوە بە سوڵتان کە ئـەو چـوار حکومەتـە بریتی بوون لە:

١ ـ **حکومەتی هکاری : هـێزێکی سـەربازیی دوو هـەزار کەسـی هەمیشـەیی هـەبوو لەکاتی شەڕدا دەتوانرا ئەو ژمارەیە بگەیەنرێ بە (٥٠ )هەزار شەڕکەر.**

٢ ـ **حکومەتی بدلیس ـ هێزەکەی ئەمیش وەکوو ئەوەی هەکاری وابووە.**

٣ ـ **حکومەتی محمـودی ـ لـە رۆژهـەلاتی (وان)دابـووە، نزیـك (١٢٠) عەشـیرەتی کوردی تیادا بووە کەبە هەموویـان دەیانتوانی هێزێکی شەش هەزار کەسی پێـك بێنن.**

٤ ـ **حکومەتی (پنیانش) بە تەنیشت حکومەتی محمودیەوە بووەو هێزێکی شـەش هەزار کەسی هەبوە.**

لـە لاپـەڕە/٢٣٤ی سـەرچاوە/٢٤دا ـکورد لای گردلێفسـکی، دوکتـۆر کمـال مەزهـەر باسـی چۆنێتـی بەشـداربوونی ئیدریسـی بدلیسـی کـردووە لـە دژی صفویەکان‌و ئەوانەی سەربەوبوون‌و لەوە دواوە چۆن زۆر بە ڕەقی‌و بێ بەزەییانە کـاری کردووە بـۆ سـوودی سـوڵتانی عوسمـانی، بەتایبـەتی لـەو شـەڕەدا دژی (قزلباش)ەکان کراوە لەناوچەی (ماردین)داو بەپێی فـەرمانی ئیدریسـی بدلیسـی هـەرچی کـلاوو سـەرپێچی قزلباشـە کوژراوەکانیـان کۆکـردەوەو چـاڵێکی قـەراغ شاریان پێ پڕکردۆتەوە.

گردلێڤسکی لەو باسەیدا رەخنەیەکی توندوتیژی لە ئیدریسی بدلیسی گرتـوە بەرامبەر بەو رەفتارەی‌و وتوویەتی:

((پێم وایە ئەوکارەی ملا ئیدریس کردارێکی سـەیری ئـەوتۆبووە پیـاو نـازانێ چۆنـی لێك بداتـەوەو بـەراوردی بکـا لەگـەڵ باوکیـا کـە گۆڕەکـەی لـە بدلیسـەو هەروەکوو بۆیان گێراومەتەوە حسام الدین باوکی مـەلا ئیدریس زۆر بیر تەسك نەبوە بـەڵکو پیـاوێکی ئـاینداری کـراوە بـووەو کـە قورئـانی لێك دلوەتـەوە لای وابووە موسـوڵمان‌و عیسـایی هـەروەکوو یـەك دەچنـە بەهەشتەوەو بـاوەڕی بـە بوونی دۆزەخ بووەو وتوویەتی سزاو ئازاردان لە دۆزەخدا کارێکی کاتی دەبێ‌واتە بـەچاوی (ئـەعراف) سـەیری دۆزەخـی کـردووە)).(ئـەو ووشـەی ئەعرافـە کـە گردلێڤسکی ناوی هێناوە ووشەی (مطهر) یش دەگرێتەوەکە بەو شوێنە دەوتـرێ کە دەکەوێتە نێوان دۆزەخ‌و بەهەشتەوەو ووشەی ئـەعراف لـە قورئانیشـدا بـاس کراوە).

گردلێڤسکی لە هەڵسەنگاندنی بدلیسیدا وتوویەتی مـەلا ئیدریس هاوچـەرخی سوڵتان سلیمی یەکەم بووەو مێژوو نووسێکی ستایشکەر بووەو پیـاوی دەوڵـەت بووە، واتە پیاوێکی سیاسی بووە.

مـارتن ڤـان برونسـونیش لـە لاپـەڕە/ ٢٧٦ی لەکتێبەکـەیدا سـەرچاوە/٧٢ باسـی ئیدریسـی بدلیسـیدا وتوویـەتی سـەردەمێك سـکرتێری (یعقـوب)ی سەرکردەی (ئاق قونیلو) بووەو مێژوونوسێکی لێهاتوو دیپلۆماتیکی کارامە بووەو بە پێی سەرچاوەکان لـەوە ئـەچێ گوێ ڕایـەڵ‌و خزمـەتگوزاری سوڵتان سـەلیم بووبێت‌و سوڵتان زانیوێتی بدلیسی شـارەزاییەکی تـەواوی هـەبوە لـە مەسـەلەی کوردا بۆیە ناردبوی بەشوێنیا داوای لێ‌کردبوو پشتیوانێتی کوردی بـۆ مسـوگەر بکا.

ساتێك کوردەکان ئیدریسـیان نـارد بـۆلای سـوڵتان بـۆ ئـەوەی ئـەو میراتـەی لەباوو باپیریانەوە بۆیان مابووەوە بۆیان بسێنێتەوەو ساتێك سوڵتان لە ئیدریس دەپرسێ ئاخۆ لەناو ئەواندا کامیان شایەنی ئەوەن پلـەی سـەرۆکایەتی پـێ بـدرێ لەوەرامدا ئیدریس پێی دەڵێ هەموویان لەوانەن شـایەنی ئـەوەبن بـەڵام هیچیـان ئامـادەنین سـەر بۆ ئـەوی‌تر دانـەوێنن‌و بـۆ ئـەوەی هـەموویان بەشـێوەیەکی

کارگەرانە لەگەڵ قزلّباشەکانا شەڕ بکەن باشترین شت ئەوەیە ئەو پلەو پایە بەکەسێکی خزمەتگوزاری ئەوتۆی تەختی سوڵتانی بدرێ کە هەموو میرەکان گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی بن (یەعنی ئەوکەسە با لەکورد نەبێ)و لەئەنجامد (بیغلو محمد) کرا بە (بەگلربەگ =میری میرانی کوردستان) هەروەکوو لە شرفنامەشدا باسکراوە، بەوجۆرە کوردە خێڵەکیە جەنگاوەرەکان بوون بەژێر دەستی (بیغلو) محمدو جنراڵە ئێراوەکانی تری سوڵتان لە (قووچ حەسان دەستیان لە قزلّباشەکان وەشانو زۆریان لێ کوشتنو زۆریشیان رایانکرد بۆ ئێران)).

ئەمین زەکی لە لاپەڕەکانی ١٧١ ــ ١٧٢ی کتێبەکەیدا باسی سەرگرتنی تەقەلاکەی بدلیسی کردووە هەرچەند کارەکەی لەگەڵ ئاواتی دوارۆژی کورد یەکی نەگرتەوەو وتوویەتی :

((لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد حەزیان بە سەربەستیو سەربەخۆیی دەکردو ئامادە بوون لەپێناوی خۆیان بەخت بکەن، بەلاّم ئەو هەموو ئارەزوو و خۆزگانە نەیگەیاندنە ئەوەی بیرلە پێکهێنانی ئیدارەیەکی یەکگرتووی مەرکەزی بکەنەوە کە هەمووی بەهۆی ئەو تەقەلایەی ئیدریسی بدلیسیەوە بو کە توانیبوی هەموویان واڵی بکاتو بیخاتە مێشکیانەوە کە بوونیان لەژێر ئالاّی عوسمانیدا لە هەموو شتێك باشترە بۆ دانیشتوانی کورد لەناوچەکانیانا.

ئەمین زەکی لە لاپەڕە/١٧٨ی کتێبەکەیدا باسی باپیری شرفخانی نووسەری شەرەف نامەی کردووە کە چۆن بەهۆی ئەو بوختانانەوە بۆی هەڵبسترابوو. لەترسی سوڵتان سلێمان خانی یەکەم پەنای بردبووە بەر( شاە طهماسب)و بەرامبەر بەوەی ئەو(ئولامە بگ تکەلو) کە پەنای بردبووە بەر ئێرانیەکان گەڕابووەوە بۆلای عوسمانیەکانو کرابوو بە(بەگلربگ ــ میری میران) لە ئەمارەتی بدلیسو حسنکێف داویەوجۆرە سوڵتان سلێمان خان ئەو بڕیارەی هەڵوەشانەوە کەلە زەمانی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا دەربارەی بدلیسو حسنکێف بریاری لەسەر دابوو، شرفخان لەڕقی ئەو پەنای بردبووە بەر ئێرانیەکانو چووبوو بەگژ (ئولامەبەگ)داو تەقەلایدا بچێتە ناوشاری بدلیسیەوە

ـەلأم تەقەلاكـەی بـێ سـوود بـوو شـاە طهماسب بـەخۆیو هـێزێكی گـەورەوە بـەلاماری (وان)ی داو ئابلۆقەی شارەكەی داو صـدری أعظمی عوسـمانی دوجـار هێزی برد بۆلابردنـی ئـەو گەمارۆدانـە، بـەلأم هـەردوو جارەكـە شكاو لـە پـایزی ٩٤/ی كۆچیدا بەرامبەر بە ١٥٢٣ زایین ئیبراهیم پاشـای صـدری اعظم هـێزێكی گەورەی ئامادە كردو لە بەهاری دوای ئەوە ڕووی كردە تەورێزو لە ڕێگایا بیستی شرفخان كوژراوەو (باپیری نوسـەری شرفنامە) لـەجیاتی ئـەو (شـمس الدیـن)ی كوڕی دانرابوو بۆ ئەمارەتەكەو سوپای عوسمانی لەدوای شـەڕێكی خوێنـاوی لـە مانگی محرمی ٩٤١/ی زایین ١٥٣٤ز چوە ناو شاری تەورێزەوە.

### هەڵسەنگاندنی كارەكەی ئیدریسی بدلیسیو ئەنجامەكەی

دەربـارەی بەسـتنی ئەمارەتـەكانی كـورد بـە دەوڵـەتی عوسمانیـەوە چـەند سـەرنجێك دێنە بەرچاو كەئەمەی خوارەوە بەشێكە لەو سەرنجانە

١ ــ راسـتە ئەمارەتـەكانی كـورد زۆرجـار كەوتبوونـە ژێـر بـارو فشـاری سـچوقیەكانو مەغۆلەكان، بەلأم لەگەڵ ئەوەشـدا وەكـوو سـەرچاوەكان باسـیان كردووە جۆرە سەربەخۆییەكی خۆیان هەبوەو زۆرجار بـاری ژیانی مـرۆڤ لـەناو ئەو ئەمارەتـە كوردیانـەدا لەناوچـە تـورك نشـینەكان باشـتربووەو ئـەوكارەی ئیدریسی بدلیسـی بـە بەسـتنی ئەمارەتـەكانی كـورد بـە دەوڵـەتی عوسمانیـەوە جۆرە شەرعیەتێكی دابوو بـەعوسمانی كەلـە دواڕۆژدا بـەئارەزووی خـۆی لەگـەڵ ئەمی ئەمارەتەكانا رەفتار بكا كە هـەندێ لـە نوسـەران لـە ئـەنجامی ئەمـەدا بـە ئیدریسی بدلیسان وتووە (ئیدریسی ئیبلیسی)و دەریـش كـەوت ئـەو ڕێكەوتنـەی لەڕێگـەی بدلیسیەوە كـرا هەرلەسـەرەتاوە گـەرای ناپـاكی تیـادا بـووەو زۆری پێـنەچوە سـوڵتانەكانی دوای سـوڵتان سلیم بـەگ لـەدوای یـەك ئەمارەتـەكانی كوردیان هەڵوەشاندەوەو فەرمانڕەوای خۆیان نارد لەجیاتی میرەكـانی كـورد بـۆ بەڕێوەبردنی كاروباری ناوخۆی ئەو ئەمارەتانە.

سەیر ئەوەیە باپیری شرفخان یەكێك بووە لەوانەی كە كوژرابوو وەكوو ئەمین زەكی باسی كردبووە.

٢ ـ راستە هەڵوێستی صفویەکان بەرامبەر بە کوردی سونی هەڵوێستێکی دوژمنانە بووەو هەرلە سەرەتاوە هەوڵیان دابوو ئەمارەتەکانی کورد هەڵوەشێننەوەو بەڕێوەبردنی کاری ناوچە کوردیەکان بسپێرن بە قزڵباشەکانی سەریە خۆیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەدەبوو ئەمارەتە کوردەکان لەرێگەی بدلیسیەوە سەرو مڕ خۆیان بخەنە ژێر باڵی دەوڵەتی عوسمانیەوە بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە لەجیاتی ئەوە جۆرە هاوکاریەك‌و جۆرە رێکخستنێك ساز بکەن لەناو خۆیانا بۆ ئەوەی کێشێکی لێوەشاویان هەبێت بەرامبەر بە عوسمانیەکان.

٣ ـ گرنگترین پرسیار لەو ڕووەوە ئەوەیە ئایا بۆچی ئەمیرەکانی کورد لەناو خۆیانا ئەگەر بەشێوەیەکی دەوریش بوویێت لەسەر ئەوە ڕێك نەکەوتون یەکێکی کارامە لەناو هەمویانا، وەیا بەنۆرە هەرجارەی یەکێکیان سەرکردایەتی هەموو لایەکی بکردایەو لام وایە ئیدریسی بدلیسی ئەگەر ئەو توانا‌و لێهاتوویی‌ەی لەخۆیدا نەیدیبێ، لام وایە ئەوەندە دەبەنگ‌و گەمژە نەبوە کە نەتوانێت میرەکانی کورد وەکوو چون رازی کردن بچنە ژێر سایەی دەوڵەتی عوسمانیەوە، بەزمانە لووسەکەی دەیتوانی داوایان لێ بکات بیر لە دواڕۆژی خۆیان‌و میللەتەکەیان بکەنەوەو هەوڵبدەن دەزگایەکی تایبەتی دامەزرێنن بۆ ڕێکخستنی هەر کاروبارێك کە پەیوەندی بە هاوکاریکردنیانەوە بووبێ‌و چارەسەری هەر کێشەیەك بکەن کە لەناو ئەمارەتەکانا لەناو خۆیانا پەیدا بێت‌و رێگە نەدەن بە کاربەدەستانی عوسمانی زەفەریان پێ بباو لەناو خۆیانا تێکیان بداو بیانکا بەگژ یەکتردا وەکوو لە راستیدا کردیان‌و سەریش کەوتن و توانیان ئەمارەتەکانی کورد بکەن بە دوژمنی یەکتری‌و لاوازیان بکەن‌و یەك لەدوای یەك بناغەکەیان هەڵتەکێنن.

سەرچاوە شارەزاکان زۆر بەوردی لەو راستیە کۆڵیونەتەوەو چونەتە بنج‌و بناوانی هۆی ئەو نەخۆشیەی وەکوو شێرپەنجە لەدێر زەمانەوە لە کورد کاریگەر بووەو نەتوانراوە ئەو دەمارە بمرێنرێت کە وای لە کورد کردووە کەسیان بە سەرکردایەتی کوردێکی تر قایل نەبێ‌و ئامادەبێ لەژێر سایەی بێگانەیەکدا بێ نەك لەژێر دەسەڵاتی برایەکی کوردی خۆیداو ئەگەر جارویار هەلو دەرفەت بۆ سەرکردەیەکی لێ هاتوی کورد ڕەخسابێ، زۆری پێ نەچوە گەرای میکرۆبی

ئۆوكیەو خۆ بەزل زانین كارێكی وای كردووە لە ناسكترین كاتی مێژوویدا ـەمۆی خۆفرۆشیو خیانەتەوە ئەو هەلو دەرفەتە لەكیس چووە وەكوو لە ئەنجامی هەموو شۆڕشەكانی كوردا ئەم راستیەمان بۆ ئاشكرا بووە.

ماموستا هەژار لە پێشەكیی وەرگێڕانەكەی شرفنامە بۆ كوردی سەرچاوە/٧٥ چەند سەرنجێكی كورتی خستوتە پێش چاو دەربارەی ئیدریسی بدلیسیو ـەستنی ئەمارەتەكان بە عوسمانیەوە وتوویەتی:

((ساتێك ماموستاكەی سولتان موراد (مەبەستی سولتان سەلیمی عوسمانی ـووە كە ئیدریسی بدلیسی لەگەڵیا رێك كەوتبوو ئەمارەتەكانی كورد بخرێتە ژێر ـایەی عوسمانیەوە) دەیفەرموو نەتەوەی كورد لەیەك شتدا توانیویانە یەك ـگرن كە بریتیە لەوەی هەموویان وەكوو یەك ئەڵێن أشهد أن لا ألاه الا اللە، لام ـیە ناشیٚ سولتان نەیزانیبێت خەتی خوار لەبن سەری پیرە گادایەو ئەنگوستی ـولتانو كلكی بابو باپیرانیشی تیادا بووە... هەر ئەو سولتان سەلیمە ـتوویەتی : ئەگەر مێش كێشەی دەناو كەویٚ ئەوسا پیاو دەتوانیٚ تێر بخەویٚ..

هەژار ئەڵیٚ : سولتان دەیزانی كەوڵی خەزو كیسەی پڕ لەپارە ماموستا مەلا ئیدریسی بۆ تاو دەكاو لێی دەپارێتەوە توركێك بكات بە میری میرانی كوردستان ـئەوسا كوردەكان قزڵباشەكانی بۆ دەردەكەن لە كوردستاندا (مەبەستی بیغلو محمدە كە سولتان كردبووی بە میری میرانی كوردستان)، وادیارە مەلا ئیدریس ـوكاتەدا فلوریەكانی (دیارە پارەی ئەو رۆژانە بووە) خستبێتیە ناو كەوڵە خەزەكەیەوە فەرموویەتی :(( بەرێكی من شیرین بار بیٚ.... با بەشی كورد ـمەری مار بیٚ ))، ئەو مەلا ئیدریسەی هەموو كوردی هاوچەرخی خۆی بە پیاوێكی پیرۆزو پایەبەرزیان زانیوە، ئەگەر بە شیری كۆیلەیی پەروەردە ـەكرابایەو تەنها هەر تۆزقاڵێك دەماری كوردایەتی تیادا بوایە كوردەكانی ئیدەگەیانو پێی دەوتن: ئێوە عەجەم لە كوردستان دەركەنو مەبنە نۆكەرو نان خۆری عوسمانیو وەرن با خاوەنی نیشتمانی خۆمان بین، ئەگەر خان بۆخانو ـەگ بۆبەگ سەر ناچەمێنیٚ بامن (ئیدریسی بدلیس) كەیخوداو ریش سپیتان بمو ـە كارتان رابگەمو دەرگاوانێكی كورد لە دەرگاوانێكی تورکو بێگانە ـشترە......

بەڵام ئیدریسی بدلیس بەوجۆرەی نەکرد هەتا بزانین کوردەکانی ئەو رۆژە بەقسەیان دەکرد یاخود هەر گرنەیان لە تورکی دەرگاوان دەگرت؟!

بەرلە کۆتایی هێنان لەم هەڵسەنگاندنەی کارەکەی بدلیس جارێکی تر ئەو سەرنجەی ئەولیا چەلەبی دەکەم بە نموونەی ئەوەی کورد بەرلەوەی بچێتە ژێر سایەی عوسمانیەوە شادمانترو سەربەستترو دەسەڵاتدار بووە وەك لەوەی دوای چوونە ژێر سایەی عوسمانیەوە کە ئەولیا چلبی لە یاداشتەکانی گەشتەکەیدا وتوویەتی:

((میرنشینەکانی کورد بەرلەوەی بچنە ژێر سایەی دەوڵەتی عوسمانیەوە، هەریەکەیان لەرووی گومرگو باج سەندنەوە دەوڵەتێکی راستی بوون، بۆیە پادشای تورکو خانەکانی عەجەمو کاربەدەستانو هەمە کارەکانیان ئەوەیان بۆ قووت نەدەچوو چاویان بەرایی نەدەهێنا میرەکانی کورد ببینن بە پێی دابو دەستووری کۆن باجو گومرگ لە بازرگانو قەڵەمچیەکانیان بسێنن)).

گەڕیدەیەکی تر (بیور) هەروەکوو لە لاپەڕە/١٥٤ی سەرچاوە/٣٢دا باسی کردووە کە لە نیوەی دوهەمی سەدەی هەژدەهەمدا بە کوردستانا گەڕاوە دەربارەی کوردی ئەو رۆژانە وتوویەتی:

((میرو سەروەرانی کورد لەم سەرو بەندەدا بەشێکی زۆر لە دەسەڵاتو هێزو سەربەخۆییو کارامەییو لێ هاتوویی خۆیان بە قازانجو سوودی پادشاکانی تورك لەدەست خۆیان دابوو پادشاکانی تورك لە چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆیانو لە زۆردارێتیو رووتاندنەوەو چەوساندنەوەی دانیشتوانی ناوچەکانی ژێر دەستیان بەولاوە هیچ شتێکی تریان مەبەست نەبوە.

کوردستان وڵاتێکی شاخاویی زۆر بە بەرهەمە، بەتایبەتی لە بەرهەمی مازوو و حەڵوادا (لام وایە مەبەستی گەزۆ بووبێ)، هەموو ساڵێك ئەوەندە گەزۆی کوردستان دەنێررێت بۆ حلبو لەوێشەوە دەنێررێت بۆ وڵاتانو دەگاتە ئەوروپاش کە پیاوی سەری لەو هەموو بەرهەمە سوڕ دەمێنێت جگەلە لۆکەو برنجو توتنو هەنجیرو بۆیاخ کەلە ڕەوگی داروبرەخت دەهێنرێتە بەرهەم لەگەڵ ئاوریشمو بنێشت کەلە بەرهەمە گرنگەکانی کوردستانن.

بیور) له گەشتەکەیدا باسی هەڵویستی کاربەدەستانی تورکی کردووه له
جێکانی ناوچه کوردیەکانو تێکدانی کوردەکان لەناو خۆیاناو وتوویەتی:
بنەماڵەی جزیره هەمیشه لەناو خۆیاندا لەسەر دەسەڵاتدارێتی شیرو تیر
بەیەکتر دەسوونو لەگەڵ یەکتردا نارێکنو پادشای تورکیش کامیان چەورتر
جویه لەدانی باجو خەراجو ناردنی دیاری لەسەر ئەولایەی دەکردەوەو هەمیشه
ـەی کردن بەگژ یەکترداو هەمیشه تۆوی دوبەرەکی لەنێوان بنەماڵەکانی کوردو
ـنێوان کوردە رەوەندو کۆچەریەکانیشدا دەچاند.

# بەشی هەشتەم

## هەڵوەشانەوەی ئەمارەتەکانی باکووری کوردستان

لەبەشی چۆنێتی بەستنی ئەمارەتەکانی کورد بە دەوڵەتی عوسمانیەوەو ئەو ڕێکەوتنەی لەنێوان میری ئەمارەتەکانی کوردو عوسمانیدا مۆرکرا،میرە کوردەکان بێ ئەوەی هیچ سەرپێچیەك بکەن بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی هەموو مەرجەکانی ئەو ڕێکەوتنەیان بەجێهیناو باج و دیاری خۆیان دەنارد بۆ سوڵتانی عوسمانیو لە شەڕەکانی عوسمانیدا بەشداریونو هێزی تایبەتی خۆیان ناردوە، بەڵام تورکەکانی عوسمانی بەپیچەوانەی ئەو هەڵوێستەی کورد، لەجیاتی ئەوەی کورد بپارێزن لە دەستدرێژی کردنی بێگانە کەچی خۆیان بون بە دەسدرێژیکەرو تێکدانی ئەمارەتەکانی کورد.

لەو روەوە گۆڤاری (The Kurds) سەرچاوە ١ باسی ئەوەی کردوە کە لەگەل ئەوەدا کورد لەڕوی کەڵچەرەوەو بەهۆی ئەوەی زمانەکەیان لە زمانی فارسیەوە نزیك بوەو زوربەی نوسینەکانیان بە فارسی نوسیوە (بۆ نمونەی ئەمە نوسینی شرفنامە بەفارسی بەڵگەیەکی تەواوە بۆ ئەو بۆچوونەی ئەم گۆڤارە)، کەچی کورد لایەنگری صەفویەکان نەبوە بەڵکوو چارەنووسی خۆی بەستەوە بە تورکەکانی عوسمانیەوە، بەلام عوسمانیەکان لەوە ترسابوون کوردەکانیش وەکو میللەتە راپەڕیوەکانی باڵقان داوای مافی خۆیان بکەنو لێیان جیا ببنەوە بۆیە یەکە یەکە ئەمارەتەکانی کوردیان هەلوەشانەوەو میرەکانی کوردیان بێ دەسەڵاتکردو بۆشاییەکی بێدەسەڵاتی لەناو ئەو ئەمارەتانەدا پەیدا بوو تاڕادەیەك پیاوە ئاینیەکانی کورد جۆرە دەسەڵاتێکیان پەیدا کردو لەناو خەڵکاو هەندێجار توانیبویان کێشەی نێوان حکومەتو ئاغاو دەرەبەگەکانی کورد چارەسەر بکەن.

مامۆستا رفیق حیلمی لەلاپەرە ٢٤ی یاداشتەکانیا سەرچاوە ٦٥باسی
ـفتاری تورکانی کردوە کە چۆن پاشگەز بوبونەوە لەو بەڵێنانەی بەپێی
ـکەوتنی میرەکانی کوردو سوڵتان سلیم سازکرابوو لەکاتێکدا کورد بەوپەڕی
ـسۆزیو پاکیەوە هاوکاری کاربەدەستانی عوسمانی بونو لە هەموو شەڕو
ـەنگو چەڵەمەیەکدا لەگەڵیان بونو دەستیان خستبوە دەستی تورکەکانو لە
ـرۆهەلاتو رۆژئاوادا لە رێگەی شانو شەرەفی دەوڵەتی عوسمانیدا لەخۆ بەخت
ـردن دوا نەکەوتبوون بەماڵو چەکو بە پارەو بەخوێن یارمەتی تورکیان داوەو
ـیچ گومان نیە لە گۆرستانی کوژراوەکانی عوسمانیا لە ئەفریقاو عەرەبستانو
ـەوروپادا لەبەردەمی بورجو بارەکانی ڤینادا گۆڕی کوردی تیا بەدی دەکرێ کە
ـیسکیان لەناوخاکدایە.

کورد بەرلەوەی لەگەڵ تورکدا یەک بگرێ تامی سەربەخۆییو ئازادی
ـێشتبوو، بەخۆشیو سەربەستی ژیابوو نەیدەزانی (دیل) مانای چیە، جگە
ـەوەش خاوێنی و دڵپاکیی گەورەو تێگەیشتوانی کورد شتێک نەبوو کەبە دڵی
ـورک بوو بێتو جێگەی رەزامەندییان بێ، بەڵکوو ئەمیرەکانی کورد تا زۆرتر
ـێناوی حکومەتەکەی تورکا خۆیان بەخت بکردایەو خوێنیان برژایە زۆرتر
ـەبەر چاوی تورکەکان سوکتر دەبوونو تووشی نوشوستیو تەنگانە دەبونو
ـەجیاتی ئەوەی بە چاوی ستایشو رێزەوە بروانن ئەم میرە کوردانەو قەدریان
ـگرنو نرخێک بدەن بە برایەتییانو رێگەی پێگەیشتنیان لێ نەگرنو ماوەی
ـەولویان بدەن کەچی تورکەکان دەستیان خستە ناو کاروباری ناوخۆی
ـمارەتەکانو ناکۆکیان دەخستە نێوانیانەوەو دەیانکردن بەگژ یەکتر داو بە
ـەموو جۆرێک هەوڵیان ئەدا ئەمارەتە کوردەکان لەناو ببەنو سیاسەتێکی
ـیکاڤیلیيان هەبوو بەرامبەر بە کوردوبایەخیان نەئەدا بە هیچ دەستوورو
ـەیمانێکو ئەم سیاسەتەی تورک لە بنچینەدا لە زەمانی سلێمان کوڕی یاوزەوە
ـەستی پێکرد کە پێیان دەوت سلێمان قانونی، ئەو سوڵتانەی تورکەکان خۆیان
ـێوە هەڵدەکێشاو لە ریزی پادشاگەورەکانیان دەیژمێرن یەکێک بوە لەو جۆرە
ـەسەی چەشکەی لەخوێن رژاندن وەردەگرتو بە هاندانی ژنە بێگانەکەی بە
ـیانوی ئەوەی کوڕە گەورە خۆشەویستەکەی چاوی بڕیبوە شوێنەکەی باوکی کە

وليعهدی خۆی بوو، ئەو کوڕەی بە بەرچاوی خۆیەوە بەجلادەکان بە خنکاندن دا هەروەکو لە کتێبی (قـادینلر سـلطتنی) ی ئەحمـەد رفیقـدا بـە دوورودرێـژ باسـی ئەمە کراوە. رەفیق حیلمی لەیاداشتەکەیدا باسی ڕەوشتی ئەوسوڵتان سلێمانەی کردوە کە هەر رۆژەی بەجۆرێك ئاشووب و فیتنەی دەخسـتە نێـوان ئـەمیرەکانی کوردەوە لە هەموو فیتنەیەکیشدا دەبـوو بەلایـەنگری ئـەو میرەیـان کـەبێ هـێزو بێدەسـەلات دەهاتـە بـەرچاو و بـەوجۆرە یـەك لـە دوای یـەك ئـــەمیرە گـەورەو بەهێزەکانی دەشکان و دەیفەوتاندن، کەچی کورد بەمە تەمێ خواردوو نـەدەبوو هۆشی نەدەهاتەوە بە بەردا، لەبەر ئەوە سوڵتانی دوای سـلێمانی قـانونیش هـەر هەمان سیاسەتیان گرتبوە بەر بەرامبەر بە کـورد، بەتایبـەتی سـوڵتان محمـودی دوهەم لەم سیاسەتە بەتەواوەتی شووڵی لێ هەڵکێشابوو، بەئاشکرا کەوتـە بـیری لەناوبردنی کوردو لەئەنجامی ئەمەدا لەدوولاوە: لە (بۆتان) و (رواندز ئەمارەتی سۆران) لەساڵی١٨٧٠ دا هەڵسان بەلام بەهۆی ناپاکیی نـاوخۆی کوردەکـان ئـەو (دووشۆڕشە گەورەو بەهێزە بەتەواوەتی لەناوبران.

بلەچ شێرکوە لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ باسی ناپاکیی سوڵتانەکانی تورکی کردوە بەرامبەر بە کوردو ئاماژەی بۆ کتێبی (منشات فریدون) کردوە کە بریـتی بوە لە نمونەی ئەدەبیاتی رەسمیی تورك، لەو کتێبەدا باسی فەرمانێکی تیادایـە لەلایـەن سـوڵتان سـلێمانی قانونیـەوە دەرچـوە کـە نـاردویێتی بـۆ والیـی تـورك لـەدیاربکرو لـەو فەرمانـەدا هەڵوێسـتی خلیفـەی ئیسـلام و رەوشـتی ناپـاکی دەردەکەوێ بەرامبەر بەوکوردەی بە ئارەزوو خواستی خۆی و بە دڵێکی پاکـەوە چوبـوە پـاڵ حکومـەتی عوسمـانی کـە ئەوسـوڵتانە لەسـەر پـێڕەوی فارسـەکان میللەتی کوردی بـە (کـورد بدینـهاد) نـاوبردوە کـە ئەمـە مشـتێکە لـە نموونـەی خەرواری رەفتارەکانی تری عوسمانی بەرامبەر بە کورد و بـەوجۆرە ئـەو هـەموو کەلەپوورە بەرهەمی شارستانێتی و ئـەدەبی و زانیاریانـەی لـە کوردسـتاندا پێـك هاتبوو هەمووی لە ناوبراو لە شوێنی ئەوانە قەلاًوینکـەی سـەربازی دروسـتکا بـۆ ئەوەی شوێنەواری ئەو هەموو زانایانـەی وەکـو: ئـامدیو حسـنکێفی و گۆرانـی و ابن المسعود العمادی و ابن الاثیری جزیری مێژووناس و هەردوو براکەی کە (ابن الحاجب) و (قـاضیابن خلکـان) بـون و، دینـوریو ابـن قتیبـەی دینـوری و علـی

حریری و ئیدریس لیسی و (ابی الفضل) ی کوردی و ابن الصلاحی شارەزووری و گەلێك لە زانایان و شارەزایانی تری کورد ناوی هەموویان کوێرییتەوە.

تورکەکان بۆ زڕاندنی ناوی کورد هەمیشە درۆو دەلەسەو بوختانیان بۆ کورد هەڵبەستوەو هەوڵیانداوە کورد بەوە تاوانبار بکەن کە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی هەمووی بە هاندانی بێگانە بوە. بەو جۆرە ناکۆکی و دڵگرمیێ بوونی کورد بەرامبەر بە تورك پەیدا بوە.



قوتابخانەیەکی کۆن لە شاری دیاربکر: لەکتێبی josef strzygowski و max van berchen کە لەساڵی ١٩١٠ دا لە پاریس چاپکراوە (لاپەڕە ٢٠٧ ی کتێبەکە کە لە ئینستوتی خوێندنی کوردی برلیندا هەیە.



فۆتۆکۆپیی قەلایەکی شاری دیاربکر_ لاپەڕە ٢٧٨ ی
کتێبەکەی ئینستوتی خوێندنی کوردی لە بەرلین

دەربارەی هەڵوەشانەوەی ئەمارەتەکانی کورد لەلایەن تورکەکانی عوسمانیەوە، نووسەری کتێبی کوردو عەجەم سەرچاوە ٧٠ لەلاپەڕە ١٥١ د باسی چۆنیتی هەڵوەشانەوەی ئەمارەتەکانی کوردی کردوە لەلایەنی کاربەدەستانی عوسمانیەوە و وتویەتی: ((لەچارەکی دوهەمی سەدەی نۆزدەدا دام و دەزگاکانی عوسمانی تا دەهات زۆرتر لە خەڵك دوور دەکەوتنەوەو بەرمو زورداری و داهێزران و دانۆشین دەچوون و دەوڵەتە ئەوروپاییەکانیش تا دەهات پەیمان و مەرجی گران و سەختیان بە سەردەوڵەتی عوسمانیدا دەسەپان و کەوتبوە ژێر باری قەرزێکی گرانەوەو ئەو دەوڵەتە ئەوروپاییانە بەهۆی بەرەڵلایی و بەرتیلخۆریی کاربەدەستانی عوسمانی توانیبوویان زۆرتر دەست بخەنە ناو کاروباری وڵاتەوە و ئەوانەی پلەوپایەی کاروباری دەوڵەت و خەڵکیا_

ـو دەسپێررا شوێنەکانی خۆیان بە نرخێکی گران لەکاربەدەستە نزیکەکان
ـمی عالی دەکڕی و دەوڵەتی عوسمانی ئەوانەیان لە شوێنی میرەکوردەکان
ـمناو لە ئەنجامی ئەمەدا هەتا ئەهات ژیانی خەڵکی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خراپـترو
ـخۆشتر دەبوو، لەجیاتی کردنەوەی ڕێگاوبانی نوێ و دروستکردنی نەخۆشخانە
ـ قوتابخانەو کارگەو زانستگاو چاپخانەو چاپەمەنی ئەو کاربەدەستانە زوڵم و
ـێن بردە ناو کوردستانەوە و ئەم ئەنجامانەی خوارەوەیان لێ پەیدا بوو.

۱ ـ **کاربەدەستی نەناسراوی نەشارەزا لەجیاتی کابەدەستی ناسراوی ناوخۆ دانرا.**

۲ ـ **دەستکرا بەدامەزراندنی قەڵاو پاسگاو ئۆردوگاو دروستکردنی لە کوردستانا بۆ ـوتانەوەی خەڵك.**

۳ ـ **زۆرکردنی ڕادەی باج و سەندنی سەرانە و بەرتیل.**

٤ ـ **گرتن و دوور خستنەوەو کوشتن و تالانکردن بەبێ لێپرسینەوە.**

٥ ـ **ڕەشبگیریی لاوان بۆ سەربازی بێ گەڕانەوە.**

بەوجۆرە، گۆڕینی دەسەلاتی دەرەبەگەکانی کورد بەدەسەلاتی داگیرکەری عوسمانی کە بەلەشکرکێشی گەورەی درێژخایەن و شەڕو تێکهەڵچوونی خوێناوی ـەبوو بوو بەهۆی ئەوەی باری ژیانی ئابووری و کومەلایەتی و سیاسی لەناوچە کوردییانەدا قورسترببێت و چەوسانەوەی نەتەوایەتیش بوو بەسەرباری)).

لە کۆتایی ئەم باسەدا، نمونەی هەڵوەشانەوەی یەکێك لە ئەمارەتەکانی کورد ـخەینە پێش چاو کە چۆن عوسمانییەکان ئەمارەتی (بۆتان) یان ەڵوەشانەوەو دوکتۆر جلیلی جلیل لە سەرچاوە ۹۳دا باسێکی دوورودرێژی ـەرخان کردوە لەلاپەڕە ۱۰۸دا کە ئەمە کورتەی باسی چۆنێتی تێکدانی ئەو ئەمارەتەیە.

((لە هاوین و پاییزی ساڵی ۱۸۳۷دا سوپای عوسمانی بڕیاری دا پەلاماری کوردەکانی بۆتان بدات چونکە دانیشتوەکانی دژی والی تورك ڕاپەڕیبون و ـمریانکردبوو کەلە دوای داگیر کردنی شاری جزیرە ئەو والیە بۆ (بۆتان) ـێرابوو.

لەو ڕۆژانەدا سوپای تورك زۆر ماندوو بوو، هێزێکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەبوو بتوانێت دەس بەسەر کاروباردا بگرێ و باری (جنرال میرزا پاشا) ی سەرکردەی

هێزەکانی تورك کە بۆ ماوەی (١٨) مانگ شاری (ماردین) ی ئابڵۆقە دابوو هەر بەو جۆرە بوو.

جلیلی ئاماژەی بۆ کتێبێکی (ئەنیسورت) کردوە، لەو کتێبەدا باسی پەلاماردانی هێزەکانی تورکی کردوە بۆ سەر کوردستان بۆ ئەوەی سەربازی تازە لەناو کوردەکانا بۆ سوپاکانی دەوڵەت پەیدا بکاتو بۆ ئەو مەبەستە (حافظ پاشا) پەلاماری (سنجار)ی دا کە دوو ئەفسەری ئینگلیزیش (عقید کونساید)و (نقیب بکیل)و چەند ئەفسەرێکی پروسیش لەناو هێزەکانی تورکدا بون مەشقیان بە سەربازەکان دەکردو لەو پەلاماردانەی حافظ پاشادا سەرەڕای ئەو هەموو گرانیو برسێتیەی لەو ناوچانەدا بڵاو بوبوەوە دڕندەیەتی هێزەکانی تورك لەوپەڕی توندو تیژیدا بوەو کوردەکان لە سەرەتادا بەرگرییان لەخۆیان کرد بەڵام لە دواییدا بەرگەی ئەو هێزە زۆرەی تورکیان نەگرت کە هێرشی کردبوە سەریانو لەو شەڕەدا (١٥)هەزار کورد کوژراو ئەوانی تر ئاوارە کران بۆ رۆژئاوای تورکیا.

دەربارەی ئەو شەڕە وەکو جلیلی ئاماژەی بۆ باسێکی (بوجول) کردوە کە بە چاوی خۆی دڕندەیەتی حافظ پاشای دیوە بەچاوی خۆی کەلەو شەڕەدا لە (ئەرکاخ) کەلە لاپاڵی بەرزاییەکانی (ئالاچاداغ) دا چوار هەزار دیلی کوردی لەبەر سوورە سووری هەتاوی هاویندا دانـاوە کە ژنو منداڵی ڕووتو قوتیان لەگەڵد بوە، بەئاشکرا کە مرۆڤ گوێی لە هاوارو ناڵەی ئەوانە دەبوو دڵی دڵبەردیشی دەتوانەوە. بوجول لە باسەکەیدا باسی ئەو کویرەوەریو بەسەرهاتانەی تۆمار کردوە کە دیلەکان بۆیان گێڕاوەتەوە کە وتوویانە لەماوەی شەش رۆژدا لەنانی رەقی بۆر بەولاوە هیچ خۆراکێکی تریان پێ نەدراوەو ئاوی خواردنەوەشیان تەنکاوی جۆگەیەکی پیس بوەو هەموو رۆژێك (٢٠) منداڵی شیرەخۆرەیان د دەمرنو تا حافظ پاشا ئەو دیلانەی مابوون گەیاندنیە (ملاتیە) ژمارەیەکی زۆریان مردنو (بۆجول) بەچاوی خۆی گوندە وێرانکراوەکانی دیوە بە چۆڵو هۆڵیو لاشەی مردوو لەناو دۆڵەکانا کەوتبوو.

بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو بەسەرهاتەشدا رۆژی ٨ ٨ ١٩٣٧ کوردەکـ ڕووبەڕووی تورکەکان بونەوەو زۆری پێ نەچوو تۆپەکانی تورك لێیان کەوتە کارو

کوردیان ناچار کرد پاشەکشە بکاو (١٥٠٠)کوژراوو برینداریان بەجێ هێشت.

بوجول) لەو باسەیدا ئازایەتی لاوێکی کوردی تۆمار کردوە بەدیلی لەژێر دەستی حافظ پاشادا بوە حافظ پاشا ئەولاوە شۆخ و شەنگە بانگ دەکاتە لای خۆی و پێشوازی لێ دەکا بەهیوای ئەوەی بتوانێ هەندێ زانیاریی بەسودی دەربارەی شۆڕشگێڕەکانی کوردی لێوە دەسگیر بێت و پێی ئەڵێ:

ئەگەر زانیاریەکی تەواوی بداتێ دەیکا بە (عقیـد) لەناو سوپاکەی تورکداو لاوەکەش لە وەرامدا پێی ئەڵێ: ((نەخێر قەد نامەوێ ببم بە سەرکردەیەکی ناو سوپای بێگانەو ئەگەر بەزۆریش بکرێم، بە سەرکردە خیانەت لە میللەتەکەی خۆم ناکەم و ئەوساش هەر دژی تۆ دەبم، لەبەر ئەوە بەتەمای ئەوە مەبە هیچ زانیاریەکت لەلایەن منەوە دەست بکەوێ...... رێکەوت و بەخت کارێکی وای کردوە ئاوا من بکەومە ژێر دەستی تۆوەو تۆش چیت لەدەس دێ بەرامبەرم درێغی مەکە)).

پاشا بەو وەرامە تووڕە دەبێ و فەرمان ئەدا (٥٠٠) قامچی لێ بدەن و لەکاتی قامچی لێدانا کەبەدەما کەوتبوو داوای سەبیلێك دەکاو وادەزانن لە بڕیارەکەی خۆی پەشیمان بۆتەوە، سەبیلێکی بۆ دێنن و سەری بەرز دەکاتەوەو دەست دەکا بە سەبیل کێشان بەبێ ئەوەی وورتە لە دەمیەوە بێ و حافظ پاشا پێی ئەڵێ بۆچی وەرامی پرسیارەکانم نادەیتەوە ئایا گوێچکەت کەرە؟ ئەویش ئەڵێ: قوربان الحمدلله گوێچکەم سوکەو هەموو شتێك بەباشی دەبیستم ... ساتێك حافظ پاشا لێی دەپرسی : ئایا چ جۆرە سزادانێك بەباش دەزانیت کە چارت بکاو وەرامی پرسیارەکانم بدەیتەوە؟ لە وەرامدا لاوە کوردەکە پێی ئەڵێ:

گرانترین و سەخترین سزادانێك ئەوەیە بە چاوی خۆم خائینێکی گلاّو پیسی وەك ئەوەی بەلاتەوە ڕاوەستاوە کە خیانەت لە میللەتەکەی خۆی دەکا دەی بینم... لاوەکە پەنجە بۆ کوردێکی خائینی خۆفروش دەکا کەلە تەنیشت حافظ پاشاوە ڕاوەستابوو، کابرای کوردی خائین دەمانچەکەی هەڵدەکێشێ و دەینێ بەسەریەوەو دەیکوژێ.

جلیلی جارێکی تریش ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (ئەنیسورت) دەکا کە وتویەتی لەگەڵ ئەو هەموو دڕەندەیەتیەی هێزەکانی عوسمانی نەتوانرا کورد واڵێ بکرێت ولز لە خەبات و ڕاپەڕین بێنن.

دوای ئەوە لە بەهاردا حافظ پاشا هێزێك دەنێرێتە سەر (ملاتیە) بۆ ئەوەی شارەکە تالآن بکاو بەخۆراکی ئەو شارە سوپاکەی خۆی پێ بژێنێت و پاش ئەوە پەلاماری کوردیدا لەباشووری گۆلی (وان) دا ئاراستەی ناوچەی (ئەکتشاداغ) و ئەوانەی لە چیای طورۆسدا بون و کوردەکانی ئاکتشاداغ بەوپەڕی ئازایەتیەوە ڕووبەڕووی هێزی تورك بون و دوای چوار ڕۆژ تورکەکان قەلآی (کورناك) یان داگیر کرد و خەڵکێکی زۆریان کوشت لەو ناوچانەو منداڵەکانیان ناردن بۆ ئەستەمبولٚ (بۆئەوەی گەورەبکرێن و پەروەردە بکرین بۆ هێزی ینیچەری (کەلەدواییدا لەباسێکی تایبەتیدا بە دوورودرێژ لێی ئەدوێین)، وژن و کچانیشیان ئاوارەکرد بۆ (ملاتیە) جلیلی لەلاپەڕە ١١١ باسی شۆڕشگێڕێکی کوردی کردوە (سعید بەگ) کە دانی بە دەسەلآتی حکومەتدا نەنابوو بەلآم خیانەتی هەندێ لەسەرۆکە کوردەکان بوو بەهۆی سەرکەوتنی هێزەکانی تورك. تورکەکان هەروەکو لەباسەکانا دەردەکەوێ گەلێ شارەزای سوپایی بیگانەیان بەکرێگرتووە بۆ مەشق پێکردنی هێزەکانی تورك کە یەکێك لەوانە (مولتکە) ی پرووسی شارەزاو ناسراو بووە و سەرپەرشتیکەری هێزەکەی تورك بووە لە دامرکانەوەی ڕاپەڕینەکەی ئەو (سعید بەگ)ـەدا. مۆڵتکە لە یاداشتەکانیا، هەروەکو جلیلی ئاماژەی بۆ کردوە وتوویەتی:

((قەلآکەی سعید بەگ لەسەر چیایەکی لاپالٚ لێژدا دروستکرابوو، ساتێك هێزی تورك ڕوویکردە ئەو قەلآیە سعید بەگ و دوسەد چەکداری دڵسۆزی خۆی لەناو قەلاکەدا خۆیان قایم کردبوو، ئەوکوردانەی لەناو هێزەکەی تورکدا بوون ملیان نەدا پەلاماری هێزەکەی سعید بەگ بدەن و زۆریان ڕایانکردو من (مۆڵتکە) بۆ ئەوەی شارەزای قەلآکەبم بە شەو بە دەوری قەلآکەدا سووڕامەوەو ئەوشوێنانەم دەسنیشانکرد بۆ دامەزراندنی طوپەکان باش بوون و لە ٨ ی ئایاری ١٨٣٨دا هێزی سوارەی تازە هات بۆ حافظ پاشا کە لە حەوت کەتیبە پێك هاتبوو بریتی بوو لە (٤٠٠) پیادەو (١٥٠) سوارو (٨) تۆپ و ڕۆژی ٩ یئایار سوپای تورك دەستی کرد بەطوَپ بارانی قەلآکەو سعید بەگ ناچار بوو خۆی دابەدەستەوە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە پاڕانەوەیەك لەدەمی بێتە دەرەوەو هێزەکەی تورك دوای ئەوە دەستی کرد بە کوشتارو تالآنی. جلیلی دەربارەی ڕق و قین و بوغزی سەرکردەکانی تورك بەرامبەر بە کورد ئەڵێ: توکەکان نەك تەنها

هەر ڕقیان لە دیلەکانی کوردبوو و بێبەزەییانە ڕەفتاریان لەگەڵا دەکردن، بەڵکو قینیان بەرامبەر ئەو کوردانەی لەناو هێزەکەی خۆیانا بوو هی دیلەکان کەمتر نەبوو، بۆیە ئەو شەرکەرە کوردانەیان دەنارد بۆ ترسناکترین شوێنی شەڕەکە کەلەو روەوە مولتکی نوسیویتی:

((زوربەی کوژراوو بریندارەکانی ناو هێزی تورك لەو کوردانە بون کە بوبون ـە لایەنگری هێزەکەی تورك و شان بەشانی ئەوان شەڕیان بۆ حکومەت دەکردو حافظ پاشا دوای داگیرکردنی قەلاگە لەماوەی سێ رۆژدا لەبنەڕەتدا هەڵیتەکان.

پاش دامرکانەوەی ئەو راپەڕینەی سعید بەگ، حافظ پاشا لە حزیرانی ١٨٣٨ ـ هێزی ناردە سەر (موش_خـازو)و سەرکردەی هێزی دیاربکریش چوەپالی و هێزیکی تریش بە ناوی (هێزی تەمێکەر) نێررا بۆ رۆژئاوای باشوری (وان) و ـوناوچانەدا ئەرمەنیەکان و کوردەکان پێکەوە لە ژێر سەرکردایەتی (حاجی ـ ئاغا) دا لە ناوچەی (ساسون) وشوێنەکانی تر بەرەنگاریان بوونەوەو لەو ـەڕەدا کچان و ژنانیش بەشداری یان کردبوو، موڵتکە باسی کچێك دەکا کە چۆن ساتێك تورکێك ویستبووی پەلاماری بدا خەنجەرێکی کردبوو بە تورکەکەدا.

ـیکران) و (راشکوتان) لەناوچەی (غونج) دا لەگەڵ (رجب بگ) و (تیمور بگ) ـەرگریەکی زۆر نێرانەیان کردبوو بەڵام بەوچەك و هێزە کەمەی هەیانبوو بەرگریی ـوپەکانی حکومەتیان پێ نەکرا.

مۆڵتکە لە یاداشتەکانیا بەدورو درێژ باسی درندەیەتی و تاوانەکانی تورکی ـو شەڕانەدا بەم جۆرەکردوە:

((لەگوندێکدا زوربەی دانیشتوەکانی سەربڕان و من کە لە بەرزاییەکانەوە سەیری شەڕەکەم دەکرد، چاوم لێ بوو خوێن لە لەشی پیاوو ژن دەتکاو منداڵی شیرەخۆرەو ساوا گوێچکەیان بڕابوو، ملیان پەڕێنرابوو، سەربازەکانی تورك، ـولەیان کە ئەوتاوانکارییەیان پێ سپێررابوو هەریەکەیان (٥٠ –١٠٠) قروش حەلاتی وەردەگرت. دیمەنی ئەوتاوان و کارەساتەی بەسەر پیاوو ژن و منداڵی کوردا دەهات دیمەنێکی ئێجگار سەخت بوو دڵی دڵبەردی ئەتوانەوە... خۆزگەر ـسی ئەو ڕووداوانە بلاونەبوایەتەوە و نەبوایە بە باسێکی دوەلی، لەوانەبوو حافظ ـشا واز لەو رەفتارەی خۆی نەهێنێت)).

## بەشی نۆهەم

## سەرەتاکانی بزووتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد

لە باسەکانی پێشوودا، بەتایبەتی لە دەسپێکردنی پێوەندیی کورد بەدەوڵەتی عوسمانیەوە بە دوورودرێژ باسی ئەوە کراوە چۆن میللەتی کوردی موسڵمان یەکێك بوە لەو میللەتە سەرگەرمانەی هەموو تواناو دەسەڵاتی خۆی بۆ پاراستنی ئاینی ئیسلام و بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام تەرخانکردوەو خەلیفەکانی عوسمانی بەناو ئیسلام تا ماوەیەکی زۆر توانیبویان دەسەڵاتدارانی کوردو سەرکردەو پیاوە ئاینیەکانی بکەن بەوابەستەو هاوکاری خۆیان و چەواشەیان بکەن و بیچەسپێننە دڵ و مێشکیانەوە کە بیرکردنەوە لە جیابوونەوە لە دەولەتی خلیفەی عوسمانی ئیسلام تاوانێکی گەورەیەو لادانە لە ریبازی ئاینی ئیسلام.

بەڵام ساتێك دەستی خلیفەکانی عوسمانی وردە وردە کەوتەڕوو ئیتر ئەوپەردەو ئیسلامەتیەی ڕووی ڕاستی خۆیان پیٚداپۆشیبوو هەڵماڵرا، کوردیش وەکو میللەتانی تر کەوتە خۆیو هەوڵیدا وەکو ئەوان خوی رزگار بکا لەودەوڵەتەی رۆژ بەڕۆژ بەرەو داوەشاوی ملی ئەناو هەست و بیری نەتەوایەتی لە مێشکیا چەکەرەی کرد.

بۆ ئاسانکردنی ئەم باسە، وامان بەباش زانی بیکەین بە دوویەشەوە:

**١- بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردو هۆکانی.**

**٢- رۆڵی زانایان و رۆشنبیرانی کورد لە بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتیدا.**

لە دوای ئــەوەی دەســتی کاربەدەســتانی عوسمــانی بەرامبــەر بــە کــورد ئاشکرابوو، دەســتیانکرد بــە تێکدانــی ئەمارەتــەکانی کورد یــەك لــەدوای یــەك و هەموو کاروباری ناو ئەمارەتەکانیان خســتە ژێــر دەســتی خۆیــان و دەســتیانکرد بەزەبرو زەنــگ نوانــدن بــۆ چاوترســاندنی کــورد بــۆ ئــەوەی کوردیــش وەکــو میللەتــەکانی رۆژهــەلاتی بالقــان بــیر لــە جیابوونــەوە نــەکات و ئــەنجامی ئــەم هەڵوێستە بــەوە گەیشــت کــورد خــۆی پــێ نــەگیرێ و هــەولێدا وەکــو میللەتــە داگیربووەکان هەمان رێبازی ئەوان بگرێتە بەر و ئــەتوانین چۆنێتــی و هــۆی ئــەو بزوتنەوەیە لە چەند خاڵێکدا دەسنیشان بکەین:-

١- سەندنی باج و سەرانەی زۆرو بێکاری کاربەدەستانی حکومــەت و بــەرتیل خۆرینی کاربەدەستانی تورك لەناوچە کورد نشینەکانا.

زوربــەی ئــەو ســەرچاوانەی باســی بــاری ئــابووریی ئــەو رۆژانــەی دەوڵــەتی عوسمانییــان کــردوە هــەموویان باســی رەفتــاری کاربەدەســتانی عوسمــانی، بەتایبــەتی ســەرکردەکانی نــاو سوپایان کــردوە کــە لەکوردســتان بەوپــەڕی بــێ بەزەیینیەوە باج و سەرانەیان لە خەڵك سەندوەو پلەی ژیانی دانیشتوانی کورد بــە هۆی ئەمەوە لەوپەڕی نزمیدان.

جلیلی لەلاپــەڕە ١٦٥ی کتێبەکــەیدا ســەرچاوە ٦٣ ئامــاژەی بــۆ کتێبــەکانی ی.ن.بیریزین) و (ف.ف.ودیتیل) کردوە کە هەریەکەیان باسی سەرانە سەندن و بەرتیلخۆریی کاربەدەستانی عوسمانییان کردوە لە کوردستاناو (رادوڤان باڤیچ) لەلاپــەڕە ٤٩ی کتێبەکــەیدا ســەرچاوە ٥٩ لەباســی ئــابووریی کوردســتانا لــەژێر سایەی کاربەدەســتانی عوسمــانبدا کــار گەیشــتبوە رادەیــەك خــەڵك بــە تــەواوی ژیانیان لێ تــاڵ بــوەو ناچــار بــون بــیر لــەوە بکەنــەوە دژی حکومــەتی عوسمــانی ڕاپەرن بۆئەوەی خۆیان لە جەورو ستەمی کاربەدەستانی تورك رزگار بکەن.

٢- بێجگــە لــە میللــەتی کــورد، میللــەتانی تــری ژێــر دەســەلاتی عوسمــانی، بەتایبــەتی میللــەتانی نــاو بالقــان دژی جــەورو ســتەمی کاربەدەســتانی تــورك ڕاپــەڕیبوون و دەنــگ و بــاس و هــەواڵی ئــەو راپەڕیوانــە دەگەیشــتە نــاو کوردستانەوەو رۆشنبیران و پیاوە ناسراوەکانی کورد دەیان بیستەوە چۆن ئــەو

میللەتانە سەربەستی و ئازادی خۆیان دەسگیربوبوو، کوردیش ئەو هەواڵانە کاری تێکردبوو هەستی نەتەوایەتی کورد لەزۆر شوێنی کوردستاندا پەرەی سەندبوو.

بۆ نموونە هەروەکو (ئەرشاك سفرستیان) لەو باسەیدا لە ژمارە ١ی نیسانی ساڵی١٩٦٠ی گۆڤاری رۆژی نوێدا کە لە سلێمانی دەرچوە، ئەو باسەی سفرستیان لەلایەن عبداللە شاڵیەوە کراوە بە کوردی و لەوباسەدا باسی کارتێکردنی شۆڕشی ئیبراهیم پاشای میصری کردوە دژی تورکەکان و کوردیش بە هۆی گەیشتنی هەواڵی ئەوشۆڕشە بۆ کوردستان کەوتنە خۆیان و دەستیانکردوە بەجم و جۆڵ و هەواڵی شۆڕش و ڕاپەرینی یۆنانیەکانیش دژی حکومتی تورك بە تەواوی دەگەیشتە کوردستان و کوردیش وەکو یونانیەکان بیریان لەوە کردەوە باج و سەرانە نەدەن بە حکومەت و خۆیان ئامادە بکەن بۆ شۆڕش.

صلاح بدرالدین لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٢٧ باسی هەڵوێستی هەندێ ئاغاو دەرەبەگی کوردی کردوە کە هاوکار بوون لەگەڵ حکومەتدا بۆ کۆکردنەوە و سەندنی سەرانەو باج و لە ئەنجامی ئەمەدا ووردە بۆرجوازیی کورد کە بریتیبون لە خوێندەوارو رۆشنبیرانی کورد هەستی بەو بارە نالەبارەی کوردستانی کردبوو، بەپەرۆشەوە هەواڵی ڕاپەرین و شۆڕشی ئیبراهیم پاشای میصری و یۆنانیەکانیان دەبیستەوەو ئەمانە هەمووی بوبون بە هاندەرێکی بەهێز بۆ پەرەسەندنی بێزاری و ناڕەزایی لە ناوچینەکانی کوردستاندا و هەستی نەتەوایەتی کارێکی وای کردبوو ئەوخوێندەوارو رۆشنبیرانە لەناو جەماوەری کوردا هەستی کوردایەتی ببزوێنن دژی داگیرکەرانی کوردستان.

٣- جەورو ستەمی کاربەدەستانی تورکی طورانی و کوشتار لەناو کوردو ئەرمەنیدا:

لەگەڵ ئەوەشدا تورکەکان بە رواڵەت بوبون بەئیسلام و ئاڵای ئاینی ئیسلامیان هەڵگرتبوو، بەڵام دەماری رەگەز پەرستی و لووت بەرزی و خۆبەزل زانین و لەزەت وەرگرتن لە کوشتارو تاڵانی شتێك نەبوون کە ئاینی ئیسلام بتوانێت ئەورەفتارە پڕ لە دڕندایەتیەی تورك لە ناوببا و دەماری رەگەز پەرستی کاربەدەستانی تورك بمرێنێت و لە باسەکانی داهاتووداو لە کوشتاری کوردو

ـەمەنی و ئاسووری و میللەتانی تر لەلایەن تورکەوە بە دوورودرێژ ئەو راستیە ـتە بەرچاوو پێویست ناکا لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

جلیلی لەلاپەرە ١٦٥ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٩٢ چەند نموونەیەکی بۆ ـدەمیەتی کورد باس کردوەو یەکێکی وەکو (بێرزن) لە کتێبەکەیدا باسی ـەرکردەیەکی تورکی کردوە (محمد پاشا) کە لەهێرشێکیدا پاش گەڕانەوەی ـەر دەرگاکانی شووری شارە کاولکراوەکانا ژمارەیەك گوێچکەی بڕاوی ـەوەکانی دادەنا بۆ ئەوەی ترس بخاتە دڵی کوردەوەو واز لەشۆڕش و یاخی ـەی بێنن.

مۆلتکە لە یاداشتەکانیا هۆی راپەڕینی کوردەکانی خستۆتە ئۆبالی ـەدەستانی تورك وەکو رشید پاشاو حافظ پاشا کە بەوپەڕی دڵڕەقی و بێ ـەیەوە هەڵس و کەوتیان لەگەل کوردا کردوەو باج و سەرانەی زۆرو بێ ـەیان لە خەڵك سەندوەو شاری (سعرد) ی هێناوەتەوە بۆ نموونە کە ژمارەی ـیشتوانی ئەوەندە کەم بوبوەوە کە لە (٦٠٠) خێزان تیپەری نەدەکرد کەچی ـوی (٢٠٠) کەسیان دەکرد لە خەڵکی شارەکە بکرێن بە سەربازو کار گەیشتە ـدەیەك ژمارەیەکی زۆریان ناچاربون رایانکردو شارەکەیان بەجێ هیشت.

**دوهەم: رۆلی زانایان و رۆشنبیرانی کورد لە بزواندنی هەستی نەتەوایەتیدا**

زاناو رۆشنبیرو نوسەرو خوێندەواری هەموو نەتەوەیەك، هەریەکەیان بە پێی ـوناو لێ هاتوویی خوی دەتوانی رۆڵێکی گرنگی هەبێ لە خزمەتکردنی وڵات و ـیللەتەکەی خۆیدا و دەورێکی کاریگەری هەبێ لە بزواندنی هەستی نەتەوایەتی ـناو هاوولاتیەکانی خۆیداو هەریەکێك لەوانە لە قۆناغێکی تایبەتیدا بە هەڵگری ـشخەڵ و ئالای میللەتەکەی خۆی دەژمێرێت. لەناو کوردەواریی خۆشمانا گەلێك زاناو مێژوونوس و رۆشنبیرو خوێندەواری لێ هاتوو هەبوەو بەرهەمی ـسوودو بەنرخیان لە پاش بەجێماوەو تا رادەیەك توانیویانە کەم تا زۆر شتێك ـدربارەی مێژووی بەسەرهاتەکانی سەردەمی خۆیان تۆمار بکەن. بەداخەوە ژمارەی ئەم جورە کەسانە کەم بون و بە شێکی زۆریان خزمەتی زمانی بێگانە و

ئەدەبی بێگانەو مێژووی بێگانەو خزمەتی شارستانێتی و رۆشنبیریی میللەتانی تریان کردوەو ژمارەیەکی کەمیان مشووری ئەوەیان خواردوە خزمەتی میللەتەکەی خۆیان و ولاتەکەیان بکەن و بۆزمانی باوو باپیریان بەرهەمەکانیان تۆمار بکەن.

لاپەڕەکانی مێژووی ئەدەب و زمانەوانی و کۆمەلایەتی ئەو میللەتانەی دراوسێی کوردبون یا کورد تێکەڵیان بوە یا هاو ئاینیان بوە، ژمارەیەکی زۆری کورد لە خزمەت ئەو میللەتانەدا بوە و بەزمانی ئەوان بەرهەمەکانیان تۆمار کردوە و لەناو کتێب و دەسنوسەکانی ئەو میللەتانەدا بە دەیان ناوی کوردی زاناو شاعیرو مێژوونوس دەبینرێ ئەگەرچی ئیمرۆ دان بە بوونی ژمارەیەکی کەمیانا دەنرێ کە بەرەگەز کوردبووبن و بەو جۆرە خویان و بەرهەمەکانیان بوون بە میراتی ئەو میللەتانەو هیچ حسابێکیش بۆ میللەتی کورد نەکراوە و بێگانەکان، بەتایبەتی ڕەگەز پەرستەکانیان بە هیچ جۆرێك دان بەوەدا نانێن کە ئەوانە کوردبوون.

بێگومان کاتێك میللەتێك دەبێ بەخاوەنی بەرهەمەکانی خۆی کە خاوەن دەسەلات و پارە دار بێو دەوڵەتێکی رەسمیی خۆی هەبێت کە بایەخ بدا بە زمانەکەی و مێژووی نەتەوەکەیو بە تۆمار کردنی باری کۆمەلایەتیو ئەدەبی میللەتەکەی، بەلام بەداخەوە کورد لەکاتی خۆیدا هەموو ووزەو توانای خۆی بۆ عالەمی ئیسلامی تەرخانکردوەو ئیجگار کەمتەرخەم بوە بەرامبەر دوارۆژی میللەتەکەی خۆیو ئیمرۆ نەوەی ئیمرۆی کورد باجی ئەو کەمتەرخەمیەی باووباپیرانی ئەداو نەبوونی حکومەتێکی کوردی ڕێگەی بۆ ئەوە خۆش نەکردوە بایەخ بە زمانی رەسمیی ئەو حکومەتە بدرێو ڕێز لە زاناو مێژونوسو شاعیران بەجۆرێکی ئەوتۆ نەگیراوە زەمینەیەکیوا خۆش بکرێ بۆ هاندانی لێ هاتوەکانی کورد بە زمانی خۆیان شت بنووسنو بلاوی بکەنەوەو بۆ ئەوەی بتوانن بەرهەمەکانیان برەوی پێ بدرێ بە زمانی ئەو میللەتە دەسەلاتدارانە شتیان تۆمارکردوە کە حکومەتیان هەبوەو پادشاو مەلیكو وەزیرو کاربەدەستانی گەورەیان هەبوویت لەوانەی کە دەسەلاتی پارەداریو بەخشینو دامەزراندنی خەلکیان هەبوویێت لەو پلەو پایانەدا کە شایانی ئەو کەسانە بووبێ.

لەگەڵ ئەوەشدا رووناکبیرو خوێندەوارو رۆشنبیری کوردی واهەبوە، ئەگەرچی بەزمانەکەی خۆشی شتی نەنووسیبێت، بەڵام بەو زمانی بێگانەیەی کە پێی نوسیوە توانیوێتی شتێك دەربارەی وڵاتەکەی و هاووڵاتیانی خۆی و مێژووی نەتەوەکەی خۆی تۆماربکات کە ئەمانە شتێك بوون نەتوانراوە لەلایەن بێگانەو دوژمنانی کوردەوە دیزە بەدەرخۆنە بکرێن ئەگەرچی زۆرجاریش تەقەلای ناویردنیان دراوەو نووسەرەکانیان راونراون و ئاوارەو دەربەدەرکراون.

لەم بەرگی یەکەمەدا، وەکو وەفادارییەك، بە پێویستم زانی بەکورتی یادی هەندێ لەو نوسەرو رۆشنبیرو شارەزا کوردانە بکەم کە خزمەتی نەتەوەی خۆیان کردوە.

بەرلەوەی بچمە سەر باسی ئەو زاناو مێژونووس و شاعیرانەی کورد، حەزم کرد بۆچوونێکی ئیمامی غزالی بخەمە پێش چاو کە ماموستا هەژار لە لاپەرەی پێنجەمی ئەو پێشەکیەی بۆ مەلای جزیری تەرخانکردوە باسی کردوە کە ئیمامی غزالی فەرموویەتی :

((دینی ئیسلام لەسەر سێ ستوون وەستاوە، ئەگەر خودا ئەو سێ کۆڵەکەیەی نەدابایە لەوانە بوو ئەو دینە تیك بتەپێ کە ئەم سێ دیرگە ئەستورانەش بریتی بون لە (دینەوەری)و (ئامیدی)و (شارەزوری) کە هەرسێکیشیان هەرکورد بون). بێجگە لەوانە، کام موسوڵمانی نەخوێندەوار هەیە هەرکوێرە سیوادێکی (خەت) هەبێ، ناوی پیاوی بەناوبانگی وەکو (أبن خلکان)و (أبو الفیدا)و (أبن حاجب)و (أبن الصلاح)و هەرسێ (أبن ئەثیر)ەکانی بلیمەت و سەدان (أبن ئەیوب)ی نەبیستبێ کە هەموویان کورد بون و بە عەرەبی نوسیویانە؟؟ کام دەشتەکی و شوانە وێڵەی نەخوێندەوار لە هەموو دنیای ئیسلامدا دەست دەکەوێ کە ناوی (أبن سیرین)ی نەبیستبێ جگە لە زانایانی تری وەکو ملاعبداللەی بێتووشی و أبن الحاج و أبوبکری مصنف و مەلاجامی کە هەموویان بوونە مایەی شانازیی عەرەب و پێشرەوانی موسوڵمانان لە دواییدا، لە باسی شرفنامەدا سەرنجێکی وردی ــ یوسف ئەبکارە ڤیچ ــ دەخەینە پێش چاو کە باسی ئەو کوردانەی کردوە بەبەرهەمەکانیان خزمەتی بێگانەیان کردوە).

**١ ــ علي ترموكي :**

ئـەمین زەكـی لەلاپـەڕە ٣٣٣ كتێبەكـەیدا سـەرچاوە ٣٢، بـەرگی یەكـەم دا وتویەتی علی ترموكی یەكێك بـوە لـەو دوو مامۆسـتا بـەرزەی ئـەدەبیاتی كۆنـی كورد كە ناویان لە ئەدەبی كوردیدا زۆر بـەرزە. علـی ترموكـی خـەڵكی گوندێكـی زۆر بچوك بوە (ترموك) لەنیوانی (ماكۆ) و (هەكاری) دا (بەڵام بلەچ شێركۆ لە كتێبەكەیدا سەرچاوە ٦٠ وتوویەتی لە ساڵی (١٠٠٠ی كوچیدا) لە گوندێكی نێوان هەكاری و مكس دا لەدایك بوە).

علی ترموكی یەكەم نووسەری كورد بوە دەستوری صرف و نحوی داناوە كـە بوە بە بناغـەی صـرف و نحـوی ئێسـتە و لـە یاداشـتێكیدا باسـی ئـەو گەشـتەی كردوە كە بەهەندێ شوێندا گەڕاوەو ناوی شوینەكانی تۆمار كردوە.

كتێبی دائره المعارف الاسلامیه كە باسـی ئـەو دوو بەرهەمـەی علـی ترموكـی كردوە نەیوتوە ئـەو دوو بەرهەمـە بەنرخـە لـەكوردیدا بـوون، بـەڵام لەوكتێبـەی كـامران بدرخـان و لوسـی پـول مـارگرێت بەجووتـە، بـەناوی (الامثـال الكردیـة) بەفرنسی چاپیانكردوە لەوەدا ترجمەی چەند شعرێكی علی ترموكییان كردوە بە فرنسی و بلاویان كردوتەوە و لەوەدا دەردەكەوێ ئەدەبی كۆنی میللەتی كورد لە چ پلەیەكی پێشكەوتووی بەرزدا بوە و خاوەنەكەی چ هەستێكی بە سۆزو ناسكی هەبوە.

ئەوانەی لەدەمی كامیران و لوسی پـول مارگرێتـەوە بـلاو كراونەتـەوە وەكـو: (ووشەیەك)، (لاوانی نیشتمان)، (ملوانكەی یاقووت)، (ئەگەر ژیـان خەوبوایـە)، دەری ئەخـەن ئـەدەبی كـوردی لـەو سـەردەمەی علـی ترموكیـدا لـە چ پلەیـەكی بەرزدابوە.

دەربارەی ئەو بەرهەمـەی كـامران و لوسـی پـول مـارگرێت كـە ئـەمین زەكـی باسی كردوە، لەبیرم دێ لە ناوەڕاستی ساڵانی چلەكانا ماموستا رفیق حلمی ئەو كتێبەی لە فرەنسیەوە كردبوو بە عەرەبی و منیش لە سـاڵانی پـەنجاكاندا چـەند شیعرێكی علی ترموكیـم لـەو وەرگێڕانـەی ماموسـتا رفیـق حلمیـەوە كردبـوو بـە كوردی كەوەكو لە بیرم مابێ یەكێكیان ئەو شعرەی (ملوانكەی یاقووت) بوو كـە بەم دێڕە دەستی پێكردبوو:

پەری خان... ووشەی زمانی کوردی هەمووی یاقووتە
ملوانکەیەکت بۆ لێ بهۆنمەوە مەعدەنی ڕووتە

بەلاّم ئەودەسخەتەم لەگەلّ هەموو کتێبەکانی ترمدا لەکاتی کۆچڕەوەکەی ـڵی ١٩٩١ دا لە سلێمانی هەمووی لەناو چوو کتێبی باشم لە کیس چوو.

٢ـ مەلای جزیری

دەربارەی مەلای جزیری، ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٣٢ وتوویەتی ـوی شێخ ئەحمەد بوەو لە شاری جزیرەی ابن عمر لە دایک بوەو لە نیوەی ـوەمی سەدەی شەشەمی هجریدا ژیاوەو بە زۆری لەوە دەچێ لە زەمانی عماد الدین زەنگی)ی ئەتابکی موصلّی بەناوبانگدا ژیابێت و دیوانێکی شعری ـنە بەرزی بەجێ هێشتوە کە شێوەی زمانەکەی هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەلّ ـمانی قسە پێکردنی ئێستەی ناوچەی (بۆتان) و بۆ یەکەم جار دیوانەکەی ـسالّی ١٣٢٢ ی کۆچی بەرامبەر بە ١٩٠٤ ی زایین لە (برلین) چاپکراوە و ـنەیەك لەو دیوانە چاپکراوە لە کتێبخانەی (الاب انسطاس کرملی) دا هەیە ـبغداد کە ناوەڕۆکی شیعرەکانی لەوپەڕی بەرزیدایە. (ئەمین زەکی لە ـنەکەیدا نەیووتوە کەی کۆچی دوایی کردە، بەلاّم بلەچ شێرکۆ لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ وتویەتی مەلای جزیری لە سالّی ١١٦٠ ی زاینی دا لەدایك بوە) ئەو ـوانی شیعرەی ملای جزیری کە ئەمین زەکی باسی کردوە، ماموّستا هەژار ئەو ـوانەی بەناوی (دیوانی عارفی رەبانی شێخ ئەحمەدی جزیری کە مشهورە بە مەلای جزیری، بێجگە لە پێشەکیەك کە بۆ ژیانی مەلای جزیری تەرخانکردوە، هەموو شیعرەکانی بە شێوەی کرمانجی خواروو لیکداوەتەوەو لە سالّی١٣٦١ ی کۆچیدا لە تاران چاپی کردوە.

هەژار لە لاپەڕە ١٥ی پێشەکیەکەیدا باسی دەسخەتێکی کردوە کە علاءالدین سجادی لەباشووری کوردستاندا دیویّتی کە ئەوە دەسخەتە لەسالّی ١٣٢٢ ی کۆچیدا نوسراوەو لەوەدا وتراوە شاعیری بەڕێزی جزیرە هاوزەمانی سولّتان

محمدی فاتح بوەو بەپێی ئەوە دەبێ لە پیاوە ناودارەکانی سەدەی نۆهەمی کۆچی بووبێ.

هەژار لەلاپەڕە ١٧ی پێشەکیەکەیدا دووبارە ئاماژەی بۆ بۆچوونێکی تری علاءالدین سجادی کردوە کە وتویەتی دەسنووسێکی تری دیوانی جزیری دەست کەوتوە کەلە سالّی ١٣٣٨ ی کۆچیدا پیاوی ناودار عبدالقادر ئامیدی نوسیویتی و لەپێشەکیەکەیدا دەربارەی مەلای جزیری وتراوە:

((جزیری ناوی ئەحمەدە و فرزەندی شێخ محمدە و لەسالّی ١٤٠٧ی زاین لەشاری جزیری بۆتان لە ناو بنەماڵەیەکی هۆزی بوختی (کەمەبەست بۆتان _ بوهتانە) چاوی بەژیان هەڵهێناوەو لای باوکی خوێندویەتی و بوە بە مەلایەکی شارەزاو گەلێك مەلای پایە بەرزی پێگەیاندوەو هەتا سالّی١٤٨١ ی زاین ژیاوە بە پیێ ئەمە (٧٤) سالّ ژیاوەو لەشاری جزیرەدا نێژراوە)).

لەراستیدا ئەمەی علاءالدین سجادی باسی کردوە دەربارەی دەسنووسەکەی عبدالقادر ئامیدی لە گەلّ بۆچوونەکەی بلەچ شێرکۆو ئەوەی ئەمین زەکیدا یەك ناگرێتەوە دەربارەی سالأنی لەدایك بوون و کۆچی دوایی مەلای جزیری.

بەلأم هەژار لەلاپەڕە ٢٣ یپێشەکیەکەیدا بۆچوونێکی جیاوازی هەیە دەربارەی ساتی ژیانی مەلای جزیری و وتوویەتی:

((ئەگەر ژابا، فون هارتمانی ئەلّمانی (ئەوەی لە سالّی ١٩٠٤ دا دیوانی مەلای جزیری بۆ یەکەم جار چاپکردووە)، یا ئەمین زەکی و بلەچ (مەبەست بلەچ شێرکۆ. جلادت بدرخانە)، محمدعلیعونی و مامۆستا علاءالدین بەرلەوەی ژین نامەی جزیری بنوسن، ئەگەر دیوانەکەیان بەووردی خوێندبایەوە، تەنیا ئەو شیعرەی باسی تیرەکانی خان شەرەف بەس بوە بۆ ئەوەی بۆیان دەربکەوێ مەلا لە چەرخی یازدەدا زیندوو بوە و ئەو گۆڕەی مەلای تیا نێژراوە ژێرزەمینی مزگەوتێکە کە خان شرفی جزیری لە پاش هەزارەی کۆچی سازیداوە.

**٣ـ فەقێ تەیران**

بەپێی لاپەڕە ٣٣٦ ی کتێبەکەی ئەمین زەکی، بەرگی دوهەمی سەرچاوە ٣٢، فەقێ تەیران خەلّکی (ماکۆ) بوە لە سالأنی ١٣٠٧ ی زاین بەرامبەر بە سالّی٧٠٧ ی کۆچی ژیاوە هەتا سالّی ١٣٧٥ ی زایین بەرامبەر٧٧٧ یکۆچی.

حیتی ئەمە دەبیٚ ماوەی (٦٨) ساڵ ژیابیٚ، کە بە نازناوی (م.ه) شتی نوسیوە
. بڵاوی کردوەتەوە کە ناوەڕاستەکەی (محمد) بوە. فقی تەیران جگە لە
ەرەیەکی زۆری شیعر دوو بەرهەمی زور بەناوبانگی هەبوە. یەکەمیان:
جیرۆکی شێخ سنان زۆرسەرچاوە بە شێخی سەنعان ناویان بردوە)، دوهەمیان
قەولی ئەسپارەش) کە بەشێوەی زمانی ناوچەیی و بەتایبەتی نوسیویێتی. بەلام
ەج شێرکوە _ جلادت بدرخان لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ وتوویەتی فەقیٚ
تەیران ناوی محمود بوەو خەڵکی شاری (مکس) بوەو لەساڵی ١٣٠٢ ی زایندا
ەنیك بوەو دوو بەرهەمی شیعری گەورەی هەیە بەناوی (شێخ سنان) و چەند
چیرۆکێك بەناوی (چیرۆکەکانی _ برسیسا) لەگەڵ شیعرێکی زۆر بەناوی
وتەکانی ئەسپی رەش) کە مەبەستی (بوراق) بوە (ئەم بوراقە لە زۆر
نەسانەدا هەیە کە گوایا ئەسپی پێغەمبەر بوە). بێجگە لەوانە بەنازناوی (م.ه)
کتێبێکی هەیە دەربارەی صۆفیگەری و (تاکایەتی بوون _ کەلە کتێبە
عەرەبیەکەی بلەچ شێرکۆدا ناوی لێنراوە: (وحدە الوجود) و لە ساڵی ١٣٧٦ی
زاین لەشاری (مکس) نێژراوە.

٤ـ مەلای باطی

ئەمین زەکی لەلاپەرە ٢٣٦ی بەرگی دوهەمی سەرچاوە ٣٢ دا ، دەربارەی
مەلای باطی وتویەتی خەڵکی گوندی (باطی) بوە لە لیوای حەکاری و ناوی
ئەحمەد بوە وەلەنێوان ساڵانی ٨٢٠ ی کۆچی بەرامبەر بە ١٤١٧ زاین و ٩٠٠
کۆچی بەرامبەر بە ١٤٩٥ زاین ژیاوە (بەپێی ئەو بۆچوونەی ئەمین زەکی دەبیٚ
٨٠) ساڵ ژیابێت).

مەلای باطی دیوانێکی شیعری هەیە و جگە لەو دیوانە بە شیعرێکی دوورو درێژ
ـەی لە دایك بونی پێغەمبەری کردوە بە شێوە زمانی کرمانجی و (فون لوك)
وێنەیەکی ئەو شیعرەی بلاوکردوتەوە. محمد علی عونی کە وەرگێری کتێبەکەی
ئەمین زەکیە بۆ عەرەبی، لە پەراوێزی لاپەرە ٢٧٧ دا وتویەتی شیعرەکەی
مەلای باطی لەساڵی ١٣٢٤ ی کۆچیدا لەلایەن (کردی زادە ئەحمەدرامن)ەوە لە
قاهرە چاپکراوە.

ئەحمەد رامز یەکێك بوە لەو کوردانەی لە (رواق الاکراد) ی جامعەی ئەزهەردا بوە دەربارەی ساڵی کۆچی دوایی مەلای باطی بلەچ شێرکوە لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ وتویەتی لەساڵی ١٤٩٠ دا کۆچی کردوە کە ئەمە لەگەڵ ئەوەی ئەمین زەکیدا یەکناگریتەوە و وتویەتی ساڵی ١٤٩٥ کۆچی دوایی کردوە.

## ٥ـ ئەحمەدی خانی

ئەحمەدی خانی یەکێك بوە لە شاعیرە هەرەبەرزەکانی کوردو ڕۆڵی ئەو شاعیرە مەزنە ئەوەندە گرنگە لە ڕووی ئەدەب و مێژوو و بزواندنی هەستی نەتەوایەتیدا، بە ماموستای قوتابخانەی شیعری نیشتمانپەروەرێتی دەژمێررێ: کەم شاعیری دوای خۆی هەیە باسی ئەو شاعیرەی نەکردبێ و پێڕەوی ڕێبازەکەی ئەوی نەگرتبێتەبەر.

لەراستیدا ڕۆڵی ئەحمەدی خانی شاعیری لێهاتوو شارەزاو ئاگادار بە بارودۆخی سەردەمی خۆی و پێش خۆی و تەنها هەر بریتی نەبوە لەو هەستە ناسکەی لەشێوەی شیعردا هۆنیویەتەوە، بەڵکو مرۆڤێکی شارەزا بە مێژووی گەل و وڵاتەکەی خۆی بوە ئاگاداری باری کۆمەڵایەتی و سیاسی میللەتەکەی خۆی بوە و بەکێش و ترازووی بیرو باوەڕوو بۆچوونی خۆی روو داوەکانی هەڵسەنگاندوەو رەخنەی لە هەموو ناڵەباری و دواکەوتنی میللەتەکەی گرتوەو شعرەکانی بوون بە زنجیرەباسێکی مێژوویی گرنگ بۆ ئەوەی سەردەمی خۆی و دوای خۆی و مەلحەمەی مەم و زینەکەی ئەگەرچی شێوەی دەرەوەی بریتی بوە لە مەلحەمەیەکی دڵداری بەڵام گۆڕەپانی مەلحەمەکەی ئەوەندە فراوان و پان و بەرین بوە جێگەی هەموو شتێکی تیادا کردوەو شیعرەکانی بریتین لە زنجیرەیەك ڕووداوو شیکردنەوەی بەسەرهاتەکانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی و بە دڵێکی پڕ لەخەم و خەفەتەوە گلەیی و نارەزییەکانی خۆی ئاشکرا کردوەو دۆخی میللەت و وڵاتەکەی لەگەڵ دوخی میللەتان و وڵاتانی تردا بەراورد کردوەو رەخنەی توندوتیژی لە دەسەڵاتداران و سەرکردەکانی کورد گرتوە و هاواری کردۆتە میللەتەکەی و داوای لەسەرکردەکان کردوە دەسبەرداری ڕێبازی کۆن بن و بچنە سەر ڕێبازی ئەو ڕاستە ڕێگەیەی میللەتانی تر گرتبویانە بەرو خۆیانیان رزگار کردبوو.

ەراستیدا ئەو دروشمانەی خانی لە شیعرەکانیا بەرزی کردبوونەوە بوبوو بە
ـشـخەڵێکی نـەکوژاوە بـۆ شـاعیران و روناکبـیران و نیشـتمانپەروەرانی کـوردی
ـری خۆی و بوبـوو بـە مامۆسـتای ئـەو قوتابخانەیـەی دەیـان شـاعیر لـەو
ـوتابخانەیەیدا شاگرد بوون وەکو حاجی قادری کۆیی و پیرەمێرو شاعیرانی تـری
ـمکو ئەوان کە شیعرەکانی خانی لە شـیعرو بەرهەمـەکانیانا بـە ئاشکرا رەنگی
ـومتەوە.

دەربارەی ئەحمەدی خانی جلادت بدرخان (بلەچ شێرکوە)لـە لاپـەرە ٣٢ ی
ـتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ وتوویەتی ئەحمەدی خانی ئـەوزاناو شـاعیرە دلدارەیـە
ـە عەشیرەتی (خانیان) بوەو خاوەنی (مەم‌وزینە) کە کەلە ریزی ئـەلیادەی
ـومیرۆس دەژمێرریێ لە کوردیدا وێنەی نیە.

خانی ئەو کتێبـەی لـە سـاڵی١٥٩١ زایینـدا لـە شـاری بایـەزید تـەواو کـردوەو
ـساڵی ١٦٥٢ ی زایندا کۆچی دوایی کردوەو بەتەنیشت ئەو مزگەوتەوە نێژراوە
ـە خۆی لە شـاری بـایزیددا دروسـتی کردبوو. ئـەمین زەکـی لەلاپـەرە ٣٣٧ ی
ـەرگی یەکـەمی کتێبەکـەیدا سـەرچاوە ٣٢ باسـی بەرهەمـە بەرزەکـەی خـانیی
ـاوی (داستانی‌مەم و زین) ناوبردوە کە بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٣٤٠ کۆچیدا -
١٣٣٠ع لـە ئەسـتەمبوڵ چـاپکراوە و جگـە لەوداسـتانە قاموسـێکی عـەرەبی
کوردیشی هەبوە بە ناوی (نوبهار - نوبار) کەلەسـاڵی ١٠٩٤ ی کۆچیـدا لەلایـەن
یوسف ضیاء بەگەوە چاپکراوەو گەلێ شیعریشی هەبوە بـە زمانـەکانی عـەربی و
تورکـی و فارسـی (وەرگـێری کتێبەکـەی ئـەمین زەکـی- محمدعلـی عونـی لـە
پەراوێزی ئەولاپەرەیەدا وتوویەتی ساڵی ١٠٩٤ ی کۆچی ساڵی چاپکردنی نوبهار
ـەبوە، بەڵکو ساڵی تەواوکردنی نووسینی بوە لەلایەن خانیەوە).

دەربارەی ژیانی ئەحمەدی خانی و ساڵی لەدایك بوونـی‌و کۆچکردنـی هـەندێ
جیاوازی هەیە لەنێوانی ئەو سەرچاوانەدا باسیانکردوە.

ئەمین زەکی وتویەتی لەنێوان ساڵانی ١٠٠٠- ١٠٦٢ کۆچی بەرامبەر بە ١٥٩٢-
١٦٥٣ ی زاینـی ژیـاوە (لەمـەی ئـەمین زەکیـدا سـاڵی ١٦٥٣ ی زاینەکـەی
بەرامبەر بە١٠٦٣ کۆچی یەك ناگرێتـەوە چونکـە بـەپێی حسابی هجـری (٦٣)
ساڵی هجری ژیاوە بەلام بـەپێی حسابی زایـن (٦١) سـاڵ ژیـاوە کـە دوورن لـە
یەکترییەوە). دوکتۆر جمال نەبەز لەلاپەرە ٥٨٥ ی کتێبەکـەیدا سـەرچاوە ٣١

وتویەتی خانی لەنێوان سالآنی (١٦٥٠ ز ـ ١٧٠٦ز) دا ژیاوە بەپێی ئەمە خانی تەنها (٥٦) سالّ ژیاوە.

جلادت بدرخان (بلەچ شێرکوە)لە کتێبەکەیدا، سەرچاوە ٦٠ لەلاپەرە ٣٢دا وتویەتی خانی لە سالّی ١٧٠٩ زایندا کۆچی دوایی کردوە (باسی سالّی لەدایکبونی نەکردوە). لە کتێبی (تأريخ مشاهير الاكراد) جلداول ـ تألیفی بابا مردوخ روحانی شیوا چاپی تاران سالّی ١٣٦٤ کۆچی لەلاپەرە ٢١٢دا وتویەتی خانی لەسالّی ١٠٦١ کۆچی بەرامبەر بە١٦٥٠ ی زاین لە دایك بوە علاءالدين سجادی لەلاپەرەکانی ١٨٩ــ١٩٤ ی مێژوی ئەدەبی کوردی کە باسی ژیانی خانیی کردوە وتویەتی خانی لە سالّی ١١١٩ یکۆچیدا، کۆچی دوایی کردوە (علاءالدين ئەمەی لەوەوە وەرگرتوە کە بەحسابی ئەبجەد بەعەرەبی ووتراوە: (طار خاني الى ربّه) کە بە حسابی ئەبجەد سالّی ١١١٩ ی کۆچی دەگرێتەوە. لام وایە راسترین سەرچاوە دەبێ ئەوسالّە بێ کە خانی خۆی لە سێ شیعریدا باسی ژیانی خۆی کردوە کە هەژار لە لاپەرە٢١٧ ی کتێبەکەی ئەحمەدی خانیدا چاپ کراوە کە ئەوسێ شیعرەش بریتیە لە:

خەططێ تەیە سەرنویشت و سەرمەشق سیە سالّە خەطێ خەطا دکەت مەشق
لەورا کو دەما ژ غەیب فەك بو تەئریخ هەزارو شیست و یەك بو
ئیسال گەهیشتە چلل و چاران وی پێشرەوێ گوناهکاران

بەپێی ئەمە کە وتویەتی لە سالّی ١٠٦٨ دا تەمەنم گەیشتوەتە چل و چوار، دەبێ ئەحمەدی خانی ١٠٦١ ـ ٤٤ = ١٠١٧ ی کۆچی لە دایك بووبێت. هەژار لە لاپەرە ٣٦٤ دا ئەو سێدێرەی بەم جۆرە کردوە بە شێوەی کرمانجی خوارو (بابە موکریانی):

بەد خۆم و لەراستە خۆم چکوسم سێ سالّە گوناهی خۆم دەنوسم گەر هاتنە سەر زەوی مەرێك بو مێژو لە هەزارو شیست یێك بو ئێستە بەتەمەن چل و چوارم پێشەنگی بەرەی گوناه کارم هەژار خۆی لەلاپەرە ٢٢٥ یکتێبەکەی خانیدا وتویەتی:

((خانی ناوی ئەحمەدە کوری ئەلیاسە، سالّی ١٦٥٠ ی زایین لەدایك بوە و لەتەمەنی (٥٨) سالّیدا لە بایەزید مردوە (کەبەپێی ئەم بۆچوونەی هەژار دەبێ

ــتی لە سالی ١٦٥٠ + ٥٨ = ١٧٠٨ زاینی لە دایک بوبێت). بێجگە لەو ـرهەمانەی ئەحمەدی خانی کە لەوسەرچاوانەدا باسکراون، مامۆستا محمد علی ـرەداغی بەناوی (مژدەی دۆزینەوەی یوسف زلێخای ئەحمەدی خانی) لەلاپەڕە ـ ی گۆڤاری ڕەنگینی ژمارە ٩٤ ی سالی ١٩٩٦ باسی ئەو چیرۆکی یوسف ـێخایەی بلاوکردوەتەوەو بە پێی باسەکەی ئەو بریتیە لە (١٤٠) لاپەڕە کە ـەمەی خوارەوە فۆتۆکۆپی بەرگەکەیەتی:


كتاب يوسف زليخا عليه السلام

وبه بسم الله الرحمن الرحيم نستعين

سر دفتر جملە كتابان ... قط نابە كو نابە ناو سبحان

حقا اوه خالق همە غفار ... بم مذنب عاصی گنە كار

ای شمس منیر عالم اذی ... چونا فلكان ژ بو تە سیری

خورشید ژ بو تە كو و میدان ... والله قسم تویی سرور اعیان

بادی تو كری ختیم مختار ... اسرار كرن ژ بو تە اظهار

اسمیته

( یوسف زلیخا )

مامۆستا هەژار کارێکی زۆر گەورەو باشی کرد پاش ماندووبونێکی زۆر مەم و زینەکەی ئەحمدی خانیی ئامادە کردوە لەلایەن ( أنستیتوتی پاریس)ەوە لە ئیتاڵیا چاپکراوە لە ساڵی ١٩٨٩ داو ووشە گرانەکانی لە شێوەی کرمانجیەوە کردوە بەکرمانجیی خواروو لە پاشکۆی دیوانەکەی مەم و زینی خانیدا هەموو دێڕە شعرەکانی مەم و زینی کردوە بە کرمانجیی خوارو (شێوەی موکریانی بوترێ باشترە)، هەرچەند من لەگەڵ ئەوەدا نیم شعری کوردی لە شێوەیەکیەوە بکرێ بە شێوەیەکی تر چونکە وەرگێڕ هەرچەندێك شارەزاو لێ هاتووش بێ بڕواناکەم بتوانێت پڕیەپڕی مەبەستەکانی ئەو شیعرانە وەرگێڕێ بۆ شێوەیەکی تر.

هەژار لەپێشەکیەکەدا ئەم چەند سەرنجەی خوارەوەی تۆمارکردوە دەربارەی چاپەکانی مەم وزین لەلایەن ئەو کەس و دەزگایانەی بایەخیان بەوبەرهەمە گرنگە داوە ئێمەش لێرەدا سەرنجەکانی مامۆستا هەژار هەروەکو خۆی پێشکەش دەکەین کەلە لاپەڕە ١٤ ی پێشەکیەکەدا باسی ئەوەی کردوە چوار مەم وزینی چاپکراوی بەراورد کردوەو سەرنجەکانی خۆی دەربارەی ئەو چاپانە بەم جۆرەن:

**١- چاپی هەولێری مام (گیو)، هەندێ ڕەخنەی لێ گرتوەو لەبەرئەو هۆیانەی باسیکردون ووتویەتی وازم لەوچاپانەی ئەو هێنا.**

**٢- مەم وزینی چاپی مۆسکۆ کە خانم (سیدا رودینکو) لەساڵی ١٩٦٢دا بەراسپاردەی ئەکادیمی علومی یەکێتی سۆڤێت (نشرخانا ئەدەبیاتا ڕۆژهەلاتی بەشێوەی خەتی عارەبی دەگەڵ وەرگێڕاوی روسی و پێشەکیەکی بەرێك چاپ و بڵاوی کردوەتەوەو لە پەراوێزەکانا دەردەکەوێ لەبەر چەند نوسخەیەکدا نووسراونەتەوەو دووبەیت لەمەدا هەبوون کە لەوەی (حەمزە) دا نەبوون.**

**٣- چاپی (حەمزە): لە پێشەکیەکەیدا نوسراوە: (مایسی ساڵی ١٣٣٥ ی کۆچی کەبەرامبەر بە ساڵی ١٩١٩ ی زاینی لەدواییەکەشیا تیا نوسراوە: (ئەو کتیبا کو مەژۆ أستنساخ کری، سالا ١١٦٥ عزیز کوری شیرمام زیدی نفیسی بوو). بەو پێیە دەبێ ئەو نوسخەیە پاش شەست ساڵ دوای دەسخەتەکەی خانی خۆی نوسرابێت. ئەو (حمزە) یە**

نهسالأنی ۱۹۱۸ و ۱۹۱۹ دا سەرپەرشتی چاپخانەی (نەجمی أستقبال) ی کردوە نەشاری ئەستەمبوڵداو لە ساڵی ۱۹۵٦ لەشاری (قامشلی) کۆچی دوایی کردوە.

٤- مەم وزینی بە لاتینی چاپکراوی ماموستا محمد ئەمین بۆز ئەرسلان، ساڵی ۱۹٦۸ لە تورکیا بەوەرگەڕاوی تورکیەوە لە چاپی داومو وتویەتی ساڵی ۱۹۵۸ لە شاری شامیش بە پیتی عەرەبیش چاپی کردوە، بەلام هەزار وتویەتی نە ئەومم دیومو نە لە کەسیشم بیستوە (تۆ بلێی لای ماموستا محمد ئەمین بۆز ئەرسەلان نوسخەیەك لەوە نەس بکەوێ؟).

٦ـ مەلا مەحمودی بایزید

دوکتۆر کمال مەزهەر لەو باسەیدا کە بۆ پێشەکیی شرفنامە وەرگێڕاوەکەی هەژاری نوسیوە لە لاپەڕە ۱٦۸، وتوویەتی مەلا مەحمودی بایزید لە کوتایی سەدەی هەژدەدا لە دایك بوە و لە سەرچاوە ۳۸ دا لەلاپەڕە ۱۲٦ دا دوکتۆر کمال ساڵی لە دایك بوونەکەی مەلا محمودی بایزیدی دەسنیشانکردوەو وتویەتی ـە ساڵی ۱۷۹۷ ی زاین لە دایك بوە لە ناوچەی بایزیدی باکوری کوردستان و جگە لە زمانی کوردی، عەرەبی و تورکی و فارسیشی باش زانیوە و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ نەك تەنها هەر لە بایزیدا بەڵکو لە هەموو کوردستانیشدا مەلایەکی بێ هاوتا بوەو لە ناو کوردەواریدا وەك زانایەکی ئاینی و ماموستایەکی لێ هاتوو ناوبانگی دەرکردوەو گەلێك بەرهەمی شاعیرانی تورك و عەجەمی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی زمانیشدا بەرهەمی زۆر هەبوە بە تایبەتی دەربارەی (ڕێزمان)و شارەزای دابوو نەریت و مێژووی کوردیش بوە.

(جابا = ژابا) کە لە سەر داخوازیی ڕۆژهەلاتناسەکانی (پیتە بۆرگ) کەوتبوە بایەخدان بە کوردناسین، پەنای بردۆتە بەر مەلا محمودی بایزید و بەیاریدەی ئەو توانیبوی گەلێك دەسنوسی نایاب و کەرستەی زانستی بۆ مۆزەخانەی ئاسیایی لە پترسبرگ (پینە بورگ) کۆ بکاتەوە. لەسەر داخوازی ژابا، مەلا مەحمود ژمارەیەك کتێبی دانا کە دەسنووسی هەموویان کەوتە لای ژابا و بەشی زۆری ئەو دەسنووسانە لە دەزگا زانستیەکانی لینینگرادا هەلگیراون و (ڕۆدنکۆ) باسی کردون و وتویەتی ئەتوانم بەوپەڕی دڵنیاییەوە بلێم گەلی کورد

لە پاراستنی گەلێك لایەنی بەنرخی سامانی روناكبیریدا هەتاڕادەیەكی زۆر قەرزاری مەلا مەحمودی بایزیدەو ئەگەر هاوكاری ئەوو (ژابا) نەبوایە تا ئێستەش بەشێكی بەنرخ لە گەنجینەی ئەدەبی كوردی سەدە ناونجیەكان نەدەزانرا.

لەو بەرهەمەیدا (عادات و رسوماتنامە طوایف اكراد و ئوصول و نظامات كوردی، كەلەسالّی ١٢٧٤ كۆچی بەرامبەر بە ١٨٥٨ - ١٨٥٩ زاین لە نوسین بۆتەوە، رۆدنكۆ لەسالّی (١٩٦٣) دا لە مۆسكۆ كردویەتی بە روسی و وەكو لەپێشەكیەكەیدا باسی كردوە بریتی بوە لە (٢٠٢) لاپەڕە.

هەرچەندە ئەم كتێبە بێ هەڵە نیە، بەتایبەتی لەسەرەتادا كە باسی رەگەزی كوردی كردوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوەیەكی بەكەڵكە بۆ مێژوونوس چونكە باسی ژیانی كۆمەڵایەتی و ئابوری و كۆچەرێتی و بازرگانیو سەندنی باج و سەرانەو سوودو سەلەم و دەسەڵاتدارێتی تیادا كردوە جگە لەم كورتە باسەی ژیانی بایزیدی، لەباسی شرفنامە و لەباسی شۆڕشی بدرخان پاشاشدا باسی ڕۆڵی مەلا محمودی بایزید تەواو دەكەین و پێویست ناكا لێرەدا باسیان بكەین.

**٧ـ يوسف ضياءالدين پاشا خالدی**

لەباسی ئەحمەدی خانیدا ئاماژەمان بۆ كتێبەكەی ئەمین زەكی كردوە كە وتویەتی قاموسەكەی خانی (نوبهارـبچوكان) لەساڵی ١٠٩٤ ی كۆچیدا لەلایەن یوسف ضیاءالدین بەگەوە چاپ كرابوو.

ئەحمەدی خانی دەربارەی ئەو قاموسەی خۆ لە نوبهاردا وتویەتی: ئەم قاموسە تەنها هەر بۆ متأدبین نیە (كە مەبەستی ئەدەب دۆستان و شارەزایانی ئەدەبە)، بەڵكو بۆ منداڵانی كوردە. یوسف ضیاءبگ لە كتێبەكەیدا (الحمیدیە) وتوویەتی: تەنها هەر ئەم چەند ووشەی ئەحمەدی خانی هەروەكو پەندو وشەی نەستەق وایە.

دەربارەی پلەو پایەی یوسف ضیاءالدین هەروەكو دوكتۆر جلیلی جلیل لەسەرچاوەی ٥٥ دا ئاماژەی بۆ لاپەڕەكانی (٥٤٥ـ٥٤٩) ی كتێبی (journal fisiqne ixeric.t.2) كردوە كەلەو كتێبەدا (ڤیلچێڤسكی) دەربارەی

مەسەنگاندن و نرخانی یوسف ضیاءالدین وتوویەتی: ((یوسف ضیاءالدین حالیدی پاشا خالیدی بەیەکێك لە گەورەترین شخصیاتی کورد دەژمێرریۆ یەکێك بوە لەوانەی جگەلە زمانی کوردی لەزمانی عەرەبیشدا شارەزاییەکی تەواوی هەبوە.

بلاوبونەوەی (هدیە الحمیدیە) ی لەناو ناسراوانی کوردو رۆشنبیراندا دەنگێکی زۆری داوەتەوەو بەسەرکەوتووترین کتێب دانراوەو رۆژنامە ئەوروپاییەکانیش بە هەمان شیوە باسیان کردوە)) میر بصری لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٢ لەلاپەرە ٦٢ دا وتوویەتی یوسف ضیاءالدین لە نێوانی سالانی ١٨٤٠ ـ ١٩٠٦ دا ژیاوە.

لەلاپەرە ٣ ی ژمارە ٣ ی رۆژنامەی کوردستان رۆژی ٧ ی مایس ١٣١٤ ی کۆچی کە لە قاهرە دەرچوە باسی چۆنیەتی دەرچوونی (هدیە الحمیدیە) کرنوە، حەزمکرد بەشێوە کرمانجیەکەی چۆن بلاوکراوەتەوە هەروا بە ئیملاکەی خۆی پێشکەشی بکەم:

((هن خالدی هنە لقدسا شریفین یك ژڤان خوی فضل وکرم شێخ یوسف ضیاءالدین، خدی عمروی درێژو علم وی زێدە بکە، بری شش سالا (کەبەپێی ئەمە سالی ١٣٠٨ کۆچی دەگرێتەوە) کتێبێك چێکر بەناڤ فێ کتێبی (الهدیە الحمیدیە فی اللغە الکردیە) یە. أڤ کتێب بحثا قواعدێن عزمان کرمانجی دکە خاتین کرمانجی حمی گهاندنە هـڤ فی کتێبدە نڤیسیە مالاوی ئاڤا أساسك ژعزمان کرمانجا رە دانی. أز هیڤی دکم کو علماو میرو پادشایێن کردا ژڤێ کتێبی پیدابکن گلك کتێبێك قنجە علمایێن کردارە لازمە کو أو ژعزمانێن خوە تیشتکی بنڤیسن)).

ناوی نوسەرەکە لە رۆژنامەکەدا نیە، وادیارە ئەبێ هی مقداد مدحت بدرخانی سەرنووسەری رۆژنامەکە بێ. دەربارەی (الهدیة الحمیدیة)؛ دوکتۆر جلیلی جلیل لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٥٥ وتوویەتی ئەو کتێبە لەلایەن یوسف ضیاءالدینەوە ئامادەکراوە لە سالی ١٨٩٢ ی زاینیدا چاپکراوە کە بەپێی ئەمە بەرامبەرەکەی سالی ١٣٠٠ ی کۆچی دەگرێتەوە کە لەگەڵ ئەوەی رۆژنامەی کوردستاندا یەك ناگرێتەوە کە لە سالی ١٣٠٨دا چاپکراوە.

دەربارەی هۆی ناونانی ئـەو کتێبـە بـە (الهدیـة الحمیدیـة) وە، جلیلـی ئـەڵێ ئەوەی لەو ڕۆژانەدا ڕێگەی بۆ چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبەی داوە (کە بە عربیو کوردی کرمانجی ژوروو بوە) ئەوەبوە لەو ڕۆژانەدا خلیفـەی عوسمـانی سوڵتان عبدالحمید بوە و کتیبەکەی بەناوی ئەوەوە بـڵاو کرێتـەوە. دەربـارەی ئەوە مامۆستا نجم مەلا لەلاپـەڕە ۲۱ ی ژمـارە ۱۲ ی گۆڤـاری ڕۆژی نـوێ سـاڵی ۱۹٦۰ کـە لەشـاری سـلێمانی دەرچـوە باسـێکی دەربـارەی ئـەوکتێبی (الهدیـة الحمیدیة) یەوە بڵاوکردۆتەوەو وتوویەتی نووڕنیە ئەو کتێبە ئەگەر ئـەو عنوانـەی لە سەر دانەنرایە کە ناوی سوڵتان عبدالحمید بوە لەوانەبوو ڕێگـە بـە چاپکردنی نەدرایە.

وەکو دوکتۆر جلیلی لەسەر چاوە ٥٥ دا باسی کردوە ئەو کتێبە بریتی بوەلە (۳۰۰) لاپەڕە کە بە زیانی عەرەبی باسی دەستووری زمانی کوردی کردوە لەگەڵ شیعرە کلاسیکیەکانی ئەحمـەدی خـانی و باسـی چـەند بەشـێك لــەو قاموسـە شیعرییەی ئەحمەدی خانی کە بەناوی نوبهارەوە نوسیبوی، لەگەڵ ئەو قاموسـە کوردیەـــ عربیـــەی محمدعبدالهـــادی و حـــاجی محمدنـــوری و محمدعـــاصم و أبومســـعودزادە علاءالدیـن دایـان نـابوو، جگـە لـە هـەندێ لـــە شـــعرەکانی (محمودخزنی خالدنقشبندی) و ئەو کتێبەی یوسـف ضیـاءالدین بەرهـەمێکی زۆر بەنرخ و کەرەسەیەکی سوود بەخش بوە بۆ ئەوانەی ویستبویان شارەزای زمان و ئەدەبی کوردی ببن.

یوسف ضیاءالدین لە الهدیة الحمیدیەدا دەربارەی بایەخدان بـەزمانی کـوردی ووتوویەتی: ((فێربوون و زانینـی زمـانی کوردی کلیلـی شـارەزابوونی کـوردە و هـۆی نزیکبوونەوەیـە لـەو میللەتـە)). بـەر لـەوەی بچینـە سەرباسـی زانـای مێژوونووسی کورد لە خوارەوە ناوی هەندێ لەو شاعیرو نووسەرانەی بـەر لەمـە سەرچاوەکانی وەکو ئەمین زەکی و دکتۆر کمال مەزهەر وجلیلی باسـیان کـردون ناوی چەند شاعیرو نوسەرێکی تر بەکورتی ئەخەینە پێش چاو کـە ئـەمین زەکـی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ۳۲ وبلەچ شێرکوە لە سەرچاوە ٦۰ دا باسیانکردوون کە بریتین لە:

**١- ئیسماعیل بایزیدی، لەساڵی ١٦٤٥ ی زایندا لەدایك بوەو لە شیعرو حسینەکانیا پێڕەوی ئەحمەدی خانی کردوە و قاموسێکی بچووکی کوردی و عربی و فرسی داناوە بەناوی (گامزار).**

**٢- شریف خانی هەکاری ـ ساڵی ١٨٦٩ لە جۆڵە مێرگ لە دایك بوە.**

**٣- مراد خان ـ خەڵکی بایزید بوە و ساڵی ١٧٣٧ لەدایك بوە.**

**٤- ملایونسی (هلکاتینی) نووسەری سێ نامەی بەناوبانگە کە بریتین لە: تصریف) و (ظروف) و (ترکیب) بەزمانی عەرەبی.**

ئەوەی جێگەی داخە، ژمارەیەکی ئێجگار زور لە زانایان و شاعیران و مێژوونوسان و پیاوی ئاینی کورد لە ژیانیانا هەرچەندە کوردبوون و سەرچاوەکان بەکورد ناویان تۆمار کردوون، بەڵام بەزمانی خۆیان شتێکیان نوسیوەو بەشێکی زۆریان کوردستانیان بە جێ هێشتوەو روویان کردوەتە وڵاتانی ئیسلام و هەر لە موصلّ و بەغدادو شامەوە هەتا قرطبەی ئەندەلس چوون و لە خزمەت کاربەدەستان و دەسڕۆیوانی ئەو وڵاتانەدا خزمەتی زمانی بێگانەیان کردوە و هیچ بەرهەمێکیان لەپاش بەجێ نەماوە دەربارەی میللەتەکەی خۆیان و وڵاتەکەی خۆیان و زمانەکەی خۆیان.

بۆ نمونە کتێبی (تأریخ مشاهیر کرد ـ عرفا، علماء، أدبا، شعرا نووسینی بابا مردوخ روحانی شیولـ چاپی تاران ساڵی ١٣٦٤ کۆچی، تەنها لە بەرگی یەکەمیا پتر لە ٦٠٠ــ٧٠٠ مێژوونـاس و زمـان زان و شاعیرو ئەدیب و نووسەری کوردی تیادا باس کراوە لەگەڵ ژیانیاناو ناوی بەرهەمەکانیان بە زمانەکانی بێگانە وەکو عربی و فارسی و تورکی، حەزمکرد لێرەدا کورتە باسی هەندێکیتان بخەمە پێش چاو کە لەکتێبی ناوبراودا بڵاونەکراوەتەوە بۆ ئەوەی بزانرێ حوکمەران و شاعیران و مێژوونووسانی کورد بێجگە لە ژمارەیەکی کەمیان نەبێ ئەوانیتر چەند کەمتەرخەم بون بەرامبەر بە میللەت و وڵاتەکەی خۆیان.

**١- ابو اسماعیل قالی ملازکردی، ساڵی ٢٨٨ کۆچی لە شاری دیاربکر لە دایك بوە و پاش ماوەیەك کۆچی کردوە بۆ موصلّ و بغداد و لە ئەنجامدا لە (قرطبە) گیرساوەتەوەو لەوێ بوە بە مامۆستا لە یەکێك لە مزگەوتەکانی قرطبە و گەلێك باس و کتێبی بە عرەبی نوسیوە.**

**٢- ابونصر احمد سليكى ملازكرد: شاعيرو نووسەرو بوە وزيرى أبونصرأحمد كورى مروانى حاكمى دياربكربوە سالى ٤٣٧ كۆچى مردوە و لەگەلْ ابوعلاء معرىدا چاويان بەيەكتر كەوتوە.**

**٣- ابن الاثير سالى٥٥٨ لە جزيرە لەدايك بوە و سالى ٦٣٧ لە بغداد كۆچى دوايى كردومو ماوميەك لە بارمگاى صلاح الدين ايوبيدا خزمەتى كردوە كە يەكێكە لە مێژوو نوسە بەناوبانگەكان.**

**٤- حسام الدين على بدليس ـ لەزاناكانى بدليس بوە بە عربى كتێبێكى نوسيوە بەناوى (جامع التزيل و التاديل) كە پێنج جلد بوە و كتێبێكيش بەناوى (الكنز من بيان مقامات الصوفى).**

**٥- كمال الدين حكيم بدليس ـ زۆر نزيك بوە لە كۆشكى سوڵتانەكانى عوسمانى و ناق قوينلى. گەلێك بەرهەمى شيعرى هەبوە بە عربى و فارسى و توركى.**

**٨- شرفخانى بدليسى**

هەروەکو چۆن ئەحمەدی خانی بە مامۆستای قوتابخانەی شیعری نەتەوایەتی کورد دەژمێرریٚ، شرفخانیش بەیەکەم مێژوونووسی کورد دەژمێررێت. بەشێکی زۆری مێژوونووسان، لەوانەی کەویستویانە دەربارەی مێژووی رابوردوی کورد بنوسن زوربەیان سودیان لەو بەرهەمەی شرفخان وەرنەگرتبێت. لەباسی ئەمارەتەکانی باکوری کوردستاندا، لەئەمارەتی بدلیسدا کورتەباسێکی ژیانی شرفخانمان لە زمانی خۆیەوە وەرگرتوە کە لە شرفنامەدا باسی کردوە، بۆیە پێویست ناکا لێرەدا دووبارەی بکەمەوەو یەکسەر دەچمە سەرباسی بەرهەمە بەنرخەکەی کە (شرفنامە)یە.

ئەوی راستی بێ، ئەگەر ئەوکارەی شرفخان نەبوایە کە بەوردیو بە دوورودرێژ گەلێك باسی گرنگی مێژوویی و ژیانی گەورە پیاوانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی تۆمارکردوە، بێگومان زۆرشت لە کیس دەچوو بێ ئەوسەرچاوەیە نەدەتوانرا بەرپەرچی ئەودرۆو دەلەسانە بدرێتەوە کە دوژمنانی کورد بۆ کوردیان هەڵدەبەست، ئەگەرچی هەندێ جار دوژمنانی کورد دەرفەتی ئەوەشیان بۆرەخساوە هەندێ لەو چیرۆك و ئەفسانانەی درابوونە پاڵ نەتەوەی کورد و

شەرەفنامە لێیان دواوەو تۆماری کردوون بیانکەن بەبەڵگە بۆ ڕوانینی مێژووی کـورد هەرچی شارەزایانی کاریەو لێهاتوو زۆربەیانی ئاسانی دەتوانن ئەو جۆرە چیرۆك و حەکایەتە بە چاوێکی گومانـەوە سـەیر بکاو بیخاتـە ڕیزو خانـەی ئـەو هـەزاران چیرۆك و ئەفسانە بێسـەروبەرانەی دراونەتـە پـاڵ میللـەتانی تریش. بەرلـەوەی چـە سەر باسی ناوەڕۆکی شاکارەکەی شەرەفخان، بـە پێویستم زانـی ئـەم چـەند وتەی مامۆستای مێژوونووسی کورد ئەمین زەکی بخەمـە بـەرچاو کـە دەبـارەی شەرەفخان نوسیویتی هەروەکو لە لاپەڕە ٢٠٢ ی بەرگی یەکـەمی سـەرچاوە ٣٢ دا هەروویەتی:

((شەرەفخانی بدلیسی خوالێخۆشبوو تەقەلایـەکی زۆریدا بـۆ ئـەوەی بتوانێـت میرەکانی سەردەمی خۆی یەك بخاو گیانی یەکگرتن و هاوکاری لەناویانا بـەتاك و بە کومەڵ و بەحکومەتەکانیانـەوە پـەرە پـێ بدلو بـۆ ئـەو مەبەسـتە ڕێنمـایی مەعولی کردوە بۆئەوەی ئەو ڕێبازە بگرنە بەر خۆشیەو شـادمانی گـەل و تـێرو تەسلیی ناو وڵاتی پێدلیین بکرێ و تەقەلایەکی زۆری دابوو نارێکی و ناکۆکی لە خوێن ئەمارەتەکان و نیشتمانپەروەرەکانا نەمێنێ و بە پێی توانا تەقەلای دابـوو دەوڵەتێکی یەك گرتوو پێك بێنێت و بەرەیـەکی یـەکگرتووی سیاسـی لـە هـەموو حکومەتەکان و ئەمارەتە کوردیەکانا لەشێوەی (فیدراسیۆن) ێکدا پێك بێنێت کە پایتەختەکـەی لـە جزیـرەی ابـن عمـردا بـێ، بـەڵام بەداخـەوە ئـەو تەقـەلاو هەنگاوەی سەری نەگرت چونکە سەرکردەکانی کورد گوێیان بۆ بانگەوازەکـەی ئەو شل نەکردو بەقسـەیان نـەکردو بـەهۆی فـرو فێـڵ و پیلانـی بێگانـەوە تـۆوی دووبەرەکی لە نێوانیا چێنرابوو، سەوز بوبوو ((سیاسەتی پیلانگێڕەکانی دوژمنی کورد لەسەر بناغەی: (تێکیان بدەو ببە بە ئاغا) دامـەزرابوو کـورد بـە ئامـانجی خۆی نەگەیشت و دوژمنەکانی بەسەریا زاڵ بـوون)). دەربـارەی ئـەو بۆچوونـەی ئەمین زەکـی و ئـەو تەقەلایانـەی شـرەفخانی بدلیسـی دابـووی، کاشـکی بـەر لـەو شەرەفخانی بدلیسی ئەم هەوڵەی ئەوی بدایە کە هێشتا ئەمارەتەکانی کـورد جۆرە سـەربەخۆییەکی خۆیـان هـەبوەو تـا ئـەو کاتـە هێشـتا خلیفـەی عوسمـانی و کاربەدەسـتەکانی تـورك ئـەو دەسـەڵاتە زۆرەیـان نـەبوە لـە کوردسـتانا و نەیانتوانیبوو بە ئارەزوی خۆیان تۆوی دووبەرەکی لەناو میرەکانی کـوردا بچێنن و هێشتا دەوڵەتەکەیان بەتەواوەتی خۆی نـەگرتبوو دەسـتیان نەخستبوە کـارو

باری ئەمارەتەکانی کوردەوە، کاشکی ئیدریسی بدلیسی بەرلە شرفخان ئەو نەخشەیەی بکێشایەو ئەو ئامانجە پیرۆزەی بهێنایەتەدی، بەلاّم بەداخەوە لە سەردەمی شرفخانی خاوەنی شرفنامەدا کارلەکار ترازابوو تورکەکان دەستی خۆیان لەکورد وەشاندبوو، کوردیان تێکدابوو لەناو خۆیانا و عوسمانی بەهێز بوبوو، بەسەر صفویەکانا زالّ بوبوو. دەربارەی شرفنامە هەروەکو لە پێشەکیەکەی هەژاردا باسی کراوە، شرفخانی بدلیسی بەزمانی فارسی نوسیوێتی و لە دواییدا وەرگێڕاوە بۆ زمانی بێگانە.

لەسالّی ١٨٦٠ دا (فیلیا مینۆف.زیرنۆف) شرفنامەی لە فارسیەوە کردوە بە فرەنسی و چاپی کردوەو پێشەکیەکی بۆ نوسیوە، لەو پێشەکیەدا باسی ئەو سەرچاوانەی تری کردوە کە شرفنامەیان چاپکردوەتەوە یا وەریانگێڕاوە بۆ زمانی تر یا باسیان دەربارەی ناوەڕۆکی شرفنامە بلاّوکردۆتەوە. زێرنۆف لەو پێشەکیەدا وتوویەتی:

لەئەوروپادا (دێرلوف) بۆ یەکەم جار دوو وتاری دەربارەی شرفنامە نوسیوەو بلاّوی کردۆتەوە، جارێك بە (شرفنامە) ناوی بردوەو جارێکیش بەناوی (مێژوی کوردان) باسی کردوە، کە سەرچاوەی (زێرنۆف) بۆ ئەو باسەی (دێرلۆف) بریتیە لە کتێبەکەی (مایسترخت).

یەکەم کەسێك وەکو زێرنۆف باسی کردوە، کە نسخەی شرفنامەی دەسگیر بووە (سێرجۆن مالکوڵم) بوە کە لە سەرەك هۆزی (محیزی) یەوە دەستی کەوتوە و لەسەری نوسیوە (کوردین کورونیك)و وتوویەتی هی (فون شەرەفە- مەبەست شرفخانە) کە ئێستە ئەو نسخەیە لای مەکۆی ئاسیایی پادشایی بریتانیای مەزن و ئیرلندەیە. مالکوڵم لەو بەرهەمە فارسیەیدا کە بلاّوی کردوەتەوە زۆر جار باسی شرفنامەی کردوە. لە ئەوروپادا هەتا سالّی ١٨٢٦ کەس نرخی شرفنامەی نەزانیوەو لە ڕاستیشدا بە هۆی زانایانی ڕووسەوە بوە ئەم بەرهەمە بەنرخە پێشکەش بە ئەوروپا کراوە.

(مسیۆ فراش) یەکەم کەس بوە لە سالّی ١٨٢٦ دا باسی ئەو کتێبە مێژوییەی کوردی کردوەو کورتە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی نوسیوەو ئاواتی ئەوەی خواستوە ترجمە بکرێت. زێرنۆف ئەڵێ: لەهەمان سالّی ١٨٢٦ دا (مسیۆلکو) یاداشتێکی دەربارەی ولاّتی فارس نوسیوەو لەو

ـەلشتەدا باسی شرفنامەی کردوەو پاش ئەوەی بە ماوەیەك (مسیۆ شارموا) لە
ـن بترسبرگ) کە مامۆستای زمانـەکانی رۆژ هـەلات بـوە، لەسـەر ئامۆژگـاریی
ـیوفراش دەسـتی کـردوە بـە وەرگـێرانی شـرفنامە، بـەلام وادیـارە
ـێوشارموا)بەرلەوەی کارەکەی تەواو بکا مردوە، ئەگەر نەمردایـە گـەورەترین
ـرمەتی دەکرد بە مێژوو.

(مسیوکوتیك) باسی ئەو نسخە فارسیەی کردوە کەلە سالی ١٠٠٧ ی کۆچیدا
یـەعنی دوو سـال دوای تـەواوکردنی نوسـینی شـرفنامە) نووسـراوەتەوە، دانـەر
ـە مەبەستی شرفخانە) خۆی چاوی پیاخشـاندۆتەوە، مسیۆ فـراش خـۆی ئـەو
ـەسنوسەی بەچاوی خۆی دیوە.

(مسیۆ خانیکۆف)ی رۆژهەلاتناس لە سالی ١٨٥١ دا کونسـلی روس بـوە لـە
ـێـرن، نسخەیەکی لە دیلمەکانی لای (سـلماس) کڕیـوەو دوو نسـخەی تریـش لـە
ـتێبخانەی (یحیی خان) ی فەرمانڕەوای ئازربایجان وەرگرتوەو (مسیۆ کوتیك)
ـسودی لەو نسخەیەی خانیکۆف وەرگرتوە.

دەسنووسەکەی لای خانیکۆف بریتیبوە لە (٢٥٠)پەڕە کـە هـەمووی بەیـەك
ـسخەت تۆمارکراوەو دەسنووسێکی تریش لە مۆزەخانەی ئاسیادا هەیـە لـەژێر
ـرەی (٥٧٦) دا کـە (بـارون.بـود) سـاتیك لـە ئـێران بـوە ئەودەسنووسـەی
ـسکەوتوەو بردویـەتی بـۆ ئـەو مۆزەخانەیـە کـە بریتـی بـوە لـە (١٠٠) پـەڕە.
ـرنۆف لە باسەکەیدا لەسەری ئەڕواو ئەلی:

((من هەرچوار نسخەکەم بەرچاو کـەوتوە، بۆیـە ناچـارم هـەرچی لـەو چـوار
ـسخەیەدا لەیـەکتر جیـاوازن لـەدواییدا لەبەشـی دوهـەمی کتیبەکـەدا بیانخەمـە
ـەرچاو. جگـە لـەو چـوار نسـخەیەی مـن شـرفنانەم لەسـەرچاپکردوە، سـێ
ـەسنووسی تریـش هەیـە لـە (ئاوسـتریا. نەمسـا) لای ( دوکتـۆر بـارب)، و
ـسێرجۆن مالکوڵم) یش لە لەندەن نسخەیەکی لایە کە ئێستە لەریزی کتێبـەکانی
کۆمـەلی ئاسـیای پادشـاهی بریتانیـاو ئیرلندەدایـە، هـەروەها لەپاریسـیش
ـ.ەسنووسێك هەیـە. (سـەرچاوەی بۆ ئەمـە بریتیـە لـە: ولکـۆ، ووتارەکـانی
ـرۆژنامەی ئەزمانگ بەشـی هەشـتەم سـالی ١٨٢٦، جگـە لەمانـە لـە مۆزەخانـەی
بریتانیادا نوسخەیەکی (مستر ریچ) یش هەیە)).

تا ئێرە بریتی بوو لە پێشەکیەکەی (زێرنۆف)دەربارەی شەرفنامەو نسخەکانی، دوکتۆر کمال مەزهەریش لە دوو سەرچاوەدا باسی شەرفنامەو شرفخانی کردوە، یەکەمیان بریتیە لەسەرچاوەی ژمارە ۳۸ (کورتەباسێکی زانستی مێژووی کوردو مێژوو)، لەلاپەڕە ۱۰۵ ی ئەو سەرچاوەیەدا وتوویەتی:

((شرفخانی بدلیسی لە تەمەنی دوازدە سالیەوە تێکەلْ بە کاروباری میری بوە، لەو تەمەنەی سالی ۱۵۵٤ ی زاینیدا کراوە بە میری (سەلیان) و (محمدئاباد) و لەسالی ۱۵٦٦ دا کەتەمەنی ۲٤سالْ بوە نازناوی میری هۆزی (رۆژەکی) پیْ بەخشراوەو ماوەی دوو سالْ لە کۆشکی شاهدا بوە لە (قزوین) و لە سالی ۱۵٦۸ دا کراوە بە فەرماندەی ئەو لەشکرەی خانی ئەحمەدی لاهیجانی ناوچەی (گەیلان) ی دامرکاندوێتەوەو لەشکرە (۱۸) هەزارەکەی (سولتان هاشم) ی جێگری ئەحمەدخانی بەزاندوە و بەوە کۆتایی بەیاخیبوونی هۆزی گەیلان هێنراوە.

لەسالی ۱۵۷٦ دا شرفخان کراوە بە میری هۆزانی کوردی ئێران کە لەو کاتەدا شاە ئیسماعیل چۆتە سەرتەخت (بێگومان ئەم شاە ئیسماعیلە دەبیْ شاە ئیسماعیلی صفوی نەبیْ کەلە سالی۱۵۱٤ دا لەشەڕی چالْدێراندا لەلایەن عوسمانیەکانەوە شکابوو)، وە هەرچی کاری گەورەی کوردستان و لوڕستان بوە هەمووی سپێررا بوو بە شرفخان (شرفخان خۆشی لە شرفنامەدا باسی ئەمەی کردوە)، بەلام ساتێك قزلْباشەکان شاە ئیسماعیلیان بە دۆستی سونیەکان تاوانبار کرد، ئیتر شرفخانی دوورخستەوە بۆ (نەخچەوان) و زۆری نەبرد لە سالی ۱۵۷۸ ی زایندا ئەو شاە ئیسماعیلە کوژراو (محمدخودابەند) چۆتە جێگەی و ئێران کەوتە ئاژاوەیەکی گەورەو، لایەك قزلْباشەکان یاخی بوون و لەولاشەوە لەشکری عوسمانی پەلاماری ئازربایجانی داو عوسمانیەکان توانیبویان شرفخانی داخ لە دلْ بەلای خۆیانا راکێشن، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ڕێگەی (خسروپاشا) ی میری میرانی (وان)ەوە عوسمانیەکان پێوەندیان پێوە کردبوو، بەو جۆرە لەسەرەتای کانونی یەکەمی سالی ۱۵۷۸ دا (یەعنی کە شرفخان تەمەنی گەیشتوەتە ۳٦ سالْ) چوەپالْ عوسمانیەکان و بە خۆیو (٤۰۰) چەکدارەوە لە (نەخچەوان)ەوە روویکردە کوردستان (باکوور) .

بەرلەوەی باسەکەی یەکەمی دوکتۆر کمال تەواو بکەین و بچینە سەر بەشماوەکەی بە پێویستم زانی چەند پرسیارو سەرنجێك دەربارەی هەڵوێست و ڕەفتاری شرفخانی مێژوونووسی کورد بخەمە بەرچاو:

یەکەم: بەپێی شرفنامەکە شرفخانی بدلیسی باسی ژیانی خۆی و باوکی کردوە، پاش ئەوەی باوکی لەگەڵ تورکە عوسمانیەکان تێکچوە، لە زەمانی شاه طهماسبی ئێرانیدا چۆتە ئێران و لەوێ کچی (ئەمیر خان موصلو) ی هێناوە کە شرفخانی لێ بوەو شرفخان خۆی لە شرفنامەدا وتوویەتی لە تەمەنی نۆ ساڵیدا یەنی ساڵی ۹۵۸ ی کۆچی (بەرامبەر بە ۱۵۵۲ ی زایین) بۆماوەی سێ ساڵ لە سایەی ئەو پادشا ڕەوشت پاکەدا مامەوە وساڵی ۹٦۱ باوکم وازی لە حزمەتگوزاری شاه هێناو گۆشەنشینی هەڵبژارد بۆ خۆیو هۆزی (ڕۆژەکی) یویان لە شاه طهماسب نا کە من بەسەرۆك دابنێرم و شاه داخوازیەکانی قبوڵکردن و من هەرچەند تەمەنم دوازدە ساڵان بوو پلەی میرایەتی دامێو ساڵیان) و (محمودئاباد)ی پێبەخشیم لە ناوچەی (شیروان) و لەهاوینەهەواری حەرقان) چوومە لای شا، ئەویش منی بە محمدبەگی لالۆم سپارد کە حاکمی همدان) بوو، خاڵم کچی خوی لێ مارە کردم و سێساڵیشم لە همدان رابورد.

پاش ماوەیەك لە هەرای سوڵتان بایزید کە هاتبوە لای شاو گیرا هات و چوکەران لە ڕۆمەوە (مەبەست تورکیایە) زۆر دەهاتن و ناردیانە شوێن باوکم و ڕیانە شاری (قزوین) و دڵخۆشییان دایەوەو بە میری هۆزی ڕۆژەکی گریهرود) ی سەریە (قوم) یان دایەدەست و ناردیانە ئەوێ بەڵام باوکم ئەوەی ەدڵ نەبوو وازی لێ هێناو شای بەهەشتی (مەبەست طهماسب) بوە منی کردوە ەمیری ڕۆژەکی و دوو ساڵ لە (قزوین) مامەوەو، هەروەکو لەوباسەی دوکتۆر کمالدا دەردەکەوێ شرفخان لەتەمەنی (٣٦) ساڵیدا بەخۆیو (٤٠٠) چەکدارەوە ە (نەخچەوان)ـەوە ڕوویکردوتە باکوری کوردستان....

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە:

ئایا باوکی شرفخانی سونی کەهەموو پەڵپ وبیانوەکەی ئیدریسی بدلیسی بەر لە ٣٠ _ ٤٠ ساڵ لە رقی صفویە شیعەکان هەموو ئەمارەتە کوردەکانی کۆکردۆتەوەو سەرۆکەکانی خستۆتە ژێر سایەی دەوڵەتی عوسمانیی سونیەوە شاه طهماسب چۆن باوەڕی بە باوکی شرفخان و بە شرفخانی بدلیسی کردوە

ئەوڕۆڵە گرنگەیان بداتێ؟ هەروەها چۆن باوکی شرفخان و شرفخان باوەڕیـان بـە طهماسبی شیعە کردوە کە دوژمنێکی خوێنەخۆری کوردو بدلیسەکان بوە وچـون وا سووك و ئاسان چوونەتە باوەشیەوە؟!

هەروەکو لەو باسەی دوکتـۆر کمـال دا دەردەکـەوێ کـە شـرفخان لـە مـاوەی بوونیا لەژێر سایەی شاه طهاسبدا وەکـو دوژمنێکـی سـەرگەرمی خـان ئەحمـەد خان وابوەو شەڕی بۆ شای ئێران کردوە و لە شرفنامەدا بـە شـانازییەوە باسـی چۆنیەتی شکاندنی خان ئەحمەد خانی کردوە.

دوهەم: لـە دوای ئـەو هـەموو بەزمـە ئایـا عوسمانیـەکان چـۆن وابەئاسـانی شرفخانیان قبوڵکردوەو بۆ ماوەی دە ساڵ بەشداری کردوە لەو شەڕانەدا سوڵتان مرادی سێهەم بۆ داگیر کردنی قفقاس کردبووی نازناوی (خان) و فـەرمانڕەوایی بدلیسی بە خۆی و نەوەی دوای ئەو بەخشیبوو، ئەو تورکە داخ لە دڵەی هەمیشە وەکـو دوژمنێکـی خوێنـەخۆی سـەیری کوردیـان کـردوە چـۆن تۆڵـەی شـرفخانی باوکیان لە خۆی نەکردۆتەوە کە ئەمە جێگەی گومانە؟!

بەلێ راستە شرفخان کتێبێکی مێژوویـی زور گرنـگ و نایـابی بـۆ کـورد تۆمـار کـردوەو بـەجێ هێشـتوە، بـەڵام لـە رووی سیاسـی و هـەوڵدان بـۆ دامـەزراندنی دەزگایەکی ئەوتۆ کە بۆنی ئەوەی لێ هاتبێت بە مەبەسـتی دامـەزراندنی بناغـەی ئـەمارەتێکی کـوردی سـەربەخۆ بووبێـت لـەورووەوە هیچـی دیارنیـە کردبێتـی. دوکتۆر کمال مەزهەر بۆ تەواوکردنی باسەکەی سەرچاوە ٣٨ وتوویەتی:

((شـرفخان لـە تەمـەنی (٥٣) سـاڵیدا خـۆی بـۆ نووسـینی مێـژووی کـورد تەرخانکردوەو لە جیاتی خۆی (أبو المعالی شمس الدین بـەگ) ی کـوڕی دانـابوو (بەمەدا دەردەکەوێ کە شرفخان لە ساڵی ١٥٤٢ دا لەدایك بووبێ، دەبێ لەسـاڵی ١٥٤٢ + ٥٣ = ١٥٩٥ دا دەستی کردوە بە نوسینی شرفنامەو لـە سـاڵی (١٠٠٥) ی کۆچیدا لە نووسین تەواوبوە)، بە وجـۆرە شـرفخانی (٣٢) سـاڵی ژیـانی لـەناو جەرگەی ڕووداوە گرنگەکانی ئێران و تورکیاو کوردستانا بردۆتەسـەرو سـاڵەکانی دوایی ژیانی بۆ خزمەتی مێژووی کورد تەرخانکردوە)).

لەو نامەیەدا کە (ضیاء شرفخان) بۆ هەژاری ناردوەو هەژار لـە لاپـەڕە ٧٩١ ی شـرفنامەدا فۆتۆکۆپـی ئـەو نامەیـەی ضیاءشـرفخانی بنەماڵـەی شـرفخانی بڵاوکردۆتەوە، لەوەدا وتراوە شرفخانی باپیرە گەورەم لە سـاڵی ١٦٠٣ یـا ١٦٠٤

- کۆچی دوایی کردوه، بەڵام دوکتۆر کمال بە پێی ئەوباسەی لایوایە شرفخان
ـەوە مردبێت و ئـەڵێ: چونکـە هـەرچۆنێکی لێـك بدەیتـەوە دەبـێ دوای
ـەوکردنی شرفنامە واتەدوای هاوینی ساڵی ١٥٩٨ زایـن کـە ساڵی تـەواوکردنی
ـرفنامە بوە، کۆچی دوایی کردبێت، چونکە رێی تێ ناچێ ئەو پیاوە لەرێگـەی
ـنسەتدا وازی لـە دەسـەڵاتدارێتی هێنـا بـێ، وەلـە دوای نوسـینی شـرفنامە
ـنامەکـەی خستبێتە لاوەو ئـەوەی زۆرتـر ئـەم بۆچوونـە بـەهێز دەکا ئەوەیـە
ـرفخان تەنها ساڵێك وچەند رۆژێکی زیاتر نەویستوە بۆ دانانی بەرهـەمێکی
ـوڵـی وەك ئـەو بەشـەی دوهـەمی شرفنامە کـە بەدەسـخەت (٣٠٨) لاپـەڕەی
ـەورەی پڕکردوەتـەوە، بێگومـان ئەگـەر مـردن موڵـەتی بدایـە ئـەوا رشتـەیەکی
ـرواری رەسـەنی تـری پێشـکەش بـە کـوردو بـە زانسـت دەکرد کەواتـە دەبـێ
ـرفخان بە ماوەیەکی کـەم دوای مـانگی نـۆی سـاڵی ١٥٩٨ زاین کۆچـی دوایـی
ـردبێت یالەتاو نەخۆشی پەکی کەوتبێت کەلام وایە نەخۆشیەکەش کە زانایـەکی
وەکو ئەو پەك بخات بەدەگمەن مۆڵەتی زۆری ژیان و مـان دەدات. ئـەمین زەکـی
مێژوونووسی کورد کە نەخۆشکەوت ونەخۆشی زۆری بۆ بردبوو پەنجەکانی پەکـی
کەوت ئیتر (سانحە)ی کچی کرد بە قەڵەم.

دەربارەی ئەو سەرنجەی دوکتۆر کمال مەزهەر کەلای وایە شـرفخان لـە دوای
تەولوکردنی نووسینی شرفنامە (کەساڵی ١٥٩٨ زاین بوە) دەبێ شرفخان کۆچـی
کردبێت، چونکە دوای ئەوە هیچ نووسینێکی لەپاش بەجێ نەماوە، لام وایە ئـەم
بۆچوونەی لەگەڵ ئەوەی (فیلیا مینۆف.زیرنۆف) کەلە پێشەکی ئەو شـرفنامەی
ـە فارسیەوە وەرگێڕاوە بۆ فرنسـی کـە وتوویـەتی (مسیوکوتك) ئـەو نسـخە
فارسیەی لەسـاڵی ١٠٠٧ دا (یـەعنی دووسـاڵ دوای تـەواوکردنی شرفنامە کەلـە
١٠٠٥ ی کۆچیدا بوە) کە شرفخان خۆی پیاچۆتەوە دیوێتی، بەمەدا دەرئەکـەوێ
شرفخان تا ساڵی١٦٠٠ ژیاوە لەماوەی ١٦٠٠ ـ ١٦٠٣ ی زایینـا دوورنیـە نـەخۆش
بووبێت، یادوورنیە وردەبەرهەمیشـی هـەبووبێو وەکـو زۆر بەرهـەمی تـری کـورد
لەناو چوە).

هـەروەکو شـرفخان خـۆی لـە شـرفنامەدا باسـی کـردوەو دوکتـۆر کمـال
مەزهەریش لە وەرگێڕانەکەی هەژاردا باسی کردوە، شرفخان وتوویەتی:

((منی بێ تین‌و توانـا و بـێ دەسـت و زوان کەوتمـە سـەر ئـەو خەیاڵـەی بـە ئەندازەی وزەو توانای خـۆم، ئەوەنـەی بـۆم لوابێـت لـە بـاس و خواسـی گـەورە پیاوان و خاوەن ناوو سەرداران و خونکارانی کوردو کوردستان بکۆڵمەوەو ئـەوی لـە مێـژووی عەجـەماندا خـۆم دیتوومـەو ئـەوەی لـە پیـاوە ژیرەکـانی ڕاسـت و بێدرۆوە بیستومە نووسیمەوەو ناوی لێبنێم (شرەفنامە)، هەموو نیازو ئاواتیشم هەر ئەمەیە خانەدانەکانی کوردستان لەناو نەچن)).

بەپێی باسەکەی دوکتۆر کمال مەزهەر لەلاپەڕە ١٠٩ لەسەرچاوە ٣٨ دا دەبێ شـرەفنامە لـە دووبـەش پێـك هـاتبێت‌و لەسـاڵی ١٥٨٨ دا دەسـتی کـردوە بـە کۆکردنـەوەی سـەرچاوە زانیاریـەکان و لـە مـانگی ئـابی ١٥٩٧دا لەبەشـی یەکـەمی شـرفنامە بۆتـەوە کەیەکـەم چـاپی ئـەو بریتیـە لـە (٤٥٩) لاپـەڕە لـە ڕۆژی١٢/ ٨ /١٥٩٧ دا دەستی کردوە بە نووسینی بەشی دوهەم و لە دەوروبەری کۆتایی مانگی ئابدا یا لە سەرەتای مانگی‌ئـەیلولی ١٥٩٨دا ئـەو بەشەشـی تـەولو کـردوە کـە ناوی‌نـاوە (خاتمـە)و ئـەو باسـەی بـۆ سـوڵتانەکانی ئـالی عوسمـان و پادشـاکانی ئـێران و تـووران و بەسـەرهاتەکانی کوردسـتان لـە نێوانـی سـاڵانی ١٢٨٧ـ١٥٨٧ ی زاین، واتە بۆماوەی سێسـەدەی ڕەبـەق تـەرخانکراوە، کەئـەم بەشەشی بریتیەلە (٣٠٨) لاپەڕە.

دوکتۆر کمال لەو باسەیدا باسی مەلا مەحموی بایزیدی بـە دوورودرێـژ کـردوە. لەلاپەڕە ١٢٩ دا وتویەتی:

((مەلا مەحمودی بایزید ویستبوی بەلاسایی کردنەوەی شرفخان ڕێگەی ئەو بگرێتە بەرو بەدەستوری ئەو مێژووی کوردو کوردستان لەو شوێنەوە بنوسێتەوە کە لە شرفنامەدا کۆتایی پێهێنرابوو، بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستە ساڵی ١٢٧٤ ی کۆچی بەرامبـەر ١٨٥٧ـ١٨٥٨ لـەدانانی (کتـابی تـأریخ جدیـد کوردسـتان) بۆتەوە کە نزیکـی هـەزار لاپـەڕە دەبـوو کـە لـە پێشـەکیەك و (١٩) بـەش پێـك هاتبوو.

لەساڵی ١٨٦٥ دا (ئەلکساندر ژابا) لەئەرزڕومەوە پێشەکیەکەی ئەو کتێبـەی ناردوە بۆ کۆڕی زانیاری ڕوسی بۆ نرخاندنی و لەقسەکانی ژابادا دەردەکەوێ ئەو کتێبە تەنها یەك دەسنووسـی هـەبوە کـە بەداخـەوە تائێسـتە سـەرەنجامی ئـەو

حنووسە نەزانراوە، خۆ ئەگەر ئەو ترجمەی پێشەکیەی لەلایەن ژاباوە ۔رحمەکرابوو نەبوایە دیارە ئەو باسەی بایزیدیش کەس هیچی لێ نەدەزانی)).

ـوکتۆر کمال لەلاپەرە ١٣٠ ی ئەو سەرچاوەیەدا ئاماژەی بۆ باسێکی بایزیدی ۔رەوە کە بۆ ژابای گێڕاوەتەوەو لە لاپەرە ٥٤ ی پێشەکی شرفنامەی چاپی ۔سیدا دەردەکەوێ هەستی مێژوونوسینی مەلا مەحمودی بایزیدی قوولبوەو ـمیك بوە ساغ بوبوەوە سولتانەکانی عوسمانی ویستبویان کورد و کوردستان ـکەن بە قەلغانی پاراستنی خۆیان و پەرەپێدانی دەسەلاتیان لە هەموو ۔ژهەلاتی ناوەراستدا، کە مەلامحمودی بایزیدی لە زمانی سولتان سلێمانی ـپەروەرەوە (کەبە سلێمانی قانونی ناسراو بوە) بۆ ژابای گێڕاوەتەوە کە ۔تووپەتی:

((ساتێك سولتان سلێمان گەڕایەوە بۆ ئەستەمبولْ، دایکی رووی تێکردوەو ۔ێی ووت: کوڕم ئەوا تۆ گەڕایتەوە، بەلام ئایا لەمەودوا گورجیەکان و ۔زلباشەکان ئیتر هێرش ناهێننە سەر مەملەکەتەکەت.

سولتان لەوەرامیا بە دایکی ئەلێ.. دایکە.. دیوارێکی پتەوم لە نێوانی ۔یمپراتۆریەتی عوسمانی و دەولەتانی گورج و عەجەمدا دروستکردوە ئیتر دوژمن ۔ێی ناکرێ هیچ زیانێکمان پێ بگەیەنێ. ساتێك دایکی لێی دەپرسێتەوە تۆچۆن ۔وانیت لەو مەودا درێژەدا دیواری وا دروست بکەی؟ دووبارە سلێمان بە دایکی ۔ەلێ: دایکە ئەو دیوارەم لە گۆشت و خوێن دروستکردوەو بەرێوەبردنی ئەو ۔وچانەم بەرەو رووی هۆزەکانی کورد کردۆتەوەو دوژمن ناتوانێ زەفەریان پێ ۔بات و ناتوانێ بگاتە دەولەتی ئیسلام)).

دوکتۆر کمال مەزهەر لە کتێبێکی تریدا، سەرچاوە ٣٩ لە لاپەرە ٢٥ دا لە باسی شرفنامەدا وتوویەتی:

((رۆژهەلاتناسان و کورد ناسانی سۆڤێت بایەخی زۆریان بە هەردوو بەرگەکەی شرفنامەداوەو سوودێکی زۆریان لێوەرگرتوە بۆ لێکدانەوەی مێژووی کوردستان و مەلبەندەکانی تری رۆژهەلاتی ناوەراست لە سالانی سییەکانا داوا لە کوردناسی روسی (ف.پ.راستۆپچین) کرا شرفنامە بکا بەروسی، بەلام مردنی ناکاوی نەیهێشت ئەو کارە تەواو بکا.

(راستۆیچین) یەکەم زانایە لە جیهاندا بۆ یەکەمجار (بیبلۆگرافیا) ی لەسەر کورد داناوەو لە ژێر ناوی (بیبلۆگرافیا دەربارەی کێشەی کورد) لە گۆڤاری (رۆژ هەلاتی شۆڕشگێڕ) دا بلاوی کردۆتەوە. یەکێك لەوتارە بەنرخەکانی ئەو نووسەرە بریتیە لە (سەرنج دەربارەی کورد) کە لە ژمارە (١٣ــ١٤) ی سالی ١٩٣٢ی گۆڤاری دەنگ و باسی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بلاوی کردوەتەوە کەلە سەرەتای ئەو وتارەدا هێرشێکی توندوتیژی کردوەتە سەر ئەو مێژوونووسە کورتبینانەی لە خۆڕا خەباتی گەلی کوردیان لەکەدار کردوەو بە توندی رەخنەی لەو نوسەرە سۆڤێتیانە گرتوە کەبە نەزانانە لەژێر پەردەیەکی مارکسیدا تۆمەتی کۆنە پەرستییان داوەتە پال هەموو بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی کورد)).

بەلای منەوە ئەو رەخنەیەی (راستۆیچین) کە دوکتۆر کمال باسی کردوە لەویژدانی زانایەکی بەویژدانەوە هەلقولاوەو، لەراستیدا وەکو لەبەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا لە شوێنی خۆیا روونی دەکەینەوە رەگ و ریشەی ئەو بۆچوونە هەلانەی هەندێ لە نووسەران و مێژوونووسانی سۆڤێت بەرامبەر بە کوردو شۆڕشەکانی، بەتایبەتی شۆڕشەکانی باکوری کوردستان ماکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دۆستایەتیەی لە زەمانی لینینەوە لەگەل مصطفی کمال و تاقمەکەیدا پەیدابوو بوو، بەتایبەتی لەو رۆژانەدا کە پەیمانێکی دۆستانە لەنێوان سۆڤێت و تورکدا مۆر کرابوو، لە تورکیادا إجازەی حزبی شیوعی درابوو بەسەرکردایەتی (حقی بهیج) کە مامۆستا رفیق حلمی لە یاداشتەکانیا بە طورانی ناوی بردوە. وکمالیەکان بۆ مەبەستێکی کاتی لە سۆڤێتەکان نزیك بوبونەوە بۆ دەربڕینی ناحەزیی خۆیان بەرامبەر بە بریتانیای ئەو رۆژانەو زوربەی نووسەرانی سۆڤێت دژی سەرکردەی تورکەکانی باکوری کوردستان بوون وەکو شۆڕشەکەی شێخ سعیدی پیران ١٩٢٥ کەتورکەکان بۆ زڕاندنی ناوو مەبەستی شۆڕشەکەی شێخ سعید ئەو شۆڕشەیان بە هاندانی بریتانیا لەقەلەم دابوو، لەبەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا لە باسی شۆڕشەکەی شێخ سعیددا ئاماژە بۆ ئەو بەلگەو دۆکیومێنتانە دەکەین کە ئینگلیزەکان هەرخۆیان ئەوانەیان بەدرۆخستۆتەوەو راستی ئەو درۆیانەیان بە تورکەکان گەیاندوە، لەلاپەرە ٤٤١ ی بەرگی دوهەمی کتێبەکەی شێخ مەحمودا (سەرچاوە ٨٠ بەدورودرێژی باسی ئەو پەیمانەی نێوان سۆڤێت و کمالیەکان کراوە کە لە دۆکیومێنتی ژمار (fo.371_6349) ی سالی ١٩٢٢دا

ئەرشیفی وزارەتی دەرەوەی بریتانیادا هەیە، کەئەو پەیمانە لە ژێر ناوی بنیاوی یەکێتی و هاوکارییەکی دۆستانەو برادەرانە لەلایەن علی فؤاد پاشاو دوکتۆر رەزا نوری نوێنەری تورك و (djomel kork mazoff, tchitcherim) ی نوێنەری سۆڤێتەوە مۆرکراوە.

دوکتۆر کمال مەزهەر لەباسەکەیدا دەچێتەوە سەر باسی شرفنامە ـ چاپی رۆسی ـ وتویەتی یەکەم کەسێك دوکتورای لەسەر شرفنامە وەرگرتوە (مەمید ئەمسی)ی زانای ئازربایجانی بوەو لە باسی بەرگی یەکەمی شرفنامەدا ـ چاپە رۆسیەکەی ـ وتوویەتی بریتیە لە (٦١٩) لاپەڕە بە پێشەکیەکەیەوە.

(هێر. بیلو) لەساڵی ١٧٧٦دا بەزمانی فەرەنسی لە کتێبەکەیدا باسی شرفنامەی بە جیهانی زانیاریی رۆژئاوا گەیاندوەو ئەونووسەرە فرنسیە بەهۆی یەکێك لە گەڕیدەکانی کانی تورك کەناوی (کاتب چلبی) بوە بەبوونی شرفنامەی زانیوە. لەپاش ئەو (جۆن مالکۆلم ١٧٦٩ـــ١٨٣٣) یەکێك بوە لەو کاربەدەستانەی ماوەیەك لە هیندستان و ئێران کاری کردوە چەند سەرچاوەو دەسنوسی کوردی دەستکەوتوە یەکێك لەوانە دەسنووسێکی شرفنامە بوە.

لە دوای مالکۆلم بەماوەی بیست ساڵ مێژوونووسی فرنسی (کاترمێن) لەزۆر شوێنی ئەو کتێبەیدا کە لەساڵی ١٨٣٦ لەپاریس بەناوی (مێژووی مەغولەکانی ئێران)ەوە بلاوی کردوەتەوەو کەڵکی لە شرفنامە وەرگرتوە.

جگە لەوانە، کاربەدەستی کۆڕی زانیاریی ئەوسای روسیا (ڤلیامینوف ـ زێرنۆف) توانی لە ساڵی ١٨٦٠ دا بەرگی یەکەمی شرفنامە بە پێشەکیەکی (٢٠) لاپەرەیی بەزمانی فرنسی بلاویکاتەوە لە دوای دووساڵ بەرگی دوهەمیشی بەپێشەکیەکی (٧) لاپەرەیی بە فرنسی بلاوکردوتەوە. بەپێی ئەو زانیاریانەی (ی.ڤاسیلیڤا) کۆیکردوتەوە، ژمارەی تۆمارکراوەکانی دەسنووسی شرفنامە لەکتێبخانە ناسراوەکانی جیهانا دەگاتە (٢٢) دانەو کۆنترین و بەنرخترین و راسترین دەسنووس بریتیە لەو دانەیەی بەدەسخەتی شرفخان خۆی نوسراوە بەناوی (شرفنامە تأریخ کوردستان) و ئێستە ئەو نسخەیە لە کتێبخانەی (بودلیان) ی زانکۆی ئۆکسفۆرد هەڵگیراوە کە بریتیە لە (٢٤٦) پەڕەو بەبیست وێنەی دەگمەن رازێنراوەتەوەو لە کۆتایی ذی الحجەی ساڵی ١٠٠٥ ی کۆچیدا کە دەکاتە ١٣ ٨ ١٥٩٧ی زایین لە بەرگی یەکەمی بۆتەوەو بەرگی دوهەمیشی لە

مانگی مایسی ١٥٩٩دا تەواو بوە))... (لام وایە ئەمەی مایسی ساڵی ١٥٩٩هەڵەی چاپەمەنی بێ وەکو باسیدەکەین).

ئەوەی شایانی باسە لەم باسەی دوکتۆر کمال مەزهەر دووشت سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ :ـ

یەکەم ـ وەکو لە پێشتردا باسمانکردوە، دوکتۆر کمال مەزهەر لە باسێکی تریا سەرچاوە ٣٨ لاپەڕە ١١٠ وتوویەتی بەرگی دوهەم کە شرفخان ناوی ناوە (خاتمە لە کۆتایی مانگی ئابدا یا لەسەرەتای ئایلولی ١٥٩٨دا شرفخان لە نوسینی بۆتەوە بەلام لەم سەرچاوەیەدا ٣٩ دا وتویەتی لەمانگی مایسی ١٥٩٩ دا بەرگی دوهەمی تەواو کردوە کە بێگومان دەبێ یەکێکیان هەڵەی چاپەمەنی بێ. دوکتۆر کمال مەزهەر خۆی لەو باسەی لە سەرچاوە ٣٨ دا لێیدواوە کە بەرگی دوهەمی لە دوای ساڵێك و چەند رۆژێك پاش بەرگی یەکەم تەواو کردوە. بە پێی ئەمە دەبێ تەواوکردنی بەرگی دوهەمی کە مانگی ئاب یا سەرەتای ئەیلول بوە وەکو لەسەرچاوە ٣٨ دا لێی دواوە راستربێت وەك لە وەی سەرچاوە ٣٩ کە وتراوە لە مانگی مایس ١٥٩٩ دابوە و وادیارە ئەمەیانە کە هەڵەی چاپەمەنی بێ. بێجگە لە ساڵی تەواوکردنی بەرگی دوهەم کە وتراوە بۆ سوڵتانەکانی ئالی عوسمان و پادشاکانی ئێران و توووران و بەسەرهاتەکانی کوردستان لە نێوان ساڵانی ١٢٨٧ــ ١٥٨٧ زاین تەرخانکراوە، باسی ئەمانە هیچیان لەو وەرگێڕانەی (هەژاردا) ناویان نەهاتوەو بەمەدا دەردەکەوێ کە ئەوەی هەژار وەری گێڕاوە بۆ کوردی بەشی یەکەمی شرفنامە بوە کە لە مانگی ئابی ١٥٩٧ دا تەواو بوە کە سەیر ئەوەیە تا ئێستە هیچ شتێك دەربارەی ئەو بەشەی دوهەم لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەکراوە و ئایا ئەو بەشەی دوهەم هەریە فارسی ماوەتەوەو بۆ هیچ زمانێکی تر وەرگێڕاوە ؟ (لام وایە ئەبوایە لەوەی هەژاردا بوترایە بەرگی یەکەمی شرفنامە) دوکتۆر کمال مەزهەر لە لاپەڕە ٣٠ ی سەرچاوە ٣٩ دا باسی دوهەم دانەی شرفنامەی کردوە کە بریتیە لەو دەسنوسەی لە کتێبخانەی گشتیی لیننگراد دا هەڵگیراوە و مێژووی نووسینەوەی لە ساڵی ١٥٩٨ دا بوە و شرفخان خۆی پیاچوەتەوەو بە دەستی خۆی مۆری تایبەتی خۆی پیادا ناوە ، بەلام بەداخەوە چەند شوێنێکی کەمی ئەم دەسنوسە نەماوەو شایانی باسە ئەم دەسنوسە یەکێکە لەبەرهەمە

ەرخەکانی بەناوبانگی زەمانی صفوییەکان کە روسەکان لەرۆژگاری شەڕی ۱۸۲۸_۱۸۳۰دا لە (ئەردەبیل)ەوە بردویانە بۆ بترسبرگ.

دوکتۆر کمال لە هەمان لاپەڕەی ئەو سەرچاوەیەدا باسی دەسنوسێکی تری کردوە کە لە ساڵی ۱٦۰٦ دا لە شاری (کلس) لەلایەن (حسن کوڕی عزالدین)ەوە لەبەر نسخەی شرفنامە بە بێ دەسکاری لە (۳۲۷) پەڕەدا نوسراوەتەوە، ئێستە لە کتێبخانەی (بودلیان) لە زانکۆی ئۆکسفورده لە بریتانیا. (ڤاسیلیا) باسی چەند دەسنوسێکی تری شرفنامەی کردوە لە مۆزەخانەی بریتانیاو ئەستەمبوڵ و چەند شوێنێکی تردا پارێزراون.

مەلا مەحمودی بایزید لە دوای دووسەد سال تێپەڕ بوون بەسەر نوسینی شرفنامەدا بەرگی یەکەمی شرفنامەی کردوە بە کوردی (۱۸۵۸_۱۸۵۹) کە ئەم کارەی مەلا مەحمود بە هاندانی (ئەلکسەندەر ژابا) بوە ئەو وەرگێڕانەی بیزیدی لە کتێبخانەی گشتیی لیننگراد هەڵگیراوە (ئاخۆ ئەو وەرگێڕانەی بایزید ئەگەر لە گەڵ ئەمەی هەژاردا بەراورد بکرێت تۆبڵێی جیاوازی لە نێوان هەردولایانا هەبێ ؟ کەلام وایە دەبێ جیاوازی هەبێ چونکە هەژار خۆی لە لاپەڕە ٤۳ دا لە پێشەکیەکەیدا وتوویەتی (هێندێك جنۆکەو منۆکە و بۆغدوزی خوێنتاڵ و شتی لە ئارەزوو بەدەرم لێ دوور خستنەوەو کێشامنە ناو پێشەکیەکەی خۆمەوەو لە هەتیتەم داون و بە هیوام گیانی پاکی ئەو میرە نازدارە گەش و شاد بێ و لێم نەڕەنجابێت)).

دوکتۆر کمال مەزهەر لە تەواوکردنی باسەکەیدا ئەڵێ: لەنێوان ساڵانی ۱۸۵۳_۱۸۵۹ دا لە شاری (ڤیان) شرفنامە لەلایەن (گ.أ.باریە) وە کراوە بەئەڵمانی و پێشەکیەکی بۆ نوسیوە کە بوە بە هۆی ناساندنی نەتەوەی کورد لای زاناکانی رۆژئاواو پرۆفیسور (ڤ.ب.شارموا) کە گەورە ترین فارسی‌زانی ئەوروپا بوە لەو سەردەمەدا لە ساڵانی ۱۸٦۸_۱۸۷٥دا هەردوو بەرگەکەی شرفنامەی بەزمانی فرنسی لە چوار بەرگدا لە (پیتەبورگ) بلاو کردبوەوە.

(یوسف ئەبگارەڤیچ ئۆربیللی) کە ئەرمەنی بوە و مێژوونوسێکی بەناو بانگ بوە وتویەتی شرفنامە کارێکی زۆر گەورەی کردۆتە سەر ژیانی روناکبیریی رۆژهەلات و کورد گەلێك رۆڵەی لە ژێر ناوی تورك و فارس و عەرەبدا لە دەس دلوەو شاعیرو مۆسیقارو جەنگاوەریان مێژووی چەند گەلێکیان رازاندوەتەوە کە

ئەمە کارێکی وای کردوە لە ناو زانستی ئەورووپادا واباو بێ گوایا کورد نەك تەنها ناتوانێ شتێکی نوێ لە رووناکبیریدا بێنێتە کایەوە، بەڵکو توانای ئەوەشی نیە لە بێگانەشەوە هیچ فێر بێت، بەڵام هەروەکو (ڤاسیلیا) وتویەتی بە هۆی شرفنامەوە دەتوانرێ کەلێنێکی گەورەی مێژووی گەلانی رۆژهەلات پڕ بکرێتەوەو شوێنی راستەقینەی خۆی تێدا دیاری بکرێت.

دوکتۆر کمال لەباسەکەیدا چۆتە سەر باسی هەستی نەتەوایەتی لای شرفخان و وتویەتی:

((ئەوەی گیان و هەستی شرفخانی بزواندبوو بریتی بوە لە هەستێکی کوردایەتی کە ئەم هەستەی جارەها لە بۆچوونەکانی ناو شرفنامەدا دەردەکەوێ.

بۆ نمونە: لە سەراپای شرفنامەدا بە ئاشکرا یا بەژێرلێوەوە، بە ناوی هەلدانی بەشان و باهوی سوڵتانەوە وتوویەتی: کوردستان وڵاتێکە نە بەکەس دلگیر دەکرێت و نە سەریش بۆ هیچ کەسێك شۆڕ دەکا (سافرستیانیش لە دائرە المعارفی بریتانیادا بەرگی ساڵی ١٩٤٤ دا وتوویەتی: (کورد بەرلەوەی ببێ بە ئیسلام سەری بۆ کەس دانەنەواندوە). جگە لەوە، شرفخان یەکەم کەسە هەوڵیداوە بە شێوەیەکی دروست و بێ پێچ و پەناو دەسکاریکردن سنووری کوردستان دیاری بکا. کە کەوتبوونە نێوان ئازربایجان و لورستان و رۆژئاوای زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس، بەڵام لە شرفنامەدا سنووری کوردستان لە (ملاتیە-ملاطیە) وە دەس پێ دەکا و لەسەر رۆخی خلیج (مەبەستی خلیجی فارسی-عربی) کۆتایی دێ کە ئەمە نیشانەی ئەوەیە لەسەردەمی سەدەی شازدەهەم (مەبەست ساتی ژیانی شرفخانە) سەرەتای دروست بوونی هەستی نەتەوایەتی لەناو سەردارانی کوردا لە ئارادا بووە. لەکۆتایی باسی ئەوانەی شرفنامەیان گۆڕیوەتە زمانی بێگانە و چاپیان کردوە یا لەسەریان نوسیوە باسی ئەم پێشەکیەی (پرۆفیسۆر.ف.ب.شارموا) کە بۆچاپکردنی هەردوو بەرگەکەی شرفنامە کە لەنێوان ساڵانی ١٨٦٨_١٨٧٥ دا، کە بەرلەمە دوکتۆر کمال مەزهەر باسی چاپکردنی کردوە، هەروەکو بلەچ شێرکوەلەلاپەرە ٤١ ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ باسی ئەو پێشەکیەی کردوە، ئێمەش هەروەکو چۆن بلەچ شێرکوە_ جلادت بدرخان _ باسی کردوە، پێشکەشی خوێندەوارانی دەکەین.

((ئـەو میلەتانـەی لەسـەر شـانۆی مێـژوودا لـە دێـر زەمانـەوە ڕۆڵـی خۆیــان دیتیوە، بەپێی ئەو شوێنەوارانەی لێیان بـەجێماوە، توانـراوە ڕادەی گـەورەیی و پێشکەوتنیان بزانرێ، وەکو شەعبی میصری کە شـوێنەکەیان مەڵبـەندی لانکـەو پێشکەی فەلسەفە بوە.

هـەندێ میللـەتانی تریش هـەن وەکـو یۆنانیــەکان و ڕۆمانیــەکان بــە هــۆی پێشکەوتنیان لـە ڕووی هونـەرو ڕێکخســتنی کاروبــاری سیاســی و زانیاریــەوە چوونەتە ناوچەرگەی باسەکانی مێژووەوەو میللەتی واش هەبوە بە هۆی سروشتی حـەز لـە وێرانکـاری و خوێن ڕشـتن و کوشـتنەوە لەهـەر شـوێنێکدا کـە جێ‌پێـی خۆیانیـان تیـادا کردبێتـەوە ناوبانگیـان دەرکـردوە هـەروەکو (هۆن)ـەکان لــە زەمـانی (ئـاتیلا) و مەغۆلــەکان و تاتارەکـان بەسـەرکردایەتی جـەنگیز خــان کەچوونەتـە هەرشـوێنێك شـوێنەواری وێرانکـاری و کـاولکردن و کوشـتارو خوێـن ڕشتنیان دوای خۆیان بەجێ هێشـتوە. میللـەتانی تـری واش هـەبوون بەداخـەوە ناوبانگیان بڵاونەبۆتەوە لەگەڵ ئەوەشدا ڕەوشتی ئازایانەو جوامێرییــان لـەکۆڕی جەنگـەکانا شـتێکی ئاشـکرابوە لـە ناوچـەکانی ئاسـیاو ئـەفریقادلو یــەکێك لــەو میللەتانە بریتیە لە میللەتی کـورد کـە لـەدێر زەمانـەوە ئازایـەتی و جوامێرییـان شتێکی ئاشکرا بوە وەکـو ئازایەتیەکـەی (ڕۆسـتم) کەبەڕاسـتی بـە (هرقـل) ی ئێران ناسراوە. هەروەها ئەو کارە گرنگ و مەزنانەی صلاح الدین ئەیوبی و (ملك عادل) ی برای کە لە شەڕی خاچپەرستەکانا دژی (فلیپ ئۆگوست) و (ریچــارد) و (لوزینیان) جەنگاون بەخۆیان و سەرکردەکانیانەوە.

بێجگە لەوە میللەتی کورد هی‌وەکـو کریـم خـانی زەنـدی تیـا هەڵکـەوتوە لـە نیوەی دوهەمی سەدەی هەژدەدا ئەویش بە (تیتوس) ی ئـێران ناسـراوەو شـان بەشـانی ئەوانـە، کـورد مێژوونـاس و ئـەدیبی ناسـراوو بـەناوبانگی وەکـو (الابن الاثیر) و (أبی الفدا) ی مێژووناس و شـارەزاو مێژووناسـی وەکـو بدلیسـی تیـادا هەڵکەوتوە)).

هەتا ئێرە بریتی‌بوو لەوانەی دەربارەی شـرفخان و شـرفنامە دواون و لـێرەدا فۆتۆکۆپـی سـەربەرگی شرفنامە وەرگێڕاوەکـەی (ولیـانۆف) زرنـۆف دەخەینــە پێش چاو لەگەڵ فۆتۆکۆپی پاش بەرگی ولیانۆف.

# شرف نامه

## بسم الله الرحمن الرحيم

افتتاح سخن حمد وثنای پادشاهی باید که ثنای ستایش از ضمیر منیر چون خورشید جهان کبر تا مدارج سپهر برین برآید. واختتام کلام شکر وسپاس مالك الملکی شاید که انتمای اعتلایش. از سکنهٔ سینه تا معارج سعود صعود نماید الحمد لله فی الاولی والآخرة سلطانی که از صدای خطبهٔ وجعلناکم خلائف فی الارض اعزاز واحترام بنی آدم را در نُه پایهٔ کرسی عرش بادا رسانید وحاکمی که نقد حشمت انسانرا در دار الضرب عنایت

لاپەڕەی یەکەمی بەرگی یەکەمی (( شەرەفنامە ))

# جلد دویم

از

# کتاب شرف نامه

تالیف

## شرف خان بن شمس الدین بدلیسی

که باهتمام اقل عباد

## ولادیمیر ملقب ولیامینوف زرنوف

در محروسه

پطربورغ

در دار الطباع اکادمیهٔ ایمپراطوریه

سنهٔ ۱۸۶۲ عیسوی

مطابق سنهٔ ۱۲۷۸ هجری

مطبوع گردید

**وێنەی (بەرگ) ی بەرگی دووهەمی شەرەفنامە**

بەر لەوەی کۆتایی بەم باسەی شرفخان بدەین بەپێویستم زانـی ئـەو هـەوڵ و کۆششەی زۆرەی مامۆستا هەژار فـەرامۆش نەکـەین کـە لـەدوای مـاندووبوونێکی زۆرو گـەڕان بـە دوای ئـەو سـەرچاوانەدا کـە دەربـارەی شـرفنامە نووسـراون لـە هـەموویان زانیاریـیـەکی زۆری کۆکردوەتـەوەو لـە پێشـەکیەکەدا باسـی کـردوەو بەوەشەوە نەوەستاوە بەڵکو بەرلە چـاپکردنی شـرفنامە بەرهەمەکـەی خسـتۆتە بەردەسـتی ژمارەیـەك لـە زانایـان و پسـپۆڕانی کـورد وەکـو مامۆسـتایان مەسعودمحمد و علاءالدین سجادی و محمدجمیل رۆژبـەیانی و دوکتـۆر کمـال مەزهـەر و هێمـن موکریـانی بۆ ئـەوەی هەریەکـەیان سـەرنجی خـۆی دەربـبڕێ بەرامبەری و لە پێشەکیەکەیدا چەند لاپەڕەیەکیشی تەرخان کردوە بۆ ئەو زاناو مێژوونووسانەی کورد کە لەکاتی خۆیدا خزمـەتی مێژووی کـورد و کوردسـتانیان کردوە وەکو ئەمین زەکی و حوزنیموکریـانی و محمدجمیـل روژبـەیانی (کـە لـە کـاتیخۆی شـەرفنامەی لـە فارسیـەوە کـردوە بـە عـەرەبی)، لەگـەڵ دەقـی ئـەو پێشـەکیەی محمدعلیعونـی لـە وەرگـێڕانی شـرفنامەدا لەسـاڵی ١٩٥٨ دا لـە فارسیەوە بۆ عەرەبی چاپی کردوە.

لەلاپـەڕەی دوای پێشـەکیەکەی هـەژار وێنەیـەکی شـرفخانی بدلیسـی تیـادا بڵاوکراوەتـەوە کـە هونەرمـەندی نەخشـەکێش (بدیـع باباجـان) بـە خـەیاڵ بـۆ شەرەفخانی کێشاوەو لەژێریا نووسراوە شـرفخانی بدلیـس ٩٤٩ـ ١١١٢ ی کۆچـی کە بێگومان ئەوەی (١١١٢) هەڵەی چاپەمەنیەو راستیەکە بریتیە لەسـاڵی ١٠١٢ کەبـەپێی ئەمـە شـرفخان ٦٣سـاڵ ژیـاوە هەرچـەندە وەکـو لـە نامەکـەی ضیاءشرفخاندا دەردەکەوێ کەلەساڵی ١٥٤٣ زایندا لەدایك بوەو سـاڵی ١٦٠٣ یا ١٦٠٤ کۆچی دوایی کردوە.

بەپێی وەرگێڕانەکەی هەژار، شرفخان شرفنامە (بەرگی یەکەمی) کـردوە بـە چواربەشەوە کەبە (ڕووپەڕ) ناوی بردون:

**ڕوپەڕیەکەم :**

بریتیە لەباسی ئەو فەرمانڕەوا کوردانەی لە کوردسـتانا ئـاڵای سـەربەخۆییان هـەڵکردبوو وەمێژوونووسـان ئەوانـەیان لـەریزی پادشـایانیان ژمـاردون وەکـو فـەرمانڕەوایانی دیاربـەکرو جزیرەودینـەوەرو شـارەزور (کـە ئەمـەی دوایـی بـە

حەسنەوەیە ناسراون و مامۆستا جمیل رۆژبەیانی لە ساڵی ١٩٩٦دا کتێبێکی چیوەبەناوی (حەسەنوەیهی و عەیاری) و فەرمانڕەوایانی لوڕی گەورەو چوک و بنەماڵەی ئەیوبیەکان لە میصرو لە شام.

ڕووپەڕی دوهەم :

باسی مێژوی ئەو گەورە پیاوانەی هەرچەند دەرفەتی سەربەخۆییشیان بۆ ڕەخسا بوو بەڵام خۆیان بەپادشاه نەزانیوە، وەکو فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان، هەکاری (شەنبۆ) و (ئامیدی کە بە بادینان بەناوبانگ بون)، فەرمانڕەوایانی جزیرە (کە بە بەختی- بەختیە)ی ناوبرابون، فەرمانڕەوایانی (حصن کێف - حصن کێف - کەبەملکانیش ناسراو بوون).

ڕووپەڕیسێهەم:

فەرمانڕەوایان و کاربەدەستانی تر لە کوردستاندا وەکو (چەمشکەزەك) و مرداسی و ساسون، خیزان، کلیس=کلز، شیروان، زەرقی، سویدی. سەیرنەوەیە لە بەشی دوهەمی ڕووپەڕی سێهەمدا لاپەڕە ٤٨٤ وتوویەتی، ئەم بەشە دوازدەبەندە و لەلاپەڕە ٤٨٤-٥٩١ باسی شەش بەندی کردوەو بەندەکانی ٩،٨،٧ هیچیان دیارنین و لەلاپەڕە ٥٩٢ دا چۆتەوە سەر بەندی دەهەم).

ڕووپەڕیچوارەم:

شرفخان ئەم بەشەی بەتایبەتی تەرخانکردوە بۆ فەرمانڕەوایانی بدلیسی کە خۆی لەو بنەماڵەیە بوە و لەوەدا باسی شاری بدلیسی کردوە لەگەڵ هۆی ئاوەدان کردنەوەی شاروقەلاکەی.

## بەشی دەهەم

# شۆڕشەکانی کورد لەباکووری کوردستاندا هەتا پێش شەڕی یەکەمی جیهانی

لە باسەکانی پێشوودا لەوە دواین چۆن دەوڵەتی عوسمانی پاش ئەوەی لەوشەڕانەدا لە رۆژهەلاتی ئەورووپادا کردبووی و گەیشتبوە نزیك شاری (ڤینا)، رۆدی پێنەچوو شکاو بەناچاری پاشەکشەی کردو گەڕایەوە ناوسنوری تورکیا پاش ئەوەی تووشی زیانێکی زۆری گیانی و ماڵی بوو، بەوباج و سەرانە زۆرەی لە دانیشتوانی خاکی عوسمانی دەسێنرا نەتوانرا کاروباری دوڵەتی پێبەرێت بەرێوە بەتایبەتی دوای ئەوەی کەوتە ژێر بارێکی زۆر گرانی قەرزی ولاتەکانی رۆژئاوای ئەورووپاوەو ئەمارەتەکانی کورد لە ئەنجامی ئەوبارو دۆخە تازەیەدا بوو بە قۆچی قوربانیی سیاسەتی کاربەدەستانی عوسمانی کەیەك لەدوای یەك ئەمارەتەکانی کورد هەڵوەشێنرانەوەو لە شوێنی میرە کوردەکان والی سەرکردەی هێزی سوپاکان لە تورکەکان دەسێنرا بۆ بەرێوەبردنی ناوچە کوردیەکان و میللەتیکورد تا ئەهات لەژێر باری جەورو ستەمی کاربەدەستانی تورکدا دەیناڵاندو بارودۆخی باری ژیانی کورد گەیشتە رادەیەك ئیتر نەیتوانی لەوە زۆرتر بیدەنگ بێو ناچارکرا دەستی دلیە چەك و لەزۆر شوێنی کوردستاندا خەلك یاخی بوو دژی کاربەدەستانی عوسمانی راپەڕی و شۆڕشی کرد.

لەم باسەدا هەوڵئەدەین باسی راپەڕین و شۆڕشەکانی کورد بکەین هەتاپێش شەڕی جیهانی یەکەم و لە بەرگی دوهەمدا شۆڕشەکانی کورد لەشەڕی جیهانیەوە هەتا شەڕی جیهانی دوهەم باس دەکەین. لە راستیدا نووسینێکی تێروتەسەل دەربارەی هەریەکێك لەو راپەڕین و شۆڕشانەی باکوری کوردستان ئەوەندە دوورودرێژە و هەریەکەیان پێویستی بە چەند کتێبێك هەیە دەربارەی

ـومرێت، بۆیە لێرەدا هەوڵدەدەین کورتەیەکی راپەڕین و شۆڕشە گرنگەکان
ـس بکەین لە باکوری کوردستاندا بە ئومێدی ئەوەی لەدوا رۆژدا لەلایەن
ـۆمەیەك لە زانایان و پسپۆڕان باسی ئەو شۆڕشانە بە زنجیرە کتێبێك تۆمار
ـکرێت وەکو چۆن میللەتانی تر لەدوای ئازاد بوونیان بەو کارە هەستاون.

دەربارەی راپەڕین و شۆڕشەکانی کورد، (باسیل نیکتین) لەلاپەرە ۱۸۱ ی
سەرچاوە ٥٤ دا پرسیارێکی ئێجگار زۆر گرنگی کردوەو وتوویەتی: ئایا کورد لە
ـوتایا هەیە دەوڵەتێکی تایبەتی خۆی هەبێت؟؟ ئەگەر هات و ئەو دەوڵەتە پێك
ـت ئایا ئەو دەوڵەتەخۆی پێ رادەگیرێت و دەمێنێت؟ ئایا لە ئەنجامی
ـوستبوونی ئەو دەوڵەتەدا هیچ کێشەیەکی وا پەیدا دەبێ ببێتە هۆی ئالۆز
ـونی باری ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست؟؟))

بێگومان هەرخۆی بۆ وەرامی پرسیارەکەی وتوویەتی: بێگومان چەند
ـەرامێك و چەند کێشەیەك دێنە پێشەوە، بەڵام ئایا ئەوانە هیچیان دەبێ ببنە
ـۆی بیانووی ئەوەی چارەسەرێك نەدۆزرێتەوە بۆ کێشەی کورد؟ لەراستیدا
ـتێکی نارەوایە رووداوەکانی ناو کورد بەیاخی بوون و ئاژاوەو سەرکێشی کردن
ـقەڵەم بدرێ، چونکە ئایا مێژووی میللەتانیش ئەوەیان بۆ ئاشکرا نەکردوین کە
سەرەتای بزوتنەوەو راپەڕینەکانیان هەر بەشێوەیەکی چەکدارانە دەستی
ـێکردوە وەکو ئەمەی کورد کردویەتی و دەیکا؟)). بەڕاستی ئەوپرسیارەی
ـاسیل نیکتین پرسیارێکی مێژوویی ئێجگار گرنگە و ئیمڕۆ کورد لە هەموو کاتێك
ـۆرتر پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ هەیە و پێویستە لە رێگەی
کۆنگرەیەکی نەتەوایەتی کوردەوە کە لە نوێنەرانی هەموو بەشە داگیرکراوەکانی
کوردستان پێك بێت و لەرێگەی پسپۆڕان و شارەزایانی ناو ئەو کۆنگرەیەوە
ستراتیجیەك بۆ هەربەشێك لە بەشەکانی کوردستان بەشێوەیەکی گشتی و بۆ
سەرانسەری کوردستان بە شێوەیەکی تایبەتی دابنرێت و ئەورێبازە بگرێتەبەر
کە میللەتانی تر چۆن گەیشتوون بە ئامانجی خۆیان کوردیش رێبازی ئەوان
بگرێتە بەرو پەند و دەرس لەرابوردوو لە هەڵەکانی شۆڕشەکانی پێشووی کورد
وەربگیرێ بۆ ئەوەی کورد تووشی هەمان ماڵ کاولی و کارەسات نەبێ وەکو

ئەوانەی پێشووی. باسیل نیکیتن لەکتێبەکەیدا شۆڕشەکانی کردوە بەسێ قۆناغەوە:

قۆناغی یەکەم: بریتیە لە دەسپێکردنی یاخی بوون و ڕاپەڕین و هەرای کۆمەلآیەتی و دەسپێکردنی ڕاپەڕین و شۆڕشی دەرەبەگایەتی.

قۆناغی دوهەم: بریتیە لە شۆڕشی تورك كە وا حسابی بۆ کرابوو کوردیش لەئەنجامیا بزوتنەوەو شۆڕشی خۆی دەس پێدەکا بۆئەوەی یاسایەك دابنرێت کە باسی کوردیشی تیا دەسنیشان بکرێت.

لام وایە باسیل نیکتین مەبەستی لە أصلاحاتی دستوریيە کە أتحادو ترقی داوای دانانی دەستوورێکی کردبوو بۆ ولایەتی عوسمانی کە کوردیش لەو چالاکیەی أتحادوترقیەدا بەشدار بووە بە ئومێدی ئەوەی مادەکانی ئەو دەستوورە میللەتی کوردیشی تیا دەبێ.

قۆناغی سێهەم: بریتیە لە باسی کورد لە دوای شەڕی جیهانیی یەکەم کە لەپەیمانی سیڤەردا ناوی کورد هاتە کایەوەو لە ساڵی ١٩٢٧ دا خۆیبون وەکو ڕێکخراوی سیاسی و لێپرسراوی کورد هاتە ئاراوە (لەراستیدا لە پەیمانی لۆزانید پەیمانی سیڤەر زیندە بە چاڵ کراو ناوی کورد پشت گوێ خرا) باسیل نیکتین باسی چەند شۆڕش و ڕاپەڕینێکی کردوە وەکو شۆڕش و ڕاپەڕینی عبدالرحمن پاشای بابان لەساڵی ١٨٠٦ داو شۆڕشی بلباسەکان لە ساڵی ١٨١٨ داو ڕاپەڕینی کوردەکانی بایزیدو وان. باسیل نیکتین لەو باسەیدا دەربارەی شۆڕشەکانی کورد ئاماژەی بۆ باسیکی (ڤیلچێڤسکی) کردوە کە وتویەتی ئەو شۆڕشانە تەنها هەر بریتی نەبون لە شۆڕشی چەند سەرۆکێکی کورد، بەڵکو شۆڕشی جەماوەریی ڕاستی بوون و لە ئەنجامی جەورو ستەمی کاربەدەستانی تورك، کورد ناچاربوە دژی حکومەت ڕاپەڕێ و بەوجۆرە لە ساڵانی ١٨١٨، ١٨٢٠، ١٨٢٢ دا زنجیرەیەك بزوتنەوەو هەرا دژی تورك و عەجەم ڕوویدا.

باسیل لە باسەکەیدا لەوە دواوە کە تەنها هەر کێشەی ئابووری هۆی ڕاپەڕینەکانی کورد نەبوە بەڵکو هەستی نیشتمانپەروەرێتیش ڕۆڵێکی زۆر کاریگەری بینیوە لەڕاپەڕینەکانی سەرکردەکانی کورداو جەماوەریش چوونەتە پاڵیان.

دوکتۆر جمال نەبەز لە کتێبەکەیدا کوردستان و شۆڕشەکەی، سەرچاوە ٣١ لەلاپەڕە ٨٤ دا باسی زنجیرە شۆڕشەکانی کوردی کردوە لەسەدەی نۆزدەهەمدا دژی حکومەتی تورک، کە دەوڵەتی عوسمانی هەمان چەکە کۆنەکەیان بەکارهێنا کە بریتی بوو لە چەکی ئاینی بۆ لەناو بردنی ئەو شۆڕشانەی کورد.

دوکتۆر جمال نەبەز لەباسەکەیدا ئەڵێ:

((یەکێك لە بەدبەختیەکانی کورد بریتیبوە لەنەبوونی ئاینزایەك یا قوتابخانەیەکی فەلسەفی، واتە نەبوونی ئایدیۆلۆژێکی تایبەت بەخۆو ڕەنگە ئەگەر شتێکی لەوبابەتەی هەبوایە بیتوانیایە هەموو کورد یەك بخات هەروەکو چۆن شیعەگەریتی هەموو فارسەکانی کۆکردەوەو بەرەو ئامانجێك بردنی. ئەبریتی ئەوە کوردەکان بوونە پاشکۆو بەپابەندی تورك و فارسەکان و خۆیان کرد بەقوربانی دەوڵەتەکانیان لە ئەنجامی ئەوەدا کورد زمان و کولتوری خۆی پشت گوێ خست و فەرامۆشی کرد هەروەکو سامی شمس الدین لەکتێبی قاموس اعلامی چاپی ئەستەمبوڵ ساڵی ١٣١٤ ی کۆچی باسی کردوە .

لەگەڵ ئەوەشدا چەند زانایەکی کەم هەبوە بەرهەمەکانیان بەکوردی دەنووسی و گازندەو گلەییان لە میللەتەکەی خۆیان کردوە کە بەوشێوەیە کەلەپووری خۆیان پشت گوێ خستوە کە یەکێك لەوانە شاعیرو زانای بلیمەت ئەحمەدی خانی بوە کە ڕۆمانە بەناوبانگەکەی شانی لە شاکارەکانی جیهان هەڵدەسوێت. لەدوای رووخاندنی ئەمارەتەکان ئەوسا کورد هاتەوە هۆش خۆی و گومانی لە ئاستی ئەو (برایەتی ئیسلام)ـە پەیدا کردو چەند شۆڕش و ڕاپەڕینێك بەرپا بوو. بەڵام ئەو شۆڕشانەش، بۆ نمونە شۆڕشەکەی شێخ عبیداللە نەهری لەساڵی ١٨٨٠ دا شتێك نەبوە لەپەلەقاژەی مەرگ بەولاوەو هەمووی هەڵچوون و هەژانێکی لەناکاوو نارێك بوون بۆیە یەك لەدوای یەك هەمویان لەلایەن دەسەڵاتدارەکانی تورکەوە بە زەبری ئاین یا لەرێگەی فروفێڵ و فریو خواردنەوە فەرامۆشکران.

ئەو شۆڕشانە ئایدیۆلۆژییەکی ڕەگ داکوتاویان نەبوەو لە دوای مردن و لەناوچونی سەرکردەکانیان ئیتر شۆڕشگێڕان بڵاوەیان لێکردوەو چوونەوە سەر ژیانی ڕۆژانەی خۆیان. هەتا ئێستە هیچ بزوتنەوەیەك نەیتەانیوە بەبێ

ئایدیۆلۆژییەکی چەسپاوو گونجاو بەردەوام بێت. بزوتنەوەی سیاسی وەکو گیانلەبەرێك وایە و بەردەوام بوونی ئەو بزوتنەوەیە پێویستی بە خۆراکێکی رۆحی هەیەو هیچ شۆڕشێکی چەکدارانە بێدەس لەملانێتی قەڵەم و تفەنگ سەرکەوتن بەدەس ناهێنێ.

بێجگە لەوە دەستێوەردانی سیخوڕو بەکرێگیراوانی ئەوروپایی و ئەمریکایی کە بەناوی میسنێرە عیساییەکانەوە ڕوویان کردوەتە کوردستان، یەکێك لە مەبەستەکانیان ئەوە بوە بەپەنهانی گیانی دوژمنایەتی و دژایەتی لەناو کورد پەرەپێبدەن.

ئیمپریالیزمەکان بە هەموو شێوەیەك کنەی ئەوەیان کردوە بەهانەی وا پەیدا بکەن بتوانن لەورێگەیەوە دەس لە کاروباری ناوخۆی ئیمپراتۆریەتە شرۆڵەکەی عوسمانی وەردەن و بۆ ئەوە چارشێوی برایەتی عیساییان پەیداکردوە لەژێرەوە دەستیان تێکەڵکرد کەلەراستیدا ئەو بەکرێگیراوانە فریان بەسەر گیان و باوەڕی ڕاستەقینەی عیساییەوە نەبوو چونکە نەیانتوانیبوو تاقە کوردێکی موسڵمان والێبکەن بۆ مەرامی خۆیان هەڵی سووڕێنن و لەداخی ئەوە کەوتنە دنەدانی کەمایەتیە عیساییەکان دژی برا موسوڵمانەکانیان و ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی ئەو میسنێرانە لەلایەن کاربەدەستانی تورکیاو ئێرانیشەوە پشتگیری لێ دەکرا هەردوو دەوڵەتەکە پەژارەی ئەوەیان لێ نیشتبوو ئەو سێ نەتەوە برایە کە کوردو ئەرمەن و ئاسوری بون، هەمویان برایانە پێکەوە بکەونە خۆیان کە بەویەکیتیە دەیان توانی ئازادیی خۆیان وەدەس بێنن.

بەرلە شەڕی ڕوس و عوسمانی لەساڵی ١٨٢٨دا کورد و ئەرمەنی بەئاشتی ودۆستانە پێکەوە ژیابون و هیچ ناکۆکیەك لەناویانا نەبوو، کە نموونەی ئەمە لە شۆڕشەکەی بدرخاندا دەردەکەوێت کە ساتێك دژی عوسمانیەکان راپەڕی بەڵێنیدا بە گەلەموسڵمانەکان دوای سەرکەوتن ئۆتۆنۆمی‌یان بداتێ )).

ئەو شۆڕش و راپەڕینانەی لەباکوری کوردستاندا کرا هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی، دەتوانرێ بکرێ بەم بەشانەوە:

**١ـ شۆڕشی بدرخان پاشا.**

**٢ـ را پەڕینەکانی دوای شۆڕشەکەی بدرخان پاشا.**

٣- ڕا پەڕینی یزدان شێر.
٤- شۆڕش و ڕا پەڕینەکانی دوای یزدان شێر.
٥- شۆڕشی شێخ عبیداللە نەهری ( شمزینی ).
٦- شۆڕش و ڕا پەڕینەکانی دوای شۆڕشی شێخ عبیداللە هەتا شەڕی یەکەمی جیهان.

شۆڕشی یەکەم ـ شۆڕشی بدرخان پاشا

شۆڕشی بدرخان پاشا بەسەرەتای دەسپێکردنی شۆڕشە گەورەکانی باکوری کوردستان دەژمێررێ. شۆڕشی بدرخان پاشا دەکرێ بە دوو قۆناغ، قۆناغی یەکەمیان بریتیبوە لەوشۆڕشەی لە ڕوژهەلاتی کوردستاندا (کوردستانی ئێران) بەرپای کردبوو، لەبەرئەوەی کورتەیەکی ئەو شۆڕشەمان لە لاپەڕەکانی ١٠١ـ١١١ ی کتێبەکەی سمکۆی شوکاك و بزوتنەوەی نەتەوایەتی چاپی ستۆکهۆلم سالی ١٩٩٦ باس کردوە لەبەر ئەوە پێویست ناکا باسی ئەو قۆناغە دووبارەبکرێتەوە بەڵام قۆناغی دوهەم کە بۆ باکوری کوردستان تەرخان بوە، لەم باسەدا دەکرێ بەم بەشانەی خوارەوە:

١ـ بنەماڵەی بدرخانیەکان و باسی ژیانی بدرخان پاشا.
٢ـ ئامانج و مەبەستەکانی شۆڕشەکەی بدرخان پاشا.
٣ـ تەقەلا و هەوڵدانی بدرخان بۆ بەهێزکردن و پتەوکردنی دۆستایەتی لەگەڵ ئەرمەنی و ئاسوریەکانی دراوسێی و ڕۆڵی میسنێرەکان و دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان بۆ سەرنەگرتنی ئەو تەقەلایەی بدرخان.
٤ـ ڕا پەڕین و شۆڕشەکەی بدرخان دژی دەوڵەتی عوسمانی و ئە نجامەکەی.
٥ـ هەڵسەنگاندنی ئەو شۆڕشە و هۆی سەرنەکەوتنی.

یەکەم ـ بنەماڵەی بدرخان و ژیانی بدرخان:

لەباسی ئەمارەتەکانا باسێکی تایبەتیمان تەرخانکردوە بۆ جزیرە و بۆتان و لەوەدا باسی بنەماڵەی (عزیزی) کرا کە بەپێی ئەوە بدرخانیەکان دەچنەوە سەر (عزیزی) یەکان و میرعبدالعزیز لەدوای مردنی دامەزرێنەری بنەماڵەکە کە (سلیمان خالد) بوە بوو بە میری جزیرە و بۆتان و ئەو بنەماڵەیە سەردارێتیی

ئەمارەتەکەیان کردوە هەتا ساڵی ١٨٤٧ ئەو ئەمارەتە لە زەمانی بدرخان پاشادا تێکچوە وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین. بەداخەوە لەسەرچاوەکانا بێجگە لە کتێبەکـەی کریس کوچرا و یاداشتەکەکانی مێجەرنۆیل، سەرچاوەیەکی وا دەسگیر نەبوو بە شێوەیەکی رێك و پێك شجرەی ئەو بنەماڵەیەی باسکردبێت و زۆرم لاسەیرە ئەو بنەماڵەیە هەر لە سەرەتاوە خوێندەوارو رۆشنبیر بوون و بایەخێکی زۆریان دلوە بە مێژووی کورد، کەچی تا دوا نەوەیان کە سریابدرخان و جلادت بدرخان و کامران بدرخان بوە، لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەم دی یەکێکیان بیری لەوە کردبێتەوە زنجیرەی بنەماڵەکەی خۆیان تۆمار بکەن و نووسەرانی تریش کە لەو باسە دواون هەریەکەیان بەشێوەیەك باسیان کردوە. بۆیە ناچارین ئاماژە بۆ ئەو سەرچاوە لێك جیاوازانە بکەین بۆ ئەوەی خوێنەر بەراوردیان بکا لەگەڵ یەکتردا.

بۆنموونە: لەژمارە ١٣ ی رۆژنامەی کوردستان کەلەشاری جنێف لە ٢٠ ی ذی العقدەی ١٣١٦ ی کۆچی لەلاپەرە ٣یدا وتراوە بدرخان بەگ لەساڵی ١٢٥٠ ی‌کۆچیدا بوە بە حاکمی کوردستان، بەڵام ئەمین زەکی لەلاپەرە ٢٣٦ ی سەرچاوە ٣٢ دا وتوویەتی بدرخان لەساڵی ١٨٢٢ ی زایندا کە تەمەنی (١٨) ساڵ بوە کراوە بە ئەمیر. بەپێی ئەم بۆچوونەی ئەمین زەکی دەبێ بدرخان لەساڵی ١٨٢٢ ـــ ١٨ = ١٨٠٤ دا لەدایك بووبێ و بدرخان کە لەساڵی ١٨٦٨دا کۆچی دوایی کردوە، دەبێ بەحسابەکەی ئەمین زەکی بدرخان ١٨٦٨ – ١٧٩٤ = ٧٤ ساڵ ژیاوە. کەچی دوکتۆر عزیز شمزینی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤٢ وتوویەتی بدرخان پاشا (٦٤) ساڵ ژیاوە. لەلایەکی ترەوە کریس کوچرا لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤١و بلەچ شێرکوە لەلاپەرە ٤٩ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ هەردووکیان وتویانە بدرخان لەساڵی ١٨٢١ دا بوە بە میری بۆتان کە لەگەڵ بۆچوونی ئەمین زەکی و دوکتۆر عزیز شمزینیدا یەك ناگرێتەوە بەڵام لەگەڵ بۆچوونی سریا بدرخاندا یەك دەگرێتەوە کە لە سەرچاوە ٧٩دا وتوویەتی لەساڵی ١٨٢١دابوە بەمیری بۆتان.

دەربارەی بنەماڵەی بدرخان، کریس کوچرا ئاماژەی بۆ کتێبی (کونسول شروتە) کردووە کەلەمەدا وتراوە بدرخان (٤٠) کوری هەبوەلەگەڵ (١٤) کچ و

ئەمرن بدرخان خۆشی بەتەواوی نەیزانیوە بدرخان چەندکوڕو کچی هەبوە هەر حەوەندەی لەباووباپیریەوە بیستوە کە وتوویانە بدرخان (٩٩) منداڵی هەبوەو ئەمران وتویەتی لەوانە ناوی (١٥) مام و پوورەکانی خۆی دەناسێتەوە کەبەداخەوە ناوەکان لەوەدا تۆمار نەکراوە).

بەرامبەر بەو ژمارەیەی کریس کوچرا باسی کردوە، مێجر نۆیل لەوگەشتەیدا بەکوردستانا کردوێتی و جەلادت بدرخان و کامران بدرخانی لەگەڵابوە، بەپێی دۆکیۆمێنتی ژمارە (fo.351_13974) سەرچاوە ٢٧وتویەتی بدرخان (٩٥) کوڕی هەبوە کەلام وایە لەکاتی گەشتەکەیدا ئەمەی لەجلادت و کامرانەوە وەرگرتوە (لە شوێنی خۆیدا بەدوورودرێژی باسی ئەو گەشتەی مێجر نۆیل دەکەین). کریس کوچرا وتوویەتی: هەرچونێك بووبێت (١٢) لەکوڕەکانی بدرخان و نەوەکەی دوای خۆی رۆڵێکی زۆر گەورەیان هەبوە لە راپەرینی نەتەوایەتی کوردا کە بریتی بوە لە:

١ و ٢: عوسمان و حسێن کوڕانی بدرخان پاشا کەلە دوای باوکیان لەساڵی ١٨٧٩دا شۆڕشیان کردوەو لە دواییدا (حسێن) لەساڵی ١٩١٠دا لەسێدارەدراوە لەدوای باسی راپەرینەکەی یزیدان شێر لە دواییدا باسی ئەو شۆڕشەی عوسمان و حسێن دەکەین کە کریس کوچرا حسێنی بە (حسێن پاشا کنعان ناوبردوە).

٣: مدحت بەگ ـ خاوەنی رۆژنامەی کوردستان.

٤ : کامل بدرخان: پەیوەندی هەبوە لەگەڵ روسەکاناو ساڵی ١٩١٧ والی ئەرزڕۆم بوەو پاش ئەوە لە شاری (تفلیس) ژیاوە.

٥ : خلیل بدرخان: والی بوە لەشاری ملاطیە (بەڵام مێجر نۆیل لەگەشتەکەیدا وتویەتی متصرف بوە).

٦ و ٧: حسن بدرخان و حسێن بدرخان (کریس کوچرا لەژمارە ١ یشدا ناوی حسێن ی بردوە ئاخۆ هەردوکیان یەك بون یا جیاواز بوون) کە هەردوکیان لە ساڵی ١٩١٠دا هەڵبژێراون بۆ نوێنەرێتی کوردستان (نەیوتوە کام هەڵبژاردن کە رەنگە مەبەستی مجلس مەبعوسان بووبێ). کاتێك حسێن زیندان کرا، (حسن)ی برای بۆماوەی شەش مانگ خۆی شاردەوەو لە دواییدا گیراو لە ژێر ئەشکەنجەدا گوێچکەی کەڕ بوو.

٨ : عبدالرحمن پاشا_ لەدوای مقداد بوە بەلێپرسراوی رۆژنامەی کوردستان_ (عبدالرحمن برای مدحت بوە).

٩ : بەحری بەگ _ بەشدار بوە لە شۆڕشەکەی شێخ عبیداللە ی نهریدا.

١٠ : ئەمین عالی بدرخان _ لەنێوانی سالآنی ١٨٥١_ ١٩٢٤ دا ژیاوە و یەکێ بوە لە دامەزرێنەرانی (club) ی کوردی ئەم (club)ەی کریس کوچرا باسی کردوە، رۆبرت ئۆلسۆن لە سەرچاوە ٨٤ دا بە دوورودرێژ باسی کردوە بە ناوی (kurt tarraki ve tavon jemiyeti) (کورد ترقی و تعاون جمعیتی) ناوی هێناوەو لە باسی جمعیت و رێکخراوەکانا باسی دەکەین). کریس کوچرا باسی سێکوڕی ئەمین عالی بدرخانی کردوە: سریابدرخان (١٨٨٣ـــ١٩٣٨) و جلادت بدرخان (١٨٩٣_١٩٥١)، کامران بدرخان (١٨٩٥_١٩٧٨).

١١ : عبدالرزاق بدرخان _ کوڕەزای بدرخان پاشا بوە (باوکی ناوی نجیب پاشابوە، کریس کوچرا تەنها ناوی یازدەکەسی هێناوە لەو دوازدە کەسەی وتویەتی رۆڵێکی گرنگیان هەبوە کە ڕەنگە ئەوی تر مەبەست نجیب پاشا بووبێ).

دەربارەی ژیانی بدرخان پاشا خۆی گەلێك سەرچاوە بە دوورودرێژ باسیانکردوە و ئێمەش لە باسی ژیانیا سێ سەرچاوەمان هەڵبژارد کە بەشێوەیەکی تایبەتی لە ژیانی بدرخان پاشا دواون:

یەکەم سەرچاوە بریتیە لە کریس کوچرا کەلەلاپەڕە ٤٣ ی کتێبەکەیدا لەوە دواوە کە بدرخان خۆی باسی خۆی بەم شێوەیە کردوە کە وتوویەتی:

((ئەوە منم کە حاکمی ئەم ولآتەم و فەرمانڕەوایی دەکەم و پادشای عوسمانی هەرچەند لە من بەهێزترو بە تواناترە بەڵام من زۆر لەو نجیب ترو گەورەترم چونکە من لەو باشتر سەرپەرشتی نەوەکەی خۆم دەکەم و باشتر ئاگام لێیانەو هیچ کاتێك زوڵم و ستەمیان لێ ناکەم و گەلی کورد گەلێکی رەسەن و خاوێنە)).

کریس کوچرا دەربارەی ئەوەی بدرخان ئەڵێ:

((هەرچەند ئەوەی بدرخان دەربارەی خۆی وتوویەتی نەختێك خۆهەڵکێشانی تێدابوە بەڵام ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ ئەو حاکمە شانازی

ـەوەوە کردوە کە خۆی بە کوردێك زانیوەو سەری بۆ پادشای عوسمانی
ـەنواندوەو بەپادشایەکی زۆرداری داناوەو هەروەکو پەیامنێرێکی فرنسی کە
ـلایەن پادشای فرنسەوە نێردرابوو بۆ تورکیا گێڕابوویەوە و وتبووی بە راستی
ـرخان حەقی بوە کە وتویەتی مـن لە گەلێکی نەجیبم و مـن پاکم چونکە لە
ـکی ئەوگەلەدا لەدایك بووم، ئەمیر بدرخـان حاکمێکی زاناو تێگەیشتوو بوەو
حزم و قەومێکی زۆری لە دەور بووەو راستی وتووە کە وتویەتی من خۆم لە
ـدشای عوسمانی بە ماقوڵتر دەزانم)).

کریس کوچرا لەباسی ژیانی تایبەتی بدرخاندا وتویەتی:

((ئەومیرە جلکی تایبەتی لەبەردەکرد کە بریتی بوە بەرگێکی گوڵ دوزمە
ـێو مێزەرێکی ئاوریشمینی سووکی لەسەرناوە، پانتۆڵەکەی ئاوریشمی سوورو
ـەش بوە، کاڵەی شەمامەبەند وەیا سۆڵێکی بیلاد کە لەسەری نووکەکەی
ـەڵگەڕابوەوە لە پێی دەکرد کە ئەوسا زۆربەی حاکمە کوردەکان جل و بەرگیان
ـوجۆرە بوەو ئەو لەپاشا تورکەکان زۆرتر بە تەنگ میللەتەکەیەوە بوە پارەتی
ـەژاران و پەککەوتووی داوەو خەڵاتی داوە بە مەلاکان و زورجار لە کۆشکەکەی
خۆیدا لە دەرگولی (جلیلی لەسەرچاوە ۹۳دا بە دێرگول ناوی بردوە)لە جزیرەدا
ـە کیسە زێڕی دابەشکردوە کە هەرکیسەیەك لەو ڕۆژانەدا دەیکردە (۲۵دولار).

کریس کوچرا ئاماژەی بۆ کتێبی ( دوکتۆر.راسیت)ی سەربە (هیراڵد
ـۆستن)بوە چاپی ۱۸٤٦ کردوە کەلەلاپەڕە ۳۸۱ دا وتویەتی بدرخان مرۆڤێکی
ـۆر ئاینداربوە و لەو ڕۆژانەدا دانیشتوانی کوردستان لایان وابوە خودا محمدێکی
ـوهەمی ناردوە بۆکورد بۆئەوەی مافی خۆی دەسگیربێت و سەربەخۆییەکی
بەنرخ و بە بایەخ بۆ خەڵکی کورد دامەزرێنێت.

کوچرا ئاماژەی بۆ نامیلکەی (ئاوریلی کەلدەمسیم) کردوە کە باسی گەڕانی
دەستەیەك کارمەندانی قونسوڵخانەی فرنسی کردوە کە لەساڵی ۱۸٤٥ دا بە
ناوچەی بۆتاندا گەڕاون و لەلاپەڕە ٦١ی ئەو نامیلکەیەدا ووتراوە:

((ولاتی کوردستان زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو شوێنانەی تر کە لە ژێر
دەسەلاتی تورکدان و ئەو گەڕیدانە کەچوونەتە دیاریکر بۆیان دەرکەوتوە لەو
پەنجا ناوچانەی پیایا گەڕابوون بەئاشکرا هەست بە دوژمنایەتی نێوان کوردو

تورك دەكرا و بدرخان زۆرباش چاودێری ولاتەكەی و دانیشتوانی كردوەو (٢٥٠ هەزار پیاستر ــ قرۆش) ی تەرخانكردبوو بۆ ئەو هۆزانەی لایەنگری ئەو بوون و. بدرخان زور بەهێزو دادپەروەر بوە و پیاوی سیخوڕی تایبەتی خۆی هەبوە بۆ كۆكردنەوەی هەواڵ و دەنگ و باسەكان لەناو توركەكاندا)).

جلیلی جلیل لە سەرچاوەی ژمارە ٢١ دا بە دوورودرێژ باسی شخصیتی بدرخانی كردوە و وتوویەتی هەرچەند بدرخان لەسەرەتای لاویدابوبو بەمیر بەلام توانیبوی دەسەلاتی خۆی بەسەر كوردەكانی دەوروبەریشدا بچەسپێنێت و لە سالانی سییەكانی سەدەی نۆزدەهەمدا ساتێك رشید پاشا پەلاماری هەندێ ناوچەی كوردستانی دا بدرخان توانیبووی خۆی لەوشەڕە دووربخاتەوەو بەوە هێزەكەی خۆی پاراست و هەڵیگرت بۆ كاتی خۆی و توانیبووی دەسەلاتی خۆی لەبۆتانەوە پەرەپێ بداو پادشای عوسمانی لە موصل و بغداد حسابیان بۆ دەكرد و سەركردەكانی ناوچەی دیاربكر زۆرتر گوێیان لە بدرخان دەگرت وەك لە توركەكان.

جلیلی ئامازەی بۆ كتیبەكەی (ف. دیتیل) كردوە كە وتوویەتی: بەچاوی خۆم پادشای بغدادم دیوە دیاریی بەنرخی دەنارد بۆ بدرخان و ئەویش بەرامبەر بەوە ڕێزی پادشای بغدادی دەگرت وەكو دەسەلاتدارو هاوشانێكی ئەو نەك وەكو نۆكەرێك.

كاربەدەستانی تورك ئەو دەسەلاتدارییەی بەدرخانیان بەدڵ نەبوو، چاویان بەرایی نەدەهێنا بەوجۆرە دەسەلاتداریێ و رقیان لێی بو بەلام بەئاشكراش حەزیان نەدەكرد دژی بجولێنەوە. بدرخان سەربەخۆییەكەی خۆی لای كاربەدەستانی ئەستەمبوڵ نەدەشاردەوەو خۆی بەخاوەنی تەواوی میرنشینەكەی دادەنا و حەزی دەكرد نوێنەرانی دەولەتە ئەوروپاییەكان دەس بەفەرمانی سولتانەوە سەری لێ بدەن و ئەوەی بەو جۆرە بچوایە لای بەساردیەوە پێشوازی لێ دەكرد. لەو ڕووەوە (كلۆدیۆس ریچ)، گەڕیدەی بەناوبانگی ئینگلیز كە لەسالی ١٨٢٠ دا چوتە كوردستان. باسی ئەو هەڵوێستەی بدرخانی بۆ (ف. دیتل)باس كردوە و بەدیتیلی ووتوە: نەكەی بەفرمانی

ـوڵتانەوە بچێتە لای بدرخان چونکە خۆی (ریچ) هەمان شـتی بەسـەردا هـاتوە ـتێك لە ئەستەمبوڵەوە چوّتە ناوچەی (بۆتان).

(ئـەم گەشـتەی ریـچ بـۆ دیتیـل) ی باسـکردوە لەسـاڵی ١٨١٣ دابوە ـــ هەروەکوماموّسـتا محمـدی حمـە بـاقی لەلاپـەڕە ٢٦ ی پێشـەکیەکەی ـمرگێڕانەکەی ریچ (سـەرچاوە ٦٨) باسـی کـردوە، جیاوازە لـەو گەشـتەی ریـچ ـحوابیدا لەساڵی ١٨٢٠ دا کردویەتی).

ریچ بە (دیتیل)ی وتوە:

((ساتێك لـە ئەستەمبوڵەوە چـوم بـۆ ناوچـەی بۆتـان و ویسـتم لـەو شـارەدا ـنوێنی خۆم دەرکەم و کە گەیشتمە شارەکە پرسم کـرد ئایـا شـوێنی وا هەیـە ـایـا بحەوێمـەوە؟ لـەوەرامدا خانێکیـان پیشـاندام و لـەوێوە خەبـەرم نـارد بـۆ ـدرخان بەگ کە دەمەوێ چاوم پێـی بکـەوێ و لـە ڕاسـتیدا زۆرم مەبەسـت بـوو ـارەزایی پەیدا بکەم دەربارەی کێشەی فارس و تورکەکان و ساتێك چوومـەلای ـرخان و فەرمانی سوڵتانم بۆ دەرهێناو چاوی بە فەرمانەکە کەوت لە جێی خۆی ـەجوولاو زۆر بـە ساردیەوە بـە نارەزاییـەوە هەڵسایە سـەر پـێ و فەرمانەکـەی حوێندەوەو ووتی: لە ڕۆژهەلاتدا تەنها دەبێ تۆکـەر بـە پێـوە ڕاوەستێت، بـەلام ـیوان هەرکەسێك بێ لە هەرجۆرە پلەو پایەیـەکدا بـێ دەبـێ دانیشـێ و قـاوەو ـلیانی پێشکەش بکرێ)).

ریچ بۆ (ف. دیتیل) دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

دوای ئەوەی نەختێك ڕاوەستام بدرخان لێی پرسیم: چیت ئەوێ؟ منیش پێیم ـت دەمەوێ من و ئەوانەی لەگـەڵمدان شـوێنێکمان دەسـکەوێ بـۆ ئـەوەی تیایـا بحەوینەوە...

بدرخان بە ڕقەوە پێـی ووتم: ئایـا تـۆ بـەخۆت و فـەرمانێکی سـوڵتانیەوە بـۆ ـەوە هاتویتە لام شوێنت بۆ پـەیدا بکـەم؟ بۆچـی تـۆ مـن بـە کوێخـا و موختـار دەزانی تا بەو کارە هەڵسم؟ من و سوڵتان چ پێوەندییەکمان بەیەکەوە هەیە واتۆ فەرمانی ئەوت بۆ هێناوم بۆ ئـەوەی بەئـەمری ئـەو خزمـەتت بکـەم؟؟ مـن لـێرە ـەریەخۆم و پێوەندیم بەکەسەوە نیەو من لێرە تەنها میوان قبـوڵ دەکـەم نـەك هەلگری فەرمانی سوڵتان)).

**دوهەم: ئامەنجەکانی بدرخان و تەقەلاکانی بۆ سەرگرتنی مەبەستەکانی**

ئامانج و مەبەستەکانی بدرخان بریتی بون لە چەند شتێك، لەوانە:

أ_ چاکردن و بەرەو پێشەوە بردنی باری ژیانی دانیشتوانی ئەمارەتەکەی و باشکردنی باری ئابوری و دابنیکردنــی ئاسـایش لـە ناوچـەکانی ژێـر دەسـەلاتیو ئامادەکردنی سوپایەکی بەهێز.

ب_ تەقـــەلای باشـــکردن و پتـــەوکردنی دۆســـتایەتی لەگـــەڵ ئەرمـــەن و ئاسوریەکاندا.

ج_ یەکخســـتنی ئەمارەتـــەکانی کـــورد و هاوکـــاریکردنی نێـــوان مـــیرو سـەرکردەکانی کـورد لەگـەڵ یـەکتردا وەکـو یەکـەم هـەنگاوێك بـۆ دامـەزراندنی حکومـەتێکی کـوردی یـەکگرتووی سـەربەخۆ، کـە لەسـەرەتادا بـە شۆڕشـی نـاو کوردستانی ئێران دەستی پێکرد بۆ ئەوەی پاش رزگارکردنی بکرێت بە بنکەیەك کە لەوێوە دەسبکرێت بە رزگارکردنی باکووری کوردستان.

**أ- چـاکـردن و بـەرەو پیشـەوە بردنــی ئــابووری و دابینکـردنــی ئاســایش و ئامادەکردنی سوپایەکی بەهێز**

بدرخان پاشا یەکێك بوە لە سەرکردە رۆشنبیرەکانی سەردەمی خۆی و بـۆی دەرکـەوتبوو چارەسـەرکردنی بـاری ئەمارەتەکـەی و کێشـانی نەخشـەیەك بـۆ دابینکردنی بۆجەیەك بۆ بەڕیوەبردنی کاروباری رۆژانی نـاو ئەمارەتەکـەو کڕینـی چەك و جبەخانە بۆ سوپاکەی شتێکی زۆر گرنگ و پێویست بون و تورکەکان بە چاوێکی پڕ لەمەترسیەوە دەیانڕوانیە ئەو تەقەلایەی بدرخـان و هەمیشـە هـەوڵی ئەوەیان دابوو تەگەرە بخەنە بەر ئەو تەقەلانەی کە لەوە ترسـا بـوون میرەکـانی تری کوردیش چاو لەو بکەن و هەمان رێبازی ئەو بگرنە بەر.

لەو روەوە دوکتۆر جلیلی جلیـل لەلاپـەڕە ١٢٣ی کتێبەکـەیدا سـەرچاوە ٩٣ باسـێکی دوورودرێـژی تـەرخانکردوە بـۆ بایـەخدانی بدرخـان بـە باشـکردنی بـاری ئـابووری و پاراستنی موڵك و مـاڵی دانیشـتوان و رێگرتـن لـە هـەموو جـۆرە دەسدرێژیکردن و تـالانی و راوو ڕووت و دانـانی یاسـایەك بـۆ چۆنیـەتی سـەندنی

ـی ساڵانە لـەهاووڵاتیان و بـەپێی ئـەوە بوجەیـەكی سـاڵانە بـۆ ئەمارەتەكـەی ـی ساز بكات.

ـیلـی ئامــاژەی بـۆ لاپــەڕە ٢٠٧ی كتێبەكـەی (ف. دیتیـل) كـردوە كـە ـینی:

((ەكاتی گەشت و گەڕانما بە ناوچەكانی ژێـر دەسـەڵاتی بدرخـان بـە چـاوی ـۆم ئـەو كوردانـەم دیوە لـە ناوچـەكانی تـرەوە باریـان دەكردو هاتبوونـە ژێـر ـی بدرخانەوە ئەگەرچی هـەموو كەسێكیش بـە ئاسـانی نـەیدەتوانی بكاتـە ـوچەیە چونكە ئەوەش مەرجی خۆی هەبوە و هەركەسێك بیویسـتایە بچێتـە ـەو ناوچەیـە دەبوایـە ئەسـپێك و زینێـك و تفـەنگێك و دەمانچەیـەكی هـەبێ بـۆ ـەی هەمیشە ئامادە بێ بۆ بەشداربوونی پاراستنی ئەمارەتەكە)).

جلیلی لـەو كتێبـەیدا باسـی ئـەوەی كردوە چـۆن بدرخـان بـۆ دابینكردنـی ـیش لە ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتیا زۆر بەتوندو تیـژی وەستاوە بەرامبـەر بـە ـونبارو ڕاوو ڕووتكـەرو دزو جـەردەو ئەوانـەی بەناوچەكـەی ئـەودا گـەڕابون ـەریان لەوە سورمابوو كە چۆن توانیبوی ئەوكارە بە جێ بێنێت. دوو میسنێری ـەمریكی (رایت) و (بریس) ساتێك چوونە لای بدرخان كەلە (یرغون) بوە لەساڵی ١٨٤٠ دا، بۆیان دەركەوتوە هیچ تاوانبارێك لە ناوسنوری دەسەڵاتیا نـەیتوانیوە ـە چنگی بدرخان رزگاری ببێت و بەرتیل خواردن و مـەرایی و كلكەلـەقێ كاریـان ـەكردۆتە سەر هەڵوێستی بدرخان. هەروەكو جلیلی باسی كردوە (ف. دیتیل) لە گەشـتەكەیدا وتوویـەتی تووشـی هیـچ جـۆرە گێچـەڵ و سەریەشـەیەك نـەبوەو ئەوانەی لە دیاریكرەوە چوون بۆ موصڵ لە رێگایانا تووشی هیـچ دەردیسـەریەك نـەبوون و سـاتێك دیتیـل خـۆی ماڵئـاوایی لـە خانەخوێكـەی دەكـا تەنــها خانەخوێكەی تاقە زەلامێكی لەگەڵا دەنێرێ و دیتیـل ئـەوەی لەلاسـەیر دەبـێ و بەرامبەر بەو واق وورمانەی دیتیل خانەخوێكەی پێی دەڵێ :

دڵنیابە رێگەكەت ئەوەندە پڕ لە ئاسایشە كە پێویست ناكا لە تاقـە زەلامێك بەولاوە لەگەڵیا بێو ئەو تاقـە زەلامـەش تەنـها بـۆ شـارەزایی رێگەیـە... دیتیـل هێشتا بەوەش هەر دڵنیا نابێ و دەپرسێ: باشە بەم جۆرە بكەومەڕێ؟...

خانە خوێكەی دووبارە لەوەراما پێی دەڵێ : لای ئێمە ئەوەی بیەوێ سـەفەر بكا تەنها هەر خۆی ئەكەوێتە رێ و كەسی لەگەڵدا نابێ و ئەگەر منداڵێك بـەتاقی

تەنها بە ئالتوونەوە بڕوا، بەویێ دەسەلاتیەی خوێ کەس ناوێرێ و ناتوانێ دەستی بۆ درێژ بکا لە ناوچەی بدرخاندا.

(دیتیل) لە باسەکەیدا بەخۆی ئەڵێ: وادیارە دەیەوێ (خانەخوێکەی) پێ بڵێ: هەی ترسنۆك ئایا لەدوای ئەم هەموو دڵنیایی کردنەش هێشتا هەر ترست لە دڵدا ماوە؟؟ بڕۆ لەگەڵ ئەو تاقە زەلامەداو هیچ ترست نەبێ.

دیتیل لەلاپەرە ٢٠٥ ی کتێبەکەیدا وتوویەتی: لە راستیدا باوەڕم نەدەکرد لەکوردستانا شوێنی وا پڕ لە ئاسایش هەبێ و ئەو دڵنیایی و قسە کردنەش لەگەڵما کرابوو هەمووی راست دەرچوو تووشی هیچ شەڕەشەقێك نەبووم. (ف دیتیل)، لەگەشتەکەیدا باسی بدرخانی کردوە چۆن زەویی دابەش دەکرد بەسەر ئەو جووتیارانەدا کە دەچوونە ناوچەکەی بە نرخێکی هەرزان و پارەیەکی کەمیشی دەدا بۆ شوێنی لەوەڕی مەڕو ماڵاتەکەی و بە هەمووی ١ ٣ی دەرامەدی ساڵانەی دەدا کە لەورۆژانەدا زۆرکەم بوە لە چاو ئەو هەموو باج و سەرانە و بێگارە زۆرەی لەلایەنی کاربەدەستانی تورکەوە دەسێنرا لەشوێنەکانی تر)،

دەربارەی تەقەلای بدرخان بۆ دامەزراندنی سوپایەکی بەهێز بۆ ئەمارەتەکەی بلەچ شێرکوەلەلاپەرە ٥١ ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤٩ باسی ئەوەی کردوە بدرخان بیری لەوە کردوەوە کە ئەمارەتەکەی بۆ ئیجگاری لەدەس تورك رزگار بکات و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە کارگەیەکی چەك دروستکردنی لە شاری جزیرەداو لە گۆلی (وان) یش چەند کەشتیەکی دروست کرد بۆ ئەوەی جگە لە سوودی بوونی ئەو کەشتیانە لە رووی بازرگانیەوە،لەکاتی شەڕیشدا بتوانێت بە هۆی ئەو کەشتیانەوە سەربازو چەکدارەکانی ئەمارەتەکەی پێ بگوێزێتەوە.

**ب ـ تەقەلای بدرخان بۆ بەهێزکردنی پێوەندیی کورد لەگەڵ ئەرمەنی و ئاسوریەکانا**

بدرخان پاشا وەکو مرۆڤێکی رۆشنبیرو خوێندەوار، بەچاوێکی دوور بینانەوەو بە سنگێکی فراوانەوە رەفتاری لەگەڵ کریستیانەکانی ناوچەکەی خۆی و دەوروبەری کردوە و هەوڵێکی زۆری داوە پێوەندیی نێوانیان دۆستانەو برایانە بێ بۆ ئەوەی بە هەموویان پێکەوە رووبەڕووی جەورو ستەمی کاربەدەستانی تورك ببنەوەو بە هاوکاریی هەموویان حکومەتی عوسمانی ناچار بکرێ دان بە

مافی ڕەوای هەرسێ لایانا بنێت، بەڵام بە داخەوە بەهۆی میسنێرەکان و دیپلۆماسیەکانی دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان کە بەناوی پارێزگاریکردن لە ئاینی عیسایی دەنێرران بۆ ناوچەکە، ئەو تەقەلایەی بدرخان سەری نەگرت و بە پێچەوانەوە توانرا پێوەندیی نێوانی ئەرمەنی و ئاسوری لەگەڵ کوردا تێك بدرێت.

دوکتۆر جلیلی جلیل لەسەرچاوە ٢١دا باسی تەقەلاکانی بدرخانی کردوە بۆ بەهێز کردنی پێوەندیی نێوان کورد و کریستیانەکان و وتوویەتی:

((بدرخان لە کاتی دانانی پرۆگرامەکانیا بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەکانی، ئاوڕێکی دۆستانەی دابوەوە بۆلای ئەرمەنی و ئاسوریەکان کە کورد لەگەڵیانا سەدەها ساڵ بوو پێکەوە بە ئاشتی و برایانە پێکەوە ژیابون و بدرخان زۆر مەبەستی بوە ئەرمەنیو ئاسورییەکان بکا بە لایەنگری خۆی دژی ڕەفتاری کاربەدەستانی تورك. ئەو تەقەلایانەی بدرخان وای لە رووسەکان کردبوو بیر لەوە بکەنەوە بدرخان نیازی وابوە کوردستانێکی سەر بەخۆ دامەزرێنێت و ببێت بە لایەنگری ئێران کەلەو ڕۆژانەدا نێوانی تورك و ئێران زۆر ئاڵۆز بوە لەسەرسنوور (بێگومان ئەو بیر کردنەوەی روس شتێکی بێجێبوە، چونکە بدرخان بەر لەوەی دژی عوسمانیەکان شۆڕش بکات لە ئێرانەوە دەستی کرد بە شۆڕشەکەی)).

هەروەکو (شاخباتیان) باسی کردوە، بدرخان نیازی وابوە هەموو (وان) و (تبلیس) و (موش) و دیاریکر هەتا گومی (ورمیە) بخاتە ناو چوارچێوەی حکومەتەکەی کوردەوەو لە دەزگاکانی حکومەتەکەیدا پلەو پایەیەکی زۆر بەرزو گرنگی بۆ ئەرمەنیەکان تەرخان کردبوو، بە هۆی ئەوەی ئەرمەنیەکان شارەزاییەکی زۆریان هەبوە لە کاروباری بازرگانێتی و پیشەسازیدا بۆیە کاروباری ئابووریی ئەمارەتەکەی خستە ژێر چاودێریی ئەوانەوەو ژمارەیەکی زۆری ئەرمەنی لەناو سوپاکەی بدرخاندا هەبوو کە زوربەیان خەڵکی گوندی (سیخ) بوون.

جلیلی لەلاپەڕە ١١٦ ی کتێبەکەیدا وتوویەتی هەرچەند دەرەبەگەکانی کورد زۆریان لە جوتیارە ئەرمەنیەکان کردوە، بەڵام ئەو زۆرلێکردنە روخسارێکی ئاینی و نەتەوەیی پێوە دیار نەبوەو لەسەر بناغەیەکی ئابووری و چینایەتی بوەو ئەو

ڕەفتارەی دەرەبەگەکانی کورد تەنها هەر لەگەڵ ئەرمەنیەکان نەکراوە بەڵکو جوتیارەکانی کوردیش وەکو ئەرمەنیەکان لەژێر بارو ئەرکێکی گرانی دەرەبەگەکاندا بون. لەگەڵ ئەوەشدا، هەروەکو (أ.یریمیان) باسی کردوە. هەرچەند ئەرمەن و کوردەکان هەمان دەردی دەرەبەگەکانی کوردیان دەچێشت. بەڵام ئەو سەرۆك و دەرەبەگە کوردانە ئەرمەنیەکانی ژێر دەسەلاتی خۆیان دەپاراست لە دەسدرێژیکردن و بێگاری کاربەدەستانی تورك و لە سالانی (٣٠ و ٤٠)ەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەرمەنیەکان بوبوونە مشورخۆر و یاریدەدەری ئەو دەرەبەگانەو بەبێ ترس و لەرزو ناخۆشی پێکەوە ژیابوون.

جلیلی ئاماژەی بۆ باسێکی (شاهبازیان) کردوە (بەرلەمە دوکتۆر جلیلی بەهەڵە وتوویەتی شاخباتیان ـ کەدوورنیە ئەوەی پێشوو هەڵەی چاپەمەنی بێ) دەربارەی ئەوەی ژمارەیەکی زۆری ئەرمەنیەکان چوونەتە لای بدرخان و لای ئەو بوون بە دەمڕاست و ڕاوێژیارو لای ئەو ئیشیانکردوە.

(شاهبازیان) و (ئەلپویاچیان) باسی (ستیپان مانوکلیان) و (ئوگانیس چالکتریان)یان کردوە کە دانیشتوی شاری (وان) بوون و ڕاوێژیاری بدرخان بون و هەندێ لەو ئەرمەنیانەی لای بدرخان بون گەزافی ئەوەیان لێدابوو پشتاوپشت نوێنەرایەتی ئەرمەنیەکانیان بۆ مابوەوە بەڵام لەلایەن تورکە عوسمانیەکانەوە لە دەسەلاتداریتی کەوتبوون، یەکێکی وەکو (ستیپان مانوکلیان) خۆی بە بنەماڵەیەکی کۆنی ئەرمەنی زانیوەو (مامیکۆیان) لەوانەبوە باوکی کاتی خۆی ناردبووی بۆ ئەستەمبوڵ و لە قوتابخانەیەکی ئیتاڵیایدا خوێندبوی و زمانی ئیتاڵی و فەرەنسی و تورکی و چەند زمانێکی تریشی زانیوەو (میرماتو) ی خەڵکی (باشقەڵا) یەکێك بوە لەسەرکردەی هێزێکی بدرخان (لیپستئوس) ی ئەرمەنی وتارێکی لە گۆڤاری (کریستیانەکانی ڕۆژهەلات) دا لەساڵی ١٩٠٤ دا چاپکردوە دەربارەی دۆستایەتی کوردو ئەرمەن لەوەدا وتوویەتی لە پێش ساڵی ١٨٤٨ دا (مەبەستی پێش ڕووخانی شۆڕشەکەی بدرخان) پێوەندی نێوان کورد و ئەرمەن زۆر دۆستانە بوەو بارەها ڕوویداوە ژن وژنخوازییان لەگەڵ یەکتردا کردوەو جاری واهەبوە لە کەنیسەیەکی ئەرمەنیدا لەلایەن قەشەیەکی

حیمخیەوە مارە دەکران و کوردەکان بەوپەڕی ڕێزەوە سەیری پیاوە حیمخیەکانیان دەکردوبگرە لە کەنیسەی ئەوانا نوێژیشیان دەکرد.

دوکتۆر کاوس قەفتان، وەرگێڕی کتێبەکەی جلیلی لەروسیەوە بۆ کوردی ..بەرە ٣٠٩دا لەسەرنجی ژمارە ٤١ دا وتویەتی: ئەو نوسەرەی جلیلی باسی ..وە زیادەڕۆیی کردوە، چونکە تەوژمی هەستی ئاینی ڕێگەی لەوەگرتوە هیچ ..تێک شتی وابکات و یەکێکی وەکو لازاریف کە شارەزای پێوەندیی کورد و ..مەنی بوە باسی شتی وای نەکردوەو کورد ئەگەر بیویستایە ژنێکی ئەرمەنی ..ە بکا روویدەکردە مزگەوت و لای مەلایەك مارەی دەکرد و قەت رووی نەداوە ..یێك لە کەنیسەدا نوێژبکات).

..من لەو سەرنجەی دوکتۆر کاوسدا سترانێکم هاتەوە یاد بەناوی (مطرانۆ) ..مناوچەی بادینانا باوەو دەنگ خۆشەکانیان وەکو حسن جزراوی و عارف ..زراوی باسی (علی قول ئاغاسی) بەلاوك دەگێڕنەوە کە علی‌قۆڵ ئاغاسی ..ریم) ی فەلەی هەڵگرتوە و لە ترسی کاربەدەستێکی تورك بردوویەتە (دێری ..ختمار) و لەوێ داوای لە قەشەکردوە لەسەر ئاینی عیسایی مارەیان بکا، بەڵام ..شە قایل نەبوەو پێی وتون من شتی واناکەم بەڵکو دەنێرم مەلایەك و ..وفەقێ وەکو شاهید بێنە ئێرەو لەسەر ئاینی ئیسلام مارەتان دەکەم).

هەمان نووسەر (لیپستئوس) وتوویەتی تا ئەوکاتەی میسنێرەکان ..هاتبوونە ناوچەکە وە دۆستایەتی کوردو ئەرمەنی زۆر بەهێز بوە و بەهۆی ..وانەوە پێوەندی هەردولایان تێکچوەو تووشی زیان بوون.

### ج ـ تەقەلای بدرخان بۆ یەکخستنی ئەمارەتەکانی کورد

بدرخان مرۆڤێکی زیرەك و دووربین بوەو بەووردی چۆتە بنج و بناوانی ڕووداوەکان و لەمێژووی کورد کۆڵیوەتەوەو هەموو ئاواتی ئەوە بوە میللەتی کورد لە هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئێران و عوسمانی رزگار بکات و زۆر باش لەوە گەیشتبوو یەکێك لە هۆ سەرەکیەکانی سەرنەکەوتنی کورد ئەو لێك دابڕان و پەرەوازەییە بوە کە لەناو کوردا هەبوەو، لەوەش گەیشتبوو تەنها خۆزگەو بەئاواتی ناودڵ و مێشك کورد ناگا بەئامانجی خۆی و بۆی دەرکەوتبوو

یەکێك لە دەردە کوشندەکانی ناوکوردەواری ئەوەبوە هیچ سەرکردەیەکی کورد بە دەسەلاَتدارێتی ئەوی تریان قایل نابێ و لە پێناوی سوودی گشتیدا سەر بۆ یەکتری دانانەوێنن و زۆرجار سەرکردەیەکی کورد بۆ گەیشتنی بە مەبەستێکی تایبەتی خۆی ئەوەی لا باشتر بوە ببێت بە هاوکاری بێگانەیەك دژی سەرکردەیەکی ناو میللەتەکەی خۆی، بۆیە بیری لەوە کردبوەوە چۆن و چیبکات بۆ ئەوەی هەستی نەتەوایەتی لە ناو مێشك و دڵی سەردارانی کورد بەهێز بکات بۆ ئەوەی لە رێگەی ئەوەوە هەموویان یەکبخات و یەك بگرن و ئەو یەکگرتنەیان ببێ بەبەردی بناغەی رزگاربوونی کورد.

دەربارەی ئەو تەقەلایە و ئەو ئاواتە پیرۆزەی بدرخان ئەمین زەکی لەلاپەرە ٢٣٦ی سەرچاوە ٣٢دا باسی بدرخانی کردوە چۆن هەوڵی ئەوەی دابوو پیلان و نەخشەی فروفێڵی تورکەکان پووچەڵ بکاتەوە کە هەمیشە هەوڵی نانەوەی ئاژاوەو ناکۆکی نێوان سەرکردەکانی کوردی ئەداو بۆ رێگرتن لەو تەقەلایانەی تورك بۆ ئەوە تێدەکۆشا میرەکانی کورد لێك نزیك بکاتەوە و کارێکی وابکرێ هاوکاری لەگەڵ یەکتریدا بکەن و لە ئەنجامی ئەو هەوڵ و کۆششەی بدرخان میرەکانی (وان) و (موش) و (هەکاری) و (خیزان) و هەندێ لەپیاوە ئاینیەکان ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ بدرخاندا.

بلەچ شێرکوە لەلاپەرە ٥٢ ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ ناوی ئەو کوردانەی هێناوە کەلەناو ئەمارەتەکانا ئامادەیی خۆیان بۆ بدرخان دەربڕیبوو کە بریتی بون لە: مصطفی بەگ، دەروێش بەگ یەکێك بوە لە سەرکردەکانی (موش)، محمود بەگ (کەبەخان محمودیش ناسراوبوەو یەکێك بوە لە سەرۆکەکانی ناوچەی وان)، نوراللە بەگی زەعیمی هەکاری، فتاح بەگ کە یەکێك بوە لە سەرۆك عەشیرەتێکی ناوچەی هەکاری، خالدبەگی سەرکردەی (خیزان)، حسێن کوری سەرۆکی عەشایری ناوچەی قارص و ئاجار.

بێجگە لەوناوانە، بلەچ شێرکوە باسی شێخ محمدی خەڵکی موصڵ و شێخ یوسفی خەڵکی زاخۆی کردوە کە لە زانا بەناوبانگەکانی کوردستان بون و ئەمانە بە کوردستاندا دەگەڕان بۆ ئەوەی لایەنگران بۆ بەدرخان پەیدا بکەن و میری ئەردەلاَنیش ئامادەیی خۆیان پیشاندابوو بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ بدرخاندا.

حسن جليل لەسەرچاوەیەی ژمارە ٩٣ دا باسی چالاکی بدرخانی کردوە لە دوای شکانی عوسمانی لە شەڕی نێوان عوسمانی و میصردا (مەبەست محمد علی میصرە) و ئەوشکانەی تورکی بەهەل زانیبوو بۆ ئەوەی سنووری دەسەلاتی خۆی پەرە پێ بداو ئەو دلڕەقی ودڕندەیەتیەی حکومەتی عوسمانی بەسەر هەندێ ناوچەی کورد لەساڵی ١٨٣٨داو هێزێکی ناردبوە سەریان بە ناوی (هێزی تەمێکردن) و ژمارەیەکی زۆری کورد کوژرابوو، بدرخان میری بوو لە بێزاری‌و دڵشکاوی ئەوانەی هێرشیان کرابوە سەر وەربگرێ و بوونی بە لایەنگری خۆی‌و بدرخان لای ئەوانە وەکو تاقە هیوایەك سەیر دەکرا کە ئومێدی ئەوەی لێ دەکرا لە جەورو ستەمی تورك رزگاریان بکات.

جلیلی لەلاپەڕە ١٢٠ی هەمان سەچاوەدا باسی تەقەلای بدرخانی کردوە بۆ هێشتنی دوژمنایەتی نێوان سەرکردەکانی کوردو توانیبوی ناکۆکیەکەی نێوان لەگەڵ (نوراللە بەگ) دا چارەسەر بکاو لەگەڵ نوراللە بەگدا پەیمانێکی دوقۆڵییان بەست بۆ ئەوەی پێکەوە دژی حکومەتی تورك بجوڵێنەوە، بەلام رێکەوتن لەگەڵ (عبداللە خان) ی حاکمی (مکس) شتێکی ئاسان نەبوو کە ئەوو دەش براکەی گەلێک ناوچەیان لەباشوری (وان) دا لەژێر دەسەلاتیانا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بدرخان توانیبوی رازی بکات و پەیمانێکی لەگەڵ مۆرکرد و لەگەڵ محمود خانی براشیدا رێك کەوت و زۆری پێ نەچوو سەرۆکە کوردەکان پەیمانێکیان مۆر کرد کەبە (پەیمانی پیرۆز) ناسرابوو هەموویان دلوای راپەڕینیان کردبوو دژی حکومەتی عوسمانی. بەپێی باسەکەی جلیلی جلیل ئەوانەی ئەو پەیمانەیان مۆر کردبوو بریتی بوون لە: مصطفی بەگ، درویش بەگ، خان محمود، نوراللە بەگ، فتاح بەگی خیزان، شریف بەگ لەموش و حسێن بەگی (قارساکور) بەپێی بریاری هەموویان بدرخان کرا بە سەرکردەی هەموان و حاکمی ئەردەلانیش لایەنگرێتی و هاوکاریی خۆی دەربڕیبوو.

هەروەکو (ئەلبویادجان) باسی کردوە ئەندامانی ئەو پەیمانە پیرۆزە دەستیشانی ئەوەیان کردبوو لە دوای سەرکەوتن و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ هەریەکەیان دەسەلاتیان بەسەر چ ناوچەیەکدا هەبێ و بە پێی ئەو رێکەوتنە ناوچەکانی (فوستان)، (کواش)، شاتاخ، جاتاك لەژێر دەسەلاتی

مەحمودخاندا بوو (وان) لەژێر دەسەڵاتی مصطفی بەگ و (جۆڵەمێرگ) و هەندێ شوێنی تر لەناوچەکانی کوردستانی ئێران لە ژێر دەسەڵاتی (نورالله بـەگ) دڵنیـ کـەنزیکی سـنوری دەسـەڵاتی خـۆی بـوە. (لەوسـەرچاوەیەدا باسـی ئـەوانی تـر نەکراوە کە چ ناوچەیەکیان بۆ دانراوبوو).

## سێهەم: تێکچوونی نێوان بدرخان و کریستیانەکان و هۆی تێکچوون و ئەنجامەکەی

وەکو بەر لەمە باسکرا، بدرخان تەقەلایەکی بێ ووچانی دابوو بۆ بەهێزکردنی پێوەنـدی کـورد و کریسـتیانەکان، بـەڵام میسـنێرەکان و نێرراوەکـانی دەوڵەتـە کۆڵۆنیالیزمـەکان بـەنلوی گەشـت بـە کوردسـتاندا هەمیشـە دژی ئـەوەبوون کریسـتیانەکان هاوکـاری بکـەن لەگـەڵ کـوردا و دژی دەوڵـەتی عوسمـانی و کاربەدەسـتانی تورکیـش چاویـان بـەرایی نـەدەهێنا ئـەمارەتی جزیـرە و بۆتـان گەشە بکات و بەهێزبێ، بۆیە ئەوان لە میسنێرەکان خراپتر تەقەلای تێکدانی ئەو ئەمارەتەیان دەکردوو کریستیانەکانیان هـاندا بـاجی سـاڵانە نـەدەن بە بدرخان لەگەڵ ئەوەشدا ئەو باجەی دەدرا بە کاربەدەستانی ئەمارەتی بۆتان کەمتر بـوە لەو باج و سەرانە زۆرانەی حکومەتی تورك لەو کریستیانانەی دەسـەند بـەڵام بـە تەقەلای میسنێرەکان و حکومەتی تورك ئەو کریستیانانە سەرپێچیان کرد لەدانی باجی ساڵانە و بدرخانیش دەستی لێ وەشاندن و بەمە کوردو ئەرمەنی و ئاسوری هەموو وەکو یەك تووشی زیانێکی گەورە بوون.

دەربارەی تێکچونی نێوان بدرخان و کریسـتیانەکان، سـەرچاوەی ژمـارە ٦٣ بەدوورودرێژ لـەوە دواوە کـە پـاش ئـەوەی بدرخـان کاروبـاری ئەمارەتەکـەی رێکخستبوو وپەیمانێکی لەگەڵ سەرکردەکانی کوردا مۆرکردبوو، گـەلێك تەگـەرە هاتە سەر رێی سەرگرتنی ئامانجەکانی و میسنێرەکان و دپلۆماسیەکانی ئینگلیز رۆڵێکی سەرەکیان هەبوە لە تێکدانی نێوانی ئەوو کریستیانەکانا بۆ ئـەوەی ئـەو کریستیانانە بکەن بەکۆمەکی دەستی خۆیان و بۆ مەبەستەکانی خۆیان بەکاریان بێنن لە ناوچەکەدلو کارێکی وایان کرد کریستیانەکان لەگەڵ بدرخان تێـك بچن و تورکەکانیش ئەو بارو دۆخەیان قۆستەوەو لەلایەکەوە بێ ووچان دەرەبەگـەکانی کوردیان هان ئەدا دەستدرێژی بکەنە سەر ئاسوریەکان و لەولاشەوە ئینگلیزەکان

حکومەتی عوسمانی‌یان پڕدەکرد دژی بدرخان و داوایان لیٚ ئەکرد سزای بدەن و
ئعدەیی خۆشیان پیشاندا یارمەتی حکومەت بدەن بۆ لێدانی بدرخان و لە
گێژاوی ئەمەدا دەرەبەگەکانی کورد کوشتاریان کرد لە ئاسوریەکان و قونسوڵی
بریتانیا بە هاندانی (راسام ــ هەندیٚ سەرچاوە بە نمرود رسام ناویان بردوە) کە
ئەرمگەز ئاسوری بوو فشاری خستە سەر سوڵتان و تورکیش دەمێك بوو بۆ
بیانوویەکی وا دەگەڕا دەس لە بدرخان بوەشێنیٚ و سوڵتانی عوسمانی لە پێشدا
حافظ پاشا)ی راسپارد داوا لە بدرخان و تاقمەکەی بکا دان بە دەسەڵاتی
ئەولوی سوڵتانا بنێن لە ناوچەکانی خۆیانا، بەڵام ئەو تەقەلایەی حافظ پاشا
سەری نەگرت و حکومەمەتی عوسمانی بە شەڕێکی چەکدارانە ڕوو بەڕووی
بدرخان بوەوە.

دوکتۆر عزیز شمزینی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤١ باسی ئەوەی کردوە جگە
لە ئینگلیزەکان، فرنسەییەکانیش دەستیان خستە کاروباری ناوچەکەوە و
یارمەتی حکومەتی عوسمانیان دا بۆ لێدانی بدرخان. دوکتۆر جلیلی جلیل لە
لاپەڕە ٢٢٤ ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٢١ لە هەموو نووسەرانی تر بەدوورودرێژی
باسی ئەو تێکچونەی نێوان کورد و کریستیانەکانی کردوە و لێرەدا کورتەیەکی
ئەو بۆچوونەی ئەو باس دەکەین:

((گرنگترین ئەڵقەی کاریگەری سیاسەتی کۆلۆنیالی سەرمایەداری رۆژئاوا
بریتیی بوە لە میسنێرەکانی ئینگلیز و فەرەنسا و ئەمریکا کەبە ڕواڵەت بەناوی
خزمەتی ئاینی عیساوە نێررابوون و ئەوانە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا لە ئەرمەنی
و ئاسوریەکانیان باشتر نەدۆزیبوەوە تێکەڵیان ببن و لە ناویانا چالاکی بکەن و
لەو رۆژانەدا کۆمەڵی میسنێرەکان کلیساییەکان لە ساڵی (١٧٧٩)ەوە لە لەندەن
دامەزرابوو بۆ ئەو مەبەستە و ئەمریکاییەکانیش لە ساڵی ١٨١٠ بنکەیەکی خۆیان
هەبوەو بۆ یەکەم جار لە ساڵانی بیستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا پێوەندییەکی
بەهێزیان لەگەڵ ئاسوریەکانا پەیداکرد.

گۆڤاری (میسینێر گیرالد) کە پڕوپاگەندەکەری تاقمی ئەمریکاییەکان بوو
زۆر بەچالاکی و ڕێکوپێکی هەواڵی میسینێرەکانی بڵاو دەکردەوەو (سمیث) و
(دوایت) لەساڵی ١٨٣٠ دا لەلایەن مەکتەبی ئەمریکاییەکانەوە نێررابوون بۆ

رۆژهـەڵاتی نزیـك بـەناو ئەرمـەنیاو كوردسـتانا گـەڕابون لـە یاداشـتەكانیان دەركەوتووە كە سەركەوتوانە لەناو ئاسوریەكانا كاروباری خۆیان بە جێ هێناوەو پڕۆپاگەندەكانی خۆیان بڵاوكردۆتەوەو هەروەكو خۆیان باسیان كردوە كورد و ئاسوریەكان بە گەرمیەوە پێشوازییان كردون. هەرچەند ئاسـوریە نسـطوریەكا ـ لەڕووی پەیوەندیی سیاسـیەوە بەشـێوەیەكی رەسمی لـەژێر سـایەو دەسـەڵاتی پادشا (مەبەست والی ـ یاحاكم) ی ئەرزرۆم دابـون، بـەڵام ئاسـوریەكانی ناوچـەی هەكاری و بۆتان لەژێر سایەی مارشمعونی بطریـارك دا بـون (سـەرۆكی ئـاینی) و تەنها هـەر دانیـان بـە دەسـەڵاتدارێتی مـیری هـەكاریی كوردا دەنـاو نوێنـەری ئاسوریەكان لەوناوچانەدا بەشدار دەبوون لە ئەنجومەنی شورای میری هەكاریدا و لـە بەرئـەوەی ئاسـوریەكان جـەنگاوەرو ئـازابوون، دەبوایـە مارشـەمعون هـێزی چەكداری بۆ میری هەكاری ئامادە بكردایە. لە پێش سـاڵانی چلـەكانی سـەدەی نۆزدەهەم، پێوەندیی نێوان كورد و ئاسوری لە ناوچەی هـەكاریدا دۆستانە بـوە هەروەكو دوو دراوسێی باش و ریك پێكەوە گوزەرانیان كردبوو، بـەڵام زۆری پـێ نەچوو بە هۆی میسنێرەكانەوە ئەودۆستایەتیەی نێوانیان تێكچوو.

لەساڵی ١٨٣٩ دا ئـەو بەعسـەیەی نـێررابوو بـۆ ناوچەكـە پزیشـكێكی تیـابوو ناوی (گرانت)بوو، توانیبوی پێوەندی لـە گـەڵ مـارشمعونیش و لەگـەڵ (نوراللە بەگ) یشـدا پـەیدا كردبوو، بارەگایـەكی لـە گونـدی (ئەشـیتا) كـردەوە بـۆ میسـینێرەكان كـە گوندێكـی گـەورەی ئاسـوریەكان بـوو، بنكەكـەی ئەمریكاییەكانیش پشتی گرانتیان گرت و چون بە دەنگیەوە.

دام ودەزگا گوێ پێداوەكانی ئەوروپا، بەتایبەتی بریتانیـا، چاوەڕوانی ئـەوە نـەبوون گەشـت و چوونەكـەی گرانت بـۆ ناوچەكـە ئـەو سـەركەوتنە بـە دەسـت بهێنێت، لە راستیدا گرانت سێهەمین ئەوروپایی بوو توانیبوی بگاتە ئـەو ناوچـە دوورو سەختانە و دوكەسەكەی پێش ئەو یەكـەمیان (تاڤێرنێر) بـوە كەلەسـاڵی ١٦٨٩ دا چۆتە ئەو ناوچانەو دووهەم (شۆڵتز) بوە كە بە شێوەیەكی تراجیدی لە ناو چیاكانا كوژرابوو.

گرانت جارێكی تریش لە ساڵی ١٨٤٠ دا سەری لە ناوچەی هەكاری دابـوەوە. ئەو بایەخ پێدان و ئاوڕدانە ئاشكرایانەی ئەوروپاییـەكان لـە ئاسـوریەكان و گفت

جگۆی ئاشکرای گرانت لەگەڵ سلیمان بەگ و نوراللە بەگ و چالاکیی ئاسـوریەکان
خێزدمکانی ووریا کردبوەوە و لەوە گەیشتبوون کۆمەڵگاکانی ئەوروپا بـە هـەموو
شێومیەك یارمەتی ئاسـوری دەدەن و بەدۆستی خۆیانیـان دادەنـان و ئـەنجامی
ئەمە بەوە گەیشت پێوەنـدی مـارشمعون و مـیری کـورد (مەبەسـت بدرخانــە)
تێوزێن.

نوراللە بـەگ پادشـای ئـەرزرۆمی بـە دیـاری نوقـوم کردبـوو تـا بەرامبـەر بـەو
ئەویش دان بـە دەسـەڵاتی بنـێ لـە ناوچەکـەی خۆیـداو دەسـەڵاتی دنیـایی
مرشمعونیش بە سـەر ئاسـوریەکانا لاواز بـێو نـوراللە بـەگ مـارشمعونی ئاگـادار
کردبوو پێویسـتە تەنـها لـە رووی ئاینیـەوە سەرپەرشـتی رەعیەتەکـەی بکـا و
دەستکاری هیچی تر نەکا. هەرچەند لەو سەردەمەدا ناکۆکی و شەڕی لاوەکی لە
هەندێ شوێنا لە نێوان کورد و ئاسـوریدا دەسـتی پێکردبـوو، بـەڵام گرانـت هیـچ
هەوڵێکی نەدا بۆ نەهێشتنی ئەو ناکۆکیە و بە پێچەوانەوە لای وابوو هــەتا هـەراو
شەڕەوە و پاشا گەردانی زۆرتر بێت ئاسوریەکان باشتر ناچار دەبن پەنا ببەنە بـەر
یەزدانی گەورە (خوا). لەساڵی ١٨٤٢ دا (گرانت) دوبارە گەشتێکی تـری بـەناو
گوندەکانی ئاسوریەکانا کردووەو لەو گەڕانـەیدا ئـەوەندەی تـر پێوەنـدی نێـوان
کورد و ئاسوری تێکداو لاوازی کرد.

لە گفت وگۆیەکی گرانت و نوراللە بەگ و سلێمان بەگ، بە ئاشکرا گرانت پێـی
وتبون دەیەوێ بنکەیەکی میسنێری لەناو گوندی ئاسوریەکانا دامەزرێنێت و دیار
بوو ئـەو بنکەیـەی لـە هـەکاری و ئەشـتیا دروسـتی کردبـوو لـەوە نـەدەچوو بـۆ
قوتابخانـە بووبێـت، بۆیـە بـوو بـە هـۆی بڵاوبونـــەوەی دەنـگ و باسـێك لــەناو
کوردەکانا ئەوروپاییـەکان کۆشـکێکیان دروسـت کـردوە بـەنیازی بڵاوکردنـەوەی
ئـاینی مەسـیحی لـە کوردسـتاناو مـەلا موسـڵمانەکان ئـەو هەواڵـەیان قۆزتـــەوەو
دەستیانکرد بە بزواندنی هەستی ئایینی کوێرانە لەناو خەڵکا وبوو بەهۆی ئەوەی
میرەکانی هەکاری و بۆتان ئاڵای دوژمنایەتییان بەرامبەر بە مارشمعون هەڵکرد.

لەساڵی ١٨٤٢دا ئیسماعیل بەگ کە ئەبوایـە ببـێ بـە مـیری بادینـان، لـەوەدا
بدرخان و نوراللە بەگ لایەنگری بون، لەگەڵ ئەوەشدا ئاسوریەکان بەرلەوە چـەند
جارێك یارمەتی ئیسـماعیل بـەگیان دابـوو، بـەلام لەمـەدا مـارشمعون هەڵوێسـتی

بەرامبەر ئیسماعیل بەگ تـەواو نـەبوو، لەولاشـەوە دیپلۆماسیە ئەوروپاییـەکان و میسنێرەکان دەیان ویست هـێزو دەسـەڵاتی حکومـەتی عوسمـانی لـەناو کوردا چەسپاوو بەهێز بێت بۆ ئەوەی بتوانن لەرێگـەی حکومەتـەوە دەسـەڵاتی خۆیـان بەئاسانتر بلاو بکەنەوەو ئەوەیان لا باشتر بوە دەسەڵاتی حکومەت بەهێزتر بیت وەك لە دەسەڵاتی میرەکانی کورد و ئەوروپاییەکان بۆ سەرگرتنی ئـەو مەبەسـتە مارشـەمعونیان کـرد بــە لایــەنگری خۆیــان و لــەناو ئەوانــەدا (گرانــت) هــەوڵ وکۆششێکی زۆری دا بۆ گەیشتن بەو مەبەستە. لـەو راپۆرتـەی گرانـت لەگەشتی یەکـەمیا دەربـارەی هـەکاری تۆمـاری کردبــوو نــاردبووی بــۆ (مەکتــەبی ئەمریکاییەکان) داوای کردبوو پێویستە دەزگایەکی هۆشیار کردنەوە دامەزرێنری لەناوچەکەداو خستبویە مێشکی مارشمعونەوە ئەگەر حکومەت دەسدرێژی بکاتە سەر کریستیانەکان ئەوا وەکو حکومـەتێك بەرپرسـیار دەبێـت و حسـابی لەگـەلا دەکریٚ ، بەلام کورد چونکە حکومەتی نیە، خۆی بـە بەرپرسـیار نـازانێت ئەگـەر دەسدرێژی بکاتە سەریان.

دیاربوو مارشمعون پشتی بە دەوڵەتە ئەوروپاییــەکان بەسـتبوو، لەونامەیـەدا بۆ کونسوڵی بریتانیای ناردبوو لە بغداد داوای کردبوو دەوڵەتە ئەوروپاییەکان لـە رێگەی چەکداریەوە بچنە مەیدانەوەو کونسـوڵیش بـەڵێنی یارمـەتیدانی پێدابوو. بەلام لە هەمان کاتدا بە ئامۆژگارییەوە داوای کردبوو بــە شـێوەیەکی نـەهێنی و بێ جاڕدان و زانینی کەس ئەو نامانەی بۆ بنـێرێت و لـە ئـەنجامی ئەمـەدا والیـی عوسمانیش لە موصل (کە دیارە ئاگـاداری بـارو دۆخ بـوە) چـاوەڕوانی ئـەوەبو هەردوو دراوسیٚ سەرشۆڕنەکەرەکە (مەبەست کورد و ئاسوری بوە ) بچن بە گـژ یەکترداو هــەردوکیان ناچـارین بچنـەوە ژێـر بـاڵ و سـایەی حکومەتـەوە. لەگەل ئەوەشــدا تورکــەکان حــەزیان دەکــرد کــورد و ئاسـوری تێـك بچـنٚ، بــەلام کاربەدەستانیان لە موصل لەوە سڵەمیبونەوەو ترسی ئەوەیان لیٚ نیشتبوو بەهێز بوونی میسنێرەکان و پەرەپێدان بەدروستکردنی بنکەکانیان دەسەڵاتی خۆیـانی پیٚ لاواز دەبوو، بۆیە میرە کوردەکانیان هاندا ئەگەر پەلاماری ئاسوریەکان بدەن کەخۆیان فرۆشتبوو بە بێگانە، ئەوا حکومەتیش حسابیان لەگـەلا دەکـاو رێگـەی هێرش بردنیان لیٚ ناگریٚ بۆ سەر ئاسوریەکان.

ـسالّی ١٨٤٢ دا باسی ئـەوەی پێوەندیـی کـورد و ئاسـوری تێکچـوو،
ـرشمعون کۆبونەوەیەکی لەگەڵ (بێجیر) ی بەعسەی ئینگلیزەکانا کـردو بێجیر
ـرفەتی لە دوور کەوتنەوەی (گرانت) وەرگرت کە لەوکاتەدا چوبوە موصلّ نـەك
ـها هەر هەوڵیدا مارشمعون لەگەلّ کوردەکانا تێك بدا بەڵکو هەوڵی ئەوەشی دا
ـچنێرە ئەمریکاییەکانیش لە ئاسوریەکان دوور بخرێنەوە وەکـو چۆن بەرلەمـە
ـسالّی ١٨٤٠دا ساتێك (ئینفورت) چاوی بە مارشمعون کەوتبوو داوای لیّ کردبوو
ـێت بەلایەنگری کەنیسەی ئەنگلیکانی ئینگلیزو ئەمریکاییەکانی لای مارشمعون
ـوە تاوانبار کردبوو کە لە خۆیانەوە رێبازێکی تازەیان بۆ کریستیانێتی داناوە
ـمەبەست پرۆتسـتانت بـوە) بێجیر لـە چاوپێکەوتنەکەیدا داوای لـە مـارشمعون
ـکردبوو پێویستە خۆی دووربخاتەوە لە مـیری بوتـان و بـە ئاشـکرا لـەو نامەیـەدا
ـکەبۆ (کۆمەڵی بلاوکردنـەوەی ئینجیـل)ی نـاردبوو ووتبـوی نـورالله بـەگی مـیری
ـەکاری مافی سەربەستی لە ئاسوریەکان زەوت کردوەو ئەگەر فریایـان نەکـەوین
ـە یارمەتی کریستیانەکان نەدەین، بە چاوی خۆمان دەیان بینینەوە چۆن دەبـن
ـە ژێر دەستەو ملکەچی کوردەکان.

ئەوەی شایانی باسە ئەم جم و جوڵەی بێجیر لەو رۆژانەدا بوە کە کورد خۆی
ـۆ راپەرینێك ئامادە دەکرد دژی تورکەکان و بەتەمای ئەوەش بوە لەوراپەرینەدا
مـارشمعون ببێـت بـە هاوکـار و یارمـەتیدەری کـورد. جلیلـی لەلاپـەرە ٢٣٤ی
کتێبەکـەیدا باسـی نـاردنی دوو نـێرراوی بدرخـانی کـردوە بـۆلای مـارشمعون بـۆ
ئەوەی بکەوێتە گفت و گۆکردن لەگەڵیا دەربارەی راپەرینی کورد بەرامبەر تـورك
و لەوکاتەدا (بێجـیر) لای مـارشمعون بـوەو بـەهۆی بێجـیرەوە مـارشمعون قـایل
نەبوە چاوی بەو نوێنەرەی کورد بکەویّ.

لەسالّی ١٨٤٤دا ساتێك نوێنەری بدرخان بەگ چاوی بە (دوکتـۆر سمیـث) و
(بارون لویس) دەکەویّ لەجۆڵەمێرگ، نوێنەرەکەی بدرخـان بـۆی باسـکردون کـە
سـاتێك چوەتـە لای مـارشمعون و بیجـیری لابـوە، بێجـیر زانیبـوی مەبەسـتی
چوونەکەیان چی بوە بۆیە مارشمعونی هاندابوو چاوی پێی نەکەویّ و مارشمعون
دڵنیا کرابوو لەلایەن بێجیرەوە کە پێویستە تەنهاهـەر پشـت بەیارمـەتی بریتانیـا
ببەستێت و هیچ پێویست ناکا چاوی بە هیچ نوێنەرێکی میری بۆتان بکەویّ.

بەڵام جلیلی لە سەرچاوە ٢١دا باسی بێجیری بە جۆرێکی تر تۆمارکردوە کەلەوەی نوێنەرەکەی بدرخان ناچێت کەبۆ دوکتۆر سمیث و بارون لویسی گێڕابوەوە و لەمەدا وتویەتی:

((ساتێك نوێنەری بدرخان بۆ یەکەم جار براکەی مارشمعونی بینی پێی ووت: بۆئەوە هاتوە گفت و گۆ بکەن بۆ رێك کەوتن، چونکە خاکی هەکاری وای لێ هاتوە هی کورد و ئاسوری نەبێ بەڵکو هی ئەمەیە کە پەنجەی بۆ بێجیر درێژ کردوە. بێجیر لە کتێبەکەیدا نوسیویێتی: براکەی مارشمعون ئەم ووشەی (ئەمە یەی بە نۆکەرەکان لێك داوەتەوە بەڵام لەراستیدا مەبەستی نوێنەرکەی بدرخان (ئەوروپاییەکان ـ ئینگلیز) بوە نەك تورك.

بێجیر وتویەتی ساتێك نوێنەرەکەی بدرخان هاتەلای مارشمعون بەوپەڕی رێزەوە پێشوازی لێ کرد (کە لە پێشیدا وترابوو مارشمعون چاوی پێی نەکەوتبوو) بەڵام بەرێیشەوە دەستی نا بە رووی نوێنەرەکەی بدرخانەوە و داخوازییەکانی پشت گوێ خست و لەوەرامدا پێی ووت: کارو پیشەی ئاینی رێگەی ئەوەی لێ دەگرێ بەکاری وا هەڵسێ)).

جلیلی ئەڵێ: دوای ئەوە مارشمعون ئاڵای بریتانیای لە بارەگاکەی خۆی هەڵکرد کەبەمە ویستیی لە کوردەکان بگەیەنێت بریتانیا پشت و یارمەتیدەرێتی و ئەگەر کورد خراپەی لەگەڵا بکەن ئەبێ حساب بۆ ئەوە بکەن کە روو بەڕوی ئەوروپاییەکانیش دەبنەوە.

بەوجۆرە پێوەندی کورد و ئاسوری تێکچوو کورد خۆی پێ نەگیراو پەلاماری ئاسوریەکانیدا.

پاش گەڕانەوەی (بێجیر)ی ئینگلیز بەچەند مانگێك (گرانت) ی ئەمریکی سەری لە ئاسوریەکان داو کە گەڕایەوە چەگدارەکانی بدرخان و نوراللە بەگی بینی کە خۆیان ئامادەکردبوو بۆ لێدانی ئاسوریەکان و گرانت داوای لە نوراللە بەگ کردبوو ئاگاداری ماڵ و موڵکی میسنێرەکان و ئەو کەسانە بێ کە بەناچاری رووی تێدەکەن و پەنائەبەنە بەر ئەو.

بێگومان گرانتیش هەروەکو بێجیر دەستی هەبوە لە ئاڵۆزکردنی نێوان کورد و ئاسوریەکان، بەڵام کە کار گەیشتە تەقینەوە ئیتر گێڕی خۆی گۆڕی و وتی

گری ئەو نیە کە خۆی تووشی ئەو کێشەیە بکا بۆیە دووره پەرێز دەوەستێ.
ێتر دوای تەواوبوونی گەشتەکەی گرانت کە بۆماوەی دەرۆژ لای نوراللە بەگ
میوەوە، کوردەکان پەلاماری ئاسوریەکانیان داو پەریشانیان کردن و لە ئەنجاما
ئاسوریەکان زیانێکی زۆریان لێ کەوتوو گەلێك گوندیان سووتێنران و تووشی
ەلاتی بوون و پاش ئەو هەموو خوێن ڕشتنە خۆڕاییە، هەموو یارمەتی دانێکی
ئینگلیز بۆ ئاسوریەکان بریتی بوە لە ناردنی هەندێ پارە بۆ لێقەوماوەکانیان.
جلیلی ئەڵێ: لەگەڵ ڕوودانی ئەویەسەرهاتە ناخۆشەی بەسەر ئاسوریەکان
ەت، کوردە ساکارەکان هەستی بەزەییان بۆ ئاسوریەکان جووڵا بەڵام پاش
ئەوەی مارشمعون بە شەڕەشەق توانیبوی خۆی دەرباز بکات و بگاتە ورمیە بە
ێ ئەوەی ئەوانەی هانیان دابوو هیچ لایەکی لێ بکەنەوە.
جلیلی لەباسەکەیدا باسی کتێبی (جۆزیف) ی کردوە کە پەنجەی بۆ
میسنێرەکانی ئینگلیز و ئەمریکاییەکان درێژ کردوە و بەوە تاوانباری کردون
ئەوان بون بوبونە هۆی نانەوەی ئەو شەڕە خۆڕاییە، بەڵام لای گرانت وابوە هۆی
سەرەکی ڕوودانی ئەوکارەساتە بەهۆی میسنێرەکانی ئەمریکاوە بوە. جلیلی
ئەڵێ: لەورۆژانەدا هێشتا خوێنی ئاسوریەکان ووشك نەبوبوەوە گرانت گەشتێکی
کرد بۆ ناو کوردە یزیدیەکان، هەرچەند مردنی گرانت مۆڵەتی تەواوکردنی ئەو
گەشتەی نەدا.
جلیلی لەلاپەڕە ٢٣٩ دا لەهەڵسەنگاندنی ئەو پەلامار دانەی بدرخان بۆ سەر
ئاسوریەکان، لای وایە تورکیا بەشێوەیەکی گشتی و کۆمەڵگاکانی ئەوروپا
بەشێوەیەکی تایبەتی وای بۆ چووبون کە بدرخان زیانێکی گەورەی گەیاندبوو بە
ئامانج و مەبەستەکانی و ئەم کارەساتە بوو بەهۆی ئەوەی ئەوروپاییەکان زۆرتر
ووتیان ژەندە ناوچەکەو ئاگری دوویەرەکییان پتر خۆشکرد لە نێوان کورد و
ئاسوریەکاندا.
جلیلی لەلاپەڕە ٢٤٠ دا ئاماژەی بۆ باسێکی (یا. لوما) کردوە دەربارەی ئەو
ڕووداوانەو وتوویەتی: پاش ئەوەی چەند جارێك ئاسوریەکان پەنایان بردبوە بەر
ئینگلیزی باوەڕپێکراویان و هیچیش سوودی نەبوو، ئەوسا ئاسوریەکان دەستیان
لە ئینگلیزەکان شتو و ڕوویانکردە رووسەکان.

## چوارەم ـ ڕووبەڕوو بونەوەی بدرخان و حکومەتی تورکیا

پاش ئەو لێدانەی ئاسوریەکان لەلایەن بدرخانەوە بالیۆزی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان لە ئەستەمبوڵ فشارێکی زۆریان خستە سەر سوڵتان و کاربەدەستانی تورك بۆ ئەوەی سزای بدرخان بدەن و حکومەتی عوسمانیان والێکرد ڕووبەڕووی بدرخان بێتەوە کە دەمێك بوو بۆ دەرفەتێکی وا دەگەڕا کە ئەوروپاییەکان بەوە قایل بن و یارمەتیشی بدەن.

دەربارەی ڕوو بەڕووبونەوەی تورکەکان و بدرخان، ڕۆژنامەی کوردستان لە ژمارە ١٣ یڕۆژی ٢٠ یمارتی ١٣١٥ یکۆچی ـ لاپەڕە ٣ کەلەشاری جنیف دەرچوە، بە پێنووسی عبدالرحمن بدرخان باسێکی دەربارەی هۆی ڕوو بەڕووبونەوەی بدرخان و حکومەتی تورك بڵاوکردۆتەوە بە دوورودرێژ کە کورتەکەی ئەڵێ: ((سولتان عبدالمجید لەشەڕێکدا داوای لەبدرخان کردبوو یارمەتی بداو ئەویش داخوازیەکەی قبوڵ کردو ساتێك لە بەشداربوونی ئەو شەڕەدا گەڕایەوە بۆی دەرکەوت خەڵکەکە لە ژێر جەورو ستەمی کاربەدەستانی تورك دەیان ناڵاند و باج و سەرانەیەکی زۆریان لێ دەسەندن، لەبەرئەوە بدرخان خۆی کۆکردەوەو دانیشتوانی کوردی لەناوچەکەی خۆیا لە جەورو ستەمی تورك ڕزگار کرد و کارگوزاری و دادپەروەریی بدرخان کارێکی وای کردبوو خەڵك ڕێزێکی تەواوی بدرخان بگرن و حکومەتی عوسمانیش هەرچەند ئەو توانایەی جارانی نەمابوو بە ئارەزوی خۆی باج و سەرانە بسێنێت و ڕاووڕووت بکەن، لەبەر ئەوە دەستیانکرد بە بیانووگرتن بۆ ئەوەی لە دەرفەتێکدا لە بدرخان بدەن.

والیی موصل کە (ئەسعەدپاشا)بوو لەگەڵ چەند والییەکی تری تورك نامەیان ناردبوو بۆ سولتان عبدالمجید کەوا هەموو کوردستان کەوتۆتە دەس بدرخان و (عوسمان پاشا) ی والی حلب هێزێکی گەورەی نارده سەر دیاربکر کە بریتی بوو لە (٣) هەزار سەرباز و (٤٠) تۆپ و پەلاماری جزیرەیان دا.

حکومەتی ئەستەمبوڵ (مەلا ئەفەندی) نارد بۆ ئەوەی شەڕەکە بوەستێنێ. بەڵام عوسمان پاشا ملا ئەفەندی گرت و ناردیەوە بۆ ئەستەمبوڵ و نامەیەکیشی نارد بۆ سولتان و ئاگاداری کرد مەلا ئەفەندی کابرایەکی سەربە بدرخانەو هەر کە

مەلا ئەفەندی گەیشتە ئەستەمبوڵ بۆ لێکۆڵینەوە گیرا و ئاوارەکرا بەتاوانی ئەوەی لەژێرەوە لایەنگری بدرخان بوە.

لەئەنجاما گەلێك شەڕی گەورە لە نێوانی بدرخان و هێزەکەی عوسمانیشادا ڕوویداو دوای شەڕێکی قورس و سەخت بدرخان بەرامبەر بەو هێزە بڕچەکەی عوسمان پاشا خۆی پێ نەگیراو ناچاربوو لە قەڵای (ئورخ) خۆی قایم ..بەڵام سوودی نەبوو چونکە تۆپەکانی عوسمان پاشا لێی کەوتە کارو قەڵاکەی وێرانکرد و هێزەکەی بدرخان شکاو گیراو ئاوارەکرا بۆ دوورگەی (کریت) . لە پاش یازدەساڵ سوڵتان عبدالعزیز داوای لە بدرخان کرد بێتە ئەستەمبوڵ، بەڵام بدرخان ئەوەی پەسەند نەکرد و داوای کرد ڕێگەی پێ بدرێ بچێتە شام ەوێ کۆچی دوایی کرد)).

دەربارەی ئەو (مەلا ئەفەندییە) ی لەرۆژنامەی کوردستانا باسی کردوە، مەلا محمودی بایزید بوە کە بەر لەمە لەڕیزی زانایانی کوردا باسیکی تایبەتیمان بۆ ئەرخان کردبوو، لە سەرچاوەکانی داهاتووشدا باسی مەلا محمودی بایزیدی کرلوە وەکو نوێنەرێکی حکومەتی عوسمانی بۆ لای بدرخان.

دەربارەی چۆنیتی ڕووبەڕوو بوونەوەی بدرخان و حکومەتی عوسمانی، جگەلەو باسەی ناو روژنامەی کوردستان، دوکتۆر جلیلی لەلاپەڕە ١٧٢ی سەرچاوە ٩٣دا بەدوور و درێژ باسی ڕوو بەڕوو بوونەوەی بدرخان و حکومەتی تورکی کردوە هەتا کاتی شکاندنی و ئاوارەکردنی کە کورتیەکەی بریتیە لە:

((لەگێژاوی ئەو بەسەرهاتەی نێوان کورد و ئاسوری، حکومەتەکانی ئەوروپا فشارێکی زۆریان خستە سەر بابی عالی و حکومەتی تورکیش خۆی ئامادە کرد و داوای لە حافظ پاشا کرد پێوەندی بە بدرخانەوە بکا بۆ ئەوەی دان بە دەسەڵاتی حکومەتا بنێت و حافظ پاشا چوو بۆ ئەرزڕۆم و کردی بە بنکەی خۆی و لەپێشدا چوەلای محمودی بایزیدی زانای کوردی بەناوبانگ بۆ ئەوەی بکەوێتە بەینەوەو بە خۆشی و بە گفتوگۆ کێشەکە چارەسەر بکرێ.

لەو ڕوەوە (ژابا) ی قونسوڵی روس لە ئەرزڕۆم باسی مەلا محمودی بایزیدی کردوە ئەو ئەرکەی پێی سپێررا بوو زۆر بەباشی بەجێی هێنابوو، مشیر حافظ پاشا زۆر لێی ڕازی بوو. پاش ماوەیەك کامل بەگی حاکمی ئەرزڕۆمیش محمودی

بایزیدی ناردبوو بۆ لای نوراللە بەگی هەکاری بۆ گفتوگۆکردن وەکو لەگەڵ بدرخاندا کرابوو، هەروەکو (ژابا) باسی کردوە کامل بەگیش لە گفت و گۆکەی نێوان بایزیدی و نوراللە بەگ ئاگادار بوە.

ساتێك تورکەکان (خان محمود)یان دەعوەت کرد بۆ ئەرزرۆم، خان محمود تەنها کوردی ئەزانی بۆیە مەلا محمودی بایزید کرا بە ترجمان و پاش ئەوەی پێشوازییەکی گەرم لەخان محمود کرابوو، کە گەڕایەوە بۆ (هەواس) کە دەکیلۆمەتر دورە لە (وان)ەوە یەکسەر دەستی کرد بەجم وجۆڵ و ڕاپەڕین و کاربەدەستەکانی تورکی لە ناوچەکەی خۆی دەرکرد. کامل بەگ کەحاکمی ئەرزرۆم بوو مەلا محمودی بایزیدی بەوە تاوانبار کردبوو خان محمودی هان دابوو دەس بکا بە ڕاپەڕین و کامل بەگ مەلا محمودی بایزیدی خستە زیندانەوە لەگەڵ ئەو هەموو خزمەتەی بۆ دەوڵەتی عوسمانی کردبوو.

مێژووناسی تورکی شارەزا (لوطفی) لەلاپەڕە ٥٤٥ ی کتێبەکەیدا باسی ئەوەی کردوە کە (عوسمان پاشا) کەبە (عوسمان تۆپاڵ = عوسمانەشەل) ناسراویوە (لەڕۆژنامەی کوردستانا وەکو بەر لەمە باسمان کرد وتبووی والی حلب بوە) کرا بە سەرکردەی هێزەکانی تورك لەئەنادۆڵ، ئیتر لە مانگی مارتی (١٨٤٧) وە ڕۆژنامە تورکیەکان دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی باسی هێرشی داهاتووی حکومەت بۆسەر کورد. ڕۆژنامەی (ئەرشا شالویسی ئاراراتیان)ی ئەرمەنی باسی ئەوەی کردوە هێزەکانی حکومەتی تورك بەوهەموو ترسناکیەی خۆیانەوە نەیانتوانیبوو هێزە درەکەی بەگ (مەبەست بدرخان بەگ بوە) کپ بکەن، لەبەر ئەوە حکومەت هێزێکی زۆر گەورەی بە سەرکردایەتی (عوسمان پاشا) و (سەید عمر) ناردەسەر کوردەکان و هێرشیان بردە سەریان و خیرالدین پاشای حاکمی دیار بکریش خۆی ئامادەکردبوو بۆ شەڕ کردن ئەگەر پێویستی بە هێزەکەی ئەویش هەبوایە.

هەروەکو عوسمان پاشای تۆپاڵ گەیشتە ئەرزرۆم دەسبەجێ دەسیکرد بە گرتنی سەرباز بەزۆرەملێ و لە ناوەڕاستی مانگی ئایاری ١٨٤٧دا خۆی ئامادەکرد و لەسەرەتای حزیراندا لەپێشدا ڕوویکردە عبداللە خان لەناوچەی

ـیکس ـ مگس)، عبدالله خانی گرت و بە خۆی و خاوخێزانیـەوە ئـاوارەی کـرد
ـ جێگەی (رۆدس) و پاش ئەوە (مستەفا بەگ)یش خۆی دابەدەستەوە.

هێزەکانی عوسمان پاشا لەسێ قۆڵەوە پەلاماری هێزەکانی بدرخان بـەگی‌دا،
ـ قۆڵی راستەوە بەسـەرکردایەتی (عمـر پاشـا) و قۆڵـی چـەپ بەسـەرکردایەتی
ـەبری پاشا)ی سەرۆکی ئەرکانی ئەنادۆڵ و عوسمان پاشا خۆشی لە نێوان ئەو
ـ قۆڵەوە پەلاماری هێزەکەی بدرخانی‌دا و هێزێکی تری حکومەت لە خریـوط و
ـێکرو ئەرزڕۆم و بەغداد و موصڵەوە نێرران بۆ هێزەکانی عوسمان پاشا.

هێزەکـانی حکومـەت (٢٥) هـەزار سـەربازبوون و هـی کوردەکـان لـە نیـوان
ـ ـ١٧ هەزار چەکدارابون (بەڵام سریا بدرخان لەلاپـەڕە ٢٩ ی سـەرچاوە ٧٩دا
ـوییـەتی هێزەکـانی حکومـەت (٦٠هـەزار) چـەکدار بـوەو سـاتێك لەسـەرەتادا
ـێرمکەی تورك شکێنرا و حکومەت ناچار بوو سەد هەزار چەکداری تری نارد بۆ
ـرمەتی و ئەویش شکا بەڵام یزدان شێری برازای لێی هەڵگەڕایـەوەو خیانـەتی لێ
ـرد وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەو خیانەتەی دەکەین). جلیلی لە باسەکەیدا
ـەرچاوە ٩٣، لەسەری ئەڕواو ئەڵێ:

((هێزی تورك لەباکورەوە هێرشی بـرد بـۆ سـەر باشـورو بەشێکی ڕوویکـردە
ون، موکس، هەکاری) بۆ ئەوەی ڕێگەی گەیشتنی یارمـەتی بگرێ بـۆ بدرخـان
ـلایـەن نـورالله بـەگ و خـان محمـودەوە لەسـەرەتادا تورکـەکان شـکان بـەڵام
ـیانەتەکـەی یـزدان شـێری بـرازای بدرخـان کـارێکی وایکـرد بدرخـان ناچـاربێ
ـەخۆیو (٥ تـا ٦) هـەزار چەکدارێکـەوە ڕوویکاتـە قـەڵای (ئـورۆخ) و عوسمـان
ـشـای تۆپـاڵی ماوەیـەك دەوری قەڵاکـەی داو تـۆپ بـارانی کـردو لـە ئـەنجامدا
ـرخان دەستی کرد بە گفت وگۆکردن و پاش ئەوەی هیوای سەرکەوتنی نەمابوو
ـ ڕۆژی ٢٠ ی تەموزی ١٨٤٧ دا پاش ئـەوەی بـەڵێنیان پێدابوو ژیـانی خـۆی و
ـەوانەی لەگەڵیابوون دەپارێزن، دەرگای قەڵاکەی کردەوە و خۆی دابەدەستەوە
و هێزەکەی عوسمان پاشا دەستی کرد بەتاڵان کـردن و گـەلێك گونـدی ناوچـەی
(بۆتان) کـاول کـران و حکومـەت دەسـتی گـرت بەسـەر هـەموو موڵك و سـامانی
بدرخاندلو هەموویان فرۆشران و بۆنمونە گوندی (دیرگول) فرۆشرا بـە (١٥هـەزار
قروش).

سەرکەوتنی حکومەت بەسەر بدرخاندا بوو بەمایەی خۆشی و شادی لە ئەستەمبوڵداو بدرخان خۆی و خێزانەکەی لەژێر هێزێکی حکومەتدا نێررا بۆ ئەستەمبوڵ و رشیدبەگی قائمقامی دیاربکرو عبدالقادر بەگ هەردووکیان لەگەڵی چون بۆ ئەستەمبوڵ و رۆژی ۲۹/۹/۱۹٤۷ گەیشتنە ئەستەمبوڵ و لەوێوە بدرخان خۆی و خێزانەکەی ئاوارە کران بۆ دوورگەی (کریت)و لەوێ ماوەیەك مایەوە و لە دوایدا لەساڵی ۱۸٦۸دا لەشام کۆچی دوایی کرد)).

رۆژنامەی کوردستان لەو ژمارەیەی بەر لەمە باسمان کرد ژمارە ۱۳۰ وتوویەتی دوای ئەوەی بدرخان ماوەی یازدە ساڵ لەکریت مایەوەو لەو ماوەیەدا خزمەتێکی زۆری کریستیانەکانی ئەو دوورگەیەی کردبوو ژیانی زۆریانی رزگار کردبوو هەتا لە زەمانی سوڵتان عبدالعزیزدا داوای کرد رێگەی بدەنێ بچێت بۆ شام و لەوێ کۆچی دوایی کردوە.

من لەساڵی ۱۹۹٦دا لەشام چوومە زیارەتی مەزارەکەی لەلاپاڵی چیای (قاسیوندا کە خۆی و جلادتی کوری ئەمین عالی بدرخان نێژرابون و بە پێی قسەی ئەوانەی لەگەڵما هاتن شوێنی بدرخان و جلادت هەر لەم شوێنەدایە).

دەربارەی سەرکەوتنی تورك بەسەر بدرخاندا، دوکتۆر عزیز شمزینی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤۱ باسی ئەوەی کردوە چۆن هێزەکانی تورك بۆ ماوەی هەشت مانگ ئابڵوقەی قەڵای (ئورخ) یان دابوو، بدرخان و چەکدارەکانی لەوماوە دوورو درێژەدا توانیبویان بەرگەی تورکەکان بگرن بەڵام لەبەر نەمانی ئازوقە و تەقەمەنی ناچار بوو دەسبکا بە گفت و گۆکردن و خۆی دابەدەستەوەو

حکومەتی تورك بایەخێکی زۆری دابوو بەوسەرکەوتنەو لە خۆشی و شادیی ئەوە مدالیایەکی تایبەتی دروستکردبوو بەناوی (میدالیای کوردستان) و رووبەکی مدالیاکە وێنەی ئورخی لەسەر بوەو دیوەکەی تریش لەسەری نوسرابوو ساڵی ۱۸٤۷، ساڵی سەرکەوتنی حکومەتی تورك بەسەر بدرخاندا.



گۆڕی بەدرخان بەگ و جلادتی کوڕی ئەمین عالی بدرخان لە کێوی (قاسیون)

**پێنجەم: هۆی سەرنەکەوتنی بدرخان و هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکەی**

لەگەڵ ئەوەشدا بدرخان مرۆڤێکی لێهاتوو دووربین بـوەو بەرلـەوەی دەست بکا بە شۆڕش و ڕاپەڕینەکەی هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری دابوو بۆ ئـەوەی لەگـەڵ سەرۆکە کوردەکـاندا دۆسـتایەتی و پێوەندییـەکی بـەهێز پێك بێنێت و بـۆ ئـەو مەبەستە توانیبوی (پەیمانی پیرۆز) یان لەگەڵدا مۆر بکـا بـۆ ئـەوەی هـەموویان ببن بەیەك و پێکەوە هاوکاری بکەن بۆ گەیشتن بە ئامانجە پیرۆزەکانی کە بریتی بـوە لـە دامـەزراندنی حکومـەتێکی کـوردی سـەربەخۆ، هـەروەها تەقەلایـەکی زۆریشـی دابـوو بـۆ ئـەوەی کریسـتیانەکانی ناوچەکـەی خـۆی و دەوروبـەری ئەمارەتەکەی بکـا بـە دۆسـتی خـۆی و پێکـەوە ڕوو بـەڕووی جەوروسـتەمی تورکەکان ببنەوە، بەڵام بەداخەوە وەکو لە باسی پێشوودا دێتە بەرچاو بە هـۆی میسنێرەکان و دبلۆماسیەکانی وڵاتانی ڕۆژئاواوە تەقەلایەکانی بێ سوود بوەو لە ئـەنجامدا شۆڕشـەکەی تێـك شـکاو خۆشـی ئـاوارەو دەربـەدەرکرا. بـەکورتی دەتوانین هۆی سەرنەکەوتنی شۆڕشەکەی بدرخان بکەین بە دوو بەشەوە:

**هۆی یەکەم: هۆی خۆمانە**

لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەدرخان بەرلـەوەی شۆڕشـەکەی دەسـت پـێ بکـا بـۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی نەخشەیەکی کێشابوو بەڵام بەداخـەوە بناغـەی نەخشـەکەی پتـەوو بـەهێز نـەبوەو لـە چوارچێـوەی شـێوەیەکی عەشـایەری و هەڕەمـەیی تێپـەڕی نـەکردوە و لـەو هـەموو سـەرچاوانەی باسـی بدرخـان و شۆڕشەکەیان کردوە لە هیچیانا ئـەوە بـەرچاو ناکـەوێ دەزگایـەکی ڕێك وپێکـی دامـەزراندبێت بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـارە گرنگـەکان وەکـو بوونـی دەزگایـەکی بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆو دەزگایەکی سوپایی لەچەند ئەفسـەرێکی شـارەزا بە سـوپاکە بێگومـان کـورد هـەرچۆنێك بووبـێ لـەناو سوپای عوسمـانیدا چـەند ئەفسـەرێکی هـەبوەو نـەتوانراوە دەزگایـەکی سـوپایی یـەکگرتوو بـۆ هـەموو ناوچەکان و ئەو ئەمارەتانەی پەیمانی پیرۆزیـان مـۆر کردبـوو دامـەزرێنێت و کـە شۆڕشـی دەسـتی پـێ کـردوە هـێزە چـەکدارەکانی بدرخـان بـە شـێوەیەکی هەڕەمەیی بێنەخشە ڕوو بەڕووی سوپایەکی مەشق پێکراوو چەکداری حکومـەت بوونـەوەو هـەر سـەرۆك عەشـیرەتە لـەناو خۆیاو بـە شـێوەیەکی لێـك پچڕاو لـە

هێزەکانی تری کورد بەرەنگاری سوپای تورك بوونەتەوەو بەشدار بوونی ئەو سەرۆکانەی تر لە شۆڕشەکەی بدرخاندا لە چوارچێوەیەکی تەسکی عەشایریدا بوە و هەرلەسەرەتاوە و لەوکۆبونەوەیەی پەیمانی پیرۆزی تیادا مۆرکرابوو هەر سەرۆك عەشیرەتەی داوای بەشی خۆی کردبوو، کردبووی بە مەرج کە لەدوای سەرکەوتن ئەو شوێنەی داوای کردبوو بیدرێتێ و لەژێر دەسەلاتی خۆیدا بێ، کە ئەمە مانای ئەوەیە هەر لەسەرەتاوە هیچیان ئیمان و بڕوایان بەبوونی حکومەتێکی یەکگرتوو نەبوەو دوورنیە هەندێکیشیان هەر بۆ حساب ڕاستکردنەوە چوبنە ناو پەیمانی پیرۆزەوە و بەوجۆرە نەبوونی دەزگایەکی ڕێك پێك و دابەشبوونی ئەرکەکانی شۆڕش بەسەر چەند لێپرسراوێکدا کارێکی وای کردبوو بە خۆبەدەستەوەدانی سەرکردەی شۆڕشەکە هەرەسی هێناوەو لەناوچوە.

بێگومان ئەو خیانەتە گەورەیەی یزدان شێر لەگەڵ بدرخانی مامیا کردبووی هۆی سەرەکی بوە بۆ ڕوخانی شۆڕشەکەی بدرخان و بەوەش وازی نەهێنابوو لە شۆڕشەکەی بدرخانا چوبوە پاڵ هێزی داگیرکەرەوەبەڵکو لە ئابلۆقەدانی قەلای (ئوروخ) یش دا هاوکاری هێزی حکومەت بوە.

دەربارەی هۆی ئەو تێکچوونەی بدرخان و یزدان شێری برازای، صادقی شرفکندی لەلاپەرە ٢٣ی سەرچاوە ٧١دا وتوویەتی ناکۆکی و کۆنەقینێك هەبوە کە بوە بەهۆی ئەوەی لەوکاتە ناسکەدا یزدان شێر بیری لەوە کردۆتەوە تۆڵەی باوکی لە بدرخانی مامی بکاتەوە، گوایا ساتی خۆی سیف الدین باوکی یزدان شێر کە برای بدرخان بوە ئەو لەپێشتر بوە کە بکرێ بە ئەمیری جزیرو بۆتان بەلام بدرخان ئەوەی لێ زەوت کردوەو یزدان شێر ئەو ڕقەی لەدلدا بووە.

لەڕاستیدا رەنگە تارادەیەك یزدان شێر ئەوەی گرتبێتە دڵ کە باوکی میرایەتی جزیرە و بۆتانی بەهۆی بدرخانی مامیەوە لەکیس چوو بوو، بەلام بڕوا ناکەم ئەوە تاکە هۆیەکی ئەو خیانەتەی بووبێ چونکە لەلایەکەوە ئەگەر بدرخان بیزانیایە یزدان شێری برازای خۆی بەدوژمنی ئەو زانیوە و لەوشۆڕشەدا نەیدەکرد بە سەرکردەی یەکێك لە هێزەکانی خۆی کە یەزدان خۆیو ئەو هێزەی لە بدرخان هەلگەڕابوەوە بەڵکو هۆیەکی گرنگتر هەبوە کە یزدان شێری لە خشتە

بردبوو ئەویش ئەوەیە لام وایە یزدان شێر لەکاتی شەڕەکەدا هەستی بە لاوازیی هێزەکەی مامی کردبێ و لای وابووبێ شەڕەکەی دۆڕاندوە و لەدڵی خۆیا وتوویەتی کە ئەو ڕۆژی با تورکەکان باوەڕ بە من بکەن و لەجیاتی مامم ببم بە حاکم و میری بۆتان کە ئەبوایە باوکم خاوەنی ئەو پلەو پایە بوایە، بێگومان هەلپەرستی و کورت بینی یزدان شێر لەلایەك وتەقەلای تورکەکانیش بۆ فریودانی کە لەشۆڕش جیابیتەوە هۆیەکی کاریگەر بوە.

***هۆی دوهەم:*** **هۆی بێگانە**

لەگەڵ ئەوەشدا هۆی خۆمانەو لێك نەدانەوەی ئەنجامەکانی ئەو شەڕەی بدرخان دژی تورکی عوسمانی کردبووی و نەبوونی ئەو مەرجە سەرەکیانەی پێویستە هەبن بۆ بەرپاکردنی شۆڕش لەو ڕۆژانەدا بدرخان نەیتوانیبوو بە باشی وەدەستیان بێنێت، هۆی سەرەکی سەرنەکەوتنی شۆرشەکە بوە، هۆی بێگانەش هۆیەکی بەهێز بوە بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکەو بدرخان بۆی دەرکەوتبوو دەوڵەتەکانی ئەورووپا بە ئاشکرا بوبوون بە لایەنگری کریستیانەکان و هەر ئەوانیش بوون هانی ئاسوریەکانیان دابوو، بەتایبەتی ئینگلیزەکان و میسنێرەکانی سەریەوان کە باج نەدەن بە بدرخان بۆ ئەوەی باری ئابووریی ئەمارەتەکەی لاواز بێ و نەبێ بە هێزێکی دەسەڵاتداری ئەوتۆ زیانی هەبێ بۆ کریستیانەکانی ناوچەکە کە دەوڵەتە ئیمپریالیەکانی ناوچەکە نەخشەی ئەوەیان کێشابوو بیانکەن بە کوتی دەستی خۆیان بۆ سەپاندنی مەرجەکانی خۆیان بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا، لەبەر ئەوە بدرخان ئەبوایە بە هیچ جۆرێك لە ئاسوریەکانی نەدایەو بەرلەوەی بچێت بەگژ حکومەتدا دەبوایە دەم و دووی ئەو دەوڵەتانەی تاقی بکردایەتەوە کەلام وایە بۆشی دەرکەوتبوو هیچیان لایەنگری ئەوە نەبون حکومەتی تورك لاواز بێت بەتایبەتی بەرامبەر بەڕوسیای قیصری کە چاوی بڕیبوە بەشێك لە خاکی عوسمانی و ترسی ئەوەیان هەبوە ئەگەر کورد ببێت بە هێزێکی کاریگەر هیچ دوورنەبوە ببێت بەدۆست و لایەنگری روس کە ئەمە لە سوودو بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتانەدا نەبوە.

بەوجۆرە دوای لێدانی ئاسوریەکان دەوڵەتەکانی ئەورووپا فشارێکی زۆریان خستە سەر سوڵتانی عوسمانی بۆ لێدانی بدرخان و نەهێشتنی دەسەڵاتی و

تورکەکانیش چاوەڕوانی هەل و دەرفەتێکی لەباری وابوون ئەمارەتـە ڕێکـو پێکەکەی جزیرەو بۆتان لەناوببەن کە توانییان لەناوی ببەن

**شۆڕش و ڕاپەڕینی دوهەم**

## هەڵوێست و ڕووداوەکانی دوای شۆڕشەکەی بدرخان پاشا

تورکەکان لە دوای لەناوبردنی شۆڕشەکەی بدرخان توانییان بۆماوەیەکی کاتی دەست بەسەر هەڵوێستا بگرن و لەهەموو بەشەکانی کوردستانا زەبرو زەنگیان دەنواند بۆ ئەوەی کورد توانای نەبێ لە هیچ بەشێکی کوردستانی ژێر دەسەڵاتیا جووڵەی لێوە بێ و هەروەکو پرۆفیسۆر خالفین لەلاپەڕە ٥٧ ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ١٠٢دا باسی کردوە تورکەکان بڕیارێکیان دەرکرد دەس بەسەر موڵك و سامانی ئەو کەسانەدا بگرێ کە بەلایەنگری خۆیانیان نەدەزانی و بێبەشیان کردن لە میراتی باوو باپیریان، بەڵام ئەوتەقەلایەی حکومەت نەیتوانیهەموو شتێك بە کامی دڵی خۆی بێنێتە دی وزۆری پێ نەچوو جم و جوڵ دژی حکومەت دوبارە لە هەندێ شوێندا دەستی پێکردوە.

دەربارەی بارودۆخی ئەو ڕۆژانەو ئەو جم وجۆڵانەی دژی حکومەت دەستی پێکردبوەوە، دوکتۆر جلیلی جلیل لە دوو سەرچاوەدا بە دوورودرێژ باسی کردوە لێرەدا کورتەیەکی ئەو دوو سەرچاوانە دەخەینە پێش چاو:

لەلاپەڕە ١٢٥ی سەرچاوەی یەکەمیان، سەرچاوە ٩٣ جلیلی باسی هێزەکانی تورکی کردوە چۆن لە دوای لەناوبردنی شۆڕشەکەی بدرخان هێزەکانیان بەرەو باکوور نارد و لە١٥/٨/ ١٨٤٧ دا چوونە ناوشاری (سێرت = سعرت)ەوە و (باروناك فیروخان)یەکێك بوە لەوانەی لەو ڕۆژانەدا لەناو بنکەیەکی سوپایی تورکدا بوە (دیارە کرێگرتە بوە) لەلاپەڕە ١٤٠ی کتێبەکەیدا باسی ڕەفتارو هەڵوێستی عوسمان پاشای سەرکردەی هێزەکانی تورکی بەم جۆرە کردوە:

((من و ئەفسەرەکانی سوپای تورك لە شاری (سێرت) لە خانوویەکی تایبەتیدا بوین و سەربازەکان لەناو چادردا بوەن و کە گەیشتینە ئەو شارە، عوسمان پاشا دەسبەجێ حەوت کەسی لە پیاوە ناودارو ناسراوەکانی شارەکەی

گرت و کەلەپچەی کردن و خستنە زیندانەوە و هیچ گوێی نەدایە هاوارو پاڕانەوەی ژن و منداڵەکانیان. عوسمان پاشا بڕیاری دا ئەوگیراوانە بە کەلەپچەکراوی لەگەڵ خۆیا بباو لە ئەنجامی ئەمەدا گەلێك سەرۆك عەشیرەت پەنایان بردەبەر خاکی ئێران و داوایان لە حکومەتی ئێران کرد وەکو ئاوارەیەك رێگەیان پێ بدرێ لەناو خاکی ئێرانا بن ئەگەر هات و حکومەتی تورك پەلاماری دان.

ئێرانیەکان بەوانەیان ووت ئەگەر ئێوە بەرەنگاری سوپای تورك ببن و لەشەڕدا بشکێن ئەوسا رووبکەنە لای ئێمە ئەوا ئەوسا ئێمەش شەڕتان لەگەڵا دەکەین و ناچارتان دەکەین خۆتان بدەن بە دەستی حکومەتی عوسمانیەوە بەلام ئەگەر بەبێ شەڕ ناوچەی جزیرە بەجێ بێڵن و بێنە ناو خاکی ئێرانەوە ئەوسا قبوڵتان دەکەین. لە ئەنجامی ئەو وەرامەی حکومەتی ئێرانا کێشە لەناو هەندێ لە کوردەکان پەیدا بوو دەستەیەکیان بەوە قایل بوون بێ شەڕو هەرا رووبکەنە ئێران و تاقمێکی تریان ئەوەیان بەترسنۆکی و بێ شەرم و شوورەیی داناو لە راستیشدا ئێرانیەکان حەزیان بەوەش نەدەکرد لەسەر ئەو کوردانە لەگەڵ حکومەتی عوسمانیدا خۆیان تووشی گێچەڵ بکەن)).

جلیلی لەباسەکەیدا ئەڵێ: ـ عوسمان پاشای تورك بڕیاریدا پەلاماری (خان محمود)بدا کە دۆست و هاوکاری بدرخان بوو، هێزەکانی نارد بۆ چیاکان بۆڕووبەڕووبوونەوەی خان محمود، بەلام هەندێ لە پیاوە ناودارو ناسراوەکانی ناوچەکە کەوتنە بەینەوە و پێشنیازیان کرد خان محمود خۆی بدا بەدەستەوە بە مەرجێك هەتا ماوە ژیانی مسۆگەر بێ لەلایەن حکومەتەوە و هیچی لێ نەکرێ و خان محمود بەقسەو بەڵێن و سوێندی ئەوانەی کەوتبوونە بەینەوە قایل بوو لە رۆژی ١٩ ٩ ١٨٤٧ دا خۆی بدا بەدەستەوەو ئەوانەی سوێندیان بۆ خواردبوو لە بەڵێنەکانی خۆیان پاشگەز بوونەوەو خان محمودیان گرت و دایان بەسەرکردەی سوپای تورك و دەم ودەس کەوتنە وێزەی و بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە رەفتاریان لەگەڵ کرد و هەنگوینیان سوو بەدەم و چاویاو بەستیانەوە بەدرەختێکەوە بۆئەوەی هەنگ بدا بەدەم و چاویەوەو دوای ماوەیەك ناردیان بۆ ئەستەمبوڵ و لەوێشەوە ئاوارەکرا بۆ (سیلیسترا)لە بولغاریا.

نکۆری پێنەچوو نەخۆشیی کۆلێرا لە کوردستان بڵاو بوەوە بەهەزارانی کوشت و نەخۆشیەکە بەناو هێزەکەی عوسمان پاشاشدا بڵاو بوەوە و لە زستانی ١٨٤٧ـ١٨٤٨ نیوەی هێزەکەی عوسمان پاشا بەونەخۆشیە مردن. لەکۆتایی ساڵی ١٨٤٧دا چەند ئەیالەتێك لەناوچە کورد نشینەکان پێك هێنرلو (ئەسد مخلص) کە کۆنە وەزیرێك بوو کرا بەحاکمی ئەو ئەیالەتانە بەڵام ئەمارەتە سەربەخۆکەی هەکاری بەسەرکردایەتی (نورالله بەگ)ی هاوکاری بدرخان تا ساڵی ١٨٤٩ درێژەی کێشاو نەیتوانی داگیری بکا و عوسمان پاشا لەزستانا بە نەخۆشی ڕشانەوە مرد. لەساڵی ١٨٤٩دا (رشیدپاشا) لەجیاتی عوسمان پاشا دا نراو پەلاماری نورالله بەگی داو نورالله بەگ خۆی بەرامبەر بەو هێزە چەکدارەی رشیدپاشا پێ ڕانەگیراو ڕایکردو چوە ناوخاکی ئێرانەوە.

جلیلی لە هەمان سەرچاوە ٩٣دا باسی ئەو کوردانەی کردوە کە پەنایان بردبووە بەرخاکی ئێران و تورك و ئێران کەوتبوونە بەین برکێ کردن لەگەڵ یەکتردا هەرلایە دەیویست کوردەکانی سەرسنوور بەلای خۆیا ڕاکێشێ بۆ ئەوەی بیانکەن بە کوتەکی دەستی خۆیان و ئینگلیزو رووسەکان لەوڕوەوە کەوتبونە نارەحەتیەوەو هەردوکیان لەوە ترسابون هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان تورك و ئێرانا زیان بەبەرژەوەندییان بگەیەنێت بەرلەمە لە ساڵی ١٨٤٣دا بەپێی پەیمانی ئەرزرۆم دەستکرابوو بەووت وێژ لەنێوان ئێران و عوسمانیدا لەو پەیمانەدا ئێران و عوسمانی و نوێنەرانی بریتانیا و روسیا ئەو پەیمانەیان مۆر کردبوو، لە ساڵی ١٨٤٧دا پەیمانێکی تازە تر بەسراو بە پێی فقرەی یەکەمی پەیمانی ئەرزرۆم ئێران و عوسمانی وازیان لەو داخوازیەی خۆیان هێنابوو دەربارەی بژاردنی ئەو زیانانەی بە هۆی عەشایرەکانی کوردەوە لێیان کەوتبوو.

لەو پەیمانە تازەیەدا ئێران و تورکیا لەسەرئەوە ڕێك کەوتن لیژنەیەك دابنرێ بۆ دانانی هێڵی سنورو هیچ لایەکیان ڕێگە نەدەن بە عەشایری لاکەی تر بچێتە ناو خاکی بەرامبەرەکەی و بڕیاردرا چەند هێزێك لەسەرسنور دابنرێت بۆ ڕێگە گرتن لە هاتوچۆی عەشایرەکانی سەرسنوور.

دەربارەی ئەو پەیمانە تازەیەی لەساڵی ١٨٤٧دا مۆرکرابوو، پرۆفیسۆر خالفین لەلاپەرە ٤٩ی کتێبەکەیدا وتوویەتی: ((بەبیانووی ئەوەی باری ژیانی

دانیشتوانی سەرسنوور باش بکرێت لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە، کاربەدەستانی ڕوس و ئینگلیز ویستیان هەل و دەرفەتیان بۆ هەڵکەوێ بۆ موسۆگەر کردنی سوودی خۆیان لەناو خاکی عوسمانیدا و فرنسیەکانیش هاتنە کایەوە و بایەخیان دا بە ڕووداوەکان و هەر کە بیستیان نوێنەرانی دەوڵەتەکان سنوریان دەستنیشانکردبوو ئەوانیش قونسوڵخانەکیان بۆ خۆیان کردەوە لە ئەرزروم.

جلیلی لەسەرچاوەی دوهەمیا سەرچاوەی ژمارە ٢١، لەلاپەڕەی ٢٩١یدا باسی ڕاپەڕینێکی تری کوردی کردوە دژی عوسمانی لە ناوچەکانی خواروی (وان) لەلایەن عەشیرەتەکانی (ڕاشکوتانلی)و ویزیدیەکان و لە ناوچەکانی (موش) و (وان)و ئەرزرۆمیشدا شەڕێکی گەورە دەستی پێکرد و بەلای (مورافیف)ەوە وابوە کوردە یزیدیەکان لەورۆژانەدا چاوەڕوانی هاتنی ڕوسەکان بون و ئەوەیان بە هەل زانیبوو دژی حکومەتی عوسمانی ڕاپەڕیبوون بۆ ئەوەی خۆیان لە جەورو ستەمی حکومەت ڕزگار بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا یزدان شێریان بۆ ماوەیەکی کاتی کردبوو بە حاکمی جزیرە (وەکو لە باسیکی تایبەتیدا باسی یزدان شێر دەکەین)، بەڵام لە پەرەسەندنی هێزو دەسەڵاتی یزدان شێر سڵەمیبوونەوە و بڕیاریان دابوو دەسەڵاتی ئەویش نەهێڵن، بەڵام بەهۆی شەڕی نێوان تورك و ڕوس (شەڕی قرم) تورکەکان ئەوەی یزدان شێریان دواخست.

دەربارەی شەری (قرم) دوکتۆر جلیلی لەلاپەرە ١٥٦ی سەرچاوە ٢١دا وتوویەتی:

((بەرلە دەسپێکردنی ئەو شەڕە، ئینگلیزەکان پێشنیازیان کردبوو تورکەکان قەڵای (قارص) دروست بکەنەوەو پڕ هێزی بکەن و ساتێك شەڕ دەستی پێکردو تورکەکان لە شەڕەکانی (کوروك دارا) و (باشکادیلار)دا شکان هێزە شکاوەکەی تورك لە قەڵای (قارص) کۆبونەوەو خۆیان حەشاردا. هێزەکانی ڕوس لە هێرشی ساڵی ١٨٥٥دا پەلاماری قەڵاکەیان دا لەلایەن (ف. ولیمس) کە عقیدێکی عەسکەری بوو (کرێ گرتەبوە لەناو سوپای تورکدا) ئەو قەڵایە دەپارێزرا، تورکەکان لەقەبی پادشایەتییان دابوو بە (ف. ولیمس) و ڕوسەکان زۆر مەبەستیان بوو قەڵاکە بگرن و تورکەکانیش بەرلەوە خۆراکی دانیشتوانی

ـوچەکەیان کۆکردبوەوەو لە قەڵاکەدا دایان نابوو، ناوچەکەشیان تاڵان کردبوو ـۆ ئەوەی روسەکان خواردنیان لەوناوچانە دەسگیر نەبێ.

روسەکان لە کۆتایی مانگی تموزی ١٨٥٥دا ئابلۆقەی قەڵای قارصیان داو ـویس فیلیکوف)ی روسی هێزێکی پێکەوەنا لەجورجی و کوردو ئەرمەن و لە تشرینی دوهەمی ١٨٥٥دا قەڵای قارصیان گرت و ئیتر بەوسەرکەوتنە شەڕ لە جبهەی قفقاسدا کۆتایی پێ هات.

کورد لەوشەڕەی روس و تورکدا هاوکاریی سوپای عوسمانییان نەکردبوو بابی عالیش هیوایەکی ئەوتۆی بە کورد نەبوەو تەنها تەقەلای ئەوەی دابوو بەشێوەیەکی ئاشتی لەگەڵ کوردا بجوڵێتەوە و بەرلەوە تورک دەستی لە کورد وەشاندبوو دەستی کردبوو بە ئاوارەکردنی و کوردیش متمانەی بە تورک نەدەکرد و بەمە تورکەکان بەشداربوونی کوردیان لە کیس چوو بوو کە لەگەڵیانا بێ.

لەورووەوە هەروەکو جلیلی باسی کردوەس (بێجیر) لەوڕۆژانەدا سەری لە گوندەکانی ناوچەی دیاربکر دابوو باسی برژێوێتی کوردی لە گوندی (خانکا جۆری ـ جلیلی لەسەرچاوەکەی تریا ئەو گوندەی بە خانێك جووی ناوبردوە کە لە نێوانی دیاربکرو ماردیندا بوە).

بێجیر (ئەوەی لەباسی کێشەی کوردو ئاسوریەکانا ناوی هاتوەو دەستێکی باڵای هەبوە لەتێکدانی کوردو ئاسوریدا)، دەربارەی کوردەکانی ئەو ناوچانە وتوویەتی:

((لەئەنجامی ئەو هەموو باج و سەرانە زۆرەی حکومەتی تورك لە کوردەکانی دەسەند، زۆریان ناچارکرابوون ڕوویکەنە چیاکان و لەوێ کە چاوم پێیان کەوت و باسی خۆیانم لێ پرسین لەوەرامدا وتیان: بەڕاستی خۆشمان نازانین چی بکەین... ئەگەر لە پێدەشتەکانا خانوو بۆ خۆمان دروست بکەین و کشت و کاڵ بکەین حکومەت بە شێوەیەك باج و سەرانەمان لێ دەسێنێ هیچی وامان بۆ نامێنێتەوە بەشی ژیانی خۆمان بکات و ئەگەر ئەو باج و سەرانەیەش نەدەین حکومەت بە تاوانبارمان دادەنێ و گوندەکانمان وێران دەکا و هەرچیشمان هەبێ هەمووی تاڵان دەکاو دەمان کوژێ و زیندانمان دەکا لەبەر ئەوە ناچارین

ڕوومانکردوەتـە ئـەم ناوچیایانـە هیـچ نـەبێ لـێرە لـە جـەورو سـتـەمیان تۆزێـك دووركەوتوینەتەوە. (جلیلی لەلاپەڕە ١٤٤ی سەرچاوەی پێشودا ٩٣ نمونەی بـۆ ئەمە هێناوەتەوە و وتویـەتی: ـ ساتێك بـاج سێنەرەکانی حکومـەت هەرچـەند بـاجی سـالأنەیان لـە دانیشـتوانی گونـدی (ئومریـان)ی ناوچـەی شـاخی (طـور) سەندبوو، بەڵام ئەو بـاج سـێنەره هـەموو پارەکـانی بـۆ خـۆی بردبـوو حکومـەت داوای سەندنی باجێکی تری دەکرد کە دانیشتوان نـەیانبوو بیـدەن لـە ئـەنجامی ئەوەدا کوشتارێکی زۆریان کرابوو لەلایەن ئەو هـێزی حکومەتـەی نـاوی لێـنرابوو (هێزی تەمێکردن).

بێجیر باسـی چۆنیتـی گەڕانـەوەی سوپا تێکشـکاوەکەی تورکـی کـردوە کـە لەماردیندا چاوی پێیان کـەوتبوو لـەناو شـاری مـاردیندا چـۆن هێزەکـانی تـورك دانیشـتوانی ئەوشـارەیان بـە خۆیـان و مەڕوماڵاتیانـەوە پێـش خۆیـان دابـوون و کەللەسەری کوردەکانیشیان بەدەستەوە گرتبوو بۆ ترسـاندنی دانیشـتوانی تـری ناوچەکە.

دەربارەی جەورو ستەمی ئەو ڕۆژانـەی تـورك (مۆڵتکـە) ـ (کـە کرێگرتەیـەکی پروسیـ ئەڵمانی بوە لەناو سوپای عوسمانیداو لە تێکدانـی ئـەمارەتی بۆتانـدلــ لەباسی ئەمارەتەکانا ـ باسی کراوە)، زۆر باش لـە هەڵوێسـت و ڕەفتـاری تـورك دواوە کـە چـۆن ئـەو کوردانـەی دەگـیران بەدەسـتی بەسـتە لەگوندەکانیانــەوە بـەکێش دەکـران بـۆ بنکـەی سـوپاکان و (نـاوی ناوەـــ ڕاوکردنـی مـرۆڤ) کــار گەیشتبوە ڕادەیەك لـە زۆر گونـدا نێرینـەی تیـادا نـەمابوو بـۆ ئـەوەی کاروبـاری ڕۆژانەی خێزانەکان ببرێت بەڕێوە.

هەروەکو چۆن (بێجیر) باسی دانیشتوانی ماردینی کردبوو، (مۆڵتکە)ش باسی دانیشتوانی شاری (سێرت) ی کردوە چۆن بەچاوی خۆی لەناو شارەکەدا لەژن و منداڵ بەولاوە کەسی تری نەهاتوەتە بەر چاوو ئەوانەش کە دەکـران بـە سـەرباز زۆریان لەوانەبوون دەرەبەگ و سەرۆك عەشـیرەتەکانی کـورد بـۆ ئـەوەی سـوود لەبابی عالی وەربگرن ئەوانەیان کۆدەکردەوەو دەیان ناردن بۆ ناو سـوپای تـورك بەرامبەر بەو ڕەفتارانەی تورك، کوردەکان پێویستیان بە شوێنی لەوەڕگا هەبوە

بۆ مەڕو ماڵاتیان و لەجیاتی ئەوەی لەلایەن تورکەوە بکرێن بە سەرباز بەخۆیو مەڕو ماڵاتیانەوە خۆیان دەگەیاندە لەوەڕگاکانی ناو خاکی ڕوسیا.

تورکەکان بەرلەوەی بکەونە شەڕەوە لەگەڵ روسەکانا، بۆ ئەوەی پاشکۆی هێزەکانی خۆیان بپارێزن، بڕیارياندا بەگژ کوردەکانی درسیمدا نەچن و بەرلەوەش سامی پاشای سەرکردەی هێزی تورك بەدرێژی ساڵانی سییەکانی سەدەی نۆزدەهەم نەیتوانیبوو بەسەر درسیمیەکانا زاڵ بێ، بەڵام ئەم جارە سامی پاشا بڕیاریدا بەوپەڕی توندوتیژیەوە ڕەفتاریان لەگەڵا بکا.

ساتێك (حسین بەگییەکەم)ی سەرکردەی کوردەکانی (کوزیجان) مرد کە یەکێك بوو لە دەسەڵاتدارە ناسراوەکان و لەجیاتی ئەو (علی بەگ)ی کوڕی چوە جێگەی، لەبەر ئەوەی لاوێکی نەشارەزاو نەکارە بوو نەیتوانی بەرامبەر هەڕەشەو دەسدرێژیکردنی تورك خۆی بگرێ کە هێزێکی زۆری کرابوە سەر، بۆیە ناچاربوو لە پێدەشتەکانەوە ڕوویکردە چیاکان و تورکەکان پێدەشتەکەیان کاولکردو کۆشکەکەی عەلی بەگ و گۆڕستانی خێزانەکەشیان هەڵتەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکەی تورك بە سەرکردایەتی سامی پاشا نەیتوانی بەسەر ناوچەی درسیمدا سەربکەوێ بۆیە هێزەکەی کێشایەوەو چەند جەندرمەیەکی تیادا هێشتەوە و هەر کە هێزەکەی سامی پاشا دوورکەوتەوە کوردەکان دەستیان گرتەوە بەسەر ناوچەکەی خۆیانا.

جلیلی لە لاپەڕە ٢٦٨ی سەرچاوە ٢١دا باسی پێوەندی کوردو روسی کردوە لەو ڕۆژانەدا و دتویەتی عەشیرەتە گەورەکانی کورد لەسەر سنوور وەکو: زیلان، حیدرانلی، سیپکی، جەمالدینلی، بیزیکی، لە سەرەتای شەڕی تورك و روسدا (٤ـ٥)هەزارێك لەو عەشایرانە لەناو سوپای تورکدا بوون بەڵام کە تورکەکان شکان ئەو کوردانە تورکەکانیان ڕاوناو هێزەکەیان تاڵانکردن و تەنها ٥ ـ ٦ هەزار سەربازێکی تورك بەسەلامەتی گەیشتە قارص و ئیتر لەوەوە تورکەکان بە هیچ جۆرێك پشتیان بەو کوردانە نەدەبەست. سەرکەوتنی روس لە (باشکادیلار) کارێکی وای کرد زوریەی عەشیرەتەکانی کورد هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر بەروسەکان بگۆڕن و دڵسۆزی خۆیان بۆ روسەکان دەربڕی ڕێگەیان پێ درا کۆچ و باری ساڵانەیان بکاتە ئەو دیو قفقاس.

(لۆریس میلیکۆف) بەناوی سەرکردایەتی ڕوسەوە سوپاسی کوردی کردبوو کە توانیبویان سنورەکانی نێوان تورکیا و ڕوسیا بە هێمنی بهێڵنەوەو لە گفت وگۆی میلیکۆف و قاسم خاندا داوا لەقاسم خان کرابوو پێویستە کوردەکانی سەریەو لە تورکەکان خۆیان ڕزگار بکەن و لەکاتی پێویستدا (٨٠٠ ــ ١٠٠٠) سواری کوردی هەڵبژاردە ئامادەبن بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ روس داو ئەرکی ئاسایشی نێوان (کولیا) و (ئەلکسندروپول) بگرێتە ئەستۆی و بەرامبەر بەوە میلیکۆفیش بەڵێنیدا بەقاسم خان کە بەدەسەلاتداری ناوچەکەی خۆیبێو ئەگەر تورکەکان پەلاماری کوردەکان بدەن روسەکان یارمەتییان ئەدەن و روتبەی کۆلۆنێل درابە قاسم خان.

شۆڕشی سێهەم

## ڕاپەڕین و شۆڕشی یزدان شێر

لەباسی شکاندنی بدرخاندا باسی ئەو خیانەتە گەورەیە کرا کە یزدان شێر لە بدرخانی مامی کردبوو تورکەکان لەسەرەتادا بۆ ماوەیەکی کاتی هەتا ئیشیان بە یزدان شێرمابوو کردیان بە میری جزیرەو بۆتان و زۆری پێ نەچوو تورکەکان لەویشیان هەڵپێچاو ئەوان نۆکەرێکی سەرومڕیان ئەویست و لاشیان وابوو یەکێك خیانەتی لە نزیکترین خزمی خۆی و لە میللەتەکەی کرد بێ جێگەی متمانە و دڵنیایی نیە بۆیە هەوڵی نەمانی ئەویشیان داو یزدان شێر تەقەلایەکی زۆریدا پێوەندی لەگەڵ روسدا بکا بەلام هیچی لەوان دەسگیر نەبوو. دەربارەی چۆنیەتی پاشگەز بوونەوەی تورکەکان بەرامبەر بە یزدان شێر، سێ سەرچاوەی گرنگ بە دوورودرێژ باسیانکردوە، هەوڵئەدەین کورتەی ئەوسێ سەرچاوەیە باس بکەین کە هەریەکەیان بە شێوەیەك باسی یزدان شێرو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەویان کردوە لەگەڵ تورکەکانا.

دوکتۆر عزیز شمزینی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٤٢ وتوویەتی پاش ئەوەی تورکەکان میرنشینێتی بۆتانیان سپارد بە یزدان شێر بەلام زۆری پێ نەچوو تورکەکان لێی کەوتنە گومانەوە.

ساتێك شەڕی تورك و ڕوس دەستی پێکرد (مەبەست شەڕی قرم)ەتورکەکان ناچاربون بەشێك لە هێزەکانیان نارده سەرسنوری ڕوسیا و یزدان شێر ئەمەی بە هەل و دەرفەت زانی و لەساڵی ١٨٥٣دا دەستی کرد بەڕاپەڕینێك دژی حکومەتی تورك و زۆری پێ نەچوو خێڵەکانی ناوچەی بۆتان و بدلیس و ناوچەیەکی تر چوونە ڕیزی بزوتنەوەکەیەوە و لەولاشەوە ئەرمەنی و ئاسوریەکان پێوەندییان پێوەکرد و لەساڵی ١٨٥٤دا پێشمەرگەی کورد ناوچەی موصلْ و بدلسیان ڕزگار کرد لە چنگی تورك و ژمارەی چەکدارەکانی کورد گەیشتبوە (٣٠ هەزار).

دکتۆر شمزینی لەلاپەرە ٥٦ی کتێبەکەیدا باسی ئەوەی کردوە کە حکومەتی تورك لەساڵی ١٨٥٤دا شاری (سیرت) یان کردبوو بە بنکەی هێزەکانیان و کوردە یزیدیەکان بە سەرکردایەتی (میر. مایزدین) هێرشیان کردە سەر سوپای تورك و دەریان پەڕاندن و ناوچەکە کەوتە ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەوەو کاربەدەستانی تورك دەرکران و تا ئەهات ژمارەی پێشمەرگە لە پەرەسەندنا بوو ژمارەیان گەیشتبوە (٦٠ـ ١٠٠هەزار چەکدار).

(ئەوەی شایانی باسە لەباسی ڕاپەڕینەکانی دوای بدرخاندا بەرلەم باسە جلیلی بەپێی کتێبەکەی سەرچاوە ٢١ باسی ڕوو بەڕوو بونەوەییەکی تری یزیدیەکانی کردوە بە پێی باسێکی (مورافیف) کە یزیدیەکان بە تەمابوون سوپای روسی بگاتە ناوچەکە).

لەگێژاوی ڕووداوەکانی دوای شەڕی قرم یزدان شێر هەوڵیدا پێوەندی لەگەڵ روسەکانا بکاو بۆ ئەومەبەستە پێنج نوێنەری خۆی ناردبوو بۆ (یریڤان) بۆ گفت و گۆ کردن لەگەڵ ڕوسەکانا بۆ ئەوەی بەرنامەیەکی دوو قۆڵی ڕێك بخەن دژی حکومەتی تورك و لە نامەیەکی یزدان شێر کە بەو نوێنەرانەدا ناردبووی بۆ ڕوسەکانی نوسیبوو بەتەمایە لەناوچەکانی (وان) و (بدلیس)ەوە بزوتنەوەکەی دەستی پێ بکا بەلام هیچ وەلامێکی لەوڕووەوە لە ڕوسەکانەوە بۆ نەهاتبووەوە و پاش ئەوە یزدان شێر خۆی یەکسەر چاوی بە (ببوتۆف)ی لێپرسراوی ستادی سوپای ڕوسیا کەوت لە قفقاس بەلام وەلامێکی ئەوتۆشی لەوەوە دەسگیر نەبوو، تەنها داوای ئەوەی لە یزدان شێر کردبوو هێزەکەی بلاوەپێبکاو واز لەجم و جۆڵەکەی بێنێت.

شمزینی له كتێبه‌كه‌یدا ئه‌ڵێ: ده‌ركه‌وت ببوتۆف نه‌ك هه‌ر نه‌یویستبوو پێوه‌ندی له‌گه‌ڵ كوردا بكا بۆ ئه‌وه‌ی پێكه‌وه له سوپای تورك بده‌ن، به‌ڵكو به‌درێژایی ئه‌و ماوه‌یه‌ی شۆڕش له كوردستانا كڵپه‌ی سه‌ندبوو (ببوتۆف) نه‌یهێشتبوو به هیچ جۆرێك ته‌وژم و فشارێكی سوپایی بخه‌نه سه‌ر هێزه‌كانی تورك و توركه‌كانیش سوودیان له‌و هه‌ڵوێسته‌ی ڕوس وه‌رگرتبوو به‌شێك له‌و هێزه‌ی خۆیان كه به‌رامبه‌ر به‌ڕوس دایان نابوو كێشایانه‌وه و ئاراسته‌یان كرد بۆ ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی كورد.

ساتێك نمرود رسام (ئه‌وه‌ی له‌باسی بدرخاندا وترا ڕۆڵێكی گرنگی هه‌بوه له هاندانی باڵیۆزخانه‌ی بریتانیا له ئه‌سته‌مبوڵ كه فشار بخاته سه‌ر بابی عالی بۆ لێدانی بدرخان دوای لێدانی ئاسوریه‌كان) به‌وه‌ی زانی كه یزدان شێر وه‌رامێكی ڕێكوپێكی له (ببوتۆف)ه‌وه ده‌سگیر نه‌بوبوو، ئاماده‌بوونی ده‌وڵه‌تی بریتانیای بۆ یزدان شێر پیشاندا كه هه‌وڵ بدرێ چاره‌سه‌ری كێشه‌كه‌ی له‌گه‌ڵ حكومه‌تی توركدا بكرێ و داوای له یزدان شێر كردبوو سه‌ر له قونسوڵخانه‌ی بریتانیا بدا له موصڵ، یزدان شێر باوه‌ڕی به قسه‌كه‌ی نمرود رسام كردو چوبوه موصڵ بۆ گفت و گۆكردن و له‌وێ یزدان شێر ده‌گیرێ و ڕه‌وانه‌ی ئه‌سته‌مبوڵی ده‌كاو هێزه‌كه‌ی یزدان شێر دوای گرتنی خۆی به‌رگه‌ی سوپای توركی نه‌گرت و شكا)).

جلیلی جلیل له‌لاپه‌ره ١٥١ی كتێبه‌كه‌یدا سه‌رچاوه ٩٣ به‌جۆرێكی تر باسی ڕاپه‌ڕینه‌كه‌ی یزدان شێرو چۆنیه‌تی شكانی كردوه‌و وتوویه‌تی:

((به‌رله‌وه‌ی شه‌ڕی قرم ده‌س پێبكا، بابی عالی له‌وه ترسابوو یزدان شێر كێشه‌یه‌كی گه‌وره بۆ حكومه‌ت دروست بكا، بۆیه یزدان شێریان له‌كارلادلو ده‌رباره‌ی هۆی ته‌شه‌نه‌كردنی بزوتنه‌وه‌كه‌ی یزدان شێرو به‌هێز بوونی جلیلی ئاماژه‌ی بۆ لاپه‌ره ٢٥٦ی كتێبه‌كه‌ی (لیخۆتین) كردوه كه له‌و ڕۆژانه‌دا جه‌وروسته‌می كاربه‌ده‌ستانی تورك گه‌یشتبوه ڕاده‌یه‌ك نه‌ك ته‌نها هه‌ر كورده‌كان به‌ڵكو هه‌موو كه‌سێك لای وابوه هه‌ر سه‌ركرده‌یه‌كی كورد ببێت به‌ده‌سه‌ڵاتدار زۆر باشتر ده‌بێ له‌ده‌سه‌ڵاتدارانی تورك و به‌پێی كتێبه‌كه‌ی لیخۆتین بێ دادی و به‌رتیل خواردن و زۆرداریی پادشاكانی تورك كارێكی وای كردبوو ئاسووریه‌كانیش هه‌ستیان به‌وه كردبوو ئه‌ركی كاربه‌ده‌ستانی كورد له سه‌رشانیان هه‌رچۆنێك بێ

ـوکتر دەبێ لە ئەرکی تورکەکان. جلیلی باسی چۆنیەتی ڕاپەڕینەکەی یەزدان شێری کردوە کە لە موصڵەوە هەتا (وان) تەشەنەی کردبوو، بێجگە لەو جەورو ستەمانەی کاربەدەستانی تورك لەگەڵ خەڵکا دەیان نواند، شکانی تورکەکانیش ـلایەن روسەوە لەخەڵکی گەیاندبوو کە حکومەتی تورك تەواو لاواز بوبو شەعبی تورکیش بەتەواوی لە رەفتاری کاربەدەستانی خۆیان بێزار بوبوون.

لەکانونی یەکەمی ١٨٥٤دا ساتێك فەیلەقی سوپای تورك گوندی (بیرکۆ)ی چۆلکرد و ڕوویکردە دۆڵی فرات و گەیشتە کەنیسەی (سورب ئوهانیس)، لەگێژاوی ئەو ڕووداوانەدا یەزدان شێر أعلانی ڕاپەڕینەکەی کرد لە ناوچەکانی بۆتان و هەکاریدلو یەکەم پەلاماردانی بۆ سەر بدلیس بوو کە (٢٠٠) سەربازی تیادابوو، بەهاوکاریی دانیشتوانی ناوچەکە شاری بدلیسی گرت و دانیشتوانی ناوچەکانی (وان) و (موکوس) بەسەرکردایەتی (تیلی بەگ)و کوڕانی بدرخان توانیبویان هێزێکی گەورە پێکەوە بنێن و کوڕانی بدرخان چوونە ریزی ڕاپەڕیوەکانەوە و جلیلی ئاماژەی بۆ هەواڵێکی پەیامنێری رۆژنامەی (کوریە دی لیون) کردوە کە لە ئەستەمبوڵدا لە ژمارە ٢٣یدا بڵاوکرابوەوە کە حکومەتی تورك لەو رۆژانەدا ترسی ئەوەی لێ نیشتبوو بزوتنەوەکەی یەزدان شێر هانی کریستیانەکانی ئەرمەنیاو ئەنادۆڵ بدا ئەوانیش دژی حکومەت ڕاپەڕن، لەبەرئەوە (فریق عظمی پاشا ـ عەزمی پاشا) بەخۆیو هێزەکانیەوە ڕوویکردە دیاربکرو موصلٌ و لەوێوە بەرەو (بۆتان) چوو، بەلام هێزەکەی ئەوەندە لاوازو شڕبوو هەر لەسەرەتاوە دیاربوو هیچی پێ نەدەکرا.

یزدان شێر لەسەرەتای ساڵی ١٨٥٥دا توانیبوی ناوچەکانی باشوری گۆلی وان داگیر بکاو ژمارەی چەکدارەکانی گەیبوە (٣٠)هەزارو کارگەیەکی چەك دروستکردنی لە موصل داگیرکردو دەستی گرت بەسەر خەزێنەی حکومەتداو کاربەدەستانی تورکیان لێ دەرکرد.

حکومەت لەساڵی ١٨٥٥دا بەسەرکردایەتی (کنعان پاشا) هێزێکی گەورەی لە ئەیالەتی بغداد کۆکردەوە و ڕوویکردە باکوور بەلام ئەو هێزە لە یەکەم ڕووبەڕووبونەوە دا لەنزیك شاری (سیرت ـ سعرت) شکاونزیکی (٢٠٠) چەکداری عەرەب چوونە پاڵ شۆڕشگێڕەکان و هەندێ یونانی و ئەرمەنیش لایەنگرێتی

خۆیان بۆ شۆڕشگێرەکان دەربڕی و لەمانگی شباطی ١٨٥٥دا ژمارە هێزەکەی یزدان شێر گەیشتە (٦٠) هەزارو هەندێ سەرچاوە وتوویانە گەیشتوە (١٠٠) هەزار (وەکو عزیز شمزینی لەکتێبەکەیدا باسی کردوەو بەرلەمە لێی دواین).

جلیلیش هەروەکو دوکتۆر عزیز شمزینی باسی ئەوەی کردوە یزدان شێر پێنج نوێنەری خۆی ناردبوو بۆ لای روسەکان و لەو نامانەدا بۆ روسەکانی ناردبوو ئاگاداری کردبون نیازی وایە شۆڕشەکەی ئاراستەی ناوچەکانی باشوور بکا، بەڵام وەکو (لیخۆتین) باسیکردوە ئەونامانە نەگەیشتبونە دەس کاربەدەستانی روس چونکە روسەکان بەرلەوە ئەو ناوچانەیان بەجێ هێشتبوو کە نوێنەرەکانی یزدان شێر بۆی چوو بوون لیخۆتین کە سەرکردەی ئەرکانی حەربی هێزەکانی بوە لە (یریڤان) وتویەتی ئەگەر روسەکان ئەو نامانەی یزدان شیریشیان پێ بگەیشتایە لەبەر سەرماوسۆڵەی زستان نەیاندەتوانی هیچ بکەن.

(لێرەدا جیاوازییەك هەیە لەم بۆچوونەی جلیلی لەگەڵ ئەوەی عزیز شمزینیدا کە دوکتۆر عزیز وتوویەتی نوێنەرەکانی ناردبوو بۆلای (ببوتۆف)و ئەویش پێی وتبون هێزەکانی بڵاوە پێ بکا، بەمەدا دەرئەکەوێ دوورنیە یزدان شێر دووتاقم نوێنەری خۆی ناردبێ بۆلای روسەکان تاقمێکیان ئەمەیان بووبێ کە (ببوتۆف) دەستی پێوە نابوون و تاقمی دوهەمیش ئەوەبووبێ کە لیخۆتین باسیکردوە).

جلیلی لە باسەکەیدا ئەڵێ: لەمانگی شباط ومارتی ١٨٥٥دا شۆڕشگێرەکان خۆیان ئامادەکردبوو بەرەو بایزیدو ئەرزرۆم هێرش بکەن و هەروەکو لیخۆتین باسیکردوە لە لاپەرە ٢٥٩ی کتێبەکەیدا راپەریوەکان لەسەر ئەوە رێك کەوتبوون دژی سوڵتان شەربکەن و کوڵنەدەن و تورکیش هێزیکی زۆری کۆکردەوە بەرامبەریان و لەلاشەوە ئینگلیزەکان بۆ تێکدانی شۆڕشەکەی یزدان شێر لەرێگەی دانی خەڵات و بەرتیلەوە چەند سەرۆك عەشیرەتێکی کوردیان رازی کرد بکەونە نێوان حکومەت و یزدان شێرەوە حکومەت بۆ ماوەیەکی کاتی توانی بارودۆخەکە هێور بکات. یزدان شێر لەمانگی نیسانی ١٨٥٥دا کەلە قەڵای (مقراعلی) بوو لە باشوری وان، لەوێوە پیاویکی خۆی کە ناوی (ئوسلو—

ئوصلو) بوو ناردی بۆ یریڤان و داوای لە روسەکان کرد بەرەو (موش) بچێت و هێزەکەی یریڤان لەوێوە ڕوبکاتە بدلیس هەروەکو لیخۆتین باسی کردوە.

بەڵام جلیلی لە کتێبەکەی تریا سەرچاوە ٢١ هەڵوێستەکەی بە شێوەی خوارەوە باسکردوە:

((فەرماندەی هێزی تورك بۆ ئەوەی بدلیس لە ڕاپەڕیوەکان بپارێزێ بەشێك لە هێزەکانی بایزیدی لە ڕێگەی (سورپ ــ ئوگانیش)ەوە بەرەو بدلیس خستەڕێ لە ئەرزڕۆم و (لاشکێرت) و (کیوپریوك)ەوە هێزی تریان ناردو لەسەرەتادا بەسەر کوردەکانا سەرنەکەوتن تا لە مانگی مارتدا (مامیت پاشا)ی فەرماندەی هێزەکانی تورك لەلای گوندی (دیریات)ی نزیك بە شاری جزیرە توانیبوی ڕاپەڕیوەکان ناچار بکا بکشێنە دواوە.

کونسڵی بریتانیا لە موصڵ ئەویارو دۆخە ئاڵۆزەی بە هەل زانی و کەوتە جموجۆڵ و توانی بە بەرات و خەڵات چەند سەرۆکێکی کورد ئاشت بکاتەوە (جلیلی بەرلەمە لە سەرچاوە ٩٢دا وتبووی قونسوڵی بریتانیا توانیبوی هەندێ لە سەرۆك عەشیرەتەکان واڵێ بکا بکەونە بەینەوە بۆ ئەوەی کێشەی حکومەت و یزدان شێر چارەسەر بکەن).

جلیلی لە سەرچاوە ٢١دا ئەڵێ:

((لە ئەنجامی ئەو ڕووداوانەدا یزدان شێر ناچار بوو گروگڤی بزوتنەوەکەی خاویکاتەوەو واز لە شۆڕش بێنێت و بۆماوەیەك لە قەڵا سەختەکەی (گاسرا ــ گێل) لەخوارووی وان دانیشت. لەسەرەتای مانگی نیسانی ١٨٥٥دا جارێکی تر یزدان شێر (ئوسلوـ ئوصلو) ی ناردەوە بۆلای فەرماندەی هێزەکانی (یریڤان) بۆئەوەی بەرەو موش وبدلیس بجوولێت، بەڵام یزدان شێر نائومێدبوو لە روسەکان و هیوای سەرکەوتنیشی نەمابوو، قونسوڵی بریتانیا لە موصڵ زۆری لێکرد لەگەڵ حکومەتدا بکەویتە گفت گۆکردن و ئەویش باوەڕی بەشەرەفی قونسوڵی بریتانیا کردو قەڵای (گاسرلـ گیل)ی بەجێهێشت بۆ ئەوەی لەگەڵ نوێنەری تورکدا گفت و گۆ بکا بەڵام درۆو دەسبڕین کاری خوی کردودەم و دەس گیراو نێررا بۆ ئەستەمبوڵ و ئاسوریەکانیش کە سەرکردەکەیان (ئەقرام)بوو لەگەڵ قونسوڵی بریتانیادا کەوتە گفت و گۆ کردن بۆئەوەی لەگەڵ حکومەتی

توركيا ئاشتی بکاتەوە. بطريارك ئەفرام لەو نامەیەدا بۆ (مورافيف)ی ناربوو لە مانگی ئەیلولی ١٨٥٥دا کە متصرفی روسەکان بوە لە قفقاس، بۆی نووسیوو قونسولی بریتانیا بێ پشوو هانم ئەدا لەگەڵ حکومەتی تورکدا رێك بکەوم و ئاشت ببمەوە بەڵام من پێشنیازەکانم بەدڵ نیەو پێیان رازی نیم.

بەو جۆرە بزوتنەوەکەی یەزدان شێر خامۆش کراو کورد نەیتوانی سوود لەوراپەرینەش وەربگرێ.دەربارەی پێوەندی کردنی یزدان شێر بەروسەکانەوەو رۆڵی قونسوڵی موصڵ، مینۆرسکی لەلاپەرە ٥٦ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤٢ لاپەرە ٥٦ باسەکەی بەجۆرێك تۆمار کردوە لە کتێبەکەیدا کە هەندێ جیاوازیی هەیە لەگەڵ ئەوەی دوکتۆر شمزینی و دوکتۆر جلیلی جلیلیدا بۆیە بە پێویستم زانی ئەوەی مینۆرسکیش کورتەیەکی باس بکەم کە وتوویەتی:

((یەزدان شێر دووپیاوی خۆی ناردبوو بۆلای روسەکان بوئەوەی هێزی هەردوولا پێکەوە دژی تورك شەربکەن، بەڵام هیچ بەڵێنێکی لەروسەکانەوە پێ نەگەیشت و یەزدان شێر بەرامبەر بە بەڵێنێکی درۆی (نمرود رسام) کە جاسوسێکی ئینگلیز بوو لە موصڵ خۆی دابەدەستەوەو گیرا. ئەونمرود رسامە خەڵکی ناوچەکە بووە (ئاسوری بوە)و بەپێی کتیبەکەی (تورایێف ــ بەندی یەکەم، لاپەرە ٣٧چاپی ساڵی١٩١٣ بەزمانی روسی) گەلێك شوێنەواری ئەرکیۆلۆجیی ئاشوریەکانی دۆزیوەتەوە.

حکومەتی تورك دوای نەهێشتنی راپەرینەکەی یەزدان شێر مدالیای تایبەتی بەشیوەتەوە بەسەر ئەو ئەفسەرو سەربازانەی لە کوژانەوەی شۆرشەکەی یەزدان شێردا بەشداربون. لەگەڵ ئەوەشدا شۆرشەکەی یەزدان شێر رووخێنرا، بەڵام لەدواییدا یزدان شێر بوو بە پاڵەوانێکی نەتەوایەتی وەکومەڵێك شیعری میللی کوردیان بۆ وتوەکە (سوتسین) گەلێك لەو شیعرانەی کرابوون بەگۆرانی دەربارەی یەزدان شێر تۆماری کردوە دوکتۆر مارف خەزنەدار لە پەراوێزی لاپەرە ٥٦ی وەرگێرانەکەی کتێبی مینۆرسکیدا وتوویەتی:

(("سوتسین" لەگەڵ (پریم)دا کۆمەڵێك گۆرانیی فۆلکلۆری کوردییان کۆکردۆتەوە لەگەڵ وەرگێراوە فرەنسیەکەیدا (وادیارە ئەو گۆرانیانە لە پێشدا

ـ.ون بەفرەنسی و لە فرەنسیەوە کـراون بـە روسـی) و ئـەو گۆرانیانـە لـە چوار
ـەرگدا لە ساڵی ١٨٨٧ و ١٨٩٠دا لە پترسبرگ چاپ کراون)).

ئـەوەی سـەرنج راکێشـەرە لـە کتێبەکـەی مینۆرسکیدا ئەوەیـە مینۆرسـکی ـمرود رسام)ی بەجاسوسێکی ئینگلیز ناوبردوە نەك وەکو قونسوڵی بریتانیا لـە موصلْ کە بێگومان ئەمەی مینۆرسکی زۆرتر رێی تێ دەچێ چونکە بڕوا ناکـەم حکومەتێکی دەسەڵاتداری وەکو ئەوڕۆژانەی ئینگلـیز یـەکێکی لـەخۆیان دەست ـەکەوتبێت بیکا بە قونسولْ، بەڵام دوورنیە وەکو کرێ گرتەیەك لە قونسوڵخانەی ـریتانیادا بەکرێ گیراوە وەکو یەکێکی شارەزا بە ناوچەکە.

سـەرنجێکی تـر دەربـارەی شۆڕشـەکەی یـزدان شـێر ئەوەیـە بـە پێـی سـەرچاوەکان لەدەوروبـەری سـاڵی ١٨٥٤ دا دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام سەرچاوەیەکی وام دەست نەکەوت باسی مێژووی کۆتایی هێنانی ئـەو شۆڕشـەی تیادا کرابێ جگە لەوەی ئەمین زەکی لەلاپەڕە ٤١ی بەرگی یەکـەمی کتێبەکـەیدا سەرچاوە ٣٢ وتوویەتی: ئەو شۆڕشـە لەسـاڵی ١٢٨١ ی کۆچی بەرامبـەر سـاڵی ١٨٦٤ ی زاین کۆتایی پێ هێنراوە، کەبە پێی ئەمە دەبێ شۆڕشەکەی یزدان شێر ماوەی دەساڵ درێژەی کێشابێ کەئەو ماوەیە جێگەی گومانە.

## هەڵسەنگاندنی ڕاپەڕین و شۆڕشەکەی یزدان شێر

لە مێژووی نەتەوەی کوردا وەکو مێژووی هـەندێ میللـەتانی تـر، زۆرجـار لـە کاتێکی زۆر ناسك و گرنگدا، سەرکردەیەك یا تاقمێك لەڕقی یەکێکی تر لە ڕێبازی میللەتەکـەی خۆیـان لایـانداوە و بـوون بەلایـەنگرو هاوکـاری دوژمنـی وڵات و میللەتەکەی خۆیان لەگەڵ ئـەوەدا سـوور زانیویانـە ئـەو دوژمنـەی دەچنـە پـاڵی ئەگەر بۆی هەڵکەوت بەخوشیانەوە ئەدا چونکە دوژمنەکەیان سوور ئەزانێ ئەوی بـەقاو وەفـای بۆمیللەتەکـەی خـۆی نـەبێ شـتێکی زور سـتەمە لەگـەڵ ئەویشـدا هەتاسەر بەدۆستایەتی بیباتەسەر .

یـزدان شـێر یـەکێك بـووە لەوانـەی لـە ناسـکترین قۆنـاغی میللەتەکـەیدا لەنزیکترین خزمی خۆی کە بدرخانی مـامی بـوە هەڵگەڕاوەتـەوەو چۆتـەپاڵ ئـەو

دوژمنەی بە خوێنی سەری میللەتەکەی تینوو بوەو لای وابوە تورك هەتا سەر بە دۆستایەتی لەگەڵیا دەمێنێتەوە و لەدوای مامی ئەمارەتی جزیرەو بۆتانی بۆ تەخت دەبێ، بەڵام کاتێك بەخۆی زانی تورکەکان کەوتبوونە سەر ئەو خەیاڵەی بەزووترین کات لەناوی بەرن و لەجیاتی ئەو کاربەدەستێکی تورك بکەن بە لێپرسراوی ناوچەکەو، کاتێکیش هەوڵی دا بۆ پەیداکرنی دۆستێکی وا لەتورکەکان بیپارێزێ جارەها تەقەلای لەگەڵ روسەکاندا دۆستایەتی پەیدا بکا بەئومێدی ئەوەی لەرێگەی ئەو دۆستایەتیەوە فشاری تورکەکان کەم دەبێتەوە و وازی لێ دێنن و هیچ بیری لەوە نەکردبوەوە روسەکان لەو رۆژانەدا بەرژەوەندیی کریستیانەکانیان زۆرتر لامەبەست بوە لە بەهێزبوونی کورد بۆیە هەموو داخوازییەکانی پشت گوێ خراو ئینگلیزەکان ئاگاداری ئەوە بوون یزدان شێر لە تەقەلاکانیدا لەگەڵ روسەکان سەرکەوتوو نەبوو بۆیە بەفرێوفێڵ هەڵیان خەڵەتاندو بەگورگان خواردیان داو خستیانە داوی تورکەکانەوەو بەدەستی خۆی جەزای ئەو تاوانە گەورەیەی کردبووی خۆی تووش کردو راپەرینەکەی بەزووترین کات و بەئاسانی خامۆش کرایەوە.

لەو روەوە صادق شرفکندی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٧١ لە باسی هەڵسەنگاندنی یزدان شێردا ووتوویەتی هەرچەند یزدان شێر مرۆڤێکی ئازاو بەجەرگ بوە، بەڵام لە سیاسەتدا کۆڵ و نەشارەزا بوەو یەکێکی وەکو (نمرود رسام) لە قونسوڵخانەی بریتانیا لە موصل بەئاسانی لەخشتەی بردوەو دەستەمۆی کردوەو داویەتیە دەس تورکەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا وەکو هەندێ لە سەرچاوەکان باسیان کردوە، یزدان شێر مرۆڤێکی ئازاو بەجەرگ بوەو دەربارەی ئەو ئازایەتییەی گەلێك شعرو گۆرانیی فۆلکلۆری بەقەدو باڵایا ووترابوو، بەڵام لام وایە ئازایەتیەکی رووتی کورت بینانەو ئەو جۆرە سەرچڵیەی ئەو بە رێبازیا رۆیشتبوو بەس نەبوو بۆ ئەوەی یەکێکی وەکو ئەو بگەیەنێت بە مەبەست.

لە هەڵسەنگاندنی راپەرینەکەی یزدان شێردا بەپێی ئەو سەرچاوانەی بەدوورو درێژ باسیانکردوە دوو سەرنجی گرنگ دێنە پێشەوە:

یەکەمیان: لەباسەکەیدا ووتــراوە ســاتێك یــزدان شــێر دەســتی کــرد بــە ڕاپەڕینەکەی، کوڕانی بدرخان بوون بەهاوکاری لەڕاپەڕینەکەدا بەشـداربوون.....
تۆ بڵێی ئەوانە ئەو تاوانە گەورەیەی یزدان شێری ئامۆزایان بەرامبەر بە بدرخانی باوکیان کردبووی هەروا زوو بەئاسانی لەبیریان چووبێتەوە؟ یا دوور نەبوە زوڵم وزۆری کاربەدەستانی تـورك بەرامبـەریان گەیشتبوە ڕادەیـەك ئـەوەی باوکیـان لەبیرچوبوەوەو لایـان وابـاش بووبـێ هـەرچۆنێك بـێ بــبن بــەهاوکاری خزمــە تاوانبارەکـەی خۆیـان نـەك لــەوە زیــاتر جــەورو ســتەم و دڕندەیــەتی تورکــە خوێنمژەکان قبوول بکەن، کە ئەگەر هەستیان بەوجۆرە بووبێ ئەوەیەکــەم جار بووە کـورد لـە کـورد خـۆش ببـێ لـەپێناوی سـوودی وڵات و میللەتەکــەیدا کــە بەداخەوە هەتا ئیستەش کورد نەگەیشـتوەتە ئـەو ڕادەیـەی هەسـت بـەو ئەرکـە پیرۆزە بکرێ.
سەرنجی دووەم، شۆڕشــەکەی بدرخــان کــە ئەنجامەکــەی بــەوە گەیشــت بەهاندانی ئینگلیزەکان حکومەتی تورك پەلاماری بدرخان بداو ئەمارەتەکەی تێك بدا، هەموو بیانووەکـەی ئینگلیز لەوهاندانـەیدا ئـەوەبوو بدرخـان کوشـتاری لـە ئەرمەنیەکان کردبوو زیانی پێگەیاندبوون و کاربەدەسـتانی ئینگلـیز خسـتبویانە مێشکی مارشمعونـەوە دەســەڵاتدارێتی حکومــەتی تــورك بــۆ ئــەوان باشــترو بەسوودترە وەك لەبەهێز بوونی کورد، ئیتر ئاخۆ چی وای لەو ئاسووریانە کردبێ گوایە لە ڕاپەڕینەکەی یزدان شێردا بووبن بە لایـەنگری بـەوجۆرە، ئەوڕاپەڕینــەی یزدان شێریش چوە ڕیزی ڕاپەڕیوە بێ سەروبەرەکانی تری کوردو ئـەو دەرسـەی لـە هەڵوێسـتی یـزدان شـێردا دەبـێ سـوودی لێ وەرگیرێ ئەوەیـە وەکـو پـەندی پێشینان ووتەنی:

هەزار ساڵ بکەی بێگانە پەرستی ئاخری هەر دەبێ بێنی نوشوستی

**شۆڕشی چوارەم**

## شۆڕش و ڕا پەڕینەکانی دوای یزدان شێر هەتا شۆڕشی شێخ عبیداللهی نهری

لە دوای خامۆش کردنی ڕاپەڕینەکە ی یزدان شێر، ئیتر وەنەبێ باکوری کوردستان ئاسایشی بەخۆیەوە دیبێ، چونکە رەفتاری کاربەدەستانی تورک و جەورو ستەمیان لە کوردستانا بەڕادەیەك نەبوە دانیشتوان خۆیان پێ بگیرێ و بیدەنگ دانیشت، بەڵکو تا شۆڕشی شێخ عبدالله نەهری دوو ڕاپەڕین دژی حکومەتی عوسمانی کراوە کە بریتی بوون لە:

**١- ڕا پەڕین و جم و جۆڵی کوڕانی بدرخان**

**٢- ڕا پەڕینی ناوچەی درسیم.**

ڕاپەڕینی یەکەم: هەردوو کوڕەکە ی بدرخان پاشا کە عوسمان و حسێن بوون دژی حکومەت کە وتنە خۆیان و چوونە ناوچەی جزیرە و دژی حکومەتی تورك کە وتنەکار.

دەربارەی ئەو ڕاپەڕینە ئەمین زەکی و بلە چ شێرکوە و دوکتۆر جلیلی جلیل هەریەکە یان بەشێوەیەك باسیان کردوەو هەوڵئەدەین کورتەیەکی ئەو سێ سەرچاوەیە بخەنە پێش چاو . ئەمین زەکی لە لاپەڕە ٢٣٩ ی بەرگی یەکە می کتێبەکەیدا سەرچاوە ٣٢ باسی (عوسمان پاشا) و (کنعان پاشا) ی کوڕانی بدرخانی کردوە کە چۆن پاش ئەوەی لە ساڵی ١٨٧٧ دا شەڕێك لە نێوان روس و تورکدا روویدا حکومەتی عوسمانی هێزێکی زۆری لە مجاهدین کۆکردبووەوە ناردبوونی بۆ کۆڕی شەر بەسەرکردایەتی ئەو دوو کورەی بدرخان پاشاو ئەو دوانە بەنهێنی لە گەڵ هەندێ لەو ئەفسەرە کوردانە و سەرۆك عەشیرەتانەی کۆکرابوونەوە بۆ ئەو شەرە لە گەڵیانا ڕێك کە وتن بەخۆیان و چەکدارو هێزەکانیانەوە ڕوویکە نە کوردستان بۆ سەرگرتنی ئەو مەبەستەی بدرخان پاشا بۆ ی تێکۆشابوو، ئەو دوو ئەمیرەو ئەوانەی بوون بە لایەنگریان لە ساڵی ١٢٩٧ ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨٧٩ی زاین چوونە جزیرەو لەوێ اعلانی سەربەخۆیی ئەمارەتەکە یان کرد.

حکومەتی عوسمانی چەند جارێك هێزی ناردە سەریان بەڵام لە هیچ هێرشێکدا بەسەر کوردەکانا سەرنەکە وت و کوڕانی بدرخان دەسەڵاتیان پەرەی

ـحنو گەیشتنە ناوچەکانی جۆلە مێرگ و زاخۆو عمادیە و ماردین و مدیات و حیین و بڕیاردرا عوسمان پاشای براگەورەیان ببێت بە ئەمیری ئەمارەتەکە و ە مزگەوتدا خوطبەی جومعە بەناوی ئەوەوە دەخوێنرایەوە.

شکانی یەك لە دوای یەکی هێزەکانی حکومەت سوڵتان عبدالحمیدی ناچارکرد سیاسەتی حکومەتەکە ی بەرامبەر بەکورد بگۆڕێ و بۆ ئەوە بڕیاریدا هەموو گیراوەکانی بنەماڵە ی بدرخان بەربدرێن و ئازاد بکرێن و سوڵتان نوێنەرێکی خۆی ناردەلای عوسمان پاشا بۆ رێکە وتن و ئاشتی و بۆ گفت و گۆکردن ەربارەی بەجێهنانی داخوازیەکانی کورد بەبێ شەڕ و خوێن ڕشتن و بەمە سوڵتان توانی هەردوو براکە هەڵخەلە تێنێ و خزمەکانیان کە لە ئەستەمبوڵدا بوون ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە رازیکردنی ئەو جووتە برایە بۆ ئەوەی لە گەڵ حکومەتدا رێك بکە ون وتورکە کان لە سەرەتادا زۆر بەنەرمی لە گەڵیانا دەجولانەوە و خۆیان واپیشان دەدا حکومەت ئامادەیە دەسەلاتی بەڕێوەبردنی کاروباری ئەمارەتەکە بداتە دەس خۆیان بەلام ئەم هەڵوێستەی حکومەت بۆ خاوکردنەوەو خەلە تاندن و دەس برین بوو هەر کە تورکە کان هەلیان بۆ هەڵ کە وت هەردوکیان گرتن و بەدەستی بەستراو نێردران بۆ ئەستەمبوڵ و خرانە زیندانەوە، پاش ماوەیەك هەردوکیان بەردران بەمەرجێك لە ناو ئەستەمبوڵدا بەدەسبەسەری بمێنێتەوە و لە ئەستەمبوڵ دوورنەکە ونەوە.

دوکتۆر جلیلی جلیل لە لاپەرە ٥٧ ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ دەربارەی هۆی بەردانی ئەو دوو کوڕەی بدرخان وتوویەتی: هەرچەند بەپێی رەوشت و رەفتاری تورکە کان دەبوایە ئەو دوو برایە هەڵواسرانایە، بەلام حکومەت لەوە ترسا بە کوشتنی ئەوان و لە سێدارەدانیان ببێتە هۆی نارەزایی و ڕاپەرینێکی تر دژی حکومەت بۆ یە هەڵنەواسران.

دوکتۆر جلیلی جلیل لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ١٨ باسی ئەوەی کردوە لە پایزی ساڵی ١٨٧٨دا ئاشووب ناوچەکانی مووش و وان و تبلیسی گرتبوەوە، خێلە کانی (موتکانلی) و (راشکۆتانلی) و (سالیکی) چالاکانە بەشداریان کردبوو لەو ڕاپەرینەداو هەروەکو (ئەفریانوف) باسی کردوە ئەو ڕاپەرینە بە

سەرکردایەتی عوسمان بەگ و حسن بەگی جووتە کوڕی بدرخان دەستی پێکردبوو کە هەردوکیان ئەفسەریوون لە ناوسوپای عوسمانیدا.

(جلیلی لە م باسەیدا وتوویەتی ئەو دوو برایە ئەفسەر بوون لە ناو سوپای عوسمانیدا، لام وایە ئەوانە وەکو ئەو خەڵکە ی کۆکرابوونەوەو نێررابوون بۆ غەزا دژی روس بەشداریان کردبوو وەکو دو ئەفسەری ناو سوپا کە هیچ سەرچاوەیەکی تر وەکو جلیلی نەیان وتوە ئەفسەر بوون وبڕواش ناکە م لە بدرخانیەکان دوای ئەو شۆڕشەی بدرخان پاشاو یزدان شێر کە کوڕانی بدرخان لە مەشدا هاوکاری یزدان شێر بون، ئیتر عوسمانی چۆن ئەفسەری لە ناو ئەو بنەماڵە یەدا هێشتۆتەوە تا بەناوی ئەفسەری ناو سوپاوە شەڕ بۆ عوسمانی بکەن؟

جلیلی لە باسی ڕاپەڕینەکە دا وتوویەتی (بۆ تان) لە لایەن ئەودوو برایەوە کرا بە بنکە ی ڕاپەڕینەکە و لە هەرچوارلای وڵاتەوە چەکدار ڕوویکردە ئەو بنکە یەو هێزی کورد کرا بە دوویەشەوە و بەپێی نەخشە بڕیار وابوە عوسمان بەگ جزیرە داگیر بکاو ساتێك شۆڕشگێڕەکان ڕوویان کردە جزیرە هێزەکە ی تورك و مووچەخۆرەکانی حکومەت شاریان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە (سێرت — سعرت) و جزیرە داگیر کراو دەستیان گرت بەسەر چەك و جبەخانەو ئازووقەی عەمارەکانی حکومەتداو اعلانی سەربەخۆیی کراو عوسمان بەگ نازناوی (میر)ی لە خۆی ناو لە خوطبەی جومعەدا ناوی لە گەڵ ناوی سوڵتانەکاندا دەهات.

بەرامبەر بەوە حکومەت هێزێکی زۆری کۆکردەوەو(١٧) بەتالیۆنی ناردە سەر شۆڕشگێڕەکان و والی بغدادیش بەخوی و(٣) بەتالیۆنەوە لە (سێرت)ەوە ڕوویکردە شارۆچکە ی (دیخ) و داگیری کرد و بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە لە گەڵ دانیشتوانیا رەفتاری کرد.

هێزێکی کورد بەسەرکردایەتی (حسێن بەگ) پەلاماری ئەوسێ بەتالیۆنەی داو بەسەریا سەرکە وت و ناچاری کرد خۆی بدا بەدەستەوە.

جلیلی ئاماژەی بۆ لاپەڕە ٢٢٥ ی کتێبەکە ی (ئەڤریانۆف)کردوە کە وتوویەتی کوردەکانی ناوچەی هەکاریش کە وتنە خۆیان و ئامادەبون بۆ ئەوەی بچینە پاڵ شۆڕشگێڕەکان.

بەرامبەر بەوە تورکە کان لە (بـایبورت)ەوەو لـە (ئـەرزنجان)ـەوە ڕژانـە نـاو شـاری (مـوش) بـۆ ئـەوەی ڕێگـە لـەوە بگـرن ڕاپـەڕیوەکانی جزیـرە و درسـیم ـەستیان بگاتە یەکتر و پێکە وە هاوکاری بکە ن.

تورکـە کـان دەسـەلاتێکی زۆریـان دا بـە (عـزت پاشـا) بـۆ لێدانـی کـوردە ڕاپـەڕیوەکان و لـە (شـێرنها) کـورد تووشـی یەکـە م نەهامـەتی بـون و عوسمـان پاشای بدرخان ناچارکرا بکشێتە دواوە بۆ جزیرەو هێزەکە ی حسێن بەگی بـرای ڕوو بەڕووی ئەو هێزەی تورك بوەوە کە لـە بدلیسـەوە هـاتبوون بـەلام ئـەویش خـۆی پێنـەگیراو کشایەوە بۆ جزیـرەو لـەوێش گـەمارۆ دران و ڕاپـەڕیوەکان بەناچاری ڕوویانکردە چیا سەختەکان و بەوجۆرە ئەم شۆڕشەش لە ناوبرا، بەلام وەکو خۆئامادەکردنێك وابوو بۆ ڕێخۆشکردن بۆ شۆڕشی شێخ عبداللە ی نهری.

ڕاپەڕینی دوهەم: ڕاپەڕینی درسیم

بێگومان ئەوشۆڕشەی درسیم کە بەر لە شۆڕشەکە ی شێخ عبداللـە ی نـهری کرابوو جیاوازە لەوشۆڕشە گەورەیەی تری درسیم کە لە سالانی ١٩٣٧ــ١٩٣٨دا بە سەرۆکایەتی (سەید ڕەزا) دەستی پێکردبوو کە لە بەرگی دوهەمدا بەدووروودرێژ باسی دەکە ین.

ئەم شۆڕشەی لە گەلێ سـەرچاوەدا باسـکراوەو ئێمـەش لـێرەدا کورتـەی دوو سەرچاوەی گرنگ دەخەینە پێش چاو:

**یەکەمیان:** سەرچاوەی ژمارە ٥٣– جنشهای کـورد أز بـیرون تـا أکنـون، کـە نووسەرەکە ی (م. کاروخ)ە و لە لاپەڕە ٢٧ی ئەو کتێبەدا باسی ئەو ڕاپەڕینـەی درسیمی کردوە چـۆن کوردەکـان بەرامبـەر بـەو جـەورو سـتەمەی(رشیدپاشـا)ی سەرکردەی هێزەکانی عوسمانی دەربارەی کورد دەیکردو (١٥) هەزار چـەکداری دڕو شەڕکە ری لە ناو هێزەکانی سوپای تورکدا هەلبژارد بۆ تێکدانی دانیشتوانی کورد لە درسیم بەوپەڕی دلڕەقیەوە.

علی بەگی کوڕی حسێن بەگ توانی ئەو هێرشەی تورك بوەستێنێو ناچـاری بکا بکشێتەوە دواوە، بەلام تورك بەو کشانەوەیە کۆلی نـەدا و بـۆ داگـیر کردنـی درسیم دەستیکرد بـە فروفێلو تەلـە کـە بـازی و لـە نامەیـەکی قونسـولخانەی

ئەرزرۆم باسی ئەوەی تیادا کراوە چۆن (سامی ـ سامیح پاشا) هەوڵێکی زۆری دابوو کوردەکان لە ناو خۆیانا تێك بداو هەندێکیان بکا بە لایەنگری خۆی .

سەختی ناوچەکە و نەبوونی رێگاوبانی باش بۆ هاتوچۆکردنی سوپاو هێزەکانی حکومەت بۆ ناوچەی درسیم رێگەی لەوە گرتبوو حکومەت بتوانێ بەئارەزووی خۆی پەلاماری درسیم بدا لە بەرئەوە دەستی کرد بەکردنەوەی جادە لە دیاربکرەوە بۆ ئەرزنجان کە بەناوچەکانی (بولیومیدر) خوزات، ماز گیرت، پالو) دا دەڕۆیشت و خەڵکی ئەوناوچەیەی بەکرێگرت بۆ ئیشکردن لەو رێگاو بانەداو سامی پاشا ئەوەی کردبوو بە بیانوو دانیشتوانی درسیم باجیان نەدابوو بەحکومەت دەستی کرد بەبرینی باجی ساڵانە لە کرێی ئەوکرێکارانەو تەنها هەر نان و خواردنی دەدانێ کە ئەمە بووبە هۆی ئەوەی ئیشەکە بەباشی نەروات لە گەڵ ئەوەشدا (گولیابیبەگ)ی قائمقامی درسیم بۆ ترساندنی کرێکارەکانی چەندکە سێکی لێ دارکاری دەکردن لەوانەی کە خۆیان لە ئیشکردن دوور بخستایەتەوە.

نووسەری سەرچاوە٥٣ لە لاپەڕە ٢٩دا باسی ئەوەی کردوە چۆن هەندێ لە سەرکردەکانی کورد بەنهێنی پیوەندیان بەروسەکانەوە کردبوو، قائمقامی (حوزات) ئاگاداری ئەوەبوە منصور ئاغا لە ناوچەی (ئەلکسندر پول) خۆی لە روسەکان نزیك کردبوەوە و داوای لێکردبون هێزەکانیان بنێرن بۆ درسیم و تاقمی (علی اللاهی ـ زۆریەی سەرچاوەکانی تر بەعلوی ناوی بردوون) دەستیانکردبوو بە پاڕسانەوە لە خوا کە کورد بە یارمەتی روس لە تورکەکان رزگاری بێ (لە باسی ئاینی کوردا مینۆرسکی وتوویەتی قزڵباشەکان علوی لایان وابوە علی شێرە گەورەکە ی خۆی دابوو بە روس بۆ ئەوەی کوردەکان رزگار بکا لە دەس تورك).

عوسمانیەکان لە کاتی شەڕی ١٨٧٧–١٨٧٨دا لە گەڵ روسەکان تەقەلایەکی زۆریان دابوو هەستی ئاینیی کورد ببزوێنن دژی روسەکان، بەڵام کوردەکان ئەو داخوازییەی روسیان پشت گوێ خست و بە پێچەوانەوە خۆیان ئامادەکرد بۆ راپەڕینێکی چەکدارانە، هەروەکو(پ. ی. ئوریانۆف ـ لە کتێبەکەیدا کە

ـ‌رجمه کراوه بۆ فارسی بەناوی(کردها درجنگ روس باایران وتورکیه درجریال ـرنی نوزدەهەم) لە روسیەوە وتویەتی:

بەپێی تلگرافێکی سامیح پاشا لە مانگی ئۆکتۆبەری ۱۸۷٦دا وتویەتی کـرده‌کانی موش و بدلیس و وان نە باج و نە سەربازیان ئەدا بە حکومەت و، جلوت) ی سەرکونسوڵی ئینگلیز لە (ترابزون) لە راپۆرتێکیا نوسیبوی عەشایرەکانی ناوچەی درسیم کە (۳) هەزار چەکداریان هەیە دەستیانکردوه بە جموجۆل لە ناوچەکانی (توجیك ــ خوت) و هەندیکیش لە سوپای عوسمانی ـرایانکردبوو چووبونە پاڵیان و ئەرمەنیەکانیش یارمەتی کوردیان داو تورکەکانیان ناچارکرد ئەو ناوچانە بەجێ بێڵن و بەپێی قسەی شەرکەرێکی (توجیك) تورکەکان لە ئەنجامی ئەوەدا دەستیانکرد بە تۆپ بارانی دلنیشتوان و خانوەکانیان کاول کردو خەڵکە کە ناچاربوون دایانە چیای (توجیك) بۆ شەری پارتیزانی.

نوسەری سەرچاوە ٥٣ ئاماژەی بۆ باسێکی (بیلو تی) کردوە کە لە راپۆرتێکیا لە ئۆکتۆبەری ۱۸۷۸دا لە (ترابزون)ەوە ناردبوی بۆ (مارکیز سولس) باسی پەلاماردانی ئەحمەد پاشای کردوه بە خۆیو هێزەکەیەوە بۆسەر هێزی عوسمانی کە بریتی بوە لە ۳–٤ گوردان و هەموو بەدیل گیران و چەکەکانیشیان دەستی بەسەردا گیرا.

هەروەکو کتێبەکە ی (میلنگن) کە کراوە بە فارسی بەناوی (زندگی و حشیان مردم کورد چاپی لندن ۱۹۷۰ لە لاپەرە ۱٥۰ دا وتویەتی هوی سەرکەوتنی کورد ئەوە بووە بە گەورە و بچووك و بەژنوپیاوەوە شەریانکردبوو لە گەڵ تورکە کانا هەروەکو (میلین) ی موستەشاری ئینگلیزەکان کە کرێ گرتە بوە لە ناو سوپای تورکدا باسی کردوه، شکستی عوسمانیەکان لە ناو چیاکانی درسیمدا تورکەکانی پەرێشانکردبوو. روسەکان دەیانزانی شەڕ لە نێوان ئەوان و تورکدا دەس پێدەکا بۆیە لە جاران زۆرتر بایەخیان ئەدا بەکوردو لەورووەوە(ن. پ. ئیگناتۆف) ی سەرکونسوڵی روس لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا، لە ۲۲ی کانونی دوهەمی ۱۸۷٦دا داوای لە سەرکردەکانی هێزی روس کردوە لە قەفقاس یارمەتی کورد بدەن و هاوکاریان لە گەڵا بکەن بۆ ئەوەی رێگە نەدرێ بە تورك و ئینگلیز

کورد پرچەك بکەن و بیانکەن بەلایەنگری خۆیان هەروەکو لە کتێبەکەی (ئوریانۆف) لە لاپەڕە ٨٦دا باسی ئەوەی ئیگناتۆفی کردوە.

دەربارەی ئەو شۆڕشەی درسیم دوکتۆر جلیلی جلیل لە سەرچاوە ١٨دا بەدورو درێژ باسیکردوە و لە لاپەڕە ٣٩دا وتوویەتی:

((سامی پاشا (کە سەرچاوەی پێشوو بەسمیح پاشا ناوی هێناوە) داوای لە قائمقامی (باستیا) کرد کە مەزیەتە بە کوردەکانی ناوچەکە بکاتەوە و تیاید دلسۆزی خۆیان بۆ سولتان ئاشکرا بکەن و لەوەرامی ئەوەدا قائمقامی باستێ پێی ڕادەگەیەنێ ئەرمەنیەکان ئەو مەزیەتانە مۆرناکەن و باجیش نادەن و ساتێك حکومەت کە وتە زەبرو زەنگ نواندن بۆ سەندنی باج لە کوردەکان. دانیشتوانی ئەرزرۆم و قارص وبایزیدو موش تەواو ورووژان و دەربارەی ئەوە(ئوبیر میللەر) لە نامەکە یا بۆ (ن. پ. ئیلیاتۆف) لە مارتی ١٨٧٣دا باسی ئەوەی کردوە چۆن (ئیسماعیل پاشا) کە لە کوردەکانی قارص بوە، بەلام تا مۆخی ئێسکە کانی خۆی فرۆشتبوو بە سولتان، بەوپەڕی درندەیەتیەوە لەگەڵ هاونەتەوەکەی خۆیدا ڕەفتاری دەکرد، بەلام بارودۆخ لە جاران خراپتری لێ هات و (ئەسەد پاشا)ی صدری ئەعظم ناچار بوو سامی پاشا لاباو لە جیاتی ئەو (مصطفی فوسفور)ی دانا کە ئەمەیان لەوی پیشوو بێدەسەلاتتر بوو ترسنۆکیش بوو نەیتوانی چارەسەری کیشەکە بکاو کوردەکانی (کیلیکیا) و (زەیتوونی) یەکیان گرت و ئەرمەنیەکانی (زەیتونی)یش لە ساڵی ١٨٧٥دا دژی حکومەت ڕاپەڕین و لەولاشەوە کوردەکانی(ئەلبیستان) و (ئاجینی) و چەند شوێنێکی تر هەستان و دەستیاندایە چەك دژی حکومەت و بەوجۆرە کوردو ئەرمەنی هەردوکیان بەرەنگاری حکومەت بونەوە و حکومەت چارەسەری کیشەکەی پێ نەکرا بە شەڕو هەروەکو (ئەڤریانۆف) لە لاپەڕە ٥ ی کتێبەکەیدا باسی کردوە قونسوڵی ڕوس لە ئەرزرۆم لە نامەیەکیا بۆ قونسوڵی ڕوس لە ئەستەمبوڵ باسی ئەوەی کردوە تورکە کان توانیبویان کوردەکان بکەن بەدوو بەشەوەو ئەوانەیان کە دەستیان خستبوە دەس حکومەتەوە بە میللەت فرۆش ناودەبران بڕیاری کوشتنی ئەو دەرەبەگانە دەرچوو کە یەکێك لەوانە (گولاوی بەگ) ی قائمقامی درسیم بوو کوژراو (شێخ سلێمان)ی سەرداری درسیمی مرکزی سەری بۆ

حکومەت دانەنەواندو هێزە چەکدارەکانی کە ژمارەیان (١٢) هەزار دەبوو دابەشیکردن بەسەر بنکە و پێنج قەڵادا. ساتێك تورکە کان دەستیانکرد بەخۆئامادەکردن بۆ لێدانی ئینگلیزەکان لەوە ترسابون روسەکان کارێکی وابکەن دەس بخەنە ناو کاروباری ناوچە کوردیەکانەوە.

دەربارەی ئەو هەڵوێستە هەروەکو دوکتۆر جلیلی جلیل باسی کردوە(ئیلوت) ی قونسوڵی بریتانیا لە ئەستەمبوڵ داوای لە قونسوڵی خۆیان کردبوو لە ئەرزرۆم گەشتێك بەناو کوردستانا بکاو زانیاریەکی تەواو دەربارەی هێزو دەسەڵاتی کورد کۆبکاتەوە و هەوڵ بدا بەپارەو دیاری کوردەکان لە روس دور بخاتەوەو کارێکی واش بکا ئەرمەنیەکانیش دژی حکومەتی عوسمانی نەجوڵێنەوە، بەڵام تەقەلاکانی ئینگلیز لەو ڕووەوە بێسوود بوو چونکە تورکەکان خۆشیان لە چالاکیەکانی ئینگلیز دەسلە مینەوە لەو ناوچانەدا. بەرامبەر بەو چالاکی و تەقەلادانەی ئینگلیزەکان، روسەکانیش دەیان ویست کوردەکان بکەن بە لایەنگری خۆیان. جلیلی لە باسەکەیدا ئاماژەی بۆ لاپەڕە ٩٦ی کتێبەکەی ئەفریاتۆف کردوە کە بە گەورە دەسەڵاتدارەکەی کورد (نەی وتوە ئەویەگە کێ بوە) کە بوو بە لایەنگری حکومەت توانیبوی (٢٥) هەزار چەکدار بۆ حکومەت کۆبکاتەوە، بەڵام ئەو کوردە بەپێچەوانەی ئاواتەکانی حکومەت، بوو بە هاوکاری کوردەکانی ترو ڕێگاکانی قارص، توکاناو، سیواس و ئەرزرۆمی گرت و ڕێگەی هاتوچۆی عوسمانیەکانی بڕی. (بیلوت)ی یاریدەدەری قونسوڵی ئینگلیز لە (ترابزون)، لەگەڵ ئەو هەموو رق و دوژمنایەتیەی بەرامبەر بەکوردەکانی درسیم هەیبوو کە چی لە نامەیەکیا خۆی پێ نەگیرابوو دانی بەوەدا نابوو کوردەکانی درسیم بەنیازی سەربەخۆیی ڕاپەڕیون لە بەر ئەوە شتێکی نارەوایە جموجوڵ و ڕاپەرینەکە یان بەجەردەیی و ڕاوو رووتکردن لە قەڵەم بدریت.

دەربارەی ڕووبەڕووبونەوەی حکومەت و شۆڕشگێڕەکانی درسیم، جلیلی ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (ئەندرانیك) کردوە کە ناوی (ترسیم) بوە لەوەدا وتراوە ساتێك تورکە کان پەلاماری گوندەکانی بناری شاخەکانی (تووژیك) و (هوت)یاندا دانیشتوەکانی بەخۆیان و کە لوپەلیانەوە ڕوویانکردە سەرشاخی توژیك و لەوێ شەڕێکی سێ ڕۆژی کرا و کوردەکانی (خرانی) و ئەرمەنیەکانی (میراکا)

یارمەتی‌یان دان‌و هێزی کوردو ئەرمەنی هێزەکە ی حکومەتیان ناچارکرد دۆڵی(باخ) بەجێ بێڵێ و گەلێك گۆرانی و فۆلکلۆر دەربارەی ئەو شەڕە بەناو خەڵکدا بڵاو بوەوە، بەڵام دوای شەڕێکی تری (١٥) ڕۆژی تورکەکان دەستیان کرد بەتۆب باران‌و ڕێگەی ئاوی خوارنەوەسیان لە کورد گرت و (توژیك) یان گرتەوەو بەوپەڕی درندەیەتیەوە پەلاماری دانیشتوای گوندەکانیان دا.

پاش ئەوو هەرچەند تورکەکان لە شەڕێکی تردا لە دۆڵی (مەنزوور) خراپ شکابوون، بەڵام عوسمانیەکان وازیان نەهیناو درسیمیان داگیر کرد.

شۆڕشی پێنجەم

## شۆڕشی شێخ عبداللە ی‌نهری (شمزینی)

هەروەکو لە پێشەکیی باسی شۆڕشەکانا لەوە دواین نووسینێکی تێرو تەسەلی دەربارەی هەریەکێك لە شۆڕشە گەورەکانی باکوور باسێکی زۆر دوورودرێژەو هەریەکە یان پێویستی بەکتێبی تایبەتی هەیە، بۆیە لە سنوری بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا هەوڵ ئەدەین کورتە باسێکی شۆڕشەکە ی شێخ عبیداللە بخەینە بەرچاو بەپێی ئەو سەرچاوانەی دەربارەیان نوسیوە.

بۆ زانینی ساڵی لە دایك بونی شێخ عبید اللە وتەمەنی شێخ عبیداللە زۆرم هەوڵدا لە سەرچاوەکانا زانیاریەکی موسوەگەرو راستم دەسگیر ببیت دەربارەی ساڵی لە دایك بونی و ساڵی کۆچی دوایی، بەڵام بەداخەوە لە کتێبەکە ی (کریس کوچرا) بەولاوە سەرچاوەیەکی ترم نەدی باسی ئەوەی کردبێ‌و کریس کوچرا لە لاپەڕە ٤٩ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤١وتوویەتی شێخ عبیداللە ساڵی ١٨٣٠ زایین لە دایك بوە کە ئەمەش جێگەی گومانە چونکە بەپێی کتێبەکەی دوکتۆر عزیز شمزینی سەرچاوە ٤١ لە لاپەڕە ٦١ دا وتوویەتی شێخ عبیداللە لە ساڵی ١٨٨٨ ی‌زاییندا کۆچی دوایی کردوە کە بەپێی ئەوەی کریس کوچراو ئەمەی دوکتۆر عزیز دەبێ ژیانی شێخ عبیداللە هەمووی بریتی بووبێ لە ١٨٨٨–١٨٣٠=٥٨ ساڵ کە هیچ بروا ناکرێ شێخ عبیداللە تەمەنی ئەوەندە کە م بووبیت

ـەوەش سەیر تر ئەوەیە کریس کوچرا لە لاپەڕە ٥١ ی کتێبەکەیدا وتوویەتی:
ـێش چل ساڵ دووركـە وتنـەوەی شـێخ عبیـدالله لـە سـاڵی ١٨٨٣دا لـە شـاری
مکە) کۆچی دوایی کردوە).

کە ئەمـەش هیچی بەسـەر هیچەوە نیە و جگـە لـەوەی دوکتـۆر شمزینـی
ـتوویەتی لە ساڵی ١٨٨٨دا کۆچی دوایی کردوە ئەمین زەکیش لە لاپەڕە ٢٤٤ی
ـەرگی یەکـەمی کتێبەکـەیدا سـەرچاوە ٣٢ وتوویـەتی شـێخ عبیـدالله لـە سـاڵی
١٨٨٣دا وازی لە شەرەکەی هێناوە(کە کریس کوچـرا سـاڵی واز لێ هێنانەکـە ی
ـەساڵی کۆچکردنـی دانـاوە)و هـەروەکو عزیـز شمزینـی باسـی کـردوە دوای
ـدولرەکردنی بۆ مکە لە ساڵی ١٨٨٨دا کۆچی دوایی کردوە بەپێی ئەمەی ئـەمین
ـەکی و عزیز شمزینی دەبێ شـێخ عبیدالله تەنـها ٤-٥ سـاڵێك بـە ئـاوارەیی لـە
شاری (مکە ) دا بووبێ نەك ماوەی چل ساڵ وەکو کریس کوچرا باسی کردوە.

لـە لاپـەڕە ١١١ی کتێبەکـە ی سمکۆو بزوتنـەوەی نەتەوایـەتی کـورد چـاپی
ستۆکهۆلم سـاڵی ١٩٩٦ کـە کورتـە باسـێکی ژیـانی شـێخ عبیـدالله و شـجرەی
بنەماڵەی شێخانی نهری(شمزینی)م باسکردوە بۆیە پێویـست بـەوە ناکـا لـێرەدا
ئەوشەجەرەیە دووبارە بکە مەوە

بێجگە لەوە لە هەمان کتێبی سمکۆدا وەکو چۆن باسی شۆڕشەکە ی بدرخان
پاشا لە کوردستانی ئێراندا کرابوو لە م بەرگەدا پیویست بـە دوو بارەکردنـەوەی
نـەبوو، لـە م بەرگەشـدا پێویـست بەشۆڕشـەکە ی شـێخ عبیـدالله ناکـا دوبـارەی
بکەمەوە کە لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا کردبووی چونکە لـەوەی سمکۆدا بـەدوورو
درێژ باسم کردوە تەنها لەم بەرگەدا باسی ڕاپەڕین و شۆڕشەکە ی شێخ عبیـدالله
دەکە ین لە باکوری کوردستاندا و باسەکە دەکە ین بەم چەند بەشەی خوارەوە:

**یەکەم: ژیانی شێخ عبیدالله و بنەماله کەی.**

**دوهـەم: هەڵوێسـت لـە بـاکوری کوردسـتاندا بەرلـە شۆڕشـەکە و لـە کـاتی شۆڕشەکەشدا.**

**سێهەم: ئامانجە سەرەکیەکانی شێخ عبیدالله و نەخشەی پرۆگرامەکانی**

**١- هەولدان بۆ یەکگرتنی کوردو پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ**

**٢- پیوەندی کورد و کریستیانەکان و ڕۆڵی شێخ عبیدالله لەوەدا**

**٣- دبلۆماسیەتی شێخ عبیدالله و هەوڵدانی بۆ بەهێزکردنی پێوەندی لەگەڵ وڵاتاندا**

**چوارەم: چۆنیەتی دەسپێکردنی شۆرش لە باکوری کوردستاندا و ئەنجامەکە ی**

**١- گەڕانەوەی هێزە شکاوەکەی شێخ عبیداللە لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە(ئێران).**

**٢- شۆرشەکە ی شێخ عبیداللە لە باکوری کوردستانو ئەنجامەکەی**

**٣- هەڵسەنگاندنی شۆرشەکەی شێخ عبیداللە.**

***یەکەم: ژیانی شێخ عبیداللە و بنەماڵەی شێخانی شمزینی***

شێخ عبیداللە کوری شێخ طە بوەو بێجگە لەوە لە ژیانیا سەرۆکی نقشبندییەکان بوە، لە هەمان کاتدا یەکێکیش بوە لە دەرەبەگە گەورە و دەسەلاتدارەکانی ئەو ڕۆژانەو موڵك و زەوی و زارێکی زۆری لە باوکیەوە بۆ مابوەوەو خویشی بە هۆی پارەداری و کاسبی و بازرگانی کرین و فرۆشتنو کشتوکاڵ کردنەوە توانیبووی موڵکێکی زۆری تر بخاتە سەر موڵکەکانی، بەتایبەتی لەورۆژانەدا حکومەتی عوسمانی کە وتبوە ژێرباری قەرزێکی زۆری دەوڵەتانی رۆژئاواو ناچار بوو و بەشێکی زۆری موڵك و زەوی و زارەکانی میری بەنرخێکی هەرزان بفرۆشێت بۆ دانەوەی ئەو قەرزانەو بەهۆی ئەوە نەك تەنها هەر شێخ عبیداللە بەڵکو ژمارەیەکی زۆری تری دەرەبەگ و دەسەلاتدارانی تر لە ناو ولاتی عوسمانیدا لەو جۆرە موڵك و زەویو زارانەیان کریبوو سنووری دەسەلاتیان پەرەی پێدرابوو.

جلیلی جلیل لە لاپەرە ٨٠ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ١٨ باسی ئەوەی کردوە ژمارەی گوندەکانی شێخ عبیداللە نزیکی (٢٠٠)گوند بوەو دەسەلاتی ئاینیو سیاسیی بەشێوەیەکی ئەوتۆ پەرەی سەندبوو هەندێ لە دەرەبەگەکانی تری کوردی دراوسێی کە وتبونە بەربەرەکانیکردنی و پرۆپاگاندەیان دژی بلاو دەکردەوە و یەکێکی وەکو شێخ محمدە بچکۆلە کە ئەویش دەرەبەگیکی دەسرۆیو بوە بەناوخەڵکدا بلاوی کردبوەوە کە شێخەکانی شمزین لە ئاینی ئیسلام لایان داوە.

شێخانی شمزینی کە لە سەر رێبازی نقشبندی بون، چ لە ناو کوردەواریدا و چ لەلای کاربەدەستانی حکومەتی عوسمانی رێزکی زۆریان لێگیراوەو پشتاوپشت تا شۆرشەکە ی ساڵی ١٩٢٥ کە شێخ عبدالقادری کوری شێخ عبیداللە بەتاوانی

ئەوەی دەستی هەبوە لە شۆڕشەکە ی شێخ سەعیداو لە ئەنجامیا شێخ عبدالقادریش شەهیدکراوە، ئەو بنەماڵە یە لە ڕیزی تێکۆشەرانی کوردابون دژی جەورو ستەمی داگیرکە رانی کوردستان، هەرچەند هەستی نەتەوایەتی لە ناویانا زۆر پابەندی ئیسلام بوەو خەلیفەی عوسمانی‌یان بەخەلیفەی هەموو ئیسلام داناوە و لایان ئاسان نەبوە هەستی نەتەوایەتی وایان لیٚ بکا بیر لە جیا بونەوە بکە نەوە لە دەولە تی عوسمانی تا ئەوکاتەی بۆ یان دەرکە وت خلیفەکانی عوسمانی لە ڕاستە رێگەی ئاینی ئیسلام لایان دابوو هەموو شتێکیان بۆ سوودی خۆیان و ڕابواردنی خۆیان و دارو دەستەکانیان بوە ئەوسا ئەوانیش چوونە ریزی ئەوانەی ماوەیەك بوو لەوە رژیمە درۆیەی خلافەتی عوسمانی بێزار بوون و لە گەڵ ئەوانا ئالای شۆڕشیان هەڵکردو بوونە پێشەوای شۆڕشگێرەکان.

دەربارەی ئەو هەڵوێستەی بنەماڵە ی شمزینی بۆ جیانەبوونەوە لە خەلافەتی عوسمانی زیانێکی زۆری بە بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد گەیاند بەتایبەتی لە کاتی پەیمانی سیڤەرو لە دوای ئەویش و بوو بەهۆی تێکچونی ریزەکانی ئەوان و رۆشنبیرانی تری ئەورۆژانە، بەتایبەتی بنەماڵە ی بدرخانیەکان کە ماوەیەك بوو ئالای سەربەخۆیی کوردیان بەرز کردبوەوە وەکو لە بەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا بەدوورودرێژ باسی ئەوە دەکەین. هەرچۆنێك بوبیٚ لە ئەنجاما جەوروستەمی کاربەدەستانی تورك هەموویانی ناچارکرد لە گەڵ یەکتردا ببن بە هاوکار هەرچەند تازە کار لە کار ترازابوو و ناکۆکیی نێوانیان کە تنی خۆی کردبوو.

دەربارەی شەخصیەتی ئاینی و سیاسی (شێخ عبیداللە) دوکتۆر جلیلی جلیل لە سەرچاوە ١٨دا باسی ئەوەی کردوە چۆن شێخ عبیدالله نەك هەرلە ناو کوردی باکوردا، بەڵکو لەو دیو قفقاسیشدا رێزی لیٚ گیراوە و لە کوردستانی ئێرانیشدا وەکو سەرکردەیەکی پایەبەرزی کورد تەماشا کراوە.

لەوراپۆرتەی (correspondence) ی رۆژی ٨ ی تەموزی ساڵی ١٨٨١ بلاوکراوەتەوە وتوویەتی: شێخ عبیدالله ئیستە هەموو رۆژێك دەیان کەس دەبینیت و وەکو جاران نەماوە و لە پیاوەکە ی جاران ناچیٚ کە ئەوسا کریستیانەکانی ناو ولاتی ئێران و عوسمانی دیبوویان.

جلیلی لە باسەکەیدا باسی ئەوەی کردوە کە شێخ عبیداللە دەستوورێکی بۆ خەڵك دانابوو، هەرکە سێك خراپەی بکردایە بە پێی ئەو یاسایە سزا ئەدرلو دادپەروەریی شێخ وبێ هەوایی و سادەیی وای لە خەڵك کردبوو بەوپەڕی رێزەوە سەیریان دەکردو ئەویش وەکو مرۆڤیکی پیاك رەفتاری دەکرو دەورووپشتەکەشی هەمان رێبازیان گرتبوەبەرو مروڤێکی رۆشنبیر بوە حەزی بە بلاوبوەنەوەی شارستانێتی کردوەو دژی هەموو دەسدرێژیو جەردەییەك وەستاوە و حەزی کردوە میللەتەکەی لە پلەیەکی پێشکە وتوودا بژی و لای هەژار و رووتەکان پشت و پەنایان بوەو لە هەموو لایەکەوە روویان تێ کردوە و خەڵك بە (باوك) ناویان دەبرد و ناوەکە ی بوبوو بە دروشمی خۆشەویستی و کە ناوی دەهێنرا خەڵك بەرزەپێ لە شوێنی خۆیان ڕاست دەبوونەوە .

دەربارەی رەوشتی (شێخ عبیداللە) دوکتۆر جلیلی ئامـاژەی بۆ باسی ئەرمەنیەك کردوە کە ناوی (مورج) بوە لە لاپەرە (٦١-٦٢)ی کتێبەکەیدا چاپی ساڵی ١٩٠٦ وتوویەتی: شێخ مرۆڤێکی چاك بوو لە ئیشکردندا ماندوو نەدەبوو بەرامبەر هەژارو هەتیوو لێقەوماوان و بێکە س زۆر باش بوو کێشەی نێوان خەڵکی چارەسەر دەکرد.

جلیلی ئاماژەی بۆ کتێبی نوسەرێکی تر کردوە (G. wilson) لە کتێبەکەید (Prsain life) لە لاپەرە ١١ دا وتویەتی: خەڵك لە دوای سوڵتان و شەریفی (مکە) ئەویان بەپیرۆزترین کە س دادەناو ئامادەبوون وەکو نێرراوێکی لای یزدانەوە بێ سێ و دوو دوای بکە ون و کریستیانەکانیش زۆر رێزیان لێ دەگرت.

## دوەم: هەڵوێست لە باکووری کوردستاندا بەر لە شۆڕش و پاش شۆڕشەکەی شێخ عبیداللە

لە گەڵ ئەو هەموو زەبرو زەنگ و ستەمکارییەی کاربەدەستانی تورک بەرامبەر کورد نواندیان لە دوای ڕاپەڕینەکە ی یزدان شێر، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا چەند هۆیەکی کاریگەری وای لە کورد کردبوو بێدەنگ و دەستەپاچە نەوەستێ‌و ڕووداوەکانی دوای دوای یزدان شێر زەمینەیان بۆ بەرپابوونی شۆڕشێکی گەورەی کورد خۆشکرد دژی حکومەت بەسەکردایەتی شێخ عبیداللە.

گەلێك سەرچاوە بەدوورودرێژ باسی ئەورۆژانەیان کردوە و لێرەدا کورتەی سێ باس دەکە ین کە هەریەکە یان باسی چمکێکی هەڵوێستو ڕوداوەکانی باکوری کوردستانیان کردوە.

ئەمین زەکی لە لاپەرە ٢٤١ی بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٣٢دا باسی بارودۆخی حکومەتی عوسمانی کردوە چۆن لەورۆژانەدا کزو و کە م دەسەلات بوە و لە ڕووخاندنەوە نزیك بوە و ئەو دەسەلاتەی جارانی نەمابوو کە توانیبوی شۆڕشەکە ی محمد پاشای رواندوزو بدرخانی پێ دامرکاندبوەوە و دەسەلاتی شێخ عبیداللە پەرەی سەندبوو، دانیشتوانی ناوچەکانی شمزینانیان دڵسۆزترین و پاکترین لایەنگرانی شێخ بون و ئامادەبوون سەروماڵیان لە پێناوی بزوتنەوەکەیدا بەخت بکەن‌و، ئازایەتی‌و چاونەترسانیان لەوەی سەردەمی باوو باپیرانیان کەمتر نەبوو کە لە لاپەڕەکانی مێژودا بەناوی ئەوەی (نایری)یەوە تۆمار کراوەو تەنها بانگەوازێك لە شێخەوە بەس بوە بۆ ئەوەی هەموویان خۆیان بهاوێژنە ناو هەموو گێژاوێکە وە بەبێ سڵ کردنەوە.

بەوجۆرە مریدو لایەنگرانی شێخ وەکو لافاو لە ساتی شۆڕشەکەیدا لە کوردستانی ئێران ڕوویانکردە ناوچەی (ورمیە) و (موکری- سابلاخ) و بەئاسانی ناوچەی موکریانیان داگیر کرد و پایتەختی شیعەکان کە (تەورێز) بوو کە وتە مەترسیەوە.

کتێبی جنبشهای کورد أز بیرون تا آکنون سەرچاوە ٥٣ لە لاپەڕە ٣٦ باسی کزبوونی دەسەلاتی دەولە تی عوسمانی کردوە دوای شەڕی روس و تورك کە باری ئابووریی ولاتی بەجۆرێك کز کردبوو کە حکومەت بۆی چارەسەر نەدەکرا و

ئەو باج و سەرانە زۆرەش کە حکومەت بەزۆر لە خەڵکی دەسەند ئەوەندەی تر خەڵکی بێزار کردبوو، برسێتی لە نێوان ساڵانی ١٨٧٨-١٨٨٠دا گەیشتبوە رادەیەك ئیتر کەس لە توانایدا نەمابوو بێدەنگ دانیشێ و دژایەتی حکومەت نەکاو رۆژنامەی تایمسی لندن لە ژمارەی رۆژی ٥ مارس ١٨٨٠دا لە باسی ئەورۆژانەدا وتوویەتی:

((هەژاری وبرسێتی و گرانی لە ناوچەکانی دیاریکرو موصڵدا گەیشتبوە رادەیەك و بەجۆرێك دانیشتوان لە لایەن کاربەدەستانی حکومەتەوە رووت دەکرانەوە خەڵك ئەوەندەی بۆ نەدەمایەوە بەشی ژیانی رۆژانەی بکاو لە شوینیکی وەکو ناوچەکانی هەکاریدا نزیکە ی بیست هەزار کە سیان لێ مردن)).

هەروەها رۆژنامەی (مشاك) ی ئەرمەنی لە ژمارە ٨٤ی ساڵی ١٨٨٠دا باسی ئەوەی کردوە چۆن بەهەزاران لە دانیشتوان لەبەر برسێتی و نەبوونی ناچار بون شوێنەکانی خۆیان بەجێ بێڵن و دەستیان بۆ روسەکان پان دەکردەوە بۆ ئەوەی پاروە نانێکیان لەوانە دەسگیر بێت و ئەوانەی بەچیاکانی ئاراراتدا رۆیشتون بە چاوی خۆیان بە سەدان برسی و مردویان لەو رێگاو بانانەدا دی و لە برسا دەمردن و سەرەرای ئەوە بێ بارانیش بوبوو بەهۆی کە مبوونی بەرهەمی کشتوکاڵ و بەجارێك ئاسایش شیرازەی تێکچوو بوو. ئا لەو بارو دوخەدا شێخ عبیدالله کە ئاگاداری هەڵوێست بوو بەئاشکرا کەوتە خۆی بۆ بزووتنەوەیەك کە عەرەبەکانی ویلایەتی بغدادیش ئامادەیی خۆیان دەربریبوو بۆ شێخ بەمەرجێك ویلایەتی موصڵیان بۆ رزگار بکات. دوکتۆر جلیلی کە کتێبەکە ی سەرچاوە ١٨ سەرومر بۆ ئەو شۆرشەی شێخ عبیداللە تەرخان کردوە بەناوی راپەرینی کوردەکان لە ساڵی ١٨٨٠دا لە باسی هەڵویستی ئەو رۆژانەدا بۆ چۆنێتی سەندنی باج لە کورد لە لاپەرە ٢٠٦ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ راپۆرتێکی قونسوڵی روس کردەوە لە ئەرزرۆم کە ناردبووی بۆ باڵیۆزی روس لە ئەستەمبوڵ ژمارەی راپۆرت ١٢٤ رۆژی ٢٥ /٦/ ١٨٧٢ وتوویەتی:

((لە ماوەی گەشتەکەمدا بەویلایەتی ئەرزرۆم، لەناو گوندو شارەکانا، لە نزیکە وە چاوم بەدانیشتوان و باری ژیانیان کە وت چون لە لایەن حکومەتەوە بەزۆرەملێ دەکران بە سەرباز. دەمەوێ بۆ تان روون بکەمەوە خەڵك لە ژێر باری

گرانی سەرانە و باجدا دەناڵێنن و باجگرەکان بەوپەڕی بێ ویژدانیەوە بەئارەزوی خۆیان باج دەسێنن و میللە تی بێ دەسەلاتیش مل کە چ ئەکا بۆ باجگرەکان و مانگێك لە مەوبەر بڕیاردرا موتەسەڕیفی ناوچەکانی قارص و بایزیدو وان و مووش لابرێن و هی تازە دابنرین کە لام وایە تازەکان لە کۆنەکان باشترو بەویژدان تربابن و موسڵمانە ڕەش و رووتەکان و کاثولیك و نسطوریەکان لایان وایە لابردنی ئەوانە بەهۆی فشاری ڕووسەوە بوە بۆ ئەوەی باری خەڵك باش بکرێت.

لەو راپۆرتەدا بەدوورودرێژ باسی جۆرو رادەی ئەو باجانەی کردوە کە لەو رۆژانەدا دەسێنران کە بریتی بون لە:

١ـ باجی دەیەك: بریتی بوە لەو باجەی لە هەموو بەرهەمی زەوی وزار و کشتوکاڵ دەسێنراو حکومەت هەر جارەی بیانویەك ئەدۆزێتەوە بۆ زۆرکردنی ڕادەی باج لە ١٠٪ بۆ ١٥٪.

ئەگەر جوتیارێك هەشت عارەبانە پووش کۆبکاتەوە دەبێ عارەبانەیەکی بدا بەحکومەت و ئەگەر پووشەکە ی نەدا پێویستە(٣٠پێسە)بداو لە سالانی١٨٦٥–١٨٦٦دا حکومەت هەموو ساڵێك نزیکەی (١٢٤٤١٠) لیرەی ئالتونیان لە دانیشتوان کۆ دەکردەوە کە چی ساڵی دوای ئەوە لە گەڵ ئەوەشدا ڕادەی باج کرابوو بەلە ١٥٪ کە چی بەشەڕەشەق توانرا (١٥٢٩٠٠) لیرە کۆبکرێتەوە.

٢ـ باجی ئەملاك: بریتی بوە لە باجی زەویوزاری چاندراوو خانوو بەرەو لەوەڕگاو باجی خانووی ناوشارەکان بێجگە لە سەندنی باجی جووت و گاو مەڕوماڵات و خوریو توتن و گومرگ و باجی ڕاوەماسی و کە لوپەلی بازرگانی.

دوای ئەو دووباجە، راپۆرتەکە چۆتە سەر باسی سەندنی باجی سەرباز وەرگرتن و حکومەت بۆ هەر گوندێك ژمارەیەکی دەسنیشان کردبوو کە ببن بە سەربازو ئەوی سەربازیی نەکردایە دەبوو لە نێوان (٢١–٣٢ پێسە) بدلو زۆرجار باج لەو مندالانەش دەسێنرا کە هێشتا لە زگی دایکیانا بون و ساتێك حکومەت داوای ئەو باجانەی لە ئەرمەنیەکان دەکرد، ژنەئەرمەنیەکان بەزەبیتەکانیان دەووت: کچمان بوە..... کوڕمان نەبوە.

جلیلی لە لاپەرە ٢٤٤دا نمونەیەکی سەیرتری هێناوەتەوە بۆ چۆنیەتی باج سەندن کە لە ساڵی ١٨٧١دا ئەحمەدبەگی موتەسەریفی (موش) بەناوی (باجی

مەنفەعە) وە (١٠٠هەزار پێسە) ی کۆکردبوەوە،لەوە (٨٠) هەزاری بۆ خۆی هەڵگرتبوو، دەهەزاری درابوویە (بطرس ئارامیان) ی خەزنەدارو دەهەزارەکەی تریش تەرخان کرابوو بۆ مووچەی کاربەدەستانی حکومەت، هەروەکو لە راپۆرتی ژمارە ١٠٨٣ی ئەرشیفی گشتی حکومەتی روسیای ساڵی ١٨٧٢دا باسیکراوە حکومەت تێرخواردنی نەبوە لە سەندنی باج.

جلیلی دوای ئەوە چۆتە سەرباسی هەڵوێستی ئەو رۆژانە لە ئەنجامی ئەو شەرەی لە نێوان تورك و روسیادا دەستی پیکردبوو حکومەتی عوسمانی بەناوی غەزاوە داوایان کردبوو لە خەڵك بەشداری بکە ن لەوغەزایەداو شێخ عبیداللە وەکو سەرۆکێکی ئاینی کورد نەیتوانیبوو دوورەپەرێز بوەستێ و ناچار بوو بەخۆیو(٣٠٠)چەکدارەوە لە مریدەکانی روویکردە سنووری روسیا، بەلام لە راستیدا ئەو کارەی شێخ بۆ مەبەستێکی سیاسی بوو، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد سوود لە ئەنجامی ئەو شەڕە وەربگرێ و هەوڵی ئەوە بدا لەو شەڕەدا ببێ بەسەرکردەی ئەو کوردانەی بەناوی غەزاوە کۆبونەوە، هەتا بتوانێ لە کاتی خۆیدا ئەو هێزە بۆ خزمەتی کورد بەکاربێنێ.ئەوسوپایانەی تورك و ئەوانەی بەناوی غەزاوە کۆکرابوونەوە پێویستییان بەخواردن و ئازوقە هەبوە و بۆ ئەو مەبەستە عوسمانیەکان کوردەکانی ناوچەی(بایزید)یان ناچارکردبوو هەموو جۆرە سەرانەو باجێك بدەن و خواردەمەنییش بۆ هێزەکان ئامادەبکە ن و لەونامەیەدا (لیوتینانت تیرگاسون) بۆ (لوریس میلیکۆف)ی ناردبوو دەربارەی ئەو شەرە وتوویەتی هەموو ماڵێك لەوناوچانەدا دەبوایە دووبەران و بەکێشەی باطمان (١٦ف) رۆن و دووجووت گورەویی خوری بدەن و ئەو ماڵە ی ئەوەی نەبوایە دەبوو بەپارە نرخی ئەو شتانەی بدایە وەکو (ئەفریانۆف) لە لاپەرە ١٧٦ی کتێبەکەیدا (کوردەکان لە شەری روسیا) دا باسی کردوە.

دەربارەی نەبوونی مانگانەی سەربازەکان، جلیلی ئاماژەی بۆ کتێبەکە ی (س. ئوــ کشمیشۆف) کردوە(جەنگی ئەرمەنیاو تورکیا لە ساڵانی ١٨٧٧ــ ١٨٧٨ چاپی مۆسکۆ ساڵی ١٨٨٤دا وتویەتی لە بەرنەبوونی پارە بۆ مانگانەی سەربازەکان حکومەت بەناوی قەرزەوە پارەی لە خەڵك سەندوە کە ئەمەش بارێکی تر بوە بەسەرشانی خەڵکە وە.

کورد حەزی نەکردوە لەوشەڕەی تورك و روسدا بەشداربێ و هەرکە سە دەرفەتی هەبوایە کۆڕی شەڕی بەجێ دەهێشت و لەو ڕووەوە(فایق پاشا) لە تەلگرافێکیا کە لە تەموزی ١٨٧٧دا ناردبووی بۆ (موختارپاشا) ترسی ئەوەی لێ نیشتبوو کوردەکانی سەر بە شێخ عبیداللە بەهۆی کە میی ئازوقەو نەبوونی چادرەوە بەتەمای ئەوەن بڵاوەی لێ بکە ن و چەکە کۆنەکانیان دابنێن و چەکی تازە لەگەڵ خۆیانا ببەن و ڕابکە ن. زۆری پێنەچوو دەستە دەستە کوردەکان وازیان لە شەڕ هێنا و هەروەکو (ئەفریانۆف) باسیکردوە لە لای (بایزید)ەوە (١٥٠٠) چەکدار وازیان هێنا جگە لە چەند کەسێکی تر لە ناوچەکانی تردا.

لە ڕۆژانی ئابلۆقەدانی قەڵای (بایزید) دلو لەو(٥) هەزار چەکدارەی لای شێخ عبیداللە تەنها(١٤٤٣) چەکدار مابوونەوە، ئەمە وای لە شێخ کرد ئەویش واز لە (بایزید) بێنێت و بگەڕێتەوە بۆ (بارگێڕ). سەرکەوتنی هێزی روس لە قارص و بایزیددا(لای کورد ئەم شەرە بەقارص‌وئەردەهانیش ناوبراوە) کارێکی وایکرد هەستی دوژمنایەتی بەرامبەر عوسمانی پەرەبسێنێت و لەو ڕووەوە (ئیڤانۆف) ی کونسوڵی روس لە ئەرزرۆم لە پاش داگیرکردنی قارص لە راپۆرتێکیا وتوویەتی لای وایە کورد خەریکی ڕاست بوونەوەیەکە و لەوە ئەچێ خۆشی بۆ ئامادەکردبێت. بێزاربوونی خەڵك بەرامبەر ستەم و زۆرداری و باج سەندنی زۆری کاربەدەستانی عوسمانی ژیانی بەخەڵك تاڵ کردبوو. ڕۆژنامەی (مشاك) ی ئەرمەنی لە ژمارە ١٠٣ەی ساڵی ١٨٨٠دا باسی ئەو کوردانەی کردوە لە (موش)ەوە پەنایان بردبوە بەر ناوچەکانی تفلیس و نائارامیو بێ یاسایی وەکو جلیلی لە لاپەڕە ٦٣ی سەرچاوە ١٨دا باسیکردوە شیرازەی بەتەولوەتی تێکچوویوو، (یاکیمانسکی)ی یاریدەدەری قونسوڵی روس لە دیاریکر لە راپۆرتێکیا وتوویەتی دەزگاکانی حکومەت خەریکە بەتەواوی هەرەس بێنن و هەمووشی دەخەنە ئەستۆی(عزت پاشا) کە کابرایەکی سوپایی نەشارەزایەو هەرخەریکی بەرتیل وەرگرتنەو تاوانبار بەئاسانی دەتوانێ بەبەرتیل خۆی رزگاریکا.

ئینگلیزەکان بەرامبەر بەو لاوازیونەی تورك بەرامبەرپەروس دەستیان خستە کاروباری ناوخۆی عوسمانیەوەو ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ یارمەتیدانی

حکومەتو (کاپتن. تورتۆنی)ی ئینگلیز لە (موش)ەوە چوە بدلیس و لە ئەرزرۆم (کۆلۆنێل کوب) کرابە سەرۆکی چاودێرێکە رەکانی جندرمەکانی تورك، بەڵام تەقەلاکانیان بێ سوود بوو.

رۆژنامەی تایمسی لندەن لە مارتی ١٨٨٠ هەواڵێکی بڵاو کردەوە دەربارەی برسێتی لە ناوچەی موصڵ و دیاربکر لە کاتێکدا (١٢ هەزارکێلە ، کە هەرکێلەیەك ٢٥ پودبوە) لە ناوعەمارەکانی حکومەتدا هەبوە و خەڵك لە برسانا مردون کە چی(حسن پاشا)ی سەرکردەی هێز لە ناوچەی هەکاری هیچ نەبێ ئەوگەنم و جۆیەی ئەبوایە بەقەرز بدابە خەڵك هەتا کشتوکاڵی تازە پێدەگەیشت کە چی ئەو هەموو گەنم و جۆیەی بەبەرتیل و بەنرخێکی هەرزان فرۆشت بەقاچاخچیەکان و لە ئەنجامی ئەمەدا کوردە برسیەکان دەستیاندایە چەك و پەلاماری عەمارەکانیان داو هەروەکو پروفیسۆر خالفین لە لاپەرە ١١٠ی کتێبەکەیدا باسی کردوە موچەخۆرەکانی حکومەتیش لەو پەلاماردانانەدا کوژران.

ئەوبرسێتیەی بەسەر خەڵکدا هات، هەروەکو (یاکیماتسکی) باسی کروە و جلیلی لە باسەکەیدا ئاماژەی بۆ کردوە لە راپۆرتێکیا کە لە ساڵی ١٨٨٠دا لە ئەستەمبولەوە ناردوێتی و لە لاپەرە ٥١٧ی ئەرشیفی روسیادایە، باسی ئەوەی کردوە خەڵك لە برسان ناچاربون گۆشتی کە رو گژوگیا و رەگی روەك بخۆن بەهەزاران کورد ڕوویانکردە قونسوڵخانەی روس و داوای یارمەتیان لێ دەکرد.

لە مانگی مایسی ١٨٨٠دا سەرکردەی بتریارکی ئاسوری لە (میدیات) پەنای بردە بەر کیماتسکی یاریدەدەری قونسوڵی روس لە دیاربکرو تکای لێکردبوو بەهەزاران کوردی موسلمان بخرێتە ژێر سایەی روسەوە یارێگەیان بدرێتێ بچنە ناو خاکی روسەوە.ئەرمەنیەکانی ناوروسیا بەپارەو پول فریای هەندێ لە برسیەکان کە وتن وەکو رۆژنامەی (مشاك) باسیکردوە.

جلیلی ئاماژەی بۆ کتێبی (مناسبات بین الملل در صر امپریالیزم)أسناد أز ٦٣ ئارشیوی دولت تزاری (مەبەست روسی قیصری) چاپی شازدەهەمە شیربرگ لە لاپەرە ٦٣یدا وتراوە: ((تورکەکان هیچ سوودێکیان لە بەشداربوونی کورد

دەسگیر نەبوو لە شەڕی ڕوسدا چونکە کوردەکان بەقسەی سەرکردەکانی خۆشیان نەدەکردو خۆیان لە شەڕەکە دوور دەخستەوە)).

نووسەری کتێبی کورد و عەجم لە لاپەڕە ١٥٤ی سەرچاوە ٧٠دا ئەویش وەکو جلیلی دەربارەی بانگەوازەکە ی سوڵتان دواوە بۆ بەشدار بوونی کورد لە غەزادا و باسی ئەوەی کردوە شێخ عبیدالله لە ئەنجامی بەشداربوونیا لەو شەڕەدا پلەو پایەی لە جاران زیاترو بەهێزترو جێگیر تر بوەو شارەزایی و هۆشیاریی سیاسی شێخ زۆر قوڵ بوە و باشتر ئاگاداری دیوی ناوەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو گیرو گرفتەکانی بوە لە راستیی سروشتی دینیی دەولەتو ڕوالەتەکە ی بوەو باشتر لە مەبەستی جهادو غەزای عوسمانی گەیشتوەو زۆرتر شارەزای دەسەڵاتی کاریگەرانەی بێگانەو دەولەتەکانیان بوەو لە کۆڕی جەنگدا زۆرتر لە گەڵ گەورەپیاوانی تری کورد ئاشنایەتی و دۆستایەتی پەیداکردوە و لەوشەڕەدا هەندێ چەك و تفاقیشی دەسکە وتوەو زیاتر ناوبانگی لە ناوچەکە دا بڵاوبوەوە نەك تەنها وەکو شێخێکی شریعەتی ئاینی، بەڵکوو وەکو ناسراوێکی ئاینی و سوپایی و سیاسی ناوی دەدرەوشایەوە.

### سێهەم: ئامانجە سەرەکیەکانی شێخ عبیدالله و نەخشەی پرۆگرامەکانی

شێخ عبیداللەوەکو مرۆڤێکی نیشتمانپەروەر و خەمخۆری هاوولاتیانی خۆی، ئەگەرچی شۆڕشەکە ی ئەویش لە سەر بناغەیەکی عەشایری بوەو ڕێکخراوێکی سیاسی دانەمەزراندبوو بۆ سەرپەرشتیکردنی شۆڕشەکە ی لە رووی سوپاییو ئابوریەوە وەکو شۆڕشگیرەکانی تری بەرلە خۆی (بگرەهی دوای ئەویش) تووشی گەلێك هەڵە بوبوو بەلام تاڕادەیەکیش هەوڵی دابوو سوود لە بەسەرهاتەکانی پێش خۆی وەربگرێ و بۆ ئەومەبەستە هەندێ هەنگاوی نابوو کە دەتوانرێ بەکورتی باسی هەندێکی بکرێ وەکو:

**١- پێوەندی کردن بە سەرۆك عەشیرەتو دەسەلاتدارەکانی کوردەوە بۆ ئەوەی بەهێزو توانای هەموو لایەك ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە وەکو ئەوتەقەلا سەرنەکەوتووەی بدرخانیش لە کاتی خۆیدا دابووی.**

٢- هەوڵ وتەقەلای شێخ عبیداللە بوباشکردن و پتەوکردنی پێوەندی و دۆستایەتی لـە گەڵ کریستیانەکانا (بۆ ئەوەی ئەو هەلە یەی بدرخان کردبووی دوبارەی نەکاتەوە).

٣- دبلۆماسیەتی شـێخ عبیـداللە بـۆ پێوەنـدی کـردن بـەولآتانی دەرەوە بەمەبەسـتی دەسکە وتنی یارمەتی .

**١- تەقەلای یەکە می شێخ عبیداللە : پێوەندی کردن بەسەرۆك عەشیرەتەکانەوە**

شـێخ عبیداللـە هـەرچۆنیك بوویـێ کـە م و زۆر هـەواڵی هەڵوێسـتی سـەرۆك عەشیرەتەکانی کوردی بیستوە وە لە کاتی شۆڕشەکە ی بدرخاندا و باش لـەوە گەیشتبوو تورکە کان هەمیشە تەقەلای ئەوەیان دابوو لە ناوخۆیانا تێکیان بدەن و یزدان شێری برازای بدرخان کە لە مامی خۆی هەڵگەڕابوەوە نمونەیەکی زەقـی ئەو بەسەرهاتە بوو کە بوبوەهۆی سەرنەکە وتنی شۆڕشـەکە ی بدرخـان و شـێخ عبیداللە جگە لەوەی سەرکردەیەکی سیاسی بوو، توانیبووی بەهۆی پلەو پایـەی ئاینیەوە لە ناوکوردا دەسەڵاتێکی فراوانتر وەدەس بێنێ. ئارشاك سافرستیان لە کتێبەکەیدا (The kurds and kurdistan) چاپی لندن ساڵی ١٩٤٨ ئاماژەی بۆ باسێکی (ئا. ئا. ئاراکیان) کردوە بەناوی (کورد لە ئێران) دەربارەی تەقـەلاکانی شێخ عبیداللە بۆ یەککرتنی کورد وتوویەتی :

((بیری پێکهێنانی کۆنگرەیەکی عەشایری کـوردی لـە نـاو جـەماوەری کـوردا یـەکێك لـە ئاواتـەکانی شـێخ عبیداللـە بـوو. لـە کۆبونـەوەی سـەرۆکی ئـەو عەشیرەتانەی شێخ عبیداللە کۆی کردبوونەوە، بۆ ی دەرکە وتبوو هەتا نـەتوانێ هەموو هێزەکانی کورد یەك بخـا هـەموو تەقـەلادانێکی تـری بـۆ پێوەنـدی کـردن بەووڵآتانـەوە شـتێکی بـێ سـوودە بـۆ یـە لـەو کۆبونەوەیـەدا بـیری بـەرپاکردنی شۆڕشـێك باسـکراو ژمارەیـەکی زۆر لـە سـەرۆك عەشـیرەتەکان چوونـە ریـزی شۆڕشـگێڕانەوە کـە ناوچـەکانی شمزینـان و موکریـان و سـوران و شـارەزور و بادینـان و وان و گـەلێك شـوێنی تـر بـون بـەهاوکاری)). عوسمانیـەکان زۆریـاش ئاگاداری جم و جۆڵ و چالاکیەکانی شێخ بون و لەوە ترسـابون شۆڕشـێکی تـری کورد بەرپا بکرێ و دەربارەی ئەو کۆنگرەیـەی شـێخ عبیداللـە بەپەرۆشـەوە بـۆ

پێکهینانی تێکۆشابوو، دوکتۆر عزیز شمزینی له لاپەڕە ٥٩ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤٢دا دەقی ئەو وتارەی باسکردوە کە شێخ عبیداللە لە کۆبونەوەی کۆنگرەکە دا خوێندبویەوە کە وتوویەتی:

((٥٥٠ ساڵ لە مەوبەر ئیمراتوریتی عوسمانی دامەزرێنراو عوسمانیەکان بەناڕەوایی هاتنە سەرکارو پاش ٤٠٠–٥٠٠ ساڵ دوای دامەزراندنی عوسمانی دەولە ت لە ڕێبازی ئاینی ئیسلام لایداو ڕێگەی خوانەناسینی گرتەبەرو لەوساوە بێ دەسەڵات و لاوازە و ڕۆژلە دوای ڕۆژ لە ڕووخان و هەرەسهێنان نزیك دەبێتەوە و ئێستە گەیشتۆتە رادەیەك کە س گومانی لەوەدا نیە ئەم ئیمپراتۆریەتە بەم زوانە دەڕووخێ.

رۆڵە ئازیزەکانم: باگوێ بۆ ئامۆژگاریەکانی باووباپیرانمان شل بکەین وچی تر سەربۆ ستەم و چەوسانەوەی تورکە خوانەناسەکان شۆڕنەکەین و تەنها هەرکوردی ناووڵاتی عوسمانی نا، بەڵکو دەبێ کوردی ئێرانیش لە م دوو دەولە تە رزگار بکەین کە تەگەرە دەخەنە بەر پێشکەوتنمان.

باپیرانمان داواکاری ئەوەن هەموومان لە پێناوی ئاین و رزگاربوونی نیشتمانا تێبکوشین و بلیمەت و زانایان ووتویانە: کەڵك وەرگرتن لە بارودۆخی لە بار نیشانەی ژیری و زیرەکیە، ئیمڕۆ فارسەکان بەشەڕی تورکمانەوە خەریکن (مەبەستی ئازربایجان بوە) وهەموو هێزەکانیان ناردوە بۆ شەڕی ئەوناوچانە، کە واتە ئیمڕۆ هەلومەرجی دەسپێکردنی بزوتنەوەیەك دژی دەوڵەتی ئێرانی شتێکی لە بارو گونجاوە.

دەبێ ئەمەش بزانین فارسەکان ئەوپەڕەکە ی دەتوانن (١٠٠) هەزار شەڕکەر کۆبکەنەوە کە نیوەی زیاتری ئەوانە لە براکوردەکانی خۆمانن کە لەژێر چەپۆکی ئێراندان و ئەوکوردانەشی مەبەستەکانیان وەکو مەبەستەکانی ئێمەوایە.

لە بەرئەوەی بەشێکی بەپیتودەولە مەندی کوردستان لە ژێردەسەڵاتی ئێراندایە، بۆیە ئێمە لە سەرەتادا دژی دوژمنی بێهێز بزوتنەوەکەمان دەسپێدەکەین و لە ئەنجاما دەتوانین براکانووڵاتە بەپیتودەولە مەندەکە یان رزگار بکەین کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی سەرچاوەیەکی گرنگمان دەسگیر

بێت‌و دەتوانین بەم سەرچاوەیە دژی دوژمنەکانی ترمان(مەبەست تورك بوە) پشت ئەستور بین، بەلاّم تەنها هەر بەکێوەکانی خۆمان پشت ئەستورین ناتوانین ئازوقەوخواردن بۆ ئەوشۆڕشە گەورەیە دابین بکە ین.

ئایا هەلّوێست‌و بۆچوونەکانی ئێوە لەم ڕووەوە چیە؟ ئایا ئامادەن ڕێبازی بەرەوپێشەوە چوون بگرنەبەر؟ ئەگەر هەرشتێکتان هەیە لەورووەوە تکایە باسی بفەرموون)).

دوکتۆر شمزینی لە باسەکەیدا وتوویەتی: هەموو بەشداربوانی کۆنگرەکە ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ خەبات‌و گیان بەختکردن لە پێناوی کوردستانا (سەرچاوەی دوکتۆر شمزینی بۆ ئەم باسی گۆنگرەیەو وتارەکە ی شێخ عبیداللە بریتیە لە کتێبەکەی (کامساراکان) بەناوی هێرشی شێخ عبیداللە سالّی ۱۸۸۰ چاپی سانبترسبرگ، لاپەڕە۲۸-۲۹-سالّی۱۸۸٤.

دەربارەی ئەو کۆنگرەیە وەکو دوکتۆر جلیلی جلیل باسی کردوە لە کۆتایی مانگی ئەیلولی ۱۸۸۰دا کۆنگرەکە لە ناوچەی بادینان بەسرا کە ئەوانەی کۆبونەوە بریتی بوون لە (۲۱) خەلیفەو (٤۲-میرزا_کاتب) و (٦۸بەگ).

ئەوەی شایانی باسە، لە کۆبونەوەکە دا بڕیاردرا لەپێشدا شۆڕشەکە لە کوردستانی ڕۆژهەلاّت (ئێران)ەوە دەست پێبکا (وەکو شۆڕشەکەی بدرخان) و لە بەرئەوەی لەم کتێبەدا تەنها مەبەستمان باسی شۆڕشەکەی باکوری کوردستانەو لە کتێبەکەی سمکۆدا ـ چاپی ستۆکهۆلّم سالّی ۱۹۹٦ بەدوورودرێژ باسی ئەو شۆڕشەی شێخ عبیداللە کراوە لە کوردستانی ڕۆژهەلاّتدا، بۆیە لە دواییدا باسی ئەو شۆڕشەی باکور دەکەین بەسەرکردایەتی شێخ عبیداللە .

بێجگە لەو بڕیارەی کۆنگرە بۆ دەسپێکردنی شۆڕش لە ڕۆژهەلاّتی کوردستاندا کێشەیەك لە نێوانی ئەندامانی کۆنگرەکە پەیدابوو بەهۆی ئەوتەقەلا بێ وچانەی تورکە کان دابوویان بۆئەوەی ئەو کۆنگرەیە بەرەو سوودی خۆیان بەکێش بکەن و بۆئەومەبەستە چەند ئەندامێکی کۆنگرەیان ڕازی کردبوو کە بەشێوەیەکی یەککگرتوو بچن بەگژ ئەرمەنیەکانا، بەوجۆرە کۆنگرەکە بوو بە دوو بەشەوە هەروەکو (ئا. کارتسۆف) لە لاپەڕە ٦۸ی کتێبەکەیدا باسی کردوە.

تاقمی یەکە م بەسەرکردایەتی(شێخ فەهیم) لە لایەن تورکە کانەوە واخرابوە مێشکیانەوە کە بەپێی بەندی (٦١) ی پەیمانی برلین مەرجێکی تیادابوە کە دەبوایە خودموختاری بدرێت بەئەرمەنیەکانو تورکە کان وایان لەوتاقمە گەیاندبوو ئەو خود موختاریەی ئەرمەنیەکان لە سەرحسابی کورد دەبێو کورد لەوە زیانێکی زۆری پێدەگا.

بەلام هەروەکو دوکتۆر عزیز شمزینی لە لاپەرە ٥٨ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤٢ باسیکردوە شێخ عبیداللە رێگەی لە سەرگرتنی تەقەلای ئەوتاقمە گرت کە بەسەرکردایەتی شێخ فەهیم بوو، وەتوانرا لە سەرئەوە رێك بکە ون شۆڕش لە کوردستانی ئێرانا دەس پێبکاو دوای سەرکەوتن لەو شۆڕشەدا ئەوسا لە باکوری کوردستانیشدا شۆڕش دژی عوسمانی بکرێ.

## ٢- هەوڵوتەقەلای شێخ عبیداللە بۆ باشکردنی پەیوەندی لەگەڵ کریستیانەکاندا

لە باسی پێشوودا لەوە دوایین چۆن شێخ عبیداللە هەوڵوتەقەلاکانی عوسمانیەکانی پوچەڵ کرد کە دەیانویست کوردبکە ن بەگژ ئەرمەنیەکاناو شێخ عبیداللە لەوە گەیشتبوو باشکردنی پێوەندی لەگەڵ کریستیانەکانا، بەتایبەتی لەگەڵ ئەرمەنیەکان شتێکی پێویست بوە ولەوەش گەیشتبوو دەولەتە ئیمپریالیزمەکان، بەتایبەتی حکومەتی بریتانیا دژی بوونی هەموو جۆرە دەسەلاتێکی کوردبوەو هەمیشە هەولی ئەوەی دابوو ئەرمەنیو ئاسوریەکان لە کورد نزیك نەبنەوەو لەگەلیانا ناریك بنو لەولاشەوە کاربەدەستانی عوسمانی بۆ لاواز کردنی کورد و ئەرمەنی بەهەموو جۆرێك هانی دەرەبەگە کوردەکانیان ئەدا دژی ئەرمەنیەکان بنو بەلێنی ئەوەیان دەدانێ ئەگەر بەسەر ئەرمەنیەکانا سەربکە ون یارمەتیان ئەدەن و دەتوانن دەست بەسەر موڵك وزەویوزارەکانی ئەرمەنیەکانا بگرن، بەلام شێخ لە هەلوێست و پیلانی هەردولایان گەیشتبوو بەهەموو توانای خۆیەوە دەیویست تەقەلای عوسمانیەکان و دەولەتە ئیمپریالیزمەکان پووچەڵ بکاتەوەو لەو ڕوەوە دەرسو پەندی لە شۆڕشەکەی

بدرخانەوە وەرگرتبوو.لـەو ڕووەوە دوکتـۆر جلیلـی جلیـل کـە پسـپۆڕو شـارەزای پێوەندی کوردو ئەرمەنیە بەهۆی ئـەو گۆڤـارو ڕۆژنامـە ئەرمەنیانـەی لـەو ڕۆژە باسی پێوەنـدی کـورد و ئەرمـەنییان کـردوەو زۆریـەی ئـەو ڕۆژنامـە ئەرمەنیانـە هەوڵیان داوە دۆستایەتی نێوان کورد و ئەرمەنی بـەهێز بکـە ن ودەسـتی تورکـە کانیان خستوتە ڕوو لەو تەقەلایانەیان کە هەمیشە هەوڵی ئـەوەیان داوە کـورد و کریستیانەکان بەتایبەتی ئەرمەنیەکان ناڕێك بن و هەرجارە بەشێوەیەك لایەکیان هانداوە دژی لایەکی تر.

دوکتۆر جلیلی لە لاپەڕە ٩٧ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ١٨ باسی ئەرمەنیەکانی کردوە لەوانەی کە ئەوانیش وەکو شێخ عبیداللە لە مەبەستو نیازی تورکـە کـان گەیشتبونو ئاماژەی بۆ نامەیەکی (نوراتونکیان) کردوە کە بۆ (سـرڤاندازیان)ی فۆلکلۆر ناسی بەناوبانگی ئەرمەنی ناردبوو، لەونامەیەدا داوای لێکردبوو دەسبکا بـە نوسـین ولێکۆڵینـەوە دەربـارەی کـورد و بـۆی ڕوونکردبـوەوە ئـەرکی هــەرە گرنگـی سەرشـانی ئەرمـەن ئەوەیـە بەشـێوەیەکی ڕاسـتوباش لــە کــورد بگــاو هـەوڵبدرێ بـۆ بـەهێزکردنی دۆسـتایەتی کــورد و ئەرمــەن. جلیلــی لەوباســەیدا بایەخێکی زۆری داوە بەو هەوڵ و تەقەلایانەی (نوراتونکیان) کە بـۆ یەکـەم جـار هەوڵێکی وادراوە لە چوارچێوەیەکی فراوانداو بـە هەسـتێکی پێشـکەوتووخوازانە دۆسـتایەتی نێـوان کـوردو ئەرمـەن بـەهێز بکـرێ و ئــەو ڕقو قینــەی نێوانیــان نەهێڵرێ کەئەو کارە لەو ڕۆژانەدا شتێکی زۆر گرنگ بوە .

جلیلی بەرامبەر بەو تەقەلاو نیازە پاکانەی لـە هـەندێ ڕۆژنامـە ئەرمەنیـەکان بڵاودەکرایەوە بەراوردی کردوە لەگەڵ ڕۆژنامـەکانی عوسمـانی و ئەوروپاییـەکان کـە چۆن دژی یـەکگرتنو سـەرکەوتنی کـورد بـوون کـە شـێخ عبیداللــە بـۆ ی تێدەکۆشـاو هـەوڵی ئـەداو بەپێچەوانـەی ئەوڕۆژنامانـە ڕۆژنامـەی (ئەریڤیلیسـات مـاموول) لـە ژمـارە ٨٥ی سـاڵی ١٨٨٠دا وتـارێکی بڵاوکردبـوەوە بەوپـەڕی دڵخۆشیەوە باسی بەهێزکردنی پێوەندیی نێوان کوردو ئەرمەنی کردوەو ڕەخنەی لە هەندێ ئەرمەنی گرتبوو کە هەڵوێستیان باش نەبوە بەرامبەر بەکورد.

جلیلی لە باسەکەیدا ڕەخنەیەکی توندوتیژی لەو ئەرمەنیە بۆرجوازیانە گرتوە کـە پڕۆپاگـاندەی دوژمنـانی کـوردو ئەرمـەن کـاری تێکردبــون وستایشــی ئــەو

ئەرمەنیە پێشکەوتوو خوازانەی کردوە کە کوردیان شان بەشانی میللە تی ئەرمەنی، وەکو دوو میللە تی بەشخوراوو چەوسێنراو باسیانکردوە.

جلیلی باسی (کۆمەڵەی رۆژهەلات) ی ئەرمەنی کردوە کە لە ساڵی ١٨٦٠دا لە ئەستەمبوڵ دامەزرابوو بەسەرۆکایەتی دوو نووسەری ئەرمەنی (کاریگین شنادجیان) و (م. مووماجیان) کە یەکێك لە ئامانجەکانی ئەو کۆمەلە بریتی بوە لە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری لە ناو کوردەکاناو چالاکیی ئەو کۆمەڵە کارێکی وای کردبوو دۆستایەتی نێوان کوردو ئەرمەنی بەهێز بکات.

جلیلی لە لاپەرە ١٠٠ی هەمان کتێبدا باسی (نێرسیسان) ی مێژوونووسی سۆڤێتی کردوە کە لە باسێکیا بەناوی (خەباتی ئازادیخوازانەی گەلی ئەرمەنی دژی زۆردارێتی تورك لە ماوەی ساڵانی ١٨٥٠-١٨٧٠دا) کە ئەم نوسەرە لەوباسەیدا پشتی بە(مالخاسیان) ی زمان ناسی بەناوبانگی ئەرمەنی بەستوە کەوتوویەتی لە ساڵی ١٨٨٠دا چەند سەرۆکێکی بزوتنەوەی نەتەوایەتی دەچنە ئەودیوە قفقاس و لەگەڵ سمکۆیەکدا (بیگومان ئەبێ ئەم سمکۆیە جیاواز بێ لە سمکۆی شوکاك) کۆدەبنەوەو ئەویش بەڵێن ئەدا کورد و ئەرمەن دژی حکومەتی عوسمانی یەك بخا.

بێگومان لە ناو ئەرمەنیەکانیشدا هی واهەبوە دژی کورد بوەو هەروەکو جلیلی لە لاپەرە ١٠٠ی کتێبەکەیدا باسی کردوە رۆژنامەی (میگوئایاستان) دژی باسێکی ناو رۆژنامەی (مشاك) دواوە و رۆژنامەکەی میگو ئایاستان لە ژمارەکانی ٥٧ و ٦٠ ی مانگی تشرینی دوهەمی ١٨٨٠دا داوای بەهێزکردنی دۆستایەتی کورد و ئەرمەنی کردوەو رەخنەی لە ئەرمەنیە بۆرجوازیانە گرتوە کە کوردیان بە ناحەز و دوژمنی ئەرمەنی داناوە و وتویەتی نابێ هەڵوێستی کورد بەهۆی باری نالە باری ناوچەکە وە جەردەیی و راوو رووت ئەکەن ئەوە بە هەڵوێستی هەموو کورد بزانین و نابێ رەفتاری جووتیارە سادەکانی کوردو دەرەبەگەکانی هەوەکو یەك سەیر بکرێ.

جلیلی لە لاپەرە ١٠٢دا چوەتە سەر باسی ئاسووریەکان کە چۆن ئەوانیش دژی عوسمانی بون و مارشمعون بریارێکی دەرکردبوو هەرئاسوریەك دەسدرێژی بکردایەتە سەر کورد بە سەختی سزا ئەدرا و لەوروەوە باسی (پۆلیتیشن

کۆرسپۆندت) کردوه که پەیامنێرەکەی لە ڕۆژی ٢٤ ٨ ١٨٨٠دا لە ئەرزڕۆمەوە نامەیەکی بۆ ناردوەو وتویەتی: ((مارشمعون لە بەردەمی سەرکردەکانی بزوتنەوە چەکدارەکانیا ڕایگەیان کە پێویستە خەباتەکەتان تەنها ئاڕاستەی سەربازەکانی حکومەت بکرێت)).

جلیلی لە لاپەڕە ١١٠ی کتێبەکەیدا باسی کتێبی (G.wilson) ی کردوە بەناوی (Persian life) کردوە کە قسەیەکی شێخ عبیداللەی دوبارە کردوەتەوە کە وتوویەتی ئەگەر هاتو بوو بە دەسەڵاتدار ئەوا کریستیانەکانیش هەوەکو موسڵمانەکان مافی ڕەوای خۆیان دەبێ.

جلیلی باسی دوو تەقەلای سەرنەگرتووی شێخ عبیداللەی کردوە وەکو ژمارە ٨ی ساڵی ١٨٨١ی ڕۆژنامەی (پۆلتیشن کۆرسپۆندنت) دا باس کراوە، ساتێك شێخ عبیداللە هەوڵی دابوو لەگەڵ (ئەخیماندیت ـ ئوگانیس وارتابێت) لە باشقەڵا کە سەرۆکی ئەرمەنیەکان بوەو لەگەڵ مارشمعونیشدا یەکتر ببینن بۆ دانانی ڕێبازێك بۆ خەباتی هەردولایان دژی عوسمانی بەڵام هیچیان بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەچوون لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی بە ئەرمەنیەکان کردوە وەك لە تورك و ئێران وەکو لە سەرەتای باسی شۆڕشەکە دا باسی ئەوە دەکرێ جلیلی لە لاپەڕە ١٠٩دا باسی هۆی ئەو ڕێنەکەوتنەی مارشمعون و شێخ عبیداللەی کردوە کە هۆی سەرەکی ئینگلیزەکان بوە کە بەهۆی دبلۆماسیەکانیانەوە ڕێگەی ئەوەیان لە مارشمعون گرتبوو، بیانوەکەی مارشمعونیش ئەوەبو گوایا سەرۆکی ئاینی کورد توانای ئەوەی نیە لە دەولەتە ئەوروپاییەکان باشتر بۆ سوودی کریستیانەکان کاربکات و جێگەی ئەوان بگرێتەوە دەربارەی ئەو بیانوەی مارشمعون جلیلی ئاماژەی بۆ نامەیەکی (کامساران)ی یاریدەدەری کونسوڵی روس لەوان کە لە ڕۆژی ٢٩ ٤ ١٨٨٠دا ناردبووی وتویەتی:

((مارشمعون لای وایە ئەگەر ببێت بە لایەنگری کوردەکان ئیتر بەوە خۆی لە دەوڵە تە کریستیانەکان دوور ئەخاتەوە، هەروەکو لە لاپەڕە ٥٦ی ئا. ف. پ. باڵیۆزخانەی روس ساڵی ١٨٨٠دا تۆمارکراوە.

کامساران باسی ئەوەشی کردوە ساتێك لە مانگی مایسی ١٨٨٠دا مارشمعون کەوتبوو، مارشمعون بۆی باسکردبوو شێخ عبیداللە زۆری هەوڵدابوو موکاری بکەن لەگەڵ یەکتردا بەلام ئەو داخوازییەی بەباشی نەزانیبوو چونکە ی وابوو دەولەتە ئەوروپییەکان کێشەی کریستیانەکان لەگەڵ دەولەتی عوسمانیدا چارەسەر دەکەن.

هەروەکو لاپەرەی یەکەمی (کۆرسپۆندنت) ی ژمارە ٥ ی سالی ١٨٨٠باسیکردوە ئینگلیزەکان داوایان لە حکومەتی ئێران و تورك کردبوو سنورەکانیان کونترۆڵبکەن رێگە بەهاتوچۆی کورد نەدرێ لەوسنورانەدا چالاکی بکەن بۆ ئەوەی راپەرینەکە ی کورد لە ناوبچێت.

جلیلی لە لاپەرە ١١٠دا باسی گەشتی (کلایتون) ی کردوە (بێگومان ئینگلیز بوە) بۆ ماوەی دومانگ بەناوچەکەدا گەراوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی رادەی خۆئامادەکردنی شێخ عبیداللەو لە (کۆچانیس) چەند جارێك چاوی بە مارشمعون دەکەوێ و لەوێوە چوەتە لای شێخ عبیداللە لە شمزینان و پێشوازییەکی گەرمی لێکراوەو سید محمدی صدیقی ترجمانو عبدالقادری کوری شێخ عبیداللە چون بەپیریەوە و لە دوو دانیشتندا کلایتۆن باسی هەڵوێستی حکومەتی بریتانیای کردوە و لە شێخی گەیاندوە بریتانیا هەمیشە دژی هەموو جۆرە بەرەڵلایی و بێ یاساییەك دەوەستێ کە ببێتە مایەی هەرەشەو ترس بۆ ئیمپراتۆریتی عوسمانی و بەئاشکرا بۆ ئەوە هاتوە بۆ ناوچەی هەکاری تا راستەوخۆ شارەزایی بارودۆخی ناوچەکە ببێ.

جلیلی ئاماژەی بۆ (موروچ)ی ژمارە ٣٠ لاپەرە(٣٣-٣٤) سالی ١٩٦٠ کردوە کە لەوەدا باسی وەرامەکە ی شێخ عبیداللە تۆمارکردوە کە بەکلایتۆنی ووتبوو لە رووی ئاسایشەوە ولاتەکەی هیچ کەموکورییەکی تیادا نیەو ئەو درۆو دەلەسانەی بەدرۆخستۆتەوە دەربارەی ناوچەی دەسەلاتی ئەو بلاوکرابوەوە.

جلیلی لەلاپەرە ١١٣ دا ووتویەتی ئەو گەشتەی کلایتۆن لەو رۆژانەدا بوە شێخ خەریکی پێکهێنانی کۆنگرەی سەرۆك کوردەکان بوە و بێجگە لە شێخ عبیداللە کلایتۆن گەلێك سەرۆك کوردی لە ناوچەکانی شمزیناندا بینیوە و گفتوگۆی لە گەلا کردبوون.

### ٣- دبلۆماسیەتی شێخ عبیداللە و پێوەندیکردنی بەدەوڵەتانەوە

شێخ عبیداللە وەکو لە زۆر هەڵوێستیا ڕوون بوەتەوە زۆر دووربینانە بۆ کێشەی کورد و مافی میللە تی کورد چوەو هەوڵێکی زۆری داوە لە گەڵ دەوڵەتانا، بەتایبەتی روسیاو بریتانیا پێوەندیی خۆی بەهێز بکا بەئومێدی ئەوەی ئەو دەوڵەتانە لە میللە تی کورد بگەن و بەچاوێکی دوژمنانەوە سەیری نەکە ن و باوەڕ بەو ڕاپۆرتو کتێبانە نەکەن کە گەڕیدەو میسنێرەکان بەهۆی کارتێکردنی کاربەدەستانی حکومەتە داگیرکەرانی کوردستانەوە پێیان گەیشتبوو بڕواناکەن وبەهەڵوێستی خۆیان بچنەوە، بەڵام تەقەلای ئەو دوو دەوڵەتە دەسەڵاتدارەی ئەو ڕۆژانە بێ سوودبوەو دووڕوویی ئەو دوو دەوڵەتە لە سیاسەتیانا بەرامبەر بەکورد پیشەیەکی هەمیشەییان بوەو هەردولایان سوور بون لە سەر ئەوەی نابێ بزوتنەوەی کورد ببێتە هۆی پەیدابونی هیچ جۆرە کێشەیەك لە ناوئێران و وڵاتی عوسمانیدا بۆ ئەوەی نەوەکو لایەکیان کورد بکەن بەلایەنگری خۆیان و دژی بەرژەوەندی لاکەی تر بەکاری بێنن. بەداخەوە کورد خۆشی، بەتایبەتی سەرکردەکانی ئەوەیان لە بارانەبوە نەخشەیەکی ڕێكو پێك بکێشن بۆ شۆڕشەکانیان و هەرکە چاویان بەوەکە وتوە ژمارەیەك چەکداریان لە دەور کۆبۆتەوە ئیتر حسابێکی زۆر کورت بینانەیان کردوە و کورد هەمیشە ئێجگار کۆڵ بوە لە دەسنیشانکردنی دۆستو دوژمنی خۆیداو بە هەڕەمەیی چوە بۆ ڕووداوەکانو ساویلکانە بەقسەی لووس هەڵخەلەتاوەو لە خشتە براوە دەربارەی هەڵسەنگاندنی سیاسەتی بریتانیا و سوپا بەرامبەر بەکورد، شێخ عبیداللە لای وابوە شوینی ستراتیجی خاکی کوردستان شتێك نەبوە رووسەکانی دراوسێی کورد فەرامۆش بکەن، بۆیە وای بیرکردبوەوە ئەگەر شەر لە نێوانی کوردو عوسمانیدا ڕوویدا ئەوا رووسەکان لە پێناوی سودی خۆیانا لایەنی کورد دەگرن بەپێچەوانەی سیاسەتی ئینگلیزەکان کە لە زەمانی بدرخانەوە ڕوون بوەوە دژی کورد دەوەستن و لە هەڵبژاردنی دوستدا لە نێوان روسو ئینگلیزدا شێخ وتوویەتی پیاو بۆ دۆستایەتی خۆی شێر هەڵبژێرێت نەك ڕێوی (شێخ لەوەدا روسی بەشێر داناوەو ئینگلیز بەڕێوی، بەڵام لە راستیدا هەردوکیان بەرامبەر کورد هەر ڕێوی بوون). شێخ عبیداللە بەپێی ئەو بۆ چوونە خۆی،

وەکو دوکتۆر جلیلی جلیل باسیکردوە، دووجار بەپەلە (یوسف ئاغا) ی ...ی پیکراوی خۆی ناردبوەلای قونسوڵی روس لە (وان) و بارەهاش پێوەندی ... نویترمیلن) ی قونسوڵی روس کردبوو لە (ئەرزروم) و ئاگاداری کردبوون لە ...تەکەیدا دژی تورک پشت ئەستووره بەوان بەڵام ئەو تەقەلایەی هیچ ...وودێکی نەبووە.

لەو رووەوە (پرۆفیسۆر خالفین) لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ۱۰۲دا باسی ...ۆماسیو سیخورەکانی روسیای کردوەلە ئێران و لە باکوری کوردستان کە چۆن ئاگاداری هەڵسوکە وتی شێخ بون وشارەزای باری ئابوری و سیاسی ...کومەڵایەتی ناوچەکە بون وسیاسەتیان بەرامبەر بەکورد بریتی بوە لە ستراتیجیەتو بەرژەوەندیەکانی خۆیانو خالفین لەوکتێبەیدا پوختەی هەندێ لەو ...پۆرتانەی خستۆتە بەر چاو کە بریتین لە:

۱ــ پێویستە هەموو داخوازیەکانی کورد پشت گوێبخرێ.

۲ــ پشتی حکومەتەکانی مرکزی بگیرێت بۆ دابین کردنی ئاسایشیان (مەبەستی ئێران و عوسمانی بوە).

۳ــ پشتگیری کریستیانەکان بکرێت چونکە لە کوردەکان پێشکە وتووترو زیرەکترن و زۆر زوو فێری شت دەبن و لە کوردیش دەوڵە مەندترن.

نوسەری کورد و عەجەم سەرچاوە ۷۰ لە باسی هەڵوێستی روسەکانا وتویەتی: لە دوای سەپاندنی پەیمانی (گولستان) لە ساڵی ۱۸۱۳دا وپەیمانی (تورکمانچا) لە ساڵی ۱۸۲۸داو بەدوای ئەوانەیش پەیمانی (سان ستیڤانۆ) لە ساڵی ۱۸۷۷داو پەیمانی برلین لە ساڵی ۱۸۷۸دا رووسەکان سوودیان لە کوردەکان دەسگیر بوبو، هەرلە کۆنەوە هەندێ تیپی پیادەو سوارەیان لە کوردەکان پێك هێنا بوو، ئەو هێزەی روسەکان لە ساڵی ۱۸۲۹دا لە موسلمانەکان دروستیان کردبوو یەکێك لەو هێزانە لە کورد پێك هاتبوو، لە شەری قرم دا لە ساڵانی ۱۸۵٤-۱۸٥٦ لە نێوان روس و تورکدا، روسەکان دووتیپیان لە کوردەکان پێك هێنابوو یەکێکیان لە کوردەکانی ئێران و ئەوی تریان لە کوردەکانی (یریڤان) بون و لە شەری ساڵی ۱۸۷۷دا روسەکان لە (۳۰۰) کورد تیپێکیان دروستکردبوو.

(مینۆرسکی لە لاپەڕەکانی ٨٢-٨٣ ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٩٣ بەدوورودرێژ باسی ئەو تیپە کوردانەی کردوە وتویەتی هەموویان کرێگرتە بون چونکە روسەکان بەدوای کرێگرتەدا دەگەڕان نەك دۆست). بێگومان هەروەکو لە ڕووداوەکانا ڕوون بۆتەوە سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بە کورد زۆرتر ئاشکرا بوە وەك لە هی روس، چونکە بەهیچ جۆرێك و لە هیچ کاتێکدا لایەنی کوردی نەگرتوە و رەنگە هی واهەبێ بپرسێت: ئایا شێخ عبیدالله ئەگەر هەوڵی بدایە تۆ بڵێی نەیتوانیایە ئینگلیزەکان بکا بە دوژمنی خۆی و کورد؟؟ . لەوەرامدا، ئەگەر بەوردی لە سیاسەتی ئینگلیزەکان بکۆڵینەوە دەرئەکەوێ ئینگلیز لە سیاسەتیانا زۆر ووشکن و لەمێژە بەرامبەر بەکورد سیاسەتەکە یان قالبێکی تایبەتی وەرگرتوە و بەلام لام وایە دوو مەرجی سەرەکی هەیە کاریکاتە سەر سیاسەتی ئینگلیز:

یەکەم: بریتیە لەوەی ئینگلیزەکان بەپێی سیاسەتی دوەلیەقالب گرتوەکان دەجوولێنەوە و هەرکاتێك گوڕانکاریەك بەسەر ئەودا هات ئەوسا دوورنیە ئەوانیش لە سنووری چوارچێوەی بەرژەوەندیی خۆیانا سیاسەتیان بەرامبەر بەکورد بگۆڕن ئەوسا ئەوانیش نایانەوێ واز لە دەسپێشکەریکردنی خۆیان بێنن و بەپێی ئەوە سیاسەتیان ئەبەن بەڕێوە.

دوەم: بریتیە لە هەڵوێستو ڕۆڵی کورد خۆی و لە رادەی پێشکەوتنی و پێگەیشتنی جلیلی پاکی یاخی بوو لە هەموو نەریتو رەوشتی کۆنی عەشایری و ناوچەگەری کە بەداخەوە وەکو تائێستەش ئەوکاژە کۆنەی لە بەری خۆی دانەماڵیوەو هەروەکو چۆن کوردی کۆچەری لەسەر کوێخایەتی و ئاغایەتی و شوێنی لەوەڕگای مەڕومالات و ئاژەڵەکانیان لە گەڵ یەکتردا ناڕێك بون، لە زەمانی بدرخانوشێخ عبیدالله وە هەتا ئیمڕۆش هەرهەمان بەزم دووبارە بوەتەوە و هیچ کوردێك بەسەرکردایەتی و لێ هاتوویی کوردێکی تر قایل نەبوەو نابێ و ئامادەیە لە پێناوی ئەو کەللەڕەقیو بۆ چوونەی خۆیا نەك هەرسەرو ماڵی خۆی بەڵکو سەرو ماڵی هەموو کورد و نیشتمانیش پێ شێل بکاو بیخاتە مەترسیەوە ! !

له راستیدا وەنەبێ شێخ عبیدالله تەقەلای ئەوەشی نەدابێ لە ئینگلیزەکان نزیك بێتەوە ئەگەر چێ سوور زانیبووی تەقەلاکە ی بێ سوود دەبێ.

لەورووەوە جلیلی جلیل لە لاپەرە ١٧٤ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ١٨ باسی نامەیەکی شێخ عبیدالله ی کردوە کە ناردبووی بۆ (دوکتۆر کوهران) ، دوکتۆر جمال نەبەز لە کتێبەکەیدا سەرچارە ٣١ بە:

(Dr. joseph kochran) ناوی بردوە (ئیگلتن لە سەرچاوە ١٧دا بەهەمان جۆر ناوی بردوە).

جلیلی وتوویەتی شێخ عبیدالله ئەو نامەیەی لە ٥ ی تشرینی یەکەمدا ناردوە کە لەو نامەیەدا وتوویەتی:

((مەلا سمایلم نارد بۆ ئەوەی بەنەهێنی وەك پێم وتوە دۆخی ئێرەتان بۆ روون بکاتەوە، تکائەکەم دۆخی کوردستان و سەفەری کورەکەم بۆ (سند) بەراستی بەحکومەتی بریتانیا بگەیەنن و روونی بکەنەوە. گەلی کورد کە لە (٥٠٠) هەزار بنەماڵە پێك هاتوە میللەتێکی تایبەتیە، ئاینەکەیان لە ئاینی ئەوان جیاوازە (مەبەستی ئەوەبوە کورد سونی و ئێران شیعەن))، خاوەنی نەریت و رەوشت و خووی تایبەتی خۆیانن، لە ناو میللە تانا بەنەوەیەکی تووڕەو کە للە رەق و دڕوبێ رەوشت ناوئەبرێن. بەو جۆرە لە کوردستان ئەدوێن، ئەگەر یەکێك لە ناویانا کردەوەیەکی نارەواو ناشرینی لێ بوەشێتەوە ناوی هەزارەها پیاوچاکانی لە گەڵدا لەکەدار ئەکرێت، ئەم هەموو سیفەتە خراپانە لە لایەن کاربەدەستانی عوسمانی و ئێرانەوە بەخۆڕایی بۆ کورد دروستکراون و بەزۆر پێوەی ئەلکێنن. کوردستان لە نێوان ئەو دەولە تەدا بەش کراوە، ئەو دەولە تە ئەوەندەیان لە بارانیە چاكوخراپ لێك جیابکەنەوە، ئەگەر یەك کەس خراپەیەك بکا ئەوە هەزاران کە سانی بێ تاوان بەهۆی ئەوەوە توشی ئازارو دەردەسەری ئەبن، بەم جۆرە پیاو خراپەکان دەمێننەوە و چاکەکانیش تیا ئەچن. بێگومان ناوی علی ئاغای شکاکتان بیستوە، ئەوەی ناوی بەکردەوەی خراپ و نارەوا دەرکردوە و ئەوەی وەك چۆن ئەزیەتی خاوەن تەریقەکانی بێگانە ئەدا بەوجۆرەش دەسدرێژی ئەکردە سەر موسڵمانەکانیش‌و هەردو دەوڵەتەکەش ئاگایان لە کردەوە خراپەکانی بوو، جائەگەر دەسەلاتی ئێران قایمتر ببێتو

زەبرو زەنگیش پـەیدابکا ئـەوا خـەڵك و خـوا کـە هـەرگیز وەك جـاران دوورلـە شارستانیەتو بەدواکە وتوویی ئەمێننەوە، تاوانەکە ی خێڵی هەکاریش لـە نـاو دەوڵـە تـی عوسمـانیدا دیـارو ئاشـکرایە، حکومـەتی عوسمـانیش وەك حکومەتی ئێران، یان خۆی لە پێشخستنی ئەم میللە تە گێـل ئـەکا یابـەچاوێکی نزمەوە سەیری ئەکات، هەمیشە بەسووکیەوە سەیری کوردستان ئەکرێ، یەکێتی نیـە، سـەرۆك وبەرێوەبـەرەکانی کوردسـتان گەیشتونەتە بڕیـارێك و هـەموویان لەوەدایەك دەگرنەوە ئیتر لە تواناادا نـەماوە لـە ژێـر سـایەی ئـەو دوو دەوڵەتـەدا بژین و ئەبێ شتێك بکەن دەوڵەتە ئەوروپاییەکان ناچار بکـا لـە بـارودۆخی کـورد وردببنـەوە و لێـی تێبگـەن کـە ئێمـەش میللـەتێکی دابەشـکراوین، ئەمانـەوێ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆی وڵاتەکە مان بەدەس خۆمانەوەبێ، خۆمان سزای ئەوانە بدەین لە ڕێی ڕاست لائەدەن، ئەو مافانەمان هەبێ میللەتانی تـر هەیانـە، خۆئەگـەر هـاتو کردەوەیـەکی نـاڕەوا ڕوویدا ئـەوا بـەڵێن بـێ زیـانی بـۆ هیـچ میللەتێکی تر نەبێ، نیاز لـە چوونـی کوڕەکـەم بـۆ (سـنە) لێکۆڵینـەوەی دۆخـی کوردستانە و ئەبێ لاقەی نەکرێ و ئەگەر دەسـدرێژی کرایـە سـەری ئـەوا هـەموو کوردستان ڕاست دەبێتەوە چونکە میللەت لە توانایا نەماوە لەوەزیاتر زۆرداریو خراپەی بێووچانی ئەو دوو دەوڵەتە هەڵگرێ)).

دەربارەی (شاری سنە) کە لە نامەکە ی شێخدا باس کراوە نووسەری کتێبـی کوردو عەجەم لای وایە مەبەستی شێخ شاری سابلاخ بوەنەك شاری سنە، بـەلام دووریش نیە مەبەست شاری سنە بووبێ چونکە شێخ وتوویەتی بۆ لێکۆڵینەوەی دۆخی کوردستان چوە بۆ سنە (کە بە ئوستانداری سنە دەوترێ کوردستانو بەر لـە شـێخ عبیداللـە مـیری ئـەردەلان لـە سـنە پێونـدی بەکۆنگرەکـە ی زەمـانی بدرخانەوە هەبوە کە پەیمانی پیرۆزیان مۆر کردبوو).

دەربـارەی ئـەو دوکتـۆر (کوهـران)ـەی جلیلـی باسـی کـردوەو ڕاسـتیەکەی کۆچران بوە، ئیگاتن لە کتێبەکەیدا زۆربەقەدو بالایا هەلداوەو هێرشی توندوتیژی بردوەتە سەر شێخ عبیدالله و بەپیاوکوژو ڕاوو ڕووتکە ر ناوی بردوەو وتوویـەتی شێخ چاکەی دوکتۆر کۆچرانی بیرچوبوەوە کە وەختی خۆی چارەسەری کردبوو لە نەخۆشیەکەی (ذات الرئە).

دوکتۆر جمال نەبەز لە لاپەڕە ٩٠ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٣١دا بەرپەرچی ئەو بۆ چوونەی (ئیگلتن) ی داوەتەوەو ئەو درۆو دەلە سانەی ئەوی بەشتێکی بێ شەرمانە داناوەو بۆ یە درۆخستنەوەی ئیگلتن، دوکتۆر جمال نەبەز ئامـاژەی بۆ کتێبەکەی (مینورسکی) کردوە کە لەوەدا هەڵوێستی شێخ عبیداللەی داناوە بەنایابترین هەڵوێستی مێژوویی.

بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی دوکتۆر کۆچـران، لە لاپەڕە ١٢٥ی کتێبەکەی سمکودا چاپی ستۆکهۆڵم ساڵی ١٩٩٦ بەدوورو درێـژ باسیم کردوە کە هەرچەند کۆچـران دوکتـۆری نەخۆشـی بـوە و یارمـەتی خـەڵکی دابـوو لـە ڕووی تەندروستیەوە، بەڵام لە راستیدا نوێنـەری ئینگلـیز و ئەمریکاییـەکان بـوەو بەخۆرایی شێخ عبیداللە ئـەو نامەیەی ئاڕاسـتەی ئـەو نـەکردوە و لـە ڕووی سیاسیەوە خزمەتی میللە تی کوردی نەکردوە بەڵکو بەپێچەوانەوە ساتێك شێخ عبیدالله شۆڕشەکەی لە ئێراندا دەست پێکردبوو ئابلوقـەی هـێزی ئێرانیـەکانی دابوو، ئەو هێزەی ئێران حاڵی شـڕیوەو چاوەڕوانی ئـەوەبوە یارمـەتیی بگاتـێ و لەو هەڵویستەدا کۆچران خۆی واپیشان دابوو دەیویست کارێکی وابکا هێزەکەی ئێران بەچەند مـەرجێك ئامادەیـە خـۆی بدابەدەستەوە کە سـاتێك شـێخ لـە سەرشاخی (سەنێر) بوەو ئەو تەقەلادانەی کۆچران کە کەوتبوە نێوانیانەوە تەنها بۆ ئـەوەبوە هێرشـی شـێخ عبیداللـە بـۆ سـەر ئێرانیـەکان دوابخا هـەتا هـێزی یارمەتیدەری دەگاتێ ولە راستیشدا تەقەلاکـە ی کۆچـران سـەری گـرت و هـێزی ئێران یارمەتی پێگەیشتوو شێخ عبیدالله دەرفەتێکی باشی لە کیس خۆی دا.

### *چوارەم*: دەسپیکرنی شۆڕشەکەی شێخ عبیداللەو ئە نجامەکەی

وەکو لە باسی کۆبونـەوەی سـەرۆك عەشیرەتەکانا بەسـەرۆکایەتی شـێخ عبیداللـە کـە دوکتـۆر عزیـز شمزینـی ووتبـووی کوبونەوەکە لە مـانگی تـەموزی ١٨٨٠دا بوە و جلیلی ووتبوی لە مانگی أیلولی ١٨٨٠دا بوەو، لـەو کۆبونەوەیـەدا بڕیاردرا لەپێشـدا شۆڕشـەکەیان لـە ڕۆژهـەڵاتی کوردستانا (کوردستانی ئـێران) دەس پـێ بکـەن و لـە کتێبەکـە ی سمکـۆدا باسـی ئەوشۆڕشـەم لە لاپـەڕەکانی

١١١-١٤٦كردوه بۆیه لێرەدا پێویست ناكا ئەوەی كوردستانی ئێران دووبارەی بكەمەوە كە ئەنجامی ئەو شۆڕشە بەوە گەیشتبوو شێخ عبیدالله شكاو هەروەكو شۆڕشەكەی بدرخان ئەویش ناچاركرا بگەڕێتەوە بۆ باكوری كوردستان و گەڕانەوەی پاشماوەی هێزەكەی شێخ عبیدالله بۆ ناو وڵاتی عوسمانی بوو بەهۆی كێشەیەكی دورو درێژ لە نێوان دەولەتی عوسمانی و قاجاریدلو حكومەتی ئێران داوایان لە حكومەتی عوسمانی كردبوو شێخ عبیدالله یان بداتە دەس بۆ ئەوەی سزای بدەن و لەوەدا روسیاو بریتانیا لایەنگری ئێران بون و بەجووتە بەتوندی داوایان لە كاربەدەستانی عوسمانی كردبوو سزای شێخ عبیدالله بدات.

دەربارەی شۆڕشەكەی شێخ عبیدالله لە باكوری كوردستانا دوای گەڕانەوەی بەشكاوی لە شۆڕشەكەی ئێرانا گەلێك سەرچاوە باسیانكردوە كە بەلای منەوە دوكتۆر جلیلی جلیل لە كتێبەكەیدا سەرچاوە ١٨ لە هەموان دورودرێژترو تیروتەسەلتر و بەپێی بەلگەنامەكانی رۆژانە لێی دواوە، بۆ یە هەولئەدەم كورتەیەكی ئەو باسەی دوكتۆر جلیلی باس بكەم.

جلیلی لە لاپەرە ١٤٠ی سەرچاوە ١٨دا وتوویەتی:

((دوای ئەوەی شێخ عبیدالله گەڕایەوە بۆ باكوری كوردستان، حكومەتی ئێران داوای لە ئەستەمبوڵ كرد شێخ عبیدالله بەگیراوی بنێرێت بۆ ئێران و لەوەدا حكومەتەكانی بریتانیاو نەمسا پیشتگیری ئەوداخوازیەی ئێرانیان كرد (لەورۆژانەدا حكومەتی ئێران چەند ئەفسەرێكی نەمساوی بەكرێ گرتبوو بۆ ناوسوپاكەی خۆی). حكومەتی ئێران بۆ ئەو مەبەستە (عقید مرزاخان) ی یاوەری شاو (فۆن لێتنیور) ی نەمساوی نارد بۆ (وان) و داوای لە كاربەدەستانی عوسمانی كرا شێخ عبیداللەیان بداتە دەست، بەلام داخوازیەكەیان سەری نەگرت و گەڕانەوەو لە تارانەوە یاداشتێكی حكومەتی ئێران نێررا بۆ عوسمانی و لەوەدا حكومەتی توركیان بەوە تاوانبار كرد كە ئەو هانی شێخ عبیدالله ی دابوو ئەوشەڕە لە ئێران بكاو حكومەتی عوسمانیش ئێرانیەكانی بەوە تاوانبار كرد حكومەتی ئێران رێگەیان دابوو بەكوردەكانی ئێران لەناو وڵاتی عوسمانیدا لە بغداد و موصلّ و وان تالانی بكەن (هەروەكو لە لاپەرە ١١٤ی كتێبەكەی سمكودا

ـكرلوه، ئیبراهیم صفائی وتوویەتی مـرزا سـعیدخان وەزیـری دەرەوەی ئـێران
ـوه).

جلیلی لە کتێبەکەیدا ئەڵێ: هەر کە شێخ لە ئێرانەوە گەیشتەوە ناوچەکە ی خۆی دەسبەجێ نامـەی نـارد بـۆ سـەرۆکەکانی کوردو داوای لێ کردن خۆیـان ئامادەبکەن بۆ شۆڕشێکی تازە لە پێناوی کوردا. هەرچەند شێخ پشتی بەوە نەبەستبوو بەروسەکان ئەگەر شۆڕشیکی تـازەە کرد بـەڵام چارناچار لـە سـاڵی ١٨٨١دا (خەلیفە محمدسعید) ی باوەڕپێکراوی خۆی ناردە لای (کامسـاراکان) و داوای لێکردبوو ئەو کوردانـەی لـە کـاتی خۆیدا بـەناچاری لـە ئێرانـەوە پـەنایان بردبوە بەر خاکی روسیا ڕێگەیان پـێ بدەن بگەڕێنـەوە بـۆ ناوچـەی هـەکاری و کامسـاکاران بەپەلـە ئـەو داخوازیـەی گـەیان بـە( نیلـدۆف) ی بـاڵیۆزی روس لـە ئەستەمبوڵ و بۆی نووسیبو کە خلیفە محمد سعید ڕای گەیاندبوو شێخ عبیداللـە ئامادەنیە بچێتە ئەستەمبوڵ چونکە کەم و زۆر باوەڕی بە کاریەدەسـتانی ئـەوێ نیە و تەنها مەرجێك کە بەپێی ئامادە دەبێ بچێتە ئەستەمبوڵا ئەوەیـە دڵنیابـێ لەوەی روسیا پشتگیری دەکا (کە سەرچاوەی جلیلی بۆ ئەمە بریتیە لە "ئا. ف. پ. ر، ف. باڵیۆزخانەی روس ساڵی ١٨٨١ لاپەڕە ٣١) شێخ عبیداللـە نامەیـەکی ناردبوو بۆ (شێخ خەلیفەی ئەلاشکیری) کە لەونامەیەدا وتبوی:

((بـەردی بناغـەی ڕاپەڕینەکـە ی بریتیبـوو لـە هیـوای هاوکـاریکردنی کـورد لەگەڵیا، بەڵام لە ئـەنجامی تاقیکردنـەوەدا بـۆ ی دەرکـە وت دوژمنایـەتی چـەند سـەرۆکێکی کـورد بەرامبـەر بەئەرمەنیـە ئاشـتیخوازەکان زیـانێکی گـەورەی بـە بزوتنەوەکە ی گەیان، لەبەر ئەوە یەکێتی نێوان کوردو ئەرمەن لە کۆڕی خەباتی ئازادخوازیدا شتێکی پێویستە. من باوەڕم بەئەرمەن زیاتر هەیە وەك لـە ئـێران و تورك (لە گەڵ ئەوەشدا ئەرمەنیەکان نەچووبون بەدەم بانگەوازەی شـێخەوە بـۆ هاوکاریکردن لە گەڵ یەکتریدا وەکو لە باسی تەقەلادانی شێخ عبیدالله دا دەرکە وت کـە چـۆن تەقـەلاکانی بـۆ باشـکردنی پێوەنـدی لەگـەڵ ئەرمەنیـەکانا بـێ هوودەبوە))، من وام لاباشە لە گەڵ ئەرمەنیەکانا بین نەك لە کە ل تـورك و ئـێران چونکـە ئـێران حـەز بـەچارەمان ناکـاو تورکیش هەمیشـە دەیانـەوێ بمانکـەن بەداردەستی خۆیان.

شێخ داوا لە شێخ خەلیفەی ئەلاشکیری دەکا بەرۆکی ئەرمەنیەکان بەرداو نەکا بەزمانی لووسی تورکەکان بخەڵە تێ دژی ئەرمەنیەکان. لە نامەکەیدا لە سەری ئەرواو ئەڵێ:

((برام، تکات لێدەکەم واز لە ئەرمەنیەکان بێنەو بەرق‌و کینەوە ڕەفتاریان لەگەڵا مەکە و حەقت بەسەریانەوە نەبێ و لێیان گەڕێ با بە ئارەزووی خۆیان لە گەڵ تورکدا پێوەندییان هەبێ و گوێ لە کەس مەگرە باوەڕ بەکەس مەکە چونکە بۆ م دەرکە وتوە ئێمە کە بەدەست تورکە وەین وەکو بووکە شوشەیەك واین و هیچی‌تر)).

خەلیفەی ئەلاشیکری لەوەرامەکەیدا تاعەت‌و ملکە چیی خۆی پیشانی شێخ داوە بەڵام بەکردەوە ملی نەداوەو رازی نەبوە بەدەنگیەوە بچێت (لە سەرچاوەی جلیلی بۆ ئەمە بریتیە لە لاپەڕە ٢٢٩-٢٣٠ ی کتیبەکە ی ئەڤریانۆڤ).

جلیلی لە لاپەڕە ١٤٧دا لە باسی شۆڕشەکە ی شێخ عبیداللەدا وتویەتی کە دەستی کرد بە شۆڕش نەك تەنها هەر کورد بەڵکو عەرەب و گەلێك لە ئاسوریەکانیش چوون بەدەنگیەوە و لە تشرینی دوهەمی١٨٨١دا نزیکی پێنج هەزار چەکداری عەرەب لە ویلایەتی بغدادو موصڵەوە گەیشتنە بارەگای شێخ و ئامادەیی خۆیان پیشاندا کە شێخ خۆشی پێنج هەزار چەکدار لە ژێر فرماندەیدابوو.

جلیلی ئامـاژەی بۆ (ئا. ف. پ. ر. باڵیۆزخانەی روس، لاەپەرە ١٣سالی ١٨٨١کردوە کە لەوەدا باسی ئەوە کراوە شێخ بۆ ئەوەی چەك و ئازووقە بۆ شۆڕشەکە ی دابین بکا بەنەهێنی پیوەندی کردوە بەهەندێ لە مووچەخۆرەکانی تورك و نوینەری خۆی ناردبوو بۆ لای قائمقامی (شاتاخ) بۆ ئەوەی چەکی بۆ بکرن و شێخ بایەخێکی زۆری دابوو بەمەشق پێکردنی چەکدارەکانی خۆی و بۆ ئەو مەبەستە (٣٦) ئەفسەری خانەنشینی هێنایە لای خۆی و هەریەکە ی مانگی دوولیرەی بۆ بریبوونەوە.

شێخ بۆ ئەوەی ئاسووریەکان بەلای خۆیا راکێشێت چەند جارێك نامەی ناردبوو بۆ مارشمعون و لە سەرەتای ساڵی ١٨٨١دا شێخ (مطران ئیسکو) ی

ئاسوری که له نزیك شمزینان دەژیا ناردی بۆ لای مارشمعون که لە (کوچانیس) حو.

دەربارەی ئەوە رۆژنامەی (مشاك) ی ئەرمەنی ژمارە ٤٦ ساڵی ١٨٨١ باسی ئەوەی کردوە مارشمعون: لە گەڵ (١٥) کەس لە (مەلیك)ەکانی بەسەرکردەکانی هێزی ئاسوری وتراوە مەلیك)، بەڵێنیاندا بەشێخ ئەگەر ئەو جارێکی تر دژی ئێران راست بێتەوە ئەوان پشتگیری لێ دەکەن.

(له پەراوێزی لاپەڕە ٢٤٥ی کتێبەکە ی جلیلی‌دا وتراوە دەنگو باسێك هەبوە مەلیکه کانی مارشمعون گوێیان نەدابوە خواستی مارشمعون بۆ لایەنگرێتی شێخ دژی ئێران، بێجگە لەوە وادیارە ئەگەر لایەنگریش لە لایەن ئاسوریەکانەوە بوبێ بۆ شێخ تەنها دژی ئێران بوە نەك تورکیا، چونکە بارەها باسی ئەوە کراوە ئینگلیزەکان دژی هاوکاریکردنی ئاسوریەکان بوون له گەڵ کوردا دژی تورکیا).

جلیلی له لاپەڕە ١٤٩دا باسی نامەیەکی(نصرالدین) شای کردوە بەتلگراف ناردبووی بۆ روسەکان بۆ ئەوەی بکە ونە بەینی ئەوان و تورکە کانەوە بۆ ناوبژیکردن‌و روسیا لە سەرئەوە داوای لە تورکیا کردبوو رێگە نەدا راپەڕینێکی تری کورد سەر هەڵبداتەوە وحکومەتی بریتانیا دەم و دەس پشتگیریی داخوازیەکە ی رووسی کرد.

حکومەتی تورك بەرامبەر بەوبارو دۆخە، بۆ ئەوەی زەبرو زەنگی خۆی پیشانی کورد بدا، بەهەڕەشەکردنەوە داوای لە شێخ کرد لە گەڵ نوێنەری سوڵتانا کۆبێتەوە بۆ گفت و گۆکردن‌و لە هەمان کاتدا هێزێکیشی نارد بۆ ناوچەی هەکاری.

شێخ بەرامبەر بەو داخوازیەی حکومەت داوای پێکهینانی لیژنەیەکی کرد بەمەرجێ دەوڵەتە ئەوروپاییەکانیشی تیادا بەشدار بێ بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی لە بارودۆخی ناوچەکە بکۆڵێتەوەو تا ئەولیژنەیە لەکاری خۆی دەبێتەوە حکومەت واز له ناردنی هێز بێنێت بۆ ناوچەکە .

بەڵام لە کۆتاییدا شێخ ناچارکرا بچێتەلای سوڵتان و حکومەت بەوپەڕی رێزەوە پیشوازی لێ کردو بەتالیۆنێکی سوارەو دوو بطاریە تۆپی بۆ پاراستنی شێخ نارد هەوەکو لە کتێبی (Wilson Persian) دا باسکراوە حکومەت

کاربەدەستە گەورەکانیشــی ڕاسـپارد کــە گەیشـتە ئەسـتەمبولْ بچنــە لای و پێشوازی لیّبکە نو لە ئەستەمبولْ طوپــی پێشـوازی کردنیـان بـۆ تـەقاند، بـەلاّم زۆری پیّ نەچوو شێخ بۆی دەرکە وت میوان نەبوو بەلْکو دەسبەسەر بوە.

کە شێخ گەیشتە ئەستەمبولْ لە مانگی تشرینی دوهـەمی ١٨٨١دا نامەیـەکی ناردبوو بۆ وەزیری دەرەوەی تورکیا بۆ ئەوەی داوا لە حکومەتی ئێران بکـا ئـەو زیانانەی لە سالْی ١٨٨٠دا لە کوردە کوژراوەکان کەوتبوو بدریّ بەخێزانەکانیان.

بەرامبەر بەو داخوازیەی شێخ ، (فەخریبەگ)ی بالْیۆزی عوسمـانی لـە تـاران رۆژی ٢٤ ١١ ١٨٨١ بەناوی حکومەتەوە داخوازیەکەی شێخی گـەیاند بـەوەزارتی دەرەوەی ئێران ونـارەزایی شێخیشـی گـەیاند بـوو بەحکومـەتی ئـێران بەرامبـەر رووداوەکانی سەرسنور.

حکومـەتی ئـێران لەوەرامەکـەیدا بەرپـەرچی داخوازیەکـە ی شـێخی دایـەوەو بەحکومەتی تورکیای راگەیاندبوو پێداگرتن لە سەر ئەو داخوازیەی شێخ دەبێتـە مایەی لاوازکردنی پێوەنـدی هـەردوو حکومەتەکـە. شـێخ لـە ژێـرەوە بەنـەهێنی پێوەنـدی لەگـەلْ شـێخ عبدالقـادری کوڕیـا نـەپچڕاندبوو، خـۆی بـۆ ئـــەوە ئامادەکردبوو خۆی لە ئەستەمبولْ دەربازبکا، بۆ ئەو مەبەستە جەژنی رەمەزانی کردبوو بـەبیانوو وەلـە خـەلْکی گـەیاندبوو بـەدرێژایی مـانگی رەمـەزان خـەریکی نوێژکردن دەبیّ و کەس لەوماوەیەدا سەری لیّ نەدا.

هـەروەکو لـە ئەرشـیفی ژمــارە (١٩٨١-٩) ی سـالْی ١٨٨٢-١٨٨٣ تۆمـار کـراوە، شـێخ بەبـەرگی بازرگانیـەوە تبدیلـی قیافـەت ئـەکاو بـە پەســاپۆرتێکی دروستکراو سواری پاپۆرێکی شرکەی (پاك) ی فرنسی دەبیّو خۆی دەگەیەنەتـە (پۆتی) و لەوێوە دەچێتە کوردستانو هەر کـە هـەوالْی گەیشـتنی بلاّودەبێتـەوە کوردستان جولْەی تێدەکەویّو گەلێك عەشیرەت چەکدارەکانی خۆیان کۆکردەوە بۆ ئەوەی بەوپەڕی رێزەوە پێشوازی لـە شـێخ بکـەنو شێخ عبدالقـادری کـوڕی بـەهێزێکی چـەند هەزارکـە سیەوە چـوو بـەپیر باوکیـەوە هـــەروەکو رۆژنامــەی (مشاك) ی ئەرمەنی باسیکردوە، لە ژمارەی ١٦٣یدا.

لە ژمارە ١٨٩ی سالْی ١٨٨٢ی هـەمان رۆژنامـەدا باسـی ئـەوەی کـردوە لـە ڕێگایدا شێخ لە سەر داخوازیی (ئەرخیماندریت ئورگانیس کاجووتی)لائەداتـە کـە

نیسەی (قدیس فارفولومیا) ی ئەرمەنی لە هەرێمی (وان) و لەو کەنیسەیەدا سوپاسی پێشوازیکردنەکە ی کردبوو ووتبوی:

((لای ئێمە لە کۆنەوە ئەرمەنیەکان وەکو مرۆڤێکی چاکە خوازو پاك و بەناموس ناسراون و ئاشکراشە باووباپیرانمان لە کۆنەوە برایانەو دۆستانە پێکەوە ژیاون و ئێمەش دەمانەوێ ئەم راستیە لە یادنەکە ین و ئەرمەنیەکان لەوە دڵنیا دەکە م لە لایەن میللە تەکە مەوە زیانیان پی ناگا)).

لە ژمارە ٢٢٩ی ئەورۆژنامەیەدا باسی ئەوەی کردوە شێخ رووی دەمی کردۆتە ئەوکوردانەی لەوێدا لە گەڵیا بون و پێیوتبون: هەرکەسێکیان لەوقسەیەی ئەولادلو کردەوەیەکی ناهەموار بەرامبەر ئەرمەنیەکان بکا مانای ئەوەیە ئەو کردەوە خراپە بەرامبەر شێخ خۆی دەکرێ. جلیلی لە لاپەرە ١٥٢ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ١٨ وتوویەتی عوسمانیەکان هەنگاو بەهەنگاو شوێن شێخ دەکەوتن و بەترسەوە دەیان روانیە دۆستایەتی کوردو ئەرمەنی و ئاسوری و بۆ تێکدانیان دەستیانکرد بەنانەوەی ئاژاوەو، ووروژاندنی خەڵکو لە ساڵی ١٨٨٢دا ساتێك بازاڕی بدلیس سووتا گەلێك دوکانی ئەرمەنی تیابوو دەم و دەست کاربەدەستانی تورك کوردیان بەوە تاوانبار کردو بلاویان کردەوە ئەوسووتاندنە بەهاندانی شێخ بوە.

دوای ئەوە شێخ لە کە نیسەی (فارفولومیا) وە، لە رێگەی (باشقەلا) وە بەرەو بارەگاکە ی خۆی کە وتە رێ و هەرچەند سەرداری حکومەت لە باشقەلا هەوڵیدا رێگە لە رۆیشتنی شێخ بگرێ، هێزێکی نارده سەر رێگەی بەلام لەوهێزە درلو شکاو پاشەکشەی کردو شێخ لەرێگایا تا ئەهات هێزەکە ی زۆر پەرەی دەسەندو بەهێزتر دەبوو.

ساتێك شێخ گەیشتە ناوچەی هەکاری کاربەدەستانی ئێران هاواریان لێ هەستاو شای ئێران سنووری خۆی لە گەڵ تورکیا قایمکرد دیوارە نیوە رووخاوەکانی شوورەی (ورمیە)یان لە ماوەیەکی کەمدا چاك کردەوەو تورکەکانیش هێزێکی گەورەیان بەرەو (وان؟) ناردو لە ئەرزروم و ئەرزنجانیشەوە چوار بتالیۆن و چوارده تۆپیان نارد بۆ (وان) ولەوێشەوە (١٥)بتالیون بەسەرکردایەتی (موسی‌پاشای کوندوخوین) بەرەو هەکاری

کەوتەڕێ و هێزەکانی تورك لە ڕێگایانا بەوپەڕی دڵڕەقیەوە لە گەڵ کوردەکانی سەر ڕیگایانا ڕەفتاریان دەکرد.

جلیلی لە لاپەڕە ١٥٤ی کتێبەکەیدا باسی پەیامنێری (میریی) لە ژمارە ٢٣٩ی ساڵی ١٨٨٢دا کردوە کە هەڵوێستی ئەوڕۆژانەی لە ناوچەکە دا بەم جۆرە باسیکردوە:

((دانیشتوانی ئەم بەشەی عوسمانی پێوەندییان لەگەڵ سەربازەکانی تورکدا دۆستانە بوو، چونکە دەبوایە ئەو سەربازانەی حکومەت لە لایەن ئەو دانیشتوانەوە تێرسك بکرانایەو کەلوپەلیان بدرێتێو بوبون بەبارێکی قورس بەسەریانەوە. شێخ هێزێکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەبوو تاروو بەڕووی هێزەکانی عوسمانی بوەستێ، بۆ یە ناچاربوو پەنابەرێتە بەر سیاسەتی چاوشارکێکردن و دەیزانی زستان بەرێوەیەو مایەی شەڕکردن نامێنێ، بەتەمای ئەوەبوو شایی کورەکەی بکاتە پەردەیەك و نیازو مەبەستی خۆی لە پەنای ئەوەدا بشارێتەوە. بەکورتی دەیویست سوود لە کات وەربگرێ بۆ ئەوەی لەوماوەیەدا سەرۆکە کوردەکان ئامادە بکا بۆ ڕاپەڕینێکی نوێ و نیازیشی وابوو دەست بەسەر قەڵاکانی ناوچەکانی دراوسێدا بێنێت و چاکیان بکات و قەڵای تازەی تریش دروست بکات و کە حکومەت بەمەی زانی کۆڵۆنێل (یوسف بەگ) ی نارده لای شێخ بەرەسمی داوای لێکرد واز لە شەڕکردن بێنێت بەڵام یوسف بەگ لەو هەوڵدانەیدا سەرنەکە وت.

لە ناوەڕاستی مانگی ئابدا (کمال بەگ) سێهەم سکرتێری سوڵتان چوە (وان) بۆ ئەوەی داوا لە شێخ بکا لە یەکێك لە شارە پیرۆزەکانی عەرەب نیشتەجێ ببێت و بەرامبەر بەوە دەولە تی عوسمانی هەموو خەرجیەکی دەخاتە ئەستۆی حکومەت و سوڵتان هەموو مانگێك (١٥٠) لیرە بۆ خۆی دەبڕێتەوە، بەڵام شێخ گوێی نەدایەو خۆی لە قەڵای (ئورامار) قایمکرد بۆ بەرگریکردن هەروەکو لە لاپەڕە ٧٢ی (ئا. ف. پ. ئەرشیفی سەرەکی ڕوسیا(١٩٨١-٩)ساڵی ١٨٨٢-١٨٨٣ باسیکردوە، عوسمانیەکان بەپەلە هێزی خۆیان گەیاندە قەڵاکەی شێخ و ئابلۆقەیان دا.

له ئەنجامی ئەو ئابلۆقەدانەی بۆ ئەوەی خوێن نەڕژێ شێخ بڕیاریدا بچێتە موصل‌و لەوێ بژی. کاربەدەستانی عوسمانی رازیبون بەلآم شێخ هەندێ بۆچیانووی نۆزیەوە بۆ ئەوەی خۆی درەنگ بخات لە چوونی بۆ موصل و بەرامبەر بەوە (موسی پاشا) بڕیاریدا بچێت بەگژ شێخ داو بۆ ماوەی ۱۸ رۆژ قەلاکەی تۆپ بارانکردو شێخ بەدیل گیراو لە گەڵ چوار بتالیۆنی عوسمانیدا نێررا بۆ موصل. تورکەکان لەوە ترسابون شێخ عبدالقادری کوڕی، باوکی رزگار بکا لە بەرئەوە لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمدا دوو بتالیۆنی پیادە لە (گاوار)ەوە بەسەرکردایەتی(مصطفی پاشا) خرایەڕێ بۆ ئەوەی رێگەی نێوان (ئورامار) و (نهری) بگرێ‌و دوو بتالیۆنیش نێررا بۆ (نەهری).

شێخ محمد صدیقی کورەگەورەی شێخ بارمتە بوو لە ئەستەمبوڵ لای حکومەت لە بەرئەوەی عبدالقادر بوبوو بەجێگری باوکی. دەربارەی شێخ عبدالقادر، لە لاپەڕە ۷۲ی باسێکی (نلدوف)دا وتوویەتی: عبدالقادر هەروەکو باوکی مایەی رێزلێگرتنەو سەرکردایەتی هێزەکانی کورد ئەکاو نیازی وایە دان بەدەسەلآتی حکومەتی عوسمانیدا نەنێت. جلیلی لە لاپەڕە ۱۵٦ی کتێبەکەیدا ئەڵێ: ئەم هەڵوێستەی حکومەتی عوسمانی بەدڵی حکومەتی ئێران نەبوو چونکە هێزو دەسەلآتی شێخ لە موصل هیچی لێ کە م نەبوبوەوەو عەشایرەکانی کوردو عەرەبی ویلایەتی موصل هەمیشە ئامادەبون هەر ئەوەندەی شێخ ئەموستی بەرزیکاتەوە ئیتر هەموو دەس بدەنە چەك.

محسن خانی بالیۆزی ئێران لە ئەستەمبوڵ سرەوتی لێ برابوو، هەمیشە ئەوەی دووپات دەکردەوە و دەیوت: ئەگەر شێخ هەلێکی بۆ هەلکە وێ ئەتوانێ دەس بەراپەڕینێکی تر بکاتەوە، لە بەرئەوە بەناوی شای ئێرانەوە داوای لە ئەستەمبوڵ کرد شێخ رەوانەی شوێنێکی تر بکرێ کە دووریێ لە سنوری ئێرانەوە بەلآم سولتانی عوسمانی محسن خانی دڵنیا کرد کە لە مەو دوا دەتوانرێ شێخ رەوانەی شوێنێکی تر بکریت و بۆ یە کوڕەکە ی بەبارمتە دانراوە تا بە بێ‌خوێن رشتن ئەو مەبەستە سەر بگرێ.

وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران گومانی هەبوە لە سوودی بوونی محمد صدیق چونکە ئێران واباشتربوو شێخ عبدالقادر بەبارمتە دابنرایە چونکە

عبدالقادریش له بیروباوەڕیا هەروەکو باوکی وابووحکومەتی ئێران بەخۆڕایی ئـەو مەترسیەی لێ نەنیشتبوو، چەنکـە زۆری پێنـەچوو لـە مـانگی تشـرینی دوهـەمدا شێخ عبدالقادر بەهێزێکی بچوکی کوردەوە لە نزیك گونـدی (شـیتان) کـە نزیکـی ٧٠–٧٥ میل دوورە لە رواندزەوە پەلاماری ئـەو هـێزەی عوسمـانیدا کـە ئـەرکی گەیاندنی شێخ عبیداللەی پێ سپێررابو بۆ موصلو توانی باوکی رزگار بکات.

کمال پاشای سەرکردەی ئەو هێزەی تـورك بـەگورجی داوای یارمـەتی لـەوالی موصل و بغداد کردو ئەوچوار بتالیۆنەش لە دوای ڕەوانەکردنی شێخ لـە موصـل بەسەرۆکایەتی حسێن بەگ مابوونەوە هەموویان بەرەو (شیتان) رەوانەکران و لـە نزیك ناوچە شاخاویەکە ی (کوردبوغازی) هێزێکی کورد لەگەل ئەو هێزەی حسێن بەگ ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوەو هێزەکەی کورد شکاو هێزی حسێن بەگ و کمال بەگ پێکەوە لە دوای شـەڕێکی شـەش سـەعاتی شـێخ عبدالقادریـان ناچـار کـرد خۆی بدابەدەستەوەو بەوجۆرە کوڕو باوك پێکەوە ڕەوانەی موصل کـران و دوای ماوەیـەك شـێخ نـێررا بۆ (مەکـە ) ئـەم بۆچوونـەی جلیلـی لـە ئەنسـکلۆپیدیای ئیسلام: **1995 Biografya lugatti-68 cuz** داباس کراوە.

جلیلـی لـە لاپـەڕە ١٥٨ی سـەرچاوە ١٨دا ئـەڵێ: نـەك تەنـها هەردەولـە تـی عوسمانی، بەڵکو روسیاو بریتانیاو دەولە تانی تریش چـاوەڕوانی ئەوەنـەبوون و بڕوایان بەوە نەدەکرد ڕاپەڕینەکەی شێخ عبیدالله بەوجۆرە بەهەرچوار لادا پـەل بهاوێژێو بەوشێوەیە بڵاوبێتەوە (لام وایە دوکتۆر جلیلی ئەبوایە ئەوەشی بوتایە کە هیچیان باوەڕیان بەوە نەبوو کە وا بەو جۆرەو بەئاسـانی ئـەو شۆڕشـەی کـە بەوپەڕی بێحسابیەوە دەستی پێکرابوو وابەودەستو بردیە لە ناویچێت ! !).

## هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکەی شێخ عبیدالله

بەرلـەوەی شۆڕشـەکەی شـێخ عبیداللــە هەڵسـەنگێنرێت، پرسـیارێك دێتـە پێشـەوە کـە بریتیـە لـەوەی ئایـا شـێخ عبیداللــە دەرسـی لــە شۆڕشــە سـەرنەکەوتوەکانی بەرلـە خـۆی وەرنـەگرتبوو وەبـۆی دەرنەکـەوتبوو تەنـها بـەرپاکردنی شـۆڕش بـەبێ لێکدانـەوەی ئەنجامـەکانی و ئـەو پێویسـتیانەو ئـەو مەرجانەی کە بۆ دەسپێکردنی شۆڕشێك پێوێست بووبن خراوەتە بـەرچاوو، ئایا

شێخ عبیداللە بــەوهێزی عەشــایریەی کــە بەشــێوەیەکی عاطیفــە لــە دەوری گرنبوبونەوە بەهیوای ئــەوە بــوو بتوانــێ بەرگــەی ئــەو هــێزو ســوپا زۆرو مەشــق پێکراوەی دەولە تی عوسمانی بگرێ کە هەندێ پسپۆڕو شارەزایان و ئەفسەرانی بێگانەشی بۆ بەکرێ گیرابوو) ئایا شێخ عبیداللە حسابی بۆ هەڵوێســتی روســیا و بریتانیا و ئێران نەکردبوو کە هیچیان بەهیچ جۆرێك رۆژێك لە رۆژان دۆستی میللەتەکە ی نەبون و نەیان ویستبوو بزوتنەوەی کورد سەربگرێ؟؟

ئایا شێخ عبیداللە دوای ئەو هەموو تەقەلایانــەی دابــووی بــۆ پێوەندیکــردن و دۆستایەتی و هاوکاریکردن لەگەڵ کریستیانەکانا کە بەئاشــکرا بــۆی دەرکــەوتبوو هەرلە زەمانی بدرخان پاشاوە چ ئەرمەنی و چ ئاسووری لە ژێر فشــاری روســیا و بریتانیادا بــوون و ئــەودوو دەوڵەتــە هەریەکــەیان بەشــێوەیەك بارەهــا بەوانــەیان وتبوو نابێ بەشداری بکەن لە هاوکاریکردن لە هیچ شۆڕشێکی کوردا، ئایا دوای ئەو هەموو ئاشکرابوونەش هێشتا شێخ بەتەمای شۆڕشێکی ســەرکەوتوو بــوە؟).

بۆ وەرامی پرسیارانە، لام وایــە شــێخ عبیداللــە خــۆی و هاوکارەکــانی ئەگــەرچی چەوروستەم و زۆرکاری و باجوسەرانە سەندنی کاربەدەســتانی عوســمانی زەیفــی ســەندبوو زەمینــەی بــۆ ئــەوە خۆشــکردبوو کــە بــێزاربوونی خــەڵك لــە دەوڵــەتی عوسمانی یارمەتیدەرێکی تارادەیەك بــاش بــوە بــۆ ئــەوەی شــێخ بکاتــە ئــەو بــۆ چوونەی کە ئەو میللەتەرەش و ڕووت و چەوســێنراوەی تابــەمافی خــۆی نــەگا واز ناهێنێ و کۆڵ نادات.

لــەورووەوە جلیلی جلیــل لــە لاپــەڕە ٦٣ ی ســەرچاوە ١٨دا ئامــاژەی بــۆ رۆژنامــەی (مشــاك) ی ژمــارە ١٩٠ی ســاڵی ١٨٨٠ کــردوە کــە وتویــەتی: هــۆی سەرەکی بۆ دەسپێکردنی ئەو ڕاپەڕینە ئەوەبوە کورد دەس بداتە چەك بۆ ئەوەی خۆی رزگــار بکا لەوبرســیتی و دواکــە وتنــەی بــەهۆی داگیر کە رانــەوە تووشــی بوبوو.....

لە گەڵ ئەوەشدا بەکورتی دەتوانین باسی هەندێ لە وکــە م و کووڕیانــە بکــە ین کە بوبونە هۆی سەرنەکەوتنی ئەو شۆڕشە:

١ــ نەبوونی نەخشەیەکی ریکوپیك بۆ چۆنیەتی دەسپێکردنی شــۆڕش و ئــەوبێ حسابیەی لە دەسپیکردنی شۆڕشەکە لە پێشــدا لــە ئــێران بــەهیوای کوردســتانی

ڕۆژھەڵاتی ڕزگارکراو بکرێت بەبنکەیەکی بەھێز بۆ ڕزگارکردنی باکوری کوردستان شتێکی زۆر کورت بینانەو بێ حساب بوە و لە زیان گەیاندن بەولاوە هیچ سوودێکی نەبوە بۆ کورد و ئەو هێزە پەراگەندەو شکاوەی شێخ کە لە ئێرانەوە گەڕاوەتەوە بۆ باکوری کوردستان‌و زۆری پێ نەچوە کربوێتی بەبناغەی دەسپێکردنی شۆڕشێکی تر دژی حکومەتی عوسمانی کارێکی زۆر کورت بینانە بوەو هەر لە سەرەتاوە دیاربوە ئەو هێزە کە مەی زۆربەی لە درویش‌و مریدەکانی شێخ پێك هاتبوو بەهیچ جۆرێك بەرگەی حکومەتی عوسمانی نەدەگرت و لە راستیشدا لە چەند شوێنێکی کەمدا نەبێ ئەو هێزەی شێخ بەرگەی سوپاکەی نەگرتوە و شێخ خۆی و شێخ عبدالقادری کوڕیشی هەردوکیان ناچاربوون خۆیان داوە بەدەستەوە.

٢ـ نەبوونی ڕێکخراوێکی سیاسی، یا دەزگایەکی بەڕێوەبەر بۆ ڕێکخستنی کاروباری ناو ولات و بەڕێوەبردنی ئیشی ڕۆژانەو سەرپەرشتی‌کردنی باری ئابوری و چۆنیەتی دابینکردنی چەك‌و ئازوقەو خواردەمەنی شتێکی ئاشکرای سەرەکی بوە کە شۆڕشەکە لە ڕاپەرینێکی هەرەمەیی بی‌حساب بەولاوە شتێکی ئەوتۆ نەبوە کە شێخ و تاقمەکە ی دڵی پێ خۆش بکە ن و هیوای ئەوەیان هەبووبێ بەسەرکە وتن...

ئەگەر ئەو ڕاپەرینەیان تەنها بۆ ئەوە کردبێ حکومەتی عوسمانی ناچار بکەن واز لە فشارو جەورو ستەم بێنێت بەرامبەر بەکورد، وابزانم ڕێگەی گفت‌وگۆکردن هەبوە بۆ ئەوەی شێخ بتوانێت سوود لە کات وەربگرێت و لەوماوەیەدا زۆرتر خۆی ڕێکخاو خۆی ئامادەبکا بۆ شۆڕشێك کە بەرامبەر هێزیکی حکومەت بشێ.

٣ـ نەبوونی یەکێتی لە ناو ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی کە شێخ عبیداللە لای وابوە هەموویان بەراست‌و بەنیازی پاکە وە دڵسۆزی لایەنگرێتی خۆیانیان بۆ دەربڕیبوو، شێخ عبیداللە سوودی لەو ڕێکەوتنەی زەمانی بدرخان پاشا وەرگرتبوو کە بەناوی (پەیمانی پیرۆز)ەوە هەموو سەرۆك عەشیرەتەکان مۆریان کردبوو لە ڕاستیدا ئەو پیرۆزیەی کە هەندێ لەوسەرۆك عەشیرەتانە بۆی چووبون کە لە دوای سەرکە وتن هەریەکە یان لە ناوچەکە ی خۆیدا دەبێ بەدەسەڵاتدارو هەرلە سەرەتاوە بین برکێی ئەوانە بۆ دەسەڵاتدارێتیە لە ناو خۆیانا شتێکی

روون و ئاشكرابوە و كۆنگرەكە ی شێخ عبیداللەش هەر شتێك بوە لەوجۆرەو بزوتنەوەكە ی بریتی بوە لە بزوتنەوەیەكی ناوچەیی و نەخشەیەكی ئەوە نەكێشرابوو هەموو ناوچەكانی باكور ئامادەبكرێ لە یەك كاتدا دەس بكەن بەشۆڕش. لەو روەوە جلیلی لە لاپەڕە ١٦ی سەرچاوە ١٨دا ئامـاژەی بۆ راپۆرتێكی پەیامنێری رۆژنامەی (ئەتگۆلوسك) كردوە ژمارە ٤٤سالی ١٨٨٠ كە وتویەتی:

((ئەگەر كوردەكان لە ناوخۆیانا یەكێتییان هەبوایە، لە ناوبردنی شۆڕشەكەی شێخ عبیدالله زۆر ئەكە وت لە سەرئێران)).

٤ـ شێخ عبیداللە هیچ تەقەلایەكی لە گەڵ دەولە تانی ئەوروپادا وەكو روسیاو بریتانیا سەری نەگرتبوو هەندێ لە دبلۆماسیەكانیان بەئاشكرا لە شێخیان گەیاندبوو كە حكومەتەكە یان دژی هەموو جۆرە راپەڕینێكی ئەوە كە ببێتە هۆی زیان گەیاندن بەدەوڵەتی عوسمانی.

دەربارەی شۆڕشەكەی شێخ لە كوردستانی ئێراندا، هەر لە زەمانی بدرخانەوە و لە شۆڕشەكە ی ئەوەوە ئاشكرابوو كە بریتانیا و روسیا سوور بوون لە سەر ئەوەی كە ئەبێ سنوری ئێران بپارێزرێ و ولاتەكە یەك گرتوویی و هیچیان بەوە قایل نەبوون كە بەشێك لە خاكی ئێران كە كوردستانی رۆژهەلات بوە لە ئێران جیابیتەوە.

٥ـ سەرنەكە وتنی شێخ عبیداللە لە دەسگیر بوونی دوژمنایەتی و هاوكارییكردن لە گەڵ كریستیانەكانداو هەروەكو لە كێشەی ناوكونگرەكەی شێخ عبیدالله دا ئاشكرابوو، یەكێكی وەكو (شێخ فەهیم) بەهاندانی حكومەتی تورك سپێررابوو كە بەر لەوەی شۆڕش دژی حكومەتی ئێران و عوسمانی بكرێت، دەبویست لە ئەرمەنیەكان بدرێ و بێگومان چ ئەرمەنی و چ ئاسووری لە دەماری هەندێكی تری وەكو شێخ فەهیم گەیشتبوون كە ئەگەر كورد ببێت بەدەسەلاتدار دوور نیە هەڵوێستی كورد بەرامبەریان لە هەڵوێست و رەفتاری عوسمانی خراپتر بێت و ئەم راستیە لە لایەن دەوڵەتە بێگانەكان و میسنێرەكانەوە بەتایبەتی ئینگلیزەكان بەتەواوەتی لە مێشكی كریسیانەكان چەسپاویوەو ئەوتاكە تاكە ئەرمەنیو ئاسوریانەی بەرواڵەت دوستایەتی خۆیان بۆ شێخ دەربڕیبوو لە چاو زۆریەی بێزاربووەكانا شتێك نەبوە حسابیان بۆ بكرێت.

شۆڕشی شەشەم:

## راپەڕین و شۆڕشەکانی باکوری کوردستان لە دوای شۆڕشەکەی شێخ عبیداللە هەتا شەڕی یەکەمی جیهان

لە دوای دامرکاندەوەی شۆڕشەکە ی شێخ عبیداللە کاربەدەستانی عوسمانی لە جاران خراپتر دەستیانکرد بەنواندنی زەبرو زەنگو ڕووتاندنەوەو برسیکردنی دانیشتوانی کورد و لە هەندێ ناوچەدا دانیشتوانیان ناچار دەکرد دەس بدەنە چەك و ڕووبەڕووی ئەو کاربەدەستانە ببنەوە.

لە دوای شۆڕشەکەی شێخ عبیداللە هەتا دەسپێکردنی شەڕی جیهان لە زۆر بەشی باکوری کوردستاندا راپەڕین و شۆڕشی پەرەوازەو لێك جیاواز دەستی پێکردوە کە بەبزوتنەوەکە ی ئەمین عالی بدرخان و مدحت بدرخان دەستی پێکردوەو بەشۆرشی ملاسلیم و شێخ شهاب الدین و هاوکارەکانیان کۆتایی هاتوە کە ئەمەی دواییان راپەڕین و بزوتنەوەیەکی درێژ خایەن بوەو هەوڵئەدەین کورتەیەکی ئەو جموجوڵو بزوتنەوەو راپەڕینانە پێشکەش بکەین و لە کۆتایی ئەم باسەدا ئەو کە مو کوڕیانەی لەو شۆڕشە بڵاوبڵاوو پچڕپچڕنەدا هەبوە کورتەیەکی باس دەکەین.

**یەکەم ـ بزوتنەوەو راپەڕینی ئەمین عالی بدرخان و مدحت بدرخان**

ئەمین عالی بدرخان کە لە زنجیرەباسی بنەماڵەی بدرخانیەکان وتراوە لە نێوان ساڵانی١٨٥١-١٩٢٤دا ژیاوە، باوکی سریابدرخان و جلادت و کامران بوەو جگە لەو راپەڕینەی لێرەدا باسی دەکەین، لە دواییدا لە شوێنی خۆیا باسی چالاکی دەکەین لە ڕێکخراوو کۆمەڵە کوردیەکانی باکورداو مدحت بدرخانیش خاوەنی رۆژنامەی کوردستان بوە وەکو باسی ئەویش لە باسی گۆڤارو رۆژنامەکانا دەکرێ.

ئەمین زەکی لە لاپەرە ٢٤٠ی بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا سەرچاوە ١٨دا دەربارەی راپەڕینەکە ی ئەمین عالی بدرخان و مدحت بدرخان وتوویەتی:

((لە کاتێکدا هەردوکیان دەچوون بۆ ئەستەمبوڵ، لە ڕێگای چوونیان لە (طرابزون) لایانداو ئەوەیان بەهەل و دەرفەت زانی و لەوێوە دەستیانکردوە

بەنامە ناردن بۆ چەند سەرۆکێکی کوردو لە گەڵ ئەوانا بڕیاریاندا هێزێکی چەکداری کورد لە (جویزیك) کە نزیك بە (طرابزون)ــە لەگەڵ هەردوکیانا کۆببنەوە و بەنەهێنی چاویان بەیەك کەوت، بەڵام حکومەتی تورك زۆر باش ئاگاداری جموجوڵی ئەو دو ئەمیرە کوردەبوو، بۆ یە حکومەت هێزێکی گەورەی نارده سەر رێگەیان بۆ ئەوەی نەگەنە کوردستان و هێزەکەی تورك ئابلۆقەی کوردەکانیان داو لە دوای شەڕێکی خوێناوی هێزیکی کورد خۆی پێ نەگیراو شکاو ئەمین عالی و مدحت بدرخان پەنایان بردەبەر چیاکانی (ئەرغنی) و (معدن) و هێزێکی تورك دوایان کە وتن و هەردوکیان ناچاربوون خۆیان دابەستەوە.

دەربارەی ئەو باسەی ئەمین زەکی، بلەچ شێرکوە (جلادت بدرخانی کوڕی ئەمین عالی بدرخان) بەشێوەیەکی تر باسیکردوە کە کورتیەکەی بریتیە لەوەی کە وتویەتی:

((ئەو دوومیرە لە ئەستەمبوڵەوە (دوورنیە لەوێ دەسبەسەر بووبن) بەنەهێنی چوونە طرابزون لەوێ چاویان بە (مصطفی نەورەس ئەفەندی شاملی) کەوت و لەرێگەی ئەوەوە پێوەندیان بەکوردستانەوە کردو لەگەڵیانا رێك کەوتن لە (جویزیك) کەوتۆتە نێوان رێگەی ئەرزرۆم و طرابزون چاویان بەیەکتر بکەوێ، بەڵام ئەو کە سەی نامەکانی ئەبرد ئەو نەهێنیەی گەیان بەتورکە کان و حکومەت لە ئەرزرۆم و ئەرزنجانەوە هێزێکی گەورەیان نارد و رووبەرووی یەکتر بونەوەو کوردەکان شکان و لە چیاکانی (ئەرغنی) خۆیان شاردەوەو پاش ماوەیەك بەناچاری خۆیان دابەدەستەوە، کە سەرچاوەی جلادت بۆ ئەم باسە بریتیە لە دائرە المعارف الاسلامیەــ بەزمانی فرنسی کە لەلایەن (مینۆرسکی)یەوە تۆمارکراوە و (A.veriondvu) لە کتێبەکەیدا باسی ئەوەی دائرەی معارفی کردوە.

**دوهەم ـ راپەڕینی ئیبراهیم پاشای میللی**

ئەمین زەکی لەلاپەرە ٢٥٥ی سەرچاوە ٣٢دا وتویەتی ئیبراهیم پاشای میللی کوڕی (محمود بەگ تیماوی) بوە (محمد علی عوینی وەرگێڕی کتێبەکەی ئەمین زەکی لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا وتوویەتی ووشەی تیماوی لەووشەی تمۆ وەرگیراوە کە کوردەکان بەتەیمووری تورکیان وتوە تمۆ).

دوای ئەوەی ئیبراهیم پاشا بوو بەسەرۆکی عەشیرەتی (میللی)، ئیتر دەستیکرد بەڕاوو ڕووتکردنو تالآنی لە ڕێگەی نێوان ماردین و دیاربکر و بەوە ژمارەیەکی زۆر لە چەتەو ڕێگر لە دەوری گردبوونەوەو حکومەتی عوسمانی هێزێکی ناردە سەری و گرتی و دووری خستەوە بۆ (سویسرا)، بەلآم زۆری پێ نەچوو دەرفەتی دەسکەوتو ڕایکردو بەشەڕەشەق خۆی گەیاندە (وێرانشهر) کە شوێنی باوو باپیرانی خۆی بوو.

لە پاش ماوەیەك هێزی سوارەی حمیدیە پێك هات و ئیبراهیم پاشا خۆی کوتایە ناو ئەو هێزەو کرابە (میری میران) لە دواییدا باسێکی تایبەتیمان بۆ هێزی سوارەی حمیدیە تەخان کردوە و بەدوورودرێژ باسی دەکە ین.

ئیبراهیم پاشا لە سالّی ١٣٢٢ کۆچی بەرامبەر بە١٩٠٤ی زاین توانی دەسەلآتی خۆی بەسەرعەشیرەتی (قرەکچیلی) دا بسەپێنیتو سەرکردەکانی بشکێنێتو بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و بەوە ئەوەندەی تر هێزو دەسەلآتی لە ناوچەکە دا پەرەی سەند.

ئیبراهیم پاشا شاری (وێهرانشهر) ی کرد بەبنکە ی دەسەلآتی خۆی و لەوێوە کاروباری ناوچەکانی ماردین، رها، ئورفە، قرەجەداغی دەبرد بەڕێوەو ئەو دەسەلآتدارێتیەی درێژەی کێشا هەتا ئیعلانی ئیصلاحاتی دستوری کە دژی سولّتان و تاقمەکە ی بوو، ئیبراهیم پاشا دژی دەستورخوازەکان وەستا (مەبەستی تاقمی أتحادو ترقی بوە) وەدژی حکومەت یاخیبوو، حکومەت (کە تاقمی اتحادو ترقی بوبون بەدەسرۆیو) هێزێکی ناردەسەری و لە شاخی (عبدالعزیز) گیراو هەلّواسرا)).

دەربارەی ئیبراهیم پاشای میللی کە ئەمین زەکی بەوجۆرە باسیکردوە. (و. ج. ئیلڤنستن) لە لاپەڕە ٥ی باسەکەیدا سەرچاوە ٨ وتوویەتی:

((بەرامبەر بەدەسەلآتی روس (مەبەست بەرامبەر بەوهێزی قۆزاقەی روسەکان پێکیان هێنابوو)، سولّتانی عوسمانی لە سالّی ١٨٩١دا لە سەرکردەکانی کورد بەناوی لە شکری میللیەوە (مەبەستی سوارەی حمیدیە بوە) هێزێك ڕێکخراو لەو هێزەدا ئازاترینو بەجەرگترین تفەنگچیی کوردستان تیایا بەشداربوو کە خرابوە ژێر فەرماندەی ئیبراهیم پاشای میللیەوە لەوێرانشهر

(له راستیدا ئیبراهیم پاشای میللی یەكێك بوه له سەركردەكانی سوارەی حمیدیه وەكو له باسی سوارەی حمیدیەدا دەردەكه وێ دەسەلاتی سەرەكی بەدەس ئەفسەره گەورەكانی توركه وه بوەو ئەوكوردانەی لەوناو هێزەدا سەركردەبون هەمویان له ژێر دەسەلاتی ئەو ئەفسەره گەورانەی توركدا بوون)و پاش ماوەیەك حكومەتی عوسمانی ئیبراهیم پاشای بەخۆیو هێزەكەیەوه ناردە سەر عەشیرەتی (شەمەر) ی عەرەبو بەسەرپاسەركه وتو لە پاداشتی ئەوەدا لەلایەن سولتانەوه بانگ كرا بۆ ئەستەمبولّ و ئەویش بەخۆی و (٤٠٠) سوارەوه چوه ئەستەمبولّ و لەوێ رێزی لیّگیراو خەلاتی پێدراو نازناوی پادشایەتی پێدراو بوویه ئیبراهیم پاشای میللی.

بەلام لەدواییدا لە سالّی ١٩٠٨دا كه دەستكرا بە أصلاحاتی دەستوری ئەوانەی سەربەسولتان بون كه یەكێك لەوانه ئیبراهیم پاشابوو لە حكومەت هەلگەرایەوەو بەخۆیو (١٥٠٠) سوارەوه بەناوی سولتانەوه شاری (شام) ی داگیر كرد ، بەلام زۆری پێ نەچوو توركه یاخی بوەكانی دژی سولتان ئیبراهیم پاشایان لە كاروبار لاداو لە شام دەركراو لە كاتی گەرانەوەیدا عەشیرەتی (شەمەر) رێگەیان پێ گرتو دوای شەرێكی خوێناوی كوژرا (كه ئەمه تۆزێك جیاوازه لەوی ئەمین زەكی كه ووتبوی له شاخی (عبدالعزیز) گیراو هەلواسرا).

**سێهەم ـ بزوتنەوەی عبدالرزاق بدرخان**

عبدالرزاق جگه لە رۆلی سیاسی لە ناو كوردەكانی باكوری رۆژهەلاتدا، مرۆڤێكی زۆر زیرەك و رۆشنبیر بوەو خزمەتێكی زۆری رۆشنبیری كوردی كردوه بەتایبەتی لە كوردستانی ئێران كه لە لاپەرە ١٤ی كتێبەكەی سمكۆدا چاپی ١٩٩٦ بەدوورودرێژ باسی ئەوەم كردوه و پێویست ناكا لێرەدا كه مەبەست باسی باكوری كوردستانه دوبارەی بكه مەوه.

ولیدحمدی الاعظمی لە لاپەرە ٣٠٥ی سەرچاوه ٢٣دا بەمەلّە وتویەتی عبدالرزاق كوری بدرخان بوه كه لە راستیدا كوری نجیب پاشای بدرخان بوه، لەوكتێبەدا دەربارەی چالاكیی عبدالرزاق بدرخان وتوویەتی:

((عبدالرزاق زۆر چاك بوە لە پرۆپاگەندەكردن بۆ روسەكان و لـە سـاڵی ١٩١٠ بەدواوە لە نێوان پاریس‌و تـەوریز و سـنوری ئـێران‌و روسـیادا بـۆ ئـەو مەبەسـتە هاتوچۆی كردوەو پێوەندی كردوە بە سەرۆك عەشـیرەتەكانی ناوچـەی وان و لـە هەندێ ناوچەی (بدلیس)یشدا لایەنگری هەبوە ئەویش یارمەتی چەك‌و پارەی بـۆ پەیداكردون.

هــەواڵی ئـەو چـالاكی‌و جموجۆڵـەی عبدالـرزاق گەیشـتە كاربەدەســتانی عوسمـانی‌و (رشـیدبەگی كوێچگیری)یـان نـارد بـۆ ناوچـەكانی ملازكـردو مــوش (رشیدبەگ والیی بدلیس بوە) بۆ ئاگاداربون لە چالاكیەكانی عبدالـرزاق و دەركـە وت هەندێ لەوئەفسەرە كوردانەی لە نـاو سـوارەی حمیدیـەدابون لـە ملاذكـرد و (بولانیك) لەو كوردە چالاكانە بون پرۆپاگەندەیان بۆ روسەكان دەكردو حكومەت گرتنی و ناردنی بۆ بەندیخانەی (موش).

(ئەوەی ولید حمیدی باسیكردوە لە نامەیەكی سـیر. ج. لوثـر وەرگـیراوە كـە ناردویەتی بۆ ئەدوارد گرای هەروەكو لە دۆكیومێنتی (1263. No: 2 Fo.371 ١٩١١im ساڵی) ناو ئەرشیفی وزارەتی دەرەوەی بریتانیادایە).

دەربارەی چالاكیی عبدالرزاق كە قوتابیی حاجی قـادری كۆیـی بـوەو حـاجی قادر بەمنداڵی دەرسـی پـێ وتـوە، (و. ل. ڤیلچێڤسـكی) كـە زانایـەكی ناسـراوی روسە باسی رۆڵی عبدالرزاقی كردوە لە پێكهێنانی ئەو كۆمەڵەی لەلایـەن هـەندێ لە زانایانی وەكو (ی. ن. مار) و (ی. أ. ئوربللی) یەوەپێك هـاتبوو و ژمارەیـەكی زۆر لە سەركردەكانی كورد بەهۆی ئەو كۆمەڵەوە هەسـتی نەتەوایـەتی تیایـان د بـەهێزبوە. وەكـو لـە كتێبەكـەی سمكـۆو بزوتنـەوەی نەتەوایـەتیدا باسـكراوە عبدالرزاق بدرخان رۆڵێكی گەورەشی بینیوەلـە هاوكاریكردنیـا لـە گـەڵ سمكـۆی شوكاك لە بزوتنەوەی نەتەوایەتی كوردا لە كوردستانی ئێران.

عبدالرزاق پاش ئەوەی شۆرشی ئۆكتۆبەر روویدابوو، لە روسیاوە گـەرابوەوە بۆ توركیاو لە لایەن كاربەدەستانی توركە وە گیرابوو نێررابوو بۆ موصـلْ، بـەلاْم بەرلەوەی بچێتە بەردەرگا لە زیندانا ئازاریاندابوو كوشتبوویان.

**چوارەم ـ راپەڕینی ملا سلیم و شێخ شهاب الدین و هاوڕێکانی بەر لە شەڕی یەکەم**

بەر لە دەسپێکردنی شەڕی جیهانی بەماوەیەك تاقمی أتحادوترەقی لە ژێر پەردەی أصلاحاتی دەستووریدا نەخشەی ئەوەیان کیشابوو دەسبگرن بەسەر کاروباری ولآتداو لە سالّی ١٩٠٨ سولّتان عبدالحمید ناچارکرا یاسایەك دەربارەی أصلاحاتی دەستووری مۆربکا کە پێی ووترا (خطی همایون) کە لە دواییدا لە باسێکی تایبەتیدا بەدوورودرێژ باسی ئەوەدەکەین و بەپێی ئەودروشمانەی أتحادو ترقی بەرزیانکردبوەوە بەر لە دەرچونی ئەو دەستورە دەبوایە میللەتی کوردیش لە ناوولآتی عوسمانیدا مافی نەتەوایەتی خۆی دەسگیرببوایە، بۆیە رۆشنبیرانی کورد چ لە دەرەوەی ولآتی عوسمانی وچ لە ناو ولآتی عوسمانیدا لە سەرەتادا لایەنگری أتحاد وترقی بون لەگەڵیانا بەشدار بون لەوچالاکی و جموجۆڵانەی بۆ سەرگرتنی ئەو مەبەستە درابوو، بەلآم هەرکە تاقمی أتحادو ترقی لە پاش مۆرکردنی دەستور بوون بەدەسەلآتدارو کاروباری ولآتیان گرتە دەس ئیتر لە بەڵێنەکانی پێشوویان پاشگەز بوونەوەو کوردی نائومێد ناچاربوو بۆ پاراستنی خۆی بۆ دەسگیربوونی مافی خۆی، بکەویتە خۆی و بێزاریی خۆی دەربڕێو ڕوویەرووی کاربەدەستانی تورك بێتەوە و راپەڕینێك بەسەرۆکایەتی ملاسلیم و شێخ شهاب الدین روویدا.

دەربارەی راپەڕینی ملاسلیم، ئیسماعیل شاویس کە خۆی یەکێك بووە لەوئەفسەرە کوردانەی ئەوڕۆژانە لە تورکیادا بوەو ئاگاداری ڕووداوەکان بوە باسێکی لە گۆڤاری (رۆژی نوێ) ی ژمارە ٨ ی تشرینی دوهەمی سالّی ١٩٦٠ بلآوکردۆتەوە کە لە شاری سلێمانی دەرچوە لەوەدا وەکو بیرەوەریەکی خۆی باسی ئەو شۆڕشەو بارو دۆخی ئەو رۆژانەی کردوە و وتوویەتی:

((ملاسلیم ئەفەندی یەکێك بوە لە شێخە گەورەکانی (خیزان) کە وەختی خۆی بەجێنشینی شێخ صبغەاللە خیزانی دائەنراو لەوانەبوو بۆ سەربەخۆیی کوردستان تێکۆشابوو. لە بەرئەوە بەفەرمانێکی سولّتان عبدالحمید ئەوو شێخ عبدالقادر ئەفەندیی کوری شێخ عبداللە و حاجی موسی بەگی خۆیتەلی دوور

خرانەوە بۆ (مدینـە) لـە حجـازو لەوسـالە دابـوو سـوڵتان عبدالحمیـد گێچـەڵی ئەرمەنیەکانی دروستکردبوو، عبدالحمیـد ئەرمەنیـەکانی دژی کـورد هـاندابوو کـە لەوەدا ئیمپریالیزمی ئینگلیز دەستی هەبوو، چار نیقۆلای روس (قەیسەری روس) بەشداری ئەو ئاژاوەیە بوەو لەوماوەیەدا (موسی بەگی هیزانی) لە لایەن کۆمـەڵی تاشـناقەوە کوژرابـوو، تورکـە کـان ئـەوەیان کـرد بـەبیانوو گـەلێك لـە گـەورەو دەسرۆیوەکانی کوردی دوور خستەوە بۆ حجاز.

لە شاری مدینەدا ملاسلیم ئەفەندی و حـاجی موسـی بـەگ و سـید عبدالقـادر لەگەڵ کوردە دوورخراوەکانی تردا کۆبونەوەو ئەوکوردانەی تریـش کـە بـۆ حـەج چوبـون ئـەوانیش لەوکۆبونەوەیـەدا بەشـداربون و لـە بـارو دۆخـی کوردسـتان کۆڵینەوەو هەموویان لەسەر مەرقەدی پێغەمبەر سـوێندیان بـۆ یـەکتر خـوارد لـە دەوڵـەتی عوسمـانی جیاببنـەوە و کوردسـتانێکی ئـازادو سـەربەخۆ پێـك بێـن و لەوکۆبونەوەیەدا پەیمانێکیان بەست ئەگەر گەڕانەوە بۆ کوردستان هەریەکە یـان لە ناوچەی خۆیدا بۆ ئەوە خەبات بکا کوردی چەوسێنراو رزگار بکا.

لە ساڵی ١٨٩٦دا سوڵتان عبدالحمید لە شێخ عبدالقادر و ملا سـلیم و حـاجی موسی بەگ خۆشبوو وگەڕانەوە بۆ کوردستان و مـلا سلیم چـوەلای کوردەکـانی باشـقەڵاو وان و مـوش و بدلیـس و دیـاربکرو بیرو باوەڕەکـانی خـۆی لـە ناویانـا بڵاوکـردەوەو خەڵکەکـەش باوەڕیـان بەقسـەکانی هـەبوو، بـەوجۆرە زۆربـەی دانیشـتوانی ئەوناوچانـە خۆیـان ئامـادەکرد بـۆ ڕاپـەڕین جگـە لـە هـەندێ لـە شێخەکانی قادری کە لە بەر ناکۆکی لە سەر هەندێ بـۆ چوونـی شـێخایەتی و لـە بەر خودپەرستی بێبایەخ نەبون بەلایەنگریان وەکو (شێخ عبدالرحمن تـاگی) لـە (بولانیق) بەلایەنگرێتی ملاسلیم قایل نەبوو سەریە سولتان عبدالحمید بوو.

لە کاتی خۆیدا کە (شێخ صبغەالله )ی خیزانی کۆچی دوایی کردبو، هەرچەند ملاسلیم خلیفەی ئەوبوو بەڵام ملاسلیم لـە جیـاتی خـۆی (شـێخ شـهاب الدیـن)ی کوری شێخ صبغەاللـە ی بـەجێگری بـاوکی دانـا ئەگـەرچی تەمـەنی دەسـاڵبوو، ڕێوشوێنی بۆ ئەو کوڕە داناو فێری زانیاری و صۆفێتی و ئیرشادی کردبوو پێـی گـەیاند. ملاسـلیم بـڵاوی کـردەوە پیـاوی ئـایندار و صۆفـی نابـێ تەنـها هـەر بـۆ

سوودی خۆی هەوڵبدا، بەڵکو پێوسیتە لە سەری خۆی لە ناو بزۆرگی و گەورەیی خوادا بتوێنێتەوەو بۆدینو بۆ دنیاش هەوڵ بدا.

شێخەکانی کورد لەوبارەوە بەتەواوەتی هاوکاری بون و جگە لە کاروباری ئاینی بیرو باوەری نیشتمانپەروەریتیشی بەناو خەڵکا بلاوکردەوەو جگە لە کوردەکانی تورکیا کاریشی کردبوە سەرکوردەکانی قفقاس وەکو ناوچەکانی قاقزمان، قارص، ئەردەهان و دەرویش‌و مریدێکی زۆری پەیداکردو مامۆستاو زاناو پیاوە تێگەیشتوەکانی کورد بیروباوەڕەکانی ملاسلیمیان پەسەندکردوەو کۆمەڵی (علولەما) فتوایان دەرکرد کە نابێ بەپێی شەرع زانا ئاینیەکانی کوردستان خزمەتی عوسمانی بکەن ویارمەتی بدەن چونکە عوسمانی بەپێچەوانەی شریعەتی ئیسلامی رەفتاریان دەکرد و جەعفەریەکان (مەبەستی علویەکانە) هەڵوێستێکی دوژمنانەیان هەبوە کە ئەمە بوو بەهۆی دووبەرەکی لە ناو ئیسلامەکانا کە ئەمە سوودی حکومەتی تیابوو.

بەوجۆرە کورد لەویلایەتەکانی ئەرزرۆم، خربوط، ئالعزیز، دیاربکر، بدلیس، وان کەوتنە خۆیان و هەستی نەتەوایەتی لە ناویانا پەرەی سەند و ملاسلیم لەگەڵ زاناو شێخ و سەرکردەکانی ئەوناوچانە لەسەرئەوە رێك کەوتن پێویستە کوردستان (ئیدارەیەکی خود موختاری) هەبێ، بەڵام سەر بە خلافتی عوسمانی بێ. حکومەتی عوسمانی بەرامبەر بەوە شپرزەبوو لە حزیرانی ١٩١٠دا لەشکرێکی ناردە سەرملا سلیم و لەلایەن ئالایەکی سوپایی تورکەوە لە رێگای (وان — بدلیس)دا ملاسلیم گیراو ساتێك شێخ شهاب الدین بەوەی زانی بەخۆیو (١٠٠) سواری کوردەوە هێرشی بردە سەرئالاکە ی تورك و ملاسلیم رزگارکردو شەر لە نێوان هەردو لادا هەڵگیرسا. لەشکری تورك لە شاری بدلیس دا بریتیبوو لە چوار طابوری سەرباز و بطاریەیەکی تۆپو (١٢) مترەلۆز لە گەڵ ئەو هەموو چەك و لە شکرەشدا کە شێخ شهاب الدین هێرشی کردە سەریان لە بدلیسدا تورکەکان شکان و (٢) تۆپو (١٠) مترەلیۆزو (٣٠٠) تفەنگ گیراو (٣٢٠) سەربازی تورك بەدیل گیران و کوردیش لەوشەڕەدا (٥٠) شەهیدی هەبوو، بەوجۆرە سوپای تورك بەرەو دیاربکر شکاو والیی بدلیسیش رایکرد. لە مانگی ئابی ١٩١٠دا لە شاری دیاربکرەوە فرقەیەکی تورك هێرشی بردە سەر بدلیس و داگیری کردەوە

که زۆربەی پێشڕەوی هێزەکە ی تورك بریتی بـوو لـە ئەرمەنیـەکان کـە خرابونـە پێشەوە لە بەرئەوە زۆریان لیٚ کوژراو کوردیش لەوشەرەدا (٢٠) شەهیدی هەبوو، بەڵام دوای ئەوە جارێکی تر شێخ شهاب الدین شاری بدلیسی گرتەوەو تورکەکان شکان)).

بۆ یەکەم جار سەرچاوەیەك باسی کێشەی نێوان ڕێبازی قادری و نەقشبەندی کردوە کـە ئیسـماعیل حقـی شـاویس ووتویـەتی: تورکـە کـان جیـاوازیی ریبـازی ئاینیان بۆ سوودی خۆیان بەکار هێناو توانیان سوودی لیٚ وەربگرن و دوویەرەکی لە ناویانا پەیدابکە ن و توانیبویان شێخ ەکانی قادری لە قەزای (کیفرا) کە شێخ عبدالباقی و شێخ حسێن بون و هەردوکیان قادری بون و تورکـە کـان توانیبویـان ئەوانە بکە ن بەلایەنگری خۆیان و دژی شێخ شهاب الدین (کە نەقشـبەندی بـوە) وەبەپێی پیلانی تورکە کان ئەوانە خیانەتیان لە شێخ شهاب الدیـن کـردو هـەردو هێرشیان بردەسەر شاری بدلیس و شان بەشانی تورکەکان لەگەڵ کوردا کە وتنە شـەڕەوە، بـەڵام بـۆ ئـەوەی خوێـن نـەڕژیٚ شـێخ شـهاب الدیـن شـاری بدلیســی بەجیٚهێشتو رویکردە (مکس وسێرت) و بەو جۆرە دیسان تورکە کان بدلیسیان داگیر کردەوە.

ملا سـلیم هـەتا سـاڵی ١٩١٣ لـە وناوچانـەدا مایـەوەو حکومـەت تەنـها لـەناو شـارەکەی بدلیـس دەسـەڵاتی هـەبوەو دەورووپشـتەکە ی بـەدەس کـوردەوە مابونەوە.

رۆژی ١٨ ٤ ١٩١٤ حکومـەت لـەوان و مـوش و دیـاربکر و ئەرزرۆمـەوە بەسـێ فرقە سەرباز هێرشی کردە سەر شـێخ شـهاب الدیـن و خلیفـە ملاسلیم ئەفـەندی زازاو لە شەڕێکی خوێناویدا شێخ محمدی بـرای شـێخ شـهاب الدیـن و سـید علـی ئەفەندی ئاموزای هەردوکیان بەدیل گیران و لە گەڵ (١٠) کە سی تردا هەڵواسران و گیانیان لە پێناوی کوردا بەخت کرد.

ملاسلیم بێدەنگ نەبوو بەرامبەر بەو ڕووداوانە، بـەڵکو بـەخۆیو (٤٠) پیـاوی خەباتکە رەوە شەبەیخونێکیان کردو چونە ناوشاری بدلیسەوە و بـۆ مـاوەی (٥) سەعات شەڕکراو لەوشەڕەدا دووئالاٚ قومـاندانی و (٥) ئەفسـەرو (١٤٠) سـەربازی تـورك کوژران، بـەڵام کـە ڕۆژبـوەوە ملاسـلیم و هاوڕێکـانی گـەمارۆ دران و (١٠)

کەسیان لێ شەهید کراو (٢٠) یان خۆیان دەربازکرد و ملاسلیم لەگەڵ دە کەسەکەی تردا خۆیان گەیاندە ناو قونسوڵخانەی روس و لەوێ مانەوە هەتا کاتی دەسپیکردنی شەری جیهانی و کە شەڕدەستی پێکرد تورکەکان قونسولخانەی روسیان بەدیل گرتو ملاسلیم و دە قارەمانەکەی لەگەڵیا بون هەموویان لە بەردەمی قونسوڵخانەکە دا هەڵواسین و بەو جۆرە ملا سلیم شەهید بوو. کە ملا سلیم لە سێدارە درا تەمەنی (٦٥) ساڵ بوو، وەختێ بردیانە بەر سێدارە والیی بدلیس لێی پرسی:

خۆتۆ دەتووت خودا سەرکە وتنتان دەداتێ کە چی وا ژێر کەوتی؟؟ ملاسلیم لەوەراما پێی ئەڵێ بەڵێ خودا سەرکە وتنی بەئێمە بەخشی بەڵام لەناو خۆمانا خائن هەبوو لە بەرئەوە خوا سەرکە وتنەکە ی لێ سەندینەوە و مردن لە رێگەی هەموانەو هەمووشی هەریەك رەنگە...

مەلاسلیم بەسەر قەنارەکە وە هاواری کردو فەرمووی:

((مژدەبێ لە تۆ (مەبەست والیی بدلیس بوە) کە دۆزەخ جێگەتەو، ئەمین بە، گەلی کورد حسابێکتان هەر لەگەڵا دەکات و هەرگیز لە حسابی کورد دەرناچن و لە دنیاو قیامەتدا هەر ژێردەکە ون چونکە حوکمو سەڵتەنەتی درۆو دەلە سەو فێڵو تەلە کە بازی بەزوڵمو زۆرداری ناچێتە سەرو هەق داناپۆشرێ)).

مەلاسەلیم وەکو ئیسماعیل حقی شاویس باسی کردوە پیاوێکی زاناو شاعرو ئەدیب بوەو جگە لە زمانی کوردی تورکی و عەرەبی و فارسیشی دەزانی و شارەزای هەموو شێوە زمانەکانی کوردیش بوە و (وەکو بەر لەمە وتبوی ملاسلیم زانا بوە) و دیوانی (مەسنەوی بخاری)ی بەناوبانگی بەشێوەی کرمانجی شرح و تفسیرکردبوو، لە پێناوی سەربەخۆیی کوردستانا دووجار بۆ ئەستەمبوڵ و چوار جاریش چووبوو بۆ حیجاز.

زۆرجار شێخ شهاب الدین تکای لە ملا سلیم کردبوو دانیشێتو وازبێنێ و هەرچیەکی بوێ جێبەجێ دەکرێ بەڵام ملاسلیم لە چالاکی خۆی نەکەوتو لە هەڕەشەو گورەشەی تورکە کان نەترساو هەمیشە ئیرشادی دینی و میللیی خۆی دەکردو دەیوت: هەتا لە پێناوی دین و قەومی کوردا خوێنی خۆم فیدا نەکەم واز ناهێنم. ئیسماعیل شاوەیس لە کۆتایی باسەکەیدا لەوە دواوە کە حکومەتی

عوسمانی (٦٤) ئـالآی سوپایی لـه ویلایەتـەکانی رۆژھـەلآتدا کـه بریـتی بـوه لـه کوردستان له خێڵەکانی کورد پێك هێنابوو بۆ پچڕ پچڕکردنی بزوتنەوەی پیرۆزی گەلی کوردو بۆ ئەوەی شیرازەی یەکێتی و برایەتی کورد تێك بچێ و رێگه نـەدرێ هێزێکی کوردی بەتوانا بەرامبـەر بـه حکومـەت پێـك بـێ و ئیسـماعیل شـاوەیس داخی ئەوەی خواردوه ئەو (٦٤) ئالآ سوپاییەی له کورد پێك هێنرابوو هیچـی لـه شۆڕشی کورد بەشداری نەکردبوو، بـۆ یـه شـەرمەزاری و ڕوورەشـی بـۆ ئەوانـەی خیانـەت لـه میللـه تەکـه ی خۆیـان ئەکـه ن و شانازی بـۆ گیـانی مــلا ســلیم و هەڤاڵەکانی.

دەربارەی ئـەو بەسـەرهات و ڕووداوانـەی لەوباسـەی ئیسـماعیل شاوەیسـدا باسکراوە، هەندێ جیاوازی دێتە بەرچاو له گەڵ ئەو سـەرچاوانەی تـر کـه باسـی ئەم ڕاپەڕینەی ملا سلیمیان کردوه.

وەکو بۆ مان دەردەکـه وێـت ئیسـماعیل شاویس لـەو باسـەیدا تەنـها باسـی ملاسلیم و شێخ شهاب الدین کردوه که چالاك بـون و سـەرکردەی ئـه بزوتنەوەیـە بوون، له کاتێکدا له کتێبەکەی ولیدحمدیدا سەرچاوە ٢٣ که پەنای بردۆتە بـەر دۆکیۆمێنتـەکانی نـاو ئەرشیفی وەزارەتـی دەرەوەی بریتانیـا، لـه مــەدا ئــەو ڕاپەڕینەی بەناوی ڕاپەڕینی (شێخ سعید علی) ناوبردوه له (خیزان) که ئەو شێخ سعیدە کوری شێخ جلال الدین بوەو وتویەتی بەرله مەش شێخ سعید لـه سـاڵی ١٨٧٧دا له شەری روس و تورکیادا ڕاپەڕیبوو وەکو له دۆکیۆمێنتی ژمـارە(Fo. 2130 -371) ڕۆژی ٢٢ ٣ ١٩١٤دا تۆمـارکراوە کـه بریتیـه لـه ڕاپۆرتێکـی نـائبی قونسـوڵی بریتانیـا لـه (وان)ـەوە نـاردوێتی بـۆ بـاڵیۆزی حکومـەتی بریتانیـا لـه ئەستەمبوڵ.

بەپێی کتێبەکەی ولید حمدی ڕاپەڕینەکەی شێخ سعید گەیشتبوە ناوچەکانی (داویك) و (کارجلکـان) و حکومـەتی تـورك لـه مـانگی مــارتی ١٩١٤دا هــێزێکی گەورەی ناردبوە سەر شێخ سعید له دەوروبـەری بدلیسـدا لـه سـەرەتای مـانگی نیسـانی ١٩١٤دا لـه شـەڕێکدا ناچـارکرا بدلیـس بـەجێ بێڵێـت و لــەو ڕاپۆرتــەی پیشـوودا وتـراوە (تحسـین بـەگ)ی والی وان بــەونائبی قونسـوڵەی وتبـوو ئــەو ڕاپەڕینە بەهاندانی ملاسلیم بـوە کـه نـاوی خـۆی نـاوە خلیفـه سلیم کـه مـەلای

تایبەتی شێخ جلال الدین کۆچکردوبوە (لە راپۆرتەکە دا وتراوە زۆر باوەریش بەقسەکە ی والیی تورك ناکرێ)

بێجگە لەوە ولید حمدی لە کتێبەکەیدا وتویەتی شێخ شهاب الدین برازای شێخ سعید بوە، لە کاتێکدا ئیسماعیل شاوەیس وتویەتی شێخ شهاب الدین کوری شێخ صبغەالله بوە کە بەپێی هەردوو سەرچاوەکە دەبی شێخ سعید و شێخ صبغەالله برای یەك بون کە چی ئیسماعیل شاوەیس لە باسەکەیدا نە باسی سعیدو نە باسی جلال الدین کردوە.

ولید حمدی لە کتێبەکەیدا لە باسی راپەرینەکە ی ملا سلیم دا وتویەتی:

((کاتێ ملاسلیم دەستیکرد بەراپەرینەکە ی، شێخ شهاب الدین کە برازای شێخ سعید بوە لە گەڵ شێخ سعیددا پیرۆزباییان لە راپەرینەکەی ملاسلیم کردو شێخ شهاب الدینو چەند شێخیکی تر رووبانکردە بدلیس و لەوێوە داخوازیەکانی خۆیان نارد بۆ (مظهربەگ)ی والی وان کە مظهربەگ لابرا (مصطفی عبد الخالق) کرابە والی و دەستیکرد بەریکخستنی پاسەوانی میللی لە دانیشتوانی شاری بدلیس و (٣٠٠) چەکداری تازەتان نێررا بۆ والییو رۆژی ١ ٤ ١٩١٤ پەلاماری کوردەکان درا و لە ئەنجامی ئەو پەلاماردانەدا ملاسلیم و شێخ شهاب الدین و سێ شێخی تر پەنایان بردە بردەبەر قونسوڵخانەی روسو قونسوڵ رازی نەبوو بیانداتە دەس تورکە کان.

بەپێی (British vce consulate. van.44-1914 ibid) کە ولید حمدی ئاماژەی بۆ کردوە والی تورك وتویەتی لەشەرەدا کوردەکان ١٠٠–٢٠٠کە سیان لێ کوژرا.

دوای ئەوە تورکەکان ئابلۆقەی قونسوڵخانەی روسیان دابۆ ئەوەی شێخ سعید رانەکاو أعلانی عورفی کرد.

ولید حمدی ئاماژەی بۆ نامەیەکی (Sir Mallet) کردوە کە لە رۆژی ١٣ ٤ ١٩١٤دا ناردبووی بۆ (Sir Edward Grex) بەپێی ئەوە باسی ئەوە کراوە حکومەتی روس بریاری دابوو ئەوپەنابەرانە نابێ بدرینە دەس حکومەتی تورك ئەبوایە دەربازیکرانایە.

رۆژی ٢٦ ٤ ١٩١٤ شێخ شهاب الدین له نزیك شـاری (دیـاردین)ەوه لـه لایـەن قائمقامی (ئەرجیش) له کاتێکدا تەقەلای دابوو رابکا لەگەڵ (٢٠٠) کورد، که لـەو کتێبەی ولید حمیدا ناوی ئەم دەکه سەی تیادا هاتوە:

١ـ شێخ سعید علی خیزان.

٢ـ صلاح الدین کوری شێخ سعید.

٣ـ فاخر خلیل.

٤ـ ملا محیالدین.

٥ـ ملا حیدر.

٦ـ ملا خلیل (که ئەمانه هەمویان خەڵکی خیزان بون).

٧ـ حسێن ئاغای زاوای شێخ سعید که خەڵکی (کارتشفیان) بوو.

٨ـ جعفر ئاغا.

٩ـ فرید ئاغای ئامۆزای شێخ سعید.

١٠ـ حسـێن بـەگی خـەڵکی (کـاواش)، هـەروەکو لـه راپۆرتەکـەی (ibid) ی پێشوودا ناویان هاتوە.

قونسـوڵی روس لـه راپۆرتێکیـا وتوویـەتی لـه نـاوی ئەوکـه سـانەوه کـه بەشداربون له راپەرینەکه دا دەردەکه وێ ئەمه بزوتنەوەیەکی ئاینی بوه.

دادگـای حکومـەتی عوسمـانی بریـاری هەڵواسـینی (١٧) کەسـیدا لەگـەڵ ئـاوارەکردنی (٦٠) کـه سرو لەوانـەی بەشـداریان کردبـوو لـەو راپەرینـەدا بـەپێی کتێبەکەی ولید حمدی، تەنها شێخ محمد ئەمین که خەڵکی (سێرت) بوو لەگەڵ (محمد خان)ی برایدا توانیبویان خۆیان دەربازبکه ن.

بەپێی دۆکیۆمێنتی ژماره (Fo. 371- 2140 No: 548 رۆژی ٤ ٩ ١٩١٤) دوای ئەم سەرکەوتنەی تورك سـوڵتان مدالیـای (مجیـدی) دەرەجـه یـەکی دا بـه مصطفی عبدالخالق بـەگی والی بدلیس و تحسـین بـەگی والی وان و لـه رۆژی ٧ ٥ ١٩١٤ ئەمانەی خوارەوه هەڵواسران:

١ـ شێخ شهاب الدین.

٢ـ شێخ عبدالشریف.

٣ـ شێخ سعید علی .

٤ـ ملا فقی علی .

٥ـ ملا جنید.

٦ـ ملا مجید.

٧ـ حاجی جبران .

٨ـ حاجی بایز.

٩ـ حاجی خورشید.

١٠ـ علی ئەفەندی (کە یەکێك بوە لە پاسەوانەکانی جارانی سوڵتان).

١١ـ ملا محی الدین .

بێجگە لەوانە (١٠) کەسی تریش هەڵواسران (باسی ناوەکانیان نەکراوە).

بە پێی کتێبەکەی ولید حمدی وتویەتی ئەوانەی خۆیان گەیانە قونسوڵخانەی روس تەنها ملاسلیم بوو بەڵام اسماعیل شاویس وتبووی (١٠) کە س بون.

بەپێی کتێبەکەی ولید حمدی دوای ئەمە حکومەتی عوسمـانی هێرشـی بـردە سەر (جزیرە) کە جێی بنەماڵەی بدرخانیـەکان بـوو لـەوێ حسـن بدرخـانی بـرای عبدالرزاق بدرخان گیراو کورێکی سلێمانی برایشی بەر گولله کەوت. ولیـد حمـدی لە کتێبەکەیدا باسی پێوەندی شێخ سعید (مەبەستی سعیدی شێخ جـلال الدیـن بوە) و شێخ عبدالسلامی بارزانی کردوە کە بریار وابوە هەردولایان لە یەك کـاتدا پەلاماری بدلیسو بـارزان بـدەن. شـێخ عبدالسـلام راپـەرینی خـۆی دەسـپێکردو هێزی تورك لە موصڵەوە بەرەو بارزان چوو بۆ دامرکانەوەی شۆرشـەکە ی شـێخ عبدالسلام .

بـەپێی ئـەوەی (ibid) باسـیکردوە کـە ئامـاژەی بـۆ راپۆرتێکـی (Sir. L. Mallet) ی قونسوڵی بریتانیا کردوە کـە نـاردویێتی بـۆ باڵیۆزخانـەی حکومـەتی بریتانیا لە ئەستەمبوڵ لە رۆژی ٥ ٥ ١٩١٤دا دەرئەکە وێ شێخ عبدالسلام یەکێك بوە لەو (٦) کە سەی لە لایەن کوردەکانی رۆژهەڵاتی عمادیەو موصڵەوە رێزیـان لێگیراوە.

بـەپێی راپۆرتەکـە ی رۆژی ١٦ ٥ ١٩١٤(ibid ) باسـیکردوە هـێزی تـورك پەلاماری شێخ عبدالسلامی داوە لە بارزان و لە دوای دوو رۆژ خۆی و تاقمەکە ی

چووبونە ناوخاکی ئێرانەوە بۆ لای سید طـەی شمزینـی بـەڵام لـە دوایـیدا تورکـە کان شێخ عبدالسلامیان گرت و أعدامیان کرد.

لە دوای ئەو دوپاسەی ئیسماعیل حقی شاویس و ولید حمدی ، دەچینە سـەر ئەو باسەدوورودێژەی دوکتۆر جلیلی جلیل دەربارەی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانـە لـە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٥٥ باسیکردوە و لە لاپەڕە ١٩١دا وتویەتی :

((سـاتێك ژۆن تـورك دەسـەڵاتی گرتـە دەسـت بـۆ یـان دەرکـەوت بەئاسـانی چارەسەری ئەو کەموکوڕیانەیان پێ نەدەکرا کە لە زەمـانی سـوڵتان عبدالحمیـدا پەیدابوبو، ئینگلیز و فەرەنسەو ئەڵمانیا و روسیا بەتەواوەتی دەستیان خستبوە ناو کاروباری وڵاتەوە و لە دوای شکانی تورك لە شەڕەکانی طرابلسو باڵقاندا لـە سـاڵانی ١٩١١–١٩١٢دابـاری دەوڵـەت بەتـەواوەتی قـورس و ئـاڵۆز بوبـوو ، ناحەزەکانیان دژیان کەوتنە جموجۆڵ کە کورد یەکێك بوو لەوانـەی دژی أتحـادو ترقی کە وتبونە کارو لەوڕووەوە پەیامنێری گۆڤاری (ئارارات) ی ئەرمـەنی ژمـارە ٣ی ساڵی ١٩١٣ لە لاپەڕە ٧٨یدا کە لە لندن دەردەچوو باسێکی بڵاوکردبـوەوە و وتبـوی کوردەکـان بۆیـان دەرکـە وتـوە (ژۆن تـورك) زۆری پـێ ناچـێ هـەموو مافێکی کورد پێشێل دەکا بۆ یە لاوازیی ئـەو رۆژانـەی تورکیـان بەهـەل زانیبـوو سەرۆکە کوردەکان لە ئەستەمبوڵ دەسـتیانکرد بـەخۆ ئامـادەکردن و لـە مـانگی ئایـاری ١٩١٢دا کۆبونـەوە و بڕیاریـاندا حزبێکـی یـەکگرتوو پێـك بـهێنریت و لەوکۆبونەوەیەدا ئامانجی ئەو حزبەیان دەسنیشانکرد و بڕیاریان دا دەس بکرێت بەڕاپەڕینێك کە لەو ڕاپەڕینەدا تاکتیکی ئەلبانەکان بەکار بهێنرێت و باج نـەدرێ بەحکومەت و کابەدەستانی تـورك لـە کوردسـتان بکرێنـە دەرەوە وحکومـەتێکی کـاتیی سـەربەخۆی کـورد دامـەزرێنرێت. هەڵوێسـتی تـورك دژی ئـەو کوردانـەی دەیانویست خۆیان هەڵبژێرن بۆ ئەندامێتی پارلە مان، کوردی تەواو بێزار کردبوو لە ئەنجامی ئەو هەڵوێستەدا کوردەکان بۆ دژایەتی اتحادو ترقی چوونە ناو ریـزی حزبـی (أئتـلاف و حریـە) وە ( لـە باسـێکی تایبـەتدا کـە بـۆ أتحـادو ترقـی تەرخانکراوە باسی أئتلاف و حریە دەکەین) .

دەربـارەی بزوتنـەوەی هەسـتی نەتەوایـەتی کـورد لەورۆژانـەدا هـەروەکو (چـێرکۆف)ی قونسـوڵی روسـیا لـە بدلیـس لـە نامـــەی رۆژی ٣١ ٧ ١٩١٢دا

باسیکردوه که لەناو ئەرشیفی ساڵانی ۱۹۰۷-۱۹۱۳ی باڵیۆزخانەی روسیا لە ئەستەمبوڵ پارێزراوە، لەونامەیەدا وتویەتی: رۆژ لە دوای رۆژ هەستی نەتەوایەتی لە ناوکوردا پەرەدەسێنێت و مێشکی هەموو کوردەکانی ناوچەی بدلیسی پڕکردوەو لە سنوری ئەویش چوەتە دەرەوە. چێرکۆف لە باسەکەیدا وتویەتی: کوردەکان بۆ ئەوەی لە بدلیس و ویلایەتەکانی تردا دەسەڵات بگرنەدەس و لە ناوچەکانی سێرتو خارزان، بۆ تان ، شیروان، خیزان و ماردین و لیڤین و جزیرە و سلیڤان و زاخۆو سلیمانیەو کرکوك خەڵك دەیانویست دەسبگرن بەسەر مخزنی چەکە کانی حکومەتداو کاربەدەستانی حکومەتیان لێ دەربکرێ و کورەگەورەکەی بدرخان بکرێت بەسەرۆکی ئەو ئەمارەتانە لە شێوەی ئەمارەتەکانی ئەڵمانیا. جلیلی لە لاپەرە ۱۹٤ی ئەو کتێبەیدا باسی ئەو نامانەی کردوە کە لە لایەن باڵیۆزی روسیاوە نێررابوون بۆ وەزارەتی دەرەوەی روسیا دەردەکەوێ کە رێکخراوێکی نهێنی کورد هەبوە بەناوی (ئیرشاد) کە خۆی ئامادەکردبوو بۆ دەسکردن بەراپەرینێك، هەروەکو (خیرالدین بەرازی) بۆ (شترمین) ی قونسوڵی روس لە ئەرزرۆمی روونکردبوەوە لەناو ئەندامانی ئەورێکخراوەدا چەند کەسێکی تیابوە وەکو: سیبکی عزیز بەگ، زیرکی عقید ئەفەندی ئەلاشگێرنسکی، شێخ عبدالرحمن ئەفەندی، سلیم ئەفەندی (مەبەست ملاسلیم بوە کە لە باسەکانی پێشودا وەکو سەرکردەیەکی شۆڕشی ئەو رۆژانە ناوی هاتوە)، بکر ئەفەندی .

لە بەهاری ۱۹۱۳دا لە ناوچەی (شیروان) ی سەربە (سێرت) سەرۆکە کوردەکان کۆبونەوە بۆ دروستکرنی ئەمارەتێکی سەربەخۆ وپێوەندیکردن بەروس و کاربەدەستانی قفقاس و بڕیاردرا کمال بەگ بنێرێت بۆ (ئەوەی هەڵوێستی روسەکان تێ بگا بەرامبەر بەکوردو ئایا چەکیان لەولن دەس دەکەوێ وەیا چەك لە رێگەی خاکی ئەوانەوە دەگاتە کوردستان (جلیلی لە پەراوێزی لاپەرە ۱۹٦دا دەربارەی ئەو کمال بەگە وتویەتی خەڵکی سێرت بوەو لە فەرەنسا خوێندبووی ودوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر هەر لە تفلیس مایەوە و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خەریکی کاروباری زانیاری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی بوە). هەروەکو قونسوڵی روس لە بدلیس بۆ (غیرس) ی باڵیۆزی نوسیبو (دیارە

باڵیۆزی روس لە ئەستەمبوڵ) ئاگاداری کردبوو بزوتنەوەی کورد گەیشتبوە ویلایەتی موصلْ و شێخەکانی کورد بۆ بیرکرنەوە لە دروستکردنی ئەمارەتێکی کورد کۆبونەوەیەکیان کرد.

دبلۆماسیەکانی ئینگلیز وێڵ بون بەدوای ئەوەدا بزانن ئاخۆ کوردەکان هەتا چ رادەیەك خۆیان کۆکردبوەو چۆن پێوەندیان بەناوچەکانی تری کوردەوە دەکرد و قونسوڵی ئینگلیز هەوڵیدا پێوەندی بەکمال بەگەوە بکا . سەرکردایەتی راپەرینەکە چەند هەنگاوێکی نا بۆ پێوەندیکردنی نێوان کوردو ئەرمەنیەکان و لە ساڵی ١٩١٣دا (ملاسلیم) پیوەندی بەنوێنەری ئەرمەنیەکانەوە کرد لە (موش) و (بدلیس) و ناوچەی (تارون)و لەگەڵ سەرۆکە کانی ئەرمەنیدا کۆبوەوە و باسی پەیمانێکی دووقۆڵیان کردو هەردولا لە سەرئەوە رێك کەوتن ئەو راپەرینە بریتی بێ لە راپەرینی کوردو ئەرمەنی و لە ناوچە ئازادکراوەکانا ئەرمەنیەکان مافی ئۆتۆنۆمیان دەبێ. (گارۆ ساسونی) کە ئاگاداری رووداوەکانی ئەورۆژانە بوە لەوکتێبەیدا لە بیروت چاپی کردوە (جلیلی باسی ساڵی چاپکردنی نەکردوە) بەناوی (بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردو پێوەندی لەگەڵ ئەرمەنیدا) لە باسی ئەو رێکەوتنەدا خەفەتی ئەوەی خواردوە نەیتوانیبوو دەقی ئەو رێکەوتنەی دەس بکە وێ، بەڵام ئامارەی بۆ بەشە گرنگەکانی کردوەو وتوویەتی:

((جگە لەو بەڵێن و بریارانەی درابون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی زەویوزار و باسی برایەتی کوردو ئەرمەنی، باسی ئەوەش کرابوو بەتێکۆشان و هاوکاریکردنی هەردولا باسی سەربەخۆیی ویلایەتەکانی رۆژهەلاتیش کرابوو کە بەچ شێوەیەك کاروباریان ببرێت بەرێوە)).

جلیلی لە باسەکەیدا وتویەتی: ژۆن تورك بەترسەوە دەیروانیە ئەوکۆبونەوەو خۆکۆکردنەوەیەی کوردو کە وتە تەقەلادان بۆ تێکدانی نێوانیان و لە لایەکەوە بەنەهێنی بەڵێنی دابوو بە ئەرمەنیەکان کە وا دەرەبەگە کوردەکان لە ناوچەی ئەرمەنیەکانا دەردەکەون و لە لایەکی تریشەوە دەرەبەگە کوردەکانیان دژی ئەرمەنیەکان هان ئەدا.

جێگری قونسوڵی روس لە (وان) لەو رووەوە نوسیویەتی: ((بزوتنەوەی کورد دووڕووی هەیە، یەکەمیان بریتیە لە بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی لە ناو

بالیۆزی روس لە ئەستەمبوڵ) ئاگاداری کردبوو بزوتنەوەی کورد گەیشتبوە ویلایەتی موصڵ و شێخەکانی کورد بۆ بیرکرنەوە لە دروستکردنی ئەمارەتێکی کورد کۆبونەوەیەکیان کرد.

دبلۆماسیەکانی ئینگلیز وێڵ بون بەدوای ئەوەدا بزانن ئاخۆ کوردەکان هەتا چ رادەیەك خۆیان کۆکردبوەو چۆن پێوەندیان بەناوچەکانی تری کوردەوە دەکرد و قونسوڵی ئینگلیز هەوڵیدا پێوەندی بەکمال بەگەوە بکا . سەرکردایەتی راپەرینەکە چەند هەنگاوێکی نا بۆ پێوەندیکردنی نێوان کوردو ئەرمەنیەکان و لە ساڵی ١٩١٣دا (ملاسلیم) پیوەندی بەنوێنەری ئەرمەنیەکانەوە کرد لە (موش) و (بدلیس) و ناوچەی (تارون)و لەگەڵ سەرۆکە کانی ئەرمەنیدا کۆبوەوە و باسی پەیمانێکی دووقۆڵی‌یان کردو هەردولا لە سەرئەوە رێك کەوتن ئەو راپەرینە بریتی بێ لە راپەرینی کوردو ئەرمەنی و لە ناوچە ئازادکراوەکانا ئەرمەنیەکان مافی ئۆتۆنۆمیان دەبێ. (گارۆ ساسونی) کە ئاگاداری رووداوەکانی ئەورۆژانە بوە لەوکتێبەیدا لە بیروت چاپی کردوە (جلیلی باسی ساڵی چاپکردنی نەکردوە) بەناوی (بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردو پێوەندی لەگەڵ ئەرمەنیدا) لە باسی ئەو رێکەوتنەدا خەفەتی ئەوەی خواردوە نەیتوانیبوو دەقی ئەو رێکەوتنەی دەس بکە وێ، بەلام ئامارەی بۆ بەشە گرنگەکانی کردوەو وتوویەتی:

((جگە لەو بەڵێن و بریارانەی درابون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی زەوی‌وزار و باسی برایەتی کوردو ئەرمەنی، باسی ئەوەش کرابوو بەتێکۆشان‌و هاوکاریکردنی هەردولا باسی سەربەخۆیی ویلایەتەکانی رۆژهەلاتیش کرابوو کە بەچ شێوەیەك کاروباریان ببرێت بەرێوە)).

جلیلی لە باسەکەیدا وتویەتی: ژۆن تورك بەترسەوە دەیروانیە ئەوکۆبونەوەو خۆکۆکردنەوەیەی کوردو کە وتە تەقەلادان بۆ تێکدانی نێوانیان و لە لایەکەوە بەنەهێنی بەڵێنی دابوو بە ئەرمەنیەکان کە وا دەرەبەگە کوردەکان لە ناوچەی ئەرمەنیەکانا دەردەکەون و لە لایەکی تریشەوە دەرەبەگە کوردەکانیان دژی ئەرمەنیەکان هان ئەدا.

جێگری قونسوڵی روس لە (وان) لەو روەوە نوسیویەتی: ((بزوتنەوەی کورد دووڕووی هەیە، یەکەمیان بریتیە لە بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی لە نلو

روشنبیرەکانا دوهەم ئەوانەن دژی ئەرمەنیەکانن. سەرکردەی بەشی یەکەم عبدالرزاق بدرخانە، بەشی دوهەمیان پیاوە ئاینیەکانن کە سەربەسوڵتانی تورکی فیڵبازو دەسبڕن حکومەتی تورك پۆلیسی خۆی هەیەو دەینێرێتە سەربازرگانەکانی کورد بەهۆی بەکرێگیراوەکانیانەوە وەکو جعفرو حسێن دەستیان کردوە بەکوشتنی کوردو یەکێکی وەکو (خیرالدین بەرازی) ساتێك بەهەندێ پارەوە لە ئێرانەوە دەگەڕایەوەو چەند بەیاننامەیەکیشی پێ بوو تیایا داواکرابو کەس نابێ ملکەچ بێ بۆ تورکەکان ئەوخیرالدینە لە لایەن تورکەکانەوە کوژراو دەمودەس (سلیمان بەگ) و دووبرایان گرت کە ناویان (فارحۆ) و (نوری) بوو لەگەڵ (ربانی مصطفی بەگ) ی قائمقامی ناوچەکەو چەند کەسیکی تریشیان گرتو حکومەت بڕیاریکی تازەی دەرکرد بۆ سەندنی باجی مەڕو ماڵات (ئەغنام رسومی) و باجی بازرگانەکانێتی و لە ٢٠٪ی باجەکەی لە چاو هی پێشوودا زیادکراو باجی گومرگ کرا بە دووقات)).

دەربارەی ئەو باج سەندنە، ڕۆژنامەی قفقاسی ژمارە ٨٤ ساڵی ١٩١٤ باسی ئەوەی کردوە چۆن تورکە کان لە دوای شەڕی بالقان لە جیاتی ئەوەی بەباشی لەگەڵ کوردا رەفتاربکەن دەستیانکردوە بەزۆرکردنی باج و کارگەیشتە ڕادەیەك باج لە منداڵیش دەسێنراو هەر کاربەدەستە بەشێوەیەك و بەئارەزوی خۆی باجی دەسەند.

هەروەکو (چێرکۆف) لە ئەرشیفی وزارەتی دەرەوەی روسیا ساڵی ١٩١٤دا باسیکردوە، ئیتر کورد لەووزەیدا نەمابوو بڕیاریاندا باج نەدەن بەحکومەت و ئەوانەی لە بدلیسەوە نێررابوون بۆ (مۆرکی) و(خوبود) دەرکران. پەیامنێرە ئەورووپاییەکان باسی کوردەکانی (ترابیر) و دیاربکرو موصلۆ ناوچەکانی تریان کردوە چۆن بڕیاریان دابوو باج نەدەن بەحکومەت و لە (بایزید) بەرەنگاری هێزەکانی حکومەت بونەوە و لە نزیك (ریزا) سەربازەکانی کورد لە هێزی حکومەت جیادەبوونەوە و دەچوونە پاڵ یاخیبوەکان.

بۆ نمونە: پەیامنێری ڕۆژنامەی (ئورایزن) ی ئەرمەنی ژمارە ٦٦ی رۆژی ٢٧/ ٣/ ١٩١٤ نوسیبوی:

((کوردە یاخیبوەکان دەڵێن: لە بەرچی کاریەدەستەکانی حکومەت مووچەی زۆر وەردەگرن‌و ژمارەی ئەو بەرتیل خۆرانەی تورك کە هەر خەریکی ڕاوو رووتــن ژمارەیـان تابێ زۆرتـر دەبێ؟ ئـەم کردەوەیـە هـەموی بۆ ئەوەیـە جوتیــاران‌و دانیشتوانی شارەکانی کوردی پێ هەژار بکرێ.

جلیلی لە لاپەرە ۲۰۱دا ئاماژەی بۆ رۆژنامـەی (ئازتامـارت) ی ژمـارە ۱۵۲٤ی ۲۹/ ۳/ ۱۹۱٤ی ئەرمەنی کردوە کە گرتنــی سـەرباز کـارێکی وای کردبـوو بوبـوە هـۆی بلاوبونـەوەی گرانـی و برسێتی و ژنیـك گەیشــتبوە تینــی و بــە خــۆی و منداڵەکانیـەوە چوبــوە بــەردەرگای دەزگایــەکی حکومــەت‌و هــاواری کردبــوو هـەمومان بـەزیندویی بنێـژن چونکـە ئـەوەی هـەیبوو بـۆ منداڵــەکانی حکومــەت هەمووی بردوە بۆ خۆی و ئیتر منداڵەکانی بەچی گوزەران بکەن؟!

لـە ئـەنجامی ئـەو هەڵوێسـتەو لـەو بـارو دۆخـەدا ملاسـلیم چـەکدارێکی زۆری کۆکـردەوەو لـە شـارەکە ی خۆیـدا (کومـانش) ســەنگەری هەڵکــە نــدو لادێیــە ئەرمەنیەکانی دراوسی ملا سلیم لە ماڵەکانی خۆیان دەستیانکرد بەدروسـتکردنی شیر بۆ راپەریوەکان لە سەر تکای مـەلا سـعید (مەبەسـتی شـێخ سـعیدی کـوری شێخ جلال الدین بوە کە بەرلە مە باسکراوە)، ئەرمەنیـەکانی گونـدی (خولتیـك) پـتر لـە سـەد تـەوزینیان بــۆ راپــەریوەکان دروســتکردو بــەیانات بەناوخــەڵکدا بلاوکرایەوە داوا لە خەڵك کرا دژی تورکە زۆردارەکان راپەڕن و زۆری پــێ نــەچوو ئالای شۆڕش بەرزکرایەوە دروشمی سەربەخۆیی بلاوبوەوەو لە هەندێ شوێنی تر وەکو ناوچەکانی (تاتیك) و (خیزان) دەستیانگرت بەسەر رێگاوبانەکان‌و چەکیان لە پۆلیس و سەربازەکان سەندو لـە هەمولایەکـە وە چـاوەروانی گەیشـتنی مـەلا سلیمی سەرکردەی بزوتنەوەکە بون.

مەلا سلیم بەهۆی کوردەکانی بدلیسەوە ئاگاداری نیازو جموجۆڵی تورکە کان بوو لـە رۆژی ۱۰ ۳ ۱۹۱٤ دا بـەناوی کـوردە راپەریوەکانـەوە نامەیـەکی نـارد بـۆ سـەرۆکی ئەرمەنیـەکان لـە بدلیـس و هەسـتی برایــەتی کــوردی بــۆ دەربڕیبــوو بەرامبەر بە ئەرمەنیەکان.

یەکێك لە ڕەوشتە باشەکانی ئــەو کوردانــەی بــەناو گوندەکـانی ئەرمەنیـەکانا تێپەریانکرد، بەبێ رازیبوونی ئەرمەنیەکان هیچمـان نـەدەکرد و بـەپارە نەبوایـە

نانیان لە کە س وەرنەدەگرت و گەلێك رۆژنامە باسی ئـەو هەڵوێستەی کوردیـان کردوە کە بوبوە هۆی ئـەوەی ئەرمەنیـەکان بوبـون بەدۆسـتی کـوردو رۆژنامـەی (تۆرایزۆن) باسی هاوکاریکردنی جووتیارە ئەرمەنیەکانی بلاوکردبوەوە کـە چـۆن چووبونە پاڵ راپەریوەکان.

ساتێك مـەلا سلیم هـەوڵیدا بچێتـە ناوشـاری بدلیسـەوە، والی تـورك بـەناوی ووتو وێژ کردنەوە ویستی مەلا سلیم و هاوکارەکانی دوا بخا هەتا هـێزی تورکـی پێ دەگا بـەڵام تەقەلایـەکی بـێ سـوود بـوو، هـەروەکو لـە ئەرشیفی وەزارەتـی دەرەوەی روسیادا باڵیۆزخانەی روس لە ئەستەمبوڵ–ساڵی ١٩١٢تا١٩١٤ باسـی گفتو گۆیەکی ملا سلیمی تیادایـە کـە بەتورکـەکانی ووتبـوو: ((تائێسـتە کـورد هەرخۆی پاراستوە لە سەربازەکانی تورك بەڵام بەم نزیکانە هەموو کورد بۆ ئەوە رادەپەرێ پارێزگاری لە مافی خـۆی بکـاو دەسـەڵاتی تورکـە وڵات فرۆشـەکانیش نەمینێ)).

حکومـەتی عوسمـانی بـەتاوانی بێدەسـەڵاتی و کەمتەرخـەمی والی بدلیسـی لابردو لـە جیـاتی ئـەو (مصطفیعبدالخـالق بـەگ) کـە کابرایـەکی کـە للـە رەق و سەرگەرم بوو کرا بەوالی و دەسـتی کـرد بـەهێرش بـردن بـۆ سـەر راپـەریوەکان، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لـە سـەربازەکان خۆیـان دوورەپـەرێز راگـرتو وتیـان ئێمـە دەستمان ناچێتە خوێنی براکوردەکانمانەوە و چێرکۆف لە نامەکەیدا بۆ باڵیۆزی روس لە ئەستەمبوڵ ئاگاداری کردبوو کـە هـەندێ لەوسـەربازانەی نـێررابون دژی راپـەریوەکان چووبونـە پـاڵ کوردەکانـەوە و ئـەو سـەربازانەی لـە (وان)ـەوە نێررابون بەقسەی حکومەتیان نـەدەکرد. بەرامبـەر بـەوبارو دۆخـە حکومـەت لـە ناوەراستی مانگی مـارتی ١٩١٤دا اعلانـی عورفـی کـردو جەندرمـە تورکـەکان لـە بدلیس لە نزیك کە نیسەیەکی ئەرمەنیەکانەوە چوار کە سیان لە پیاوەکانی مـەلا سلیم گرت.

دەربارەی ئەو چوار گیراوە، پەیامنێری رۆژنامەی (تۆرایزۆن) لە ژمـارە ٦٥ی ٢٦ /٣/ ١٩١٤دا نوسیویەتی لە نزیك کە نیسەی (خاشراگاشار) چوار کـورد گـیران و بەکەلەپچەکراوی نێرران بۆ زینـدان و لـە رێگایانـا هـەرچواریان بەسـەربەرزی و شانازیەوە دەرویشتن تاخرانە زیندانەوە کە تا ئیمرۆ چـوار رۆژە هێشـتا هـەر لـە

بەندیخانەدان. ملا سلیم وەکو جلیلی لە لاپەرە ٢٠٥دا باسیکردوە، دەسبەجێ داوای بەردانی ئەو گیراوانەی کردو هەڕەشەی کرد ئەگەر بەرنەدرێن ئەویش (٥) جندرمە لە جیاتی ئەوان دەگرێ.

پاش ئەوە زۆری پێ نەچوو شەڕێکی قورس دەستی پێکردو تورکەکان ویستیان بە تۆپ باران کوردەکان بشکێنن بەلام بەفرو باران ئیشەکە ی لێ تیکدان و ملاسلیم بەخۆیو (٧٠٠) چەکدارەوە پەلاماری هێزەکەی تورکیان داو پاشەکشەی پێکرد بۆ پێدەشتەکان، بەلام راپەریوەکان زۆر بەناڕێكوپێکی دەجوولانەوە، بۆیە نەیانتوانی کارێکی وابکەن خەلکێکی زۆر ببێتە لایەنگریان و راپەریوەکان زۆربەیان بریتی بون لە رەش و رووتی بێ پێلاو بەناو بەفرو سەهوڵبەنداندا دەرۆیشتن و چەکی هەندێکیان بریتیبوە لە خەنجەرو شیر و رم و تەور و ژنیش شان بەشانی پیاو شەڕی دەکردو خۆراك و فیشەکیان بەکێش دەکردو لە راستیدا راپەرینەکە نمونەیەکی بەرزی ئازایەتی و کۆڵنەدان و لە خۆبورن بوو، بەلام رۆژگار لەگەڵ کوردا نەبوو، نەیتوانی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن خۆی بگرێ.

دەربارەی رەفتاری راپەریوەکان لەو شۆڕشەدا، رۆژنامەی (ئۆرایزن) لە ژمارە ٧٤ی ١٠/ ٤/ ١٩١٤ نوسیویێتی (کوردە شۆڕشگێڕەکان و جەماوەری کورد بەوپەڕی باشیو دۆستایەتیەوە رەفتاریان لەگەڵ ئەرمەنیەکانی ناوچەکە دا دەکردو زۆرجار بەبێ پارە نانیان لە ئەرمەنیەکان وەرنەدەگرت و تەنها مەگەر پێویستییان بە سووتەمەنی هەبوایە لەو رۆژە ساردو سەختەدا ناچار ئەبون لێیان وەربگرن)).

ئەنجومەنی وەزیرانی تورك لە بلاوبونەوەی راپەریوەکە ترسان و بریاریدا هێزێکی گەورە بنێرێ بۆ بدلیس و بریاردرا (أحسان پاشا) ی سەرکردەی هێزی موش بکرێ بەسەرکردەی ئەو هێزە کە زۆر شارەزابوو لە نانەوەی ئاژاوە و رێکخستنی پیلان و فروفیڵ و دەستی کرد بەوەی کورد و ئەرمەنی بکا بە دوژمنی یەك بۆ ئەوەی ئەرمەنیەکان یارمەتی کورد نەدەن و بۆ ئەو مەبەستە چوە لای سەرکردەی ئەرمەنیەکان لە (موش) و داوای لێکرد هێزێکی ئەرمەنی ئامادەبکا بۆ ئەوەی شان بەشانی حکومەت دژی کورد شەڕبکا.

دەربارەی ئەوە وەکو لە دۆکیومێنتی ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی روسیا لە ساڵی ١٩١٤دا تۆمار کراوە، (گارۆساسون)ی ئەرمەنی بەرامبەر بەو تەقەلایەی احسان پاشا بەگاڵتە پێکردنەوە نوسیویێتی: ئەرمەنیەکان بۆ ئەوەی لە گەڵ تورکە کانا توشی گێچەڵ نەبن ناچاربون داخوازیەی احسان نوری قبوڵ بکەن، بەڵام لە هەمان کاتدا بەنهێنی کوردەکانیشیان ئاگادار کردبوو لەوە.

احسان پاشا دەستیکرد بەسووتاندنی خانووی کوردەکانی سەرڕێگای هێزەکەی بێ ئەوەی بەزەییان بەکە سدا بهاتایەوە جلیلی لە لاپەڕە ٢٠٨ی سەرچاوە ٥دا باسی هەڵوێستی دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی کردوەو بۆ نمونە باسی ئەڵمانیای دۆستی تورکیای کردوە هەرلە سەرەتاوە دژی ئەو ڕاپەرینە بوەو بەشێوەیەکی دوژمنانە سەیری کردوە. بالیۆزی ئەڵمانیا لە ئەستەمبوڵ (فون فاغینیفیم) داوای لە حکومەتی تورك كرد بەزووترین كات ئەو ڕاپەرینە دامرکێنێتەوەو (فون ساندیرس) کە بۆ چاودیریکردنی هێزەکانی تورك چوبوە تورکیا، بەپەلە چوە ناوچەی ئەرزیرۆم و ئەرزنك، وپووداوەکان دەری خست هەڵوێست و بارو دۆخ لە سودی کورد نەبوو چونکە شۆڕشەکەیان نارێکو پێك بوو لە ناسکترین کاتدا هەندێ لە کوردە ناسراوەکانیش بون بەلایەنگری حکومەت و ڕاپەرینەکان ناچاربون لە بدلیس بچنە دەرەوە و مەلا سلیم بەناچاری خۆیو چەند هاوڕێیەکی پەنای بردەبەر قونسوڵخانەی روس لە بدلیس.

جلیلی ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (مشاك) ئەرمەنی کردوە کە باسی چۆنیەتی بەجێ هێشتنی کوردی کردوە لە شاری بدلیس و وتویەتی کوردەکان ماڵ ئاواییان لە ئەرمەنیەکان کردو جوتیارەکانی کورد لە ترسی دڕندەیی و تۆڵە سەندنەوەی تورك ناچار بون پەنابەنە بەر چیاکان وڕۆژنامەی (ئۆرایزن) ی ژمارە ٨٧ی ڕۆژی ٢٥ /٤/ ١٩١٤باسی ئەوەی کردوە ساتێك کوردەکان گوندەکانی خۆیان بەجێ هێشت مەڕو ماڵات و ژن و منداڵەکانیان لای ئەرمەنیەکان بەجێهێشت. شێخ سعید علی (٨٠٠) چەکداری هەبوو لە گوندی (غایدی) بەبێبەرگری خۆی دا بەدەستەوەو کە تورکە کان ماڵەکەیان پشکنی لەوێ سکاڵایەکی مەلا سلیمیان دۆزیەوە وێنەی نێرابو بۆ قونسوڵی روس کە لە لایەن هەزاران کوردەوە مۆرکرابوو کە بوویەهۆی تاوانبارکردنی شێخ سعید و لە

ماوەی مانگی نیسان و مایسدا هەزاران کـورد گیران و ئەوانـەی بەشـداربون لـەو ڕاپەڕینەدا ماڵ و گوندەکانیان کاولکرا.

جلیلی لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ سەرچاوەیەکی ئەڵمانی کردوە (Oktange puke postor) کە لـە ڕۆژی ١٣/ ٥/ ١٩١٤ تیایـا وتـراوە قونسـوڵی ئـەڵمانیا لـە ئەرزڕۆم بەوپەڕی دڵخۆشیەوە کاربەدەستانی خۆی لەوە ئاگـادارکردەوە احسـان پاشا لە ناوچەکانی: سمیك، خیزان، غوزالده، شاتێ نەك تەنها هەر ڕاپـەڕیوەکان بەڵکو (٢٥٠٠) کوردی تریشی گرتوە لەوانەی لە سەربازێتی ڕایانکردوە.

(چێرکۆف) لە نامەیەکیا بۆ باڵیۆزی ڕوسیا لە ئەستەمبوڵ ئاگـاداری بـاڵیۆزی کردوە، دوێنێ ١٠ی نیسانی ساتێك کوردێکان لە زیندانەوە برد بۆ لێپرسینەوە لە م سەرەوە بەشێکی ساغ برابوو بەڵام بەسەرشکاوی و بەخوێنەوە هێنرایـەوە بـۆ بەندیخانەکـە ی، لـە بەندیخانەیـەکی تـردا ئەفسـەرێکی تـورك لـە جیـاتی ئـاوی خواردنەوە میزی دابوو بەگیراوەکان و کوردێکی بریندار کە لـە شـەڕدا گـیرابو لـە زیندانا ئەفسەرە تورکە کان ئەوەندەیان بەپێلە قە لێدابوو گیانی دەرچـوو بـوو، زیندانی بدلیس پڕە لە گیراوی کوردو ئەرمەنی و مرۆڤ نازانێ چۆنیان باس بکـاو ئەوی لە زیندانا بێ شێت دەبێ و زیندانەکان وای لێ هاتوە جێگەی کە سـی تـری تیا نابێتەوە، بۆ ئەوەی شوێن بۆ گیراوی تازە پەیدا بکرێ دادگـای سـوپا پـەیتا پـەیتا گیراوەکـان ئیعـدام دەکـا بـەڵام زۆری پـێ ناچـێ دوبـارە زیندانەکـە پـڕ دەبێتەوە.

جلیلـی لـە لاپـەڕە ٢١٢دا باسـی ڕۆژنامـەی (ئـاڕاڕات)ی کـردوە کـە باسـی ڕاپەڕینەکـەی کـوردی بڵاوکردبـوەوە حکومـەت بـۆ سـزای ئـەوە ئـەو ڕۆژنامـە ئەرمەنیەی داخست.

بـەپێی بڕیـاری دادگـای سـوپا شـێخ سـعیدعلیو شـێخ شـهاب الدیـنو چـەند کەسێکی اعـدام کـران و بـۆ چاوترسـاندنی خـەڵك لاشـەکانیان بەهەڵواسـراوی لـە مـەیدانی بـازاڕدا هێڵرابونـەوەو ناوەکانیـان لـە سـەرپارچە پەڕۆیـەك نوسـرابوو بەسنگیانا هەروەکو لازاریف لە لاپەڕە ٢١٦ی کتێبەکەیدلـ کوردسـتانو کێشـەی کورد چاپی مۆسکۆ ساڵی ١٩٦٤باسیکردوە.

جلیلی لە لاپەڕە ٢١٢دا باسی ئەوانەی کردوە دەبرانە بەرقەنارە چۆن بەوپەری سەربەرزیەوە دەیانروانیە پەتی قەنارەکە و مەلا رسول لەوێوە هاواری کردە سەربازەکانی تورك کە وا دڵنیابە میللە تی کورد بەم زوانە لە زۆرداری و ستەمی تورك رزگاری دەبێ.

لە سەرەتای مانگی ئایاردا (کامل بەگ) لە شاری (سیرت) گیراو لەگەڵ خزمێکیا نێررا بۆ ئەستەمبوڵو کاتێ بەربەرەکانیی گرتنەکە ی کرد کوشتیان.

هەروەکو لە کتێبی (العلاقات الدولیةفی عهد الامبریالیة، بەرگی دوهەم، زنجیرەی سێهەم، لە لاپەڕە٢٦٩یدا باسی أتحادو ترقی کردوە چۆن هەموو جۆرە هەنگاوێکی نابوو بۆ ئەوەی ڕەگو ریشەی ڕاپەڕینەکە ی کورد نەمێڵێتو لە ٤ /٤/ ١٩١٤دا، لە کۆبونەوەیەکدا مدحت فکری وتویەتی لە دوای اعلانی دستوری ساڵی ١٩٠٨ ژمارەیەکی کەم لە کوردەبەئەدەبەکان نەبێ ئەوانی تر هیچیان نەبوون بەلایەنگری ئەو دەستورە کە ئەمە بە هۆی هاندانی (کامل بدرخانو سمکۆ و ساویت بەگ)ەوە بوو لەگەڵ چەندکوردێکی تردا کە لە ژێر سایەی پاراستنی باڵیۆزخانەی روسدا بون (مەبەستی مەلا سلیم بوە).

ساتێك وەزیری دەرەوەی تورکیا داوای لە (کێرس) ی باڵیۆزی روس کردبوو ئەوانەی پەنایان بردبوە بەر قونسوڵخانەی روس لە بدلیس هەموویان بدرێنە دەس حکومەت، لەوەرامدا باڵیۆز پێی دەڵێ: ئەوانە پەنابەری سیاسین بۆ یە مافی ئەوەیان هەیە لە لایەن قونسوڵی ئێمەوە بپارێزرێن.

ئەڵمانەکانیش لەوهەڵوێستەی روس نارازی بون و لە ٢ /٦/ ١٩١٤دا (ئەندیرس) ی قونسوڵی ئەڵمانیا چوبوو بۆ ئەرزڕۆم بۆ ئەوەی چێرکۆف ببینێت بۆ ئەوەی بزانێ چارەنووسی مەلا سلیم و تاقمەکەی لەناو قونسوڵخانەکەی روسدا چۆن دەبێ و ئایا مەلاسلیم هەروا لەوێ دەمێنێتەوە.

رۆژنامەکانی تورك وەکو (صباح) و (طنین) و (ئیقدام) بۆ ئەوەی فشار بخەنە سەر روس، بڵاوەیان دەکردەوە ڕاپەڕینی کوردەکان بەهاندانی بێگانە بوە و کاربەدستانی تورك قونسوڵخانەی روسیان لە بدلیس بەوە تاوانبار کردبوو دزو جەردەو ڕاوو ڕووتکە رانی گرتوەتە خۆی و دەیان پارێزێ.

بەوجۆرە مەلا سلیم لە قونسوڵخانەدا مایەوە تادەسپێکردنی شەڕ ئەوسا مەلا سلیمیان لە قونسوڵخانە دەرهێناو هەڵیان واسی وەکو سەرچاوەکانی تریش هەربەو شێوەیە باسیانکردوە.

لای تورکەکان وابوو ئیتر ڕاپەڕینی کورد کۆتایی هاتبوو، بۆ یە لە ڕەفتاری خراپی خۆیان وازیان نەهێناو بەو پەڕی دڵڕەقیەوە ڕەفتاریان لەگەڵ کوردا دەکردو دانیشتوانی ویلایەتی ئەرزڕۆم دوبارە لە حکومەت یاخی بون و باجیان نەدا بەحکومەت و بەرامبەر بەو هەڵوێستە تازەیە سەرۆکی لیژنەی (الوحدە والتقدم) ی تورك لە کۆبونەوەیەکدا دانی بەوەدا نابوو هێشتا نەتوانراوە ڕاپەڕینەکە ی کورد بەتەواوی لە ناوببرێ و جلیلی لە لاپەڕە ٢١٨ی کتێبەکەیدا باسی (بیرغ میلد)ی قونسوڵی ئەڵمانیای کردوە لە طرابزون کە ترسی ئەوەی لێ نیشتبوو دوبارە ڕاپەڕینێکی تری کورد سەر هەڵبداتەوەو لە ڕاستیدا لە حزیرانی ١٩١٤دا لە قەزای (موتکی) و (غرزان) لە سەر نەدانی باج شەڕێکی قورس قەوما پاش ئەوەی تورکەکان لە جیاتی باج مەڕوماڵاتیان بەزۆر زەوت دەکردو لە بازاڕی بدلیسدا بەئارەزوی خۆیان دەیان فرۆشت و حکومەت بۆ هێور کردنەوەی هەڵوێست چەند کوردێکی ناسراویان لە ئەستەمبوڵە وە نارد بۆ ناوچەکە بۆ ئەوەی بیر لە هیچ ڕاپەڕینێکی تر نەکەنەوە بەڵام ئەو تەقەلایەی حکومەت بێ سوود بوو.

جلیلی لە لاپەڕە ٢١٩ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٥٥باسی ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی روسیای کردوە نامەیەکی (چێرکۆف) ی تیایە لە ساڵی ١٩١٤داوتویەتی: ئەگەر کوردەکان بەهاندانی تورك پەلاماری ئەرمەنیەکانیان بدایە ئەوا بێگومان حکومەتی تورك بەرامبەر بەوە هیچیان لە کوردەکان نەدەکرد، لە لایەکی ترەوە ڕۆژنامەکانی تورك زۆر بەکورتی باسی ڕاپەڕینەکەی کوردیان بڵاو دەکردەوەو زۆرجار هەواڵنێرەکانی ئینگلیز و فرنسە و هەندێ جاریش هی روسەکان ڕاپەڕینەکە ی کوردیان بەبزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستانە لە قەلە م دەداو وایان بڵاودەکردەوە ڕاپەڕینەکە تەنها بەمەبەستی دژایەتی کردنی اصلاحاتی دستوری بوە، لە لایەکی ترەوە هەروەکو ڕۆژنامەی ئۆرایزۆن لە ژمارە ٦٧ی ڕۆژی ٢٨/ ٣/ ١٩١٤دا باسێکی ڕۆژنامەی (دیلی تلگراف) ی بڵاوکردبوەوە

لەوەدا وتبووی راپەرینی سەرۆکە کانی کورد وەکو شەڕێکی پیرۆزی دژ بەئەرمەنیەکان وابوە، رۆژنامەی (تایمس) ی لندنیش هەڕەشەی ئەوەی کردبوو هەرشتێك بەسەر ئەرمەنیەکاندا بێ ئەوا کورد بەرپرسیار دەبێ چونکە رێگە لە تورکە کان دەگرن اصلاحاتی دستوری سەربگرێت.

پاش سەرنجدان لە بلاّوکراوەکانی ناو ئەورۆژنامانە، دەرئەکە وێ چۆن هیچیان بەشێوەیەکی راست و بەمەبەستێکی پاك لە راپەرینەکەی کورد نەدواوون و هیچیان باسی ئەو هەموو جەورو ستەم و زۆرەی کاربەدەستانی تورکیان نەکردوە کە میللەتی کوردی والێکردبوو دەس بداتە چەك و کوردیان بەوە تاوانبار کردبوو کە دژی اصلاحاتی دستوری بوە وڕێگایان لە کاربەدەستانی تورك گرتبوو ئەو کارە گرنگە بەئەنجام بگەیەنن و هیچیان باسی ئەوەیان نەکردوە ئەوەی دژی اصلاحاتی دستوری بوە تورکە کان بون نەك کورد چونکە تورکەکان بوون لە بەلّێنەکانی خۆیان پاشگەز بوبونەوە بەرامبەر بەکورد کە بەر اصلاحاتی دستوری لە سالّی ١٩٠٨دا بەلّێنیان بەکورد دابوو مافی خۆیان دەسگیر دەبێت و بەهۆی ئەوەوە بوە کورد بەوپەڕی دلّسۆزیەوە لە سەرەتادا هاوکاربوە لەگەلّ ژۆن تورك‌و اتحادوترقیدا بۆ سەرگرتنی یاسای اصلاحاتی دەستوری وەکو لە باسێکی تایبەتیدا کە بۆ اتحاد ترقی تەرخانکرلوە باسی دەکە ین.

رۆژنامەی (العهدالحدیث)ی روسی لە ژمارە ١٣٦٦٢ی رۆژی ٢٤/ ٣/ ١٩١٤ بەرپەرچی درۆو دەلەسەکانی ئینگلیز و روسی دابوەوە بەباسێك بەناوی کوردو ئەرمەنی و لەوەدا ووتبوی هۆی راپەرینی کوردەکان بەهۆی کاری خراپ و نالە باری کاربەدەستانی تورکە وە بوە کە بەئاشکرا باری ژیانی ناوچە کوردیەکانیان پشت گوێ خستبوو جلیلی بۆ بەرپەرچدانەوەی درۆو دەلە سەکانی تورك و روس وتویەتی رۆژنامەکانی ئەرمەنیەکان لە هەموان باشترو راستتر هەوالّ و دەنگوباسەکانیان بلاّو دەکردەوە وبەقوولّی چووبونە بنچ‌و بناوانی هۆی راپەرینەکە و نوسەرێکی وەکو (ناڤاساردیان)ی شارەزا بەرووداوەکان ناوەرۆکی باسەکانی ناو رۆژنامەکانی دەولّەتە رۆژئاواییەکانی بەدرۆ دەخستەوە کە وتبویان راپەرینەکەی کورد راپەرینێکی کۆنەپەرستانە بوە لە کاتیکدا تورکەکان خۆیان

له هەموو کەس زۆرتر کۆنەپەرست بون و دژی خواستو داخوازیـەکانی ئەرمـەنی بـونو بەپێچەوانـەی ئـەو رۆژنامانـەوە بزوتنەوەکـە ی کـوردی بەبزوتنەوەیــەکی نەتەوایەتی حساب کردوەو وتویەتی له ناوکوردا ژمارەیەکی زۆری واهەیە هەستی نەتەوایەتی پاڵی پێـوە نـاون رێبـازێکی شارستانێتی بگرنـە بـەرو بەشێوەیەکی مرۆڤانه رەفتار دەکەن.

هەمان نووسەر له باسێکی تریـا بـەناوی (ڕاپـەرینی کوردەکـان یـا کوشـتاری ئەرمەنیەکان) ووتویەتی:

((بزوتنەوەی کورد دژی ژۆن تورك بوەو دژی ئەرمەنی نەبوە و لەوڕاپەرینەی دژی حکومـەت کردبویـان هیـچ کوشـتارێکیان لـە ئەرمـەنی نـەکردبوو، تەنـها لــە بەرئـەوەی ڕاپەرینەکـە ی کـورد هـەندێ دروشمـی ئـاینی تیـا بـەرزکراوەوە ئیـتر رۆژنامە ئەورووپاییەکان ئەوەیان کردبوو بەبیانوو بەڕاپەرینێکی کۆنەپەرستانەیان له قەله م دابوو)).

نووسەرێکی ئەرمەنی تـر (مـتراك) لـە باسـێکیا لـە رۆژنامـەی(مشـاك) وتبـوی دروشمی شریعەتی ئیسلامی تەنها ڕووی دەرەوەی ڕاپەڕینەکـەی کـورد بـوەو لـە ڕاسـتیدا ناوەڕۆکەکـەی بریتـی بـوە لـە دەربڕینـی هەسـتی نەتەوایـەتی کـورد. سەرنوسەری رۆژنامەی (مشاك) كە (ئاراكیلیان) بوە لــە رۆژنامەکـەیدا وتویـەتی: وردە وردە باری راستی بزوتنەوەکـەی کـورد ڕوون دەبێتـەوەو ئـەو هـەموو درۆو دەلەسانەش ئاشکرابون کـە دژی ئـەو ڕاپەرینـەیان بـڵاو دەکرایـەوە و دەبـێ بـە دڵنیاییەوە بڵێین ئـەو ڕاپەرینـەی کـورد بزوتنەوەیەکی سیاسـی بـوەو بـە هیـچ جۆرێـك بــەلای چەتەگـەریو ڕاوو رووتکـردن و دەمارگـیریی ئـاینـدا نــەچوەو دەسدرێژی نەکراوەتە سەر دانیشتوانی بێ تاوان کە ئەمە پێچەوانەی درۆو دەلــەسەی ئەوانەیە دەیانەوێ ناوی کـورد بزرێنـن کـە ئـەم ڕاپەرینـەیان بـۆ ئـەوەبوە ئۆتۆنۆمی بۆ میللەتەکەی خۆیان مسۆگەر بکەن.

## هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکانی دوای شۆڕشەکەی شێخ عبیداللە

ڕاپەڕینو شۆڕشەکانی دوای شۆڕشەکەی شێخ عبیداللە له باکوری کوردستانا هەتا دەسپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانی شێوەیەك بون لە ڕاپەڕینـە پچڕپچـڕە سـەرنەکەوتوەکانی پێشـووترو سـوود لـە هەڵـەو کـەمو کوڕیـەکانی پێشـوو

وەرنـەگیراوەو حکومـەتی تورکیـش شـارەزای بـارو هەڵوێسـتی نـاو کوردبـوەو دەمـاری شۆڕشـگێڕەکانی کـوردی ناسیوەو هــەموو جـارێك بەشـێوەیەك ئــەو ڕاپەڕینانەی خامۆش کردوەو میللەتی کورد لەو هەموو کارەسـاتو بەسـەرهاتانە هیچی دەسگیر نەبوە. بەکورتی دەتوانین ئەم باسە بکە ین بەدوو بەشەوە:

أ- هۆی بزوتنەوەو ڕاپەڕینەکان.

ب- هۆی سەرنەکە وتنی ئەو ڕاپەڕین و بزوتنەوانە.

### أ- هۆی بزوتنەوەو ڕاپەڕینەکان

میلله تـی کـورد، ئەوبەشـەی لـە ژێـر سـایەی دەوڵـەتی عوسمـانیدا بـوە، لـە زەمانی سوڵتان سەلیمەوە کە بەهۆی ئیدریس بدلیسیەوە بـەپێی ڕێکەوتنێکـەوە چوبوە ژێر سایەی ئەو دەولە تەوە، لە سەرەتادا خـۆی بەمیللـە تێکـی هاوبـەش زانیبوو، هەستی بەوە نەکردبوو لای تورکە کان ئەو حسابەی بۆ ناکرێ، بەڵام لـە سەدەی نۆزدەهەمەوە تورك بەتەواوەتی خۆی ئاشکرا کردو دەستی کرد بـەوەی لە کورد بگەیەنێ هەموو دانیشتوانی دەولە تـی عوسمـانی ئـەبێ خۆیـان بـەتورك بزانن و ئەم دەمارگیریەی تورك لە کاتی دەسەلاٌتدارێتی ژۆن تورك و أتحاد ترقیدا گەیشتە رادەیەك ئیتر کورد خۆی پێنەگیرێو دەسبداتە چـەك و خـەبات بکـا لـە پێناوی دەسگیربوونی مافـەڕەواکانی خۆیـداو هەوڵـەدەین کورتـە باسـێکی ئـەو هۆیانە بخەینە پێش چاو کـە بوبونـە هـۆی بـەهێز بوونـی هەسـتی نەتەوایـەتی و پاڵیـان بـەکوردەوە نـا لـەوە زۆرتـر بێدەنـگ نـەبێ بەرامبـەر بـەرەفتارو تــاوانی کاربەدەستانی عوسمانی.

### ١- ڕا پەڕین و شۆڕشەکانی دژی دەولەتی عوسمانی

لە کاتی دەسەلاٌتدارێتی و بەهێز بونی دەولە تی عوسمــانیدا، بـەناوی غـەزای ئـاینی ئیسـلامەوە تورکـە کـان بەشـێك لـەولاتی ڕۆژهــەلاتی ئـەوروپایان داگـیر کردبوو، بەلاٌم زۆری پێ نەچوو میلله تانی ئەو ولاتــە یەکـە یەکـە دژی عوسمـانی راسـت بوونــەوەو هەریەکــەیان بەشـێوەیەك شۆڕشـیان دژی عوسمــانی کــردو توانییان لە خاکی خۆیان بیانکەنە دەرەوەو خۆیان ئازاد بکـە ن و ولاتەکـە یـان لە داگیرکەران رزگار بکە ن و شۆڕشی ئەو میللەتانەو هەواڵی سەرکەوتنیان بەناو

میللەتانی تری ژێر دەسەلاتی عوسمانیدا بلاوبوەوەو هانیان دان ئەوانیش دەسبکەن بەشۆڕشی ئازادیخوازانەی خۆیان کە یەکێك لەوانە میللەتی کورد بوو ئەو هەولانە کاری تێکردبوو رۆشنبیرانی کورد بیری سەربەستی و رزگارکردنی ولاتیان بەناو کوردا بلاوکردەوەو کوردیش وەکو ئەو میللەتە رزگار بەانە دەستی دایە چەك ئەگەرچی بەداخەوە وەکو ئەوان نەیتوانی خۆی و نیشتمانە داگیرکراوەکە ی رزگار بکات.

**٢- شۆڕشی سالی ١٩٠٥ لە روسیا**

شۆڕشی سالی ١٩٠٥ لە روسیا یەکێك بوە لەو رووداوە گرنگانەی ئەنجامەکە ی بەهۆی رۆشنبیرانی کوردەوە بەناو جەماوەری کوردا بلاو بویەوەو دروشمی ئازادی و دیموکراتی و مافی میللەت کە لە روسیادا بەسەرکە وتوویی دژی قیصری روس بلاو بوبوەوە کاری کردبوە سەر کوردو بیرباوەرەکانی ئەوشۆڕشە سەرکە وتوە لە مێشکی کوردیشدا دەنگی دایەوە.

لەو روەوە دوکتۆر شمزینی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤٢ لە لاپەرە ٦٢-٦٤دا باسی کارتێکردنی ئەو شۆڕشەی کردوە کە هەوالی نەك تەنها هەر گەیشتۆتە کوردستان بەلکو وەکو شۆڕشێکی دیموکراتی لە هەموو رۆژ ئاوای ئاسیادا دەنگی دابوەوە.

دەربارەی ئەوە وەکو دوکتۆر عزیز باسی کردوە (کیرگۆف)ی قونسولی گشتی روسیا لە شاری (خۆی) لەوە دواوە چۆن ساتێك بازرگانە کوردەکان یارمەتیدەرەکانیان لە خوێندەوارو روناکبیرەکانی دەچوون بۆ سەردانی فرۆشگای (ماکاریوف) لە (نیزنی نوفکورد) و لەوێ چاویان بەسەربازە دیموکراتیەکانی روس دەکە وت و لەوانە هەوالو دەنگوباسی شۆڕشەکەی سالی ١٩٠٥یان دەبیستەوە ئەو هەوالانە کارێکی زۆری تێدەکردن و کە دەگەڕانەوە ئەو هەوالانەیان بەناو هاولاتیانی کوردا بلاو دەکردەوە، دەبوونە هەوێنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی و هاندان بۆ ئەفسەرانی کوردی ناو سوپای عوسمانی کە ئەوانیش بیر لە بەرپابوونی شۆڕشێك بکەن میللەتی کوردی پێ رزگار بکەن و زۆری پێ نەچوو ئەو هەستی نەتەوایەتیە بەناو رۆشنبیران و هەندێ لە سەرۆکەکانی کوردا

بڵاوبوەوەو خستنیە سەر خولیای خەباتو تێکۆشان بۆ دەسگیر بوونی مافی میللەتەکەیان.

٣- هاوکاریکردنی کورد لەگەڵ ژۆن تورکو اتحادو ترقیدا

ساتێك سوڵتان عبدالحمیدی دوهەم لە شوێنی سوڵتان مراد دانرا لە ساڵی ١٨٧٦دا، یەکێك لەو مەرجانەی بۆ عبدالحمید دانرابوو ئەوەبوو اصلاحاتی دستوری بکا، بەڵام سوڵتان لەویەڵێنەی پاشگەز بوەوەو بەرامبەر بەوە لە ناو تورکە کانا رێکخراوی ژۆن تورکو اتحاد ترقی دروستبوو دژی سوڵتان و لە ساڵی ١٩٠٨دا سوڵتانیان ناچار کرد ئەو دەستورەی جارانی عوسمانی بگۆڕێ و فەرمانێك دەربارەی ئەو دەربکا، میللە تی کورد یەکێك بوە لەومیللە تانەی لە سەرەتادا بەگەرمیەوە پێشوازی لە دروشمەکانی اتحاد ترقی کردو ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی کورد بون بەئەندام و هاوکار لەو رێکخراوەدا بەئومێدی ئەوەی تاقمی اتحاد و ترقی لە دوای سەرگرتنی اصلاحاتی دەستوری کارێکی وائەکەن کوردیش مافی نەتەوایەتی خۆی دەسگیر بێت، بەڵام کە اتحادیەکان بون بەدەسەڵاتدار لە بەڵێنەکانی خۆیان پاشگەز بونەوەو رێکخراوو کۆمەڵە کوردیەکانو رۆژنامەکانیان داخستن و کوردیش بەرامبەر بەوە کە وتە خۆی و هەستی نەتەوایەتی جۆشی سەندو دەستیکرد بەخەبات و تێکۆشان بۆ دەسگیر بوونی مافە ڕەواکانی خۆی کە تاقمی اتحاد و ترقی لێی پاشگەز بوبونەوە.
دەربارەی ئەوە دوکتۆر عزیز شمزینی باسی کتێبەکەی (میللەر)ی کردوە بەناوی (کورتەباسێکی مێژوویی تازەی تورکیا) چاپی مۆسکۆ ساڵی ١٩٤٨ کە لە لاپەڕە ٢٠دا باسی هۆی راپەڕینی کوردی کردوە هەروەکو ئەوەی لە گۆڤاری (رۆژهەڵاتی نوێ)ی ژمارە ٤ی ساڵی ١٩٢٣دا باسێکی (لاهوتی) تیایدا بڵاوکراوەتەوە کە لە هەردوو باسەکە دا دەربارەی سیاسەتی شۆڤێنی ژۆن تورك دواون کە چۆن رەفتاریان بوە بەهۆی بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی توندڕەوانە لە ناو کوردەکانا بۆ بەرهەڵستی ئەو هەڵوێستەی تورکە شۆڤێنیەکان.

٤ـ سەندنی سەرانەو باجی زۆر لە دانیشتوانی کورد کارێکی وای کردبوو میللە تی کورد بەتەواوەتی لە رەفتاری تورکەکان بێزاربوبون بەرتیلو بەزۆر کردنی خەڵك بەسەربازو روتاندنەوەی خەڵك هەمویان وایان لە کورد کردبوو

دەستەپاچە دانەنیشن و بیر لە یاخی بون‌و راپەرین بکەن دژی حکومەتی عوسمانی..

ب- هۆی سەرنەکەوتنی شۆرشەکان

راپەرین و بزوتنەوەکانی دوای شۆرشەکە ی شێخ عبدالله هەتا دەسپێکردنی شەری یەکەمی جیهانی کە هەریەکە یان لە ناوچەیەکی باکوری کوردستاندا روویاندابوو بەشێوەیەکی گشتی بریتی‌بون لە راپەرین و بزوتنەوەیەك بەشێوەیەکی پچر پچر لە هەندێ ناوچەکانی باکوردا کە بەکورتی دەتوانین باسی هۆی سەرنەکەوتنیان بەم شێوەیەی خوارەوە بکەین:

١- ئەو بزوتنەوەو راپەرینانە بەشێوەیەکی گشتی بریتی بون لە دەربرینی بێزاری بەرامبەر بەجەورو ستەمی کاربەدەستانی تورك کە لە راپەرینەکەی ملاسلیم و شێخ شهاب الدین دا زۆرتر دەنگی دابوەوە، بەلام بەشێوەیەکی گشتی هەمویان بێ نەخشە بون و هەریەکەی لە ناوچەیەکی تایبەتیدا رویداوەو پێوەندی بەناوچەکانی ترەوە نەبوەو سەرکردەو عەشایرەکانی ناوچەکانی تر بەشێوەیەکی گشتی لە راپەرین و بزوتنەوەیەکی تایبەتیدا هاوکار نەبون و ئەگەر چی لە زۆریەیاندا ئەوپەری ئازایەتی و لە خۆبوردن و دلسوزیەکی ئاشکرایان تیادا بوەو بۆ مەبەستێکی پیرۆز دەستیان پێکراوە بەلام هیچیان لە بزوتنەوەیەکی عەشایری بەولاوە تێپەریان نەکردوەو لەزۆریەیانا خیانەت‌و خۆفرۆشی هەندێ لە سەرکردەکانی کورد لە ناسکترین کاتی ئەو شۆرش‌و راپەرینانەدا بۆ تە هۆی دامرکانەوەی بزوتنەوەکە و دوبارە هەمویان بێ نەخشە بون و حسابی توانای دارایی و سوپایی نەکراوە لە لایەن شۆرشگێرەکانەوەو شۆرشێك کە بەقەمەو شیر و تفەنگی ژەنگاوی کۆن کرابێ بەهیچ جۆرێك بەرگەی هێزی حکومەتی پرچەك‌و مەشق پێکراوی نەگرتوەو هەرلە سەرەتاوە ئەنجامەکە ی دیار بوە بەزیانێکی زۆر کۆتایی بەو راپەرین‌و شۆرشانەوە دەهێنرا.

٢- نەبوونی رێکخراوێکی سیاسی و هێزێکی پر چەکی مەشق پێکراو لە هەموو راپەرین و بزوتنەوەکانا دووبارە بۆتەوەو ئەوانەی لە یەکێك لەوراپەرین‌و بزوتنەوانەدا بەشدارییان کردبێ، هەریەکە یان لە شوێنی خۆیدا بەشێوەیەکی عەشایری و هەرەمەیی‌و ناوچەگەری بەشداری کردوەو هەر کە سەرۆکی

عەشیرەتێکی بەشداربوو کوژرابێ، یاکۆڵی دابێ، یالە لایەن عوسمانیەکانەوە فریودرابێو خۆی فرۆشتبێت ئیتر هەموو چەکدارەکانی ئاشبەتاڵیان کردوە و بێگومان بەشداربوانی ئەو راپەرینو بزوتنەوانە هەمیشە لەگەڵ یەکتردا رێك نەبونو ناکۆکی و دووبەرەکی لە ناویانا هەبوەو لەورووەوە هەروەکو دوکتۆر جلیلی لە لاپەڕە ١٥٩ی کتێبەکە ی (دیتیل) ی کردوە لە لاپەڕە ٢٠٠یدا باسی سیاسەتی حکومەتی کردوە کە چۆن توانیبووی ئاگری دووبەرەکی و ناکۆکی لە نێوان شۆڕشگێڕەکانا بەرپا بکاو زۆرجار حکومەت بۆ تێکدانی کورد چاوی لە رەفتاری هەندێ دەرەبەگ و سەرکردەی عەشایری کورد پۆشیوەو رێگەی پێداوە لە ناوچەکەی خۆیدا بەئارەزووی خۆی زوڵم لە دانیشتوان بکاو بەوە حکومەت ئەوجۆرە کە سانەی کردوە بەدەسکە لای خۆی و لە کاتی پێویستدا بەکاری هێناون بۆ تێکدانی ریزەکانی کورد.

٣ـ بین برکێی نێوان دەوڵەتە سەرمایەدارەکان بۆ ئەوەی هەریەکە یان خۆی دەسەڵاتدار بێ لە کاروباری ئابوری و سیاسی دەوڵەتی عوسمانیدا، ئەوانە هەمیشە بەئاشکرا دژی هەموو بزوتنەوەو راپەرینەکانی کورد بون کە ئینگلیزەکان لەوبارەوە لە هەمویان زۆرتر سەرگەرم بوەو بەماوەیەك پێش دەسپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانی ئەڵمانیاش هاتبونە کایەوەو توانیبویان تورکیا بەلای خۆیانا بەکێش بکەن و دژی ئەوەبون کورد ببێتە هۆی لاوازبونی دەوڵەتی عوسمانیی دوستیان کە نەخشەی شەری جیهانی لە لایەن ئەڵمانەکانەوە بۆ کێشرابوو، ئەو دەوڵەتانە هەریەکەیان لە کاتی خۆیداو بەشێوەی تایبەتی خۆی فشاریان خستبوە سەر تورکەکان بەوپەڕی دڵرەقیەوە لە کوردەکان بدەن بۆ ئەوەی ئاسایشو ئارامی وڵاتی ئەو دۆستەیان نەکەوێتە مەترسیەوە.

شتێکی ئاشکرابوە، هەموو ئەو دەوڵەتە ئەوروپاییانەی دەستیان خستبوە کاروباری حکومەتی عوسمانیەوە، جگە لەوەی نەیان ویستبوو بەهۆی کوردەوە ئاسایشی وڵاتی عوسمانی تێك بچێت، شتێکی تریش هەبوو هەرلە کۆنەوە بیریان لێکردبوەوە کە بریتی بوە لەوەی رێگە نەدرێ بەکورد خۆی بەهێزتر بکا لە هێزو دەسەڵاتی ئەو کریستیانانەی کە ماوەیەك بوو بەدەیان میسینێریان ناردبوە

ناوچەکانیان‌و بنکە یان بۆ دروستکردبون و خستبویانە مێشکیانەوە بەهیچ جۆرێك نەبن بەهاوکاری کورد لە راپەرین و شۆڕشەکانیان دژی حکومەتی عوسمانی کە ئەم راستیە لە هەڵوێستی هەندێ دەسڕۆیوەکانی ئەرمەنیەکان و ئاسوریەکان دەرکە وتوە کە خۆیان لە بزوتنەوەی کورد نزیك نەدەکردەوەو لایان وابوە تەنها دەوڵەتە ئەوروپاییەکان ئەوان رزگار ئەکات‌و هەتا رادەیەکیش ئەو دروشمە ئاینیانەی لە هەندێ شۆڕش‌و راپەرینی کوردا بەرز کرابوەوەو بۆ نەی دژایەتی لێ هاتبوو بەرامبەر بە هەندێ لە کریستیانەکان زۆر گاریگەر بوە لە سەرنەگرتنی هەوڵی پەیدابوونی دۆستایەتی و هاوکاریکردنی کورد لەگەڵ کریستیانەکان بەشێوەیەکی ستراتیجی.

٥ـ ئەو کێشەیەی لە نێوان (سونی) و (علوی) دا بەهۆی دروستبونی سوارەی حمیدیەوە پەیدا بوبوو زیانێکی زۆری گەیان بەشۆڕشەکانی کوردو وەکو لە شۆڕشەکانی شێخ سعیدی پیران و هەندێ شۆڕشی تردا لە بەرگی دوهەمدا باس دەکرێ دەرئەکەوێ چۆن علویەکان لە زۆریەی شۆرشەکانی کورد بەشدار نەبوون لە تۆڵەی ئەو رەفتارە نا رێکانەی سەرکردە سونیەکانی ناو سوارەی حمیدیە بە هاندان و راسپاردەی تورکەکان دژی علویەکان کردبوویان .

## بەشی یازدەهەم

# خزمەتی کورد بۆ ئیسلام و بۆ دەوڵەتی عوسمانی

کورد لەورۆژەوە بووە بە ئیسلام، ئیتر هەموو توانای خۆی بۆ بەرزکردنەوەی ئاینی ئیسلام و ناوی ئیسلام و پاراستنی ولآتی ئیسلام تەرخانکردوەو سەرکەوتنی ئیسلامی بەسەرکەوتنی خۆی حسابکردوەو بیری لەوە نەکردبوەوە لەریزی میللەتانی ئیسلام دابڕێ و بۆخۆی وەکوو میللەتەکانی تر حکومەتێکی تایبەتی نەتەوایەتی خۆی ئەگەرچی لەژێر ئاڵاو دروشمی ئیسلامیشدا بوویێ دامەزرێنێت و لەو ڕووەوە هیچ میللەتێکی سەربەئیسلام بەقەد کورد دەربارەی خۆی کە متەرخەم نەبوە بۆ نمونە بنەماڵەی ئەیوبیەکان کە لەزەمانی صلاح الدین دا گەیشتبوە چلەپۆپەی دەسەلآت و هێز بیری لەوەنەکردبوەوە حکومەتێکی کوردی دامەزرێنێت کە شەقڵی نەتەوایەتی کوردی پێوە دیاربوویێ ، لەهەر شوێنێکدا بەناویش ناوی دەوڵەتی ئەیووبی هاتبێ ئەوە تەنها مانای حکومەتێکی ئیسلامی گرتوەتەوە لەچوار چێوەی ئاڵای ئیسلام دابووە.

کە ساتێك عوسمانیەکان بوون بەدەسەلآتدارو ئەو ئیمپراتوریەتەیان دامەزراند، کورد لەرێگەی ئیدریسی بدلیسەوە هەموو ئەمارەتەکانی خۆی کرد بەوابەستەی ئەو دەوڵەتەی دروشم و ئاڵای ئیسلامی بەرزکردبوەوەو بۆ بلآوکردنەوەی دەسەلآتی عوسمانی تورکەکان دەستیان کرد بەدلگیرکردنی ولآتان بەناوی (غەزا) وەو لەوەدا کورد ڕۆڵێکی ئێجگار گرنگی هەبوە.

ئەم بەشە دەکرێ بەدوو بەشەوە:

**١- خزمەتی کورد بۆ ئیسلام و بۆ ئاینی ئیسلام و بۆ جیهانی ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی.**

**٢- خزمەتی کورد بۆ خلافەتی عوسمانی کە خۆی وا پیشاندابوو نوێنەری هەموو ئیسلامە.**

**یەکەم: خزمەتی کورد بۆ ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی**

بێگومـان میللـەتی کورد جگە لـەوەی خزمـەتی ئیسـلامی کـردوە لـەبواری سیاسیو سوپاییەوە، خزمەتێکی ئێجگار گەورەشی کردوە لەرێگەی ئەو زانا ئاینیو مێژوونوسانەی کوردەوە کە بەسەدان کتێبیان دەربارەی ئاینی ئیسلام و ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی و لێکدانەوەی (حدیسی پێغەمبەر) و دەیان کتێبی شرع و فقە و مێژووی پیاوە ناودارەکانی ئیسلام نوسیوەو ئەو هەموو بەرهەمانە هەمووی بووە بە کەلەپوورێکی بەسوود و بەکەڵك لەریزی بەرهەمی نووسەرانی میللەتانی تردا، کە بەداخەوە باسەکان ماون بەڵام شوێنەواری نووسەرەکانیان وەکوو نووسەرێکی کورد وردە وردە کوێر بۆتەوەو براونەتەوە سەر نەتەوەی عەرەب کە ئەمە باسێکی ئێجگار دورو درێژە و لەمەبەست لامان ئەدا.

باسیل نیکیتن لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٥٤، لەلاپەڕە ١٧٠دا باسی زنجیرەیەك لەوبنەماڵانەی کوردی کردوە کە خزمەتی ئاینی ئیسلامیان کردوەو هەموو ژیانی خۆیـان لـە پێنـاوی ئیسـلام و سـەرکەوتنیا تـەرخانکردوە. باسـیل نیکتـین لەباسەکەیدا بۆ نمونە لەبنەماڵـەی (شداد) ی دواوە کـە دامەزرێنەرەکـەی محمد شداد کوڕی قارطو بوە لەساڵی ٩٥١ی زایندا و مێژوو نووسە عەرەبەکان باسی ئەو بنەماڵەیان وەکو نمونەیەکی راستو ئاینپاك باسکردوە کە لەرێبازی ئاینی ئیسلام لایان نەداوەو گوێیان نەداوەتە جیاوازیی رەگەزو ئاین.

هەروەها بنەماڵـەی (بنـی مـروان) ، دامەزرێنەرەکـەی (ابوعلـی مـروان کـوڕی دوسـتاق) بـوو لـەنێوان سـاڵانی٩٩٠–١٠٩٦ زاینیـدا حوکمڕانیـان کـردوەو (ئـەمیر ئـەبونصیر) ی مروانـی یـەکێك بـوە لەوانـەی بـە دادپـەروەری و خواپەرسـتی بـەناوبانگ بـوەو واڵی بـەغداد دەسـەڵاتێکی زۆری دابویـە چونکـە بەوپـەڕی دادپـەروەریو بەپێی ئـاینی ئیسـلام کاروبـاری دەبـرد بـەڕێوە، بـەڵام لـەدواییدا تورکـە سـلجوقیەکان دەسـتیانکرد بـەتێکدانی کاروبـارو سـەرکردەکانیان لـەناو خۆیانا تێکدا.

باسیل نیکتین ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (مار) کـردوە کـە کـوردی بەمیللـەتێکی ئایندارو خزمەتگوزار بۆ ئسلام حساب کردوە.

دوكتۆر (محسن محمدحسين) لەبەرگی ١٣ی ساڵی ١٩٨٥ی گۆڤاری كۆڕی زانیاری لە بغداد باسێكی بڵاوكردۆتەوە بەناوی (دەوری كوردەكان لە سوپای صلاح الدینیدا) وتویەتی ساتێك صلاح الدین جێگەی شێركۆی مامی گرتەوە، وەزیری فاطمیەكان و سەرۆكی توركمانەكان (یاروقی) بەوە رازی نەبون صلاح الدین بكرێ بەوەزیرو (یاروقی) زۆربەی توركەكانی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ شام و وتی من خزمەتی صلاح الدین ناكەم.

نوسەری ئەو باسە ئەڵێ: لەراستیدا كوردەكان بوبوون بە بڕبڕە پشتی ئەو هێزەی صلاح الدین و خۆبەختكردنی ئەو كوردانەو ئەو ئەركەگرنگانەی پێی هەڵسابوون لەناو سوپای صلاح الدیندا بوبووە هۆی ئەوەی ژمارەی كورد لە ئەنجومەنی سەركردایەتی صلاح الدیندا پەرەبسێنێت كە صلاح الدین خۆی سەركردەی ئەو ئەنجومەنە بوو.

(دەربارەی ئەو وەزیرێ فاطمیە كە لەو باسەدا ناوی هاتووە، كێشە لەنێوان صلاح الدینی سونی و فاطمیەكانا كە لە میصردا بە حشاشەكان ناویران و لەسەر ئاینزای شیعەبوون بریتی بووە لە كێشەیەكی مەزهەبیو ئەگەر بەوردی لەوە بكۆڵرێتەوە، بۆمان دەردەكەوێ لەهیچ شوێنێكی سەریە شیعەدا، لەگەڵ ئەو هەموو خزمەتە گەورەیەی صلاح الدین بۆ ئیسلامی كردبوو، هەتا دوژمنە ئەوروپاییەكانیشی كە ناوی صلاح الدین دەبەن بەرێزەوە باسی دەكەن، كەچی شیعەكان بەوە صلاح الدین تاوانبار دەكەن حكومەتی فاطمیەی لە میصر لەناوبردبوو) .

دەربارەی صلاح الدین، دوكتۆر (نظیر حسان سعدلوی) لەكتێبەكەیدا (التاریخ الحربي المصري في عهد صلاح الدین) چاپی قاهرە ساڵی١٩٥٧ وتوویەتی: صلاح الدین بۆیە هەموو پلەو پایەگرنگەكانی سوپاییو بەڕێوەبردنی كاروباری سپاردبوو بەكوردەكان چونكە صلاح الدین پشتێكی تەواوی بە كەسوكاری خۆی و كوردەكان بەستبوو كە لە راستیشدا هەموویان پڕبەدڵ دڵسۆزو پشتیوانی صلاح الدین بون لەشەڕەكانا.

مامۆستا شوکور مصطفى لەلاپەڕە ۱۲۳ ی گۆڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە ۸ی ساڵی ۱۹۸۱ باسێکی لە زمانی تورکیەوە وەرگێڕاوە بۆکوردی دەربارەی ئەیوبییەکان کە لەو باسەدا وتراوە:

((لەهەڕەشەو جەنگەی شەڕو شۆڕێکی خوێناوی دوورودرێژی خاچپەرستەکان (صلیبیەکان) کە چەکو شارستانێتیو ئاین– مەسیحیەت دژی ئیسلام– و کە لەپوور پێکا هەڵدەپژان و زۆرانیان دەگرت، دەرفەتی هیچ جۆرە لێک هەڵەنگوتنو لێك گەیشتن و بازرگانیەك نەبوو، ئەورووپای مەسیحی و دەرەبەگ خاکی فەلەستینی پیرۆزو سوریایان دەویست، عەرەبەکان لەوڕۆژانەدا لەڕووی هێزی سوپاییەوە ئەو سەربازە شەڕکەرانەی جارانیان نەبوو کە حەوت سەدە لەوەو پێش فتوحاتی ئیسلامیان بەهەموو لایەکی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا دەگەیاندو، لە سەدەی ڕوو لەکزی و کەفو کوڵ و دامرکانەوەدا بوون، تورکە سلجوقیەکانیش کە بەلێشاو لەئاسیاوە ڕوویانکردبووە ئەو ولاتەو لەنیوەی دوهەمی سەدەی نۆهەمدا ئێرانو کوردستانو ئەرمەنستانو عێراقو سوریاو بەشێکی زۆری (بیزانتس) یان داگیر کردبوو، لە (مرعش) ەوە هەتا (ئەرزنجان) و لەدواییشدا تا ئەرزڕۆم هەڵکشابون، میرە (زەنگی) یە تورکەکانی حلب و موصل بوبوون بەژێر باری پاراستنی سوریاو موسڵمانەوە لە خاچپەرستەکان، بەلام نەك تەنها هەرخۆیان، بەڵکو بەیارمەتیو کۆمەڵکردنیو کوردە هاوسوێندە سەر ڕاستو دڵپاکەکانەوە بووە کە کوردی نوێ موسڵمان دەرگای سەردەمی دەرەبەگایەتیان دەخستە سەرپشت کە بەشی زۆری ئەوانە وەزیرو هەمەکارەی پلەو پایەبەرزو مەلاو زانایانی گەورە گەورەی کوردبوون.

وەرگێری ئەو باسەتورکیە مامۆستا شوکور مصطفى ئاماژەی بۆ کتێبێکی (N. elissees) کردوە بەناوی (نور الدین، میریکی گەورەی موسڵمان لە سەردەمی خاچپەرستەکانا) بەرگی سێهەم چاپی ۱۹٦۷ باسی ئەوەی کردوە صلاح الدین و سوڵتانەکانی ئەیوبیی دوای ئەو جێگەی (زەنگی) یە کانیان گرتبوەوە لە پاراستنی ئیسلامدا.

لەو کتێبەیدا بەناوی (phchistory of salanin) نوسینی پرۆفیسۆر مینۆرسکی و (کلود و چینی) چاپی لندن ساڵی ۱۹۵۳و وتویانە شەڕی

ئیسلامەکان دژی خاچپەرستەکان، بەهۆی قورس پێداگرتنی کوردەکانەوە بووە کە کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی سەرکردایەتی ئەیوبیەکانەوەو بە سەرکردایەتی ئەوان شەڕەکە بەردەوام دەبوو بەڕێوە دەچوو وای لێ هاتبوو (میرە زەنگی) و (ئورتوکیدەکان ـ مەبەست کوڕانی ئورتق) ـە هەموویان چووبوونە ژێر فەرماندەی سوڵتانە ئەیوبیەکانەوە. ئەو سوپا موسڵمانانەی بەگژ (ریچارد ـ شێردڵ ـ کە عەرەبەکان بەقلب الاسد) ناویان بردووە، و (فیلب ئۆگۆست) ی قەراڵی فەرەنساو (فردریك باریاروس) ی ئیمپراتۆری ئەڵمانیادا چوون و مصرو سوریایان لە فەرەنگەکان رزگار کرد و لەجیاتی (خاچ) دروشمی (هەڵۆ) یان لەسەر بورج و دیواری قدس چەقان (صلاح الدین و ئەیوبیەکان دروشمی ناوئالاکەیان بریتی بوە لە وێنەی مەلی هەڵۆ).

ئەو کوردانەی باروبنەی سەردەمی شەڕوشۆڕی نێوان مەسیحی و موسڵمانەکانیان پێچایەوەو بۆ ئێجگاری شەڕیان یەکلاو یەکچاو کردەوەو دەرگای پەیوەندیان نەك تەنها هەر لەڕووی گەڕیدەکان، بەڵکو لەڕووی سەدان شۆڕەسوارو سەربازی فەڕەنگ و ئینگلیز و ئەڵمان و بولگارو نۆرماندو ئیتاڵیشی خستە سەرگازی پشت. هەروەکو (والتر سکۆت) باسیکردوە مەسیحیەکانی ئەوسەردەمە کوردەکانیان بەسوڵتان و سەربازەوە ـ بەپارێزەرو پاسەوانی موسڵمانانی رۆژهەڵات ناویبردوە. کورد هەروەکو لەمەیدانی شەڕدا بەشۆڕەسواری مەیدان و ئازاو بوێر و مێرخاسان ناسرابوون، لەکاتی ئاشتیشدا سەرڕاست و پیاوی خاوەن قسەی خۆیانن و بەرەفتاری بەرز ناسراون.

باسە تورکیەکە لەسەری رۆیشتوەو وتویەتی: کوردەکان وەنەبێ تەنها هەر رێبەرو پێشەواو سەربازیان پێشکەش کردوە بۆ خزمەتی ئیسلام بەڵکوو زۆربەی زاناو مامۆستاو مێژوو ناس و گەورە و کەڵە پیاوی وەکو ابن الاثیر و ابن خلکانیش هەبوە، قەڵا گەورەکەی قاهرە و قەڵاکەی (cracdes chevalians) ی بەناوبانگ نزیك بە (lal taqoule) و ژمارەیەکی زۆری مزگەوتو فێرگەو قوتابخانە لە میصر هەمووی لەکاتی خۆیدا کورد دروستیان کردوون و لەسەردەمێکدا کە زانستو هونەر لە رۆژهەڵاتا دەگەشایەوەو لە پەرەسەندنا بووە ئەورووپای ئەوسا لەنێو تاریکاییدا پەلەکوتێی دەکرد لە کاتێکدا لەرۆژهەڵاتا

سەردەمی ڕاپەڕین و وریابوونەوە بوو. (حەزم کرد بەرلەوەی بچمە سەرباسی سەرچاوەکانی کورد کە دەربارەی خزمەتی کورد دواون بۆ ئیسلام ڕاستیەکی مێژوویی بخەمە بەرچاو بەرامبەر بەو هەموو خزمەتەی کورد بۆ ئیسلام، بەتایبەتی ئەیوبیەکان بەسەرکردایەتی صلاح الدین، لەو هەموو شوێنەوارە سادەیەی کە لەلایەن صلاح الدینەوە بەجێ مابوو بریتی بووە لەوەی لەزەمانی ئەودا چەند ژوورێك بەناوی (رواق الاكراد) ەوە بۆ کورد تەرخان کرابوو بەتایبەتی بۆکوردەکانی باکوری کوردستان کە ژمارەیەکی زۆریان چووبونە میصرو لەو رواق الاكرادەی جامعەی ئەزهەردا خوێندنیان تەواو کردبوو لەوێ مابوونەوەو خزمەتی زمانی عەرەبی و ئاینی ئیسلامیان کردبوو، ئەو کوردانە لەوچەند ژورەدا بە نانەسکی ژیانی خۆیان بردبووە سەر هەتا زەمانی جمال عبدالناصر ئەوپارە کەمەی بۆئەو شوێنە تەرخانکرابوو لەگەڵ پارەی تەرخانکراو بۆ هەندێ شتو شوێنی تر لابراو لەوساوە دەرگاکانی رواق الاكراد داخراوەو ئەو چەند کوردەی جاران ڕوویان دەکردە ئەو شوێنە هەموو لەو دەرفەتە بێ بەش کران) .

بلەچ شێرکوە لەلاپەڕە ٢٤ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٦٠ باسی خزمەتی مروانیەکانی کردوە بۆ ئاینی ئیسلام لە زەمانی (القادر باللە) ی خلیفەداو لە پاداشی ئەوخزمەتە گەورەیەی ئەمیر ئەحمەد کوڕی مروان الكوردی بۆ ئیسلامی کردبوو نازناوی (نصرالدولە) ی پێبەخشرا.

بلەچ شێرکوە لەو کتێبەیدا باسی زانایان و شارەزایانی کوردی کردوە کە چەند خزمەتی ئاینی ئیسلامیان کردوە بە بڵاوکردنەوەی زانیاری فقەو تۆمارکردنی ژیانی پیاوە ناسراوەکانی کورد و ئیسلام کە بەرهەمەکانی ئەو کوردانە لە قوتابخانەکانی بغدادو قاهرەو حجازو ئەصفهانو مراغەو بدلیسو ئامدو دمشقو حلبو شارەزووری شوێنەکانی تری ئیسلاما دەخوێنران.

بلەچ شێرکوە (جلادت بدرخان) لەلاپەڕە ٢٥ی کتێبەکەیدا باسی کوردستانی کردوە چۆن لە زەمانی عباسیەکانا وەکو قەڵایەکی سەخت وابووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی ئیسلامدا بەتایبەتی بەرامبەر بەڕۆم (مەبەست بیزەنطیەکان بوە) و هەمیشە ناوچە کوردیەکان وەکو سەنگەرێك وابون بۆ پاراستنی ئەو خەلافەتە.

بەلأم هەروەکو بلەچ شێرکوش لەوباسەدا لێی دواوە، لە پاداشـی ئـەو هـەموو چاکانەی کوردو ئەو هەموو بەرهەمە بەنرخانەی ئەوزانایانەی کـورد پێشکەشـیان کردوە بەجیهانی ئیسلامی بـەناڕەوا هـەمووی پشت گوێ خـراوەو کـە دێتـە سەرحساب هیچی بۆ کورد نازمێرریێو هەرلایە بەشێوەیەکی تایبـەتی هـەوڵ ئـەدا ئەو چاکەو بەرهەمی ئەو زانایانە بۆ خۆی حساب بکاو کوردی لێ بێ بەری کراوە.

**دووهەم: خزمەتی کورد بۆ خەلافەتی عوسمانی**

لەباسەکانی پێشوودا لەوە دواین چۆن لەدوای بەسـتنی ئەمارەتـەکانی کـورد بەدەوڵەتی عوسمانیەوە لەرێی ئیدریس بدلیسـەوە تائـەو کاتـەی تورکـەکان لـە بەڵێنەکانی خۆیان بەرامبەر بەکورد پاشگەز نەبوبوونەوە، کـورد لـەماوەی چـەند سـەدەیەکدا بـەماڵ و بەگیانـەوە خزمـەتی ئـەو دەوڵەتـەی کـردوەو ئامـادەبووە لەهەموو ئەو شەڕانەی بەناوی غەزاوە کرابوو لەهەموویا بەشدار بێو پیـاوە زانـاو ئاینی و ئەوانەی لەناو سوپای عوسمانیدا بەدڵو بەگیان خزمەتیان کردبـوو چـۆن بەپاکیو دڵسۆزانە کاریان کردوە. میر بصری لەکتێبەکەیدا اعلام الکرد سەرچاوە ٢ ناوی گەلێك کوردی هێناوە لەوانەی هەریەکەیان بەشێوەیەك خزمـەتی سـوپای عوسمـانی و دەزگا بەڕێوەبـەرەکانی دەوڵـەتیان کـردوە، بەتایبـەتی ئەوانـەی لەباشوری کوردستانا چووبونە ئەستەمبوڵاو هەندێ شارەکانی تری ئەو رۆژانـەی دەوڵەتی عوسمانی. ئەمە بێجگە لەناوی ئەو کوردانەی باکوری کوردستان کە لە رووداوو باسە مێژوییەکانا ناویان هـاتووە. مـیر بصـری دەربـارەی ئـەو کوردانـەی باشـوری کوردسـتان لەدەوڵـەتی عوسمـانیدا خزمـەتیان کـردوە باسـی ئەمانـەی خوارەوەی کردوە:

١ـ ئەحمەد پاشای دوا ئەمیری بابان ـ کە لەساڵی ١٨٥٦دا لـە (یمـن) کـراوە بەوالی عوسمانی و لەساڵی ١٨٦٣دا کراوە بەوالی (وان) و لەسالانی ١٨٦٧ـ ١٨٨٠) دا والی ئەرزرۆم بووەو بەوپەڕی تواناو دەسەلاتی خۆیەوە خزمەتێکی گەورەی ئەو دەوڵەتەی کردوە (سەرەڕای ئەوەی لەئەمارەتەکەی خۆشی لابرابوو) .

٢ـ عبدالله مصیب پاشاـ لەساڵی ١٨٧٧دا بە روتبەی وەزیری کراوە بـەوالی بصرەو لەوێوە گوێزراوەتەوە بۆ بیروت و لەساڵی ١٨٨١دا کۆچی دوایی کردوە.

٣ـ خالد پاشا باڵیۆزی دەوڵەتی عوسمانی بوە لە (بلغراد) و (طهران) و ساڵی ١٨٩٩ کۆچی دوایی کردوە.

٤ـ شريف پاشای خندان ـ كه به جنراڵ (شريف صبری پاشا) ش ناسرابوو، لەساڵی ١٨٦٥دا لە ئەستەمبوڵ لەدايك بوەو لەناو هێزی سوپای سوارەی عوسمانيدا گەيشتبووە پلەی (فريق) و لەساڵی ١٨٩٠دا (ئەميرە ئەمينە) ی كچی محمد عبدالحليم پاشای كوڕی محمد علی پاشای ميصری مارەكردوە كە لەو رۆژانەدا ئەو ئەمينە خانە خوشكی محمد سعيد حليم پاشای صدری ئەعظەم (سەرۆك وەزيران) ی عوسمانی بوەو لە ساڵی ١٨٩٨دا كراوە بە باڵيۆزی حكومەتی عوسمانی لەستۆكهۆڵم (لەبەرگی دوهەمی ئەم كتێبەدا لە زۆر شوێنا شريف پاشای خندان دێتە بەرچاو) .

٥ـ سعيد پاشای خندان كوڕی حسێن پاشای كوڕی ئەحمەد ئاغای خندان بوە كە خەڵكی سلێمانی بوەو مامی سيف اللەخەندانی ناسراو بوەو، لەساڵی ١٨٨٢دا سعيدپاشا كرابوو بەوەزيری دەرەوەی عوسمانی و لەساڵی ١٨٨٣دا كراوە بە باڵيۆزی عوسمانی لەبرلين و ساڵی ١٨٨٥ دوبارە كراوەتەوە بە وەزيری دەرەوەو ساڵی ١٨٩٣ كراوە بەسەرۆكی ئەنجومەنی شورای (ئەنجومەنی سەنا= پيران و ساڵی ١٩٠٧ كۆچی دوايی كردوە.

٦ـ رسول مەستی: باپيری تۆفيق وەهبی بوە، گەلێك نوسراوو كتێبی بەتوركی چاپكردوەو كراوە به مفتيش معارف له (وان) ... (جارێك تۆفيق وەهبی بۆی باس كردم كه لەكۆتايی ژيانيشيا مديری معارف بوه لە ويلايەتی موصڵدا) .

٧ـ عزەت بەگی خەندان: برای سعيد پاشای خەندان بوە، لەساڵی ١٩١٢دا كراوە به والی (وان) و لەساڵی ١٩١٨دا وەزيری ئەوقاف بوه له ئەستەمبوڵ. عزت بەگ يەكێك بوه لەئەندامانی ئيئتلاف و معارضی كه ماليەكان بوەو لەسەر ئەوە لەساڵی ١٩٢٠دا زيندان كراوە.

٨ـ مصطفی نهنی پاشا: كوڕی حسێن بەگ بوە بۆ ماوەيەك والی (ئەطنە) بووە.

٩ـ ئيسماعيل حقی بابان: ئەندامی مجليسی مبعوثانی عوسمانی بوەو يەكێك بوه لەروناكبيرە سەربەستيخوازەكانی ئەو رۆژانەو لەساڵی ١٩٠٨دا كه اعلانی دەستور كرا ئەو خەريكی رۆژنامەگەری بوەو لەساڵی ١٩١١دا كرا بەوەزيری معارف و ساڵی ١٩١٣ كۆچی دوايی كردوە.

١٠ــ مصطفى‌پاشا یامولکی‌ــ ساڵی ١٩٠٤کــراوە بەرئیسـی ئـەرکانی ئـەو فرقەیـەی لـە ئەنقـەرەدا بـوەو سـاڵی ١٩١٠کـراوە بـە سـەرکردەی فرقـەی ١٣ لەئەرزنجان و ساڵی ١٩١١ لە شەڕی بالقـاندا بەشـدار بـووە و سـاڵی ١٩١٨ کـراوە بەسەرۆکی دادگای سوپایی کە محاکەمەی مصطفی کمالی کردبوو بـەتاوانی یـاخی بوون و حوکمـی اعدامـی مصطفـی کمـال دەرکردبـوو لـەوە تورکـە کمالیـەکان بـە (مصطفی نمرود) ناویان بردوەو ساڵی ١٩٢٢ گەڕایـەوە بـۆ باشـوری کوردسـتان و لەحکومەتەکەی شیخ مەحمودا وەزیری معارف بووەو ماوەیەك لەبەغدادیش دوای ئەوە خەریکی رۆژنامەگەری بوە.

١١ــ پیرەمێردــ شـاعیری مـەزنی کـورد حـاجی تۆفیـق کـوڕی محمـود ئاغـای همزە ئاغا کە همزە ئاغای باپیری وەزیری ئەحمەد پاشای دوامیری بابان بووە کە لەژمارە ١ی ناوەکاندا باسمان کردوە.

پیرەمێرد لەساڵی ١٨٩٨دا لەسلێمانیەوە چۆتـە ئەستەمبوڵ و کولیەی حقوقی تەواو کردوەو بوە بە ئەندامی (ئەنجومەنی بەرزی معارف) لەئەسـتەمبوڵ و سـاڵی ١٩٠٨ کە اعلانی دستوری کراوە خەریکی رۆژنامەگـەری و محامـات بـووە و سـاڵی ١٩٠٨ رۆژنامەی (رەسملی کتاب) ی دەرکردوە و بەسێ زمان نوسیویەتی و ساڵی ١٩٠٩کراوە بەقائمقامی جۆلەمێرگ و ساڵی ١٩١٨ کـراوە بـە متصرفـی ئەماسـیەو لەدواییدا گەڕاوەتەوە بـۆ سـلێمانی و خـەریکی رۆژنامەگـەری بـوەو ژیـان و ژینـی دەرکردوەو ساڵی ١٩٥٠ کۆچی دوایی کردوە.

١٢ــ محمد ئەمین زەکیــ نوسـەرو مێژوونـاسـی بـەناوبانگ و خـاوەنی کتێبـی مێـژوی کـوردو کوردسـتان. سـاڵی ١٨٨٠ لەسـلێمانی لـەدایك بـوە و سـاڵی ١٨٩٩ چوەتە ئەستەمبوڵ و چوەتە قوتابخانەی سەربازی و ساڵی ١٩٠٤ ئـەرکانی حربـی تـەواو کـردوەو سـاڵی ١٩٠٩ یەکـەم کـەس بـووە خەریتـەی شـاری ئەسـتەمبوڵی کێشاوە و بەشدار بووە لەدەسنیشان کردنی سنوری تورکیا و بولغاریـادا لەسـاڵی ١٩١٠داو سـاڵی ١٩١٢ بەشـداری کـردوە لەدەسنیشـانکردنی سـنوری عوسمـانی و روسیا لەناوچەکانی قفقاس و لەشەڕی باڵقاندا ضابط روکنی فرقەی پێنجەم بـوەو ساڵی ١٩١٢ نێرراوە بۆ فرنسـە بـۆ شـارەزابوونی مەشـقی سـەربازی و لـە شـەڕی یەکـەمی جیهانیدا ضـابط روکنـی فەیلـەقی یەکـەم بوە سـاڵی ١٩١٨ نـێرراوە بـۆ جەبهـەی قفقـاس و مـــەدالیای زیوینـــی پێـدراوە و مـەدالیای دوهـەمی صلیبـی

ئەڵمانیاشی وەرگرتوەو ساڵی ١٩٢٢ گەڕاوەتەوە بۆ عێراق و لە حکومەتی عێراقدا چەند جارێك کراوە بە وەزیر.

١٣ـ توفیق وەهبیـ ساڵی ١٨٩١ لە سلێمانی لەدایك بووە و لە مەکتەبی عەسکەری ئەستەمبوڵ دەرچووەو لە ساڵی ١٩١١دا لەشەڕی ئەلبانیادا بەشداربووەو ساڵی ١٩١٤ ضابط روکنی ئەو فرقەیەی تورك بووە کە لە شەڕی (چناقلعە) ی بەناوبانگدا لە (دردنیل) دا کراوە بەشدار بووە و لەساڵی ١٩١٧ مەدالیای صلیبی ئاشتی پێدراوە (ئەوەی شایانی باسە، دەربارەی ئەو شەڕەی ئەلبان کە میر بصری باسی کردوە، تۆفیق وەهبی بەتورکی کتێبێکی هەیە لەجامعەی لندن کتێبخانەی ساواس، بەناوی (ماکینەلی تفەنگ_ دەوری رەشاش لە شەڕی پارتیزانیدا).

تائێرە ناوی ئەو کەسانەیە کە میر بصری لەکتێبەکەیدا دەربارەی ئەو کوردانەی باشوری کوردستان کە خزمەتی دەوڵەتی عوسمانیان کردوە، بێگومان کوردی رۆژهەڵاتی کوردستانیش ئەوەی دەرفەتی بووبێ خزمەتی کردووە شان بەشانی ئەو کوردانەی تر لەباشوری کوردستاندا بون لەباسەکانا ناوی هەندێکیان هاتووە.

دەربارەی هەستی ئاینی کوردو بەشدار بوونی کورد لە شەڕەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ خزمەتی ئاینی ئیسلام و دەوڵەتی عوسمانی بەناوی غەزاوە لەلاپەڕە ٢٧ی گۆڤاری ڕەنگینی ژمارە ٨٣ ی رۆژی ١٥ ٥ ١٩٩٥، عبدالرحمن زەنگەنە باسی گەڕیدەیەکی فرەنسی کردوە ناوی (لجان) بوە لەنێوان ساڵانی ١٨٦٢ – ١٨٦٦دا بەناو وڵاتی عوسمانیدا گەڕاوەو لەو گەشتەیدا دەربارەی کورد سەرنجی خۆی بەم جۆرەی خوارەوە دەربڕیوە:

((دەگێڕنەوە ساتێك جەنگی رۆژهەڵات بەرپابوو لەساڵانی ١٨٥٤ – ١٨٥٦ دا، بابی عالی بانگەوازی جهاد (غەزا) ی بڵاوکردەوەو بەو بانگەوازە هەستی ئاینی ئیسلامەکانی جووڵاندو موسڵمانان ڕوویانکردە ئەستەمبوڵ و ناو شەقامەکانی ئەستەمبوڵ پڕبوو لەخەڵکی وڵاتانی جۆربەجۆرو هەریەکە بەجل و بەرگی نیشتمانی بەجۆرە چەکێکی تایبەتی خۆیەوە هاتبوو بۆ بەشدار بوون لەو غەزایەدا لەوانە ژنێکی کورد بوو (قەرەفاطمە_ فاطمەرەش) کە بەخۆی و چەکدارەکانی هێزەکەیەوە گەیشتبوونە ئەستەمبوڵ. ئەو ژنە بەپێی شێوەکەی

دیاریوو ژنێکی لاو نەبوو جوانیش نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو شۆڕە سوارانەی کورد دوای کەوتبون و هاتبوونە ئەستەمبوڵ. هاتنی ئەو ژنە بەو شێوەیە سەرنجی خەڵکی راکێشابوو، پڕیەدڵی ئەو خەڵکە بوو زۆریان پێ خۆشبوو ژنێك بەو جۆرە هاتبووە ریزی پیاوە چەکدارەکانەوە و هاتنەکەی کارێکی زۆری کردبووە سەر خەڵك بەتایبەتی.بۆ سەر پیاوە ئاینیەکان.

هەرچەند کاربەدەستانی عوسمانی رێگەیان نەدا بە فاطمە بچێتە ناو کۆڕی شەڕەوە بۆ ئەوەی بەشدار بێ، بەڵام چوونەکەی بۆ ئەستەمبوڵ لەزۆر شوێنی کوردستانا دەنگی دابوەوەو هەستی ئاینی زۆریانی بزواندبوو)) .

لەراستیدا ئەو باسەی قەرە فاطمە یەکێك بووە لە دیمەنی بەشداربوونی کورد شان بەشانی هێزی عوسمانی لەو شەڕانەدا بەناو بۆ سوودی ئاینی ئیسلام دەیان کردو بێگومان لەکاتی ئەو شەڕو غەزایانەدا بارەها کورد خۆی ناردوە بۆ بەشدار بوون کە نمونەیەکی تری ئەمە لە ناردنی ئەو دەروێش و مریدانەی کاك ئەحمەدی شێخدا دێتە بەر چاو کە وەختی خۆی ژمارەیەکی زۆری ناردبوو بۆ هاوکاری کردنی سوپای عوسمانی لە شەڕی قارص و ئەردەهاندا.

بێجگە لەوە، لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەی شیخ محمودو دەوڵەتەکەی کوردستان سەرچاوە ٨٠ بەدوورو درێژ باسی بەشدابوونی شێخ مەحمودم کردوە بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ سوپای عوسمانیدا لە (شعیبە) لە باشوری عێراقدا دژی ئینگلیزەکان لە ناوچەی (مەریوان) دژی سوپای روس کە گەیشتوەتە نزیکی پێنجوین لە شەڕی جیهانی یەکەمدا کە شیخ مەحمود لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری کوردا لەگەڵ سوپای عوسمانیدا بەشدار بوون لەو شەڕەدا شێخ مەحمود بریندار کرابوو.

## بەشی دوازدەهەم

# سوارەی حمیدیە- ئێستر سوار (حمیدیە ئالایلری)

سوارەی حمیدیە بریتی بووە لەو هێزەی وەکوو لاسایی کردنەوەیەکی روسەکان چۆن هێزی (قۆزاق) یان دامەزراندبوو، تورکەکانی عوسمانیش بەڕاسپاردەو راوێژی ئینگلیزەکان هاندران هێزێکی لەو شێوەیە لە عەشایرە جۆر بەجۆرەکانی ناو وڵاتی عوسمانی وەکو بەشێك لەسوپای دەوڵەت بەسەرکردایەتی ئەفسەرە بەرزەکانی تورك دامەزرێنن و لەبەرئەوەی عەشایەرەکانی کورد و سەرکردەکانی هەندێکیان رۆڵێکی گەورەیان بینیوە و پێیان سپێررابوو بەپێویستم زانی باسی ئەو هێزەو چۆنیەتی پێك هێنانی بکەم و باسەکە بکەم بەم چەند بەشەوە:

**١- چۆنیەتی پێکهێنانی.**

**٢_ هۆی پێکهێنانی.**

**٣_ زیانەکانی سوارەی حمیدیە.**

**یەکەم - چۆنیەتی پێکهێنانی**

لەساڵی ١٨٩١دا سوڵتان عبدالحمیدی دوهەم فەرمانێکی دەرکرد بۆ ئەو هێزە عەشایرییەی ناوی لێ نرا (حمیدیە ئالایلری_ سوارەی حمیدیە) کە لای کوردەکان بە ئێستر سوار ناودەبران.

مینۆرسکی لەلاپەرە ٥٩ی سەرچاوە ٤٣داو ئەمین زەکی لەلاپەرە ٢٥٤ی مێژووی کوردو کوردستان باسیان کردوەو هەروەکوو لەو دوسەرچاوەدا هاتووە ناوی ئەو هێزە کراوە بە (خفیف سواری ئالایلری= هێزی سوارەی سووك و سۆڵ) و (ROBERT OLSON) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٨٤ ناوی ئەو هێزەی وەکوو

بەتورکی چۆن بووە بەوجۆرە ناوی بردوە (HAFIF SUVARI ALAYLARI) خفیف سواری ئالایلری.

بەپێی کتێبی (TNE THE KURDS) سەرچاوە ١ ئەوهێزە لەهاوینی ساڵی ١٨٩١دا دروستکراوەو (مروان المدور) لەکتێبەکەیدا (الارمن عبر التأریخ) چاپی ١٩٨٢ لەلاپەرە ٢٩٧دا وتویەتی:

((ئەو هێزە لەهەموو نەتەوەکانی تری غەیری تورك وەکوو کورد و ئەلبان و چرکس پێکهێنرابوون کە ژمارەی کورد لەناو ئەو هێزەدا تەنها بریتی بوە لە (١٠ هەزار سوار) ، کە ئەم بۆچوونەی مروان المدور ئەوە بەدرۆ دەخاتەوە کە هەندێ سەرچاوەی دوژمنی کورد وتویانە ئەو هێزە هەمووی لە کورد پێکهاتبوو ئەو کوشتارەی لەساڵی ١٨٩٥دا لە ئەرمەنیەکان کرابوو بەهۆی ئەو هێزەوە کرابوو زۆری تاوانەکەش خرابووە ئەستۆی کوردەوە.

مینۆرسکی لەلاپەرە ٥٩ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤٢ لەباسی چۆنیەتی پێکهێنانی ئەو هێزە وتویەتی:

((شاکرپاشای بەناوبانگ کە لەساڵی ١٨٩١دا سەرکردەی گشتی أصلاحات بوو لە ویلایەتەکانی ئەنادۆڵدا هەوڵیدا هێزێکی سوپایی لە کوردەکان دامەزرێنێت لەشێوەی هێزی قۆزاقداو لەساڵی ١٨٩٢ دا لە ئەستەمبوڵو بەغداد قوتابخانەی عەشایری کرایەوە بۆ ئەوەی هەستو هۆشی تورکەکان لەبیرو گیانی عەرەب و کوردە کۆچەریەکانا چەکەرە بکاو بەهێز بێو کوردو عەرەب لەتورك نزیك بکرێنەوەو تێکەڵ بەوان بنو زۆری پێ نەچوو شاکرپاشا خۆی کرا بەلێپرسراوی ئەو هێزەو ئەو قوتابخانە (بەپێی کتێبەکەی رۆبرت ئۆلسۆن شاکرپاشا مێردی خوشکی سوڵتان عبدالحمید بووە) .

لەم باسەی مینۆرسکی‌دا دەردەکەوێ هەندێ لەو سەرچاوانەی وەکوو (ئیلفنستن) لەکتێبەکەیدا سەرچاوەی ژمارە ٨ وتبویان ئەو هێزە بەسەرکردایەتی ئیبراهیم پاشای میللی دروستکرابوو شتێکی راست نیە و ئیبراهیم پاشا وەکو لەشوێنی خۆیا باسی دەکەین سەرکردەی یەکێك بووە لەهێزەکان.

بێجگە لەوە هەندێ سەرچاوەش وەکوو کتێبەکەی صادق شرفکندی سەرچاوە ٧١و کتێبەکەی حسن عرفە لاپەڕە ٢٢٤ چاپی لندن ساڵی ١٩٦٦ وتویانە ئەو هێزە لەکوردو لە سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد پێکهاتبوو بەڵام لەهەندێ سەرچاوەی تردا وەکو کتێبەکەی مروان المدور وتراوە لەو هێزەدا ئەلبان و چرکسیشی تیادابووەو ژمارەی کورد لەو هێزەدا بریتیبووە لە (١٠) هەزار کەس کە ژمارەی ئەو هێزە وەکوو لەدواییدا باسی دەکەین زۆر زیاتربووە لە دەهەزار کەس.

رۆبرت ئۆلسۆن لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٨٤ لەباسی ئەو هێزەدا وتوویەتی ئەو هێزە لەو کوردانە بوون کە (سونی) مەزهەب بونو ڕێگە نەدراوە بەکوردە عەلەوییەکان بەشداربن (کە ئەوەی وتوویەتی ڕێگە نەدراوە بەعلویەکان لەو هێزەدا بوون شتێکی راستە بەڵام هەموو هێزەکە هەر لە کورد پێك نەهاتبوو) .

صادق شرفکندی لەلاپەڕە ٤٧ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٧١ باسی ناوچەکانی ئەرزیڕۆم و دەوروبەری باکووری گۆلی وان و بدلیسی کردوە کە ئەبوایە هەموو بنەماڵەیەکی ئەو ناوچانەی کورد سوارێك بەئەسپەوە وەیا پیادەیەك ڕەوانەی سوپای حکومەت بکەن بۆ ئەوەی بکرێن بە سەرباز.

(لام وایە ئەو بەزۆر ناردنەی کورد بۆ ناوسوپای تورك وای لەزۆریان کردبوو کە بچنە ناو ڕیزی هێزی سوارەی حمیدیەوە کە لەژێر سەرکردایەتی دەرەبەگەکانی کوردا بوونو ئەمەیان لاباشتربووە لەوەی بچنە ناو سوپای تورکە وە کە هەمیشە سەرکردەکانی تورك بووە) .

بەپێی باسەکەی صادق شرفکندی، لکەکانی سوارەی حمیدیە لەسەر بناغەی ڕێکخراوێکی لەگەورە وە بۆ بچووکی عەشیرەتی دامەزرێندرابوو، هەموو چەکیان لە حکومەت وەردەگرت و دەبوایە لەپێشدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لەژێر چاودێریی ئەفسەرە تورکەکانا مەشقیان پێ بکرایە و پاش تەواوکردنی مەشق دەبوایە چەکەکانیان بدایەتەوە بەحکومەت هەتا کاتی پێویستی و سەرۆك عەشیرەتەکان هەریەکەیان نازناوێکی سوپاییان پێ ئەدرا وەکو پاشاو دەسکەوت و خەڵاتی ئاشکرایان وەردەگرت و لەناو ئەو هێزانەدا دەسەڵاتیان لەدەسەڵاتدارێتی دەرەبەگێتی یا پاشا زۆرتر و بەهێزتربووەو ئەو هێزە

لەکوشتاری ئەرمەنیەکان و عەرەبـە ناسیۆنالیستـەکان بەشـدار بـوون و میللـەتی کورد خۆشی لەدەسدرێژیو تـاوانی ئـەو هـێزە رزگـاری نـەبوو تـاوانێکی زۆریـان هەبوە بەرامبەر کوردەکانی دەرسیم و باشوری کوردستان.

دەربارەی قەوارەی ئەو هـێزە، روبـرت ئولسـون لەسـەرچاوە ٨٤ وتویویـەتی هەریەکێك لە لکـەکانی ئـەو هـێزە لـە شـەش فـەوج پێکهاتبوو، هەرفـەوجێکیش بریتیبووە لە (٥١٢) سوارو لکەکان لێك جیاوازبوون و نەدەبوایە بخرێنـە سـەر یەك مەگەر تەنها لەکاتی شەڕدا دەخرانە ژێـر سـەرکردایەتیەکەوە (کـە بێگومـان ئـەو سـەرکردایەتیە تـورك بـووە) تەمـەنی ئەوانـەی لـەو هـێزە دا قبـولْ دەکـران دەبوایە لەبەینی ١٧ـ٤٠ ساڵیدا بوونایە و ئەوانەی دەکران بەئەفسـەر لـەناو ئـەو هـێزەدا دەبوایـە لەقوتابخانـەی (سـوارەی حمیدیـە مەکتـەبی) بخوێنـن و ئەگـەر کوردێك لـەناو ئــەو هــێزەدا بگەیشـتایەتە پلــەو پایــەی (کۆلۆنێـل) دەبوایــە یارمەتیدەرەکەی تورك بوایـە و بەشـێوەیەکی گشـتی ئـەو هێزانـە دەبەسـرانەوە بەهێزی چوارەمی سوپای حکومەتی عوسمانی کە لەژێر سەرکردایەتی مشیر زکی پاشادابوو کە خۆی واپیشان ئەدا گوایە دۆستی کوردبوو.

جلیلـی لەکتێبەکـەیدا سـەرچاوە ٥٥ ئامـاژەی بـۆ لاپــەڕە ٢٤ی کتێبەکـەی (کارتسۆف) کردوە چاپی تفلیس ساڵی ١٨٩٦ کەوتویـەتی: ئـەو ئاغـا کوردانـەی هـەتا ئێسـتە لای تورکـەکان بەچەتـەو ڕێگـر نـاودەبران وابـە هـۆی ئـەو مدالیــاو نیشـانانەی وەریـانگرتووە (مەبەسـت لـەناو سـوارەی حمیدیــەدا) وائێسـتە بــە بەرچاوی ئەفسەرەکانی حکومەتی عوسمانیەوە خۆیانی پێوە هەڵدەکێشن.

جلیلی بێجگە لەوە ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (ف. ف. گریازنۆف) کردوە بەناوی (کوردو سوارەی کورد) لە هەواڵەکانی ئەرکانی حەربی ناوچەی قفقاس ژمـارە ٢٠ لەتفلیس باسی ئەوەی کردوە کە لەگەڵ ئەوەشدا حکومەت لەو ڕۆژانەدا لـەرووی ئابووریـەوە دەسـتی کـورت بـوو کـەچی هەشـت ملیــۆن لـیرەی بـۆ مەبەسـتی دروستبوونی ئەو قوتابخانانە تەرخان کرد بۆ ئەوەی تاقمێکی تازەی دەرەبـەگی ئایندار بهێنرێتە ژێر سایەی سوڵتانەوە.

ئەڤریانۆڤ لەباسی ئەو قوتابخانەدا وتویەتی لەناو هەریەکێك لەو قوتابخانانە مزگەوتێك دروست دەکرا بـۆ ئـەوەی منداڵانـی کـورد کـە لـە قوتابخانـەدا دەیـان

خوێند هەستی ئاینیان تیادا بەهێز بکرێت و منداڵانی کورد لەقوتابخانانەدا فێری زمانی تورکی ببن.

لەساڵی ١٨٩٢ دا لە ئەستەمبوڵ قوتابخانەی (عەشیرەت مەکتەبی) کرایەوە، ماوەی خوێندن تیایا پێنج ساڵ بووە. زۆربەی منداڵانی قوتابی منداڵی سەرۆکە کوردەکان بوون و ژمارەی هەر قوتابخانەیەك (٢٥٠) قوتابی بووەو لەو قوتابخانانەدا منداڵی عەرەب و ئەلبانیشی تیابووە جگە لە منداڵانی کورد.

لازاریف، دەربارەی ئەو منداڵانەی دەنێران بۆ ئەو قوتابخانەیە لای وایە تورکەکان ئەو قوتابخانانەیان بۆ ئەوەکردبوەوە تا منالآنی کورد وەکو بارمتەیەك وابن لای حکومەتی عوسمانی، بەڵام ئاواتەکانی سوڵتان سەری نەگرت چونکە زۆری پێ نەچوو هی وا پەیدابوو لەناو ئەو قوتابخانانەدا دژی حکومەت رادەوەستا.

دەربارەی ئەو بۆچوونەی لازاریف، رۆژنامەی (گنتشاك= کنجاك) لەژمارەکانی ٧ــ ٨ یدا لاپەڕە ٤٧ ی ساڵی ١٩٠٣ وتویەتی: منداڵانی کورد لەو قوتابخانانەدا هەرچەند بەزمانی تورکی دەیان خوێند، بەڵام بەهۆی ئەوەی تێکەڵ دەبوون لەگەڵ ئەو منداڵانەی بیروباوەڕی ئازادی و سەربەستی لەمێشکیانا چەکەرەی کردبوو ئەو تێکەڵبوونە کاریکردە سەر منداڵەکانی کوردیش و ئەوانیش بیری ئازادی و سەربەستی لە مێشکیان جێگیر بوو بیریان لەوە کردەوە کوردیش بۆخۆی حکومەتێك دروست بکا، بۆیە سوڵتان عبدالحمید لە ساڵی ١٩٠٦دا ئەو قوتابخانانەی داخست.

جلیلی ئاماژەی بۆ ژمارە (٧-٨) ی رۆژنامەی (کنجاك) کردوە کە پەیامنێرەکەی وتویەتی:

ئارەزووی کوردەکان بۆ گواستنەوەی چالاکیەکانیان لە کەناری بۆسفۆرەوە (مەبەست ئەو کوردانە بووە لە ئەستەمبوڵدا دەژیان) بۆ ناوخاکی نیشتمانی خۆیان هەندێکیانی خستبووە سەرسەودای گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان و هەندێکیشیان بەنەهێنی گەڕابوونەوەو دەستیان کردبوو بەبیرکردنەوە لەدامەزراندنی کوردستانێکی سەربەست و لەئەنجامی ئەمەدا بیری خەبات و تێکۆشان بۆ ئەو مەبەستە لەناو ئەو قوتابخانانەدا پەرەی سەندبوو.

تورکەکان لەبغداد بەهۆی پیلانی عوسمانیەوە کێشەیەکیان پەیدا کرد لەنێوان قوتابیانی کوردو عەرەب و، والی ئەو کێشەیەی کرد بەبیانوو قوتابخانەکەی بغدادی داخست.

**دوهەم ـ هۆی پێکهێنانی سوارەی حمیدیە**

ئەو رۆژانەی هێزی سوارەی حەمیدیەی تیادا دروست بوو، بەرلەوە کێشەیەکی سیاسی و بەین برکێیەکی توندو تیژ لەنێوان ئینگلیزو روسدا پەیدابوبوو، هەرلایە دەیویست تەنها هەرخۆی دەسەلاتی لەناو دەولەتی عوسمانیدا هەبێ.

حکومەتی عوسمانی بەهۆی باری خواری ئابووریەوە تووشی گێچەلێکی گەورە بوبوون و کەوتبوونە ژێر بارێکی گرانی قەرزی حکومەتی بریتانیاو بازرگانەکانیەوەو ئنگلیز لەوە ترسابوو روسەکان لەسنوری قفقاسەوە لەرێگەی قوازقەکانیەوە دەسدرێژی بکاتە سەرسنوری دەولەتی عوسمانی و فشاریش بخاتە سەر کوردو ئەرمەنی بۆ ئەوەی بیانکا بەدەسکەلای خۆی دژی حکومەتی عوسمانی، بۆیە سەریانکردە سەر سولتان و کاربەدەستان بۆئەوەی دەستوبرد بکەن لە دامەزراندنی هێزێکی عەشایری بۆ رووبەرووبونەوەی مەترسیەکانی قۆزاق و بۆ دامرکاندنی هەر بزوتنەوەو جمو جۆلێك دژی حکومەت بۆ ئەوەی روسەکان سود لەو کێشەو هەرایانە وەرنەگرن و لەئەنجامدا توانییان کاریکەنە سەر حکومەتی عوسمانی و هێزی سوارەی حمیدیە پێك هێنرا.

بۆ روونکردنەوەی هۆی پێکهێنانی سوارەی حەمیدیە، هەوڵ ئەدەین کورتەی هەندێ لەو سەرچاوانە باس بکەم:

لەکتێبی (جنبشهای کورد ــ سەرچاوە ٥٣، لەلاپەرە ٥١ دا دەربارەی هۆی پێکهێنانی سوارەی حمیدیە وتویەتی هۆی یەکەم ئەوەبووە حکومەتی عوسمانی لەرێگەی ئەو هێزەوە بەرگری لە سنوورەکانی خۆی بکا دژی هەرهێرشێك لەئێران و روسەوە ئاراستەی خاکی عوسمانی بکرێ.

هۆی دوهەم ئەوەبووە لەڕێگەی زەبرو زەنگی ئەو هێزەوە دەسەڵاتی زۆربەی سەرۆك عەشیرەتەكان لەناو ئەو هێزەدا گرد بكەنەوەو ئەو هێزە بكەن بەداردەستی خۆیان بۆ لێدانی هەر بزوتنەوەیەك دژی دەوڵەت بكرێت.

هۆی سێهەم بۆچاوترساندنی ئەو كە مە ئاینیانەی دژی حكومەت دەجوڵانەوە، بەتایبەتی ئەرمەنیەكان كە كاریەدەستانی عوسمانی لەنێوان ساڵانی ١٨٩٤–١٨٩٦ دا (٣٠٠) هەزار ئەرمەنییان لەڕێگەی ئەو هێزەو لەڕێگەی سوپای توركەوە قەلاچۆ كردو ژمارەیەكی زۆریشیان لێ ئاوارە كراو زەوی و زارەكانیان لێ زەوت كردن.

مەبەستێكی تری ئاشكرای حكومەت بریتیبووە لەپەیداكردن و بەهێزكردنی دوژمنایەتی نێوانی كوردو ئەرمەنی (سەرچاوەی كتێبی جنبشها بریتیە لەكتیبی: گ. م. ئاردتیونیان ـ بەناوی: سیاسەتی أرتجاعی بورژوازی انگلستان دەربارەء مسئلەء ئەرمنیها لاپەڕە ١٩٠ چاپی مۆسكۆ ساڵی ١٩٥٤) .

كتێبی جنبشها، لەسەر باسەكەی ڕۆیوەو ئەلێ:ـ حكومەتی عوسمانی بۆ سەرگرتنی مەبەستەكانی خۆی، دەسەڵاتێكی زۆری دابوو بە سەرۆك عەشیرەتەكانی كورد بۆ لێدان و لاواز كردنی ئەرمەنیەكان و حكومەت گوێی خۆی كە ڕ دەكردو چاوی دەنووقان لە ئاستی ئەو ڕەفتارە پیس و چەپەڵانەی سوارەی حمیدیە دەربارەی ئەرمەنیەكان دەیكرد.

بۆنمونە: لە ناوچەی (خوشاب قاضی) لەماوەی هەشت ساڵدا لەلایەن سوارەی حمیدیەوە دەیان كەس كوژراو (٨٠٠) ولاخی بەرزەو بەهەزاران مەڕو ماڵاتیان دەدزی و تالانیان دەكرد و حكومەتیش لێی بێدەنگ دەبوو.بەلاَم لەدواییدا حكومەت بۆی دەركەوت ئەو هێزە ئامانجەكانی بەتەواوی و بەباشی نەدەگەیاندە ئەنجام و كوردو ئەرمەنیش بۆیان دەركەوتبوو تاقە دوژمنی هەردولایان بریتی بووە لە حكومەتی عوسمانی، بۆیە لەساڵانی ١٩٠٣–١٩٠٤ ساتێك شۆڕشی ئەرمەنیەكان لەناوچەی (ساسون) دەستی پێكرد، كوردەكان ژمارەیەكی زۆریان لەئەرمەنیەكان پاراست و بەشێوەیەكی نهێنی گرتیاننە خۆیان و زۆریان لە مردن رزگار كردن، دەربارەی هۆی پێكهێنانی سوارەی حمیدیە، (ڕۆبرت ئۆلسۆن) لە كتێبەكەیدا سەرچاوە ٨٤ باسی بۆچوونی

نووسـەرێکی کـردوە (Bayram Kodmen ـ کـە بەناوەکـەیا دیـارە تورکـە) دەربارەی هۆی پێکهێنانی ئەو هێزە کە بریتی بوە لە:

١ـ بەستنەوەی دەسـەلآت لـە هـەموو ناوچـەکانی ولآتـی عوسمـانیدا بەحکومـەتی مەرکەزیەوە.

٢ـ سیاسەتی پەیداکردن و ڕاگرتنی لەنگەرێك لەناو ولآتدا.

٣ـ بەهێز کردنی یەکێتی لەناو ئیسلامەکانا.

٤ـ بۆئەوەی حکومەت ئەو هێزە بکا بە کوتەکی دەسـتی خـۆی دژی هەرلایـەك سـوور بێت لەسەر داواکردنی أصلاحاتی دەستوری لە ولآتی عوسمانیدا.

ڕۆبرت ئۆلسۆن لەکتێبەکەیدا ئەڵێ: بـەڵام بـەلای (Stephen Duguid) ەوە وایە سوڵتان عبد الحمید چەند مەبەستێکی تریشیهەبوە وەکوو:

١ـ لای سوڵتان وابـوە بونـی ئـەو هـێزە دەبێتـە هـۆی پتـەوکردنی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و دەبیەستێتەوە بـەڕەگ و ریشـەی ئیسـلامەتیەوە و دژی ئەوانـە دەوەسـتێ داوای أصلاحاتی دستوری دەکەن کە بەوە دەسەلآتی سوڵتانی نوێنەری ئاینی ئیسـلامی پێ کزدەبێ.

٢ـ بەکارهێنانی ئـەو هـێزە دژی ڕوس و ئەرمـەن کـە هـەردولای بـەهاوکاری یـەکتر دادەنا دژی دەوڵەتی عوسمانی.

٣ـ بـەکارهێنانی ئـەو هـێزە دژی هەردەسـتەو تـاقمێك سـەرپێچیان بکردایـە دژی دەسەلآتی حکومەت.

٤ـ بەکار هێنانی ئەو هێزە دژی ئەوانـەی لەناوچـەکانی جۆرجیـادا دژی حکومـەتی عوسمانی بون.

ڕۆبرت ئۆلسۆن دەڵێ: لەراستیدا مەبەستی سەرەکی حکومەت ئـەو کوشـتارە بوە لەسـاڵی ١٨٩٣ دا لـەڕۆژی ٢٢ ی مـانگی سـیبتەمبەردا لەناوچـەی ساسـون دژی ئەرمەنیەکان کردبووی کە لەو ڕۆژانەدا ژمارەی کورد لـەناو هـێزی سـوارەی حمیدیەدا (٤٧) هەزار بووە.

لەڕاستیدا لەو کتێبـەی (Stephen Duguid) کـە ڕۆبـرت ئۆلسـۆن ئامـاژەی بۆکردبوو دووشتی تیایە کە دوورن لەراستیەوە، یەکەمیان ساڵی ئەو کوشـتارەی لە ئەرمەنیـەکان کرابـوو لـەنێوان سـاڵانی ١٨٩٤ـ ١٨٩٦ دا بـوە (کـە زوریـەی

سەرچاوەکان ساڵی ١٨٩٥یان داناوە بەساڵی ئەو کوشتارە، دوهەم ژمارەی کورد لە سوارەی حمیدیەدا زیادە ڕۆیی تیاداکراوەو ژمارەیان (١٠) هـەزار بـووە وەکـو بەرلەمە باسی کراوە.

ڕۆبرت ئۆلسۆن لەباسەکەیدا ئـەڵێ: ((سـاتێك أصلاحـاتی دەسـتوری لەسـاڵی ١٩٠٨ دا مۆرکرا سوارەی حمیدیە هەرمایەوە بەلاّم ناوەکەیان گۆڕی بە (Tribal Regiment = فەوجی عەشایری). لەپێشدا هەوڵدرا ناوەکەی بکرێ بە (Ougus Laylan) کـە ئەمـە ئامـاژە بـووە بـۆ ئـەو فیدراسیۆنەی لـەکاتی خۆیـدا لـەناو عەشیرەتەکانی تورکدا سازکرابوو بەمەبەستی ئەوەی ئەو هێزە هیچ پێوەندیەکی بەکوردەوە نەمێنێ بەلاّم محمود شوکت پاشا ئەمەی بەدڵ نەبوو.

لەساڵی ١٩١٠دا کە تاقمی ژوون تورك ـ اتحادوترقی ـ بـوون بەدەسـەلاّتداری تەواو ژمـارەی فەوجـەکانی حمیدیـە (٦٤) فـەوج بووکـە بەهـەمووی (٥٣) هـەزار سواربوو، لەوانە (٣) هەزار سواری لەئورفەو وێرانشهرەوە نێرران بۆ باڵکان.

**سێهەم ـ زیانەکانی سوارەی حمیدیە**

مەبەست لەدروست کردنی سوارەی حمیدیە شـتێك نـەبوو ڕۆشـنبیرانی کـورد لەنیازی کاربەدەستانی عوسمانی شارەزا نەبووبن، بەڵکوو سوور دەیـانزانی ئـەو هێزە چەند سوودی سوڵتان و کاربەدەستانی عوسمـانی تیـادا بـووە ئـەوەندەش زیـانی بەمیللـەتی کـورد و دۆسـتایەتی وپێوەنـدی کـورد گـەیاندبوو لەگـەڵ ئەرمەنیەکاندا کە هەردوولا هـاودەردی جـەورو سـتەمی تورکـەکان بـوون و لـەناو کوردا ئەوەی سوودی لـەبوونی ئـەو هـێزە دەسـگیر بوبـوو بریتـی بـوون لەچـەند ئاغاو دەرەبەگێك کە تەنها بەدوای سـوودی خۆیـان گـەڕابوون و دەسـکەوتەکانی خۆیان لە هەموو شتێك زیاتر گرنگ بووە لایـان و لـەخۆڕایی نـەبوە لـەو ڕۆژانـەدا لەڕۆژنامـەی کوردسـتانی ژمـارە ٢٨ی ڕۆژی ١ /٩/ ١٣١٧ ی کۆچـی کـە ئـەو ژمارەیـە لەشـاری (فۆلکسـتۆن ـ Folkston) ی بریتانیـاوە دەرچـووە کـە سەرنوسەرەکەی عبدالرحمن بدرخان بووە، لەوژمارەیەدا هێرشـی بردوەتـە سـەر ئەو هێزەو باسی زیانەکانی کردوە بۆ میللـەتی کـورد و بـۆ تێکدانـی دۆسـتایەتی کوردو ئەرمەنی.

دەربارەی ئەو زیانانەی بەهۆی ئەو هێزەوە بەکورد گەیشتبوو، دوکتۆر کمال مەزهەر لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٢٢ باسی ئەو زیانانەی کردوە کە بەهۆی سوارەی حمیدیەوە بەکورد گەیشتبوو بریتی بووە لەزڕاندنی ناوی کورد بەهۆی ئەو کوشتارەی لە ئەرمەنیەکان کرابوو، بۆ ئەوە ئامارەی بۆ کتێبی (مێژووی ئەرمەنیا) لەلاپەڕە ٥٣یدا چاپی بیروت کردوە چۆن حکومەتی عوسمانی لەساڵی ١٩١٥دا بەسەربازو جەندرمەو کورد (مەبەستی لەکوردی سوارەی حمیدیە بووە) و چەند رێگرێکەوە بێ جیاوازی کەوتنە گیانی ئەرمەنیەکان.

هەروەها دەربارەی ئەو ناوزڕاندنەی کورد (لۆقا زودو) لەکتێبەکەیدا (المسألەالكرديەو العقوبات العنصريە في العراق) چاپی بیروت ساڵی ١٩٦٩ لەلاپەڕە ٨٠دا وتویەتی:ـ

((ساتێك سوڵتان عبدالحميد ویستی ئەرمەنی و ئاسوری لەناوببا لەکوردەکانی باشتر نەدۆزیەوە مەبەست و نیازەکانی خۆی پێ بێنێتە دی بەو جۆرە تورکی عوسمانی توانی شەڕێك لەنێوان کوردو ئەرمەنیدا بەرپابکا کە ئێستەش لە ویژدانی ئەم نەوەیەدا دەنگ ئەداتەوە (لەراستیدا لوقا زۆدۆ دەبوایە بیوتایە هەندێ لە دەرەبەگەکانی کورد نەك هەموو کورد) .

بەرامبەر بەو تەقەلایانەی تورك کە هەوڵیدابوو دەستە خۆێناویەکەی خۆی هەمووی بەسەر کوردا بسرێ، نوسەری بەویژدانی واش هەبوە هەندێ راستیشی باسکردوە، بۆنمونە دوکتۆر کمال مەزهەر باسی کتێبەکەی (کیلینگ) ی کردوە بەناوی ـ سەرەڕۆیی ـ مغامرات ـ لەتورکیاو روسیادا چاپی لندن ساڵی ١٩٢٤ کە وتویەتی بەچاوی خۆی لە ناوچەکانی کوردا دیویێتی چۆن کوردەکان داڵدەی ئەرمەنیەکانیان دابوو منداڵەکانیان رزگار کردبوون لەمەرگ، ئەوەی کە کوردو ئەرمەنی ناڕێك کرد بەهۆی تەقەلاکانی عبدالحميدەوە بوو کە سوارەی حمیدیەی بۆ ئەو نیازو مەبەستە دروستکردبوو. بەکورتی دەتوانین زیانەکانی سوارەی حمیدیە کە ژمارەیەك لە دەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد تیایا بەشداربوون لەم چەند خاڵەی خوارەوە داباس بکەین:

**یەکەم:** ئەو دەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەتانەی لەناو هێزی حمیدیەدا دەکران بەسەرکردەو ئەفسەرو فەرمانبەر هەروا بەخۆڕایی لەو هێزەدا قبوڵ

نەدەكران بەڵكوو هەریەكەیان لەبەر هۆیەك هەڵبژێررابوون و لەوە دڵنیا بون ئەوانە لەڕێبازی سوڵتان لانادەن و حكومەت هەر كارێكیان پێ بسپێرێ بێ سڵ كردنەوە بەجێی دەهێنن.

بۆنمونە: یەكێكی وەكوو ئیبراهیم پاشای میللی ماوەیەك ڕێگرو تاڵانیكەر بووە، ساتێك یاسای اصلاحاتی دستوری بەزۆر بەعبدالحمید مۆر كرا ئیبراهیم پاشا یەكێك بوو لەلایەنگرانی سوڵتان و دارو دەستەكەی چونكە بەپێی ئەو اصلاحاتە ئەبوایە دەسەڵاتی سوڵتان كەم بكرێتەوە كە زۆریەی ئەوانەی لە سوارەی حمیدیەدا بوون وەكو ئیبراهیم پاشای میللی دژی ئەو یاسایە وەستان و ئەو هەڵوێستەیان بە بزوتنەوەیەكی كۆنەپەرستانە لەقەڵەم دراو بەخۆڕایی لەبەریەك دوو كەسێكی وەكو ئیبراهیم پاشا ناوی كوردی پێزڕا.

**دوهەم** : زڕاندنی ناوی كورد بەهۆی سوارەی حمیدیەوە.

هەندێ سەرچاوە، بەتایبەتی ئەوانەی زانیاریەكانیان بریتی بووە لە سەرچاوە توركیەكان یا كاربەدەستانی تورك بۆئەوەی پاكانە بۆ حكومەتی توركی عوسمانی بكەن لەو كوشتارو تاوانانەی سوارەی حمیدیە كردبووی وەبۆ ئەوەی هەمووی بدەنە پاڵ كورد لەناو سوارەی حمیدیەدا، بۆئەو مەبەستە ژمارەی بوونی كورد لەناو ئەو هێزەدا زیادە ڕۆیی تیاداكراوە و لەكاتێكدا یەكێكی وەكو خاوەنی كتێبی سەرچاوە ١ كتێبەكەی (مروان المدور) بەناوی (الأرمن عبر التأریخ) هەردولایان ژمارەی كوردیان لە سوارەی حمیدیەدا بە (١٠) هەزار كەس داناوە لەكاتێكدا ژمارەی هەموو سوارەی حمیدیە هەروەكوو ڕۆبرت ئۆلسۆن باسی كردوە بریتی بووەلە (٥٣) هەزار سوار كەچی (٤٧) هەزاری لەو ژمارەیە بەكورد داناوە كە بێگومان سەرچاوەی بۆ ئەمە بریتی بووە لەوزانیاریانەی لەتوركەكانەوە وەری گرتووە، كە مەبەستی توركەكان لەمەدا ئەوەبووە هەموو تاوانەكانی سوارەی حمیدیە بخەنە ئەستۆی كورد، هەرچەند لەدواییدا ئەو ئەرمەنیە ئازادیخوازانەی ویستویانە دۆستایەتی لەگەڵ كوردا بەهێز بكەن و توركەكان ڕیسوا بكەن بەرامبەر بەوەی كە ئەوان لێپرسراوبوون بۆ ڕوودانی ئەو كارەساتە، لەدواییدا ئەمانە گەیشتونەتە ئەوەی تاوانی سەرەكی هی تورك بووە نەك هی كورد.

**سێهەم:** ئەو دەرەبەگو ئاغایانەی کورد کە هەڵدەبژێران بۆ ئەو هێزی سوارەیە لەو جۆرەبوون کە رەفتارەکانیان نەك بەرامبەر بەئەرمەنی بەڵکوو بەرامبەر بەجووتیارو دودەس بە ناڵەکانی کورد خراپتر بووەو زۆر دڕندانە رەفتاریان لەگەڵ کردون و رەش‌و رووتی کورد تووشی زیانێکی زۆر بووە کە لەزیانەکانی ئەرمەنی کەمتر نەبوە.

**چوارەم:** ئەو نەخشەیەی تورکەکانی عوسمانی لە پێکهێنانی سوارەی حمیدیەدا نەخشەیان بۆ کێشابوو شتێکی زۆر ئاشکرا بووەو بریتی بووە لەوەی کوردی سونی و کوردی علوی بکا بە گژ یەکتردا و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە تەنها هەر کوردە سونیەکان ماوەی ئەوەیان هەبوە لە هێزی حمیدیەدا بەشدار بن و بەهیچ شێوەیەك رێگە نەدراوە بەعلویەکان تیایا بەشدار بن و بەپێچەوانەوە کوردە سونیەکانیان هانداوە لەگەڵ کوردە عەلەویەکانا رەفتاری خراپ بکەن و ئەو قین و رق و دوویەرەکیەی لەو رووەوە پەیدا بووە زیانێکی ئێجگار زۆری گەیاندووە بەوشۆڕشانەی سەرکردەکانیان سوونی بوون و هیچ کوردێکی عەلەوی پڕ بەدڵ نەی ویستووە لەو شۆڕشانەدا بەشداری بکات بەڵکو بە پێچەوانەوە کاربەدەستانی عوسمانی سوودیان لەوە وەرگرتبوو توانیبویان هەندێ لەعەشایرەکانی سەر رێبازی علوی بەلای خۆیاندا رابکێشن و دژی کوردە سونیەکان بەکاریان بێنن وەکوو لە شۆڕشی شێخ سعیدی پیرانی ساڵی ١٩٢٥ دا دەرئەکەوێ کە لەبەرگی دوهەمدا باسی دەکەین.

بۆ نمونەی ئەو ناکۆکیەی لەنێوان سونی و علوی کوردا پەیدا بووە بەر لە شۆڕشەکەی شێخ سعید هەروەکوو رۆبەرت ئۆلسۆن باسێکی دوور درێژی بڵاوکردۆتەوە کە وتویەتی:

((ئەوی سونی نەبوایە لە سوارەی حمیدیەدا قبوڵ نەدەکرلو بەپێی کتێبەکەی (شریف فرات) کە خۆی ئاگاداری بارو دۆخی ئەو رۆژانە بووە، قبوڵ نەکردنی عەلەویەکان لەو هێزەدا بوبوو بەهۆی ئەوەی عەشیرەتی جبرانی کە سونی مەزهەب بووەو دەسەڵاتدار بوون لەناو ئەو هێزەدا لەگەڵ عەشیرەتی (هورمیك Hormek) کە علوی بون لەوپەڕی ناکۆکیدا بوون چونکە جبرانیەکان رێگەیان لە تاقمی عەشیرەتی هورمیك گرتبوو کە بچنە پێشەوە و لەدەزگاکانی حکومەتدا

کاروباریـان بدرێتـه دەس و هەمیشـه ئـەو هورمیکـه علویەیانـەن بەعلویـه ئێسـك گرانـەکان و بـەقزلْباش ناویـان دەبـردن و حکومـەت بـۆ بـەهێز کردنـــی نـــاکۆکی نێوانیان لەهەموو دەســدرێژیکردنەکانی جبرانیـەکان خـۆش دەبـوو کـه بەرامبـەر علویەکانی هورمیك بکرایه و ناکۆکی نێوانیـان لەسـاتی دەسـەڵاتدارێتی سـوارەی حمیدیـه گەیشـتبووە ئـەو ڕادەیـەی (زەینـل) ی کـوڕی (ئیـبراهیم تـالو) لـەدوای تێپـەڕبوونی دوازدە سـالْ بەسەرکوشـتنی باوکیـا لەلایـەن جبرانیەکانـەوە کـه ئیبراهیم تالوی باوکیان لەساڵی ١٨٩٤ دا کوشتبوو، وازیان لەکورەکەشی نەهێناو لەسـاڵی ١٩٠٦ دا ئەویشـیان کوشـت (سـەیر ئەوەیـه سـەرکردەی جبرانیـــەکان خالدبـەگ جـبران بـووە کـــه لەباســەکانی داهــاتودا لەبـەرگی دوهــەمدا باســی چالاکیەکانی دەکرێ) بەلاّم لەگەڵ ئەو هـەموو زیانـه گەورانـەی بـەکورد گەیشـت بەهۆی سوارەی حمیدیـەوە، ڕاسـتیەك هەیـه نابـێ پشـت گـوێ بخـرێ، ئـەمیش ئەوەیـه هـەروەکوو رۆبــرت ئۆلســۆن لەکتێبەکــەیدا ســەرچاوە ٨٤دا وتویــەتی سوارەی حمیدیه هەندێ چاکەشی هەبوە و دەربارەی ئەوە وتوویەتی:

((لەگەڵ ئەو هـەموو زیانانـەی بـەهۆی سـوارەی حمیدیـەوە بـەکورد گەیشـت ئـەبێ بوتـرێ رولْێکـی گەورەشـی بینیـوە بـۆ بزوتنـەوەی هەسـتی نەتەوایـــەتی، چونکه کورد لـــەهیچ شـێوەیەکی تـردا لـەتوانایدا نـەبوە ئـەو هـەموو چەکدارەی کوردی تیادا کۆببێتەوە و لەشەڕی بالْقاندا ئەو کوردانەی لەناو هێزەکـەی تورکدا بوون لـەناو سـوارەی حمیدیـەدا شـارەزاییەکی تـەواویان دەربـارەی شـەڕ پـەیدا کردبـوو کـه بـوو بـەهۆی هەسـتی نەتەوایـەتیان جـووڵاو ئـەوانیش بیریـان لــەوە کردەوە وەکو میللەتانی بالْقان ڕاپەڕن بۆ دەسگیربونی مافی خۆیان)) .

رۆبرت ئۆلسۆن لەباسەکەیدا ئەڵێ:

((لەگـەڵ ئەوەشـدا ژێن تـورك لەســاڵی ١٩١٥ دا ســوارەی حمیدیــەیان دژی ئەرمەنیەکان بەکار هێنـا، بـەلاّم سـوارەی حمیدیـه تاسـەر هـەمویان هـەر ئەڵقـه لـەگوێی سولْتان و تورکـەکان نـەبوون و کـه جـەورو سـتەمی تورکـەکانیان بـۆ دەرکەوت لەگەرمەی شەڕی جیهانیدا هەندێکیان چونه پاڵ روسەکان و ئەو هێزی حمیدیەش که (قرەبکر پاشا) ئامادەی کردبوو بیکا به گژ ئەرمەنیـەکانا و بـەگژ گەلەکانی ئەودیو قەفقاسدا، بەلاّم سەرکردەی ئەو هێزە که خالد جبران بوو ئەو

مەبەستەی تورکی پشت گوێ خست (دوورنیە هەرئەوەش بووبێ کە شریف فرات وەکوو روبرت ئولسون باسی کردوە خالد جبرانی بەپیاو کوژ و پیاو خراپ لەقەڵەم داوە کە بێگومان لەبەرئەوە بووە فەرمانی تورکەکانی بەجێ نەهێنابوو).

هەرچۆنیك بووبێ سوارەی حمیدیە ئەگەر ئەو چاکەیەشی هەبووبێ وەکو رۆبرت ئۆلسۆن باسی کردوە، بەڵام زیانەکانی ئێجگار زۆر بووە بۆ کورد و لە ناسکترین کاتی شۆڕشەکانی کوردا رەفتارەکانی ئەو هێزە بوەتە هۆی ئەوەی کوردە علویەکان بۆ تۆڵەی خۆیان لە شۆڕشی سەرکردە کوردە سونیەکان نزیك نەکەوتوونەتەوەو هەندێ جار بگرە دژیان بوون.

## بەشی سیازدەهەم

# هەڵوێستی حکومەتی عوسمانی بەرامبەر بەئەرمەنی و کوشتاری ئەرمەنی

دەوڵەتی عوسمانی لەسەرەتادا لەسەر بناغەیەکی ئاینی دروست بو بوو هەتا ئەوکاتەی أتحاد ترقی بوون بەدەسەلاتدار ئەو دروشمە شتێك بوو عوسمانیەکان کاسبی‌یان پێوە دەکردو بەڕواڵەت خەلیفەی عوسمانی پارێزەری میللەتانی ئیسلام بووەو بۆپەرەپێدانی ئاینی ئیسلام تێکۆشابوو لەجیهاندلو لەراستیدا لەژێرەوە فریان بەسەر ئاینی ئیسلامەوە نەبوەو لەشوێنی خۆیدا باسی ئەو سەرچاوانە ئەکەین کە ئەو راستیەی خەلیفەی عوسمانی‌و دارو دەستەکانایان خستۆتە ڕوو.

لە شانسی عوسمانیەکان هێزی دەسەلاتداری ئەو رۆژانە کە بریتی بوون لە صفویەکان و بێزەنتیەکان کە ئەمەی دواییان خۆی بەخاوەنی خاکی داگیرکراوی (ئەرزرۆم) دەزانی لە شەڕی چاڵدێراندا شکێنرابوو، بیزەنتیەکانیش لە کێشەیەکی گەورەدابوون لەگەڵ پاپای رۆمداو ناکۆکی نێوانیان گەیشتبووە رادەیەك بیزەنتیەکان ئەوەیان لاباشتر بووە لەژێر دەسەلاتی عوسمانیدابن ، نەك لەژێر سایەی پاپای رۆماداو مایەوە ئەو کریستیانانەی لەناوخاکی تورکیادا مابوونەوەو لەوانەی زۆرکاریی عوسمانیەکان نەیتوانیبوو ئەوانە بکا بەموسڵمان و هەر لەسەر ئاینی کریستیانی خۆیان مابوونەوە، بەتایبەتی ئەرمەنیەکان کە خۆیان بەمیللەتێکی ڕەسەنی مێژوویی دەزانی و بەرلەوەی تورك لەناوەڕاستی ئاسیاوە ڕوویکاتە ئاسیای بچووك و داگیری بکا ئەوان لە وڵاتی ئەرمەنیای خۆیان خاوەنی حکومەتی خۆیان بوون و لەڕاستیدا هەتا ئەو کاتەی وڵاتانی ئەورووپا دەستیان

نەخستبووە ناو کاروباری عوسمانیەوە و میسینێرەکانیان کە بەناو بۆ بەهێزکردنی ئاینی مەسیحی نێررابوون بۆ ناوچەکانی کریستیان نشینەکانی وەکو ئەرمەنی و نسطوری، هەتا ئەوکاتە ئەو کریستیانانە تووشی گێچەڵێکی ئەوتۆ نەبووبوون لەگەڵ (موسوڵمانەکانا بەکوردو بەتورکو عەرەبەوە).

بەڵام زۆری پێ نەچوو جەورو زۆرداریی تورکەکان بەرامبەر بە ئەرمەنیەکان تا دەهات پەرەی دەسەندو دەوڵەتە ئەوروپاییەکانیش رۆژ لەدوای رۆژ بەناوی پارێزگاریکردن لە کریستیانەکان زۆرتر دەستیان دەخستە کاروباری ناو وڵاتی عوسمانیەوە ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی تورکەکان بەچاوێکی دوژمنایەتیەوە بروانن ئەرمەنیەکان و بەنۆکەرو وابەستەی روسیان دادەنان و پاش ئەوەی ئینگلیزەکان هاتنە کایەوە ئەوەندەی تر تورکەکان دوژمنایەتییان بەرامبەر بەئەرمەنیەکان بەهێزبوو، زۆری پێ نەچوو وەکو لە باسێکی پێشوودا لەوە دواوین چۆن تورکەکان سوارەی حمیدیەیان دروست کرد لە ساڵی ١٨٩٥ دا چۆن ئەو کوشتارەیان لە ئەرمەنیەکان کرد کە لاپەرەکانی مێژوو بەلاپەرەیەکی رەشی ناو مێژووی دەوڵەتی عوسمانی ناودەبا کە پرە لە شەرمەزاری.

دەربارەی تەقەلاکانی تورکی عوسمانی بۆ دوژمنایەتی کردنی موسڵمانەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی دژی کریستیانەکان، بەتایبەتی دژی ئەرمەنی، گۆڤاری هلالی میصری کە لەلایەن نووسەری بەناوبانگ جرجی زیدانەوە لەقاهرە دەردەچوو، لەلاپەرە ١٥١ی مانگی دیسمبری ساڵی ١٩٠٨ (کە ساڵی مۆرکردنی أصلاحاتی دەستوری بوە) بەدوورو درێژ باسی خەباتی ئەرمەنیەکانیەکانی کردووە دژی دەوڵەتی عوسمانیو وتوویەتی:

((لەساڵی ١٨٩٠دا کۆمەڵێکی رزگاریخوازی ئەرمەنی پێك هات بۆ رزگارکردنی گەلی ئەرمەنی لەدەس جەورو ستەمی عوسمانی و لەدەس روس و ئێران (ئێرانی بەعەجەم ناوبردوە) و لەورۆژانەدا توانرا (١٣٠ هەزار فرنك) بۆ ئەو کۆمەڵە کۆ بکرێتەوە و ئیمرۆ (مەبەست ساڵی ١٩٠٨ بووە، رۆژی دەرچوونی گۆڤارەکە ) بوجەی ئەو کۆمەڵە بریتیە لە ملیۆنێك فرنك، لەوپارەیە لە ٣٠٪ بۆبزوتنەوەی چالاکیی شۆرشگێری و سیاسی و لە ٣٥٪ بۆ پڕ چەك کردن و لە ٢٠٪ یبۆ چاپەمەنی وبڵاوکردنەوەی هەواڵ و راگەیاندن تەرخانکراوە.

ساتێك ئەو تورکانەی خۆیــان بەئاشتیخواز دەزانــی (مەبەسـت أتحادو ترقـی بووە) بەم هەواڵەیان زانی زۆر تەنگەتاوبوون و بەنەهێنی لەگـەڵ گـەورە پیـاوانی ئەرمەنیدا کۆبۆنەوە و پێیان وتن: ناتوانرێ تەنها هەرهــوڵ بـدرێ بـۆ چاکردنی باری ناو ئەرمەنیەکان و باری ویلایەتەکانی تـر پشـت گـوێ بخـرێ، لەبـەر ئـەوە پێویستە داوای چـاکردنی بـاری هـەموو دەوڵـەتی عوسمـانی بکـرێ بـەتێکرایی و ڕاستە ئەرمەنیەکان توشی زیانێکی زۆر بوون بەلاّم موسـڵمانەکانی تورکیـاش لـە جـەورو سـتەمی کاربەدەسـتانی حکومـەت رزگاریـان نـەبوە بۆیـە هاوکـاریکردنی ئەرمەن لەگەڵ تورکدا گرنگ و پێویسـتە بـۆ سـەرگرتنی ئـەو أصلاحاتـەی ئـەبێ لــەولاّتدا بکــرێ و حکومــەتێکی رێــك و پێــك دروســت بکــرێو ئامانجــەکانی هەموولایەکی پێ بهێنرێتە دی.

گۆڤارەکە لەباسەکەیدا ئەڵێ:

ژۆن تورکەکان بەئەرمەنیەکانیان ووت: ساتی خـۆی کـە ئەرمەنیـەکان هاتنـە ژێر سایەی عوسمانیەوە، ئەوسا ژمارەتان لەچەند دەهەزارێك تێپەڕی نـەدەکرد، بـەلاّم وائیمـڕۆ ژمارەتـان چـەند ملیۆنێك دەبــێ کــە زۆربــەتان لــە پایتــەختدا (ئەستەمبوڵ) و شارەگەورەکانا هەموو دەوڵەمــەندن و بـەتێرو تەسـەلی دەژیـن و بازاڕو دەزگا ئابوریەکانی ناو ولاّتتان بەدەستەوەیەو گەلێك کاروفرمانی پلەو پایە بەرزی ناو ولاّتتان پێ سـپێرراوە، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە ئـەم ڕاسـتیە بگەیەننـە ڕێکخــراوە نەهێنیــەکانی ئەرمــەنی کــە لــە ئــەورووپادا زۆر بەســەرگەرمی و کەللەڕەقیەوە جمو جۆڵ ئەکەن.

لــەدوای کوشــتاری ئەرمەنیــەکان لــە ساســۆن، هــەروەکو گۆڤــاری هــلال باسیکردوە، ئەرمەنیەکان تاقمێکی چەکداریان پێکەوە نـاو پـەلاماری بانقـەکانی عوسمانیيان دا لەئەستەمبوڵ (ئەمە لەئەنجامی کوشتاری سـاڵی ١٨٩٥دابـوە) ، وەلەساڵی ١٨٩٦ دا چـەند بۆمبایـەکیان تـەقان بـۆ ئـەوەی سـەرنجی حکومـەتی عوسمــانی و ئەورووپاییــەکان بــەکێش بکرێــت و حکومــەت ناچـار بکـرێ ئــەو أصلاحاتی دەستووریەی بڕیاربوو کاری پێ بکرێ حکومەت وەستانی کە ئەبوایـە بەپێی ئەو أصلاحاتە هەموو دانیشتوان وەکو یەك سەیر بکرانایە.

دوای ئـەو بۆمبا تەقاندنانــە ئەرمەنیــەکانی چــەند لیژنەیــەکیان دروســکرد گرنگترینیان لیژنەی (سیروب) بـوو توانـی بۆمـاوەی شـەش سـاڵ لـە شـاخەکانی (ساسون) دژی حکومەت شۆڕش بکات.

ئەرمەنیەکانی ناو وڵاتی روسیش لە قەفقاس لەلایـەن (پرنـس غـالینزین) ەوە دەچەوسێنرانەوەو تاتازە موسڵمانەکانیان زاڵ کردبوو بەسەریاناو لـەوێش چـەند کوشـتارێکیان لیٚ کرا و زیـانێکی زۆری مـالی پـیٚ گەیشـتبوو لەئـەنجامی ئــەوەدا رێبــازی خۆیــان گــۆڕی و لــە (ژۆن تــورك) نزیــك بوونــەوەو لەشــاری (ڤینــا) کۆبونەوەیەکیان لەگەڵاکردن و لەو کۆبونەوەیـەدا ژمارەیـەك تـورك و ئەرمـەنی و مکدونـی وڕۆم و کـورد و عـەرەب و یـهودی و ئـەرنا ئوطـی کۆبونـەوەو هــەمویان لەسەر ئەوە رێك کەوتن بەهەموویان هــەوڵ بـدەن حکومـەتی سـوڵتان سـەرنگوم بکریٚ و حکومەتێکی دەستوری دابنرێت سودی بۆ هەموولایەك تیادا بیٚ.

دەربارەی ئەرمەنیەکان و بزوتنەوەکانیان سعید احمد برجـاوی لەکتێبەکـەیدا ســەرچاوە ٨٢ باســێکی دوورودرێــژی تــەرخانکردوە دەربــارەی کوشــتاری ئەرمەنیەکان و وتویەتی:

((کێشەی ئەرمەنیەکان یەکێك بوو لـەو کێشـانەی مێشـکی خەلیفـەی مـاندوو کردبوو نەیدەزانی چۆن چارەی بکاو لای وابوو کێشەی ئەرمەنیەکان گریٚ درابـوو بەسیاســەتی دەوڵەتــە ئەوروپاییەکانــەوە و لــەو ڕۆژانــەدا ڕاپــەڕین و بزوتنــەوەی میللەتــەکانی باڵقــان دژی عوسمــــانی کــــارێکی زۆری کردبــــووە سەرهەســتی نەتەوایەتی ئەرمەنی ئەویش وەکوو میللـەتانی ژێـرْ دەسـت کـەوتبووە خـۆی بـۆ داواکردنی جۆرە سەربەخۆییەك بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری خۆی.

لەگێژاوی بەسەرهات و ڕووداوەکانی ئەو رۆژانەدا چەکدارەکانی ئەرمەنی تاقم تـاقم کۆدەبونـەوەو ژمارەیـان لەپەرەسـەندندابوو، سـوڵتان بەتــەواوەتی لــەجم وجۆڵـی ئەرمەنیـەکان بـێزار بـوو چونکـە ئـەوەی بـەهاندانی روسـەکان ئــەزانیو بەئاشکرا میسنێرەکانی ئینگلیز لەناویانا دەستیانکردبوو بەچالاکی و هاندانیــان. میسنێرئەمریکاییەکانیش دەستیانکردبوو بەجموجۆڵ لەناو ئەرمەنیەکاندا و بـیرو بــاوەڕی دیموکراتیــان بڵاودەکــردەوەو ئەمانــە هــەموویان هــاندەربوون بـــۆ ئەرمەنیەکان خۆیان ئامادەبکەن بۆ شۆڕش.

لــەدوای کوشــتنی قیصــری روس (ئەلکســاندەری دوهـــەم) وهـــاتنی (ئەلکسەندەری سێهەم) سیاسەتی روسیا گۆڕراو قیصـری تـازە لایـەنگری هیچ بزوتنەوەیەك نەبوو لەناوچەکەدا بکرێ بۆیە ئەرمەنیـەکان هیـوای ئـەوەیان نـەما روسەکان یارمەتیان ئەدەن بۆیە بەناچاری ڕوویانکردە دەوڵەتـە ئەوروپاییـەکانی تر، بەتایبەتی ئینگلیزەکان کە بەگەرمی لایان لێ کردنەوەو هەندێ لـە (هنشـاقە) کـانی ئەرمـەنی چـەکیان ئامـادەکردبوو لـە ترســی ئــەو کــوردە دەرەبەگانــەی لەوانــەبوو بــەهاندانی تورکــەکان دەســدرێژی بکەنــە ســەریان و لـــە ناوچــە شاخاویەکانا لەئەنادۆڵی ڕۆژهەلاتا داوای چاکردنی بـاری ژیـانی ئەرمەنیـەکانیان لەحکومەت کردو سوڵتان عبدالحمیـد دەسبەجێ لەساڵی ١٨٩١ هـێزی سـوارەی لەکوردەکان پێکهێنا (مەبەست سوارەی حمیدیە) و لەنێوانی ئەرمەنیەکان و ئەو هێزەدا کوشتارێکی خوێناوی لەناوچەی (وان) ڕوویداو دەم و دەس قونسـوڵەکانی دەوڵەتە ئەوروپیەکان کەوتنە سەر ئـەوەی داوای چارەسـەرکردنی ئـەو کێشـەیە بکەن و لیژنەیەك پێك بێت لەبارو دۆخی ئەرمەنیەکان بکۆڵێتەوە بەلام رووسەکان ئەوەیان بەدڵ نەبوو دانانی ئەو لیژنەیان پەسەند نەکرد.

لەهاوینی ١٨٩٤ دا سەرکردەکانی حزبـی (هنشـاق) لـەچیاکانی (ساسـون) دا گیران و ئەرمەنیـەکان کەوتنـە خۆیـان بـەرەنگاری سـوارەی حمیدیـە بوونــەوەو دەریانکردن و سوڵتان عبدالحمید تۆڵەی ئەو ڕاپەڕینەی لەئەرمەنیەکان کـردەوەو دەسەلاتیکی فراوانی دا بــە والیـەکان ئـەو ڕاپەڕینـە دامرکێننـەوە و لەئـەنجامیدا کوشـتارێکی زۆر لـە ئەرمەنیـەکان کـرا، ژمارەیـان لـە شـوێنە جـۆر بــەجۆرەکانا گەیشتبووە سێهەزار.

لەمانگی ئەیلولی ١٨٩٥ دا ئەرمەنیەکان لەشاری ئەستەمبوڵدا خۆپیشاندانێکی گـەورەیان کـرد لەبـەردەمی باڵیۆزخانـەکانی دەوڵەتـە بێگانـەکاناو هـێزی تــورك پەلاماریدان و ژمارەیەکیان لێ کوژراو کێشــە هـەتا مـانگی ئـابی ١٨٩٦ درێـژەی کێشا.

نوسەری ئەم سەرچاوەیە، ئەمیش وەکوو باسـەکەی گۆڤـاری هـلالی بەرلەمـە باسی ئەوەی کردوە چۆن ئەرمەنیەکان پــەلاماری دلێرانـەو شـێتانەیان کردبـووە سەر بانقەکان بەخۆیان و بۆمباکانی دەستیانەوەو لەئەنجامدا بێگانەکان کەوتنـە

بەینەوەو بەڵێنیان دا بە ئەرمەنیەکان ژیانیان دەپارێزرێ و بەڵێنیان پێدان دەربازیان دەکەن بەمەرجێك بەبێ گێچەڵ بچنە دەرەوەو بانقەکان کە دەستیان بەسەراگرتبوو بەجێیان بێڵن. ئەرمەنیەکان بەناچاری ئەوەیان قبوڵ کردو لەژێر چاودێری و پاراستنێکی بەهێزدا نێرران بۆ پاپۆڕی مدیری بانقەکەی ئینگلیزەکان کە ناوی (سێر ئەدگارد فنسان) بوو بەوجۆرە گوێزرانەوە بۆ پەنایەکی نەهێنی. بەڵام کێشەکە بەوە کۆتایی پێ نەهات چونکە دوای ئەوە تاقمێکی ئاژاوەچیی سەریەحکومەت لە ئەستەمبوڵدا کۆبونەوەو بەوپەڕی ڕق و قینەوە بەربوونە گیانی ئەرمەنیەکان و ژمارەیەکیان لیٚ کوشتن و تالآنیانکردن و لەماوەی سێ ڕۆژدا حەوت هەزار ئەرمەنی کوژران و بەرامبەر بەوە ئەو دەوڵەتە ئەوروپاییانەی پەیمانی (برلین) یان مۆرکردبوو هەڕەشەیان لەسولتان کرد ئەگەر چارەسەری ئەو کێشەیە نەکا ئەوا چارەنووسی خۆشی (هی خلیفە) دەکەوێتە مەترسیەوەو سوڵتان ناچاربوو لە ٢٨ ٨ ١٨٩٦ دا فەرمانێکی دەرکرد بۆ کاربەدەستانی حکومەت دەم و دەس دەست بەسەر هەڵوێستا بگرن و ڕێگەی ئاژاوەی تر نەدرێ. نووسەری هەمان سەرچاوە باسی ڕووداوێکی تری کردوە لەساڵی ١٩٠٥ دا لاوێکی ئەرمەنی (ئەدوار جوریە) لە ٢١ تەموزی ١٩٠٥ دا بۆمبایەکی فڕێدایە ناو مەوکیبی سوڵتانەوە کە لەگەڵ خەڵکدا دەچوو بۆ نوێژی جومعە لەمزگەوتی (حمیدیە) و بەو بۆمبایە (٨٠) سەربازی تورك کوژرا بەڵام سوڵتان خۆی لەدواوە بوو هێشتا سواری کە ژاوەکەی نەبو بوو بۆیە هیچی لیٚ نەهات و لەکاتی دادگاکردنی ئەولاوە ئەرمەنیەدا بێ ترس و لەڕزو بەشانازیەوە دانی بەکردەوەکەی خۆیدا نابوو.

ئەوەی شایانی باسە پەیمانی برلین کە لەساڵی ١٨٧٧دا مۆرکرابوو بڕیاری دابوو مافی نەتەوایەتی ئەرمەنی چارەسەر بکرێ بەڵام ئەو پەیمانە تەنها نوسینی سەر کاغەزبوو. تائێرە باسی ئەو کوشتارەیە کە لەئەرمەنیەکان تاشەڕی یەکەمی جیهانی لەلایەن حکومەتی عوسمانیەوە کرابوو لەبەرگی دوەمدا، لەشوێنی خۆیدا باسێکی تایبەتی تەرخان دەکەین بۆ ئەو کوشتارانەی لەلایەن حکومەتی کمالیەوە بەرامبەر ئەرمەنیەکان کرابوو لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی.

# بەشی چواردەهەم

## هەڵوێستی دەوڵەتان و میللەتان بەرامبەر بەکورد تا شەڕی یەکەم

لەبەشی یەکەمی ئەم بەرگەدا باسێکی تایبەتی تەرخان کرابوو بۆ خزمەتی ئیسلام و دەوڵەتی عوسمانی لەلایەن میللەتی کوردەوەو، لەو باسەدا لەوە دواین چۆن کورد هەموو توانای وزەی خۆی بۆ پاراستنی ئیسلام و دەوڵەتی عوسمانی بەناو پارێزەری ئاینی ئیسلام تەرخانکردبوو لەئەنجامی ئەوەدا شان بەشانی تورکی عوسمانی و میللەتانیتری ئیسلام دژی خاچپەرستەکان شەڕی کردبوو. بە هەزارانیان گیانی خۆیان فیداکردبوو بۆ پاراستنی شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلام و نمونەی ئەوە لە صلاح الدین و بنەماڵەی ئەیوبییەکانا بەڕوونی رەنگی دابوەوەو ئەو هەڵوێستەی کورد بوو بەهۆی ئەوەی هەر لەسەرەتاوە هەتا دوایی گەلێك دوژمنی بۆ خۆی پەیدا کردو دەوڵەتە رۆژئاواییەکان، بەتایبەتی روس و ئینگلیز تاماوەیەك کوردیان بەکوتەکی دەستی عوسمانی ژماردبوو، نمونەی ئەوەیان لە سوارەی حمیدیەدا بەدی کردبوو، لەئەنجاما ئەو هەموو رەنجەی کورد بەفیڕۆ چوو، نە ئەوساو نە ئێستە هیچ لایەك ئەو فیداکاریانەیان بۆ کورد حساب نەکردوەو نایکەن.

بۆ ئەوەی هەڵوێست و پێوەندی کورد بەدەوڵەتان و میللەتانەوە باس بکەین ئەم باسە دەکەین بەم بەشانەوە.

**١ـ پێوەندی کوردو دەوڵەتی عوسمانی و تورکی عوسمانی.**

**٢ـ پێوەندی کورد لەگەڵ ئەرمەنیو ئاسوریدا.**

**٣ـ هەڵوێستی روسیای قیصری بەرامبەر بەکورد.**

**٤ـ هەڵوێستی حکومەتی بریتانیا بەرامبەر بەکورد.**

**یەکەم: پێوەندی کوردو دەوڵەتی عوسمانی و تورکی عوسمانی**

دەتوانرێ پێوەندی کورد بەدەوڵەتی عوسمانی و بەتورکی عوسمانیەوە بکرێ بەدوو قۆناغەوە:

قۆناغی یەکەم: لەو رۆژەوە کەئەمارەتەکانی کورد لەرێگەی ئیدریسی بدلیسەوە خرانە ژێر سایەی دەوڵەتی عوسمانیەوە هەتا کاتی مۆرکردنی اصلاحاتی دەستوری لەساڵی ١٩٠٨ کە دەسەڵاتی خلیفەی تیادا هاتە کزی، ئەگەر چی بەرلەوە لە سەرەتای ساڵی ١٨٣٩ و بەدواوە کە سوڵتان عبدالحمید ناچار کرا فەرمانی (خط شریف گولخانە) مۆر بکا، دەسەڵاتی خلیفە هاتبووە کزی.

قۆناغی دوهەم: لەدەسپێکردنی دەرچوونی اصلاحاتی دەستوریەوە کە تاقمی اتحادو ترقی بوون بەدەسەڵاتدارێتی سەرەکی لە وڵاتی عوسمانیدا هەتا کاتی هەڵوەشانەوەی خەلافەتی عوسمانی کە لە بەرگی دوهەمدا بەدوورو درێژ باسی چۆنیەتی ئەو هەڵوەشانەوەیە دەکەین.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە، ئەگەر چی کورد لە قۆناغی یەکەمی پێوەندیدا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی تووشی زیانێکی زۆری ماڵی وگیانی بووە هەروەکوو لە باسەکانی پێشوودا باس کراوە، بەڵام لە قۆناغی دواییدا کە ئەوەی پێوەندی بەدەوڵەتی عوسمانیەوە بێ، لەم بەرگەدا هەڵوێستی حکومەتی عوسمانی بەرامبەر بەکورد هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی باس دەکەین و لە شەڕی جیهانیەوە هەتا کاتی هەڵوەشانەوەی خلافەتی عوسمانی لە بەرگی دوهەمدا باس دەکەین.

**دوهەم: پێوەندی کوردو ئەرمەنی و ئاسوری**

میللەتی ئەرمەنی وەکوو میللەتێکی دراوسێی کورد کە زۆر سەرچاوە بەخزمی یەکتریان داناون، هەرلە کۆنەوە رۆڵێکی مێژوویی گرنگیان بینیوە لەناوچەکەداو بە یەکێك لە میللەتە رەسەنەکانی ئاری ژمێرراون و لەژێر زەمانەوە لەناو خاکی خۆیانا هەمیشە هێرشیان براوەتە سەرو وڵاتەکەیان کاولکراوە، کە باسی ئەمە لە باسی چۆنیەتی هاتنی تورکەکان لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بۆ

ڕۆژئاوای ئاسـیادا کـراوەو دەوڵـەت و میللەتـەکانی دراوسـێی ئەرمـەنی هەریەکـە بـەجۆرێك زیانیـان پێگــەیاندوەو لەلایەکــەوە تورکــی عوسمــانی بەداردەسـتی ڕوسەکانیان داناون بەتاوانی ئەوە لێیان داون لەکاتێکدا وەکو لەباسی کوشـتاری ئەرمەنیـەکاندا روون بۆتـەوە قیصـری روس خـۆی یــەکێك بـووە لەوانــەی دژی ئەرمەنی بووەو تاتارەکانی ناو خاکی روسیای هانداوە پەلاماری ئەرمەنی بدەن و ئینگلیزەکانیش بۆ ماوەیەك ئەرمەنیەکانیان بەداردەستی روسەکان دانابوو، بۆیە لەگـەڵ ئەوەشـدا لەسـەرەتادا میسـنێرەکانی ئینگـلیز بـەناو بـۆ پارێزگـاری لــە کریسـتیانەکان لـە ناوچەکـەدا لـەچالاکیدا بــوون، بـەلام هەمیشـە دژی هــەموو بزوتنەوەیەکی ئەرمەنی بوون نەوەکو بزوتنەوەکەیان ببێتە هۆی نانەوەی ئـاژاوە لـەناو وولاتــی عوسمـانیدا کـە ئینگلیزەکـان هەمیشـە مەبەسـتیان نـەبوە ولاتــی عوسمانی یەکگرتوو بەهێز بێت بۆ ئەوەی رووبەرووی روســەکان خـۆی رابگـرێ و لەولاشەوە تورکی عوسمانی بەئاشکرا دژی هەموو مافێکی نەتەوایـەتی ئەرمـەنی بوون و بەوە تاوانباریان کردبوون بوبوون بەداردەستی روسیا و ئینگلیز و ولاتـە کریستیانەکانی تری ئەورووپاو میللـەتی کوردیش لـەم نـاوەدا کـە ئـەویش وەکـو ئەرمـەنی و ئاسـوریەکان چەوسـێنراویووەو لـەمافی نەتەوایـەتی بـێ بـەش بـووە هەوڵێکی زۆری داوە لەگەڵ ئەرمـەنی و ئاسـوریدا بەشـێوەیەکی دۆسـتانە بـژی و تەقـەلای ئـەوەی داوە هاوکـاری لەگـەڵ هـەردولایانا بکـا بـۆ ئـەوەی هــەموویان پێکەوە دژی جەورو ستەمی کاربەدەسـتانی عوسمـانی بوەسـتن و بەرامبـەر بـەو تەقەلایانەی کورد کە لـە تەقـەلاکانی بدرخـان پاشـا و شـێخ عبیداللـەی نـەهریدا بەئاشکرا دەسـتی پێکردبـوو بـەلام لـە تەقـەلاکانیا سـەرکەوتوو نـەبوون بـەهۆی هەڵوێسـتی روس و ئینگلیزەکانـەوەو بـەهۆی میسـنێرو دبلۆماسیەکانیانەوە کـە هـانی ئەرمەنیـەکانیان دابـوو خۆیـان لـە جموجـۆڵ و بزوتنـەوەکانی کـورد نزیـك نەکەنەوەو نەبن بە هاوکـاری کـورد دژی عوسمـانی و لـەکاتی تـەنگ و چەڵەمـەو لێقەومان و ئەو دەسدرێژیانەی جارەها کرابووە سەریان خۆشـیان بەدەنگیانـەوە نەچوون و دەستیان بڕیبوون، بەئاشکرا ئـەو سـوارەی حمیدیـەی کـە لەباسـێکی تایبەتیدا لە تاوانەکانی دواین کوشتارێکی زۆریان لەئەرمەنی کردبـوو بـێ ئـەوەی ئـەو دەوڵەتانـە شـتێکی ئـەوتۆیان بـۆ بکـەن سـوودی تیابــێ و بەهاوکاریانــەوە

نەچوون هەمووی هاتبووە سەر ئەو بڕیارەی لەپەیمانی (برلین) دا دەربارەی مافی ئەرمەنیەکان دەسنیشان کرابوو کە دەبوایە دەوڵەتی عوسمانی ڕێزی لەمافی ئەرمەنی بگرێت و ئەو پەیمانە لەجیاتی ئەوەی ببێت بەهەنگاوێکی سوود بەخش بۆ ئەرمەنی کەچی عوسمانیەکان کردیان بەبیانوو و بەڵگەیەکی هەمیشەیی و کوردیان بەوە دەترسان کە سەرگرتنی ئەو پەیمانەی برلین گەورەترین کارەسات دەبێ بۆ میللەتی کورد و ئەوەی ڕاستی بێ لەمۆر کردنی پەیمانی سیڤەریشدا کە لەبەرگی دوهەمدا باسی دەکەین تورکەکمالیەکان ئەوەی لە پەیمانی سیڤەردا دەربارەی مافی ئەرمەنی دەسنیشان کرابوو کردیان بەبیانوو کوردیان پێ ترسان و کورد لەئەنجامیا بوو بە دوو بەشەوە و بەشێکی ڕۆشنبیران و سیاسەتمەداری شارەزا کە ویستیان کورد لەگەڵ ئەرمەنیدا دۆستانە بژی و دژی ئەوە نەبوە ئەرمەنیش مافی خۆی دەسگیر بێت کە لە تەقەلاکانی شریف پاشای خەندانی نوێنەری کورد لە پەیمانی سیڤەرو (نوبار پاشا) ی نوێنەری ئەرمەنیدا بەئاشکرا هەردوکیان بۆ سەرگرتنی لەچالاکیدا بوون دەردەکەوێ. تەقەلای ناحەزانی کورد و ئەرمەنی جگە لە سەر نەگرتنی تەقەلاکانی بدرخان و شێخ عبید الله، دوای ئەوەش هەرجارەی لایەك تەگەرەی خستبووە بەر کوردو ئەرمەنی لەنزیك بوونەوەیان لەیەکتری و ڕۆژنامەکانی ئەرمەنی لەکاتی خۆیدا بارەها لەسەر ئەوە نوسیویانە و میللەتی کوردو ئەرمەنی‌یان وریاکردوەتەوە کە بەقسەی دوژمنانی هەردولایان نەکەن بۆ نمونە دوکتور جلیلی جلیل لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٥٥ باسی گۆڤاری (دروشاك) ی کردوە کە لەژمارە ١ ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٠ بەدورو درێژ باسی تەقەلاکانی حکومەتی تورکی کردوە بۆ تێکدانی پێوەندی نێوان کوردو ئەرمەنی و بەرامبەر بەوەش کوردو ئەرمەنی دڵسۆز بۆ یەکتر هەبوە کە هەوڵیان داوە تەقەلاکانی تورکەکان پووچەڵ بکەنەوە و جلیلی بۆ نمونە باسی ژمارە ٤ی گۆڤاری (دروشاك) ی ئەرمەنی کردوە لەساڵی ١٩٠١دا باسی ئەوەی کردوە چۆن عبدالرحمن بدرخان لەو ڕۆژانەدا چالاك بوەو (٥٠٠) دانە لە ڕۆژنامەکەی کە ڕۆژنامەی (کوردستان) بووە بەکوردی و تورکی دەرچوەو ئەرمەنیەکان ئەو (٥٠٠) دانەیەی ڕۆژنامەی کوردستانیان لەڕێگای ئەرمەنیانەوە ناردوە بۆ

کوردەکان و گۆڤاری دروشاك دەربارەی ئەوە وتوویەتی: ((نزیکی ٥٠٠دانە لەو ڕۆژنامەیەی کە بەرلەچوار مانگ دانەیەکی نێررابوو بۆمان، لای ئێمە ئەم ڕۆژنامەیە وەکو لقی درەختێکی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد وایە کە دەمانەوێ لەڕۆژنامەکەمانا بلاوی بکەینەوەو هەموو ژمارەکانمان نارد بۆئەوەی لەناو کوردەکانا بلاو بکرێتەوە)) .

جلیلی لە پەراوێزی لاپەڕە ٨٦ ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٥٥ وتویەتی: کاتی خۆی دەقی‌ئەو بلاوکراوەیە بەزمانی فرەنسی لە گۆڤاری (Pre Armenie) ژمارە ١٠-١٢ی سالی ١٩٩٢دا بلاوی کردۆتەوەو لەوەدا داوای ئەوە کراوە پێویستە باری ژیانی کورد چاك بکرێ و ئەبێ ڕۆشنبیرانی کوردهەستی نەتەوایەتی خۆیان بەهێز بکەن و باسی چەوسانەوەی کورد بکەن لەگەڵ چۆنێتی خۆرزگار کردن لە جەورو ستەمی تورك.

جلیلی ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (نوردار) ی ئەرمەنی ژمارە ٢٨ی ڕۆژی ١٦ ١ ١٩٠٠ کردوە کە لەوەدا دەقی ناوەڕۆکی ڕۆژنامەیەکی لەندنی (Mation) ی بلاوکردۆتەوە کە وتوویەتی عوسمان بەگ یەکێکە لەئەمیرەکانی کورد لەترسی تورکەکان ولاتەکەی خۆی بەجێ هێشتوەو یەکێکە لەوانەی سالەهایە بۆ ئەوە تێکۆشاوە کورد و ئەرمەنی هێزەکانیان یەك بخەن بۆ ئەوەی پێکەوە دژی عوسمانی‌یەکان خەبات بکەن.

جلیلی بێجگە لەوە لەلاپەڕە ٩٠ی سەرچاوە ٥٥دا باسی ناوەڕۆکی ڕۆژنامەی (مشاك) ی کردوە کە وتوویەتی:

((باسی هاوکاریکردنی کوردو ئەرمەنی کە دوو گەلی دراوسێی یەکن شتێکی تازە نی‌یەو (نیرسیس فارجانیان) و (مارتین خریمانیان) و چەند ئەرمەنیەکی تر بەپێویستی دەزانن لەکوردستانا بایەخ بدرێ بەخوێندەواری و خریمانیان داوای لە حکومەت کردبوو پێویستە لەناو گوندەکانی کوردا قوتابخانە بکرێتەوەو (رینوغالیات) کە ئەرمەنیەکی ڕۆشنبیرە داوای ئەوەی کردبوو پێویستە مندالانی کورد شان بەشانی مندالانی ئەرمەنی قوتابخانەیان بۆ بکرێتەوە.

جلیلی لەلاپەڕە ٩١ی هەمان سەرچاوەدا باسی یاداشتەکانی (روبین) ی کردوە بەناوی (یاداشتەکانی شۆڕشگێڕێك) چاپی لوس ئەنجلس، سالی ١٩٥١،

جلدی ١٣ کە لەوەدا باسی چاپکراوێکی (ئاگوب شاهبازیان) ی کردوە کە بەدورودرێژ لە تەقەلاکانی (گرەبێت تاتانیان) دواوە دەربارەی هەوڵدان بۆ پێك هێنانی ڕێکخراوێکی کوردو ئەرمەنی و تورك بۆ چارەسەرکردنی باری وڵاتی عوسمانی بەشێوەیەکی گشتی.

هەروەها لەورۆژانەدا بانگەوازێك بڵاوکرابوەوە لەلایەن چەند کوردێکی ناسراوەوە دژی ئەوانەی ئاگری دووبەرەکی‌یان لەنێوان کوردو ئەرمەنیدا خۆشکردبوو یەکێك لەوانەی ئەو بانگەوازەیان مۆرکردبوو عبدالرحمن بدرخان بوەو هێرشی بردبوە سەر ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی کورد جڵەوی خۆیان دابوە دەس سوڵتان و داوا لەکوردو ئەرمەنی کرابوو پێکەوە خەبات بکەن.

هەروەکو (لینتش) باسیکردوە، لەئەنجامی هەوڵ و تێکۆشانی (مهران دامدیان) کە ئەندامێکی ناسراوی حزبی طاشناق بووە کوردەکان پێکەوە بێزاریی خۆیان دەربڕیبوو دژی ئەو باج و سەرانە زۆرانەی پشتی میللەتی کوردیان شکاندبوو، کوردەکانی هاوسنور لەگەڵ ئەرمەنیدا هاوکاریان کردبوو لەگەڵ ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکانی ئەرمەنیەکاناو عەشیرەتەکانی کورد دلخوازیەکانی تورکیان قبوڵ نەکردبوو بچن بەگژ ئەرمەنیەکاندا.

جلیلی لەو روەوە ئاماژەی بۆ راپۆرتێکی (تیللر) ی قونسوڵی ئینگلیز کردوە لە ئەرزرۆم کە باسی پێوەندی کوردو ئەرمەنی کردوەو وتویەتی: لەم مانگانەی دواییدا شتێکی زۆر سەیر روویدا دەربارەی یارمەتیدانی ئەرمەنیەکان لەلایەن کوردەوە کەئەو یارمەتیدانەی کورد بوو بەهۆی ئەوەی حکومەت ئەو هێرشەی بەتەمابوو لەم هاوینەدا بیکاتە سەر ئەرمەنیەکان لە (ساسۆن) دوای خست و کوردەکان لەناکاو بڕیاریاندا نەچنە ناو هێزەکانی حکومەتەوە دژی ئەرمەنیەکان و هاوڕێ فرنسیەکەم پێی ڕاگەیاندم گفت و گۆی نێوان کوردو ئەرمەنی بەوە گەیشت کوردەکان بێلایەن بن و ئەگەر حکومەت هێرشی بردە سەر ئەرمەنیەکان کورد ئامادە دەبێ بەرگرییەکی چەکدارانە بکا لە ئەرمەنی.

جلیلی لەلاپەرە ٩٢دا ئاماژەی بۆ بەڵگە نەهێنیەکانی حکومەتی بریتانیای ساڵی ١٩٠٣ کردوە کە لەوانەدا باسی یارمەتیدانی بۆ ئەرمەنی تیادا کراوە لەلایەن کوردەکانی (سێرت ـ سعرت) ـەوە، قونسوڵی گشتی بریتانیا لە تەورێز

لـه راپۆرتێکـی رۆژی ۲۸ ۱۲ ۱۹۰۳ باسـی ئـەوەی کـردوە ئەرمەنیـەکان بـەهۆی کوردەکانەوە چەکیان لەئێرانەوە بۆ هاتووە.

هەروەها جلیلی ئاماژەی بۆ کتێبەکـەی (مارانتیـان) ی مێژوونـاسـی ئەرمـەنی کردوە کە لەجلدی یەکەمی ئەو کتێبەیدا چاپی پاریس باسی ئەوەی کردوە چۆن تورکەکان (رووبین) ی ئەرمەنییان هەڵواسـی بـەتاوانی ئـەوەی لـەناو کوردەکـانی دەرسیمدا چالاکی نواندبوو تورکەکان تۆپ بارانی گوندەکـانی (قاسم بـەگ) یـان کردبـوو بـەتاوانی ئـەوەی یارمـەتی ئەرمەنیـە شۆڕشگێڕەکانی دابـوو سـەرۆکی عەشیرەتی (دومبلی) کە (زیناك بەگ) بوو لەو کوردانەبوو ئیمـانێکی تـەواوی بـە پێویستی هاوکاریکردنی نێوان کورد ئەرمـەنی هـەبوو، بەرامبـەر بـەوە حکومـەت راوی‌ناو ناچارکرا لەچیاکانی دەرسیمدا خۆی بشارێتەوەو لەدواییدا لەساڵی ۱۹۰۸ اتحادیەکان لەناویان برد.

دوکتۆر جلیلی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ۲۵ باسی گـەلێك رووداوو بەسـەرهاتی تری کردوە دەربارەی پێوەندی و هاوکاریکردن لەنێوان کوردو ئەرمەنیدا.

لـەکۆتایی ئـەم باسـەی پێوەنـدی کـوردو ئەرمـەنیدا باسـی وتـارێکی (گردلێڤسکی) ئەخەینـە پێش چاو کـە دوکتـۆر کمـال مەزهـەر لەلاپـەڕە ۲۳٦ی سەرچاوە ۳٤دا لێی دواوەو کە ئـەو وتـارەی گردلێڤسـکی لەسـاڵی ۱۹۱۲دا لـەناو کۆڕێکی زانستیدا خۆی خوێندویەتیەوەو لەوەدا باسی ئەوەی کردوە (علی شان) ی کوری مەحمود پاشای سەرکردەی هـۆزی (قۆجگیری) باسـی محمـود پاشـای کردوە کە باوکی یەکێك بوە لـەو سەرۆکە کوردانـەی هەرچیـەکی بووتایـە لـەلای کوردەکـان دەبـوو بەیاسـاو دەبوایـە بـەجێ بهێنرایـەو لـەو باسـەی علـی شـاندا وتویـەتی لەسـاڵی ۱۸۹۵دا کـە کوشـتاری ئەرمەنیـەکان لەلایـەن حکومـەتی عوسمانیەوە کرا محمود پاشـا رێگـەی بـەپیاوەکانی ژێـر دەسـەڵاتی خـۆی نـەدا بەشداری بکەن چونکە هەمیشە بەوپەڕی رێزەوە دەیڕوانیە ئەرمەنیەکان.

تائێرە باسی، پێوەنـدی کـوردو ئەرمـەنی بـوو، دەربـارەی پێوەنـدی کـوردو ئاسوریش بەرلەوە لەزۆر شـوێندا باسـی ئـەوە کـراوە کـە چـۆن کـوردو ئاسـوری دۆستایەتی‌یان باش بووە هەتا ئەو کاتەی میسـنێرەکان دەسـتیانکرد بـەهاندانی ئەرمەنیەکان بۆ ئەوەی لە کورد نزیـك نەبنـەوەو وایـان خسـتبووە مێشکیانەوە

بەهێزبوونی کورد لە قازانجی ئەواندا نیە بەڵکو بەپێچەوانەوە زیانیان پێ دەگەیەنێت کە سەرەتای ئەو تێکچونە لە شۆڕشەکەی بدرخان پاشادا ڕەنگی دایەوە کە دەوڵەتەکانی ئەوروپا هانی ئاسوریەکانیان دابوو لەگەڵ بدرخاندا هاوکاری نەکەن و باجی ساڵانە نەدەن بە دەزگای بەڕێوەبردنی کاروباری ئەمارەتەکەی بدرخان و جلیلی باسی نامەیەکی (بیرگنیس) ی کردوە کە لەساڵی ١٨٣٦دا ناردبووی بۆ مارشمعون و لەو نامەیەدا بۆی نووسیبوو: ((ئەو هەموو سزاو ئەشکەنجەیەی خۆت و گەلەکەت لەم ماوە دوورودرێژەدا بەهۆی جەوروستەمی ئیسلامەکانەوە چێشتویانە کارێکی وای کردوە برا کریستیانەکانی ئەمریکا بایەخ بدەن بەژیانی ئێوە)) .

جلیلی لەباسەکەیدا ئەڵێ مەبەست لەونامەیەی بیرگنیس خۆشکردنی ئاگری دووبەرەکی کوردە دراوسێکانی ئاسوری بوە لەگەڵ ئاسوریەکاناو بەر لەمە لەباسی شۆڕشەکەی بدرخان پاشاداو لە تەقەلاسەرنەگرتوەکانی بدرخان لەگەڵ ئاسوریەکان بۆ بەهێز کردنی دۆستایەتی لەگەڵ ئاسوریەکانا باسی میسنێرەکانمان کرد کە چۆن هەریەکەیان ڕاسپاردەی یەکێك لە ولاتەکانی ئەوروپا بوون و ئەوانە ڕۆڵێکی زۆر خراپیان بینیوو لە بەهێزکردنی ناکۆکی نێوان کوردو ئاسوریدا، لەبەر ئەوە پێویست ناکا باسی تەقەلاکانی ئەو میسنێرانەو ئەنجامەکانیان لێرەدا دوبارە بکەینەوە.

**سێهەم: سیاسەتی حکومەتی بریتانیا و هەڵوێستی بەرامبەر کوردی باکوری کوردستان**

لە باسی بدرخان و شێخ عبیداللەدا، لە شۆڕشەکانی هەردوکیانا هەڵوێستی حکومەتی بریتانیا بەتەواوەتی روون بووەتەوەو دوای ئەوانیش هەمیشە میسنێرەکانی ئینگلیز لەلایەن حکومەتی بریتانیاوە ڕاسپێرراببوون مێشکی کریستیانەکان بەوەپڕ بکەن نابێ هیچ جۆرێك هاوکاری لەگەڵ کوردا بکەن و ترسی ئینگلیز لەکورد لەبەر ئەوەبووە لایان وابووە ئەگەر تواناو دەسەڵاتیان هەبێ دەبن بە لایەنگری روسی دراوسێی کوردستان کە روسیا هەمیشە لەگەڵ حکومەتی عوسمانیدا ناڕێك بووەو لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بەوە تاوانبار کرابوو

چاوی بڕیبوه ناو خاکی وڵاتی عوسمانی و بۆ ئەو مەبەستە کــورد و ئەرمــەنی بــە داردەستی ئەو دەزانێ کەلەراستیدا وەکو رووداوە راستیەکان ئاشــکرایان کــردوە نــە کوردو نــە ئەرمــەنیو نــە ئاســوریش بــەهیچ جۆریــك ســوودێکی ســوپایی و سیاسییان لەروس دەسگیر نــەبوە. بــەو جــۆرە ئینگلیزەکــان هەمیشــە بــەچاوی گومانــەوە ســەیری بزوتنــەوەکانی کوردیــان کــردوەو یــەکێکی وەك مێجــر نۆیــل لەبەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا بەدورو درێژ باسی گەشتەکەی ئەکەین لــە هــەندێ ناوچەی کوردستانا، بەڕواڵەت خۆی وای پیشاندابوو لەو گەشتەیدا بەمەبەستێکی پاك و بۆ سوودی کورد ئەو گەشتەی کردبوو لەگەڵ دوو کورەزای بدرخان پاشــاو کوردێکی دیار بەکری ناسراو لەبنەماڵــەی جمیــل پاشــا گــەڕابوو، یــەکێکی وەکــو مامۆستا رەفیق حلمی لەســەرەتای یاداشــتەکانیا لەبەشــی دوهــەمیا لای وابــووە حکومەتی بریتانیا بۆ ئەوەی ناردبوو بۆ باکوری کوردستان بۆ ئــەوەی نەخشــەی پێکهێنانی حکومــەتێکی کــوردی لــە بــاکوری کوردســتانا ئامــادە بکــا، بــەڵام دەرکەوت ڕاستیەکەی مەبەســتەکە بــەو شــێوەیە نــەبوە تەنــها بــۆ کۆکردنــەوەی زانیاری بووە دەربارەی کوردی باکوری کوردستان و شارەزا بوون لە دەســەڵاتی گــەورە پیــاوان و ســەرۆك عەشــیرەتەکانی کــوردو لــەوەش زیــاتر بــۆ ئــەوەی کــە کوردەکــان بــە شــتی لاوەکیــەوە خــەریك بکــا بــۆ ئــەوەی ئــەو نەخشــەیەی دبلۆماسیەکانی ئینگلیز دەربارەی کورد ئامادەیان کردبوو کە بریتی بوە لەوەی ڕێگە لەکورد بگرن هیچ جۆرە جموجۆڵێك نەکا لەورۆژە ناسکانەدا کــە تورکــەکان لە سۆڤیەتیەکان نزیك کەوتبونەوەو هەروەکو مس بێلْ لەکتێبەکەیدا (فصول مــن تأريخ العراق القريب، چاپی بیروت وەرگێڕانی جعفر خیــاط) وتویــەتی نۆیــلْ لــەو گەشتەیدا سەرکەوتوو بووە (یەعنی توانیبوی مەبەســتەکانی حکومــەتی بریتانیــا بــەجێ بهێنێ) و پــاش ئــەوەی ئــەم راســتیە دەرکــەوت ئەوســا مامۆســتا رەفیــق حلمیش لەدوا بەشی یاداشتەکانیا کە لەساڵی ١٩٩٢ دا لەلایەن دوکتۆرە پاکیزەی کچیــەوە بڵاوکراوەتــەوە وتوویــەتی دەرکــەوت بــۆ ئــەو مەبەســتە نــەچووبوو کــە لەیاداشتەکانی پێشوویدا باسی کردبوو بەڵکو بۆ شتێکی تــر چووبــوو کــە تەنــها سوودی حکومەتەکەی خۆی تیابووە.

بەر لە میجرنۆیل، (ریچ) یش لەدوو گەشتیا هەر بۆ مەبەستێکی تایبەتی چووەو بۆ ئەوە نێررابوو بۆ باکوری کوردستان هەتا هەواڵ و دەنگ و باس و زانیاری کۆبکاتەوە بۆ کاربەدەستانی حکومەتەکەی بۆ ئەوەی ئەو زانیاریانە ئامادە بن بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز بۆ سوود لیٚ وەرگرتنیان لەکاتی پێویستدا.

سیاسەتی بریتانیا بەرامبەر بەکورد لەکۆنەوە شتێك نەبوە شاردراوە بێ خوێنەری بەڕێز لە باسەکان و لە رووداوەکانا هەڵوێستی ئینگلیزی بەتەواوەتی بۆ روون دەبێتەوە.

***چوارەم: هەڵوێستی روسیا بەرامبەر بەکورد هەتا شەڕی یەکەمی جیهان***

وەکو لەزۆر شوێندا دێتە بەر چاو، روسەکانیش وەکو زۆریەی دەوڵەتە ئەوروپیەکانی تر میللەتی کوردیان بە میللەتێکی ئاینداری سەرگەرم داناوە هەتا کورد بەتەواوەتی دەستی عوسمانیی بۆ نە کەوتبووە روو خۆی بە بەشێك دانابوو لە دەوڵەتی عوسمانی و لە ریزی دڵسۆزەکانی خەلیفەی عوسمانی حسابی بۆ دەکراو حسابی ئەوەشی بۆ کرابوو کە ژمارەیەك لە کوردەکان دلسۆزیان بۆ خلیفەی عوسمانی گەیشتبووە رادەیەك دژی اصلاحاتی دەستوری بوون کە دەسەڵاتی خلیفەی پیٚ کز دەبوو، کوردیش بەهۆی سەرکردە ئاینیەکانیەوە لەو غەزایانەی کە خەلیفە داوای لە موسڵمانەکان کردبوو بچن بەپیریەوە وەکوو شەڕی قارص و ئەردەهان چوبوونە کۆڕی شەڕەوەو شان بەشانی عوسمانیەکان دژی روسەکان شەڕیان کردبوو، بێجگە لەوە تورکەکان کە دژی کریستیانەکانی ناو وڵاتی عوسمانی بون و ئەو کریستیانانەیان بە داردەستی روسەکان دانابوو دژی خلافەتی عوسمانی ئیسلامی خستبویانە مێشکی کوردەکانەوە روسەکان دەیانەویٚ ئەو کریستیانانە بکەن بەملۆزم و کەڵەگای ناوچەکە بۆیە لێدانیان بەشتێکی پێویست زانرابوو، ئەمانە هەمووی بوبوون بەبناغەی بۆچوونەکانی روس بەرامبەر بە کورد و وامان بەباش زانی هەڵوێست و بۆچوونی رووسەکان دەربارەی کورد بکەین بەدوو بەشەوە:

١ـ *هۆی ئاینی*: روسیا وەکوو دەوڵەتێکی کریستیان، زۆر مەبەستی بووە کریستیانەکانی ناو وڵاتی عوسمانی بپارێزیٚو بەهێزیان بکاو یارمەتیان بداو لەوەدا کوردیشی هەتا رادەیەك وەکوو تورکەکان بە نەیارو ناحەزی

کریستیانەکان حساب کردوەو باوەڕی بەئەرمــەنی و نسـطوریەکان زۆرتـر هـەبوە وەك لـەکوردو کـورد لـە هـــەموو تەقــەلا سیاســی و ســوپاییەکانا هیــچ جــۆرە پێشکەوتنێکی بەجێ نەهێنابوو لەگەڵ روسەکاندا.

٢ــ باوەڕنـەکردنی روس بەمیللـەتی کـورد وەکـو میللـەتێکی هەمیشــە یـەك نەگرتوو شتێك بووە لەمێژیووە روسەکان بـۆی چووبـون و ئاگـاداری ئـەوە بـوون لەناوخۆیانا ناڕێك بـوون و کەسیان بەسـەرکردایەتی یـەکێکی تـر قـایل نـەبوە و هەرچەند هەندێ جار هی وەکو بدرخان و شێخ عبیداللە تەقەلای ئـەوەیان دابـوو سـەرۆك عەشـیرەتەکان کۆبکەنــەوەو پــەیمانێك ببەســتن لــەناوخۆیانا بــۆ هاوکـاریکردن لەگـەڵ یـەکتردا بـەڵام زۆری پـێ نـەچوە لـەناوخۆیانا تێکچـوون و ریسەکەیان بۆتەوە بەخوری و ئەو نـاڕێکیو یـەك نەبوونـە لـەنێوان کـوردا شتێك نەبوە روسیای دراوســێ بـە کوردسـتان ئاگـای لێ نـەبووبێ و لەگـەڵ ئـەو هـەموو تەقەلایانەی دوای بدرخان ویەزدان شێر و شـێخ عبیداللـە درابـوو، لەرۆشـنبیرانی کوردیش وەکوو عبدالرزاق بدرخان کە ماوەیـەك پەنابـەر بـووە لـەژێر دەسـەڵاتی روسەکانا هەمان تەقــەلای دابـوو بۆئـەوەی روسـەکان بکـا بەلایـەنگری کـورد لـە راپەڕین و بزوتنەوەکانیا دژی تورکیا و لە روسەکانی گـەیاندبوو مەبەستی کـورد بۆ هاوکـاریکردن لەگـەڵ روسـەکانا لەسـەر بناغەیـەکی راسـت بـوەو پـر بـەدڵ ویستویانە کورد لەسایەی روسیادا بەمافی خۆی بگا بەڵام هەموو ئـەو تەقەلایانـە بێ سوود بوەو روسەکان گوێی خۆیان لێ کەڕ کردبوو.

لـەو ڕووەوە پرۆفیسـۆر خـالفین لەکتێبەکـەیدا سـەرچاوە ١٠٢ باســی ئــەوەی کردوە روسەکان هەتا ساڵانی نەوەدەکانی سـەدەی نۆزدەهـەم هیـچ چالاکیـەکی ئـەوتۆیان نــەبوە لەکوردســتاناو تەنــها هــەر خــەریکی سەرپەرشــتیکردنی موستـەعمەرەکانی خۆیـان بـون لەقفقاسـدا، بـەڵام لـەدواییدا وەختێك دەوڵەتــە ئەوروپاییەکان دەسەڵاتی ئابووریـیـان لـە ناوچـەکانا پـەرەی سـەند و دەسـتیان کردبوو بەناردنی بەرهەمە پیشەسازیەکانی خۆیان بۆ ساغکردنەوەو فرۆشتنیان و کڕینی کە رەستەی خـاو بـەنرخێکی هـەرزان، ئیـتر ئـەوانیش بەتایبـەتی لـەدوای دامـەزراندنی سـوارەی حمیدیـە کـە بەئاشــکرا دژی روس و ئەرمەنیــەکانی روس پێکهێنرابوو ئیتر ئەوانیش کەوتنە بایەخدان بەناوچە کوردیەکان.

(عقبـد ڤارتســۆڤ) ی روس لەوناميلكەيــەيدا لەســاڵی ١٨٩٦ دا بــەناوی (سەرنجدان لەكورد، چاپی تفليس ساڵی ١٨٩٦) وەكـو دوكتـۆر جليلی ئامـاژەی بۆئەمەو بۆ كتێبێكی (نقيب ئـەڤريانۆڤ) كردوە كە لەسـاڵی ١٩١٣دا چاپكراوە لەوانەدا باسی ئەوە كراوە كە روسەكان هـەوڵی ئـەوەيان دابـوو ئەگـەر نـەتوانرێ كـورد بكرێ بەدۆسـتی روس بـاهيچ نـەبێ شـتێكی وابكرێ كـورد بێلايــەن بــێ لەكێشەی نێوان ئەوان و توركدا.

ئـەوەی راسـتی بـێ، وەكـو پرۆفيسـۆر خـالفين باسيكردوە پێوەنـدی نێـوان كوردو روس هەتا كۆتايی سەدەی نۆزدەهەم چالاكيەكی ئەوتۆی تيادا نەبينراوەو لەكۆتايی سەدەی نۆزدەهەمـەوە روسـەكان تاڕادەيـەك شـتێك لـەگرنگيتی رۆڵـی كـورد گەيشــتبون كــە چالاكيــەكانی عبدالــرزاق بــەدرخان لــەو روەوە لــەزۆر سـەرچاوەدا بـەدورودرێژ باسـكراوەو دەمانـەوێ لـێرەدا شـتێك دەربـارەی ئــەوە بەپێی سەرچاوە شارەزاكان باس بكەين.

جليلی لەكتێبەكەيدا سەرچاوە ٥٥ دەربارەی چالاكيەكانی عبدالرزاق بدرخـان بۆ هاوكاريكردنی روس لەگەڵ كوردا وتوويەتی:

((ساتێك عبدالرزاق لەكاتی خۆيدا كرابوو بەسكرتێری سێهەمی باڵيۆزخانــەی دەوڵــەتی عوسمــانی لــە بترســبرگ لــەو ماوەيــەدا فــێری زمــانی روس بــوو شارەزاييەكی تەواوی پەيداكردبوو لەرووی سياسـی و كۆمەڵايـەتی روسـەكانەوەو كاربەدەستانی روسيش بەرامبەر بەو شارەزاييەی ئەو رێزێكی زۆريان لێ گرتـوەو خەڵاتی (ستانسلاف) يان داوەتێ))

سـاتێك عبدالـرزاق كارەكــەی لــە بترسـبرگ تــەواو بــووە گەڕاوەتــەوە بــۆ ئەسـتەمبوڵ و لـەوێ لەئـەنجامی چـەند درۆو دەلەسـەيەكدا بۆيـان هەڵبەسـتبوو سوڵتان لەئەستەمبوڵ هێشتبويەوە، بەڵام زۆری پێ نەچوو هەواڵێك بڵاوكرايـەوە گوايـا بـەهاندانی (يوسـف عزالديـن) ی جـێ نشـينی شـەرعيی سـوڵتان پيلانێــك رێكخرابوو بۆكوشتنی سوڵتان و عبدالـرزاق يـەكێك بـووە لەوانـەی بـەوە تاوانبـار كرابوو گوايا بەشداربووە، يا ئاگاداری ئـەو پيلانـە بـووە بۆيـە گـيراو چـوار سـاڵ لەزيندانا مايەوە و سـاتێك لەسـاڵی ١٩٠٨دا اصلاحـاتی دەسـتووری خرايـە گـەڕو لێخۆشبوونی گشتی دەرچوو عبدالرزاق بەپێی ئەوە لەزيندان بـەردراو پـەيوەندی

بە (چێرکۆف) ـەوە کردو موافەقەتی بۆ وەرگرت مافی پەنابەرێتی بدرێتێ لەروسیاو لـەرۆژی ٨ ١ ١٩١٠دا لەرێگـەی (سیواسـتپول) و (یالطـە) وە خـۆی گەیاندە (تفلیس) و لەوێوە هەوڵیدا بچێت بۆ (یریڤـان) بۆئـەوەی لـەوێوە بتوانێ پەیوەندی بەکوردەکانی باکورەوە بکـا، بـەڵام رێگـەیان نـەدا بچێتـە (یریڤـان) و لەجیاتی ئەوە چووە کوردستانی ئێران.

لەلاپەڕەکانی ١٤٦-١٧٠ی کتێبەکەی سمکـۆ چاپی سـتۆکهۆڵم سالی ١٩٩٦ باسی چالاکی عبدالرزاق بدرخانم کردوە لەگەڵ سمکۆدا بەجووتە چۆن پێوەندیان بەڕوسەکانەوە کردبوو لێرەدا پێویست ناکا ئەوە دوبارە بکەمەوە.

جلیلی لەلاپـەڕە ١٥٢ی سـەرچاوە ٥٥دا باسی چالاکی عبدالرزاقی کـردوە لەسەر سنوری تورکیا وئێران و لەوێ چـاوی بـە (بطـرس ئیلـوف) ی سـەرکردەی ئاسـوریەکان کـەوتووەو روسـەکان دووجـۆر هەڵوێسـتیان هـەبوە بەرامبـەر بەعبدالرزاق و بـۆ جۆری یەکـەم جلیلـی ئامـاژەی بـۆ لاپـەڕە ١٧٨ی کتێبەکـەی لازاریف کردوە دەربارەی هەڵوێستی روسەکان بەرامبەر بە عبدالرزاق کە لازرێـف وتوویەتی:

((ماکلۆڤسکی سووربووە لەسەرئەوەی بەهیچ جۆرێك نابێ یارمەتی عبدالرزاق بدرێ و لەوەدا لەگەڵ بۆچوونی (نیراتۆف) دا یەکی گرتوەتەوە کە لایـان وابـووە بدرخان نێرراوێکی نەهێنی تورکـەکان بـوەو نـیراتۆف بـۆ ماکلۆڤسـکی نوسـیبوو عبدالرزاق جێگەی گومانەو نابێ بڕوای پێ بکرێ. و بەرواڵەت خۆی واپیشان ئەدا دۆسـتی ئێمەیـەو لـەورووەوە (غۆلینـۆف) ی جێگری قونسـوڵی روسـیش هـەمان بۆچوونی نیراتۆفی هەبوە.

دەربارەی ئەوە وەکو جلیلی باسی کردوە لە ئەرشیفی باڵیۆزخانەی روس لـە ئەستەمبوڵ لەساڵی ١٩١٠دا وتراوە:

((بۆ وەرامی پرسیارێکی وەزارەتی دەرەوەی روسیا دوای ئـەوەی عبدالـرزاق بـو بـوو بەپەنابـەر لـە قونسولخانەی روسـیا لەورمیـە، (کاخاتۆڤسـکی) وەرامـی داوەتەوەو وتوویەتی: عبدالرزاق ئێستا رقـی لەحکومـەتی تورکیایـە و ئـەندامانی اتحـادو ترقـی گـەلێك درۆو دەلەسـەیان بـۆ هەڵبەسـتوەو عبدالـرزاق ئەوانـە

بەتاقمێکی خوێنرێژ دادەنێت کە هەموو کارێك دەکەن بۆ سەرگرتنی مەرامــەکانی خۆیان و بۆ چەوساندنەوەی خەڵك)).

جلیلـی دەربـارەی ئـەو وەرامـەی کاخانۆفسـکی وتوویـەتی لەراسـتیدا پــەنا بردنەکـەی عبدالـرزاق بـۆ قونسـوڵخانەی روس لـە ورمیـە بۆچوونــی هــەندێ لــە روسـەکانی گـۆڕی و یـەکێکی وەکـو (غۆلنیێـڤ) کـە جــاران بــەگومان بــوو لــە عبدالرزاق، پاش ئـەوە نامەیـەکی نـاردبوو بـۆ وەزارەتـی دەرەوەی روسـیا تیایـا وتبووی بۆچوونەکانی پێشووی دەربارەی عبدالرزاق شتێکی هەڵە بوو.

تورکەکان زۆریان هەوڵدا لەگەڵ عبدالرزاق دا بگەڕێتەوە قونسوڵی تورك زۆری هـەوڵدا لـەورووەوە بـەڵام بـێ هوودەبـوو، ئیــتر دوای ئــەوە بگرســبرگ بڕیــاریدا بەتەواوی عبدالرزاق بپارێزێ و رۆژی ٢٥ ی ئایار لەژێر پاراستنی قۆزاقـدا چـووە (تفلیس) و لەوێ سنوریان بۆ چالاکیەکانی دانا بۆیە ئەوێی بەجێ هێشـتوو چـوە ئەورووپا.

هـەروەکو لازاریـف لەلاپـەڕە ١٦٠ ی کتێبەکـەیدا باسـێکی (کاخانۆفسـکی) بڵاوکردوەتەوە کە وتوویەتی: عبدالرزاق پێی ڕاگەیاندین دەیەوێ بچێت بۆ پاریس بۆئەوەی چاوی (کدرپاشا ـ کە لام وایـە خـدر پاشـا بـێ) کـە لـەپاریس گۆڤـاری مشروطیەی دەرکرد و لەپاریسەوە چوو بۆ قاهرەو لـە ٢٣/ ٩/ ١٩١١دا گەڕایـەوە بۆ تفلیس.

ئەوەی شایانی باسە، لازاریف لەو کتێبەیدا باسی ئەوەشی کـردوە روسـەکان نەیان ویستبوو پەیوەندی بە بزوتنەوەکەی کوردەوە بکـەن و لایـەنگری ئـەوەش نەبون کورد ئۆتۆنومی یا دەوڵەتێکی سەربەخۆی هەبێ. لەساڵی ١٩١٢دا وەزیری دەرەوەی تورکیـا نـاڕەزایی خـۆی دەربـڕی لای بـاڵیۆزی روسـیا لـە ئەستەمبوڵ بەرامبەر بــەو پارێزگاریکردنــەی عبدالـرزاق و باڵیۆزخانــەی روس لـە ئەسـتەمبوڵ ئاگاداری ئەوەشی بووە اتحادوترقی بڕیاری کوشتنی عبدالرزاقیــان دابـوو، چـەند کەسێکیان ناردبوو بۆ کوشتنی بەڵام سەری نەگرتبوو.

جلیلـی لەلاپـەڕە ١٦٠ی هـەمان سـەرچاوەدا باسـی چالاکیـەکانی عبدالرزاقـی کردوە کە دەیویست یارمەتی لە روسەکانەوە بۆ کورد مسۆگەر بکا بۆ خۆئامـادە کردن بۆ ڕاپەڕینێك و (کاخانۆفسکی) ئاگادارکرابوو لەونیازو مەبەستەو بـۆ ئـەوە

جلیلی ئاماژەی بۆ نامەیەکی (س. تۆلغیریَڤ) کردوە کە لە٢ ٤ ١٩١١دا ناردویەتی و لەوەدا وتویەتی کە چاوم کەوت بە عبدالرزاق تێم گەیاند ئامادەم گوێ بۆ هەموو قسەکانی شل بکەم بەمەرجێك کارێکی وا نەکا پێوەندی رەسمی ئێمەو تورکی پێ تێك بچێت.

جلیلی لەلاپەرە ١٩٠دا باسی گفتو گۆیەکی نێوان عبدالرزاق و (تۆلغیریَڤ) ی کردوە کە پێی ووتبوو شەڕ لەنێوانی تورکیاو روسیادا هەر دەقەومێ، لەبەر ئەوە پێویستە کورد خۆی بۆ ئەو رووداوە ئامادە بکاو دڵسۆزیی خۆی بۆ روسیا ئاشکرا بکاو روسیاش بەرامبەر بەوە پێویستە یارمەتی کورد بدا.

جلیلی لەلاپەرە ١٦٧ باسی بۆچوونێکی (گردلێڤسکی) کردوە کە لەلاپەرە ٣ی کتێبەکەیدا وتویەتی:

((ئیتر کاتی ئەوەهاتووە دبلۆماسەکان و زانیارەکانی روس واز لەبیرو بۆچوونەکانی پێشووی خۆیان بێنن بەرامبەر بەکورد و چڵك و ژەنگی مێشکیان لەو روەوە رابماڵن وەکارێکی وابکەن لەرێگەی ئێمەوە بگا بەشارستانێتی)).

دوکتور کمال علی لەلاپەرە ٥٢ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٦ باسی چەمکێکی تری پێوەندی کوردو روسی کردوەو وتویەتی:

ساتێك شەڕی تورك و روس دەستی پێکرد هەرچەند میرنشینەکانی هەکاری ئەوانەی خواروی کوردستان هەڵوێستێکی بێ لایەنیان گرتبووە بەر بەڵام لەناو کوردەکانا هیواش هەبوە وەکوو سەلیم پاشاو بەهلول پاشای بایزید و موش بەئاشکرا هاوکاری روسەکان بوون لەدوای ئەوە ئیتر هەندێ لە زاناکانی روس وەکو (خ. ئابۆڤیان) و (ف. دیتیل) و (ئی بیریزن) و ژمارەیەکی تر دەستیان کرد بەلێکۆڵینەوە دەربارەی کورد هەروەکوو کتێبی: وڵاتان و میللەتانی رۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاست، بەرگی ١٢ چاپی یریڤان ساڵی ١٩٨٥ باسیکردوە (لەراستید' جگەلەو کوردانەی بێ لایەن بوون یا هاوکاری روسەکان بوون، ژمارەیەکی زۆریش کوردی واهەبوە دژی روسەکان شان بەشانی تورکەکان بەناوی غەزاوە شەڕیانکردوە لە شەڕەکانی قرم و قارص و ئەردەهاندا وەکوو لەباسەکانی پێشوودا باسیانکراوە).

هەمان سەرچاوەی ژمارە ٦ ئاماژەی بۆ لاپەڕە ١٢ی کتێبەکەی (ئەفریانۆف) کردوە کە ووتویەتی:

((هەمیشە کوردەکان پێشنیاری ئـەوەیان دەکـرد هاوکاریمـان لەگـەڵا بکـەن، بەڵام ئێمە (روس) هیچ کاتێك نەمانتوانیبوو لەگەڵ کوردەکانا پێکەوە بچین بەگژ تورکداو نـەمان توانیبـوو لـەهیچ کـاتێکدا نرخـی ئـەو داخوازیەیانـەی کـورد هەڵسەنگێنین)).

مینۆرسکی لەلاپەڕە ١٧٣ی کتێبەکەیدا اسی ئەوەی کردوە هەر ساتێك شـەڕ لەودیو قفقاسەوە هەڵگیرسایە ئەوسا ئێمە (روس) زۆرتر بایەخمان ئەدا بە کورد.

لازاریـف لەلاپـەڕە ٢٢٥ی کتێبەکـەیدا (مەسـەلەیکورد) باسـی (ئولغرێـف) ی کردوە کـە ووتویـەتی پێویسـتە زۆر بەگەرمیـەوە کـارێکی کولتـوری لەئەرمـەنیاو کوردستانا بکەین چونکە ئەمە شتێکی زۆر کاریگەر دەبێت بۆ گۆڕینی هەڵوێسـت و بیرو بۆچوونی میللەتانی رۆژهەڵات بەرامبەر بە روسیا.

لازاریـف لەهـەمان کتێبیـدا باسـی ئـەوەی کـردوە چـۆن جارویـار عبدالـرزاق بدرخان گلەیی دەکرد لە روسەکان کە زۆر کە مترخـەم بـوون بەرامبـەر بـەکورد پێی ووتبوون ئەگەر ئێوەهاوکاریەیان نەکـەن و پشـت گوێیـان بخـەن ئـەوا کـورد ناچار ئەبێ روو لەئەڵمانەکان بکا.

لازاریف لەباسەکەیدا دەڵێ:

((هەرچـەند هاوکـاریکردنی روس بـۆ کـورد لـەبواری کلتوریـدا سـەرکەوتنێکی سیاسـی بـوو لەکوردسـتانا بـەلام پێشـنیازەکانی تـری چێرکۆف بـۆ کردنـەوەی هەندێ قوتابخانە لەکوردستان لەلایەن روسەکانەوە پێشوازی لێ نەکرا)).

جلیلی لەکتێبەکەیدا چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی کورد لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستدا چـاپی ئۆپسالا ـ سوید ساڵی ١٩٨٥ لەلاپەڕە ١١٥دا ووتویەتی:

((ئەرشیفەکانی دەرەوەی حکومەتی روسیا ئاشکرای ئەکەن روسیای قیصری هەمیشـە سیاسـەتێکی دوو ڕوویـی هـەبوە بەرامبـەر بەمیللـەتانی ناوچەکـەو بەدرێژایی سەدەی نۆزدە قەیسەرەکانی روس باری ناهەمواری کوردو دواکـەوتنی و نەبوونی رێکخراوێکی سیاسی کوردیان کردبوو بـە بنێشـتە خۆشـەی دەمیـان و

کردبویان بەبەڵگە بۆ پشتگیری نەکردنی بزوتنـەوەکانی کوردە ئازادیخوازەکـان.

نووسەری سەرچاوە ٦ بۆ تێ هەڵکێشی ئەوە وتوویەتی:

روسـەکان دەرفـەتیان لەکـەم و کـوڕی و ناتـەبایی کـورد وەرگرتبـوو لەناوکوردستانا بەرامبەر بەوە روسیا سیاسەتێکی فێـڵاوی و تەڵەکـەبازی گرتبـوو بەر بەرامبەر بەکورد، نمونـەی ئـەو دوو ڕوویـە لـەراپۆرتێکی (ب. ئـی. تـێرمین) لەوگەشتەیدا ساڵی ١٩٠٦ بە ناوچەکانی وان و هـەکاریدا کردبووی و سـاڵی ١٩١٠ لەتفلیس چاپکراوە، لەوەدا باسێکی جێگری قونسولی روس لەوان خراوەتە پێـش چاو وتوویەتی: ((گەر هات و کوردەکـان دژی تـورك ڕاپـەڕین، ئەوسـا ئێمـە هـەر بۆئەوەی ئەو جۆرە سۆزەیان پێ بدەین دەتوانین بیانجووڵێنین و بیانکەین بـەگژ تورکەکانا)) .

## بەشی پازدەهەم

# لاوازبوون و گەندەڵبوونی دەوڵەتی عوسمانی و هۆی لاواز بوونی

بێگومان دەوڵەتی عوسمانی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو کزی و لاوازی چووە و باری ئابووری زۆر ئاڵۆز بووەو خۆی خستبووە ژێر بارێکی ئێجگار گرانی ئەو هەموو قەرزانەی لە وڵاتەکانی ئەورووپاو بازرگانەکانیانی کردبوو، کار گەیشتە ئەوەی نەك تەنها هەر میللەتەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، بەڵکو تورکەکان خۆشیان لە کرداری سوڵتانەکان و دەورو پشتەکانیان بێزاربون و بەشدار بوونی عوسمانی شان بەشانی ئەڵمانەکان لە شەڕی جیهانیدا بەمەبەستی خۆ رزگارکردن لەو قەرزانەو شکاندنی خۆی و ئەڵمانیای هاوکاری ئەوەندەی تر حکومەتەکەی لاواز کردو دوای تەواو بوونی شەڕی جیهانی بە دوسێ ساڵ خەلافەتی عوسمانی و سوڵتانی عوسمانی ریشەکێش کرا.

بۆ ئەوەی بەکورتی لە هۆی ئەو لاوازبونەوەی عوسمانی بکۆڵینەوە باسەکەدەکەین بەم بەشانەوە:

**١ـ خراپەو درندەیەتی و زۆرداریێتی کاربەدەستانی عوسمانی بەرامبەر دانیشتوانی دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەکی گشتی و بەرامبەر بە کەمە نەتەوەکان بەکورد و ئەرمەنی ئاسوری و عەرەبەوە بەشێوەیەکی تایبەتی.**

**٢ـ رەوشتی خراپی سوڵتانەکانی عوسمانی و خەریکبوونیان بە رابواردن و بەرژەوەندی خۆیان.**

**٣ـ دارزاوی و گەندەڵ بوونی دەزگا سیاسیو سوپاییەکانی دەوڵەتی عوسمانی.**

**٤ـ دەستێوەردانی وڵاتانی ئەوروپا لە کارو باری وڵاتدا.**

**یەکـــەم: خراپکـــاری و دڕندەیـــەتی و زۆرداریتـــی کاربەدەســـتانی دەوڵەتی عوسمانی**

لاپەڕەکانی مێژووی عوسمانی پڕن لە باسی دڕندەیـەتیو پیـاوکوژی و خوێـن ڕشـتن و تـالانکردنی ئـەو شـوێنانەی دەسـتیان بەسـەردا ئـەگرت و ڕەفتـاری کاربەدەستەکانیان هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆی نـەبوە لەگـەڵ ڕەفتـاری تاقمـەکانی جەنگیز خان و هۆلاکۆو تەیموری لەنگ لەرابووردودا.

لـەو ڕووەوە دوکتـۆر جلیلـی لەلاپـــەڕە ٢٠٤ی کتێبەکـەیدا سـەرچاوە ٢١ بـۆ نمونەی ئەوە باسێکی (ڤالمیر پیتر) ی هێناوەتەوە کە لەوەدا ووتویەتی:

((دڕندەیەتی و خوێنمژینی کاربەدەستانی تـورک گەیشـتوەتە رادەیـەك ئـەو کاربەدەستە تازانەی دەسـتە دەسـتە لـەدوای یـەکتر دەنـێرران لەوانـەی پێشـوو دڕندەتـرو چـاو برسـیتر بـوون ئەوانـەی کـە دەنـێرران بـۆ کاروبـاری ناوچەیـەك فرمانەکەیان بە پارەیەکی زۆر دەکـڕیو، پـارەو پولێکـی ئەوتۆشـیان نـەبوە کـە پارەی کڕینی فرمانەکە بدەن بۆیە بەقـەرزو قۆڵـە ئـەو پارانـەیان پـەیدا دەکـردو سوودو سەلەمێکی زۆریان ئەدا بەوانەی پارەیان ئەدانێ بەقـەرز وەکـوو بازرگانـە ئەرمەنیـەکان و هـەر کـە دەگەیشـتنە شـوێنی کارەکـەیان دەسـتیاندەکرد بـە ڕووتانـەوەی خـەڵك و سـەرانەو بـاجی زۆریـان لەخـەڵك دەسـەند بـۆ ئـەوەی لەلایەکەوە قەرزەکەی خۆیـانی پـێ بدەنـەوەو لەلایـەکی تریشـەوە دەبوایـە لـەو پارەی بـاج و ڕاوو ڕووتانـەی دەسـتیاندەکەوت بەشـی کاربەدەسـتە گـەورەکانی ژوور خۆیان بدایە بۆ ئەوەی چاویان لەرەفتارە خراپـەکانیان بپۆشـن و بێگومـان سوڵتان و (حـەریم ــ کـە مەبەسـتی لـەو فەرمانبەرانـە بـووە لـەناو کۆشـکەکانی سوڵتاندا بوون) لەو پارانە بێبەش نەدەکران و وای لێ هاتبوو بەرەڵاییـەکی تـەواو لەناو وڵاتی عوسمانیدا بڵاو بوبوەوە کە دانیشتوان بەتەواوەتی لە حکومەت بێزار بوبون.

دەربارەی ئەو بەرەڵاییە، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەکتێبەکەیدا سـەرچاوە ٩٢ لەلاپـەڕە ٧ یـدا باسـی بەشـێك لـەو نامەیـەی کـردوە کـە لـە کتێبـی (القضیةالسوریة لاپەڕە ١١دا باسی نامەیەکی ئەمی رمصطفـی فـاضلی کوڕەزای

محمدعەلی پادشای میصری کردوە کە ناردبووی بۆ سوڵتان عبدالعزیزی خلیفەی عوسمانی و لەو نامەیەدا گلەیی لەوە کردبوو وڵات گەیشتبوە ئەوپەڕی پەرێشانی و سەرگەردانی و داوای لە سوڵتان کردبوو چارەسەرێك بدۆزێتەوە بۆ ئەو بارو هەڵوێستەی کە حکومەت تێی کەوتبوو و کاربەدەستان هەریەکە لەشوێنی دەسەڵاتیا هەرچیەکی ویستبێ کردویەتی و لەئەنجامی ئەوەدا دانیشتوانی وڵاتی عوسمانی بوبون بەدوو بەشەوە، بەشێکیان بریتی بوون لەتاقمێکی زۆردارو بەزەییان بەکەسدا نەهاتوەتەوەو هیچ بەرهەڵستیەکیش نەبوە رێگەی ئەوتاوان و دەستدرێژیکرنەیان لێ بگرێ، بەشەکەی تریان بریتی بوون لەچەوسێنراوان و زوڵم لێکراوان کە بریتی بوون لە زۆربەی دانیشتوانی وڵات و کەس فریایان نەدەکەوتن تاوانبارەکانیش کە لەسایەی سوڵتانا ئەو رەفتارانەیان دەکرد وایان بڵاودەکردەوە سوڵتان هەموو دەسەڵاتێکی داونەتێ.مامۆستا ئیبراهیم لەلاپەرە ٨ی کتێبەکەیدا لەساڵی ١٩٢٧ لەبغداد چاپکراوە، باسی زۆردارێتی کاربەدەستانی عوسمانی و دەرەبەگەکانی عوسمانی کردوە چۆن رێگەیان لەوە گرتبوو تیشکی خۆری شارستانێتی ناوولاتانی رۆژئاوا بگاتە ناوچەکانی رۆژهەڵات و بەپێی رەوشت و سروشتی دەرەبەگایەتی دەوڵەتی عوسمانی هەمیشە رێگەی لەپێشکەوتن و برەو پێدانی بازرگانێتی و پیشەسازی گرتووەو باسی ئەو هەموو باج و سەرانە سەندنە زۆرەی کردوە کە حکومەت بەزۆرەملێ سەپاندوبووی بەسەر خەڵکی بێ دەرامەتدا، لەکاتێکدا دەنگ و هاوار و دادو بێدادی هیچ کەسێك نەدەگەیشتە گوێی کاربەدەستانی دەسرۆیوو بەشی میللەتی کورد لەو دواکەوتن و بەشخوراویەدا لە هی هەموو میللەتەکانی تری ناو وڵاتی عوسمانی زۆرتر بووە.

لەکاتێکدا لە رۆژئاوادا پێشکەوتن و شارستانێتی هەتا دەهات بەرەو باشی و پێشکەوتن دەچوو، کەچی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا نەخوێندەواری و نەشارەزاییو دواکەوتن بەولاوە هەست بەهیچ شتێکی تر نەدەکرا.

لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتی عوسمانی (پیاوە نەخۆشەکە) هەتا سەر لە توانایدا نەبوو رێگا لە لێشاوی ئەو شارستانێتی و رۆشنبیریە بگرێ کە

لەرۆژئاواوە بەرەو رۆژهەلات دەکشاو دەبوە هۆی بزوتنەوەی هەستی دانیشتوان و چاویان لە میللەتانی ولاتە راپەریوەکان دەکردو وەکوو یۆنان و بولغـارو صـرب کە هەریەکەیان لە شوێنی خۆیـا کەوتبوونـە جوولـە بـۆ دەسـگیربوونی ئـازادی و سەربەخۆیی. لەراستیدا جەورو ستەمی کاربەدەستانی عوسمانی هەر تەنها رووی تاقمێکی نەگرتبوەوە بەلکوو هەموو چینەکانی ولات لەژێر بـاریدا دەیـان نـالاَن و ئـەوەبوو بەتێکۆشـانی هـەموویان لەسـالی ١٩٠٨دا دەسـتوورێك دانـرا بـۆ ولاتــی عوسمانی)).

***دووەم: رەوشتەکانی سولتانەکان و خەریکبوونیان بەرابواردنەوە***

سـولتانەکانی عوسمـانی هەرچـەند لەسـەرەتاوە بەروالـەت ئـالای ئیسـلامیان بەرزکردبوەوە و خۆیان بەنوێنەری میللـەتانی ئیسـلام دائـەناو نـاو بـەناو بـەپێی شـەریعەتی ئیسـلام وەکـوو یاسـایەکی هەمیشـەیی دەرۆیشـــتن بـــەرێوە، بـــەلاَم لەراستیدا ژیانی سولتانەکان لەناو کۆشك و تەلارو شوێنە نەهێنیـەکانیان سـەدان چیرۆك و سەرگروشتەی ئێجگار سەیر دەربارەیان نوسراوە.

یـەکێکی وەکـو پرۆفیسـۆر (ئیسـماعیل حقـی ئــوزون) لەلاپـــەرە ٧٣٠ی کتێبەکـەیدا سـەرچاوە ٩٠ بـەدوورودرێژ باسـی رەفتـــارو رەوشــتی ســولتانەکانی کردوەو وەکوو ئەمانەی خوارەوە:

**١ـ ژن هێنانی زۆری سولتان لـە بێگانـە بـوو بـەهۆی روودانـی ئـاژاوەو پشێوی لـە سەرتاسـەری ولات و خـەلکێکی زۆر بـە پیلانی ژنـە بێگانـەکانی سـولتانەکان کـوژران و زۆربوونی ژمارەی ژنەکانی سولتان لەنـاو کۆشکەکانی بـابی عـالیدا کارێکی کردبوو هـەر ژنە بەجیا تـاقم و دامودەزگای خۆی هەبوە.**

**٢ـ منداڵەکانی سولتان کە لەچەند ژنێکی دەبوون کە گـەورەدەبوون لـەناو خۆیـانـا ناڕێك دەبوون و هەریەکە تـاقم و دارو دەسـتەی خـۆی هـەبوە کـە لەگـەڵ هـی براکـانی تریـا ناڕێك بوون وولات بەهۆی ئەو نـاڕێکیانەوە تووشی گەلێك زیان و ئاژاوەبووە.**

**٣ـ دەسـتێوەردانی ژنـەکانی سـولتان لـە کاروبـاری رۆژانـەی نـاخۆی دەولـەتدا. بەتـایبەتی لە دانانی فەرمانبەران و کاربەدەستانی دەولەتدا گـەلێك کێشـەو نـاکۆکی لێ پەیدا بووە.**

**٤ـ سوڵتانەکانی عوسمانی هەر لەسەرەتاوە هەتا زەمانی سوڵتان سەلیمی یەکەم خۆیان دەبوون بەسەرکردەی سوپا کە هیچ شارەزاییەکیان نەبوە لە کاروباری سوپاییدا.**

**٥ـ خەریکبوونی سوڵتانەکان و ئەمیرەکان بەرابواردن و سەفاهەتەوە بوبووە هۆی ئەوەی کارە گرنگەکانی وڵات فەرامۆش بکەن.**

**٦ـ شەڕی خاچپەرستەکان سوڵتانەکانی خستبووە سەر سەودای ئەوەی هێزی گەورە پێك بێنن بۆ ئەو شەڕانە کە بوو بەهۆی بارێکی گران بەسەر دەوڵەتی عوسمانیەوە لەڕووی ئابوریو سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە.**

**٧ـ دانی دەسەڵات و ئیمتیاز بە کۆمپانیاو بازرگانە بیگانەکانی وڵاتانی رۆژئاوا رێگەی بۆ ئەوە خۆش کرد دەوڵەتە ئەوروپاییەکان لەرێی ئەوانەوە دەستبخەنە ناو کاروباری وڵاتەوە و دەورێکی زۆریان هەبوە لە تێکدان و ناکۆکی نێوان دانیشتوانی دەوڵەتی عوسمانیدا.**

**٨ـ لووتبەرزی و خۆبەزلزانینی سوڵتانەکان و دەوروبەرەکانیان بەرامبەر بوبووە هۆی ئەوەی دانیشتوان دژی حکومەت بن و بەچاوێکی سووکەوە سەیری دەوڵەت بکەن.**

**٩ـ دەستێوەردانی سوڵتانەکان لە کاروبارە ئاینیەکانا بەناوی سەرپەرشتی کردنی ئاینەوە کە خۆی بە پارێزگاری ئاینی ئیسلام دەزانی بوو بەهۆی ئەوەی ئاین کرا بەشتێکی گاڵتەجاڕی بەدەس کاربەدەستانی حکومەتەوە.**

دەربارەی رەوشتی سوڵتانەکانی عوسمانیو زیانیان بۆ ووڵات، (رۆهات ئالاکۆم) لەسەرچاوە ٧٨دا باسی کابرایەکی سویدی کردوە کە ناوی (گوستاف نورینگ) بووە لەوسەردەمەدا کە شریف پاشای خەندان باڵیۆزی دەوڵەتی عوسمانی بووە لەستۆکهۆڵم و ئەو کابرایە بۆ گاڵتە کردن بەسوڵتان عبدالحمید، نەك تەنها هەر لەسوید، بەڵکوو لەکۆبونەوەو کۆنفرانسەکانیشدا بەقسەو بەنوسینی ناو گۆڤارەکان رەفتارە خراپەکانی عبدالحمیدی باسکردوەو بڵاوی کردۆتەوە، ئەو کابرایە لەدواییدا بووە بەموسڵمان ناوی خۆی ناوە علی نور (سەرچاوەی رۆهات ئالاکۆم بۆئەم باسە بریتیەلە:

Gunnar J- arring: Gustvnoring, Alias Norl ١٩٧٦ چاپی ساڵی

Ochham بەپێی ئەو سەرچاوەیە، دوای ئەوەی حکومەتی عوسمانی هەواڵی

گاڵتـە پێکردنـەکانی (گوستاف نورینـگ) دەبیسـتێتەوە دادگایـەکی حکومـەت بڕیاری زیندانیکردنی دەدا بۆ (١٠) ساڵ.

یـەکێك لەنوسـینە پـڕ لەگاڵتـەکانی ئـەو کابرایـە کتێبێـك بـووە بـەناوی (عبدالحمید) ، لەساڵی ١٩٠٢دا چاپی کردوە گەلێك کاریکاتێرو شیعری دەربارەی عبدالحمیدی تیا بووەو سەرزەنشتی رەفتارە نابەجێکانی عبدالحمیدی کردوە.

دەربـارەی رەفتـاری سـوڵتانەکان، (خالدالمقدسـی) لـەگۆڤاری هــلالی سـاڵی ١٩٠٨–١٩٠٩ لاپەڕەی ٧٢ سەرچاوە ٨٨ باسێکی دوورو درێژی سوڵتان و صدری ئەعظمی کردوەو وتوویەتی (کورتیەکەی) :

((کۆشکی سوڵتانی عوسمانی و پێگەیاندن و پەروەردەکردنی ولی عـهدەکانی سوڵتان لەسەر هەمان پێڕەوی خوو رەوشتی سـوڵتانەکانی مـەغۆلی بـوو، بـەپێی ئەوە حکومەت وەکوو رەشماڵێکی گەورە وابـووەو دەوڵـەت بریتیبووە لـە بـابی عالی (دەروازەی گەورە یا بەرز) و سەرۆکی وەزیران پێی وتراوە صدری ئەعظم و نوێنەری سوڵتان بووەو هەڵگری مـۆری سـوڵتان شـێخ الاسـلام بـووە کـە پێشـی وتراوە (قاضی العسکر) و لێپرسراوی دارایی پێی وتراوە (دفتردار) .

نوسەری ئەو باسـە بـەدوورودرێژ باسـی کاربەدەسـتانی حکومـەت و ئاغاکـانی ناوخۆ کە پێیان وتراوە (ئەندەرون) بۆ چـاودێریکردنی ژنـانی نـاو کۆشـکەکانی سوڵتان و ئاغاکانی دەرەوەی کۆشکی سوڵتان.

نوسەر لەباسەکەیدا باسی کێشەی ناو کۆشکی سـوڵتانی کـردوەو لـەوەدواوە دەسڕۆیوەکانیان ئەگەر بیانزانیایە سوڵتان زۆر رووئەدا بـەصدری ئـەعظم ئەوانـە گـەلێك شـتیان بـۆ هەڵدەبەسـت بۆئـەوەی نـاوی بزرنێنـن و جـاری واهـەبوە (قاوەچیباشی) و (ئەئوابچیباشی) وبیروقدارە سجادەباشی و باخـەوان باشـی و بلطەچی باشی زۆرتر دەستیان رۆیشتووە لە صدری ئەعظم.

نووسـەر لەلاپـەڕە ١٣٢دا بۆنمونـە باسـی مدحـت پاشـای کـردوە کـە سـاتێك دەکرێ بەصدری ئەعظم، هەمووی سێ مانگی پێ ناچێ لایدەبەن چونکە یەکێك لەخانمەکانی ناوکۆشکی سوڵتان نۆکـەرێکی خـۆی دەنـێرێ بـۆلای مدحـت پاشـا تابیکا بەقائمقام ئەویش داخوازیەکەی قبولّ ناکـا لەبەرئـەوە لادەبـرێ و لـەدوای مدحت پاشا لەماوەی سێ ساڵ و نیودا دەجار صدری ئەعظم دەگۆڕێ و بـەرتیل

و فرۆشتنی روتبەو نیشانە بەپارە ناوی دەوڵەتی زڕاندبوو باری ئابوری و خەزێنەی حکومەت بەتەواوەتی کەوتنە کزیو حکومەت لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٧٥دا اعلانی (افلاس ــ ئابووری) کردوە لە٢٢ ی مایۆی ١٨٧٦دا لەمزگەوتەکانی ئەستەمبوڵدا ٦-٧ هەزار قوتابی کۆبونەوەو چوونە سەر (سەرای دولمە باخچەسی) و لەئەنجامیا (محمود ندیمی) صدری ئەعظم لابراو لەجیاتی ئەو رشید پاشا کرابە سەرۆکی وەزیران.

نوسەری سەرچاوە ٨٨ لەلاپەڕە ١٤دا باسێکی سەیری دەربارەی عبدالحمید بڵاوکردۆتەوە کە وتویەتی:

((ساتێك عبدالحمیدی دوهەم لە ساڵی ١٨٧٦دا بوویە خلیفەی سوڵتان و لەساڵی ١٩٠٩ دا لابرا، ئەو سوڵتانە لەدایکیەوە ئەرمەنی بوو، وەکو ئەوان لووتێکی چەماوەی هەبوو نرخی خوێندەواری و زانیاری نەدەگرت و زمانی تورکیشی زۆر باش نەدەزانی و هەر لەمنداڵیەوە پارە خۆشەویست بووەو زۆر رەزیل بوە بەرلەوەی عبدالحمید ببێت بەسوڵتان، مرادی برای پارە ئەدا بەرۆژنامەی (خیال) بۆئەوەی چیرۆکەکەی ڤۆلتێر بەنێوی (رەزیل) ەوە بکا بەتورکی لەسەرشانۆ پیشانی بدات. کە عبدالحمید دەبێ بەسوڵتان ئەزانێ مرادی برای ئەوەی دژی ئەو کردبوو بۆیە تۆڵەی خۆی لێدەکاتەوە.

عبدالحمید باوەڕی بە فاڵچیو فالگرتنەوە هەبوەو گومانی هەبوە بەرامبەر بەهەموو کەسێك بۆیە دەزگایەکی سیخوڕی دامەزراندبوو. بەو جۆرە ئەو هەموو ستەمکاریەی لە زەمانی عبدالحمیدا بەرامبەر بەزانایان و رۆشنبیران دەکرا، زۆریانی ناچارکرد وڵاتی عوسمانی بەجێ بێڵن و لەدەرەوە دژی حکومەت کاربکەن.

***سێهەم:* داڕزاوی و گەندەڵبوونی دەزگاکانی حکومەت**

وەکو لەباسەکانی پێشودا دێتەبەر چاو دەزگاکانی بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری هەر لە فەرمانبەرێکی بچوکەوە هەتا صدری ئەعظم هەریەکەیان بەشێوەی خۆی هەڵپەی بۆ ئەوە کردوە خۆی و خاوخێزانەکەی تێر بکاو ژیانی رۆژانەیان بۆدابین بکا کە ئەمە باری ژیانی فەرمانبەرە بچوکەکانیان بووە و

فەرمانبەرە گەورەکانیشیان کە بەپارە ئیشەکەی خۆیان دەکڕی بەهەموو جۆرێك خەریکی ڕاووڕووتکردنی میللەت بوون و خەریکی پڕکردنی گیرفانی خۆیان بوون.

بەڵام ئەوەی باری دەوڵەتی عوسمانی قورس کردبوو سوپای دەوڵەت و ئەو ڕیکخراوانەی تر بوون وەکوو سوارەی حمیدیەو هێزی ئەنکشاری (یەنیچەری) کە هەریەکەیان بەشێوەیەك کێشەیەکی گەورەی بۆ وڵات و هاوڵاتیانی عوسمانی پەیدا کردبوو.

بەرلەمە لە باسێکی تایبەتیدا لە سوارەی حمیدیەو لە چۆنیەتی دروست بوونی و لەوزیانانە دواین کەبەهۆی ئەو هێزەوە دروست بوبوو، بۆ تەواوکردنی ئەم باسە حەزمکرد باسێکی هێزی ئەنکشاری یەنیچەریش پێشکەش بکەم بەپێی ئەو سەرچاوانەی لێی دواوین:

هیچ گومان لەوەدانیە تورکەکان، هەر لە عەشایرەکانی غوزەوە بەزنجیرە هەتا عوسمانیەکان کە بوون بەدەوڵەت وەکوو دەوڵەتی سلجوقیەکان و عوسمانیەکان، بەڵام لەرەوشت و رەفتاریانا کە گەیشتنە ئاسیای بچوك (تورکیای ئێستە) هەروەکوو عەشایر هەڵسوکەوتیان کردوەو تاڵانکردن و کوشتارو ڕاووڕووتیان بەشتێکی سروشتی و بەئازایی داناوە، بەڵام پاش ئەوەی لەزەمانی سلجوقیەکان و عوسمانیەکانا خۆیانگرت و بەهێزبوون دەوڵەتیان دامەزراند ئیتر پێویستیان بەبوونی سوپایەکی هەمیشەیی هەبوە.

دەربارەی سەرەتای دامەزراندنی سوپا لەلایەن تورکەکانەوە گۆڤاری هلال سەرچاوە ٨٨ باسی دامەزراندنی سوپاو دامەزراندنی هێزێکی تری کردوە کە پێی وتراوە (ئەنکشاری=یەنیچەری) وتوویەتی:

((دوای ئەوەی (عوسمان) زۆربەی ویلایەتی (بروسە= خداوندکار) ی داگیرکردو (ئورخان) ی کوڕی چووە جێگەی ئۆرخان علاءالدینی برای خۆی کرد بە وەزیرو علاءالدین (جندرلی قەرە خلیل) ی هێنایە پێشەوەو کردی بەسەرکردەی هێزی پیادە کە پێی دەوترا (یایا) بەڵام ترسی ئەوەیان پەیدا کرد ئەو هێزە ڕۆژێك لەرۆژان لێیان هەڵگەڕێتەوە، بۆیە بیریان لەپێك هێنانی هێزی ئەنکشاری کردەوە. زۆربەی سەربازەکانی تورك لەممالیك پێك هاتبوو، هەر لە

منالّیەوە مەشـقیان پێدەکـردن کـە زۆریـەیان لـەتورك و چرکس و رۆم و کـورد و ئەرمەن و تورکمان پێك هاتبوون.

ووشەی ئەنکشاری لە ووشەی (یەنیچـەری) تورکیـەوە وەرگـیراوە کـە مانـای (سەربازی تـازە) دەگرێتـەوە. پـاش ئـەوەی عوسمانیـەکان بـەناوی غـەزای ئیسلامەوە پـەلاماری رۆژهـەلاتی ئـەوروپایان دا، لـە شـەڕەکانا منداڵـی ئـەو کوژراوانەی بەکێش دەکـرد بـۆلای خۆیـان و مەشـقیان پـێ دەکـردن و دەنـێران بۆلای (حاجی بکطاش =بەکتاش) کە شێخی تاقمی بەکتاشەکان بوو، ئەمانە کـە گـەورەکران هێزێکیـان لیٚ دروسـتکرا بـەناوی ئەنکشـاریەوەو لـەزەمانی سـولتان سلیمانی قانونیدا ژمارەیان (١٢) هەزار بووە. (لـەزەمانی سولتان عبدالحمیدی دوهەمدا کە ئەنکشاری هەڵوەشێنرایەوە وەکوو لە شـوێنی خۆیـا باسـی دەکـەین ژمارەی ئەنکشاری گەیشتوە (١٤٠) هەزار سەربان) .

نوسەر دوای ئەوە باسی ئەوە دەکا چۆن ئـەو هـێزە کـە بـوو بەدەسـەلاتدار، دەسـتیانکرد بەدەسـدرێژی کـردن و خراپـەکاری، ئیـتر حکومـەت بـیری لـە هەڵوەشـاندنەوەی کـردەوە تـا لەسـاڵی ١٨٠٨دا بڕیـاری هەڵوەشـانەوەی دراو لەسەرەتادا ئەنکشاریەکان یاخی بوون و کوشتارێکی زۆریان لیٚ کرا لەلایەن هێزی حکومەتەوە)).

دەربـارەی ئـەوهێزەی ئەنکشـاریە، لـە سـەرچاوەیەکی تـردا (ژمـارە ٥٨ بـەدوورودرێژ باسی چۆنیـەتی پێك هـاتنی کـردوەو وتویـەتی جنـدرلی قرەخلیـل ناوەکەی گۆڕراو کرا بە( خیرالدین پاشا) ئەمیش وەکـو باسـەکەی گۆڤـاری هـلال وتویەتی لەدواییدا کەوتنە دەسـدرێژی کـردن و لەسـاڵی ١٨٢٦ دا هەڵوەشـانەوە (کە ئەمە لەگەڵ ئەوەی گۆڤاری هلال دا یەکناگرێتـەوە کـە تـیووی سـاڵی ١٨٠٨ هەڵوەشێنرایەوە ) نووسەری سەرچاوە ٥٨دەڵێ:

(( ئەگەر چی هێزی ئەنکشـاری لـەناو سـوپای عوسمـانیدا گـەلێك کـردەوەی ناڕەواو تاوانێکی زۆری کردبوو، بەلاّم لەراستیدا تاوانەکان هەمووی هەر ناکەوێتە ئەستۆی ئەمانەوە، بـەڵکوو کاربەدەسـتانی عوسمـانی بەرپرسـیاربوون بەرامبـەر بـەوەی نـەیانتوانیبوو هەسـتێکی پـاك لـەناو مێشـك و دڵـی ئەوانـەدا بچێنـن و

بەڕێگەی باشیان ببەن بۆئەوەی رەفتاری خراپە نەکەن، بەڵام بێگومان خۆیان هانیان دابوون و خستبوویاننە سەر ئەو بارە خوارو زیانبەخشە)).

دەربارەی ئەو بۆچونەی سەرچاوەی ژمارە ٥٨ ئەوەی ئەو دەربارەی ئەنکشاری کردوویەتی بەتەواوەتی و پڕ بە پڕ لە تاوانەکانی سوارەی حمیدیەشد بەدی دەکرێ و تاوانەکان نابێ هەمووی هەر بخرێتە ئەستۆی ئەو هێزی سوارەوە بەڵکوو کار بەدەستانی عوسمانی کە بەنیازێکی ناپاك ئەم هێزەیان دروستکردبوو بە تاوانباری سەرەکی دەژمێردرێن و کەچی هەمیشە تورکەکان هەوڵیاندلوە خۆیانی لێ دوور بخەنەوەو پاکانەیان بۆ خۆیان کردوە.

**پوارەم: دەستێوەردانی دەوڵەتان لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانیدا**

ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی عوسمانی، بەتورکیاو بەمیسوپۆتامیاو ناوچەکانی تری خاکی عەرەبەوە کە لەژێر دەسەلاتی تورکدا بوون، ئەمانە هەمووی پڕ پیت و بەرەکەت بوون، بەڵام نەشارەزایی کاربەدەستانی عوسمانی لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو وڵاتانەدا کارێکی وای کردبوو میللەتانی ئەو وڵاتانە هەمیشە برسیو دواکەوتوو بن و سوود لەو هەموو سامانانە وەرنەگیرێ کە لەوڵاتەکانیان هەبوە.

وڵاتانی سەرمایەداری رۆژئاوا کە ماوەیەکی زۆربوو گەلێك زانیارییان دەربارەی ئەو وڵاتانە کۆربیوەوە شارەزای سامانەکان بوون و لەمێژ بووە نەخشەی ئەوەیان کێشابوو دەست بگرن بەسەریاو، باری گرانی ئابوری دەوڵەتی عوسمانی و هەموو قەرزە زۆرەی بەهۆی ئەو شەڕە خۆڕاییانەی خۆیان پێوە تووش کردبوو لە وڵاتانی رۆژهەلاتی ئەورووپادا کارێکی وای کردبوو تورکەکانی عوسمانی سەرومڕ خۆیان دابەدەستەوەو باری ئابووری وڵاتیان خستە ژێر رەحمەتی ئەو دەوڵەتانەوەو، ساتێك کێشەی نێوان ئەڵمانەکان لەلایەك و روسیاو بریتانیاش لەلایەکی ترەوە پەیدا بوو، تاقمی أتحادوترقی تورکیایان خستە گێژاوێکی ترسناکەوەو بوون بەهاوکاری ئەڵمانەکان دژی روس و بریتانیاو فرنسەو ئەو شەڕە خۆڕاییە ئەوەندەی تر حکومەتی عوسمانی بەقوڕا بردو شەڕەکەی دۆڕان و ئیمپراتۆریەتەکەی هەڵوەشێنرایەوە وەکوو لەباسەکانی شەڕی جیهانیدا روون دەبێتەوە.

## بەشی شانزەهەم

# ژۆن تورك و أتحادوترقی و بزوتنەوەی طورانیێتی

## ( پان تورکیزم )

دەربارەی ژۆن تورك و اتحادوترقی كە دوو رێكخراوی تورك بوون، لەكۆتایی سەدەی نۆزدە بەدواوە یەك لەدوای یەك هەوڵی ئەوەیان دابوو دەست بەسەر كاروباری وڵاتی عوسمانیدا بگرن، گەلێك سەرچاوە باسیانكردوە.

لەلاپەرە ١٣٣ی گۆڤاری هلال، سەرچاوە ٨٨ بەدورودرێژ باسی سەرەتای ئەنجامی چالاكیی رێكخراوی ژۆن توركی كردوە كە لەرۆژی ١٧ی جمادی الاولی ١٢٩٣ ی كۆچی بەرامبەر ٣٠ی مایۆی ١٨٧٦ سوڵتان عبدالعزیزیان لابردو مرادخانی برازای خرایە جێگەی بەڵام زۆری پێ نەچوو سوڵتان مراد لابراو عبدالحمیدی دوهەمی برای كرا بەسوڵتان

بۆ روونكردنەوەی ئەم باسە، دەیكەین بەچوار بەشەوە:

**١- چۆنیەتی پێك هێنانی ژۆن تورك و اتحادوترقی.**

**٢- دانانی قانونی ئەساسی و اصلاحاتی دستوری.**

**٣- بەشداربوونی كورد لە چالاكیەكانی ژۆن تورك و اتحادوترقیدا و هۆی بەشداربوونی كورد.**

**٤- پاشگەزبوونەوەی اتحادوترقی لە بەڵێنەكانیان بەرامبەر بە كورد.**

### یەكەم: چۆنیەتی پێك هێنانی ژۆن تورك و اتحادوترقی

بەرلەوەی اتحادوترقی پێك بێت رێكخراوێك بەناوی (ژۆن تورك) لەلایەن مصطفی فاضل پاشای كوڕەرای محمد علی میصریەوە دروست بوو كە بەعوسمانیە ئازادیخوازەكان ناودەبران. ئامانج و پرۆگرامی ئەو تاقمە بریتی

بووه له هەوڵدان بۆ چاکردنی دەستووری زۆریەی ئەندامەکانی لە تورکەکانی نیشتەجێی ئەستەمبوڵ بوون و هەروەکوو گۆڤاری هلال باسیکردوە، جگە لە تورك چرکس و سوری و ئەرمەنیشیان لەگەڵدا بووه کە بەشێك لەوانە قوتابیی ناو قوتابخانە بەرزەکان بوون (بێگومان دامەزرێنەرەکەی کە مصطفی فاضل پاشایە تورك نەبوە) .

سەرچاوە ٨٨دوای ئەوە باسی چۆنیەتی پێك هاتنی اتحادوترقی کردوەو ئەڵێ:

((لەساڵی ١٨٩٤بەدواوە ئازادیخوازەکان کەوتنە جمو جۆڵو دەربڕینی بێزاری بەرامبەر کارە نارەواکانی کاربەدەستانی حکومەت و زۆربەی ئەو ئازادیخوازانە لە قوتابیانی قوتابخانە بەرزەکان بوون کە چواریان قوتابی کولیەی پزیشك بوون: ئیسحاق سکوتی خەڵکی دیاربکر (گۆڤارەکە وتویەتی ئیسحاق سکوتی لە ئۆکتۆبەری ١٩٠٨دا کۆچی دوایی کردوە) ، عبدالله جودت کە دوکتۆری چاوی بەناوبانگە لە قاهرە (هەردوکیان کورد بوون) و حکمت ئەمینی خەڵکی قونیە و محمد رشید چرکس کە خەڵکی ققفاس بووە ئەمانە لەسەرەتادا بڕیاریاندا کۆمەڵێکی نهێنی پێك بێنن بەناوی اتحادو ترقیەوە بە مەرجێك بناغەی دروست بوونی و مەبەستە گرنگەکانی بریتی بێ لە چاککردنی دەستورو هەموو دانیشتوانی وڵاتی عوسمانی یەکسان بن و هەمویان ئازادبن لە دەربڕینی بیروباوەڕو ئیشکردن و دانانی سنورێك بۆ دەسەڵاتی سوڵتان لەیاسا لانەدا.

ئەورێکخراوە رۆژ لەدوای رۆژ لەپەرەسەندندا بووەو پرۆگرام و مەرجیش دانرابوو بۆ ئەندامێتی کە لەهی (ماسۆنی) یەکان دەچوو، دەبوایە هیچ ئەندامێك لە ئەندامێکی تر بەوەلاوە کەسی تری ناورێکخراوەکە نەناسێت و رێکخراوەکە لەپێشدا لەئەستەمبوڵ دامەزراو لە دواییدا گوێزرایەوە بۆ (سالانیك) و هەر ئەندامە ژمارەی تایبەتی خۆی هەبوەو ئەوەی دەبوو بەئەندام دەبوایە بەقورئان یا بەئینجیل سوێندی بخواردایەو پێویست بو ئەوەی سوێندی دەخوارد بەدەمانچەیەك و بەتبدیلی قیافەت بچوایە بۆ سوێند خواردن و بۆ یەکەم جار (حاجی ئەحمەد ئەفەندی لەساڵی ١٨٩٦دا هەڵبژێررا بۆ سەرۆکایەتی کە

ەرمانبەرێکی گەورە بوو لە دەوڵەتدا و لقەکانی اتحادوترقی لەئەستەمبول و
ـالانێك لە بیروت و شام و رووس و میصردا هەبوە.

ـرادبەگی داغستانی یەکێك بوو لە ئەندامە بەناوبانگەکانی ئەو کۆمەڵە کە
ـۆژنامەی (میزان) ی دەرکرد. لەپاش ماوەیەك حکومەت حاجی ئەحمەد
ئەفەندی ئاوارە کرد بۆ طرابلس و لەوێ مردو ئەحمەد رضا کە ئەندامێکی
چالاکیان بوو رای کرد بۆ پاریس و لەوێ رۆژنامەی (مشورەت) ی دەرکرد.

ۆری پێ نەچوو چالاکی کومەڵەکە کەوتە کزی و مانەوە سەر (ئیسحاق
سکوتی) و عبدالله جودت (کە هەردوکیان کوردبوون) و لەجنێف رۆژنامەی
عوسمانلی) یان دەرکردو لەدواییدا گواستیانەوە بۆ (فۆلکستۆن ـ لەبریتانیا) .

ئەو کۆمەڵە هەروا بەکزی مایەوە تا ئەوکاتەی (داماد محمودپاشا) ی زاوای
سوڵتان رقی لە حکومەت هەڵساو ئەستەمبوڵی بەجێ هێشت و خۆیو (صباح
لدین) و (لطف الله) ی کوڕی لە مانگی دیسمبری ساڵی ۱۸۹۹ دا بەپاپۆڕ چونە
(مارسیلیا) ولەوێوە بۆ پاریس و لەوێ بڕیاری بووژانەوەی اتحادوترقییان دا
لەدوای مردنی دامادمحمود لە ینایری ۱۹۰۲دا صباح الدین کوڕی چووە جێگەی و
(٤٧) کەسی رۆشنبیری ئەو رۆژانەی کۆکردەوە کە تێکەڵبوون لەتورك و عەرەب
و یۆنانی و کورد و ئەلبانی و چرکس و یەهودی و ئەرمەنی لەو کۆبوونەوەیەدا
صباح الدین داوای لێکردن بێ جیاوازیی رەگەزو ئاین پێکەوە کاربکەن و صباح
الدین پرۆگرامێکی ئامادەکرد بۆ دوارۆژی وڵات بەپێی ئەوە ویلایەتەکان
هەریەکەیان سەربەخۆیی ناوخۆییان دەبوو بەڵام بەمەرجێك لەژێر ئالای
عوسمانیدا بن و پرۆگرامەکە بریتی بووە لە:

**١ـ بڵاوکردنەوەی زانیاری و ئەدەب و هاندانی خەڵك بۆ خوێندن و فێرکردن و شارەزابوون لەچۆنیەتی بەرێوەبردنی کاروباری سەربەخۆیی لەناوخۆدا.**

**٢ـ بەهێزکردنی برایەتی و دۆستایەتی لەنێوان هەموو دانیشتوان بێ جیاوازی ئاین و رەگەز.**

**٣ـ پاراستنی سوودو مافەکانی دەوڵەت.**

**٤ـ پێکهێنانی رێکخراوو کۆمەڵی نیشتمانی و کۆمپانیا بەسەرپەرشتی و رێگرتن لە دەستدرێژیی زۆرداران و بەرزکردنەوەی ئالای حەق.**

لەساڵی ١٩٠٦دا أتحادوترقی ڕۆژنامەی (ترقـی) دەرکـردو ژمارەیـەکی زۆر لـە ڕۆشنبیران و نوسەران بوون بەلایەنگری صباح الدین وەکـو طلعت بـەگ، مدحـت بـەگ و توانـرا فەیلـەقی دوو وسـێ ی سـوپا لـە سـالانیك بکـرێ بەلایـەنگری اتحادوترقی.

نووسەری سەرچاوە ٤٦ لەلاپەڕە ٦٢یدا باسی تێکچونی اتحادو ترقـی کـردوە لەناوخۆیدا و بوون بەدووتاقمەوە. تاقمی یەکەم( ئەحمەد رضابەگ) سـەرکردەی بوو کە بریتی بوون لەتاقمەکەی ژۆن تورك و ئەمانە سـوور بـوون لەسـەر ئـەوەی ئـەبێ دەسـەڵات هـەمووی بـەدەس مرکـەزەوە بـێ (مەبەسـت ئەسـتەمبوڵ) و کاربەدەستان بەرەگـەز تـورك بن، وتـاقمی دوهـەم بەشـی زۆری لایـەنگرەکانی ئەرمەنی بوون و داوای بوونی حکومەتێکی ناوچـەییان دەکرد بۆخۆیـان. بـەپێی مادە ٦١ ی پەیمانی برلین کە ئەو بڕیارەی دابوو بۆ ئەرمەنیەکان بەمەرجێك ئـەو داخوازیـە کـوردو چرکەسیش بگرێتـەوە. بـەو جـۆرە تاقمەکـەی ئەحمـەد رەزا دەیانویست هەموو نەتەوەکانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی لە بۆتـەی نەتـەوەی تورکدا بتوێنرێتەوە.

دەربـارەی ئـەو دروشمانـەی اتحـادوترقی لەسـەرەتادا بـەرزیان کردبـوەوە، سەرچاوەی ژمارە ٨٥ Patrik Kinross باسی ئەوەی کردوە ئەو دروشمانـە لـە شۆڕشەکانی فرەنسەوە وەرگیرابوو کە بریتیبوو لـە: یەکسـانی و برایـەتی بـەڵام لەراسـتیدا ناوەڕۆکەکـەی هـەمووی عوسمـانچێتی و هـەندێ شـتی ڕۆاڵەتیشـیان بەسودی کریستیانەکان بڵاوکردبوەوە.

سەرچاوەی ژمارە ٤٦ باسی ئـەوەی کـردوە بەرامبـەر بـەو تاقمـەی ئەحمـەد رەزا تاقمێکی تریش بەسەرۆکایەتی صباح الدیـن کۆمـەڵێکیان دامـەزران بـەناوی (تشبث شخصی و عدم مرکز جمعیتی) یان پێکەوە نا (مەبەست لامرکـزی بـووە) لەناو ئەوانەدا: ئەحمەد فضلی کرا بەسکرتێری گشـتی و ئیسـماعیل کمـال بـەگی ئـەلبانی و دوکتـۆر نـهاد رشـاد، دوکتـۆر رفعـت، مـیر ئـالای نـامق زکـی و چـەند کەسێکی تری تیادا بوو، ساڵی ١٩٠٦ لقێکیان لە طرابـزون و ئـەرزڕۆم کـردەوە و لقێکیش لەشام و لانقیة وە هەموو لقەکان بەسران بەلقی سـەرەکیەوەو ئەوانـەی ئەسـتەمبوڵ کۆمـەڵێکیان دانـا بـەناوی (انقـلاب جمعیتـی) کـە پرۆگرامەکـەیان

هــەروەکوو (T. z. tunay لەکتێبەکــەیدا Turkiycde Syasi Portilar لەلاپەڕەکانی ١٤١-١٤٣دا باسی کردوە وەکو خوارەوە بووە:

((بۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری ویلایەتــەکان لەلایــەن ئەنجومــەنی شــارەوانی ویلایەتەکانەوە پێویستە ئەو ئەنجومەنە ئەندامەکانی بەدەنگی نەهێنی هەڵبژێرن و هەرناوچەیـە دارایـی تایبـەتی خۆی هـەبێ لەسنوری ئــەو دەسـەڵاتەدا بـۆی دادەنرێ، جگەلـەوە نوێنـەری ئەنجومـەنی شارەوانیەکان دەبێ بەشـدارین لــە مجلسی مبعوثانی پایتەختدا و هــەر ویلایەتـە جندرمـەی تایبـەتی خـۆی دەبـێ و ئـەبێ والی و متصرفــەکان و ســەرۆکی دارایــی (دفــتردار) و ســەرۆکی دادگــا (دفترحقانی مدیرلری) و سەرۆکی دادگاکان لەلایەن حکومەتی مرکزیەوە دابـنرێن و فەرمانبەران و کارگوزارانی تری ویلایەتـەکان بـەپێی پێویسـت لـە دانیشـتوانی ویلایەتەکان دابنرێن)) .

تاقمەکـەی (ئەحمـەد رضـا) پرنـس صبــاح الدینیــان بــەوە تاوانبــارکردبوو ئامادەبووە داخوازیە ئەرمەنیەکان بەجێ بێنێت.

نوسەری سەرچاوە ٤٦باسی کۆمەڵێکی تری کردوە بەناوی (عوسمانلی حریت جمعیتـی) ئەندامـەکانی بریتـی بـوون لــە جمــال بــەگ (ئــەو جمــال بەگــە لای عەرەبەکان بەجمال السفاح ناسراوبووە) وطلعت بەگ، مدحـت بـەگ و چـەند کـە سێکی تر وەکوو رحمان بەگ و یوزباشی عمر نــاجی و ئیسـماعیل خـانبولاد (کـە لام وایە ناوەکە جانبولاـ جمبولات بێ) .

لەساڵی ١٩٠٧ دا تاقمی (عوسمانلی حریت جمعیتی) لەگەڵ جمعیتی اتحـادی عوسمانیدا یەکیان گـرت کـە ئەمـەی دوایـی چـوار قوتـابیی کلیـەی طـب پێکیـان هێنابوو بەسەرکردایەتی (ئیبراهیم تمو) کە ئەلبانی بووە.

سەرچاوەی ٨٩ لەلاپەڕە ١١٤ دا باسی رێکخراوێکی تری کردوە لەساڵی ١٩٠٦ دا لەلایەن یوزباشی (مصطفی کمال) ـەوە پێکـهاتبوو کـە لەگـەڵ تـاقمی اتحـادو ترقیدا بوون بەیەك.

پاش ماوەیەك أتحــادوترقی صبـاح الدینیـان ناچـار کـرد واز لەرێکخراوەکـەی خۆی بێنێت و بایدایەوە بەلای اتحادیەکاناو لەو لامەرکە زیەتیەی خۆی پەشیمان بوەوەو لەساڵی ١٩٠٨ دا (جمعت لامرکزی ونشیت مشـخصی) هەڵوەشـێنرایەوەو

ئەوانەی لەناو اتحادوترقیدا بەرەگەز تورك نەبون وردە وردە خۆیان کێشـایەوە و سەرگەرمەکانی اتحادوترقی مەبەستەکانی خۆیـان ئاشـکراکردو یـەکێکی وەکـوو (حسین جاهید) کە تورکێکی زۆر رەگەزپەرست بوو باسـێکی بلاوکـردەوەو تیایـا ووتبوی: ئەبێ ئومەتی تـورك هـەتا هەتایە هەرئـەو دەسـەلاتداربێت و پێویستە ئیمتیازێکی تایبەتی هەبێ بۆ ئەوانەی بەرەگـەز تورکـن و هـەروەکوو پـەیامنێری (D, orienc) لـەراپۆرتی ژمـارە ٧ی سـالی ١٩٠٩ لـەمانگی کـانونی دوهـەمدا لەلاپەرە ٢١٩دا باسی کردوە، ئەو تاقمە وتویانە پێویستە دەستور تەنها لەلایەن ئەوانەوە دابڕێژرێت کە بەرەگەز تورکن.

بـەوجۆرە ئەوانـەی تـورك نـەبوون بەتـەواوەتی لـەرەفتارو مەبەسـتەکانی اتحـادوترقی بـێزاربوون. نوسـەری هـەمان سـەرچاوە باسـی لیژنـەی مرکـزی اتحادوترقی کردوە کە ئەندامەکانی هەشت کەس بوون بەسەرکردایەتی ئەحمەد رضا بەگ و هەموویان بەرەگەز تورك بوون)) .

ئەوەی سەرنج راکێشەرە دەربارەی اتحادوترقی، ئەوەیە هەرچەند پرۆگـرام و سیاسەتەکەیان بەرووکەش بریتی بووە لەتورکچێتی، بـەلام لەراسـتیدا لـەژێرەوە دەستێك هەبوە نەخشەیەکی دوورودرێژی بۆ بەڕێوەبـەرانی اتحـادوترقی کێشـابوو کە هەندێ سـەرچاوە لـەو روەوە ئاماژەیـان بـۆ زایۆنـیزم و ماسـۆنی کـردوە کـە هـەردولایان تـاقمی اتحادوترقییـان بـە تاقـەهێزێکی بـەتوانا هـەلبژاردبوو بتوانـن مەبەستەکانی خۆیان لەڕێگەی ئەو رێکخراوەوە بەجێ بێنـن کـە بریتـی بـووە لـە هەلوەشانەوەی خلافەتی ئیسلامی.

بۆنمونە: عبدالعزیز یـامولکی لەیاداشتەکانیا سـەرچاوە ٦٧دا باسـی چـالاکی جوولەکـەکانی ئـەو رۆژانـەی کـردوە چـۆن چـالاك بـون لەبلاوکردنـەوەی نوسـینەکانیانا بـۆ لایـەنگرێتی اتحـادوترقی کـە لەرۆژنامـەی (طنـین) ی حسـین جاهددا بلاویان دەکردەوە

عزیز یامولکی لەیاداشتەکانیا باسی رۆژنامەی (طنـین) و (صبـاح) و (شـورای ئومـەت) ی کـردوە کـە سـەربە اتحادیـەکان بـوون و رۆژنامـەی واش هـەبوە دژی بۆچوونەکانی نوسەرانی ئەوسێ رۆژنامەیە بوون وەکوو رۆژنامـەی (سەربەسـتی. ولقان، میزان، ئیقدام، یەنی غەزەتە)

سەرچاوەی ٤٦ بێجگە لەو ڕێکخراوە کۆمەڵە تورکیانە، لەلاپەڕە ٢٧٥یدا ناوی ئەم ڕێکخراوەشی هێناوە: لەنێوان ساڵی ١٩٠٨-١٩١١دا (تورك درنكی= یەعنی کومەڵگای تورکی ــ لە٥ ١٢ ٩٠٨ دا پێك هاتبوو) ، (تورك یورتی جمعیتی= کۆمەڵی نیشتمانی تورك لە ٣١ ٨ ١٩١١دا پێك هاتبوو) ، ) تورك ئوجاغی= هاوولاتیی تورك ــ لە٣ ٧ ١٩١١دا دروست بوبوو.

سریا بدرخان لەلاپەڕە ١٧ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٧٩ لەباسی ئامانج و مەبەستەکانی ژۆن تورك دا وتویەتی:

((ژۆن تورك کە) ئێستە بوون بەکما لیست دوای ئەوەی لەساڵی ١٩٠٨دا بوون بەدەسەڵاتدار بیریان لەوە کردبوەوە پێوەندیەکی بەهێز پەیدا بکەن لەگەڵ طورانیزمەکانی ئەولای دەریای قزوین و ناوچەکانی ناوەڕاستی ئاسیا بۆ بەهێزکردنی (پان طورانیزم) و هەندێ لە نووسەران لایان وایە ژۆن تورك واتحادوترقی هەر لەسەرەتای دامەزراندنیانەوە پێوەندییان هەبوە لەگەڵ ماسونیەکان و ڕێکخراوەکەیان پێڕەوی ماسۆنیەکانیان کردوە لەکاروباریا)).

دەربارەی ئەو بۆچوونەی سریابدرخان، سعید ئەحمەد برجاوی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٨٢ وتوویەتی:

تاقمی اتحادوترقی پێوەندیان بەهێز بووە لەگەڵ ماسۆنیەکان کە بنکەیەکیان لە (سالانیك) دا هەبوە هەروەها (Patrich Kinros) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە ٨٥ چاپی لندن ١٩٩٥ باسی چالاکی مصطفی کمالی کردوە لە سالانیك و پێوەندییەکی بەهێز هەبوە لەنێوان اتحادوترقیو ماسۆنیەکانا لە سالانیك و لە باسی پرۆگرامی اتحادیەکانا وتویەتی ئەوانەی دەبون بەئەندام هەروەکوو ناو ڕێکخراویکی ماسۆنیەکان ئەبوایە سوێندیان بەقورئان و شیر بخواردایە و چاویان دەبەستنەوە (لەهەندێ سەرچاوەی تردا وەکوو باسمان کردون وتویانە سوێندیان بەقورئان و ئینجیل دەخوارد) و ئەنداماں دەبوایە هەموو زانیاریەکانیان دەربارەی ڕێکخراوەکەیان نەهێنی بێ و هەموو بڕیارەکانی بەجێ بێنن و هەرکەس دژی بێ دەبێ بکوژرێ)) لێرەدا نوسەری سەرچاوە ٨٥ دەپرسێ و دەڵێ:

((تۆ بڵێی مصطفی‌کمال کاتی خۆی که کرابوو بەئەندام و سوێندی خواردبوو ئایا ئەو مەراسیمی سوێند خواردنەی بەدڵ بوویێ و سوێندی بەقورئان خواردبێت؟

(له بەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا، له باسی کمالیەکانا که باسێکی تایبەتیم بۆ مصطفی کمال تەرخانکردوە باسی ئەوە دەکرێ چۆن مصطفی کمال بەر لە مردنی رای سپاردبوو نابێ بەپێی مراسیمی ئیسلامی بنێژرێت و نابێ تەلقین بدرێ که هەندێ سەرچاوە ئەمەیان وەکوو بەڵگەیەك لاوابووە که مصطفی کمال ماسۆنی بووە) .

بۆزۆرتر روونکردنەوەی رەگ و ریشەی پێوەندی اتحادوترقی و ژۆن تورك کە لەدواییدا کمالیەکان جێگەیان گرتەوە، بەپێویستم زانی زۆرتر بچمە بنج و بناوانی اتحادوترقی و لەورووەوە نوسەری سەرچاوە ٤٠ لەلاپەرە ٢٧٤ی گۆڤاری کۆڕی زانیاریدا دەربارەی چونێتی دروست بوونی اتحادوترقی باسی کتێبی (دوکتور. أ. رامزرو) ی کردوە چاپی ساڵی ١٩٠٨ لەوەدا ئەو نوسەرە وتویەتی: ماسۆنی رۆڵێکی زۆر گەورەی بینیوە لە دامەزراندنی اتحادوترقی‌دا و هاندەرێکی بەهێز بوە لەدامەزراندنی کە لەسەر شێوەی (کاربۆناری) ئیتاڵی پێك هاتووە و دامەزرێنەری ئەو رێکخراوە (ئیبراهیم تمۆ) بوە (لەهەندێ سەرچاوەدا وتراوە حاجی ئەحمەد ئەفەندی سەرۆکی بوە بۆ یەکەم جار) .

ئیبراهیم تمۆ کە ئەلبانی بووە، ماوەیەك لە شاری (برندیزی) ی ئیتاڵیا ماوەتەوە ولە رێگەی گەڕانەوەیا بۆ ئەلبانیا ماوەیەکیش لە شاری (ناپۆلی) ماوەتەوەو لەوێ سەری لە (مەحفەلی ماسۆنی) یەکان داوەو پێوەندی لەگەڵا کردون و زۆر شتیان لێوە فێر بووە (بەرلەمە باسی ئیبراهیم تمۆ کراوە کە قوتابی کلیەی طب بووەو لەدامەزرێنەرانی ئەو رێکخراوە بووە) .

دەربارەی پێوەندی نێوان ژۆن تورك و اتحادوترقی لەگەڵ زایۆنیزمدا، بەراوردکردنی هەڵوێستی تورکەکان بەرامبەر بەجوولەکەکانی ئەو سەردەمەی ناو ولاتی عوسمانی کە بەهیچ جۆرێك تووشی هیچ زیانێك نەبوون بەپێچەوانەی ئەوانەی سەریە ئاینی کریستیان بوون وەکوو ئەرمەنی و ئاسوری ئاشکرای دەکا

بەخۆڕایی نەبوە تورکەکان بەرامبەر جولەکە بێدەنگ بوون لەکاتێکدا ئەو هەموو تاوانانەی بەرامبەر بەئەرمەنی و ئاسوری کردبوو.

بۆزیاتر روونکردنەوە، دوکتور قیس جواد العزاوی لەلاپەرە ١٢٧ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٤٨ باسی نووسەرێکی جوولەکەی کردوە (ئەرمینوس فامیری) کە خۆی کردبوو بەدەروێشێك و جلی دەروێشی پۆشیبوو بەناوەراستی ئاسیادا (کە دانیشتوانی تورك بوون) گەڕاوەو کتێبێکی بەناوی (دەروێشێکی گەنج لەئاسیای ناوەڕاستدا) چاپی کردوەو وتویەتی پێویستە تورك بەناوی ( پان توکیزم) ــەوە یەك بگرن و هەرلەدەریای ئیجەوە هەتا سنوری چین بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە چونکە ئیسلام کۆسپێکی گەورەیە لەڕێگەی یەکگرتنی هەموو تورکدا و ڕێگە لەپیشکەوتنیان دەگرێ و رێگەی ئەوە نادا تورك دەسەڵاتێکی بەهێزی هەبێ و بۆئەوە پێویستە خۆیان لە ئاینی ئیسلام دوور بخەنەوە و رێبازی نەتەوایەتی بگرنە بەر. نووسەر ئەڵێ: ئەو کتێبە کارێکی زۆری کردبووە سەر چەند کەسێکی وەکوو (کوك ئەلب ـ کە مەبەستی ضیاء کوك ئەلپە) و (یوسف ئەقشور) و (ئەحمەدغایف) و خالید خانم.

لەراستیدا ئەو کتێبە ناوەڕۆکەکەی لەناو تورکە رەگەز پەرستەکانا، بەتایبەتی ئەوانەیان لە دەرەوەی وڵاتا چالاك بوون بوو بەپرۆگرام و پێڕەوی نەتەوایەتییان و بەرلە مشروطیەی ساڵی ١٩٠٨ لە رۆژنامەکانیانا لەسەر ئەو کتێبەیان دەنووسی و ناوەرۆکەکەیان بلأودەکردەوە.

نووسەر ئەڵێ: بێجگە لە تورکەکان، ئینگلیزەکانیش ئەو کتێبەی (ئەرمینوس فامیری) یان قوستەوەو بەدڵیان بوو بۆئەوەی تورکەکان بەهێز بن و هەستی تورکەکانی ناوەڕاستی ئاسیا دژی روسیا ببزوێنن و رێگە نەدەن روسیای قیصری لەوناوچانەدا دەسەڵاتی هەبێ.

نووسەری سەرچاوە ٤٨ باسی نووسەرێکی تری فرنسی کردوە کە جوولەکە بووە( مسیۆلیۆن کۆهین) ، کە لەساڵی ١٨٩٦ دا کتێبێکی دەربارەی رەگەزی تورك لە منگۆلیا دەرکردوەو بەدوورودرێژ ستایشی تورکی کردوەو بەهیچ جۆرێك بەلای باسی تاوانەکانی تورکدا نەچوە (مەبەستی جەنگیزخان و هۆلاکۆو تەیموری لەنگ) جمعیتی زانیاری فرنسە ئەو کتێبەی وەرگێڕاوە بۆسەر زمانی

تورکی و ناوەڕۆکی ئەو کتێبە زۆر بەنرخ بووە لای ئەندامانی اتحادوترقی و نەخشەی جوولانەوەکەیان بەپێی نەخشەو باسەکانی ئەو کتێبە کێشاوەو کاریان پێکردوە.

بەوجۆرە دەردەکەوێ تەقەلاو تێکۆشانی تورکەکانی اتحادوترقی بۆ بووژاندنەوەی رەگەزی طورانێتی و یاساکانی (مەغۆل) و (هون) بریتی بووە لەرەنگدانەوەی تەقەلا ئەثنولۆجیەکانی ئەورووپای رۆژئاوا کە زاناو نووسەرە جوولەکەکانی ناو فرنسەو روسیا رۆڵێکی زۆر کاریگەریان هەبوە لەوەداو وایان خستبووە مێشکی تورکەکانەوە هەتا تورك خۆی لەئاینی ئیسلام دوور نەخاتەوە نابێ بەخاوەن دەسەلاتێکی تەواوو لەوساوە تورك بووە بەئیسلام ئەو هەل و دەرفەتەی لەدەس داوە.

نووسەری سەرچاوە ٤٨ باسی چەند شاعیرو نووسەرێکی تورکی کردوە وەکو (نامق کمال) و (عبدالحق حامد) کە ئەو کتێبەی فامیری بوبوو بەسەرچاوەی بیرو هەست و هۆشیان و وایان لێ هاتبوو هێرشیان دەبردە سەر هەر ووشەیەکی ئیسلامی و عەرەبی کە تێکەڵ بو بوو بەزمانی تورکی.

ساتێك بزوتنەوەی طورانێتی لەناوروسیادا پەیدابوو کە لەسەرەتادا لەکەناری روباری (ڤۆلگا) لەناو تاتارەکانا لەساڵی ١٨٩٥ دا لەشارەکانی (قازان) و (ئوستراخان) دا کەوتبوونە جوولەو هەوڵی ئەو بزوتنەوە طورانێتیە گەیشتبووە گوێی تورکەکانی ئەستەمبوڵ، یەکێکی وەکو (یوسف ئەقشور) بەنوسین دەستیکردبوو بەرەخنەگرتن لەحکومەتی عوسمانی بەتاوانی ئەوەی بایەخی رەگەزی تورکی پشت گوێ خستبوو.

نووسەری سەرچاوە ٤٨ ئەڵێ:

ئەوتاتارانەی بەکۆچکردن چووبونە ناو خاکی روسیاوە (وەکو چۆن تورکەکانی تر روویانکردبووە ئاسیای بچوك) ، لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی روسیا لەساڵی ١٩٠٤ دا و هی اصلاحاتی دەستوری ئێران ساڵی ١٩٠٥-١٩٠٦ وەاصلاحاتی دەستوری عوسمانی لەساڵی ١٩٠٨دا ئەمانە هەمووی بووە هۆی جموجۆڵی بزوتنەوەی تاتارەکانی روسیا وجموجۆڵی ئەمانەش کاری کردبووە سەر ژۆن تورك و اتحادو ترقی و بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکوو کاریەدەستان و

فەرمانبەرانی حکومەتیش ترسیان شکاو چونە ئەو رێکخراوانەوە.نوسەری سەرچاوە ٤٨ باسی ئەوەی کردوە بەرلە دەسپێکرنی شەڕی جیهانی تاقمی (حریەو ائتلاف) پێك هاتبوو بەڵام لە ١٣ ١ ١٩١٣ اتحادیەکان ئەو رێکخراوەی کە حکومەتی لێ پێکهێنرابوو ناچاری کرد واز لەکاربێنێت و اتحادیەکان خۆیان رێکخراوێکیان دامەزران بەناوی (یەنی طوران) و حکومەتێکی تازەیان دامەزراند کە ئامانج و مەبەستەکانی بریتی بووە لە:

**١- ئەبێ تورك وەکوو میللەتێکی جیاوازی تایبەتی حسابی بۆ بکرێت و سەربەخۆیی و دووربێ لەرێبازی ئاینی ئیسلام.**

**٢- گەشە بدات بەگیان و هەستی سەربازێتی لەناو سوپادا.**

**٣- پێوەندیی خۆی بەهێز بکا لەگەڵ تورکە ئیسلامیەکانی ناو ئازربایجان و روسیاو ئەوانەی ئاسیای ناوەراست.**

**٤- پاکژکردنی زمانی تورکی لە ووشەی بیگانە و هەوڵدان بۆ توانەوەی میللەتانی تری ناو وڵاتی عوسمانی لەبۆتەو لەناو کۆمەڵگای تورکدا.**

بەڵام پرۆگرامی لیژنەکانی اتحادوترقی بەم جۆرە بووە:

**١- تورك یوردی (یەعنی مەملەکەتی تورك) دروشمەکەی ئەوەبووە پێویستە بایەخ بدرێ بەئەدەبی تورکی و پاکژ کردنی زمانی تورکی لەووشەی بیگانە و لەجیاتی ئەوانە ووشەی مەغۆلی بەکاربهێنرێت.**

**٢- تورکی رونکی (یەعنی خۆراگرتنی تورك) دروشمەکەی بریتی بووە لەتەقەلادان بۆ بڵاوکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی تورك لەناو ئەوانەی تورك نەبوون لەوڵاتی عوسمانیدا.**

**٣- بایەخدان بەلەش ساغی تورك و بڵاوکردنەوەی گیانی وەرزشی.**

نوسەری سەرچاوە ٤٨ باسی کتیبکی (لوثر. ب) ی کاتبی ئەمریکی کردوە کە وتویەتی:

((بەزۆر خەڵك کردن بەتورك وای لە ژۆن تورك کرد بەوپەڕی بێ عەقڵی و دەمارگیریەوەو بەو پەڕی رەگەزپەرستیەوە رەفتاربکەن کە ئەنجامەکەی بەوە گەیشت نەتەوەکانی تری ژێر سایەی عوسمانی هەموو راپەڕن و ڕوو بەڕوویان بینەوە، بەتایبەتی لەدوای بڵاوکردنەوەی چەند کتێبێك وەکوو کتیبی (تورك

یوردی= مەملەکەتی تـورك) و (تـورك قلیجـی = شمشێری تـورك) و چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ژیانی تەیموری لەنگ و هۆلاکۆو جەنگیزخان بـەهاندان و چـەلاکیی ژۆن تورك.

*دوهەم*: **اصلاحاتی دەستوری**

لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، بەرەڵڵایی و بێ یاسایی لە وڵاتـی عوسمـانیدا گەیشتبووە رادەیەك خەڵك لەوە زیاتر نەیاندەتوانی بەرامبەر بەرەفتاری سوڵتان و کاربەدەسـتانی عوسمـانی بێدەنـگ بـن و لەهـەموو لایەکـەوە دەنگـی بـێزاری بەرزبوەوە کە دانانی دەستورێك بۆ وڵات بوبووە داخوازیی زۆربەی روناکبـیران و رۆشنبیران و ژۆن تورك و اتحادوترقی ئەوەیان بەهەل زانی و نەبوونی دەستورێك بـۆ پـێرەوکردنی و بۆدانـانی سـنورێك بۆکاربەدەسـتانی وڵات و بـۆ سـوڵتان بەتایبەتی کرابە داخـوازی سـەرەکی و دەسکرا بەبڵاوکردنـەوەی بانگـەوازێك بۆ دانانی دەستورو چاکردنی باری وڵات و لەئەنجامدا لەساڵی ١٩٠٨دا توانرا سولتان ناچاربکرێ فـەرمانی بـەجێ هێنـانی ئـەو دەسـتورەی مـۆر کـرد کـە سـوڵتان عبدالحمیـد خـۆی لەسـاڵی ١٨٧٦دا دەری کردبـوو بـەلأم رێگـەی نـەدابوو بەکاربهێنرێت بـەو جـۆرە ئـەتوانرێ بوتـرێ دەسـتورو اصلاحـاتی دەسـتوری لەسەرەتاوە بەچەند قۆناغێکدا رۆیشتووە تا ساڵی ١٩٠٨.

میللەتی کوردیش وەکوو بەشێك لە هاووڵاتیانی عوسمانی بێزاربووە بەرامبـەر بـەو بـەرەڵڵایی و بێیاسـاییەی نـاو وڵات و ئـەویش وەکـوو رۆشـنبیرانی تـری میللـەتانی عوسمـانی حـەزی بـەبوونی یاسـایەك کـردوە هـەتا لەسـایەیدا لـە ناوچەکانی خۆیدا لەژێر سایەی یاسایەکدا بژی کە هەموو هاووڵاتیـان بـەپێی ئـەو یاسـایە وەکـوو یـەك بژیـن و هـەمان مافیـان هـەبێت و ژۆن تـورك و تـاقمی اتحادوترەقی لەسەرەتادا خۆیان وا دەرخستبوو ئامادەن ئەو دەسـتورە بـۆ وڵات دابنرێ و وەکوو یەك سەیری هەموو دانیشتوان بکەن بێ جیاوازی رەگەزو ئاین و کورد بۆ گەیشتن بەو مەبەستە چووە ناو ریزەکانی تاقمی اتحادو ترەقیەوە.

دەربـارەی اصلاحـاتی دەسـتوری وامـان بـەباش زانـی باسـەکەی بکـەین بەدووبەشەوە: بەشی یەکەم بریتـی بـێ لـەو تەقەلایانـەی درابـوو بـۆ اصلاحـاتی

دەستوری و چۆنێتـی سـەرگرتنی و مۆرکردنـی، بەشـی دوهـەم باسـی نـاوەڕۆکی مادەکانی اصلاحاتی دەستوری.

دەربارەی بەشی یەکەم، گۆڤاری هلالی سـاڵی ١٩٠٨ بـەرگی دوهـەمی مـانگی نۆفەمبەر وتوویەتی:

((لەزەمانی سولتان عبدالحمید خاندا (مەبەست عبدالحمیدی یەکەم بـووە کـە لەسـاڵی ١٨٣٩ دا سـوڵتان بــووە) ناچـارکرا بڕیـاری بەجێـهێنانی دانـانی دەستوریکات و لەمانگی تەموزی ١٨٣٩دا ساتێك مصطفی رشید پاشای بـاڵیۆزی عوسمانی لە قاهرە کرا بە وەزیری دەرەوە، ئەو مصطفی رشید پاشـایە رۆڵێکـی زۆر گرنگـی هـەبوە لـە ڕێکخسـتنی کاروبـاری وڵاتـداو کـە بەبـەرچاوی پیـاوە گەورەکانی وڵات و باڵیۆزی دەوڵەتەکانەوە (خطی شریف سوڵتانی) لە (گوڵخانە) دا خوێنرایەوە (گوڵخانە یەکێك بووە لەسـەرا کۆنـەکان و پێشـی ووتـراوە (طـوپ قبو) لەتەنیشت مزگەوتی (ئەیاصوفیا) ، لەبەرئەوەی ئەو فەرمانبەرانەی سوڵتان لەلایەن رەشید پاشاوە خوێنرابووەوە لەگوڵخانە، بۆیە نـاوی لێ نـرا (خـط شـریف گوڵخانە) کە بەپێی ئەو فەرمانە هەموو هاووڵاتیانی عوسمانی دەبوایـە بەیـەکچاو تەماشا بکرانایە.

لە ساڵی ١٨٦١دا لەلایەن سوڵتان عبدالعزیزەوە فەرمانی چاکردنی باری وڵات دەرچوو، بەڵام دەرکردنی ئەو فەرمانە هیچ سوودێکی نەبوو چونکـە زوڵـم و زۆرو لە یاسا لادان هەروەکوو خۆی مابوەوە، تاقە شتێکی باش کە کرابوو بریتی بـوە لە هەڵوەشانەوەی هێزی ئەنکشاری.

سـاتێك عبدالحمیـدی دوهـەم لەسـاڵی ١٨٧٦دا بـوو بـە سـوڵتان، یـەکێك لـەو مەرجانـەی بـۆی دانرابـوو ئەبوایــە فــەرمانی بەجێـهێنانی دەسـتوور دەریکـاو حکومەت لە بارودوخێکی بەرەڵلاییەوە ببا بەرەو قۆناغێکی دەسـتووری و بۆئـەو مەبەستە بڕیاردرا (ئەنجومەنی مبعوثان) پێك بێت.

ئەوانەی چالاك بون لە داخوازیکردنی دانانی دەستور بریتی بوون لـە: مدحـت پاشـا، عوسمـان پاشـا، ضیاءپاشـا، روشـدی پاشـا، کمـال بـەگ و بڕیـار وابــوو سعدالله بـەگ و ضیاءبـەگ و کمـال بـەگ بکرێـن بـە راوێژیـاری سـوڵتان بــەڵام عبدالحمید چووە سەرتەخت لە هەمووی پاشگەزبوەوەو لەجیاتی ئەو سێ کەسە

بەئارەزووی خۆی خەڵکی تری دانا بۆئەوەی خۆی لەبەجێهێنان و سەرگرتنی دەستوور دووربخاتەوە.

پاش ئەوەی عبدالحمید، محمد رشید پاشای کرد بە صدری ئەعظم، مدحت پاشا زۆری هەوڵدا سوڵتان بەوە قایل بێ دەستور بخرێتە گەڕ، بەڵام تەقەلاکەی بێ سوودبوو لە وڵات دوورخرایەوە.

هەروەکو لەلاپەڕە ١٣٥ی سەرچاوە ٨٨دا (روحی بگ خالد المقدسی) لە گۆڤاری هلالدا بڵاوی کردوتەوە:

لەرۆژی ٢٣/ ١٢ /١٨٧٦دا سوڵتان عبدالحمید فەرمانی قانونی ئەساسی دەرکردو رشید پاشا لەبەرئەوەی پیربووبوو لابرا و مدحت پاشا کرا بە صدری ئەعظم (دیارە بەر لە دوورخستنەوەی بووە) بەڵام (ئەغناتێف) ی باڵیۆزی روسیا لە ئەستەمبوڵ ئەو دەستورەی بەدڵ نەبوو، سووربوو لەسەرئەوەی دەسکاری بکرێت و بابی عالی لە٢٠ /١/ ١٨٧٧دا داخوازیی دەوڵەتەکانی پشت گوێ خستو ئەمەبوو بەهۆی تێکچونی نێوان بابی عالی و دەوڵەتە ئەورووپاییەکان.

پاش ئەوەی تەقەلاکانی مدحت پاشا سەری نەگرت، نامەیەکی نارد بۆ سوڵتان و تیایا ووتبووی:

((مەبەست لەدانانی دەستور بۆ وڵات نەهێشتنی زوڵمو جەورو ستەم بوو لەگەڵ دانانی سنووری دەسەڵاتی ئێوەش و کارێکی وابکرێ کاربەدەستو فەرمانبەرانی لێ هاتوو دابنرێن بۆ کاروباری وڵات. لەگەڵ ئەوەشدا رێزی خۆم پێشکەش ئەکەم، بەڵام بەپێی ئەحکامی شەرع بۆم هەیەو پێویستە لەسەرم عەرزتان بکەم ئەو بڕیارو فەرمانانە بەجێ ناهێنم کە سوودی میللەتی تیادا نەبێ)). لەئەنجامی ئەوەدا مدحت پاشا دورخرایەوە بۆ ئیتاڵیا.

(پرنس غورچکۆف) ی وەزیری دەرەوەی روسیا لە ٢١/ ١/ ١٨٧٧دا نامەیەکی نارد بۆ دەوڵەتەکانی ئەورووپاو داوای لێکردن کارێکی وابکەن اصلاحاتی دەستوری بکرێ و ئەگەر ئەوان نەیکەن ئەوا قەیسەر ناچار دەبێ خۆی ئەو کارە بەجێ بێنێت و (ئەغناتێف) ی باڵیۆزی روس لە ئەستەمبوڵ نامەیەکی تری نارد بۆ باڵیۆزەکان و ئاگاداری کردن بابی عالی لە پەیمانی (پاریس) لایداوەو ساتێك عبدالحمید بۆی دەرکەوت دەوڵەتە ئەورووپاییەکان

سوورن لە بەجێهێنانی اصلاحاتی دەستوری، ئیتر دەم و دەس بڕیاری دانانی مجلسی مبعوثانی دابوو بۆ ئەوەی ئەو ئەنجومەنە ئەو ئیشە بکاو لە ٩/ ٥/ ١٨٧٧دا ئەنجومەنی مبعوثان هەڵبژێراو لە (سەرای دوڵمەباغچەسی) لە گەڕەکی (بیشکطاش) ئەو ئەنجومەنە کۆبوەوەو لەو کۆبونەوەیەدا وتارێکی سوڵتان خوێنرایەوە.

بۆ وەرامدانەوەی ئەو وتارەی سوڵتان کێشەیەك پەیدابوو چونکە نوێنەرێکی رۆمی (مەبەست یۆنانی) و نوێنەرێکی ئەرمەنی نارەزایی خۆیان دەربڕی بەرامبەر هەندێ لە وتارەکەی سوڵتان چونکە مافی نەتەوەکانی تری (مەبەست غەیری تورك) تیادا روون نەکرابوەوە، بەڵام بەزۆری دەنگ جگەلە (١٨) نوێنەری رۆم ئێلی و ئەرمەن کە دژی بوون وتارەکەی سوڵتان پەسەند کرا (سەیر ئەوەیە لەو ئەنجومەنەدا بێگومان نوێنەری کوردیش هەبوە، ئاخۆ لەبەرچی ئەو نوێنەرانەی کورد هاوبیری یۆنانی و ئەرمەنیەکان نەبوون لەگەڵ ئەوەشدا لە باسی نەتەوەی تورك بەولاوە لەو وتارەی سوڵتاندا ناوی هیچ لایەکی تر نەهێنراوە؟!!)

(پرنس غۆرچکۆف) ی وەزیری دەرەوە بڵاوی کردەوە دەوڵەتی عوسمانی نایەوێ اصلاحاتی دەستوری بکا بۆیە پێویستە بەشەڕ ناچاربکرێ اصلاحات بکاو بەوجۆرە لەنیسانی ١٨٧٧دا شەڕی نێوان روسیاو تورك دەستی پێکردو هەشت مانگی خایاند و روسەکان سەرکەوتن و عوسمانیەکان زیانێکی زۆریان لێ کەوت و ناچارکران پەیمانی (برلین) مۆربکەن.

دەربارەی ناوەڕۆکی مادەکانی اصلاحاتی دەستوری کە لەکاتی دەرچونیەوە هەتا ساڵی ١٩٠٨ نەخرابووە گەڕ و کاری پێ نەکرابوو، دووسەرچاوە دەربارەی ئەوە باسیان کردوە.

سەرچاوە یەکەم بریتیە لەسەرچاوە ٨٢ کە بەدوورودرێژ باسی کردوەو کورتیەکەی بریتیە لە:

١ـ هەموو هاوڵاتیەکی عوسمانی بێ جیاوازی ئاین و نەتەوە، مافی سەربەستی هەیەو دەبێ هەموویان وەکو یەك سەیر بکرێن و ئەرکی سەرشانی هەموویان بەرامبەر بەوڵات وەکوو یەك وایە.

٢ـ نابێ هیچ کەسێك بەبێ دەرچوونی بڕیارێکی یاسایی بگیرێت و بخرێتە ژێر فشاری لێپرسینەوەوە.

٣ـ نابێ هیچ جۆرە دادگایەك دابنرێت بەبێ بوونی بڕیارێکی یاسایی بۆ دروستبوونی و لە دادگا بەولاوە کەسی تر مافی ئەوەی نابێ بەزۆر دلوای وەرامدانەوەی پرسیار بکا.

٤ـ پێویستە ماڵو موڵکی هەموو هاووڵاتیەك بپارێزرێ و بەبێ بڕیاری دادگا کەس دەسەڵاتی ئەوەی نیە بچێتە ناوماڵی هیچ کەسێك و بیپیشکنێ یا پرسیاری لێ بکات بۆ وەرگرتنی زانیاری.

٥ـ بەبێ بوونی بڕیارێکی یاسایی کەس بۆی نیە دوای کەسێکی تر بکەوێ.

٦ـ هەموو هاووڵاتیەکی عوسمانی مافی ئەوەی دەبێ بۆ هەر وڵاتێك حەز بکا بۆی بچێت بەنیازی بازرگانی یا بۆ گەشت و گەڕان و بۆی هەیە تێکەڵ بەهەموو کەسێك و هەموو کومەڵگایەك ببێت

٧ـ پێویست بەبوونی رەزامەندی حکومەت ناکا بۆ دەرچوونی چاپەمەنی و ناردنی هیچ نامەیەکی تایبەتی نابێ لە دەزگاکانی پۆستەخانەدا ناردنی دوابخرێ و تەنها دادگا مافی ئەوەی هەیە تاوان بداتە پاڵ هەرنووسەرێك کە لەنووسینەکانیا لەبواری رێگادانی یاسایی لایدابێ.

٨ـ خوێندن و فێربوون بۆ هەموانەو کەس نابێ رێگە لەوە بگرێ.

٩ـ نابێ هیچ کاروفرمانێك بە زۆرەملێ بسەپێنرێ بەسەر هیچ کەسێکدا کە ئەوکارەی بەدڵ نەبێ.

١٠ـ بێجگە لەوانەی کاروباری شێخایەتی (ئاینی) ئیسلامی دەبەن بەڕێوەو جگە لە وەزیری جەنگ و دەریا، پێویستە هەموو وەزیرەکانی تر لەلایەن صدری ئەعظەمەوە دابنرێن و ناوەکانیان بنێررێت بۆ ئەنجومەنی مبعوثان بۆ پەسەندکردنیان. باڵیۆزەکان بەپێی بڕیاری وەزیری دەرەوەو والیی ویلایەتەکان بە بڕیاری وەزیری ناوخۆ دادەنرێن.

١١ـ پێویستە هەموو فەرمانبەرێك چ بەنووسین بێ یا دەماودەم بێ لە کاروباری پێوەندی بەفەرمانبەری لەخۆی بەرزترەوە بکاو نابێ لەو سنوورە لابدلو پێوەندی بەکەسی ترەوە بکا.

١٢ـ ئەگەر دەزگای بەڕێوەبەرایەتی کاروباری صدری ئەعظەم هەڵەیەکی هاتە بەرچاو لەدانانی فەرمانبەرێکدا ئەو دەزگایە بۆی هەیە ئەو هەڵەیە راست بکاتەوە.

١٣ـ پێویستە وەزیری دارایی (دفتردار) هەموساڵێك بوجەی ساڵانەی دەوڵەت ئامادەبکا.

دەربارەی ئەندامانی ئەنجومەنی مبعوثان وەکوو لەو سەرچاوەی ٨٢دا باسکراوە وتویەتی: بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی مبعوثان کە ژمارەیان (٢٨٨) ئەندام بووە، لەمانگی تشرینی دوهەمی ساڵی ١٩٠٨ دا دەستکرا بەهەڵبژاردن و ژمارەی ئەوانەی لەو ئەنجومەنەدا تورك بوون (١٤٧) ئەندام بوون و هەرمیللەتەش بەپێی سەرژمێری خۆی ژمارەیەك نوێنەری بۆ دانرابوو (مانای ئەوەیە بەژمارەی ئەوانی تر ١٤٧ ئەندام بوون و بێگومان کورد لەبەر هەندێ هۆ، بەتایبەتی سەندنی باج و سەربازدان بەحکومەت ژمارەی راستی کورد نەزانراوە چەند بووە بەپێی ئەوە ژمارەی نوێنەرەکانیشی لەو ئەنجومەنەدا بەکەم پیشان دراوە) .

لەپاش دانانی ئەنجومەنی مبعوثان ئەنجومەنی ئەعیان (پیران) یش دانراو لەمانگی کانونی یەکەمی ١٩٠٨دا بەئامادەبوونی سوڵتان و سەرۆکی هەردوو ئەنجومەنەکە کۆبونەوەیەکی گشتی کرا.

ژمارەی ئەوانەی اتحادو ترەقی بوون یا سەریەوان بوون زۆربەی ئەندامەکانیان پێك دەهێناو ئیتر رێگا لەوەگیرا سوڵتان دەس بخاتە ناو هەموکارو بارێکی وڵاتەوە.

پاش ئەوە هەروەکو سەرچاوە ٨٢ باسی کردوە تێکچوون و ناڕێکی تاقمی اتحادو ترەقی و نەیارەکانی ئاشکرابوو لە١٤/ ٤/ ١٩٠٩دا کۆبونەوەیەکی فراوانکراو لەو کۆبونەوەیەدا بڕیاری لابردنی سوڵتان عبدالحمید دراو بەپێی فتوایەکی شێخ الاسلام، محمد رشاد بەناوی سوڵتان محمدی پێنجەمەوە لەجیاتی عبدالحمید کرا بەسوڵتان (لەبەرگی دوهەمدا بەدوورودرێژی باسی لابردنی سوڵتان و هەڵوەشانەوەی خلافەت دەکەین) .

بەڵام سەرچاوەی ژمارە ٨٨ گۆڤاری هـلال، لەلاپـەرە ٨٩ بـەدوورودرێژ باسـی ناوەرۆکی قانونی ئەساسی کردوە کـە لەلایـەن هـەردوو ئەنجومەنەکـەوە بڕیـاری لەسـەردرابوو، هـەندێکی لـەوەی سـەرچاوە ٨٢ دەچێـت و هـەندێکی تریشـی جیاوازەو یا لە سەرچاوەی پێشودا باس نەکراوە بەندەکانی بەپێی سەرچاوە ٨٢ ئێجگار زۆر دوورو درێژە، بۆیە ئێمە لێرەدا تەنها ئەو مادە گرنگ و ئەساسیانەمان هەڵبژارد کە بەگرنگمان زانیوە کە بەندەکان هەمووی بریتی بووە لە (١١٩) بـەند کە ئەمانەی خوارەوە ئەوانەن ئەو سەرچاوەیەش بە شتی گرنگی داناون:

*بەندی یەکەم* / دەوڵەتی عوسمانی بریتیە لە دەوڵەت و ئەو ویلایەتانـەی بەهـەموویان وەکوو بەشەکانی لەش پێکەوە بەسراون.

*بەندی دووەم* / ئەستەمبوڵ پایتەختی دەوڵەتە بـەڵام نابـێ هیـچ ئیمتیـازێکی هـەبێ لەچاو شارەکانی تردا.

*بەندی سێهەم* /سەڵتەنەتی دەوڵەتی عوسمانی جێگری خلافەتی ئیسلامی گەورەیـەو بەپێی رەوشتی کۆن لەژێر دەسـەڵاتی گـەورەترین کـوڕی سـلالەی عوسمانیدا دەبێ.

بەندی چوارەم/ جلالەتی سوڵتان پارێزەری دینەو حاکمی هەموو دانیشـتوانی وڵاتـی عوسمانیە.

بەندی پێنجەم / حضرتی سوڵتان مقدسەو بەرپرسیار نابێ بەرامبەر هیچ شتێک.

*بەندی شەشەم* / مافی سەربەستی بنەماڵەی عوسمانی و موڵک و ماڵو سـامانەکانیان دەپارێزرێت و دابینکردنی ژیانیان ئەرکی سەرشانی هەموانە.

*بەندی حەوت* / (لەم مادەیـەدا لـە دەسـەڵاتەکانی سـوڵتان دواوە: بـەکورتیوەکوو: مۆرکردنی پەیمانی نێوان عوسمانی و دەوڵەتانی تر، اعلانی شـەڕو ئاشـتی، سـەرکردایەتی هـەموو هێزەکـانی زەمینـی و دەریـایی. لێخوشبوون و کە مکردنەوەی ماوەی زیندان، کۆکردنەوەی مجلسی عومومی و هەڵوەشانەوەی ئەنجومەنی مبعوثان) .

بـەندی هەشـتەم / لەقـەبی عوسمـانی بەهـەموو هاوڵاتیـانی عوسمـانی دەدرێ بـێ جیاوازی دین و مەزهەب.

*بەندی نۆهەم و دەهەم* / هەموو هاولاَتیانی عوسمانی خاوەنی سەربەستی خۆیـان و
بۆکەس نیە لەوسنورە لابداو کەس نابێ دەسدرێژی بکاتە
سەر ئەو مافە مەگەر تەنها لەرێی یاساوە نەبێ.

بەندی یانزەهەم / دینی ئیسلام دینی دەوڵەتی عوسمانیە و نابێ دەسـدرێژی بکرێتـە سەر دینەکانی تریش.

بـەندی دوانزەهـەم /چاپەمـەنی و بلاَوکردنـەوە شـتێکی سەربەسـت و ئـازادە لـە چوارچێوەی یاسادا.

بەندی پانزەهەم / خوێندن و فێربوون شتێکی مەعافە بۆ هەموو کەسـێك لـە سـنوری یاسادا.

بەندی حەڤدەهەم /هەموو هاوولاَتیەك بەرامبەر بەیاسا وەکوو یەك وایە.

بەندە هەژدەهەم / پێویستە لەسەر ئەوکەسەی دەکرێ بـە فەرمانبـەر لـە دەزگاکـانی دەوڵەتدا زمانی تورکی بزانێت.

بەندی بیست‌وچوار /کەس نیە لەخۆیەوەو بەخۆرایی مـاڵی کەسـێکی تـر زەوت بکـا
وەیا بەزۆرەملێ بـەبێکار ئیـش بەکـەس بکـا جگـە لەهـەندێ
حالاَت کە لەکاتی شەڕدا بەپێویست بزانرێ.

بەندی بیست‌وحەوت هەتا بەندی سی‌ویەك / بەدوورودرێژ باسی ئەنجومەنی وەزیران دەکاو لەوە ئەدوێ چۆن بەرپرسیار دەبن لەبەردەمی صدری ئەعظم دا.

بـەندی سی‌وشـەش / ئەگـەر پێویسـت بـە دانـانی یاسـایەکی بەپەلـە هاتـە ئـاراوە ئەنجومەنی گشتی لەکاتی کۆبونەوەی گشـتی ئاسـایی خۆیـدا نـەبێ، ئـەوا ئەنجومـەنی وەزیران بۆ بەرژەوەندی و سوودی ولاَت و هاولاَتیان بۆی هەیە لەسـنوری یاسـادا بەباشـی دەزانی بریاری بۆدەربکا بەمەرجێك پێوەندی بەیاساوە هەبێ.

بەندی چل‌ودوو / باسی ئەنجومەنی ئەعیان و ئەنجومەنی مبعوثانە بەدوورودرێژ.

بەندی چل‌وسێ هەتا بەندی هەشتا / باسی ئەو مەرجانەیان تیادا کراوە کە پێویسـتە لەوکەسانەدا هەبێ کە بیانەوێ ببن بەئەندام لەیەکێك لەو دوو ئەنجومەنەدا.

بـەندەکانی هەشـتاو یـەك هـەتا بـەندی نـەوەد / باسـی دادگاکـان و چۆنیـەتی دامەزراندنیان و دەسەلاَتی دەزگاکانیان

بەندی‌نەوەدوشەش هەتا سەدوحەوت هەموویان باسی کاروباری داراییان کردوە.

ئەو ئیصلاحاتی دەستورییە هەرچەند سولتان مۆری کردبوو، بەلام لەراستیدا ساتێك تاقمی اتحادو ترەقی دەستیانگرت بەسەرکاروباری ولاتدا ئەوشتانەی لەومادانەدا بەدڵیان نەبوو هەمویان پشت گوێ خست و هەموو دەستوورەکەیان پێشێل کردو ئەوان لە سولتان زۆرتر بەرەڵلابون بەئارەزوی خۆیان کاروبارییان دەبرد بەڕێوە و لەهەموو بەڵێنەکانی خۆیان پاشگەز بوونەوە.

**سێهەم: بەشداربونی کورد لەرێکخراوی اتحادو ترەقیدا و هۆی بەشداربوونی**

لەباسی چۆنیەتی دامەزراندنی اتحادو ترەقی و لە باسی دروشمەکانیا لەوەدواین چۆن تاقمی اتحادو ترەقی دروشمی وایان بەرزکردبوەوە کە میللەتانی تری غەیری تورکیش لەناو ولاتی عوسمانیدا هاوکاری بکەن لە تێکۆشان بۆ اصلاحاتی دەستوری کە لەراستیدا تاقمی اتحادو ترەقی نەخشەی ئەوەیان کێشابوو لەئەنجاما سولتان لابەرن و خۆیان کاروبار بگرنەدەست و کوردیش کە لەو رۆژانەدا چاوی کرابوەوە دەیویست لەو چالاکیانەدا بەشداری بکا کە سوودی کوردی تیادابێ و ساتێك تاقمی اتحادو ترەقی دەستیان کەوتە روو کوردیش کەوتە خۆی و دەستیکرد بەدامەزراندنی کۆمەڵ و رێکخراوی کوردی وەکوو لە باسێکی تایبەتیدا بەدووروودرێژ باس دەکرێت .

لەراستیدا کورد ساویلکانە روانیبویانە تاقمی اتحادو ترەقی و بەدروشمەکانیان هەڵخەڵەتابوون. بۆنمونە باسێکی سەرچاوە ٧٨ی (روهات ئالاکوم) دەخەینە پێش چاو کە باسەکەی بۆ شریف پاشا تەرخانکردوە لەوەدا ناپاکیی تاقمی اتحادیەکان روون دەبێتەوە بەرامبەر بەکورد کە لەوباسەدا رۆهات ئالاکۆم وتوویەتی:

((ساتێك شریف پاشا کرا بە باڵیۆزی دەوڵەتی عوسمانی لە (ستۆکهۆڵم) لەو سەردەمەدا سولتان عبدالحمید لەسەرتەخت بوو کە بە پیاوێکی زۆردار بەناوبانگ بووە، شریف پاشا لەستوکهۆڵمەوە تێکەڵ بەچالاکیی ئەو کۆمەڵ و رێکخراوە نەبوو کە بۆ چاککردنی باری ولات تێدەکۆشان کە اتحادو ترەقی یەکێك بووە لەوانە دەستیکرد بە هاوکاریکردن لەگەڵیانا (وەکوو بەرلەمە لەشوێنی خۆیدا

باسمان کردوه) نووسەر باسی ئیسحاق سکوتی کردوه وەکوو ئەندامێکی چالاکی اتحادو ترەقی کە لە وەختی خۆیدا لەساڵی ١٨٩٩دا کە لـەجنێف بـوه نامەیـەکی ناردبوو بۆ (تۆنـاڵی حلمـی) و لەونامەیـەدا باسـی ئـەوەی بـۆ نوسـیبوو لـەماوەی شەش مانگی دواییدا پارەتی‌یان لەکوردەکانەوە دەسگیربووە.

بەپێی بۆچوونی (یالچین کوچوك) کە لێکۆڵەرەوەیەکی تورك بـووە، ئیسـحاق سکوتی لەنامەیەکیدا بۆ تۆنـاڵی حلمـی لـەوەدا باسـی ئـەوەی بـۆ کـردوه شـریف پاشـای خنـدان لـەپاش سـتوکهۆڵم چـووە بـۆ پـاریس و لـەوێ هاوکـاریی خـۆی دەربڕیبوو لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنەکاندا.

پرۆفیسـۆر (ت. ی. ئـارمی. T. J . Arme) کـە ئـەویش لێکۆڵەرەوەیـەکی سویدی بووە باسی ئەوەی کردوە نوێنـەرێکی اتحـادو ترەقـی بەنـەهێنی چوبـوو بۆسوید هەروەکوو. Svenskarna Och Osterludet چـاپی سـتوکهۆڵم سـاڵی ١٩٩٢ لاپەڕە ٣٥٥ باسیکردوە.

هەرچەند نووسەری ئەوکتێبە نـاوی ئـەو نوێنـەرەی نـەهێناوە لەکتێبەکـەیدا، بەڵام لەسەرچاوەیەکی تردا لەلاپەڕە ١٢٥ی کتێبەکـەی Mehmed Selahadin نـاوی ئـەو نوێنـەرەی اتحـادوترەقی هێنـاوە کـە ئەحمـەد رضابـەگ بـووە (لـە دامەزراندنی اتحادو ترەقیدا باسکراوە).

ئەو ئەحمەد بەگە بەپێی باسەکەی رۆهات ئالاکۆم، بۆ ئەوە چوبوو بـۆ سـوید کە شریف پاشا ببینێت و ساتیك دەچێتـە سـوید، (موختـار بـەگ) ی سـکرتێری باڵیۆزخانـەی عوسمـانی لـە سـتۆکهۆڵم بەنـەهێنی باسـی ئـەو چوونـەی ئەحمـەد رضابەگ دەگەیەنێت بەکاربەدەسـتان لـە ئەسـتەمبوڵ و بەمـە پێوەنـدی شـریف پاشا و اتحـادو ترەقیـەکان ئاشـکرابوو، سـوڵتان داوای لـە شـریف پاشـا کردبـوو ئەحمەد رضا بەگ بگرێ بەڵام شریف پاشا فەرمانەکەی سوڵتانی بەجێ نـەهێناو پاش ماوەیەك شریف پاشا گوێزرایەوە بۆ (مدریـد) بـەڵام نـەچوو وازی لـە کـاری دەوڵـەت هێنـاو بـەوجۆرەی ئەحمـەد رضـا بـەگ بـەهۆی شـریف پاشـاوە لـە مەترسیەکی گەورە رزگاری بوو، بەڵام ئەحمەد رضابەگ ئەو پیاوەتیەی شەریف پاشای لەبەرچاو نەبوو ساتێك أتحادیەکان دوای مۆرکردنی اصلاحاتی دەسـتوری بـوون بـە دەسـەڵاتدار ئەحمـەد رەضـا بـەگ پیلانـی کوشـتنی شـەریف پاشـای

نەخشەکێشابوو. بەو جۆرە بەهۆی ئەحمەد رضا بەگەوە نێوانی شـەریف پاشـاو حکومەتی ئەستەمبوڵ تێکچوو ساتێك سعید پاشای باوکی شەریف پاشا لەساڵی ١٩٠٧دا کۆچی دوایی کرد شـەریف پاشـا نـەیتوانی بـۆ بەشـداربوونی پرسـەکەی باوکی بچیێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ (سەرچاوەی رۆهارت ئالاکۆم بۆ ئەمە بریتیـە لـە Avliden Turksman چاپی ١٩٧٠/١٠/٣٠).

نوسەر ئالاکۆم ئاماژەی بۆ un representant delatur چـاپی سـاڵی ١٩١٢ کردووە لەوەدا باسی ئەوە کـراوە شـەریف پاشـا لـە سـتۆکهۆڵمەوە ڕوو دەکاتـە پـاریس و لـەوێ ڕۆژنامـەی (مشـروطیة) دەردەکـاو لـەو ڕۆژنامەیـەدا ڕەفتـارە خراپەکانی موختار بەگی باڵیۆزی عوسمانی بڵاو دەکاتەوە. (سەیر ئەوەیە جگـە لەو باسەی رۆهـارت ئـالاکۆم، هیـچ سـەرچاوەیەکی تـر باسـی ئـەوەی نـەکردووە شەریف پاشا ڕۆژنامەی وای لە پاریس دەرکردبێ... تۆ بڵێی هیچ دانەیـەکی لـە هیچ شوێنێك دەس بکەوێ؟)

رۆهارت ئالاکۆم ئەڵێ: جگە لەو باسانەی شەریف پاشا، لەرۆژنامەی (ئـافتون بلادیـت) یشـدا کـە لەسوید دەرچـووە باسـێکی تیـادا بڵاوکرابـوەوە لــەژێرناوی (ئـابڕووچوونێك لـە کـۆڕی دپلۆمـاتیك) دا لەوەشـدا باسـی ڕەوشـتە خراپــەکانی موختار بەگ بڵاوکراوەتەوە.

دەربارەی ئەو کوردانەی لە أتحادو ترەقیـدا بەشـدار بـون، لـە لاپـەڕە ٢٧٤ی سەرچاوە ٤٠دا ناوی هەندێ لە ئەندامانی أتحادو ترەقی هێنـاوە کەبـەناوەکانیانا دەردەکـەوێ هـەندێکیان کـورد بـون (بـەڵام بەداخـەوە نـاوی کوردەکـانی جیـا نەکردۆتەوە) کە بریتی بوون لە:

ئیسحاق سکوتی کە خـەڵکی دیـاربکر بـوە، شـرف الدیـن مـەغمومی، عبـدالله جودت، محمد رشـید چرکس، ئاسـاف درویـش، علـی روشـدی هەرسـکی، محمـد غریـد حسن زادە، علی بابـان، حکمـت ئـەمین بابـان، ئیسـماعیل ئیـبراهیم بابـان زادە، کریم سیباطی، صبری مومکی، ناظم سـلانیکی، نجیـب دراغـا، گلعـت بـگ، شەگین بەگ، کقواصلی ئیبراهیم بەگ، شفیق کرنلی، جودت عوسمان.

هـەمان سـەرچاوەی ٤٠ ئامـاژەی بـۆ باسـێکی (خـاتو کریسـتین) کـردوە کــە وتویەتی یەکەم کۆبونەوەی أتحادو ترەقی لە پـاریس کـراو لـەو کۆنفرنسـەدا دوو

سەرکردەی کوردیش بەشدار بون کە بریتی بوون لە عبدالرحمن بدرخان و حکمت بابان و کوردەکان لەو ڕێکخراوەدا شان بەشانی تورکەکان لە چالاکیدا بون.

عبدالعزیز یامولکی لە کتێبەکەیدا (کوردستان و کورد أختلاللری) سەرچاوە ٦٧ وتویەتی لەساڵی ١٨٩٥دا زۆریەی ئەندامانی أتحادوترەقی لە ئەستەمبوڵ گیران و لەناو ئەوانەدا: ئیسحاق سکوتی، کریم سیباگی، عبدالله جودت، شرف الدین مەغمومی، شێخ نائلی و عبدالقادر ئەفەندی (مەبەستی عبدالقادری شمزینی کوڕی عبدالله بوە)، وعبدالقادر بەوە تاوانبار کرابو بەشدار بوە لە پیلانی أتحادیەکان دژی سوڵتان.

هەروەکو دوکتۆر جلیلی لەسەرچاوە ٥٥ دا باسیکردوە، کۆبونەوەی دوهەمی أتحادو ترەقی_ ژۆن تورك لەنێوانی ٢٧_ ١٩٠٧/١٢/٢٩ لەپاریس گیرا کەلەو کۆبونەوەیەدا هەموو ڕێکخراوە ئۆپۆزیسۆنەکانی تر بانگ کرا بون بۆ بەشدار بون لەو کۆبونەوەیەدا و ئەو کوردە ئاوارانەی لەدەوری ڕۆژنامەی کوردستان گردبوونەوە بە سەرۆکایەتی عبدالرحمن بدرخان لەو کۆبونەوەی پاریسدا بەشدار بون و بێجگە لەوانە وەفدی ئەرمەنی تورك و کوردە ئاوارە بوەکانی ئەمریکاش ئامادەبون کە زمانی حاڵیان بریتی بوە لەڕۆژنامەی (ZOYQSA).لەدوای تەواوبونی کۆبونەوەکە، نامیلکەیەك بەچەند زمانێك چاپکراو بڵاوکرایەوە، کە یەکێك لەوزمانانە بەزمانی کوردی بوو، بڕیارەکانی ئەوکونفرانسەی تیادا بڵاوکرایەوە کە بریتیبووە لەلابردنی سوڵتان و دانانی دەستورو دامەزراندنی پارلەمان و خۆئامادەکردن بۆ ڕاپەڕینێکی چەکدارانە هەروەکوو لە ژمارەکانی ٥-٦ی کانونی دوهەمی ساڵی ١٩٠٨ بڵاوکراوەتەوە (تۆبڵێی دانەیەك لەونامیلکەیە بەزمانی کوردی لای کەس یا لەهیچ کتێبخانەیەکدا دەس بکەوێ؟؟

بێگومان لەناوکوردەکانیشدا هی واهەبوە بۆ سوودی تایبەتی خۆیان چووبونە ناو ئەو ڕێکخراوەوە، بۆنمونە: سەرچاوەی ژمارە ٤٠ باسی کتێبی (ئەرنست رافررو) ی کردوە کە وتوویەتی لەناو ئەندامانی اتحادو ترەقی دا هی واهەبوە وەکو ئیسحاق سکوتی و عبدالله جودت حەزیان بەوە کردوە لەناو ڕێکخراوەکەدا بە دوو تورك یا بەدوو هاووڵاتی عوسمانی ناوببرێن (لەگەڵ ئەوەشدا ساتێك ئیسحاق سکوتی مردوە ڕۆژنامەی کوردستان لەژمارە ٣٠یدا کەلەڕۆژی ١ یمارتی

١٣١٨ی کۆچیدا لەجنێف دەرچـووە، لەلاپـەڕە چـواردا بـەتورکی باسـی کۆچـی دوایی ئیسحاق سکوتی و کورتە باسێکی ژیانی کردوە لەژێر ناوی (ضیاع عظیم).

وەکو لەباسی ئەحمەد رامـزدا لەبەشـی حەڤدەهـەمدا بـاس دەکرێ ئەحمـەد بەگ رامز یەکێك بووە لەسەرکردەکانی اتحادو ترەقی لەساڵی ١٩٠٨دا.

**چوارەم:- پاشگەز بوونەوەی اتحادو ترەقی لە بەڵێنەکانی بەرامبەر بەکورد**

ساتێك عبدالحمید ناچارکرا فەرمانی اصلاحاتی دەستوری بکا لەساڵی ١٩٠٨، تا ئەوسا تـاقمی اتحـادو ترەقـی مەبەسـتەکانی خۆیـان ئاشکرا نـەکردبوو کـورد بەگەرمیەوە هاوکاریون لەگەڵ اتحادو ترەقیدا لـەورووەوە سـەرچاوەی ژمـارە ٥٣ جنبشهای کـورد لەلاپـەڕە ٨٥ باسـی ئـەوەی کـردوە بەرلـەوەی اتحادیـەکان بەتەواوەتی ببن بەدەسەڵاتدار گەلێ کوردی ناسراوی وەکوو ئـەمین عـالی بدرخـان (ئەمەیەکەم سەرچاوەیە باسی ئەوەی کردبێ ئەمین عالی بدرخان هاوکاری کردبێ لەگەڵ اتحادو ترەقیدا) و سید عبدالقادر شمزینی و شریف پاشاو احمـد ذوالکفـل پاشا بەنیازێکی پاك چووبونە پێشەوەو بـەناوی کـوردەوە هاوکاریـان کردبوو.

اتحادیەکانیش لەسەرەتادا شێخ عبدالقادریان کرد بەسەرۆکی ئەنجومەنی (سـەنا = پیران) و رێگەیان دا بە عالی بدرخان و شێخ عبدالقادر کۆمەڵێکی سیاسی کورد پێك بێنن و رۆژنامەیەکیان بەناوی (کورد تعاون و ترەقی گەزەتەسـی) دەرهێنـاو رۆژنامـەی (تعـاون و ترەقـی کـورد) بەسـەرکردایەتی جمیـل بـەگ دەرچـوو کـە بایەخێکی زۆری دا بەفەرهەنگ و زبان و فۆلکلۆری کوردی، بـەڵام لەسـاڵی ١٩٠٩ اتحادیەکان کە هێزیـان پـەیداکرد وردە وردە سـاردی کەوتـە نێوانیانـەوە لەگـەڵ کوردەکانا و کوردەکان هەستیان بە مەبەستەکانی تورك کـردو ئـەوانیش کەوتنـە خۆیان پێوەندییان بەئەفسەرانی کوردەوە کرد لەناو سوپای عوسمانیدا و لەگەڵ ئەرمەنیەکانیشـدا نزیـك بونـەوەو دۆسـتایەتییان پـەیداکردو تورکـەکان بەرامبـەر بەوە تەقەلایەکی زۆریان دا بۆ تێکدانـی نێـوان کـوردو ئەرمـەنی و لەگـەڵ پیـاوە ئاینیەکانی کوردا تەقەلایەکی زۆریان دا لەسەر پێڕەوی کوردە ناسیۆنالیستەکان نەڕۆن لەنزیك بوونەوەیانا لەگەڵ ئەرمەنیەکانا کە بەهاندانی بێگانە دەیان ویست لـەناو کوردسـتانا بـبن بـە دەسـەڵاتدارو لەئـەنجاما توانیـیان کوردەکـان بکـەن بەدوبەشەوە و تاقمی بدرخانی و رۆشنبیرەکان دەیان ویست دۆسـتایەتی لەگـەڵ

روسدا پەیدا بکەن (عبدالرزاق بدرخان یەکێك بووە لەو کوردانەی تەقەلایەکی بێ سوودی دابوو بۆ پێوەندیکردن و دۆستایەتی لەگەڵ روسەکانا) ، بەلام تاقمەکەی تر بەسەرۆکایەتی شێخ عبدالقادر لەسەر ئەو بیرو بۆچوونەی ئەوان نەبوون و تورکەکان سوودیکی زۆریان لەوناکۆکیەی نێوان هەردولادا دەسگیربوو لەساڵی ١٩١١دا کۆمەڵی رۆشنبیری کوردیان یاساغ کرد (سەرچاوە ٥٣ ئەوکۆمەڵەی بەجامعەی سیاسی ناوبردوە) و جگەلەوە رۆژنامەی (کوردتعاون و ترەقی گازیتسی) و قوتابخانە کوردیەکان داخران (لەبەشی هەژدەهەمدا بەدوورودرێژ باسی کۆمەڵ و رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو رۆژە دەکەین) و لەئەنجامی ئەوەدا ژمارەیەکی زۆر لە کوردە ناسراوەکان ولاتیان بەجێ هێشت و ئەوانەی مابونەوە بەنەهێنی ئیشیان دەکرد و بەرلەوە لەساڵی ١٩٠٦دا عبدالرزاق بدرخان و علی شامل پاشا بەوە تاوانبار کرابوون دەستیان هەبوە لەکوشتنی مدیری پۆلیسی ئەستەمبوڵدا و چەند کەسێك لەسەرئەوە هەڵواسران و علیشامل پاشا ئاوارە کرابوو بۆ طرابلس لەلیبیا و عبدالرزاق خۆی دەربازکردبوو (لەشوێنی خۆیدا لەپێوەندی کوردو روسدا باسی ئەوەی عبدالرزاق بدرخان کراوە).

ئەوەی شایانی باسە، لەو رۆژانەدا کە تاقمی اتحادوترەقی دەسەلاتیان گرتبووە دەس کە ئەیانویست هەموو کاروبارێکی ناو ویلایەتەکان ببەسرێتەوە بەمەرکەزەوە، بەرامبەر بەوە رێکخراوێکی تر پەیدابوو بەناوی (حریەو ائتلاف) دەربارەی ئەو رێکخراوە، سەرچاوە ٦٣ نوسیوێتی تاقمێك لە رۆژهەلاتناسانی روس باسی ئەو رێکخراوەو هەڵوێستی کوردیان کردوە لەگەڵ ئەو رێکخراوەدا کە کورتیەکەی وەکو ئەوان باسیانکردوە:

((لەساڵی ١٩١١دا دوای ئەوەی عوسمانیەکان لەلیبیا لەلایەن ئیتاڵیەکانەوە شکان و عوسمانیەکان دەرکران و حکومەتی تورك بەوە پەرێشان کراو کورد لەوشەرەدا هاوکاری حکومەت نەبوە و خۆی لە اتحادیەکان دوور خستبوەوەو زۆربەی کورد بەبنەماڵەی بدرخانیەکانەوە بوون بەلایەنگری (حریەو ائتلاف) وکورد دەستی کرد بەجموجۆڵ و گەلێك نامەیان نارد بۆ قونسوڵەکانی روس و تاقمی حریەو ائتلاف لە مانگی تموزی ١٩١٢دا کەوتنە خۆیان و بەڵێنیان دا بەکورد مافی ئەوان پشت گوێ نەخرێو لە ماوەیەکی کەمدا بەهێزبون و

توانیبویان نزیکی (١٧) هەزار کورد بکەن بەلایەنگری خۆیان، بەلام زۆری پێ نەچوو ئەو رێکخراوەش هەولّی ئەوەی دا نێوانی کوردو ئەرمەنی تێك بداو بڕیاری لێ خۆشبوونیان دەرکرد بۆ عبدالرزاق بدرخانو سید طەو ئەوکوردانەی لەگەلّ تاقمی اتحادو ترەقیدا نارێك بوون، بەلام ئەو پێوەندی و دۆستایەتیەی نێوان ئەو رێکخراوەو کوردەکان زۆر کورت خایەن بوو تەنها نیو سالّ درێژەی کێشا و کوردەکان بۆیان دەرکەوت ئەمانیش شێوەیەکی تر بوون لە اتحادو ترەقی و جگە لەوە ماوەی دەسەلاتدارێتی حریەو ائتلاف ئەوەندە درێژەی نەکێشاو دووبارە اتحادیەکان دەستیانگرتەوە بەسەر هەلّویستاو خۆیان ئامادەکرد دەولّەتی عوسمانی تووشی شەڕی جیهان بکەن و خۆیان ئالآنە ئەو شەڕەوەو ئیتر بەدەسپێکردنی شەڕ هەموو جۆرە چالاکیەکی سیاسی وەستێنرا.

# بەشی حەڤدەهەم

## بزوتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری لە باکووری کوردستان بەر لە شەڕی یەکەم

لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە گەلێك رووداوی گرنگ روویدا لەناو ولآتانی دراوسێی کوردستان وەکوو شۆڕشی روسیا لە ساڵی ١٩٠٥داو مشروطیەی ئێران لە ساڵی ١٩٠٥ ـ ١٩٠٦داو أصلاحاتی دەستوری لە ولآتی عوسمانیدا ساڵی ١٩٠٨ کە ئەمانە هەموویان بەرهەمی رووداوەکانی بەر لە خۆیان بوون لەسەدەی نۆزدەهەمداو میللەتی کوردیش چاوی کرابووەوەو لە مەبەستو ئامانجی ئەو شۆڕشانە گەیشتبوو چۆن سیاسەتمداران و رۆشنبیرانی میللەتان هەر تاقمە بۆ خۆی کەوتبووە چالاکی و داوای چاکردن و باشکردنی باری ولآت و ژیانی هاوولآتیانی خۆیان دەکرد، کوردیش ماوەیەك بوو لەسەدەی نوزدەهەمەوە زانایان و رۆشنبیرانی کەوتبوونە خۆیان و هەستی نەتەوایەتی‌یان بەناو جەماوەری کوردا بلآو دەکردەوەو میللەتی کوردیان هان ئەدا لەوە زیاتر بیدەنگ نەبن بەرامبەر بە جەورو ستەمی داگیرکەرانی کوردستان و هەروەکوو دوکتۆر جلیلی جلیل لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٥ باسی کردوە، کوردەکانی ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٩٠٦دا لەبەردەمی دەزگاکانی حکومەتدا لە ئەستەمبوڵ خۆپیشاندانێکی گەورەیان کردو بێزاریی خۆیان دەربڕیبو بەرامبەر بە کاربەدەستانی عوسمانی و جەورو ستەمیان لەگەڵ میللەتی کوردا کە بۆ یەکەم جار ئافرەتی کوردیش لەو خۆپیشاندانەدا بەشداربوون و پاش ئەوە لە ساڵی ١٩٠٧دا لە شاری بدلیس خۆپیشاندانێکی لەو جورەی ئەستەمبوڵ کرا(٥) هەزار کەس هەموو هاوکاری لابردنی کاربەدەستە پیسەکانی حکومەتی تورکیان دەکرد لە ناوچەکەیاناو داوای

لابردنی والیان دەکردو پەلاماری دائـرەی پۆستـەخانەو چـەند دەزگایـەکی تـری حکومەتیان داو دەستیان بەسەرا گرت.

جلیلی لەلاپەڕە/٥٧ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کتێبی (خ.م.تفنیکیان) کـردوە چـاپی سـاڵی ١٩٤٥ کـە باسـی ئۆپۆزیسـیۆنی عوسمـانی کـردوە لەگـەڵ (٢٨) ئەفسەری ناو سوپا کە دوو ئەفسەر لەوانە کورد بوون بانگەوازێکیان بڵاوکردەوە دژی جەورو ستەمی کاربەدەستانی حکومەت.

هەروەها لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨دا لە ئاهـەنگی (شـکر بـیری) لـە ئەسـتەمبول ژمارەیـەکی زۆری کـورد لەبـەر مـاڵی شـێخ عبدالقـادر شمزینیـدا کۆبوونـەوەو لـەوێوە خۆپیشـاندانێکیان کـرد لەسـەر شـەقامەکانی ئەسـتەمبول‌و دروشمی (پارێزگاری کردن لە دەستور)بەرز کرابووەوەو لەبەر کۆشکی سوڵتانیدا چەند وتارێك دەربارەی ئەوە خوێندرابووەوەو دروشمـی رۆشـنبیرانی کـورد لـەو خۆپیشاندانەدا بریتی بووە لە :

پێشکەوتن...... یەککرتن.

رۆژنامـەی (جامانـاك)ی ئەرمـەنی لـە ژمـارە/٧ی مـانگی تشـرینی یەکـەم‌و ژمـارە/١٩ی ١٨/ی تشرینی دوهـەمی سـاڵی ١٩٠٨دا باسـی هاوکـاری کردنـی ئەرمەنیەکانی کردوەو لەو رۆژنامەیەدا وتراوە:

((ئەرمەنیەکان لەو کۆبوونەوەیدا هاوکاری کردنی خۆیـان پیشـاندابوو لەگـەڵ کوردەکاناو لەگەڵ ئەوانا بە کوردی گۆرانییان دەوت‌و هاواریان ئەکرد هەردولا بۆ یەك ئامانج‌و مەبەست تێدەکۆشن)).

بێگومان ئەو بزوتنەوەی نەتەوایەتیەی کورد لە سەرەتای سەدەی بیستـەمدا گەیشتبووە ئەو رادەیەی کورد رێکخـراوو رۆژنامـەو گۆڤـاری خـۆی هـەبێ شتێك نەبوە هەرلە خۆیەوە هاتبێتە کایەوە بـەڵکوو ژمارەیـەك لـە رۆشـنبیران بەرلـەوە بـۆی تێکوشـابوون‌و خـەباتیان بـۆ کردبـوو، بـە نوسـین‌و بـە کـردەوەو بـە بڵاوکردنەوەی باسی ناو رۆژنامەو گۆڤارەکان‌و ئەو کتێبانەی دایان نابوو کـارێکی وایان کردبوو نەوەیەکی نیشتمانپەروەر بکەونە خۆیان‌و لەم باسەدا هەوڵئـەدەین باسی ژمارەیەك لەو رۆشنبیرانە بکەین.

**یەکەم: ملاسعید (بدیع الزمان) - کە بە سعید نەورەسی ناسراوبووە**

ملا سعید مامۆستای خلیل خیاڵی بووەو.یەکێك بووە لە زاناکانی سەردەمی خۆیو ڕۆڵێکی زۆر گرنگی بینیوە لە پێشخستنی خوێندنو ڕۆشنبیری لەناو کۆمەڵگای کوردی سەردەمی خۆیدا.

دەربارەی ملا سعید (بدیع الومان) باسی دوو سەرچاوە ئەکەین لەوانەی دەربارەی ژیانی دواون،یەکێك لەوانە : کتێبی فەرهەنگو زانست، نوسینو کۆکردنەوەی محمد صالح ئیبراهیمی ـــ چاپی تاران ساڵی ١٣٦٤کۆچی، لەلاپەڕە/٢٧١دا لەباسی سعید نەورەسیدا وتویەتی لەساڵی ١٨٧٣ی زایین، لە ناوچەیەکی بدلیس لەدایك بووەو لە ساڵی ١٩٦٠دا لە شاری (ئورفە)کۆچی دوایی کردوە (بە پێی ئەمە٨٧ساڵ ژیاوە).

ملا سعید وەختی خۆی هەوڵێکی زۆری دابوو لە (وان) زانکۆیەکی وەکوو ئەوەی (ئەزهەر) دروست بکا بەلاّم تەقەلاکانی سەری نەگرتبوو تورکە ڕەگەزپەرستەکان ڕێگەی هەموو چالاکیەکیان لێ دەگرتو هەرجارە بەشێوەیەك سزایان ئەداو ئەیاندا بە دادگا.

ملا سعید نەورەسی پتر لە (٢٩ رسالەو پەڕاوە)ی نوسیوە، یەکێك لەوانە کتێبی (رچە ـ یاریچیك بە کوردو عەرەبی داناوەولەوەدا وتوویەتی :((هەرچەند من مروڤێکی هەژاری کوردم، زۆر شادمانم چونکە لە باوەشی کێوە سەوزو ڕەنگینەکانی کوردستانا پێگەیشتووم)).

قدری جمیل بەگ (زنار سلوپی) لەلاپەڕە/٢٠ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧، لە باسی ملا سعیدا وتوویەتی کتێبێکی نوسیوە بەناوی (شهادة حول نکبة مدرستین ـ وەکوو لە کتێبە عەرەبیەکەی زنار سلۆپیدا ناوی کتێبەکە بەو جۆرە هاتووە)، لەو کتێبەدا ملا سعید لەلاپەڕە/٤٤یدا ستایشێکی زۆری خلیل خیاڵی کردوە (خلیل خیاڵی قوتابی خۆی بووە).

هەرچەندە نوسینی کتێبەکەی بدیع الزمان بە نوسینە تورکیەکەی زۆر ناڕێك نوسیوە لە رووی زمانەوە، بەلاّم ئەتوانم وێنەیەکی پێشکەش بکەم لەوەی دەربارەی خلیل خیاڵی نوسیویتی کە وتوویەتی:

((خلیل خیاڵی ـ خەیاڵی ـ خەڵکی (موتکی)یەو ئـەو کەسـەیە بناغـەی پیتـی ئەبجەدیی کوردیو بناغەی دەستوری زمانی کوردی دانـاوە، بوونـی ئـەو کـوردە نیشتمانپەروەرە (مەبەست خلیل خیاڵی) وەکـوو ئەسـتێرەیەکی گەشـەداری ئـاو ئاسمانی کوردستان وایەو مانای ئەوەیە دوارۆژمان ڕۆشنەو لـە پاشـەڕۆژدا چـەند کەسێکی تری وەکوو ئەو دێنە کایەوەو خزمـەت ئەکـەن. خلیـل خـەیاڵی دانـەری بناغەی چۆنیتی گۆڕینی زمانەکەمانەو داوا لەهاوڵاتیان دەکەم ڕێبازی ئەو بگرنە بەرو بیرو بۆچوونەکانی بکەن بە بناغەی سەرەتای دەرسەکانمان)).

(ئای چەند گرنگەو جێی دڵخۆشکردنە لەناو کوردا مامۆسـتایەکی بـەرزی ئـەو سەردەمەی وەکوو بدیع الزمان ئابەو جـۆرە ڕێـزی لـە قوتابیـەکی خـۆی گرتـوەو بەوەشەوە نەوەستاوە، بەڵکو داوای لە هاوڵاتیانی کوردیش کردوە پێڕەوێتی ئەو بکەن کـە لام وایـە لـەناو کوردا کـەم جـار مامۆسـتای وابـەرزو پـاك هەڵئەکـەوێ بەرامبەر بە قوتابیەکی خۆی).

لێرەدا تاقە سـەرنجێکم بـەبریدا هـات، ئـەویش ئەوەیـە پـیرەمێردی شـاعیری بەرزی کورد وەختی خۆی شیعرێکی وتووە کە لە دیوانەکەی پیرەمێردا لە بغـداد ساڵی ۱۹۷۰ چـاپم کـردوە پـیرەمێرد لـەو شیعرەدا لـە دێڕێکیـدا نـاوی (بدیـع الزمان)ی هێناوە شیعرەکە ئەڵێ :

(کاک ئەحمەد)ەکەی خۆشەویستی خوا زۆرکەس لەسایەی تۆوە نان ئەخوا
لەوانە زیاتر من تۆم خۆش ئەوێ هەرتۆی سەربەرزی قەومەکەت ئەوێ
کە لە زیندانیان تێکخزاندبووین سێدارەیان بۆ داچەقاندبووین
تۆ چووبوویتە لای (بدیع الزمان) مژدەت دابوویە بە ژیانو مان
فەرموو بووت ئێوە نامرن ئەمێنن تاسەر ئازادی گەلتان ئەسێنن

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا پیرەمێرد مەبەستی لـەو (بدیـع الزمـان)ە کێبووە؟؟ ئایا مەبەستی ئەم مەلا سعیدی بدیع الزمانە بووە یا مەبەستی لە شێخ سعیدی پیران بووە کە بەویش وتراوە بدیع الزمان؟

**دوهەم : خلیل خەیاڵی**

یەکێك بووە لە زاناو رۆشنبیرە بەرزەکانی کوردان دانپیاناتی مامۆستاکەی کە ملا سعید نەورەسی بووە وەکوو لە پێشتردا باسمانکرد گەواهێکی ئاشکراو روونە کە خلیل خیاڵی لە چ پلەو پایەیەکی بەرزدابووە. دەربارەی ژیانی خلیل خیاڵیو چالاکیەکانی، دوو سەرچاوەمان هەڵبژارد کە هەریەکەیان بە شێوەیەك باسی ژیانی ئەویان کردوە.

باسی یەکەم لە لاپەڕە/١٨ی سەرچاوە/٥٧دا (قدری جمیل بەگی دیاربکری) وتوویەتی :

((خلیل خیاڵی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی عەشیرەتی (مودان)بووە لە ویلایەتی بدلیسداو هەرلە منداڵیەوە لای (ملا سعید بدیع الزمان)ی مورشیدی ناسراوو بەناوبانگ فێری خوێندن بووەو کەسایەتی ملا سعید کارێکی زۆری کردۆتە سەر ژیانی.

پاش ئەوەی خلیل خەیاڵی چۆتە ئەستەمبوڵو خوێندنی تەواو کردوە لە دەزگاکانی حکومەتی عوسمانیدا بووە بە فەرمانبەرو دوا کاری بریتی بووە لە محاسبی معهدی کشتوکاڵ لە(خالق ئالی)و زمانی فرنسیو عەرەبی جگە لە تورکیو کوردی زۆرباش زانیوەو هەمیشە لە خەمو خەفەتی دواکەوتنی میللەتی کوردا بووەو دەستیکردوە بە نوسینو دانانی کتێب و دانانی دەستوری زمانی کوردیو قاموسێکی کوردی ئامادەکردوەو لە ساڵی ١٩٠٠دا لە ئەستەمبوڵ پەیوەندی بە وەفدێکی گەنجە کوردەوەکانەوە کردوەو لەگەڵیانا دەربارەی بارو دۆخی ئەو رۆژانە قسەی کردوەو لەگەڵیانا دەستی کردوە بە لێکۆڵینەوەو هەستی نەتەوایەتی لەناو ئەو گەنجە کوردانەدا بەهێز کردوەو لەگەڵ (ضیاء ئەفەندی توفیق ئەفەندی) کە لە دیاربکردا دائەنیشت دۆستایەتی پەیدا کردوە.

ضیاء ئەفەندی لە زازاکانی ناوچەی (چرمیك) بووەو بەرلەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ خلیل خەیاڵیدا پەیدا بکاو ببن بە دۆست بوبوو بە تورکخوایەکی تەواوو نازناوی (ضیاء غیوکلب)ی لەخۆی نابوو یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی رێکخراوی (وجاقی تورکی. تورك ئوجاغی)، بەلام لەدوای ئەوەی بوو بە دۆستی خلیل

خەیاڵی ئیتر زۆربەی کاتی  خۆی بە نوسینی دەستوری زمانی کوردی ئەبرد بەرێوەو خۆی ئامادە دەکرد بۆ دانانی قاموسێکی کوردی.

ساتێك ضیاء ئەفەندی لە معهد دەرکرا (دیارە هەمان معهدی کشتوکاڵ بووە کە خلیل خەیاڵی محاسبی بووە)، ئیتر ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ دیاریکرو لەگەڵ خۆیا کۆپیەکی ئەو بەرهەمانەی لەلایەن حکومەتەوە یاساغ کرابوو (دیارە ئەوانە بووە کە لەگەڵ خلیل خەیاڵیدا ئیشی تیادا کردبوو، یا هەر هی خلیل خەیاڵی بووە) هەمووی دەستنووسکردوەو لەگەڵ خۆیا بردبوی بۆ دیاریکرو لەوێ هەتا ساڵی ١٩٠٨ ــ ١٩٠٩ مایەوە کە إعلانی دەستوور کرا ئەوسا گەڕایەوە بۆ ئەستەمبوڵو هەروەکوو نوێنەری دیاریکر لە رێکخراوی أتحادو ترقیدا لە کۆبوونەوەکانی سالانیکدا بەشدار دەبوو.

ساتێك خلیل خەیاڵی داوای موسودەی دەستوری زمانی کوردی لە ضیاء ئەفەندی دەکا بۆی بنێرێتەوە داخوازیەکەی پشت گوێ دەخا بە بیانووی ئەوەی کاتی خۆی هەمووی سووتینرابوو، لەبەر ئەوە خلیل خەیاڵی ناچار دەبێ سەرلەنوێ دەستبکاتەوە بەکارکردن بۆ ئامادەکردنیدەستووری زمانی کوردی)).

دەربارەی ئەو ضیاء ئەفەندیەی ناوی خۆی نابوو (ضیاء غیوکلب).

هەروەکوو لە بەشی شازدەدا لە سەرچاوەی ژمارە/٤٨دا لەوە دواین چۆن ئەو ضیاء ئەفەندیە یەکێك بووە لە تورکە سەر گەرمەکانو خۆی بەتورکێکی رەگەزپەرست زانیبوو، یەکێك بووە لەوانەی کتێبەکەی (مسیولیوڵ کوهین)ی جولەکەی فرنسی کاری تێکردبوو خستبویە سەر رێبازی تورکچێتی. هەروەها لە هەمان بەشی شازدەی پێشوودا باسی ئەو (تورکی ئوجاغە)شمان کردوە کەلە ١٩١١/٧/٣دا دروستکرابوو.

دەربارەی خلیل خەیاڵیو چالاکیەکانی، دوکتۆر کمال مەزهەر لەلاپەڕە/٣٧ی سەرچاوە/٢٤دا بەراوردی چالاکیەکانی خەلیل خەیاڵیو عبدالرزاق بدرخانی کردوەو (لەدواییدا باسی ئەویش دەکەین) وتوویەتی :

وەکوو چۆن خلیل خەیاڵی لە کوردستانی تورکیادا بایەخی دابوو بە خوێندەواریو بلاوکردنەوەی رۆشنبیری، بەوجۆرەش عبدالرزاق بدرخان لە کوردستانی ئێرانا تەقەلاکانی کاریگەر بووە. ئەم نیشتمانپەروەرە دڵسۆزە

(مەبەست خلیل خەیاڵی‌یە) خۆی بۆ خزمەتکردنی زمان‌و ئەدەبی گەلی کورد تەرخانکردبوو زۆر بە گەرمیەوە هانی ڕۆشنبیرانی کوردی ئەدا بە چاوێکی دوربینیەوە بڕواننە ئەو ئەرکە گرنگەی کەوتبووە سەر شانیان‌و بۆی ڕوونکردنەوە نەخوێندەواری دەردێکی کوشندەی کۆمەڵگای کوردە.بە هاندانی مامۆستا خلیل خەیاڵی ژمارەیەك لە ڕۆشنبیران‌و قوتابیانی کورد لە قوتابخانە بەرزەکانا کۆمەڵی (کورد تعمیم معارف جمعیتی =کۆمەڵی بلاوکردنەوەی خوێندەواری کورد)یان دامەزراندو بەرلە دەسپێکردنی شەڕی جیهانی فێرگەیەکی تایبەتی لە ئەستەمبوڵدا بۆ مندالانی کورد کردەوە (دوکتۆر کمال لەپەراوێزی لاپەڕە/٣٧دا وتویەتی خوێندن لەو فێرگەیەدا بە زمانی کوردی بووەو قوتابیەکانی بە گیانی کوردایەتی گۆش دەکران، بەلام بەداخەوە زۆری نەخایان ئەو فێرگەیە لەلایەن حکومەتەوە داخرا).

**سێهەم : حاجی قادری کۆیی**

ساتێك حاجی قادری کۆڵ‌وباری پێچایەوەو لە کۆیەوە ڕوویکردە ئەستەمبوڵ کە ئەوسا شوێنی کۆمەڵگای کورد بوو ژمارەیەکی زۆر لە زانایان‌و سیاسەتمەدارانی کوردی تیا کۆبووبوەوەو، حاجی لەوێ تیکەڵیەکی زۆری پەیدا کرد لەگەڵ دانیشتوانی کوردی ئەوێدا بەتایبەتی لەگەڵ بنەماڵەی بدرخانیەکان‌و هەروەکوو سەرچاوەکان باسیانکردوە حاجی قادری شاعیرو نیشتمانپەروەری کورد مامۆستای عبدالرزاق بدرخان بووەو گەلێك منداڵی تری لەو ڕۆژانەدا فێری خوێندن‌و کوردایەتی کردوەو شیعرە ئاگراویەکانی هەوێنی بزواندنی هەستی نەتەوایەتی بووە لەناو دڵ‌و مێشکی لاوانی کورداو بێترس‌و سڵکردنەوە لەکەس‌و ڕەپ‌و ڕەوان ڕەخنەیەکی توندوتیژی لە سەرکردەکانی کورد گرتوەو کوردی هانداوە ڕچەی بەستەڵەکی کۆنەپەرستی‌و ووشکە ئاینی بشکێنن‌و بچنە سەر ئەو ڕێبازەی میللەتانی تر لەو ڕێگەیەوە بە ئامانج‌و مەبەستەکانی خۆیان گەیشتبوون‌و ڕۆژنامەو بلاوکراوەکانی کوردی گەلێك لە شیعرەکانیان بلاوکردۆتەوەو مقداد مدحت بدرخان لەلاپەڕە/٣ی ژمارە/٣ی ڕۆژنامەی کوردستان کە لە ساڵی ١٨٩٨دا لە قاهیرە دەرچووە هەواڵی کۆچی دوایی حاجی

قادری بەم جۆرە بلاوکردۆتەوە کە وتوویەتی لە ساڵی رابردودا (واتە لە ساڵی ١٨٩٧دا) کۆچی دوایی کردوە.

بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٢٥دا دیوانی شیعرەکانی لەلایەن عبدالرحمن سعید (کە حاکم بووە لە سلێمانی) لە بغداد چاپی کردوەو بە پێی دیوانە تازەکەی حاجی کە سەردار حمید میران‌و کریم مستەفا شارەزا باسیانکردوەو ١٢٣١/ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨١٥ ـ ١٨١٦ زایین لە دایك بووەو بەوجۆرە کە لە ساڵی ١٨٩٧دا کۆچی دوایی کردبێ حاجی قادر دەبێ ٨١ ـ٨٢ساڵ ژیابێ، هەرچەند هەندێ سەرچاوەی تر وتویانە حاجی لە ساڵی ١٨١٧دا لەدایك بووە.

ئەوی راستی بێ، شیعرەکانی ئەحمەدی خانی بەزۆری لە ناوەرۆکی شیعرەکانی حاجی قادردا رەنگیان داوەتەوەو هەروەکوو ئەو قوری پێواوەو بێزاریی خۆی دەربڕیوەو هاواری ئەوەی کردبوو پێویستە کورد لەخەو راپەرێ‌و بکەوێتە خۆی‌و ئەو کاژە کۆنەی بەری راماڵی‌و مشت‌و ماڵی دڵ‌و مێشکی بکاو ئەویش وەکوو ئەحمەدی خانی داوای کردوە چەك‌و قەڵەم یەك بخرێ‌و بە هەردوو چەکەکە خەبات بکاو مافی خۆی وەدەست بێنێت کەلەو روەوە وتوویەتی:

صلاحی ئێوە ئێستاکە سلاحە		تەماعی گەورەیی بێ‌چەك نەکەن نەك
بەشیرو خامە (قەڵەم) دەوڵەت پایەدارە		ئەمن خامەم هەیەو شیر نادیارە

لە شعرێکی تریدا فەرموویەتی :

جۆشێك بدەن وەکوو هەنگ، تەدبیر بکەن بە بێدەنگ
ئەسبابی شەڕ پەیداکەن تۆپ‌و تفەنگ‌و هاوان
پاڕانەوەو تەوەکل لەم عەسرە پارە ناکا
تیرە دوعایی جەوشەن پەیکانە حیرزی مەیدان

حاجی قادر دەربارەی ناکۆکی‌و نا تەبایی ناو کورد پێی وتوون:

هەتا وەك ئاگری بن کان لەگەڵ یەك		ئەگەر طوفان بێ لەشکرتان بەپووشەك
لەبەر حیزە بخۆیی‌و ناتەبایی		لەژێر حیزی حیزانا بوینە دۆشەك

حاجی قادر له شیعرێکیدا ڕووی دەمی کردۆته میللەتی کورد بۆ ئەوەی بایەخ بدەن به خوێندەواری‌و ڕۆشنبیری‌و وتوویەتی:

هەرکوردە لەبەینی کوللی میللەت بێ بەهرە لە خوێندن‌و کیتابەت
میللەتی بێ کتێب‌و بێ نووسین غەیری کوردان نیە لەسەر ڕووی زەمین
ڕۆم‌و جوو، چاکە ئیتفاقی هەیە کوردە بێ غیرەتی‌و نیفاقی هەیە
وادیارە هەتاوەکوو دنیا بێ کوردەکان دەبێ حاڵیان هەروابێ
حاڵەتی ژێر دەستی هەروایە نۆکەری کاری چاکی بۆ نایە

لە هەموو شتێك گرنگتر، حاجی قادری ئاینداری سەرگەرمی دینی ئیسلام، ئەگەر لەو ڕۆژانەدا بەتەواوەتی نەگەیشتبێتە تینی، لەناو ئەو هەموو پیاوە ئاینداره بەناوبانگانەی ئەو ڕۆژانەدا نەیدەوێرا گوێ نەداتی‌و ڕەخنەی توندوتیژ لەو پیاوە ئاینیانە بگرێ کە کەمتەرخەم بوون بەرامبەر بەمیللەتی کورد کە پێی ووتوون:

بەڵێ شێخ قوطبە ئەما قوطبی ئاشە بەنان‌و نیعمەتی خەڵکە گەڕانی
بڵێن بەو سەرکزۆڵەی کوز پەرستە بەچاوی کلدارو بە ڕیشی پانی
کە نەفعێکی نەبێ بۆ قەوم‌و میللەت بەمن چی نەقشبەندی مان‌و نەمانی!!

**چوارەم : عبدالرزاق بدرخان**

لە کتێبەکەی سمکۆدا چاپی ستۆکهۆڵم ۱۹۹٦ بە دوورو درێژ باسی چالاکیەکانی سیاسی‌و ڕۆشنبیری عبدالرزاق بدرخان کراوە لە کوردستانی ئێراناو لێرەدا تەنها باسی ئەو چالاکیانەی ئەکەین پەیوەندییان بە باکوری کوردستانەوە هەبوە .

دەربارەی ئەو چالاکیانەی عبدالرزاق بدرخان، دوو سەرچاوە باسیانکردوە بەدوورو درێژو هەوڵ ئەدەم کورتەی هەردوکیان باس بکەم:

سەرچاوەی یەکەم بریتیە لە کتێبەکەی دوکتۆر جلیلی جلیل سەرچاوە/٥٥، لەلاپەڕە/١٧١دا وتوویەتی:

((عبدالرزاق جگە لە تەقەلاكانی بۆ پێوەندیكردن لەگەڵ ڕۆمەكانا لەڕووی سیاسیەوە بۆ دەسگیربوونی یارمەتی لە ڕۆمەكان، هەوڵێكی زۆریشی دابوو پێوەندی لەگەڵ زانایانو ڕۆشنبیرانی ناو وڵاتی ڕوسیا بكا بۆ ئەوەی سوودیان لێ وەربگرێ بو خزمەتی ڕۆشنبیری كورد.

بۆ ئەو مەبەستە بایەخێكی زۆری دابوو بەدانانی ئەبجەدییەكی تایبەتی بۆ نوسینی زمانی كوردی لەسەر بناغەی پیتی نووسینەكانی ڕووس بۆ ئەوەی نووسەری كورد لەو كێشەیە ڕزگاری ببێ لەكاتی نوسیندا بەپیتی عەرەبی بۆ نووسینی زمانی كوردی (لەدواییدا جلادت بدرخان ئەم ڕێبازەی ئەوی گرتەبەر).

جلیلی بۆ تێهەڵكێشی ئەوباسەی لەوە دواوە ئەو باسەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەكادیمی زانیاری ڕوسی هەندێ باسو دەسنووسی دەربارەی زمانی كوردی بڵاوكردبووەوە، هەروەكوو لە بیبلیۆغرافی ڕوسی كە لە موسكۆ لە ساڵی ١٩٦٣دا چاپكراوە، لەوەدا وتراوە : عبدالرزاق پێوەندیی بە زانایانو شارەزایانی ڕوسەوە كردبوو وەكوو (ن.ی.مار)و (ی.أ. ئۆربیللی)و تەقەلایەكی زۆری دابوو ئەوانەو زانایانی تری ڕوسی یارمەتی كورد بدەن بۆ پێشخستنی باری ڕۆشنبیریو خوێندەواری لەناو كوردلو داوای لەڕوسەكان كردبوو لە (ستراسبرگ) معهدێك بكرێتەوە بۆ خوێندنی زمانو ئەدەبی كوردی هەروەكوو لازاریف لەكتێبەكەیدا (كوردو كێشەی كورد) باسی ئەو تەقەلایانەی عبدالرزاق بەدرخانی كردوە. عبدالرزاق داوای كردبوو لە زاناكانی ڕوس چەند كتێبێك دەربارەی زمانی كوردیو ئەدەبی كوردی بنوسنو بەرهەمە ئەدەبییەكانی ڕوس وەربگێڕن بۆ زمانی كوردیو بەرهەمی شاعیرە ناسراوەكانی كوردیش بكرێن بەڕووسی.

ئەو ئەبجەدییەی (ی.أ.ئۆربیلی) لەكاتی خۆیدا بۆ زمانی كوردی دانابوو لەدواییدا لەساڵانی ١٩١٩ ـ ١٩٢٠دا بوو بەهۆی هاندانی كوردەكانی تفلیس بۆ ئەوەی ئەبجەدییەكی لاتینی بو زمانی كوردی دابنرێ كە لەوەدا خلیل خیاڵیو محمد ئەمین زۆر چالاك بوون لە هاندانی كوردەكان بۆ سەرگرتنی ئەو مەبەستە (لە سەرچاوەكانی تردا شتێكم دەسگیر نەبوو دەربارەی ئەو محمد ئەمینەی وادیارە لە ئەرشیفی معهدی ئەتنوغرافیای سەر بە علومی ئەكادیمی سۆڤێتی ناوی هێناوە).

جلیلی لەلاپەڕە/ ١٨٣ی سەرچاوە/ ٥٥دا باسی چـالاکی ڕێکخراوێکـی کـردوە بەناوی (غیخاندی ـ کەلە هـەندێ سـەرچاوەی تـردا بـەناوی جیهاندانیـەوە نـاوی هاتووە) کە بوبوو بەهۆی گەشە پێدانی هەستی نەتەوایەتی لەناو کوردەکاناو لەو ڕووەوە هـــەروەکوو (ڤیلچڤســـکی)ش لەلاپـــەڕە/٦١ی کتێبەکـــەیدا بـــەناوی (کوردەکانی ڕۆژئاوای ئێران) باسی چالاکی ئەو ڕێکخراوەی کردوە کە وتویـەتی ژمارەیـەك کـوردی زانـاو لێهـاتووی سیاسـیو کۆمەلأیـەتی تیایــا بەشــداربوونو بەهەمویان خزمەتێکی گەورەی زمانو ئەدەبی کوردییان کردوە.

جلیلی لەلاپـەڕە/١٨٤دا باسـی چـالاکی عبدالرزاقـی کـردوە لــە (بترســبرگ) کەلەوێ چاوی بە (سازانوف)و (کلیـم)ی سـەرۆکی بەشـی ڕۆژهـەلأتی ناوەڕاسـت کەوتبوو، لەو چاوپێکەوتنەدا کلیم داوای لە عبدالرزاق کردبـوو لەگـەلٚ ئەرمـەنیو ئاسوریەکانا دۆستایەتی بەهێز بکەنو عبدالرزاق داخوازیەکەی پەسـەند کـردو لـە بترسبرگ لەگەلٚ ئەرمەنیەکانا کۆمـەلێکی پێکـەوە نـاو لـە (تفلیـس)و شـارەکانی تری قفقاسدا پێوەندی بە ئەرمەنیەکانەوە کردو سازانۆف لـەو ڕووەوە پشـتگیری لێ کرد.

لەلاپەڕە /٢٤٩ی کتێبی (پێوەندی نێوان دەوڵەت لـە زەمـانی ئیمپریـالیزمدا) زنجیرەی سـێهەم بەشـی دوهـەم باسـی ئـەوە کــراوە هەرچــەند کلیـم هـەولێ بەهێزکردنی پێوەندی کوردو ئەرمەنی دابوو لەگەلٚ هەندێ ڕوسی تردا بەلأم کلیم وتوویەتی: ((پێشنیازەکانی عبدالرزاق لەم ڕۆژانــەدا بەئاسـانی بـەجێ نـاهێنرێن، بۆیــە ئەوانــەمان هــەلگرت تــا ئەوکاتــەی دەتوانــین چــەند قونســولخانەیەك لەکوردستانا، لەهەندێ شارا دەکەینەوە. لەگەلٚ ئەوەشدا داوامان لـە عبدالـرزاق کـرد نـابێ کـارێکی وابکـرێ ببێتـە هـۆی دوژمنایـەتیمان لەگـەلٚ تورکـەکانا بۆیـە ناشبێ لە ناوچەکانی سەر سنوور نزیك ببێتەوە)).

جلیلی لەلاپەڕە/١٨٦ی کتێبەکەیدا ئەلێ..هەرچەند عبدالرزاق لەسەفەرەکەی بترسـبرگدا لـەڕووی پرۆگرامـە سیاسـیەکانەوە ســەرکەوتوو نــەبوو، بــەلأم ئــەو دەسکەوتانەی دەربارەی ڕۆشنبیری کورد دەسگیری بوبوو شـتێکی کـەم نـەبوو. جلیلی باسی ڕاپۆرتێکی کردوە لەوەدا (ئوربیللـی) وتوویـەتی سـودێکی زۆری لـە عبدالرزاق دەسگیر بوبوو لە ڕونکردنەوەی هەندێ لە شیعرەکانی ئەحمەدی خانی

له مه‌م‌و زیندا‌و ئۆربیللی بایه‌خێکی زۆری دابوو به‌نوسراوه کوردیه‌کان له‌گه‌ڵ ئه‌و قاموسه فرنسیه کوردی‌یه‌ی (أ.ژابا) ئاماده‌ی کردبوو.

عبدالرزاق رۆڵێکی زۆر گرنگی هه‌بوه له کردنه‌وه‌ی به‌شی کوردی لـه زانکـۆی (بترسبرگ) که له‌وێدا ئۆربیللی کرابوو به مامۆستا.

دوای ئـه‌و باسـه‌ی دوکتـۆر جلیلـی جلیـل، ئیسـماعیل شـاویس باسـێکی بلاّوکردۆته‌وه له گۆڤاری رۆژی نوێ ژماره/٧ی تشرینی یه‌که‌می ساڵی ١٩٦٠ کـه لـه شـاری سـلێمانی ده‌رچووه، له‌لاپـه‌ره/٥٠یـدا باسـی چالاکیـه‌کانی عبدالـرزاق بدرخانی کردوه، هه‌ربه ئیملای بلاّوکراوه‌که‌ی خۆی پێشکه‌شی ده‌که‌م:

((مـیر عبدالـرزاق بدرخـان لـه سـاڵی ١٩١٢/١٩١٣دا له‌گــه‌ڵ چــه‌ند پیـاوێکی ناسراوی کورد ده‌چن بۆ شـاری سـان بترسـبرك (لینغـراد)و لـه‌وێ (چـارنیکولا)ی قه‌یسه‌ری روس ئه‌بینێت‌و گفتوگۆی له‌گه‌لا ئه‌که‌ن ده‌رباره‌ی مه‌سه‌له‌ی کورد. بۆ ئه‌وه‌ی یارمه‌تی لێ وه‌ربگـرێ بـۆ پێکـهێنانی حکومـه‌تێك لـه کوردسـتانا لـه هـه‌ر شه‌ش ویلایه‌ته‌که‌ی کوردستانی تورکیا، له ئه‌نجامی ئـه‌و گفت‌و گۆکردنـه‌دا مـیر عبدالرزاق به‌ڵێنی له چارنیکولای وه‌رگرتبوو بۆ دامه‌زراندنی حکومه‌تی کوردستان به مه‌رجێك مافی که‌سایه‌تیه‌کانی وه‌کوو ئه‌رمه‌نی‌و ئاسوری‌و کلدانی بپارێزێت له کوردستانا.

بۆ ئه‌م مه‌به‌سته پیرۆزه‌ی گه‌لی کورد، به‌تایبه‌تی خـێزانی بـه‌درخان‌و خـێزانی شمزینـان‌و ده‌رسـیمیه‌کان یارمـه‌تی عبدالرزاقیـان داو لـه سـاڵی ١٩١٢دا بــۆ به‌جێهێنانی ئه‌م فرمانه گه‌وره‌یه له‌گه‌ڵ سه‌رۆکی (بارو لوتفـی)کـه فیکـری بـه‌گی ده‌رسیمی بوو سه‌رۆکی گشتی نه‌قابه‌ی پارێزه‌ران (محامی) ده‌وڵـه‌تی عوسمـانی بوو دوابوو رێك که‌وتون بو سه‌رگرتنی ئامانجه‌کانی نه‌ته‌وه‌ی کورد.

له کـاتێکدا مـیر عبدالـرزاق کۆششـی ده‌کـرد بـۆ گه‌لـه چه‌وسـاوه‌که‌ی خـۆی، کۆمه‌ڵی اتحادوترقی له‌ژێر فه‌رمانداریتی ئه‌نوه‌ر پاشـاو طلعت بـه‌گ دژی بدرخـان لـه‌کاردا بـوون‌و رۆژنامــه‌کانی (ئه‌سـته‌مبول)و (وقــت)و (سـه‌باح)و (ئیقـدام)و (ته‌صویری ئه‌فکار) دژی عبدالرزاق ئه‌یان نووسی هاواریان ده‌کردو ده‌یـان ووت : عبدالرزاق له‌دین وه‌رگه‌راوه‌و خائنـه، چونکـه هه‌ره‌شـه لـه خه‌لافـه‌تی عوسمـانی ده‌کا.

ئەمەیان بۆ ئەوەبو لەناو کوردا بیشکێنن‌و ناوی خراپ بکەن‌و دەیان نووسی میر عبدالرزاق لەگەڵ مۆسکۆدا پەیمانی بەستوەو چل هەزار تفەنگی وەرگرتوە لەگەڵ پارەیەکی زۆر بەخەیاڵی دامەزراندنی حکومەتی کوردستان لەژێر چاودێریی روسیا. رۆژنامەکانی أتحادو ترقی دەیان نووسی : ئەی ئیسلام... ئەی کوردو تورك، ئەمە چۆن ویژدانتان ئەوە پەسەند ئەکا عبدالرزاق بەوجۆرە بکا؟! بەرامبەر بەوە حکومەت بریارێکی دەرکرد بە پێی ئەوە بدرخانی‌و شمزینانیەکان‌و دەرسیمیەکانیان بەخائن دانا بەرامبەر بەئیسلام‌و تورك.

ساتێك جەنگی یەکەم هەلگیرساو لەشکری روس لەدوای پایزی ساڵی ١٩١٤گەیشتە نزیك (وان)و (ئورمیە) میر عبدالرزاق لەگەڵ قوماندانی گشتی روسیا دەبیّ‌و لە شاری چاڵدێران کە ئەکەوێتە رۆژهەلاتی هەرێمی وان لە سنوری ئێران‌و لەویّ حکومەتی کوردستان دائەمەزرێنێت‌و لەشکرێکی بچووك لە خێڵە کوردەکانی سید طەی شمزینی‌و سمکۆ ئاغای شکاکی کە دوو سەرۆکی کورد بوون لە (باکۆ) بەدیل گیرابوون لەسەر هەوڵو داوای میرعبدالرزاق بەر دەدرێن‌و هەردوکیان دەگەرێنەوەو هاوبەشی حکومەتی کوردستان دەکەن‌و میر عبدالرزاق دەسدەکا بە بەرێوەبردنی کاروفرمانی حکومەتی کوردستان‌و بۆ ئەو مەبەستە بەیاننامەیەك دەرئەکەن‌و داوا ئەکەن کورد پێویست ناکا خۆی بکا بە قوربانی لە پێناوی عوسمانیدا چونکە شەری نێوان تورك‌و روس شەرێکی دینی نیە بەڵکو شەرێکی طورانیزمەو هیچ سودێکی گەلی کوردی تیانیەو شەرێکە لەژێر چاودێریتی (ولهلم)ی ئمپراتۆرێتی ئەڵمانیادا دەکریّ بەمەبەستی دروستکردنی ئیمپراتۆریەتی طورانیەکان بۆ ئەوەی بەجارێك میللەتی کورد لەناوبەریّ، عبدالرزاق لە بەیانەکەیدا داوای کردبو کورد بیّلایەن بن لەو بەیانەدا باسی ئەوەی تیا کرابوو لەو شەرەدا تورك هەر ئەشکیّ‌و بەجیّهێشتن‌و چوڵکردنی ماڵو دێهات‌و شارەکانی کورد تەنها بەرژەوەندیی تورکی تیادایەو هیچ سوودێکی بۆ کورد نیە جگە لەسەرگەردانی بەولاوە. عبدالرزاق لە بەیانەکەیدا ئەڵیّ : روسیا دوژمنی کورد نیەو روس وەکوو تورکەکان بۆ پرۆپاگەندە بلاوی دەکەنەوە چونکە روسیا دانی بە سەربەخۆیی‌و مافی کوردستانا ناوەو لەگەڵ موسوڵمانەکانی روسیادا کردەوەی باشەو یارمەتییان ئەدا. بەرامبەر بەوە

تورکەکان بۆ تەڵەکەبازی بانگەوازێکیان بڵاوکردەوە ئەگەر عبدالرزاق واز بهێنێ لەو کەڵکەڵەیەی لەمێشکیایە ئەوا حکومەت هیچی لێ ناکاو لێی خوش ئەبێ...

ئیسماعیل شاویس لە کۆتایی باسەکەیدا ئەڵێ بەداخەوە ئەو حکومەتەی کورد لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر پاش کشانەوەی روسیا لە شەڕ ئەویش لەناوچوو کە شەڕ برایەوە تورکەکان لە سنوری شاری رواندزدا عبدالرزاقیان لەساڵی ١٩١٨دا بەدیل گرتو درایە دەس علی أحسان پاشا کە سەرکردەی جبهەی عێراق بوو لەوێ بە نهێنی أعدام کرا)).

دەربارەی ئەو یاداشتەی ئیسماعیل حقی شاویس دوو سەرنجی زۆر زەقو ئاشکرا دێنە بەرچاو:

دەربارەی ئەوەی وتوویەتی عبدالرزاق لە بترسبرگ لەگەڵ چارنیکۆلایدا یەکتریان بینیوەو دەربارەی کورد گفتوگۆیان کردوە، بێجگە لەم باسەی ئەو بەهیچ جۆرێك هیچ سەرچاوەیەکی تر باسی گفتوگۆی نێوان عبدالرزاقو بدرخانو نیکۆلای قیصری روسی تیادا نەکراوە، رەنگە ئیسماعیل شاویس مەبەستی بینینو گفتوگۆکردنی عبدالرزاق لەگەڵ نوێنەری قەیسەردا بووبێ نەك خۆیو هەروەکوو لەو باسەی دوکتۆر جلیلیشدا دەردەکەوێ عبدالرزاق چاوی بە سازانۆفو کلیم کەوتووە کە بەئاشکرا کلیم بەعبدالرزاقی ووتبوو نابێ شتێکی وابکەی دوژمنایەتی نێوان ئێمەو تورکی لێ پەیدا ببێ، رەنگە روسەکان کە شەڕی جیهانی هەڵگیرسا حەزیانکردبێ کوردیش هاوکاریان بێ دژی تورکەکان، بەڵام لەهیچ لایەکیانەوە شتێکی وانەکراوە کە بۆنی ئەوەی لێ هاتبێ حکومەتێکی کوردی دروست بکرێتو ئەگەر بەسووسەش باسی شتی وابکرایە ئەوا ئەبوایە هیچ نەبێ لە یەکێك لەو هەموو راپورتو باسانەی لە دۆکیومێنتەکانی ناو ئەرشیفی روسیادا تۆمار کراون شتێکی واهەبوایە کە باسی بینینی عبدالرزاقو نیکۆلای کردبێ.

دەربارەی ئەو حکومەتی کوردیەش گوایە میر عبدالرزاق لەکاتی دەسپێکردنی شەڕی جیهانیدا پێکی هێنابوو دوبارە بێجگە لەم باسەی ئیسماعیل شاویس لەهیچ راپۆرتو دۆکیومێنتدا باسی نەکراوەو هیچ نەبوایە ئەبوایە لەناو دۆکیومێنتەکان باسی ئەو بەیانەی حکومەتەکەی عبدالرزاق بکرایە کە ئەو باسی

ردوەو لام وایە تەنها بەدروست بوونی ئەو هێزە بچووکەی ئیسماعیل شاویس باسی کردوە، بەوە حکومەتێکی پێ دروست ناکرێ....

**پێنجەم ــ کردی زادە ئەحمەد رامز بەگ**

ئەحمەد رامز بەگ یەکێك بووە لەنووسەرو رۆشنبیرە ناسراوەکانی سەردەمی خۆی کە بڵاوکراوەو نوسراوەکانی بەناوی (کردی زادە)وە بڵاودەکردەوە.

زنار سلۆپی (قدری جمیل بەگ)، لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ لە باسی ئەحمەد رامزدا وتوویەتی یەکێك بووە لەو رۆشنبیرانەی بە خۆشەویستی وڵاتو میللەتەکەی بەناوبانگ بووە لەناو کوردەکانی سەردەمی خۆیداو هەمیشە شانازی بەکوردایەتیی خۆیەوە کردوەو هەروەکوو نوێنەرێکی ویلایەتی دیاربکر بەشداری کردوە لە چالاکیە سیاسەکاناو لە ساڵی ١٩٠٠دا بووە بەئەندامی (جمعية العزم القوی الکوردستانی) ئەو رێکخراوە بە دەسپێشکەرێتی (فکری ئەفەندی) پێك هاتبوو (دوکتۆر جمال نەبەز لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣١ ئەو کۆمەڵەی بەیەکەم کومەڵێکی کوردی ژماردووە کە لەساڵی ١٩٠٠دا پێك هاتبوو).

لەگۆڤاری (بەیان)ی ژمارە/١٢٦ کانونی یەکەمی ١٩٨٦ بەناوی (م.تەیفوون) لەلایەن مامۆستا شکور مصطفى کراوە بەکوردی باسێکی وەرگێڕاوە کە باسی ئەحمەد رامزی کردوەو وتویەتی :

((ئەحمەد رامز لیجی (دوکتۆر جلیلی لەسەرچاوە/٥٥دا وتویەتی خەڵکی لیجا بووە) لەساڵی ١٩٠٤دا چۆتە مصرو لەگەڵ تاقمی ژۆن تورکدا پێوەندی پەیدا دەکاو لەساڵی ١٩٠٦ لەمصر (مولود نامە)کەی (مەلای باطي) کەبە کرمانجی نوسیبووی لەوێ بڵاوی دەکاتەوەو لەساڵی ١٩٠٨دا کە اعلانی مشروطیە کرا ئەحمەد رامز یەکێك بووە لە سەرکردەکانی أتحادو ترقی.

زنار سلۆپی لەکتێبەکەیدا لەباسی بەرهەمەکانی ئەحمەد رامزدا باسی چەند کتێبێکی کردوە لەلایەن احمد رامز ــ کردی زادەوە نوسراوە وەکوو : ١ ــ خەتایا سەلەفو خەلەف ٢ ــ ئیختبارا دجلەوفرات، یان ژی گازیا هاوار مابین النهرین ٣ ــ پاش ڤەمانا کوردان یان ژی کوردستان.

لەگۆڤاری بەیاندا کەمامۆستا شوکور باسەکەی تیا وەرگێڕاوە بو کوردی باسێکی کتێبێکی تری ئەحمەد رامزی کردوە بەنێوی (دیوانا دەهری ــ دیوانیکی

بچوكی دەهری) كە لەسەر كتێبەكە نوسـراوە كـوردی زادە ئەحمـەد رامـز چـاپی كردوە.ئەو (دەهری)یەی ئەحمەد رامز دیوانەكەی بۆ چاپكردوە بریتـی بـووە لـە نازنـاوی (حسـین كـامی) كـە حسـێن كـامی ــ یـا دەهـری شـاعیرو نووسـەرێكی داغستانی بووەو لەو دیولنەی ئەودا چەند شعرو نووسینی ئەحمەد رامزیشی تیادا بووەو بەپێی ئەو كتێبە چاپكراوە حسێن كـامی لـە سـاڵی ١٩١٢ ئـەندامی حزبـی (حریەوأئتلاف) بووە كە لەگەڵ ئیتحادو ترقیدا نارێك بووەو ئەحمەد رامز خوشی لەگەڵ طورانیەكانا تێكچووە (بەرلەمە باسی ئەوە كرا كە لە ساڵی ١٩٠٨دا یەكێك بووە لەسەركردەكانی أتحادو ترقیو وادیارە ساتێك أتحادوترقی لە بەڵێنەكانیان بۆ كورد پاشگەز بوونەوە ئەوسا تێكچووە لەگەڵیان).

لەو باسەی ناو گۆڤاری (بەیاندا) باسی جوامـێریو ئازایـەتی ئەحمـەد رامـزی كردوە كە وەختێك (دەهری ـ حسێن كامی ــ كـە داغسـتانی بـووە) ویسـتبووی كتێبەكەی خۆی چاپ بكا ئەحمەد رامز پێی دەڵێ:

چاپكردنی ئەم كتێبە بەئاشكراو بەناوی خۆتەوە تووشـی گـێرەو كێشـەیەكی زۆرت ئەكاو ئیمرۆ ولات پێویستی بەبوونی تـۆ هەیـە، باكتێبەكـە بـەناوی منـەوە دەرچێو بلاوبكرێتەوەو ئەگەر كاربەدەستان شـتێكیان دژی كتێبەكـە كـرد بـامن بەرپرسیاریم بەرامبـەری نـەك تـۆ. هێشـتا كتێبەكـە لەچاپخانـەدا دەبێ پۆلیـس دەچێتە سەر چاپخانەكەو دەس بەسەر كتێبەكەدا دەگرنو ئەحمەد رامز لەسـەر ئەوە دەگیرێو دەدرێ بە (دادگای حرب).

باسەكە ئەڵێ : حسێن كامی خۆی دەربارەی ئەوە وتوویەتی :

((ساتێك بردیانم بۆبەر دادگا، تماشام كرد فیداكاری قدر بلند ــ كـوردی زادە ئەحمەد رامز ئەفەندی لەپێش مندا گەیشـتبووە دیوانـی حـربو لـەوێ بـەدادگای وتبوو حسێن كامی هیچ سەروكارێكی بەم كتێبەوە نیە، چونكە كتێبەكـە كتێبـی منە، بەوجۆرە كوردی زادە منی رزگاركردو خۆی هاویشتە ئەو ئاگرەوە)).

حسین كامی لەباسەكەیدا لەسەری ئەرواو ئەڵێ:

((لەسەر ئەو كتێبەی من دادگای حرب بریاری دورخستنەوەی ئەحمەد رامزی دا بۆ قاستەمونی (شارێكە لە باكوری رۆژئاوای توركیا)و هاوشاریەكانی كوردی زادە دەهاتنە لای من لە گەرەكی (بەبەك) لە ئەستەمبولو داوایـان لـەمن دەكـرد

ڕێگایەك بدۆزمەوە بۆ ڕزگارکردنی کوردی زادەی بێچارەو ساتێك منیش هەوڵم بۆ ئەدا ڕزگاری بکەم کاربەدەستان داوای سێ شتیان لەمن دەکرد:

یەکەم ـ ئەو ڕەخنەیەی لە ( طلعت ) بەگم گرتبوو لێی پەشیمان ببمەوە.

دوهەم ـ بە قورئانی پیرۆزو بە ناموس و شەرەف سوێند بخۆم ئیتر لەمەودوا جارێکی‌تر نە بە پەخشان و نە بە شیعر هیچ شتێك دژی أتحادو ترقی نەنووسم.

سێهەم ـ ئەو مووچەیەی حکومەت بۆی بڕیبوومەوە وەری بگرم و قبولی بکەم )).

وادیارە حسین دەهری ئەو مەرجانەی بۆ خۆیان دانابوو ناردبووی بۆ ئەحمەد رامزو ئەویش بەم شێوەیە وەرامی دابووەوە:

((نامەکەتم پێگەیشت و بە ساغ و سەلامەتیتان پێخۆشحاڵ بووم ـ زوڵم و زۆری زۆرداران چاومان ناترسێنێت و ئەوەی زۆر غەمگینی کردوم لەم زستانە بێ بەزەییەدا بریتیە لە داخستنی قوتابخانە کە ئەمە بەتەواوی دەری ئەخا ئەوانە لە تاوانبارێتی خۆشیان ناسڵەمێنەوە. کاتێك دەربەدەرکرام و دوورخرامەوە ویستیان بەبەرتیل لە خشتەم ببەن و منیش پێم وتن ناتوانم پارەی خەفێتی (جاسوسی) قبوڵ بکەم و بەرامبەر بەوە بەتلگراف ناڕەزایی خۆمم دەربڕی و ناردم بۆ ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ و لەم بارەوە نامەی ئێوەشم پێ گەیشت کە هەق دەدەن بەمن، من لێرە بەرۆژنامەو کتێب فرۆشی دەژیم و گوزەرانی خۆمم پێ دابین کردوە، ئەو پارانەی میللەت لە دەمی خۆی دەیگێڕێتەوە بۆ پێشخستنی ڕۆشنبیری نابێ ئێوە لەو پارەیە بۆ منی بنێرن، بەڵکو بیدەن بەو قوتابخانە بێچارەیەی منداڵان بەخۆڕایی و بێپارە فێری خوێندنیان ئەکاو تەنانەت جل‌وبەرگیشیان بۆ دەکاو بەدانی ئەو پارانە بەمنداڵانی قوتابخانە ئەبێتە هۆی ئەوەی ڕێز لە ئێوەو لە منیش بگیرێ کە ئەمە خەڵاتێکی ئێجگار هێژایە بۆ ئێمە. ئیتر سڵاو لە شوکت ئاغای بەغدایی(ئەو شوکت ئاغایە لایەنگری تاقمی حریەو أئتلاف بووە).

امزا

کوردی زادە ـ ئەحمەد رامز

هەروەكوو لە گۆڤاری (بەیان)دا باسكراوە حسێن كامی لە نوسینەكەیدا وتوویەتی((شۆڕشی نویێ ڕێزی لە كوردی زادە بە چەپكە گوڵان گرت)). ئەحمەد رامز لەدوای ساڵی ١٩١١ گیراو خرایە بەندیخانەوە، بەڵام هەروەكوو لە ڕۆژنامەی (تقدیم وقائع)ی توركی باسی كردوە، ئەحمەد رامزو (١٣٠)كەسی تر لەساڵی ١٩١٢ دا لەلایەن حكومەتی ئەحمەد موختار پاشاوە لێخۆشبوونێكیان بۆ دەرچوو ئەوەی ئەحمەد رامز لە لێخۆشبوونەكەیدا ووترابوو: لێخۆشبوون لە كتێب فرۆشی دیاریكری ئەحمەد رامز. بێگومان جگە لەو چەند كەسەی لێرەدا باسمانكردون گەلێك ڕۆشنبیری تری كوردیش خزمەتیان كردوە وەكوو لەباسەكانا ناویان هاتەوە.

## بەشی هەژدەهەم

# کۆمەڵو ڕێکخراوە کوردیەکان لەباکووری کوردستان بەرلە شەڕی یەکەم

باسی ڕێکخراوە کوردیەکان لە باکوری کوردستانا باسێکی دورو درێژەو ئێجگار ئاڵوزەو تێکەڵە بەباسی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان لە دەرەوەو لە باکوری کوردستانا بلاّوکرابوونەوە هەرچەند جیاکردنەوەی باسی کۆمەڵو ڕێکخراوەکان لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان شتێکی پێویست بوو، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار لەباسی کۆمەڵو ڕێکخراوەکانا ناچارین بۆ ڕوونکردنەوەی پێوەندیی ئەو کومەڵو ڕێکخراوانە بە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانەوە کە لەلایەن ئەو ڕێکخراوانە دەرچووە لە هەردوو باسەکەدا بیان بەستینەوەو لە هەردوو لادا باسیان بکەین کە لام وایە نابێ ئەمە بە دووبارە کردنەوە بژمێرێ وەکوو هەندێ کەس بۆی دەچن.

بێگومان لەسەرەتای سەدەی بیستداو بەر لەوەش بە ماوەیەك لە سەدەی نۆزدەدا ئەستەمبوڵی پایتەختی عوسمانی شوێنی کۆمەڵگای ڕۆشنبیران‌و خوێندەوارانی کورد بووە لەو کوردانەی هەڵدەبژێرران بۆ ئەندامێتی (مجلیسی مبعوثان)و ئەوانەش کەلە ڕێکخراوی أتحادو ترقیدا بەنیازی خزمەتی میللەتی کورد بەشدار بوون تیایا، ئەمانە هەمویان لە ئەستەمبوڵ کۆبوونەوەو کومەڵگایەکی کوردەواریان پێك هێنابوو کە جگە لە کوردی باکور، کوردەکانی باشورو ڕۆژهەلاّتی کوردستانیش تیکەڵ بوبوون بەو کۆمەڵگایەی کورد لە ئەستەمبوڵدا وەکوو لەناوی ئەندامانی ئەو ڕێکخراوو کۆمەڵانەو ئەو نووسەرو ڕۆشنبیرانەی لە باسەکاندا ناویان دێ ڕوون دەبێتەوە.

بەرلەوەی بچمە سەر باسی کومەڵو ڕێکخراوەکان حەزمکرد سەرنجێك دەربارەی ناوی کۆمەڵو ڕێکخراوەکان بخەمە بەرچاو ئەو ناوانە بەهۆی ئەوەی لە سەرچاوە جۆر بەجۆرەکانەوە وەرگیراونو ژمارەیەك لەو سەرچاوانە نووسەرەکانیان بێگانەنو لە نوسینەکانیانا ناوەکانیان بە پیتی نووسینی زمانەکانی خۆیان تۆمارکردوە کە زۆرجار ناوی ڕێکخراوێك لە چەند سەرچاوەیەکدا بە یەك شێوە باس نەکراوە لەکاتی نوسینا، بۆیە داوای لێ بووردن ئەکەم لەو جیاوازی ناوانەی لەو سەرچاوە جۆر بەجۆرانەدا ناویان هاتووە.

بێگومان، جگە لە ڕۆژنامەی کوردستان کە بنەماڵەی بدرخان لە ساڵی ۱۸۹۸دا لە قاهرەوە دەستیانکردبوو بە بڵاوکردنەوەیو هەندێ لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی تر کە کورد لە دەرەوەی باکوری کوردستان دەریانکردوە، ئەوانەی تر لە باکوردا دەرچون لە کاتی مۆرکردنی اصلاحاتی دەستوریەوە ڕێگە درابوو بەکورد چاپەمەنیو ڕۆژنامەو گۆڤار بەزمانی کوردی دەربکەن لەلایەن ئەو ڕێکخراوانەی ڕێگەی کارکردنیان پێدرابوو ئەگەرچی لەساڵی ۱۹۰۰دا (بەرلە اصلاحاتی دستوری) کۆمەڵی عزمی قوی پێك هاتبوو وەکوو لە شوێنی خۆیا باسی دەکەین.

پاشگەز بوونەوەی أتحادوترقی لەو بەڵێنانەی دابویان بەنەتەوەکانی تری غەیری تورك هەموو ئەو نەتەوانەی ناچارکرد هەرلایە بەشێوەی خۆی خەبات بکاو بۆ ئەو مەبەستە گەلێك کۆمەڵو ڕێکخراوی سیاسیو ڕۆشنبیریو کۆمەلآیەتی پێکهێنرا کە کورد یەکێك بووە لەو میللەتانەی کەوتبووە چالاکی بۆ ئەوەی بەرپەرچی ئەو تەقەلایانەی طورانیەکانی أتحادو ترقی بدەنەوە.

دەربارەی ئەوە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەلاپەرە/۱۰ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/۹۲ ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (جلال نوری) کردوە بەناوی (مێژووی دوارۆژ)، لەوەدا جلال نوری بە ئاشکرا مەبەستی طورانیەکانی ئاشکرا کردبوو ووتبوی : پێویستە عەرەبەکانی سوریا ناچاربکرێن ولآتەکەیان بەجێ بێڵنو (یەمەن)و (حجاز)یش بکرێن بە موستەعمەراتی تورکیو زمانی تورکی بە زۆرە ملێ بسەپێنرێت بەسەر هەموو دانیشتوانی ولآتی عوسمانیداو بکرێ بە زمانی

ڕەسمی لە کاروباری سیاسی‌و ئاینیشداو بۆئەوەی دوارۆژی خۆمان مسۆگەر بکەین پێویستە هەموو دانیشتوانی عەرەبەکان بکرێن بە تورك چونکە ئەگەر کارێکی وا نەکرێ ئەوەی تازە پێگەیشتوی عەرەب ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەماری نەتەوایەتی‌یان بەهێزتر دەبێت‌و لەئەنجاما توشی کارەساتێکی گەورە دەبین.

(جلادت بدرخان لەلاپەڕە/٦٦ی کتێبەکەیدا سەرچاوە /٦٠باسی ئەوەی کردوە کە تورکەکان دەیان زانی ئەو کارەیان بەئاسانی سەر ناگرێ لەگەڵ عەرەبەکانا کە زمانەکەیان زمانی قورئان بوو بۆیە هەموو تەقەلاکانیان لەو ڕووەوە ئاڕاستەی کوردو ئەرمەنی‌و ئەرنائوطی‌و چرکسی کردبوو).

دەربارەی کەوتنەخۆی کورد بۆ بەرەنگاربوونەوەی تورکەکانی أتحادو ترقی کە دەستیانکردبوو بە پێشێلکردنی مافی کورد، کاك مسعود بارزانی لەلاپەڕە/١٨ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/١٢باسی شێخ عبدالسلام بارزانی کردوە کە پێوەندی هەبوە بە جمعیتی تعالی‌وترقی کوردو کۆمەڵی هێڤی‌و جمعیتی استقلالی کوردو لە بەهاری ١٩٠٧دا لەگەڵ شێخ نور محمد بریفکانی کە سەرۆکی تەکیەی (قادری)بوو لەگەڵ چەند سەرۆکێکی تری کوردا تلگرافیان نارد بۆ (بابی عالی)لە ئەستەمبوڵ‌و لەو تلگرافەیانا چەند داخوازیەکیان خستبووە بەرچاو کە بریتی بوون لە :

١ ـ کردنی زمانی کوری بە زمانێکی ڕەسمی.

٢ ـ پێویستە هەموو کاروبارێك بە پێی یاسای ئیسلام ببرێت بەڕێوە.

٣ ـ خوێندن لە قوتابخانەکاندا بە زمانی کوردی بێ.

٤ ـ قائمقام‌و مدیری ناحیەکان‌و فەرمانبەران لەوانەبن زمانی کوردی بزانن.

٥ ـ ئەو باجانەی لەخەڵك دەسێنرێ هەروەکوو خۆی بمێنێتەوە (یەعنی زۆر نەکرێ)، بەمەرجێك ئەوەش بۆ چاکردنی ڕێگاوبان‌و قوتابخانە تەرخان بکرێ لە ناوچە کوردیەکانا.

وێنەی ئەو تلگرافە نێررا بۆ شێخ عبدالقادری شێخ عبیداللەی نهری‌و بۆ ئەمین عالی بدرخان‌و شریف پاشای کوڕی سعید پاشای خندان.

کاك مسعود لەلاپەڕە/٢٠ی کتێبەکەیدا ئەڵێ شێخ عبدالسلام خۆی تلگرافەکەی مۆر کردبوو ناردبوی‌و لەو کۆبوونەوەیەدا هەموو سوێندیان خواردبوو

واز لەو داخوازیانە نەهێنن (سەرچاوەی کاك مسعود بۆ ئەمە بریتی‌یە لە کتێبەکەی (صدیق دملوجی)چاپی موصل ساڵی ١٩٥٢).

ئەوەی شایانی باسە تورکەکانی عوسمانی بەرامبەر بەو داخوازیانە بێدەنگ نەبوون‌و هێزیکیان ناردە سەر ناوچەکە بەسەرکردایەتی محمد فاضل پاشای داغستانی لە کۆتایی ساڵی ١٩٠٧دا شێخ عبدالسلام ناچارکرا ڕوویکاتە ئاسوریەکان لەگوندی (تیاری)و لەماوەی شەش حەوت ساڵدا هەمیشە لەلایەن سوپای عوسمانیەوە پەلاماری ئەدراو ساتێك سلێمان پاشای نظیف بوو بەوالی موصل دەستی کردەوە بەناردنی هێز دژی شێخ عبدالسلام‌و شێخ عبدالسلام لەگەڵ سمکۆدا دەچێ بۆ (تفلیس)و لەوێ چاوی بە نوێنەری حکومەتی روسی قیصری دەکەوێ‌و داوای یارمەتی دانی لێدەکا بۆ کوردو لەرێگەی گەڕانەوەیدا لەگوندی (کەنکە جین) لەلایەن صوفی عبدالله ناوێکەوە خیانەتی لێ دەکرێ‌و لە شێرین خەودا عبدالسلام دەگیرێ‌و دەدرێتە دەست حکومەتی عوسمانی‌و لە ١٩١٤/١٢/١٤دا شێخ عبدالسلام لە سێدارە دەدرێ. (ئەوەی شایانی باسە، صدیق دملوجی لە کتێبەکەیدا ـ الضحایا الثلاث بە دورو درێژ باسی کوشتنی شێخ عبدالسلام بارزانی کردوە).



وێنەی شێخ عبدالسلام بارزانی لەگەڵ نوێنەری روسی قیصری لە تفلیس

دوای ئەو پێشەکیە بەزنجیرە باسی کۆمەڵو رێکخراوە کوردیەکان ئەکەین لە باکووری کوردستانا:ـ

١- کۆمەڵی عزمی قوی

دوکتۆر جمال نەبەز لە لاپەڕە/٩٤ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣١ لەباسی ئەم کۆمەڵەدا وتوویەتی ئەم کۆمەڵە لەساڵی ١٩٠٠دا پێکهێنراوەو بەیەکەم کومەڵو رێکخراوی کورد دەژمێررێ.

قدری جمیل پاشا (زنارسلۆپی) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧بەهەمان جۆر باسیکردوەو وتویەتی بەهۆی (لطفی فیکری)یەوە دروست بوو وکردی زادە احمد رامزی نوێنەری دیاریکر یەکێك بووە لە ئەندامە چالاکەکانی بەرلەمە لەباسی (ئەحمەد رامز ـ کردی زادە) شدا باسی ئەوە کرابووە ئەویش یەکێك بووە لە ئەندامانی ئەم کۆمەڵە.

٢- کوردستان تعاون‌و ترقی جمعیتی

لەدوای اعلانی دەستورو دەرچوونی فەرمانی سوڵتان، کوردەکان بەئاشکرا دەستیانکرد بەچالاکی‌و کۆمەڵێکیان لە ئەستەمبوڵ پێکهێنا بەناوی کورد (باکوردستان) تعاون‌و ترقی جمعیتی لە ساڵی ١٩٠٨دا گەلێك سەرچاوە دەربارەی ئەو کۆمەڵەو چۆنێتی پێکهێنانی‌و چالاکیەکانیان نوسیوە.

لەبەرئەوەی ئەم کۆمەڵە، بە بەهێزترین کۆمەڵو رێکخراوی کورد دەژمێرێ کە لەدوای اصلاحاتی دەستووری پێك هاتبوو، لام وایە هەر ئەم کۆمەڵەش بووە کە بووە بە بناغەی رێکخراوو بزوتنەوەکانی داهاتوو لە باکوری کوردستانا، بۆیە بەپێویستم زانی باسەکە بکەم بەدوو بەشەوە:

یەکەم : چۆنێتی پێك هاتنی

کۆمەڵی کوردستان تعاون‌وترقی جمعیتی لە سەرچاوەکانا بەگەلێك شێوە ناوی هاتووە هەرچەند هەموویان هەریەك مەبەستی گرتووەو جیاوازی نێوان ناوەکەی لە سەرچاوەکانا بەهۆی پاش‌و پێش خستنی هەندێ ووشەوە بووە کە لە زمانی تورکیا پاش‌وپێش دەخرێ، بو نموونە: دوکتۆر جلیلی جلیل لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٥ بەکورد تعاون‌وترقی جمعیتی ناوی بردوە کەلەمەدا

لەگەڵ ئەوەی (Robert olson)دا یەك دەگرنەوە کەلە سەرچاوە/٨٤دا باسی کردوە.

دوکتۆر عبدالستار طاهر شریف ـ لەکتێبەکەیدا الجمعیات والمنظمات الاحزاب الکردیة چاپی ١٩٨٩ لەلاپەڕە/١٩داو لەو باسەیدا لەسەرچاوە/٤٠دا بە (کوردستان تعالی جمعیتی) ناوی بردوە، بەڵام دوکتۆر جمال نەبەز لەلاپەڕە/٩٤ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣١بە (یەکیتی تعالی‌و ترقی کورد)و سیامەند احمد عوسمان لەباسەکەیدا سەرچاوە/١٢بە (کۆمەڵی کوردستان تعالی‌وترقی جمعیتی) ناوی بردوە.

وەکوو دوکتۆر عبدالستار باسی کردوە ئەو کۆمەڵە لەساڵی ١٩٠٨ لەلایەن چەند تێکۆشەرێکی کوردەوە پێکهێنرابوو وەکوو ئەمین عالی بدرخان، شریف پاشای خندان، شێخ عبدالقادری شمزینی‌و داماد نوالکلفل پاشاو مراد محمد علی‌و خلیل رامی‌و کامران‌و فواد پاشاو حکمت بابان‌و حسێن‌و شکری‌و فؤادو محمودوعلی لەبابانەکان، سید عبدالله‌و رمزی بەگی خربوطی‌و اکرم جمیل بگو نجم الدین حسێن‌و ممدوح سلیم‌و حسن حامدو فریدو دوکتۆر شکری محمدو حسین عونی خربوطی، محمدی نوێنەری ملاطیە‌و ئەمین زەکی‌و میر ئالای خلیل بگ دەرسیمی‌و محمود ندیم پاشاو فریق مصطفی پاشا السلیمانی (مەبەست مصطفی پاشا یا مولکی‌یە)و فریق حمدی پاشاو قائمقام محمد امین زکی بگ السلیمانی (مەبەست ئەمین زەکی بەگە مێژوو نوسە)و شێخ علی شیروان‌و شفیق ئەفەندی خێزانی‌و گەلێك کەسی تر

(پیرەمێردی شاعیر وەکوو لەدواییدا باسی دەکەین سەرنووسەری ئەو رۆژنامەیە بووە کە ئەو کۆمەڵە دەری کردوە لەبەر ئەوە بێگومان ئەویش ئەندام بووە).

بەراستی دوکتۆر عبدالستار طاهر شریف کارێکی زۆر باشی کردوە کە پرۆگرام‌و پەیرەوی ئەو کۆمەڵەی لە تورکی‌یەوە کردوە بەکوردی کە لە ئەستەمبوڵ لە چاپخانەی استقبال مطبعەسی ساڵی ١٣٢٥ی کۆچی چاپکراوەوەهەروەکوو لە لاپەڕەکانی (٢٣-٣٥دا) بڵاوی کردۆتەوە کردویەتی بە عەرەبی بریتی بووە لە (٢٤)مادە.

عبدالعزیز یـامولکی لەلاپـەڕە/٥٥ی کتێبەکـەیدا سـەرچاوە/٦٧باسـی ئـەوەی کـردوە لـەدوای پێکـهاتنی ئـەو کۆمەڵـە دبلۆماسـی ئینگلـیز لـەتورکیا تلگرافیـان ناردبوو بۆ باڵیۆزی حکومەتی بریتانیا لە ئەستەمبوڵو بریتانیایان ئاگادار کردبوو دەربـارەی ئـەو کۆمەڵـەو لەئـەنجامی ئـەوەدا حکومـەتی بریتانیـا تلگرافـی پیرۆزباییـان ناردبوو بـۆ ئـەو کۆمەڵـە (کەبەراسـتی شـتیوا زۆرکـەم لـە ئینگلـیز وەشـابوو) سـەرچاوەکان هەریەکـەیان بەشـێوەیەك باسـی چالاکیـەکانی ئـەو کۆمەڵەیان کردوە، کە کورتەی ئەو چالاکیانە، جگە لـەوەی ئـەو کۆمەڵـە هـەوڵی دابوو هەموو کورد یەك بخاو لەدەوری خۆی کۆیان بکاتەوەو هەموو بەیەك دەنگ داوای مافی نەتەوەی کورد بکەن، دوو تەقەلای تریشی دابوو:

**یەکـەم : بایـەخدان بەبلاوبوونـەوەی خوێنـدەواری لـەناو کـورداو کردنـەوەی قوتابخانەو دەرکردنی رۆژنامەیەك کە ئۆرگانی کۆمەڵەکە بێ.**

**دوهـەم : بەهێز کردنی دۆستایەتی لەگەڵ ئەرمەنەکانا بۆ ئەوەی بەهەردوولا ڕوو بەڕووی اتحادو ترقی ببنەوە کە زۆربـەیان بـە بیروبـاوەری طورانیێتـی گۆشکرابوون و لەدلا نیازیان پاك نەبوە لەگەڵ کوردا.**

دەربارەی یەکەم :

وەکوو دوکتۆر عبدالستار طاهر شریف لەلاپەڕە/٣٥ی ئەو کتێبەیدا بەعەرەبی وەکوو لەپێشەوە باسمانکرد وتوویەتی کۆمەڵێکی رۆشنبیری بەناوی (جمعیة نشر المعارف الکردیة)بەکوردیەکەی وتویەتی (کۆمەڵەی بلاوکردنەوەی زانیاریی کورد) لەسـاڵی ١٩٠٨دا پێك هـات کـە بریتـی بـوو لـەڕێکخراوێکی ئـەدەبیو پـەروەردە کردن و پرۆگرامێكو پێڕەوێك دانرا بۆ ئەو ڕێکخراوە کە بریتی بووە لە (١٥)مادەو ئـەو ڕێکخـراوە قوتابخانەیەکیشـی کردۆتـەوە بـەکوردی لەگـەڕەکی (چەمبـەرلی طاش) کە خلیل خیاڵی کرا بەلێپرسراو بۆ ئەوەی منداڵانی کـورد لـە ئەسـتەمبوڵ فێربکرێن.

دەربارەی ئـەو بانەیـە ــ یـا کۆمەڵـە، یـارێکخراو، هـەروەکوو لەلاپـەڕە/١٢ی دیوانە تازەکەی پیرەمێرد کەلە بغداد لەسـاڵی ١٩٩٠دا چاپکراوە، لـەوەدا باسـی ئەوە کـراوە پـیرەمێر وتویـەتی ئـەو ڕێکخـراوە رۆژنامەیـەکی بـەکوردیو تورکـی

دەرکردوە (لەباسی گۆڤارو رۆژنامەکان باسی دەکەین) کە یەکەم ژمارەی لە ١٩٠٨/١١/٩دا دەرچووە، جلیلیش لەلاپەرە/٦٥ی سەرچاوە/٥٥ ئاماژەی بۆ کتێبی(17-N 1-2 Revue du monde Musulman) کردوە چاپی ساڵی ١٩٠٩ کە لەلاپەرە ١٧٠ – ١٧١یدا وتراوە سەرنوسەرەکەی توفیق بووە — کەمەبەست توفیق ـ پیرەمێرد بووە.

جلیلی لەهەمان کتێبیدا دەربارەی ئەو رێکخراوە وتوویەتی پێکهێنانی ئەو کۆمەڵە بۆ ئەوە بووە هەموو کۆمەڵو تاقمی رۆشنبیرانی کورد لە بۆتەیەکی سیاسیی یەکگرتوودا جۆش پێ بدرێو کۆیانکاتەوە کە (ئەکیمۆڤیچ) ئەو رۆشنبیرانەی بەسێ بەش ناویردون : بدرخانیەکان، شمزینیەکان، بابانەکان. جلیلی دەربارەی چالاکی کۆمەڵی کورد تعاونوترقی جمعیتی لەلاپەرە/٧٣ی هەمان کتێبدا وتوویەتی کورد تعاونو ترقی زۆری پێ نەچوو دەستی کرد بەچالاکی سیاسیو چەند لقیکی لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئەنادوڵدا کردەوەو لەدیاربکرو بدلیسو بغدادو موصلو موشو ئەرزرۆم چالاکی زۆرباشی هەبوەو ئەو یانەیەی لەبدلیس کردیانەوە بوویە گەورەترین یانەو ژمارەی ئەندامەکانی هەتا دەهات لە زۆربووندا بوو، بەئاشکرا بەریەرەکانی أتحادوترقی دەکرد کە لە بدلیسدا بوو.

نائبی قونسوڵی روس (ئەکیمۆڤیچ) لەو راپۆرتەیدا رۆژی ١٩٠٨/١٠/٢٣ ناردبووی باسی ئەو پەرەسەندنەی یانەکەی بدلیسی کردوەو وتویەتی لەوانەیە ژمارەیان بگاتە چەند هەزار ئەندامێك هەروەکوو لە ئەرشیفی وزارەتی دەرەوەی روسیا/ باڵیۆزخانەی روسیا لە ئەستەمبوڵ ساڵی ١٩٠٨ لەلاپەرە/٥٨یدا باسی ئەوەی ئەکیمۆڤیچ کراوە.

دەربارەی ژمارەی ئەندامانی لقی بدلیس، لازاریفیش لەلاپەرە/١٤١ی کتێبەکەیدا وتویەتی ژمارەیان گەیشتبووە (٨٠) هەزار ئەندام (لام وایە مەبەستی ئەندامانی هەموو ناوچەی بدلیس بووبێ چونکە بروا ناکەم شاری بدلیس ئەو ژمارەیەی لێ بووبێ). هەروەکوو ئەکیمۆڤیچ باسی کردوە کوردە دەوڵەمەندەکان دەستیانکردبوو بەکۆکردنەوەی پارە بۆ ئەوەی (٤٠هەزار لیرە) کۆبکەنەوە بۆ ئەوەی بەو پارەیە لە بدلیسدا کارگەیەکی پێ دروست بکەن.

جەلیلی لەلاپەڕە/٧٤ی سەرچاوە/٥٥دا باسی ئەوەی کردوە هەرچەند هەندێ لە دەرەبەگو سەرۆك عەشایرەکان بۆ سوودی خۆیان چوبوونە ئەو یانەوەو بوبوون بە ئەندام، بەلاّم پەرەسەندنی یانەکە ترسێکی تەواوی خستبووە دڵی بەڕێوەبەرانی یانەکانیتر، بۆ نمونە ئەرمەنیەکان ئەو چالاکیەیان بە شتێکی پڕ لە مەترسی ئەزانیو هەروەکوو لە راپۆرتی ئەکیمۆڤیچ لە لاپەڕە/٥٨ی ئەرشیفی وزارەتی دەرەوەی روسیا ــ باڵیوێزخانەی روسیا لە ئەستەمبوڵدا وتراوە:((یەکێتی کوردەکان سەرنجی زۆر لای راکێشاوە چونکە بەرێکخراوێکی بەهێز دێتە بەرچاو، بەتایبەتی دوای ئەوەی لەویانەیەدا دەسکرا بە مەشقو فێرکردنی کاروباری سەربازی بەناو پاراستنی ئاسایشی ناوچەکەوە)).

لازاریفیش لەلاپەڕە/ ١٤١ی کتێبەکەیدا ـ کوردو باسی کوردستان ــ باسی ئەوەی کردوە تاقمی أتحادو ترقی لە بدلیس ئەو پەرەسەندنو فراوان بوونەیان پێ ناخۆش بوو، بۆیە لەمانگی ئایاری ١٩٠٩دا ئەو یانەیان داخستو توانیبویان هەندێکیان بەکێش بکەن بەلای خۆیانا.

جلیلی لەلاپەڕە/٧٥ی کتێبەکەیدا باسی راپۆرتێکی تری ( ئەکیمۆڤیچ)ی کردوە کە ناردبووی بۆ (زینوفیف)و باڵیوێزی روس لەئەستەمبوڵ لەوەدا رەزامەندی خۆی بۆ دەربڕیوە دەربارەی ئەو داخستنەو وتوویەتی: کوردەکان کە هەتا ئێستە بەهێزترین تاقمن دژی دەستور وەستاون، پێویستە رێگەی ئەوەیان پێ نەدرێ ببن بەلایەنگری دەستور، لەگەڵ ئەوەدا داخستنی ئەو یانەیە بەدڵی ئەرمەنیەکانەوئەو ترسەی لەدڵدا نەهێشتن کە بەیەکبوونی کورد لەدڵیانا پەیدا بوبوو.

لێرەدا بۆ بەرپەرچی ئەو بۆچوونەی ئەکیمۆڤیچ گوایە ئەرمەنیەکان داخستنی یانەکەی کوردیان پێ خۆشبووە، هەندێ بەلگە هەیە ئەو بۆچوونەی پووچەڵ دەکاتەوە: بۆ نمونە : هەروەکوو جلیلی باسی کردوە لەسەرچاوە/٥٥دا، رۆژنامەی (غورتس)ی ئەرمەنی لە ژمارە/٣ی رۆژی ١٢/١٠/١٩٠٨دا وتوویەتی ئەو کۆمەڵەی کورد پێوەندییەکی بەهێزی هەبوە لەگەڵ کۆمەڵی طاشناقی ئەرمەنیدا.

رۆژنامەی (جاماناك)ی ئەرمەنیش لەژمارە /١٩ی رۆژی ١٩٠٨/١٠/٧ لەژمارە /٧یدا نوسیبووی کوردو ئەرمەن پێکەوە بۆ یەك ئامانج تێدەکۆشن‌و هەردولایان وەکوو دوو هاوکاری وەك یەك پێکەوە رێبازی خەبات‌و تێکۆشانیان گرتوتەبەر.

دەربارەی گرنگێتی ئەو یانە کوردیانەی کۆمەڵی (کورد تعاون‌و ترقی جمعیتی) پێکی هێنابوون (أ. شاهبازیان) لە کتێبەکەیدا (مێژووی کوردو ئەرمەنی لەلاپەرە/ ١٧٧دا وتوویەتی:

((یانە کوردیەکان رۆڵێکی زۆر گرنگیان هەبوە لە بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردا، چونکە تا ئەوساکە ئەو یانانە پێك نەهاتبوو هەندێ لەکوردەکان خۆیان لەریزی تورك دەژمارد، بەڵام کە ئەو یانانە کرانەوە هەستی نەتەوایەتی لەناو ئەو کوردانەشدا پەیدا بوو بەهێز بوو)).

سەرچاوەکان باسی چالاکیی (کورد نشر معاریف)ی کردوە کە بایەخێکی زۆری دابوو بە بڵاوبوونەوەی خوێندەواری‌و رۆشنبیری لەناو کورداو ئەرکی چاپکردنی کتێبی بەکوردی گرتبووە ئەستۆی خۆی.

(دەربارەی ئەوە جلیلی لەسەرچاوە /٥٥دا ئاماژەی بۆ باسێك کردووە لە رۆژنامەی التاخی رۆژی ١٩٦٧/٧/١٠دا لە بغداد دەرچووە باسی چالاکی کورد نشر معاریفی کردوە کە خلیل خەیالی موتکی رۆڵێکی گرنگی هەبوە لە بەرێوە بردنی کاروباریا.

جلیلی لە سەرچاوە/٥٥دا باسی رۆژنامەیەکی فرنسی کردوەRevue du monde Musulman no:4 لاپەرە/٥٧٨ ساڵی ١٩١٠ کە باسی ئەوەی کردوە کۆمەڵی کورد نشر معارفی لە ئەستەمبولْ بەپارەی ئابوونەو باریووی کوردەکان بەرێوە دەچوو کەلە ناوچەی (دیوانیولو) لەجادەی (حاجی پاشا) دەردەچوو، لە ئاهەنگی کردنەوەیدا عبدالرحمن بدرخان (٣٠) لیرەی داو بەڵێنیشیدا هەموو مانگ ئابوونەی خۆی بدا.

دەربارەی ئەو رێکخراوەی کورد نشر معارفی رۆژنامە ئەرمەنیەکان وەکوو (ئۆرایزۆن)و (ئازاتارماتا)و (جاماتاك) هەریەکەیان بەشێوەیەك باسیانکردوەو لەوە دواون پرۆگرامی وتنەوەی دەرسەکان لە قوتابخانەکەیانا وەکوو پرۆگرامی قوتابخانەکانی تر وابووەو عبدالرحمن بدرخان کرابوو بەلێپسراوی قوتابخانەکە لە

سەرەتادا (٣٠) منداڵی کورد دەرسیان تیادەخوێندو لە دوایـدا ژمارەیـان زۆربـوو لە شوێنەکانی دەرەوەی ئەستەمبوڵیش هەوڵدرا قوتابخانەی لەوجۆرە بکرێتەوە.

رۆژنامـــەی (ئـــازا تارماتـــا) لـــەژمارە/ ٩٠ی رۆژی ١٩١٠/١٠/٢٢ داوای لـــە رۆشنبیرانی کورد کردبوو کۆڵ نەدەن‌و داوا لە سەرکردەکانی خۆیان بکەن چالاك بن چونکە دوارۆژی گەلەکـەیان بـەندە بـە بـڵاو بوونـەوەی هەسـتی نەتەوایـەتی‌و رۆشـنبیری‌و پێشـکەوتووخوازەکانی ئەرمـەنی لـە مەبەسـت‌و چالاکی کوردەکـان گەیشـتون‌و داوایـان لێ کردبـوون هەسـتی نەتەوایـەتی لـەناو خـاکی خۆشـیانا بڵاوبکەنەوە چونکە ئەستەمبول بەشوێنێکی باش‌و لەباری هەمیشەیی نازانرێت.

(بەراستی ئەم بۆچـوون‌و بانگـەوازەی ئـەو رۆژنامـە ئەرمەنیـە ئـەوەندەی تـر درۆکانی ئەکیمۆفیچ بـەدرۆ دەخاتـەوە لـە راپۆرتـەکانیا بـۆ باڵیۆزخانـەی روسـی دەنارد لە ئەستەمبول وەکوو لەپێشتردا باسمانکردوە).

دەربارەی ئەو کۆمـەڵی رۆشـنبیری‌یەی دوکتـۆر عبدالستار طـاهر شـریف بـە (کۆمەڵەی بڵاوکردنـەوەی زانیـاریی کـورد) نـاوی بـردوە و دوکتـۆر جمـال نەبـەز بەکورد نشر معارفی باسی کردوەو دوکتۆر کمال مەزهـەر لـە سـەرچاوە/٢٤دا بـە (کورد تعمیم معارف جمعیتی) ناوی بردوە، ئەمانـەش هـەمویان هەریـەك کۆمـەڵ بوون‌و ووشـەکانی پـاش‌و پێـش خـراون هـەروەکوو ئـەوەی لـەناوی (کوردسـتان تعاون‌وترقی جمعیتی)دا روویداوە.

دەریـارەی شـوێنی ئـەو قوتابخانەیـەی کـورد تعمیـم معـاریف جمعیتـی کردبویـەوە، دوکتـۆر عبدالسـتار طـاهر شـریف وەکـوو لـە سـەرەتادا باسمـانکرد وتویەتی لە گەڕەکی (چەمبەرلی طاش) دروست کرابوو خلیـل خیـاڵی لێپرسـراوی بـووە، لـەوەدا سـیامند احمـد عوسمـان‌و صـادق شـرفکندی لـە کتێبەکـەیدا سـەرچاوە/٧١ هـەروەکوو عبدالسـتار طـاهر شـریف بـە چەمبـەری طـاش ناویـان بردووە، بەڵام کریس کوچیرا لەسەرچاوە/٤١دا وتوویـەتی لـە (خـان ویـرلی طـاج) بووە.

تـەنیا سـەرچاوەیەك کـە ناووشـوێنی قوتابخانەکـەی پێکـەوە نـاوبردووە باسەکەی سیامند ئەحمەد عوسمانە سەرچاوە/١٣ کە وتویەتی ئـەو یانەیـە پێـی وە (کورد کوپلری)و شوێنەکەی لە چەمبەرلی طاش بووە.

هەرچۆنێك بووبێ، چ کۆمەڵی کوردستان تعاون‌و ترقی جمعیتی و ئەو یانانەی کە سەرچاوە بێگانەکان بە (club) ناویان بردوەو نوسەرانی تر بـە کـورد تعمیـم معاریف جمعیتی ناویان بردوە، پاش ئەوەی تاقمی اتحادو ترقی لـە بەڵێنـەکانی خۆیان پاشگەز بوونەوە هەردووکیانیان داخست.

**دوهەم: چالاکیەکانی ئەو کۆمەڵەو بەهێزکردنی پێوەندی لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا**

بێجگە لـە پێکهێنانی کورد تعمیم معـارف جمعیتـی‌و قوتابخانەکـەی (کـورد کوپلـری)و دەرهێنـانی رۆژنامـەی (کـورد) کـە پـیرەمێرد سەرنوسـەری بـووەو هەندێکی‌تر بە (کوردستان تعاون‌و ترقی گازیتەسی)ناویان بردوە (وەکوو لەباسی رۆژنامەو گۆڤارەکانا باسیان دەکەین، بێجگە لەوانە ئـەو کۆمەڵـە هـەوڵێکی زۆری دابوو پێوەندی نێوان کوردو ئەرمەنی بەهێز بکا، هەروەکوو دوکتۆر جلیلی جلیل لەسەرچاوە /٥٥دا باسیکردوەو ئاماژەی بـۆ وتـارێکی (موفتـی زادە) کـردوە کـە داوای بەهێزکردنی نێوان کوردو ئەرمەنی کردبوو لەو ڕووەوە هەواڵنێری رۆژنامـەی (غورتـــس)ی ئەرمـــەنی لـــە ژمـــارە/١٣ی رۆژی ١٩٠٨/٩/٢١دا وتوویـــەتی : (( قسەکەرێکی یانـەی کـورد بەتـەواوەتی ئـەوەی خسـتە بـەرچاو کـە مەبەسـتی سەرەکی لەدروست کردنی ئەو یانەیە بۆ بـەهێزکردنی دۆسـتایەتی نێـوان کـوردو ئەرمەنی بووە)).

هـەروەها لەهـەمان ژمـارەی (غورتـس)دا هـەروەکوو جلیلـی لەلاپـەڕە/٧٢ی سـەرچاوە/٥٥دا باسـیکردوە نموونـەیـەکی هێناوەتـــەوەو لـــە رۆژنامەکـــەدا بـــلاو کراوەتەوە کە: دوێنێ لە (خاسغیوغ) کە گەڕەکێکە لـە دەورویـەری ئەسـتەمبوڵ کۆبوونەوەیەکی کوردو ئەرمەنی کرا بەرامبەر بەو دەسدرێژیەی لەلایەن هـەندێ کوردەوە دژی تاقمێك لە ئەرمەنەکان کرابوو، بەرامبەر بەوە ئەرمەنیەکان داوایان لە دەوڵەتی بێگانە کردبوو (مەبەستی ئەوروپاییەکانە) چارەسەری ئـەو کێشـەیە بکەن، بەڵام توانرا لەلایەن ئەرمەنیەکان‌و دوو نوێنەری کوردەوە کە ئەندامی ئەو یانەیـە بـوون ئـەو کۆبوونەوەیـە سـاز بکـەن‌و هـەردولا بـێزاری خۆیـان دەربـڕی بەرامبەر بـە رووداوەکـان‌و بەرامبـەر بـەو کـارو رەفتارانـەی ئەبنـە هـۆی تێکدانـی دۆستایەتی هەردولاو ئەو کۆبوونەوەو رێکەوتنە دەنگێکی ئێجگار باشی دابـووەو بوبووە هۆی دڵنیای بوونی هەردوولا لەیەکتری.

### ٣- حزبی هێڤی (هیوا)

ئەو سەرچاوانەی باسی حزبی هیوایان کردوە دوبارە لەمەشدا هەندێ جیاوازی لە بۆچونەکانیانا دەبینرێ، بۆیە بەپێویستم زانی کورتەی هەندێکیان بخەمە بەرچاو.

بێگومان دوای ئەوەی اتحادو ترقی بوون بە دەسەلاتدارو بەهێز بوون لە بەڵێنەکانیان پاشگەزبوونەوە بەرامبەر بە کوردو کوردستان تعاون و ترقی جمعیتی و کورد تعمیم معاریف جمعیتی و ئەو قوتابخانەیەی لە چەمبەرلی طاش کرابووەو لقەکانی ئەو کۆمەڵەیان لە هەندێ ناوچەی کوردستانا وەکوو بدلیس هەمویان قەدەغە کردن و داخران، ئیتر کورد، بەتایبەتی لە کۆمەڵگای ئەستەمبولدا وەنەبووبێ بێدەنگ دانیشتبێت، بەڵکو بەنهێنی کەوتە خۆی و دەستی کرد بەچالاکی نواندن.

سەرچاوەکان هەریەکەیان بەشێوەیەك باسی ئەوانەیان کردوە کە بەشدار بوون لە دامەزراندنی هێڤیدا، بۆ نموونە:

دوکتۆر عبدالستار طاهر شریف لەکتێبەکەیدا سەرچاوە /٤٠دا لاپەڕە /٢٨٨دا وتویەتی لەساڵی ١٩١٠دا قوتابیە کوردەکانی ناو قوتابخانەی کشتوکاڵ لەئەستەمبوڵ توانیبویان کۆمەڵی (هێڤی) کوردی دامەزرێنن کە ئەندامە دامەزرێنەرە بەناوبانگەکانی برتی بوون لە :

عومەر بەگی جمیل پاشاو قدری جمیل پاشا لەناسراوەکانی دیار بکرو فۆاد تەمۆبەگی وانلی و زەکی بەگو ئەکرەم بەگی جمیل پاشاو ممدوح سلیم و خلیل خەیاڵی موتەکیش گەورەترین هاندەریان بوو بۆ دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەو خۆشی ئەندامی دامەزرێنەر بوو، لەپاش ماوەیەك شەهید کمال فەوزی و براکەی ضیاء وەهبی و نجم الدین حسین کرکوکی و عزیز بابان و شفیق ئەوراسی و همزە موکسی و طیب علی خرپوتی (دوکتۆر جلیلی جلیل لەلاپەڕە/٥٧ی سەرچاوە/٥٥دا وتوویەتی لەساڵی ١٩٢٥دا ئەو طیب علی یە لەوانەبوو لەشۆڕشەکەی شێخ سعیدی پیراندا لەدوای شکاندنی لەگەڵ شەهیدەکانی تردا هەڵواسرا)، عبدالکریم سلێمانی (کریم بەگ کە لەباسی رۆژنامەکانی کۆمەڵی هێڤیدا لەدواییدا باسی دەکەین) وصالح دیاربکری و عبدالقادر دیاربکری و ئاصف

بدرخـان‌و مصطفـى ره‌شـادى ديـاربكرى‌و دوكتـۆر مصطفـى شـوقى مـه‌هابادى‌و محمدى ميهرى سنه‌يى‌و دوكتۆر فؤاد حكارى‌و عبدالرحيم حكاريى شاعير.

ده‌رباره‌ى كـاتى دروسـتبوونى حزبـى هێڤـى سـه‌رچاوه‌كان هه‌ريه‌كـه‌يان به‌شێوه‌يه‌ك باسيانكردوه:

١) بلـه‌چ شـێركوه له‌سـه‌رچاوه/٦٠داو جنبشـهاى كـورد سـه‌رچاوه/٥٢داو سيامه‌ند ئه‌حمه‌د عوسمـان له‌سـه‌رچاوه/١٣و صـادق شـرفكندى سـه‌رچاوه/٧١و دوكتۆر عبدالستار طـاهر شريف هـه‌موويان وتويانـه كـه كۆمـه‌ڵى هێڤـى له‌سـاڵى ١٩١٠دا درووست بووه (صادق شرفكندى وتوويه‌تى له ١٩١٠هێڤى دامـه‌زراوه‌و لـه ١٩١٢دا به‌ئاشكرا كارى ده‌كرد).

٢) دوكتۆر جمال نه‌به‌ز سه‌رچاوه/٣١و دوكتۆر كمال مه‌زهه‌رو رۆبرت ئۆڵسۆن وتوويانه هێڤى له‌ساڵى ١٩١٢دا دروست بووه.

٣) بـه‌ڵام مينۆرسـكى له‌لاپـه‌ڕه/٩٣ى كتێبه‌كـه‌يدا سـه‌رچاوه/٤٣ وتوويـه‌تى له‌ساڵى ١٩١٣دا دروست بووه.

٤) جليلـى له‌لاپـه‌ڕه/ ٤٨ى گۆڤـارى رۆشـنبيرى ژمـاره/١١٦ى سـاڵى ١٩٨٧ وتويه‌تى له ساڵى ١٩١٢دا دروست بوو وه‌له شارى (لۆزان)ى سويسـره‌ش لقێكى هه‌بوه به‌ڵام كه شه‌ڕى يه‌كه‌م ده‌ستى پێكرد ئه‌و كۆمه‌ڵه له چالاكى كـه‌وت‌و ئـه‌و ئه‌رشيفه‌ى هـه‌بوو درا بـه عبدالعزيـز بابـان بـو ئـه‌وه‌ى بيپـارێزێ‌و لـه‌دواى تـه‌واو بوونى شه‌ڕى يه‌كـه‌مى جيـهانى كۆمه‌ڵـه دوبـاره به‌سـه‌رۆكايه‌تى ئـاصف بدرخـان ده‌ستى كردوه‌وه به‌چالاكى كه ئه‌كره‌مى جميل پاشا سه‌رۆكى فخرى بووه، به‌ڵام كه مصطفى كمال بوو به‌ده‌سه‌ڵاتدار دوباره ئه‌مه‌ش داخرا.

ده‌رباره‌ى چالاكيـه‌كانى كۆمـه‌ڵى هێڤــى، جگــه لــه‌ده‌ركردنى رۆژى كـوردو هه‌تاوى كورد كه‌له دواييـدا لـه‌ناو رۆژنامـه‌و گۆڤاره‌كانـا باسـى ده‌كـه‌ين، هـه‌ندێ چالاكيشى بووه له چاپكردنى كورديدا. بۆ نمونه: دوكتۆر عبدالستار طاهر شريف له‌سه‌رچاوه/ ٤٠دا باسى ئه‌وه‌ى كردوه كۆمه‌ڵى هێڤى قاموسى فـێركردنى زمـانى كوردى‌و توركى ئامـاده كـردوه كـه بـه‌ناوى (هينگـر زمـانى كـوردى)يـه‌وه بـووه له‌سـه‌رى نوسـرابوو كتێبـى ژمـاره/١ى كۆمه‌ڵـه لـه‌دواى شـه‌ڕى جيـهانى له‌سـاڵى

١٩٢١دا لەناو کتێبەکانی تردا بەشێوەی کرمانجیو بابانی (مەبەست کرمانجی خواروەوە) لەچاپخانەی استقبالی بابی عالی ـ (ئەبو سعود) چاپکراوە.

٤- پارتی استقلالی کوردستان

دوکتۆر جمال نەبەز لەلاپەڕە/٩٥ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣١ وتوویەتی پارتی استقلالی کوردستان لەساڵی ١٩١٧دا پێوەندیی بە روسە تزارەکانەوە کرد (مانای ئەوەیە بەر لەتەواو بوونی شەڕی یەکەم ئەو پارتە دروست بوبوو)، بەڵام کە شۆڕشی ئوکتوبر ڕژێمی تزاری سەرنگون کرد هەموو پلانەکان هەڵوەشانەوە.

بەڵام دوکتۆر عبدالستار طاهر شریف وتویەتی لەدوای موتارەکە(مەبەست وەستانی شەڕی یەکەمە)و لە پەراوێزی لاپەڕە/٢٩١دا. سەرچاوە/٤٠وتویەتی هەندێجار بەکۆمەڵەو هەندێجار بە (یانەی کورد)و هەندێجار بە حزبی سەربەخۆیی کورد (استقلالی کوردستان) ناوی هاتووە (ئەمە لەگەڵ ئەوەی دوکتۆر جمال نەبەزدا یەك ناگرێتەوە کە وتویەتی لەساڵی ١٩١٧ پێوەندی بەروسەوە کراوە کە مانای ئەوەیە پێش (موتارەکە) دروست بووە نەك لەدوای ئەوە.

بلەچ شێرکوە (جلادت بدرخان) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٠ وتوویەتی ئەم کۆمەڵە لە قاهیرەدا لەلایەن سریا بدرخانەوە دروست بوو (بەڵام نەیوتووە لەچ ساڵێکدا دامەزراوە).

بەڵام کاك مسعود بارزانی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە /١٢ لە لاپەڕە/١٨دا لەباسی شێخ عبدالسلام بارزانیدا وتویەتی پێوەندی بەکومەڵو ڕێکخراوە کوردیەکانەوە هەبوە کە یەکێك لەوانە (جمعیتی استقلالی کوردستان)بووە. بەپێی ئەو بۆچوونەی کاك مسعود ئەبێ جمعیتی استقلالی کوردستان لەساڵی ١٩١٢دا یا بەرلەوە دروست بووبێت چونکە شێخ عبدالسلام لەساڵی ١٩١٢دا لەلایەن تورکەکانەوە شەهید کرابوو..... تۆ بڵێی ئەو حزبەی جلادەت بدرخان باسی کردوە کە وتویەتی لەقاهرە لەلایەن سریا بدرخانەوە دروست بوبوو ئەو حزبە بووبێ کە لقێکی لەکوردستانا هەبووبێو شێخ عبدالسلام پێوەندی پێوە کردبێ.

دەربارەی ئەوە لە کتێبی (القضية الكردية من الضحاك الى الملاذ)، لەلاپەرە/٥٧دا ئەمیش وەکوو جلادەت بدرخان وتوویەتی حزبی استقلالی کوردستان لە قاهرە لەلایەن سریا بدرخانەوە دامەزرابوو، لقێکیشی لەکوردستانا هەبوە بەڵام کە مصطفی کمال بوو بەدەسەڵاتدار ئەو حزبە داخرا.

عبدالستار طاهر شریف لەلاپەرە/٢٩١ی سەرچاوەی/٤٠دا باسی ئەوەی کردوە چۆن ئەم کۆمەڵە ناکۆکی لەنێوان ئەندامەکانیا پەیدابوو بوو بە دوو بەشەوە، لیستەی بدرخانیەکان و لیستەی تاقمی شێخ عبدالقادر ئەفەندی شمزینی.

نوسەر ئاماژەی بۆ باسێکی دوکتۆر ئەحمەد عوسمان کردوە (کوردستان فی عهد السلام) کەلە گۆڤاری (الثقافة)ی ژمارە/٢ی ساڵی ١٩٨٧دا بلاْوکردوەتەوە (سەرچاوەی دوکتۆر ئەحمەد عوسمانیش بۆ باسەکەی بەڵگەنامەیەکی ناو ئەرشیفی وزارەتی دەرەوەی بریتانیایە کە لەرۆژی ١٩٢٠/٥/٢٠دا لەژێر ناوی ــ یانەی کوردی ـ لەئەستەمبوڵ بوو بەپێی ئەو سەرچاوەیە لیستەی بدرخانیەکان بریتی بوون لە :

١ ـ دوکتۆر عبدالله جودت بەگی خەڵکی خربوط ـ دوکتۆرو نوسەر بووە.

٢ ـ شوکری بەگ بابان ـ لەدیاربکر لەدایك بووە.

٣ ـ شوکری محمد بگ ـ خەڵکی دیاربکر بووە.

٤ ـ جلادت بدرخان.

٥ ـ ئەکرەمی جمیل بەگ.

٦ ـ ئەمین عالی بدرخان (باوکی سریاو جلادت و کامران بدرخان).

٧ ـ حسێن حاجی بەگ : پارێزەرو خەڵکی (ئورفە)بووە.

٨ ـ ممدوح سلیم خەڵکی وان ـ نوسەر لە رۆژنامەی (ژین)دا.

٩ ـ نجم الدین حسێن بەگ ـ خەڵکی کرکوك بووەو مامۆستای علوم بووە.

بارەگای کۆمەڵ بەشێوەیەکی کاتی لەدەزگای بەڕێوەبردنی رۆژنامەی (ژین)دا بووە لە شەقامی (أبو السعود) ـ رێگای (الباب العالي).

بەپێی ئەو سەرچاوەیە، سریا بدرخان لەقاهیرەوە یاداشتێکی بەناوی (ئەحمەد سریا) ناردبوو بۆ نوێنەرانی دەوڵەتان (کە ئەمانە لەلایەن (سیر

وینکیت) له ١٩١٨/١٢/١٦دا له دۆکیومێنتی ژماره (٦٠٨/٩٥/ ٤٣٤)و لەوەدا سریا بدرخان ناڕەزایی خۆی دەربڕیوه بەرامبەر دابەشکردنی کوردستان).

٥- تشكيلاتى أجتماعيه

دوکتۆر عبدالستار له کتێبەکەیدا سەرچاوه/٤٠وتویەتی پاش داخستنی کۆمەڵی تعالیوترقی (کورد کۆمەڵی تشکیلاتی کۆمەڵایەتی کورد) لەلایەن علی جودتو کامران بدرخانو کمال فوزیو ئەکرەمی جمیل پاشا زادەو دوکتۆر شوکری محمد (مەبەست دوکتۆر محمد شوکری صگبانه کەله زەمانی کمالیەکانا پەنای بردبووه بەر عێراقو لەکوردایەتی لایداو دەستیکرد به ستایشی کمالیەکان بۆ ئەوەی ڕێگەی بدەن بگەڕێتەوه بۆ تورکیا)؛ وممدوح سلیمو سەرۆکی ئەم کۆمەڵه ئەمین عالی بدرخان بووه(باوکی سریاو جلادتو کامران بووه).

له کتێبی القضية الكردية من الضحاك الى الملاذ،لەلاپەڕه/٥٧دا وتویەتی ئەو کۆمەڵه بەناوی (کۆمەڵی شەعبی کوردی)یەوه ناوبراوه، بەلام دوکتۆر جمال نەبەز لەلاپەڕه/٩٤ کتێبەکەیدا بەناوی (تشكيلات أجتماعيه)وه باسیکردوه.

٦- جمعيتى حريت پرور فرقەسی

رۆبرت ئۆڵسۆن لەکتێبەکەیدا سەرچاوه/٨٤ به (معتدل حريت پرور فرقەسی) ناوی بردوه(Muatadil Hurriet Firkasy) کەبه ئینگلیزیەکەی بەرامبەر بەوه وتویەتی (Moderate Freedom party) هەروەکوو لەو کتێبەی رۆبرت ئۆڵسۆندا باسکراوه ئەو کۆمەڵه رۆژنامەیەکی دەرهێناوه بەناوی (Tanzimat) ـ تنظیمات ـ لوطفی فکری یەکێك بووه له ئەندامه چالاکەکانی ئەو کۆمەڵه کە زۆر دژی تاقمی أتحادو ترقی کورد بووەو کە شەڕی جیهانی دەستی پێکرد جمعیتەکەو رۆژنامەکه هەردوکی داخرا.

٧- رێکخراوی میللەتی کورد

دوکتۆر جمال نەبەز لەپەراوێزی لاپەڕه/٩٤دا، سەرچاوه/٣١ وتوویەتی ئەو رێکخراوه بەناوی (رێکخراوی میللەتی کورد)ەوه بووه.

٨- رێکخراوی ئیرشاد

تاقه سەرچاوەیەکی دەسگیربوو دەربارەی ئەو رێکخراوه بریتیه لەکتێبەکەی دوکتۆر جلیلی جلیل سەرچاوه/٥٥ کەله لاپەڕه/١٩٤دا وتوویەتی بریتی بووه له رێکخراوێکی نهێنی لەمانگی ئابی ١٩١٢دا دروست بووەو بەپێی ئەو راپۆرتو

نامانـەی لەباڵیۆزخانـەی روسـەوە لـەتورکیاوە نـێرراوە بـۆ وەزارەتـی دەرەوەی روسیا باسی ئەوە کراوە کوردەکان بەنهێنی رێکخراوێکیان پێکـەوەنابوو بـەناوی (ئیرشاد)ەوە کە لیژنەیەکی تایبـەتی سەرپەرشـتی کردوەو بـەڕێوەی بـردوە بـو ئەوەی راپەڕینێك دەس پیبکریّ دژی حکومەتی تورك.

نوسەر ئەڵیّ: هەروەکوو (خیرالدین برازی) بەنامەیـەك (شـترمین)ی قونسـوڵی روسی لە ئەرزرۆم ئاگادار کردبوو ئەو لیژنەیە لەچەند کەسێك پێکهاتبوو وەکوو : عزیز بەگ، زیرکی عقید ئەفـەندی، ئەلاشـکیر تسـکی، شـێخ ئوصمـان(عوسمـان) ئەفەندیو بکر ئەفـەندی. ئـەو رێکخـراوە چاپخانەیـەكو صندوقـی پـارەی خـۆی هـەبوەو ئەندامـەکانی ئابوونـەو مانگانـەی خۆیـان داوەو چاپخانەکـەو قاسـەی پارەکە لای بکر ئەفەندی بووە لە(خنیس).

لـە راپۆرتێکـی (شـتر مـین)دا بـۆ وەزارەتـی دەرەوەی روسـیا دەربـارەی چاوپێکەوتنی بەخیرالدین برازی وتوویەتی: ئەو لیژنەیە بەنهێنی پەیوەندی ئـەکا بەلقەکانیەوە لە (وان)و (دیاربکر)و (ئورفە)و شوێنەکانی تر. بەپێی راپۆرتەکان، لیژنەکە خیرالدین برازی ڕاسپاردبوو چاوی بـە کوردەکـانی ئـەرزرۆمو بدلیسو بایەزیدو موش بکەویّ بۆ گفتوگۆ کردنو خۆ ئامادەکردن بۆ راپەڕینێك.

بەپێی راپۆرتەکەی (شتر مین) وادیارە لیژنەکە لەرووی داراییـەوە دەسکورت بووەو ئەگـەر پـارەی هەبوایـە دەیتوانـی لـەماوەی (١٥) رۆژدا دەس بکـا بـە راپەڕینو لەبەر ئەوە خیرالدین بـەگ چـاوەڕوانی یارمـەتی حکومـەتی روس ئـەکا (ئـەوە شـایانی باسـە بنەماڵـەی (بـرازی) لەسـوریا لـەو کوردانـەن لـە بـاکوری کوردستانەوە لەتاو جەوری تورکەکان روویانکردۆتە سوریا کـە ئـەو خـیری بەگـە یەکێك بووە لەو بنەماڵەیە).

جلیلی لە باسەکەیدا ئەڵیّ: رێکخراوی ئیرشاد بۆ ئـەوەی هـەندیّ پـارە پـەیدا بکا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیو بۆ ئەوەی بتوانیّ چەك بکڕیّ بڕیاریدا باجو پیتاك کۆبکاتەوە کە لەو رۆژانەدا کوردەکانی سێرتو دەوروبەری بشیری، غارزان ئەمانە باجیان نەدەدا بەحکومەت بەڵکوو دەیان دا بەحەسەنو سلێمان بدرخان.

لەبـەهاری ١٩١٣دا سـەرۆکەکانی ناوچـەی شـیروانی سـەر بـە سـێرت کۆبوونەوەیەکیان کرد بو گفتوگـۆ کـردن دەربـارەی دروسـتکردنی ئـەمارەتێکی سەربەخۆی کورد.

## بەشی نۆزدەهەم

# رۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکان تا شەڕی یەکەمی جیهان کە پەیوەندییان بە باکوری کوردستانەوە هەبوە

لەباسی پێشوودا باسی رێکخراوو کۆمەڵو حزبو جمعیەتە کوردەکانمان کرد کە لەلایەن کوردەوە ـ بەتایبەت کوردەکانی باکور ـ پێك هاتبوو، لەوەش دواین هەندێ لەو رێکخراوو کۆمەڵانە گۆڤارو رۆژنامەیان دەرکردوە چ لەتورکیا بوبێ یا لەولاتی دەرەوە کە ئاوارەکانی کورد دەریانکردوەو ئەم بەشەمان بۆ ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە دەرکردوە کە سەرچاوەکانی خۆمانەو بێگانە لەسەریان نوسیوە.

دەتوانرێ دەرچوونی ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە بکرێن بەسێ قۆناغ

**١ ـ قۆناغی یەکەم : بریتیە لە رۆژنامەی کوردستان کە لە ١٣١٤/٤/٩ی کۆچیدا لەقاهرە یەکەم ژمارەی دەرچووەو دوا ژمارەی لە ١ی نیسانی ١٣١٨ی کۆچیدا دەرچووە.**

**٢ ـ قۆناغی دوهەم : لەدوای اعلانی دەستوری عوسمانی لەساڵی ١٩٠٨دا رێگە کرایەوە بۆ کورد ئەویش دەستبکا بەچالاکی سیاسی خۆیو کۆمەڵی تعاونو ترقی جمعیتی رۆژنامەیەکیان دەرکرد بە ناوی ( کورد ) کە هەندێ سەرچاوە بە ( کورد تعاونوترقی غزەتەسی ) باسیانکردوە.**

**٣ ـ قۆناغی سێهەم : دەرچوونی گۆڤاری ( رۆژی کورد ) لەلایەن کۆمەڵی هێڤیەوە کەلە دواییدا ناوی گۆڤارەکە گۆڕراو کرا بە ( هەتاوی کورد ).**

بێجگە لەو رۆژنامەو گۆڤارانە چەند بڵاوکراوەو چاپەمەنیەکی تریش دەرچووە لە هەندێ سەرچاوەدا ناوەکانیان هاتووە.

زوبر ١ | سالا اوّلي | عدد ١

# كردستان

١٣١٥

حجي كاغذك ني ربكه دڤي ريكث بمري سر ئاف خوبي ني جريده بي لاو بدرخان پاشا مقداد مدحت بكي هر جار دوهزار جريده يا بي بره ازسره دبكم كردستاني دبلين خلكي بازده روژا جاركي نيت نڤيساندن

عنوان
مصرده «كردستان» غزته سي
صاحب ومحرري بدرخان
پاشا زاده
✽ مقداد مدحت ✽
مرطبعه . . . دفتر كردستان
ولايت مقالات ارسال ورسائلر بله
قرار نشر ... اوك جنيدر

كردستان خارجنده هر بر
ايجون سنه لك ابونه بدلي
٨٠ غروشدر
كردستان داخلنده محرري
امثالنه مجانا گوندرلور

✽ كردلري ايقاظ وتحصيل صنايعه تشويق ايجون نشر اولنور ✽

✽ اون بش گونده بر نشر اولنور كردجه غزته‌در ✽

✽ روژا پنجشنبي ده ٣٠ ذوالقعده سنه ١٣١٥ پنجشنبه في ٩ نيسان سنه ١٣١٤ ✽

بسم الله الرحمن الرحيم

صد هزار شكر وحمد ژ خدى تعالى‌ره آم مسلمان خلق كرن . وظائفنا علم ومعرفتيره هش وزكا دامه . درحقا عليمادنا علم ومعرفتيره گلك آيتين جليله واحاديث شريفه هنن دنيايده چقاس مسلمان هين گوند وبازيرين حياده مكتب ومدرسه وجريده هنن دنيايده چه دبه چه نابه جريده دنڤيسن . حيفاس نيت ژ كرداره كرد ژ گلك قوما زيده‌تر خوي هش وزكانه چابرن دبين خوده راست وقوينه خورتن ودبسا وكه قومين دي نه خوندانه نه‌زوانن دنيايده چه دبه جيران وان وسقوف جاوه وي چه بكه نظالن لوما ربخدي‌ده من آف جريده پاما نڤيسي باذنا خدى تعالى باش نهو هر پازده روزاده جاركي آزي جريده‌كي بنڤيسم . ئاف ني من كربه ( كردستان ) ني جريده‌يده آزي بحثا قنجيا علم ومعرفتا بكم

لكوديري مروف دعلمه لكوديري مدرسه ومكتبين قنج هنه ازي نيشا كردا بكم لكوديري چه شر دبه دولتين معظم چه دكن جاوه شر دكن تجارت جاوه دبه ازي حيا حكايت بكم حتي نهو كسي جريده‌كي دولي نڤيسي‌به آف جريده‌يا منالها يا اوّلي‌به لوما وي گلك كيمايي هبتن . ازهيڤي دكم كيمايا جريده‌يي ژمتره بنڤيسن حمي تشتي وكي نو چه دبن بكن باشي بمنكي دچه دكون ربده اقه ايدي ازي دست مقصدي بكم . ( ومن الله التوفيق )

---

حضرت پيغمبر عليه الصلوة والسلام گوتي‌به «العلماء ورثة الانبياء» انكو علما وارثين انبيانه ژ طرف خديده مامورن وعظ ونصيحتي بدن خلكي ريا قنج نيشا وان بكن لوما گلي علمايين كردا جاره اون وعظ ونصيحتا بيژي ددن ول دڤي اون مير وآغا وكرمانجين دناسن وان تشوبقا طالبنا علم ومعرفتي بكن ريا قنج نيشا وان بكن هكي اون وي نكن گنهي حيا سطوى‌ويه

ژماره یەکی رۆژنامەی کوردستان لە قاهیرە

## قۆناغی یەکەم : رۆژنامەی کوردستان ١٨٩٨ ــ ١٩٠٢

دەربارەی رۆژنامەی کوردستان چەند سەرچاوەیەك باسیانکردوە کە هەندێ جیاوازی لەنێوان سەرچاوەکانا هەیە، بۆیە بەپێویستم زانی لەو سەرچاوانە بدوێم کە بەلای منەوە راستترین سەرچاوە بریتیە لە ژمارەکانی رۆژنامەکە خۆی کە مامۆستا محمد امین بوز ئەرسلان کارێکی ئیجگار باشی کردوە بەوەی لە دوویەرگدا فۆتۆکۆپیەکانی بلاوکردۆتەوەو بەپیتی لاتینو بەشێوەی کرمانجیی ژوور هەموو باسی ژمارەکانی چاپکردوە لەساڵی ١٩٩١دا لە ستۆکهۆڵم کە برای بەرێزو خۆشەویستم دوکتۆر عمر شێخ موس بەدیاری ئەو دوو بەرگەو فۆتۆکۆپی ژمارەکانی گۆڤاری ژین (١٩١٨ ــ ١٩١٩)ی بۆی ناردوم کە ئەمەی دوهەمیان لەبەرگی دوهەمی کتێبەکەدا باس دەکرێن.

کاك جمال خەزنەدار لەلاپەرە/١٧ی رابەری رۆژنامەگەریدا سەرچاوە/١٤ لەباسی ئەم رۆژنامەیەدا وتوویەتی رۆژنامەیەکی نیو مانگی بووە، خاوەنو نوسەرەکەی مقداد مدحتو عبدالرحمن بەدرخان بووەو (٣١) ژمارەی لێ دەرچووەو شوێنی دەرچوونی ژمارەکانی باسکردوە کە لەگەڵ فۆتۆکۆپیەکانی محمد امین بوز ئەرسلاندا یەك دەگرنەوە.

بەلام زۆرم لاسەیریوو ئەمین زەکی لە زۆرکەس شارەزاتریووە لەچالاکی رۆشنبیرانی ئەو رۆژانەو هەتا دوای شەری جیهانیی یەکەم لە ئەستەمبوڵدا مابووەوە بەلام لەبەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا مێژووی کوردو کوردستان وتوویەتی رۆژنامەی کوردستان لەلایەن مدحت بەگی کورەزای بدرخانەوە لە ئەستەمبوڵ دەرچووەو ساتێك نەخۆش کەوتوە عبدالرحمن بدرخان لە پێشدا لەقاهیرەو لەدواییدا لە (جنێف) دەری کردوە هەروەکوو لەلاپەرە/٣٥١ی کتێبەکەیدا باسی کردوە.

ئەمین زەکی لەو لاپەرەیەدا وتوویەتی : لەدوای اعلانی دەستوری عوسمانی (مەبەستی ساڵی ١٩٠٨بووە) جارێکیتر ئەو رۆژنامەیە لەلایەن (سریا بدرخان)ەوە دەرچووەو لەکاتی شەری جیهانیشدا هەردەرچووە کە ژمارەکانی (٣١)ژمارە بووە.

وەرگێری کتێبەکەی ئەمین زەکی بۆ عەرەبی محمد علی عونی لەپەراوێزی لاپەرە/٣٥١ی کتێبەکەی ئەمین زەکیدا وتوویەتی : ((ئەو ژمارانەی لەکاتی

شەڕی جیهانیدا دەرچووە شوێنی چاپکردنیان نەزانراوە، بەڵام ئەوەی من بزانم سریا بدرخان بەر لە شەڕی یەکەم ڕوویکردە قاهیرەو لەساڵانی ١٩١٥ ـ ١٩١٦دا ڕۆژنامەیەکی دەرکرد بەزمانی کوردیو تورکی کە مانگی دووجار بەنازناوی خۆیەوە(عزیزان)دەریکردووە.بەوجۆرە دەردەکەوێ کە ئەمین زەکی لەکتێبەکەیدا تاقە سەرچاوەیە کە وتویەتی ڕۆژنامەی کوردستان لەپێشدا لە ئەستەمبوڵ دەرچووە کەلێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا تۆ بڵێی جگە لەو ژمارانەی محمد امین بوز ئەرسلان فۆتۆکۆپیەکانی چاپکردون، بەرلەوە بە زنجیرەیەکی جیاواز لەو (٣١) ژمارەیە مدحت بدرخان ڕۆژنامەیەکی بەهەمان ناوەوە چاپکردبێت کە هیچ شوێنەوارێکی دیارنیەو هیچ سەرچاوەیەکی تریش باسی نەکردوە؟؟ یا تۆبڵێی وشەی (ئەستەمبول) هەڵەی چاپەمەنی بووبێ کە ئەمین زەکی باسی کردوە؟.

دوکتۆر مارف خەزنەدار لە لاپەڕە/٩٣ی کتێبەکەی مینۆرسکیدا سەرچاوە/٤٣ وتوویەتی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستانم لە ئەکادیمی زانستی سۆڤێتی دیوە لە لینىنگراد کە پاشکۆیەکی لەگەڵدا بووە بە زمانی فرنسی بۆ ڕوونکردنەوەی ناوەڕۆکی ڕۆژنامەکەو بۆ پڕۆپاگەندەکردن بۆی وەکوو لە لاپەڕەکانی(٣ ـ ٤)ی ژمارە دوهەمی ساڵی ١٩٨٦ی گۆڤاری چوارچرا لە سوید لەلایەن دەستەی نوسەرانیەوە باسی گوڤاری (ئاهانیت)ی ساڵی ١٩٠٠یان کردوە کەلاپەڕە/١٣٩ی دا باسی ڕۆژنامەی کوردستانی کردوە کە نووسەرانی ئەو ڕۆژنامەیە بایەخێکی زۆریانداوە بە گرنگێتی خوێندەواریو داوایان لە کورد کردوە بکەونە خۆیانو دەس بکەن بەچالاکی.

هەمان گۆڤاری چوارچرا لەو باسەیدا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (دروشاك)ی ئەرمەنی کردوە لەساڵی ١٩٠٠دا دەربارەی ڕۆژنامەی کوردستان وتوویەتی:((ئیمڕۆ وا نەمامێکی تازە چرۆ دەکاتو ئومێدەوارین بەربگرێتو گومان لەوەدا نیە لەوڵاتدا دەتوانرێ هێزێکی گەورەی دژ بە سوڵتان پێك بهێنرێت)).

ئەوەی شایانی باسە هەندێ سەرچاوە لێپرسراوی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستانیان بە مدحت بدرخانو هەندێکی تر بە مقداد مدحت بدرخان ناویان هێناوەکە هەردوکیان هەر یەکێك بوونو بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە سریا بدرخان

لەلاپەڕە/٥١ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٩وێنەیەکی بڵاوکردۆتەوە بـەناوی (پرنس مدحت بدرخان)و لەلاپـەڕە/١١٠ی بـەرگی یەکـەمی فۆتۆکۆپیـی ڕۆژنامـەکانی کوردستان کە محمد ئەمین بوز ئەرسـلان بـڵاوی کردۆتـەوە هـەمان وێنـەی تیایـە بەناوی (مقداد مدحت بدرخان)ەوە بەمەدا دەرئەکەوێ هـەردو ناوەکـە هـەر یـەك کەس بوون.



مقداد مدحت بدرخان

بەپێی ژمارەکانی ڕۆژنامـەی کوردسـتان ــ فۆتۆکۆپیـەکانی محمد امـین بـوز ئەرسلان بریتین لە:

١ - لەژمارە (١ ــ ٥) لەلایەن مقداد مدحت بدرخانەوە دەرچووە لە قاهرە.

٢ - لەژمارە (٦ ــ ١٩) لە جنیف دەرچووە لەلایەن عبدالرحمن بدرخانەوە.

٣ - لەژمارە (٢٠ ــ ٢٣) لەلایەن عبدالرحمن بدرخانەوە دوبارە لە قاهرە دەرچووە.

٤ - ژمارە (٢٤) لەلەندن دەرچووە لەلایەن عبدالرحمن بدرخانەوە.

٥ - ژمارە (٢٥) دوو ژمارەی ڕۆژنامەکە بەژمارە /٢٥دەرچووە

ژمــارەی یەکــەم نوسراوە١٩ئاغســتوس ســاڵی ١٣١٦ لەلایــەن عبدالرحمــن بدرخانەوە لەلندن ئەوی تریان کە هــەمان ژمــارەی لەسـەر نوسـراوە/١٨ ئـەیلولی ١٣١٦ لەشاری(فوڵکستوّن) دەرچـووە کـە شـارێکە لـە بریتانیـاو لێـی نوسـراوە لەلایەن (بدرخان پاشا ئوغلی عبدالرحمن) کە هەتا ژمارە/٢٩ هەموو ژمارەکان لە (فوڵکستوّن)دەرچوون.

٦ ـ ژمارە ( ٣٠ ـ ٣١ ) لە جنێف دەرچووە لەلایــەن عبدالرحمن بدرخانـەوە کـە دوا ژمارەی رۆژنامەکە /٣١لە ( ١٣١٨/٤/١ )ی کۆچیدا دەرچووە.




**رۆژنامەی کوردستان کە لەجنێف دەرچووە**

**قۆناغی دوهەم: رۆژنامەی کورد (کوردستان..... یاکورد تعاون و ترقی گازیتەسی**

ئەم رۆژنامەیە ئۆرگانی کۆمەڵی (کوردستان تعاون‌وترقی جمعیتی)بووە کەبەر لەمە لەزنجیرەی دوهەمی کومەڵ‌و رێکخراوەکانا بەدوورو درێژی باسمانکردوە، هەموو سەرچاوەکان بەرۆژنامە ناویان بردوە بێجگە لە (رۆبرت ئۆڵسۆن) لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ بەگۆڤار ناوی بردوە.

دەربارەی کاتی دەرچونی ئەو رۆژنامەیە کاك جمال خەزنەدار لەلاپەڕە/١٨ی رابەری رۆژنامەگەری کوردیدا وتوویەتی ئەو رۆژنامەیە لەساڵی ١٩٠٧دا دەرچووە کە ئەمە لەگەڵ سەرچاوەکانی تردا یەك ناگرێتەوە کە وتویانە لەساڵی ١٩٠٨دا دەرچووە.

بۆ نموونە دوکتۆر جلیلی جەلیل لەسەرچاوە/٥٥دا وتویەتی لە ٩/تشرینی دوهەمی ١٩٠٨دا دەرچووە کە سەرچاوەی جلیلی بۆ ئەمە بریتیە لە گۆڤاری (Revue du monde Musulman No.1-2) ساڵی ١٩٠٩کە لەو گۆڤارەدا وتراوە: یەکەم ژمارەی رۆژنامەی کورد لەرۆژی ٩/١١/١٩٠٨دا لە ئەستەمبوڵ دەرچووە (لە دواییدا دەچینەوە سەر باسەکەی دوکتۆر جلیلی جلیل).

سەرچاوەکانی‌تر وەکوو دوکتۆر جمشید حیدری سەرچاوە/٣و کریس کوچیرا سەرچاوە/٤١و دوکتۆر کمال مەزهەر لە کتێبەکەیدا (تێگەیشتنی ڕاستی ــ لەلاپەڕە/٢١٧ هەموو وتویانە لەساڵی ١٩٠٨دا دەرچووە.

دەربارەی ناوی رۆژنامەکەو لێپرسراوی رۆژنامەکەش چەند بۆچونێکی جیاواز هەیە:

دوکتۆر جمشید حیدری لەباسەکەیدا سەرچاوە/٣و دوکتۆر کمال مەزهەر لەلاپەڕە/٢١٧ی کتێبی تێگەیشتنی راستیداو سرکسیان‌و لازاریف بەپێی کتێبەکەی دوکتۆر جلیلی جلیل هەروەها کریس کوچیرا سەرچاوە/٤١ هەموویان رۆژنامەکەیان بە (کورد تعاون‌و ترقی گازیتەسی) ناوبردوەو دوکتۆر جمشید حیدری وتویەتی خاوەنەکەی شاعیری گەورەی کورد پیرەمێرد بووە بەڵام سەرچاوەکانی تر، وەکوو مامۆستا علاءالدین لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە/٨ی ئابی ١٩٤٣دا وتویەتی رۆژنامەی (کورد) ئیمتیازەکەی بەناوی (پیرەمێرد)ەوە بوو.

کاك جمال خەزنەدار لەلاپەڕە/١٨ی رابەری رۆژنامەگەریدا وتویەتی رۆژنامەی کورد لەلایەن هاوبیرانی شێخ عبدالقادری شمزینیەوە دەرچووە.

لەرۆژنامەی (ژین)ی ژمارە/٩٤٨ی رۆژی ١٩٤٨/١٢/٣٠ وەکوو لەلاپەڕە/١٣ی دیوانە تازەکەی پیرەمێردا چاپی بغداد سالی ١٩٠٠وتراوە رۆژنامەی (کورد) لەلایەن پیرەمێردەوە بەڕێوە دەبرا لەژمارەی یەکەمی سالی ١٩٤٦ی مانگی کانونی دوهەمی گۆڤاری گەلاوێژدا پیرەمێرد خۆی لەوەدا وتوویەتی :((نۆبەرەی غەزەتەمان لە ئەستەمبول غەزەتەی (کورد)بوو کە ئیمتیازەکەی بەر من کەوت)).

(ئەوەی شایانی باسە جگە لە ئیمتیازی رۆژنامەی کورد، هەروەکوو لە دیوانە تازەکەیدا باسکراوە ئیمتیازی گۆڤاری (رەسملی کتاب)یشی هەبوە کە بۆ ماوەی چوارسال دەرچووە).

لەکۆتایی ئەم باسەی رۆژنامەی کوردا بەپێویستم زانی کورتەیەکی ئەو باسە دورو درێژەی دوکتۆر جلیلی جلیل کە لەسەرچاوە/٥٥ دا باسی ئەو رۆژنامەیەی کردوە بیخەمە پێش چاو کە وتوویەتی :((یەکێك لە چالاکیەکانی کۆمەڵی تعاون وترقی جمعیتی کورد ئەوەبووە بلاوکراوەیەکیان هەبێ وەکوو ئۆرگانی رێکخراوەکەیان)).

جلیلی لەباسەکەیدا ئاماژەی بۆ چەند سەرچاوەیەك کردوە کە دەربارەی ئەو رۆژنامەیە دواون، بۆ نموونە :

لەلاپەڕە/٦٥ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ رۆژنامەی (جامانـاك)ی ئەرمەنی ژمارە/٢ی رۆژانی ١٦ـ١٩٠٨/١٠/٢٩ کردوە کە باسی ئەوەی کردوە کوردەکان لە ئەستەمبول کۆبوونەوە بۆ دەرکردنی رۆژنامەیەك بەکوردیو تورکی وە ئاماژەشی بۆ گۆڤاری : (Revue du monde Musulman No.1-2) سالی ١٩٠٩ لاپەڕە/١٧٠ ـــ ١٧١)کردوە کە لەوەدا وتراوە رۆژنامەی (کورد) لەرۆژی١٩٠٨/١١/٩ لە ئەستەمبول دەرچووە کە سەرنوسەرەکەی (تۆفیق)ە ــ مەبەست تۆفیق پیرەمێردە ــ

دەربارەی دروشمو ئامانجی رۆژنامەکە ئەوەبووە بەهەموو توانای خۆیەوە هەفتەی جارێك وەکوو ئۆرگانی کۆمەڵی تعاونو ترقی کورد جمعیتی دەربچێت.

وەکوو جلیلی باسی کردوە رۆژنامەکە هەشت لاپەڕە بووەو هەر لاپەڕەیەك چوار ستوون بووە.

جلیلی ئەڵێ: هەرچەند ژمارەکانی ئەو رۆژنامەیە هەڵنەگیراون و زانیارییەکی زۆرکەم و ناڕاست لە فهرستە ئەدەبییەکانا دەربارەی ئەو رۆژنامەیە هەیەو یەکێکی وەکوو (ئو. ل. ڤیلچڤیسکی) کە هەمیشە باسەکانی بەشێوەیەکی تێرو تەسەل و واقعیەت نوسیوە، لەو باسەیدا لە رۆژنامەکان دواوە باسی رۆژنامەی (کورد)ی تیادا نەکردوە.

هەرچەند ژمارەکانی ئەو رۆژنامانە هەڵنەگیراون بەڵام ئەو شەش مەقالەیەی لە ژمارەکانی ئەو رۆژنامەیە بڵاوکرابووەوە هەندێ نوسەر لەباسەکانیانا ئاماژەیان بۆ ئەوانە کردوەو شتیان لێ وەرگرتون هەروەکوو ئەوەی لە کتێبەکەی لە (أ. شاهبازیان)دا بەناوی مێژووی کوردو ئەرمەنی لەلاپەڕە/١٧٧یدا باسیکردوە.

جلیلی ئەڵێ: هەرچەند رۆژنامەی کورد بۆ تۆ مانگ درێژەی کێشابوو بەلام لەو تەمەنە کورتەیدا ناوبانگی بەزۆر شوێنی کوردستانا بڵاوبوبووەوە هەروەکوو شاهبازیان لە کتێبەکەیدا لەباسی بڵاوکراوەیەکی ئەو رۆژنامەیەدا بڵاوکرابووەوە داوای لە هەموو کورد کردبوو یەك بگرن و هەوڵ بدەن بۆ چاکردنی باری ژیانی کورد کە تورکەکان بەوپەڕی بێ دادیەوە رەفتار لەگەڵ کوردا دەکەن.

جلیلی لەباسی کتێبەکەی شاهبازیاندا کە ئامازەی بۆ ناوەرۆکی رۆژنامەی کورد لاپەڕەی یەکەمی ژمارەی دوهەمیدا وتراوە لەگەڵ ئەو هەموو خزمەتەی کورد بۆ عوسمانی کردوە کەچی لە هەموو میللەتەکانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی زۆرتر زیانی پێ گەیشتوە.

جلیلی ئەڵێ بەپێی کتێبەکەی شاهبازیان لەزۆریەی ژمارەکانی (رۆژیکورد)دا نووسەرەکان بایەخێکی زۆریان داوە بەگرنگێتی رۆشنبیری و خوێندەواری کە لەناو نووسەرەکانیا چەند کەسێکی وەکوو سعید کوردی و ئیسماعیل حقی بابان زادە دەکەوێتە بەرچاو.

جلیلی ئاماژەی بۆ باسێکی سعید کوردی کردوە (لە شوێنی خۆیدا باسی سعید کوردیمان کرد کە مامۆستای خلیل خەیاڵی بووەو بە بدیع الزمان ناسراو

بووه)، که ئەو باسەی ملا سعید لەژمارە/٢ی ڕۆژنامەی کوردا بڵاوکراوەتەوەو لـە باسەکەیدا پرسیویّتی : ئایا کورد پێویستی بەچی هەیە؟

سعید کوردی هەر خـۆی وەرامـی پرسـیارەکەی خـۆی داوەتـەوەو وتویـەتی: ئـەوە مـاوەی پازدەسـاڵ تێپـەڕیکرد بەسـەر ئەوکاتـەی ئـەو پرسـیارەم لـــەخۆم کردبوو هەتا ئێستەش نەگەیشتومەتە هیچ وەرامێکی ئەوتۆ کەلەم دوو بۆ چوونە تێپەڕبکات.

١ ـ یەك گرتنێکی نەتەوەیی‌و نیشتمانی.

٢ ـ بێجگـە لـەفێربوونی زانیـاریی ئـاینی، پێویسـتە بایـەخ بـدرێ بـەزانیاریی هونەری‌و ئەو زانیاریانەی تـر کـە دەبنـە هـۆی پێشـکەوتنی شارسـتانێتی‌و شـان بەشانی ئەوەش کورد پێویستە سوپایەکی تایبەتی خۆی هەبێ بۆ ئەوەی بتوانێ لەڕێگەی ئەو سوپایەوە سەربەخۆیی دەسگیربێت (سـەرچاوەی جلیلـی بـۆ ئـەم باسەی سعید کوردی بریتیە لەلاپەڕە/٧٠ی کتێبەکەی سافرسـتیان چـاپی سـاڵی ١٩٤٨ بەناوی کوردو کوردستانەوە).

جلیلی لەهەمان کتێبیـدا ئامـاژەی بـۆ لاپـەڕە/١٧٧ی کتێبەکـەی شـاهبازیان کردوە کەلەو کتێبەیدا باسی مقـاڵێکی ئیسـماعیل حقـی بابـان زادەی کـردوە کـە لەژمارە/٣ی ڕۆژنامــەی کـوردا بـڵاوی کردۆتـەوە دەربـارەی بزوتنـەوەی هەسـتی نەتەوایەتی کوردو داوای کردوە ئەبێ منداڵانی کورد فێری زمانی خۆیـان بکرێـن‌و وتوویەتی : ((با بـۆ نموونـە باسـی منداڵێکـی کـورد بکـەین، منداڵێکـی کـورد لـە گوندەکـەی خۆیـدا کـە بـە کـوردی قسـەی تیـا ئـەکرێ لـەناو خۆیانـا، ئەگـەر قوتابخانەیەك کرایەوەو لەجیاتی زمـانی کـوردی بـەزمانی تورکـی دەرسـی تیـادا بوترێتەوە، وای لێدێ ئەو منداڵە ئیتر تەنها شت هەر بەزمانی تورکی فێر دەبێـت، بەڵام ئەگەر بـەکوردی کتێبـی زانیـاریی بـۆ ئامـادە بکرێ ئـەوا لـەجیاتی زمـانی تورکی بەزمانەکەی خۆی فێری ئەو زانیاریە دەبێ.

جلیلی ئاماژەی بۆ کتێبێکـی تـر کـردوە(سیاسـەتی ئیمـپراتۆرێتی عوسمـانی لەودیو قافقاسدا لاپەڕە/٧٢ چاپخانەی بریتانیا ساڵی ١٩٦٢ نوسینی سرکسـیان) کە ئەمیش ئاماژەی بۆ باسێکی تری ئیسماعیل حقی بابان کردوە کەلە ڕۆژنامەی کوردا بڵاوی کردۆتەوەو سرکسیان وتوویەتی:

((ئیسماعیل حقی بابان لەو باسەیدا تەنها دەربارەی سیاسەت نەدواوە، بەڵکوو باسی دانانی بناغەیەکی زانیاریانەی کردوە بۆ پەرەپێدان بەزمانی کوردی‌و ئەدەبی کوردی‌و بایەخدان بەئەدەبی فۆلکلۆری‌و ئەفسانە، چونکە بایەخدان بەزمانی کوردی‌و پەرەپێدانی زانیاری دەربارەی زمانی کوردی دەبێتە هۆی پێشکەوتنمان‌و کلیلی پێشکەوتن هەمیشە بریتیە لە خوێندەواری‌و رۆشنبیری‌و زانیاری بۆیە ئەرکی سەر شانی زاناکانمانە بایەخێکی تەواوە بدەن بەو بابەتانە.

جلیلی جگە لەو باسانەی ئیسماعیل حقی بابان ئاماژەی بۆ کتێبێکی (أ.وجلتیاکوف،و یو.أ.بلاسیان) کردوە کە لەوەدا باسێکی (سعید کوردی)دواوە کە لەژمارە/٦ی رۆژنامەی (رۆژی کورد)دا بلاوی کردۆتەوە دەربارەی (رۆڵی ئاین لە ژیانی کوردا)و لەو باسەیدا هەوڵی داوە بەشێوەیەکی پێشکەوتووخوازانە دەربارەی ئاین بدوێ‌و داوای کردوە لەرێبازی ئەو جۆرە کەسانە لابدرێ باسی ئاین زۆر بەووشکی و رەقی دەکەن‌و هێرشێکی توندی بردۆتە سەر ئەو سیاسەتەی بەناوی ئاینەوە هەوڵ ئەدرێ لەژێر پەردەی ئایندا ولاتان داگیربکرێت‌و داوای کردوە دۆستایەتی کورد لەگەڵ میلەتانی هاوسێ‌دا بەهێز بکرێت‌و لەو روەوە رۆژنامەی (غورتس ـ گورتس)دەربارەی ئەو بۆچوونەی سعید کوردی باسێکی بلاوکردۆتەوەو وتوویەتی :((سەرنووسەری رۆژنامەی کورد ــ وابیارە سعید نورسی ــ سعید کوردی نوسەرێکی هەمیشەیی بووە لەو رۆژنامەیەدا ـ بانگەوازێکی بلاوکردۆتەوە کە داوای لە هاوولاتیانی خۆی کردوە پێوندیی کورد لەگەڵ میللەتانی تردا بەهێز بکرێت)).

هەروەکوو مامۆستا علاءالدین سجادی لەلاپەرە/٥٥٢ی کتێبەکەیدا ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ـ باسیکردوە، رۆژنامەی کورد کە زمانی حاڵی کۆمەڵی کورد تعاون‌وترقی جمعیتی بووە باسی کۆبوونەوەیەکی یانەی کوردی کردوە لە ١٩٠٨/٦/٢٥ لەهۆڵی (فیتز نجیلری) لە ئەستەمبوڵ کە لەو کۆبوونەوەیەدا (٥٠٠)کەس بەشداربوون‌و ژمارەیەك لە ئامادەبووەکان دڵسوزیی خۆیان بۆ کۆمەڵی کورد تعاون‌و ترقی جمعیتی دەربریوەو قسەکەرێکیش لە قسەکانیا باسی گرنگێتی‌و بایەخدان بە دەستور کردوە ـ کە لام وایە ئەمەش بەڵگەیەکی

تره بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەو پڕوپاگەندانەی وتوویانە کورد دژی أصلاحاتی دەستوری بوون)).

**قۆناغی سێهەم : گۆڤاری رۆژی کورد ـ هەتاوی کورد**

لەباسی کۆمەڵی ((هێڤی ـ هیوا))دا بەرلەمە باسی ئەوە کرا کە ئەو کۆمەڵە گۆڤارێکی لەساڵی ١٩١٣دا دەرکرد بەناوی (رۆژ کورد)و لەساڵی ١٩١٤ ناوی گۆڤارەکە گۆڕا بە (هەتاوی کورد) هەموو ئەو سەرچاوانەی باسی ئەو گۆڤارەیان کردووە بەگۆڤار ناویان بردوە جگە لەئەمین زەکی لەلاپەڕە/٣٥٢ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣٢ بەرۆژنامە (صحیفە) ناوی بردوە، کاک جمال خەزنەدار لەدوو سەرچاوەدا باسی (رۆژ کورد)ی کردوە، لەسەرچاوەی ژمارە/١٤ بەهەڵە بەرۆژنامەی رۆژکورد ناوی بردوە بەلآم لەسەرچاوەی دوهەمدا، ژمارە/٢٦ کە هەرسێ ژمارەکەی دەسکەوتوەو فۆتۆکۆپیی هەرسێکیانی بلآوکردۆتەوە لەمەیانا راستی کردۆتەوەو بەگۆڤار ناوی بردوە وەکوو لەدوایدا باسی دەکەین.

دەربارەی مێژووی دەرچوونی یەکەم ژمارەی، بەپێی فۆتۆکۆپی سەرچاوە/٢٦ لەسوچی سەرەوەی لای چەپیا نوسراوە تأریخ تأسیس ١٣٣١کۆچی ورۆژی دەرچوونی ٦/حزیران١٣٢٦ لەلای راستیا نوسراوە ١٤/رجب/١٣٣١، دوکتۆر جلیلی جلیل لەسەرچاوە/٥٥دا هەربە ٦/حزیران/١٩١٣ باسیکردوە، بەلآم دوکتۆر مارف خەزنەدار لەپەراوێزی لاپەڕە/٦٣ کتێبە وەرگێڕاوەکەی مینۆرسکی لەروسیەوە بۆ عەرەبی چاپی ساڵی١٩٨٧ ئامـاژەی بۆ (س.م.شاپشال) فی المجموعة الشرقية لجمعية المستشرقين الروس ص٢٣٣ ساڵی ١٩١٣ وتراوە گۆڤارەکە لە١٩/٦/١٩١٣دا دەرچووە کە بێگومان ئەم رۆژە هەڵەیەو لەگەڵ فۆتۆکۆپی رۆژنامەکەدا یەك ناگرێتەوە.

دوکتۆر کمال مەزهەرو دوکتۆر جمشید حیدریش لە باسەکانیانە وتویانە گۆڤارەکە لەپێشدا بەناوی رۆژ کوردستانو لە دواییدا ناوەکەی گۆڕاوە بە (هەتاو کورد).

لەناو سەرچاوەکانا، دوو سەرچاوە بەدوور درێژ باسیانکردوە، دوکتۆر جلیلی جلیل لەو دوو سەرچاوەیدا یەکەم لەگۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە/١١٦ی کانونی

یەکەمی ساڵی ١٩٨٧ کە لەبغداد دەرچووە دوهەم سەرچاوە/٥٥باسی رۆژ کوردو هەتاو کوردی کردوە لەبەر ئەوەی هەردوباسەکەی لەیەك دەچن، بۆیە تەنها ئەو باسەی سەرچاوە/٥٥ ئەخەینە بەرچاو هەروەها کاك جمال خەزنەداریش لەسەرچاوە/٢٦دا کە بۆ گۆڤارەکەی تەرخان کردوە لەویش دەدوێین.

دوکتۆر جلیلی جلیل لەسەرچاوەی/٥٥دا، لەلاپەرە/٩٧دا ئاماژەی بۆ رۆژنامەی (التاخی) رۆژی ١٠/تموزی/١٩٦٧ کردوە کەلە بغداد دەرچووە لەوەی التآخیدا وتراوە ئەو گۆڤارە لەلایەن کۆمەڵی هێڤی‌یەوەدەرچووە کە چاپخانەیەکی خۆی هەبوەو قوتابیانی کورد لە ئەستەمبولٚ لەو چاپخانەیەی کۆمەڵی هێڤی‌دا زۆر چالاك بوون. کە سەرچاوەی جلیلی بو ئەمە بریتیە لە Die: wellde islam 1913 Berlin,bond 1,Heft ¾.522 کە باسەکەی لە رۆژنامەی (جاماناك)ی ژمارە(١٦٠٨)ی ساڵی ١٩١٣دا بڵاوکراوەتەوە.

ئەوەی شایانی باسە کاك جمال خەزنەدار لەسەرچاوە/٢٦دا دیارە تەنها سێ ژمارەی رۆژ کوردی دەسکەوتوەو فۆتۆکۆپی کردوە وەکوو لەدوایدا باسیان دەکەین، بەلآم دوکتۆر جلیلی جلیل باسی ژمارەی چوارەمیشی کردوە وەکوو لە لاپەرە/١٠١دا باسیکردوە وتویەتی ژمارە/٤ لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٣دا دەرچووە بەلآم بەناوی هەتاوی کوردەوە، هەروەها جلیلی لەپەراوێزی هەمان لاپەرەدا وتوویەتی ڤیلچێڤیسکی‌و لازاریف هەردوکیان لەباسەکانیانا بەهەڵە وتویانە رۆژکورد لەساڵی ١٩١٤دا دەرچووە جلیلی لەباسەکەیدا وتویەتی گۆڤاری رۆژ کورد لە سێ ژمارەی یەکەمیا سەرنوسەرەکەی عبدالکریمی خەڵکی سلێمانی بووە (مەبەستی کریم بەگی حاجی ئەولآی حمە کرکوکی بووە کە ماوەیەك لەدواییدا لەکرکوك کراوە بەحاکمی بدائی)، بەلآم ژمارەی چوارەمی عبدالعزیز بابان بووە کە گۆڤارەکە بەزمانی کوردی‌و تورکی دەرچووە.

جلیلی بێجگە لە عبدالکریمی لێپرسراوی گۆڤارەکە باسی چەند سیاسیەکی تری کردوە کە لەو گۆڤارەدا بەشداری نوسین بوون وەکوو نجم الدین کرکوکلی‌و صلاح بەدرخان‌و عبدالله جودت‌واسماعیل حقی بابان زادە.

جلیلی لەو باسەیدا دەربارەی عبدالله جودت کە یەکێك بووە لەو نوسەرانەی ئەو گۆڤارە، رەخنەی لە ئەدەبیاتە کوردیەکان گرتووە کەهیچ باسی خزمەتی

عبدالله جودتیان نەکردوە کە چۆن بەشداربووە لە نوسینی ئەو گۆڤارە کوردیەدا (لەراستیدا فۆتۆکۆپی هەرسیّ ژمارەکەی رۆژی کوردم پشکنی لەلاپەرە/٤ی ژمارەی یەکەمو لەلاپەرە/١٠ی ژمارە/ دوهەمدا دووباس بلاّوکراوەتەوە دەربارەی کورد لەلایەن عبدالله جودەتەوە.

جلیلی ئەڵێ: جگە لەو گۆڤارە عبدالله جودت لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی تردا گەلێك باسی دەربارەی مێژووی کوردو بلاّوکردنەوەی رۆشنبیری لەناو کوردا نوسیوەو لەدوای شەڕی جیهانی یەکەمیش لەناو کۆمەڵو رێکخراوە کوردیەکانا چالاك بووەو لەساڵی ١٩٢٥دا کە شۆڕشی کورد بەرپابوو (مەبەستی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیرانە) رۆژنامە تورکیەکان گەلێك جار هێرشیان بردۆتە سەر عبدالله جودت، بەتایبەتی ئەوەی لە رۆژنامەی (ئەقشام)ی تورکیدا لەمانگی کانونی دوهەمی ١٩٢٥دا دژی عبداللە جودت بلاّوکرابووەوە، بەتاوانی ئەوەی هەوڵی دابوو بۆ دروست بوونی حکومەتێکی سەربەخۆی کورد.

دەربارەی ئەو بۆچونەی دوکتۆر جلیلی، لەو دیوانە تازەیەی پیرەمێرد کەلە ساڵی ١٩٩٠ لەبغداد چاپکراوە لەوەدا بۆ بۆچوونێکی پیرەمێرد بلاّوکراوەتەوە دەربارەی عبداللە جودت کە وتویەتی:((لەدوای ئەوەی اعلانی مشروطیە(مەبەست اصلاحاتی دستوری ١٩٠٨)ە، عبداللە جودت لە ئەوروپاوە گەڕایەوە بۆ ئەستەمبوڵو گۆڤاری (أجتهاد)ی دەرهێنا، من یەکێك بوم لەوانەی لە هەموو کەس زیاتر لە خزمەتیا دەبومو خۆمو (نەژاد)ی کوڕم بە نشرو نظم (پەخشانو شیعر) لە گۆڤارەکەیدا خزمەتمان هەبوە)).

لام وایە ئەو کەمتەرخەمیەی ئەدەبیاتی کوردی بەرامبەر بە عبدالله جودت کە جلیلی رەخنەی دەربارەی گرتبوو بەخۆڕایی نەبوە ئەگەرچی عبداللە جودت خزمەتی کوردیشی کردبوو، بەلاّم لەباسی سیّهەمی ژۆن تورکو أتحادو ترقیدا لەبەشی شازدەهەمدا کە بۆ بەشداربوونی کوردستانمان تەرخانکردوە لە کۆمەڵی أتحادو ترقی تورکیدا بەر لەوەی تورکەکان لە بەڵێنەکانی خۆیان پاشکەزببنەوە، لەوەدا لە سەرچاوە/٤٠دا ئاماژە بۆ باسێکی (ئەرنست رامزرو)کراوە کە وتوویەتی لەناو ئەندامەکانی أتحادو ترقی تورکدا هیوا هەبوون وەکوو ئیسحاق سکوتیو عبدالله جودت، ئەگەرچی کوردیش بوون بەلاّم حەزیان بەوە کردوە لەناو أتحادو

ترقیدا وەکوو دوو تورك وەیا هاوولاتیەکی عوسمانی ناو ببرێن، کە دوورنیە هەڵوێستی عبدالله جودت بوبێت بەهۆی هەندێ نارەزای هەندێ لە کوردەکانی ئەو سەردەمە.

دوکتۆر جلیلی لەسەرچاوە/٥٥دا باسی ئەوەی کردوە ژمارەکانی گۆڤاری رۆژی کورد لە ئەستەمبوڵەوە دەگەیشتنە کوردستانو بلاودەکرانەوە.

بەمەدا دەردەکەوێ چالاکیەکانی کۆمەڵی هێڤی بەپێچەوانەی ئەوەی کورد تعاونو ترقی جمعیتی کە هەر لە ئەستەمبوڵدا بووە، ئەوەی هێڤی گەیشتبووە ناوچەکانی کوردستانیش.

ئەوەی شایانی باسە دوکتۆر جلیلی جلیل لەو باسەیدا بەزۆری لە گۆڤاری رۆژ کورد دواوەو دەربارەی هەتاوی کورد تەنها ئەوەی وتووە لەدوای دەرچونی ژمارە/٣ی رۆژ کورد ناوی گۆڤارەکە گۆڕاوە بەهەتاوی کوردو وتویەتی لازاریفو ڤیلچێڤسکی بەهەڵە وتویانە هەتاوی کورد لەساڵی ١٩١٤دا دەرچووە وەکوو جلیلی لەلاپەرە/١٠١دا باسی کردوە وتویەتی ئەو تاقە ژمارەیەی هەتاو لەتشرینی یەکەمی ١٩١٣دا دەرچووە.

دوکتۆر جلیلی جلیل لەسەرچاوە/٥٥دا لەلاپەرە/١٠٥دا تەنها ناوەرۆکی ژمارەی یەکەمی گۆڤاری رۆژی کوردی باسکردوە، لەبەر ئەوەی کاك جمال خەزنەدار لەسەرچاوە/٢٦دا باسی ناوەرۆکی هەرسێ ژمارەکەی کردوە، بۆیە هەوڵ ئەدەم کورتەی ئەو باسەی ئەم بخەمە پێش چاو.

وەکوو لە پێشدا باسمانکردو بە پێی فۆتۆکۆپی بەرگی یەکەمی گۆڤاری رۆژ کورد، عبدالکریم لێپرسراوی گۆڤارەکە بووە لە هەرسێ ژمارەکەدا کە فۆتۆکۆپی ژمارەی یەکەمو سێهەم بەرودوا دەخەینە پێش چاو.

صاحب امتیاز :
و مدیر مسئول
عبدالکریم

عدد : ١


# روژ کرد


تاریخ تأسیسی :
١٣٣١

جلد : ١

رجب سنه ١٣٣١ شیمدیلك ایده بر نشر اولنور ٦ حزیران سنه ١٣٢٩




سلطان صلاح الدین ایوبی

**بەرگی ژمارە/١ی گۆڤاری رۆژی کورد**

باسەكانی ژمارە/١ی گۆڤاری رۆژ كورد بەپێی فۆتۆكۆپیەكەی كاك جمال خەزنەدار لەلاپەرەی یەكەمیەوە تالاپەرە/١٨ بەشی توركیەكەیەتی و لەلاپەرە/١٩هاتا٣٢) بەشی كوردیەكەیەتی.

ـ لەلاپەرە/٢دا بەتوركی مقالێك لەژێر ناوی (غایە ـ مسلك) دیارە بەپێنوسی لیپرسراوی گۆڤارەكە بووە (عبدالكریم) كەلە بەرگی یەكەمدا نوسراوە: صاحب ئیمتیازو مدیر مسئول.

ـ لەلاپەرەكانی٣ ـ ٤ بەتوركی نوسینی عبدالله جودت لەژێر ناوی (بیر خطاب).

ـ لەلاپەرەكانی ٥ ـ ٦ باسێكی توركی بەناوی كركوكلی نجم الدین.

ـ لاپەرە ٧ ـ ٨ بەناوی (خ) بەتوركی دەربارەی (دەردو دەوا).

ـ لاپەرە ٨ ـ ٩ بە پێنوسی خربوطلی بەتوركی لەژێر ناوی غربلە شرق، ملیت جریانلی.

ـ لاپەرە ٩ ـ ١٠ بەپێنوسی كركوكلی نجم الدین ـ لەژێر ناوی (أحوال أجتماعیە من) بەتوركی.

ـ لاپەرە ١١ ـ ١٢ بە پێنوسی فخری بەتوركی لەژێر ناوی (كردلردە قابلیت تمدن).

ـ لاپەرە ١٢ ـ ١٣ بەتوركی (ناوی نوسەر نیە) لەژێر ناوی (خلاصە ئەفكار).

ـ لاپەرە ١٤ ـ ١٨ بەتوركی لەژێر ناوی (قوای عمومیە حكومت) بە پێنوسی (سلیمانیەلی مسعود).

ـ لاپەرە ١٩ ـ ٢١ بەكوردی ـ پێنوسی سلێمانی عبدالكریم ـ لەژێر ناوی (تاڵو شیرینی).

ـ لاپەرە ٢١ ـ ٢٣ بەكوردی ـ پێنوسی عبدالكریم سلێمانی لەژێر ناوی (منداڵ بۆچی زوو فێری خوێندن نابێ).

ـ لاپەرە ٢٣ ـ ٢٤ بەكودری ـ بەپێنوسی عبدالكریم سلێمانی لەژێر ناوی (بە تأثیر محیط مادیو معنوی علموفن).

ـ لاپەرە ٢٤ ـ ٢٥ بەكوردی بەپێنوسی دیاریكری ـ نجدت لەژێر ناوی (جوتكاری).

ـ لاپەڕە ٢٥ ـ ٢٦ بەکوردی بەپێنوسی (فؤاد تمو) لەژێر ناوی (چیرۆك).

ـ لاپەڕە ٢٦ ـ ٢٨ ناوی نوسەر نیە، لەژێر ناوی (دم کالمە ـ چاغامە ـ دمەتی).

ـ لاپەڕە ٢٩ ـ ٣١ چەند شیعریکی نالی لەژێر ناوی (دیوان شاعیر شهیر حضرت نالی)و شعرێکیش لەلایەن فاضل مخلص عشیر ملی لەژێر ناوی (خوندن‌و خەبات).

له دوالاپەڕەی گۆڤارەکەدا فهرستی باسەکانی تیادایە لەگەڵ دوو اعلان : یەکەم دەربارەی:(أطبای ملکیەدن حیدریزادە ئەحمەد بەگ دوهەم هکیم حیدری زادە ئەحمەد بەگ .

ژمارە /٢ی گۆڤاری رۆژکورد:

کەلە ٦/تموزی/١٣٢٩ بەرامبەر ١٤/ی‌شعبانی١٣٣١کۆچی دەرچووە. لەبەرگی ژمارەکەدا وێنەیەکی کریم خانی زەندی تیایە لەژێریا نوسراوە: کرد أعاظم أمراسندن کریم خان زند، تا لاپەڕە /٢٠بە زمانی تورکیەو ئەوی تری هەتا لاپەڕە /٣٢ بەشی کوردیەکەیەتی .

لەلاپەڕە/٢دا لەژێر ناوی (کرد لك ئیچین ـ ضباع عظیم)بەتورکی باسی کۆچی دوای حسێن کنعان پاشا بدرخانی کردوە، کە وێنەیەکی لەبەرگی ژمارە/٢شدا هەیە/ وەکوو لەدوای ئەمە دەبینرێ.

ـ لەلاپەڕە/٢ هەتا لاپەڕە/٥ لەژێر ناوی (ملتکزە قارشو وظیفەکز ـ کورد منور گنجلکنە) بەپێنوسی (طوغان) کەلە بولغارستانەوە ناردوێتی.

ـ لاپەڕە ٥ ـ ٧ باسێك بەتورکی بەناوی (مسلمانلق وکردلك) بەپێنوسی بابان زادە ئیسماعیل حقی.

ـ لاپەڕە ٨ ـ ١٠ لەژێر ناوی (أتحاد یولی) بەپێنوسی عبداللە جودت لەژێریا نوسراوە٧/تموز/١٩١٣.

ـ لاپەڕە ١٠ ـ ١١ لەژێر ناوی (خلیا حقیقت ئولیور) بەپێنوسی م.صالح بدرخان.

ـ لاپەڕە ١١ ـ ١٢ (هەوی ـ مەبەست هیوا هێڤی)دن أمیدمز نوسینی (خربوطلی:ح.ب).

ـــ لاپــەڕە ١٢ ـــ ١٣ لــەژێر نــاوی (حروفمــز تســهیل قرائــت) بـــەپێنوس (م.ص.ئازیزی).

(کـە محمـد صـالح بدرخانـەو بدرخانیـەکان نازناویـان ئـازیزی ـــ عزیـز بـووە هەروەکوو لەباسی ئەمارەتەکانا ـ باسی ئەمارەتی جزیرەدا ڕوونکراوەتەوە).

ـ لاپەڕە١٣ ـــ ١٦ باسـێك بـەناوی تعمیـم معـارفـو أصـلاح حـروف) جمعیـت محترمەسی طرفندن وأرد أولمشدر (باسی هەوڵدانێکە بۆ نوسینی کوردی بـەپیتی لاتینی).

ـ لاپەڕە١٧ ـ ١٩ لەژێر ناوی : کرد أعاظمی حضوروندن : صلاح الدین أیوبـی (ناوی نوسەرەکەی نیەو لەژێریا نوسراوە (مابعدی وار ـ هێشتا ماوێتی).

ـ لاپەڕە ١٩ ـ ٢٠ لەژێر ناوی (حادەء أفکار) ناوی نوسەرەکەی نیە.

ـ لاپەڕە ٢١ ـ بەشی کوردی ـ بوونا کرمانجی ـ وندا کی مزن ـ گلەیی لەوە کردوە شتێکی وا دەربارەی حسێن کنعان پاشا نەنوسراوە (لەژمارە/٣دا لەبەرگەکەیدا وێنەی حسێن کنعان پاشا بڵاوکراوەتەوە).

ـ لاپەڕە ٢١ ـ ٢٢ بەپێنوسی سلێمانی عبدالکریم لەژێر نـاوی : هـەر مـن بمو کسیتر نەبێ.

ـــ لاپـەڕە ٢٢ ـــ ٢٣ دووبـارە بەپێنوسـی عبدالکریـم سـلێمانی لـــەژێر نـــاوی (عبرت).

ـ لاپەڕە ٢٣ ـ ٢٤ ـ چیرۆك ـ نوسینی فۆاد تمو.

ـ لاپەڕە ٢٥ ـ ٢٨ باسکی حاجی قادر لەگەڵ شعریکی نوسینی (مودانی.خ).

ـ لاپەڕە ٢٨ ـ شیعریکی شێخ رەزا (مربوطەحیاتم بەسلێمانیوخاکی).

ـ لاپەڕە ٢٩ ـ ٣٠ لەژێر ناوی (زمانوترانیا کوردی) بەپێنوسی (مودانـی .خ) لەگەڵ شعرێکی حاجی قادر.

ـ لاپــەڕە ٣١ باسـێك بـەناوی (خبـات خوێنـدن) بەپێنوسـی فکـرت نجـدت ـــ دیاربکری.

لەدوا لاپەڕەدا : باسێکی ئاینیو شیعرێکی (محمد عاکف بەگ) شـاعیر لـەژێر ناوی هوارو فیزار مسلمانی، بەپێنوسی (مودانی.خ).

صاحب امتیاز
و مدیر مسئول :
عبدالکریم

عدد : ٣

# روژ کرد

غرهٔ رجب
١٣٣١

ژمار : ٣

١١ رمضان سنه ١٣٣١ — شهریلك آیده بر نشر اولونور — ١ اغستوس سنه ١٣٢٩



**بەرگی ژمارە/٣ ی گۆڤاری رۆژی کورد**

**وێنەیەکی بدرخانی مرحم حسین کنعان پاشا**

ئەم ژمارەیە لە ١٣٢٩/٨/١ کۆچیـدا دەرچـووە(١٥)لاپـەڕەی یەکـەمی بەشـی تورکیەکەیەتی‌و لەوە بەدواوە بەشی کوردیەکەیەتی.

ــ لاپـەڕە ٢ ــ ٤ لـەژێر نـاوی (کردلـرك تعالیســی) بەپێنوســی بابــان زادە ئیسماعیل حقی.

ـ لاپەڕە ٤ ـ ٦ لەژێر ناوی (حیات مشاهیر ـ بدرخـانی حسـین پاشا) دیـارە بەپێنوسی سەرنوسەر بووە.

ـ لاپەڕە ٦ ـ ١٠ لەژێر ناوی (قلیجدن أول قلم) بەپێنوسی صالح بدرخان.

ـ لاپـەڕە ١٠ ــ ١٤ لـەژێر نـاوی (کـرد أعـاظمی حضورنـدە ــ صـلاح الدیـن) بەپێنوسی (م).

ـ لاپەڕە ١٤ ـ ١٥ لەژێر ناوی (نفاقمن) بەپێنوسی (خ)کە دوا لاپەڕەی بەشـە تورکیەکەیەتی.

ـ لاپەڕە ١٦ ـ ١٧ لەژێر ناوی (بفر یاکوین) بەپێنوسی سلێمانی عبدالکریم ـ بەکوردی.

ـ لاپەڕە ١٧ ـ٢٠ لەژێر ناوی (تفسیر شریف ـ قران) بەپێنوسی (م.خ).

ـ لاپەڕە ٢٠ ـ ٢١ لەژێر ناوی (زیمان) بەپێنوسی (م.خ).

ـ لاپەڕە ٢٢ ـ ٢٤ بەناوی (عرد أیمە) بەپێنوسی دیاربکری فکری نجدت.

ــ لاپـەڕە ٢٤ ــ ٢٧ لـەژێر نـاوی (بـری شـیری قلـم) بەپێنوسـی (م. صـــالح بدرخان)و لەژێریا شیعرێکی ئەحمەدی خانی بڵاوکراوەتەوە.

ـ لاپەڕە ٢٩ ــ ٣١ لـەژێر نـاوی (بخـت رش‌و محکومیـا کـوردان) بەپێنوسـی (م.خ).

ـ لاپەڕە ٣١ چیڕوکی کرمانجیا بەپێنوسی (کندو).

لەکۆتاییدا نوسراوە : محمود بگ مطبعەسی.

تائێرە باسی هەرسێ ژمارەکـەی گۆڤـاری ڕۆژی کـورد بـوو وەلـەدوای ئـەوە دیـارە ئـەو گۆڤـارە بـەو نـاوەوە دەرنـەچووەو لـەجیاتی ئـەو گۆڤـارەی (هـەتاو) دەرچووە.

بەڕاستی نەزانراوە ئایا گۆڤاری هەتاو هەر ئـەو تاقـە ژمارەیـەی لێ دەرچـووە کە دوکتۆر جلیلی جلیل لەسەرچاوە/٥٥دا وتویەتی ئەو ژمارەیە لەمانگی تشرینی

دوهەمی ۱۹۱۲ی زانیدا دەرچووە لەکاتێکدا کاک جمال خەزنەدار لەلاپەڕە/۱۱ سەرچاوە/۲٦دا وتویەتی ئەو ژمارەیەی هەتاو لە ۲۳/ی ذی القعدەی ساڵی ۱۳۳۱هجری بەرامبەر/۱۱/ی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۳۲۹ی ڕۆمی دەرچووە کە کاک جمالیش‌و دوکتۆر جلیلی هەردوکیان وتویانە سەرنوسەرەکەی (کاک جمال وتویەتی خاوەن ئیمتیازو مدیری مسئول) عبدالعزیز بابان بووەو جلیلی وتویەتی لاپەڕەکەی هەتاوی کورد لەهی ڕۆژ کورد کەمتربووەو زانیاریەکی کەم هەیە دەربارەی ئەو گۆڤارە.

کاک جمال خەزنەدار لەلاپەڕە/۱۱ی سەرچاوە/۲٦دا سەرنجی خۆی بەرامبەر هەتاو بەم جۆرە دەربڕیوە:

((ئەوەی لەهەموو شتێکیش گرنگتربێ ئەوەیە ئەو کەسانەی ڕۆژی کوردیان دەرکرد هەر خۆیان ناوی گۆڤارەکەیان گۆڕیبوو کە ئەم زانیاریەمان لە دوکتۆر إحسان فؤادەوە وەرگرت کە وتویەتی : لەژمارەی یەکەمی گۆڤاری هەتاوی کوردا لەدوا لاپەڕەیدا بەزمانی تورکی‌و دەسخەتی عبدالعزیز بابان بەزمانی تورکی لەسەری نوسیوە کە کوردیەکەی بریتیە لە : گەورەمان سەید ئەحمەد ئەفەندی، بەپێی ئارەزوو داوای شێخ عبدالقادر ئەفەندی (مەبەستی شێخ عبدالقادری شمزینیە) ئیتر ڕۆژی کورد وەستێنراو لەباتی ئەوە (هەتاو کورد) بڵاودەبێتەوە (وادیارە دوکتۆر أحسان فۆتۆکۆپی ئەو ژمارەیەی هەتاودەسخەتەکەی وەرنەگرتووە)).

بێجگە لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی لەدەرەوەی وڵات‌و ئەستەمبوڵدا دەرچوو بوو، هەندێ سەرچاوە بەکورتی ئاماژەیان بۆ دەرچوونی چەند بڵاوکراوەیەکی تر کردووە. بۆ نمونە:

۱ ـ دوکتۆر جمشید حەیدەری لەسەرچاوە/۳دا باسی ڕۆژنامەی (پەیمان)ی کردوە کەلە ساڵی ۱۹۰۹دا لە دیاربکر دەرچووە، هەرچەند بەتورکی بووە بەڵام بەکوردیش نوسراوی تیا بڵاوکراوەتەوەو ئەتوانرێ ئەم ڕۆژنامەیە بەیەکەم ڕۆژنامەی کوردی دابنرێ کە لەناو کوردستاندا چاپکراوە.

۲ ـ دوکتۆر جلیلی لەلاپەڕە/٦٦ی سەرچاوە/٥٥دا لە پەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا باسی ڕۆژنامەیەکی کردوە بەناوی (ڕۆژهەڵات‌و کوردستان) لەلایەن

(خارسـاقلی ئەحمـەد شـریفو بـدری مالاتیـالیو ئیسـماعیل خارسـاقلییەوە دەرچووەو پرۆپاگەندەیەکی زۆریان بۆ ئاینی ئیسلام کردوە هـەروەکوو لـە سەرچاوەی Revue du monde musulman دا باس کراوە.

٢ – بەرلەمە لەباسی عبدالله جودت دا لەوە دواین کە رۆژنامـەی (أجتـهاد)ی دەرکردودو لە پەراوێزی لاپـەڕەی/١٢٨ی دیوانـە تازەکـەی پـیرەمێردا ــ چاپی ساڵی ١٩٠٠ باسی ئەوە کراوە کە پیرەمێرد خۆی وتویەتی لەگـەڵ نـەژادی کورپـا لە رۆژنامەکەی عبدالله جودتدا بەشداربوون لە نوسینیا.

هـەروەها لـە پـەراوێزی هـەمان لاپەڕەشـدا باسـی گۆڤـاری (ژیـن) کـراوە کـە سەرنوسەرەکەی (ئەشرەف هەمزە)بـووە لـە ئەسـتەمبوڵ دەرچـووەو پـیرەمێرد لەوەشدا بەناوی (سلێمانی توفیق)و (م.س) نوسینی تیا بڵاوکردۆتەوە.

لەدوای ئەشرەف هەمزە (ممـدوح سـلیم) بـووە خـاوەنی أمتیـازی هـەروەکوو دوکتۆر کمال مەزهەر لەپەراوێزی لاپەڕە/٤٩ی کتێبی تێگەیشتنی راستیدا باسـی کردوەو وتویەتی ئەو سەرچاوانەی (ژین)یان بە رۆژنامە دانابوو بەهەڵەدا چوبوون چونکە گۆڤار بووە نەك رۆژنامە.

دەربارەی ئەو گۆڤاری (ژین)ە کـاك جمـال خەزنـەدار لەلاپـەڕە/٢١ی رابـەری رۆژنامەگـەری کوردیـدا وتویـەتی بـەزمانی کـوردیو عـەرەبیو تورکـی لـەقاهیرە لەلایەن سریا بدرخانەوە دەرچووە، هەروەها (رۆبرت ئۆڵسۆن)یش لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤باسی ئەو گۆڤارەی کردوە کە وتویەتی لەلایەن سریا بدرخانەوە لە قاهرە دەرچووە کە بریتی بووە لە درێژە پێدانی رۆژنامەی کوردستان کـە کـاتی خۆی لە قاهیرە دەرچووە.

## بەشی بیستەم

# نەخشەی دەوڵەتان بۆ دابەشکردنی وڵاتی عوسمانی

## ( پەیمانی سایکس پیکۆ)

دەربارەی هەلویستی دەوڵەتان وەکوو روسیاو بریتانیاو فرنسەو دوای ئەوانیش ئەڵمانیاو ئەمریکا بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی، هەریەکەیان نەخشەی تایبەتی خۆی هەبوە بۆ چونێتی دەسگرتن بەسەر زۆرترین بەشی ئەو ئیمپراتۆریەتەدا کە پوختەی نەخشەکانی سێ دەوڵەتی سەرەکی لەناو ئەوانەدا کە بریتانیاو روسیاو فرنسە بوو لە دارشتنی پەیمانی سایکس پیکۆو مۆرکردنیا دەردەکەوێ.

بەرلە هەموویان روسیای قیصری لەمێژبوو بۆ دەرفەتێك دەگەڕا دەسەلاتی سیاسیو ئابووری خۆی لەناو وڵاتی عوسمانیدا بەهێز بکاو بۆ ئەو مەبەستە گەلێك قونسولخانەی لەناوچەکانی سەر سنوریا لەگەڵ عوسمانی دامەزراندبوو کە هەریەکەیان بنکەیەکی تایبەتی بوون بۆ ئاسانکردنی کاروباری ئەو میسنێرانەی دەنێرران بۆ ناوچەکە بەناوی ئاینەوە هێزی قۆزاقی روسی بۆ جۆرە شەرفرۆشتنێك بە عوسمانی پێکهێنرابوو بەرامبەر بەوە عوسمانیەکانیش سوارەی حمیدیەیان رێکخستو ئەو شەڕانەی لەنێوان هەردولادا روویدا وەکوو شەڕی قرمو شەڕی قارصو ئەردەهان بوو بەهۆی ئەوەی حکومەتی عوسمانی ناچاربکرێ پەیمانی (سان أستیڤانو)و پەیمانی (برلین) مۆر بکاو ئەم هەڵویستەی روس بەرامبەر بە عوسمانی بەتەواوەتی سەرودلی بەریتانیاو فرنسەی گرتبوو، ئەوانەی تریش وەکوو ئەڵمانیاو ئیتالیاو ئەمریکا هەریەکەیان بەشێوەی خۆی کەوتە چالاکی.

فرنسـەو بریتانیـا کەلـە شـێوەدا سیاسـەتیان لەیەکـەوە نزیـك بـوو، سـاتێك دەسـتیانکرد بـەئامادەکردنی نەخشـەیەك بـۆ دەسـگرتن بەسـەر هـەندێ لەناوچەکانی دەوڵەتی عوسمـانی، نـەیان توانـی بـەبێ بەشداربوونی رووس ئـەو کارەیان ئەنجام بدەن، بۆیە بەجووتە لەگەڵ روسەکانا ئـەو نەخشـەیەی لەلایـەن نوێنەرانی ئینگلیزو فرنسـەوە (سـایکس‌وپیکۆ) ئامـادەکرابوو لەگـەڵ روسـەکانا کەوتنە گفت‌وگۆو لەگەڵیانا لەسەر نەخشەیەکی هاوبـەش رێك کـەوتن ئەگـەرچی لەدوای روخانی رژێمـی قیصری لـە شۆڕشـی ئۆکتۆبـەردا روسـەکان خۆیـان لـەو پەیمانە کێشایەوەو نەهێنیەکانی ئەو پەیمانەیان ئاشکرا کرد.

ئینگلیزەکان لـەمێژبوو تەقەلایـەکی زۆریـان دابـوو بـۆ کۆکردنـەوەی زانیـاری لەناو خاکی عوسمانیدا بەهۆی میسـینێرەکان‌و بـەهۆی گەڕیدەکانیانـەوە وەکـوو مـارك سـایکس‌و ریـچ‌و مێجرسـۆن‌و فرنسیەکانیش بـەهۆی ئـەوەی دەسـەلاتێکی زۆریان پـەیدا کردبـوو لەرێگـەی کۆمپانیـای (ریـژی ـــ کـە کۆمپانیایـەکی توتـن‌و جگـەرەی فرنسـی‌بوو) ئـەوانیش جگـە لـەوەی بەتـەمای سـوریاو لوبنـان بـوون، چاویشـیان بریبـووە ویلایـەتی موصـل‌و ئینگلیزەکـانیش لـە هـەموویان زۆرتـر مەبەسـتەکانیان ئاشـکرابوو کـە دەیانویسـت هـەموو میسـۆپۆتامیا بـۆ خۆیـان موسوگەر بکەن‌و بیکەن بە بەشـێك لـە موسـتەعمەرە گەورەکـەیان لەهندسـتان‌و نزیك بەچاڵە نەوتەکانی ئەهواز لەخواروی ئێراندا.

وەکوو لەباسـی دامـەزراوی دەوڵـەتی عوسمـانیدا لێـی دوایـن، تورکـەکانی عوسمانی کەوتبوونە ژێر باری قـەرزێکی ئێجگـار قـورس‌و گرانـەوەو لەمەبەسـتی روسـیاو ئینگلـیزو فرنسـە گەیشـتبوون بۆیـە تـاقمی أتحـادوترقی بـەنیازی خـۆ رزگارکردن لەو هەموو قـەرزە زۆرەی بەسـەر دەوڵەتەکەیانـەوە بـوو، بـۆ ئـەوەی خۆیان لەئینگلیزو فرنسە رزگار بکەن، خۆیان لە ئەڵمانـەکان نزیـك کـردەوە، کـە بەرلەوە ماوەیەك بوو پێوەندیـی ئـەڵمانیاو عوسمـانی بـەهێزبوبو، ژمارەیـەك لـە ئەفسـەرە ناسـراوەکانی ئـەڵمانی‌و نەمسـایی بـەکرێ گیرابوون‌و لــەناو سـوپای عوسمانیدا مەشقیان بەهێزەکانیان دەکردو هەندێکیان لەشەڕە ناوچەییەکانیشدا شان بەشانی سـوپای عوسمـانی بەشـدار دەبـوون، وەکـوو مۆڵتکـە کـە بەرلەمـە لەشوێنی خۆیدا لەباسی رووخاندنی ئەمارەتی بۆتاندا لێی دواین..

ئەمریکاییەکانیش کە تازە کەوتبوونە خۆیانو ئاگاداری چالاکیەکانی دەوڵەتانی تر بوون، ئەمانیش بەبێ دەنگی دانەنیشتنو هەروەکوو دوکتۆر کمال مەزهەر لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/١٠٣ أضواء علی قضایا دولیە لاپەڕە/٣٢باسی تەقەلادانی ئەمریکاییەکانی کردوە کە لە ساڵی ١٨٣٠دا پەیمانێکی دۆستایەتیو بازرگانێتیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا پەیدا کردو بەوە جێپێی خۆیان کردەوەو کەوتنە چالاکیو کۆمپانیای نەوتی (ستاندرد ئۆیل) بیانووی ئەوەی دۆزیەوە گوایا لەکاتی کوشتاری ئەرمەنیەکانا زیانیان لێ کەوتبوو ئەوانیش بەسەرکردایەتی (کولبی چستر) خۆیان گەیاندە کەناری دەریاکانی عوسمانی پاش ئەوەی (ولسن) بوو بە سەرۆکی ئەمریکا، خۆی وەکوو داواکارێکی ئاشتی خستە بەرچاوو ساتێك شەڕی جیهانی دەستی پێکرد چەکی بەهەموو لایەك فرۆشتو قەرزێکی زۆریشی دا بەبەریتانیاو فرنسەو ئیتر لەڕێگەی ئەو قەرزدانەوە ئەویش خۆیکرد بەدەوڵەتێکی هاوبەش.

لەبەرگی یەکەمی کتێبەکەی شێخ محمودا سەرچاوە/٨٠ لەلاپەڕەکانی (٢٧٠ ــ ٢٧٨) باسی بایەخدانی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان کراوە بەکوردستانو لە هەموویان چاکتر ئینگلیزەکان بوونو چاویان بڕیبووە نەوتی کوردستانو میسۆپۆتامیاو لەلاپەڕە/٤٢٨ی بەرگی دوهەمی ئەو کتێبەشدا باسی بەین برکێی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان کراوە لەسەر نەوتی میسۆپۆتامیاو کوردستان کە ئەمەش هەر بریتی بووە لەرەنگدانەوەی پەیمانی سایکس پیکو.

دەربارەی پەیمانی سایکس پیکۆ لەنێوان ١٥ ــ ١٧/ی مایس ١٩١٦دا هێشتا شەڕی جیهانی لەگەرمەیدا بووە ئەو نەخشەیە لە (بترۆگراد)مۆرکرا. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە لێی بدوێین تەنها بریتیە لەو ناوچە کوردیانەی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون کە پەیمانی سایکس پیکۆ گرتبوویەوە:

**١ - بە پێی نەخشەی سایکس پیکۆ ویلایەتی موصل ( خواروی کوردستان ) لەگەڵ ویلایەتی شامو حلب بەر فرنسیەکان کەوتبوو ( لەدوای تەواو بوونی شەڕ ئنگلیزەکان ویلایەتی موصلیان لەدەست فەرەنسیەکان دەرهێنا بەرامبەر بە هەندێ شوێنی تر کە درا بە فرنسیەکان ).**

**٢- باکووری کوردستان ( له په یمانی سایکس پیکۆدا بەکوردستانی مرکزیی ژوروو ناوبراوه )، بۆ روسیای قیصری دانرابوو ( لەدوای شۆرشی ئوکتوبرو کشانەوەی روسیا لە شەری جیهانی وازی لەو په یمانه هێناو مایەوه سەر سیاستی بریتانیا کەله پێشدا بو به لایەنگری په یمانی سیڤەر کە بە پێی ئەوه مافی کوردی باکورو باشوری تیادا دەستنیشانکرابوو، بەلام دوای ئەوه ئینگلیزەکان وازیان لەو سیاسەته هێناو رێگەیان دا به کمالیەکان دەست بەسەر باکوری کوردستانا بگرن وەکوو لەبەرگی دوهەمدا باسی دەکەین ).**

دەربارەی پەیمانی سایکس پیکۆو هۆی ئامادەکردن و مۆرکردنی، دوکتۆر کمال مەزهەر لەباسەکانیا وتویەتی:

((هۆی هەلگیرسانی شەری یەکەمی جیهان بەهۆی چاوچنۆکیو تێر نەخواردنی دەولەته گەورەکانەوە بووە کە بووە هۆی ئەوەی نەخشەی دابەشکردنی ناوچەکە بکێشریو کوردستان بەشێك بووه لەنەخشەی ئەو دابەشکردنه.

تورکەکان دەیانویست بەهۆی ئەلمانەکانەوه کە بە سەرزاری بوبوون بەدۆستی عوسمانی خۆیان لە دەولەته سوێندخۆرەکان (هاوپەیمانەکان) بپارێزن و له ئەنجامی ئەوەدا چونه پال ئەلمانیاو تێکەل بەشەری جیهانی بوون، لەراستیدا ئەگەر ئەلمان سەربکەوتایه بەتەمای هەموو دەولەتی عوسمانی بوو، روسیای قیصریش ئەگەر دەستی بکەوتایه هەموو کوردستانی بۆخۆی دەویستو فرنسیەکان جگە لەسوریاو لوبنان چاویان بریبووه ویلایەتی موصلیش.

نامەیەکی (سازانۆف)ی وەزیری دەرەوەی روسیای قیصری لەمانگی نیسانی ١٩١٦دا ناردبووی بۆ بالیۆزخانەی فرنسا لە (پترۆگراد) بەئاشکرا باسی کوردستانی لەو نامەیەدا بەم جۆرەی خوارەوه کردبوو:

**١- پێویسته ناوچەی ئەرزرۆمو ترابزون و وان و بدلیس هەتا ئەو شوێنەی ئەکەوێته رۆژئاوای ترابزون لەسەر کەناری دەریای رەش هەمووی بۆ روسیا دابنرێت.**

**٢- ئەبێ ناوچەی کوردستان لەباشوری وان و بدلیس دا، لەنێوانی موش و سعرت و روباری دجلەو جزیرەی أبن عومەر، هێلی لووتکەی ئەو شاخانەی بەسەر عمادیەدا دەروانن لەگەل مەرگەوەر، هەمووی بۆ روسیا تەرخان بکریو روسیاش بەرامبەر بەمانە**

**دان بەومدا ئەنێت ئـەو ناوچانـەی کەوتونـە نێـوان (ئالـەداخ ـ قیصـری ـ خربـوط) هەمووی بۆ فرنسە بێ.**

**٣-روسیا بەو پەڕی توندوتیژیەوە بەرامبەر هەر هەوڵێکی فرنسـا دەوەستێت و پـێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە نابێ هیچ بەشێك لەکوردستان، بەتایبەتی خۆرئاوای تورکیـا بدرێت بە فرنسە)).**

لەبەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا دەگەڕێینەوە سەر ئەم باسـەو لـەڕووداوەکانی دوای شەڕی جیهانی یەکەم بەدوورو درێژ باسی سیاسەتی بریتانیـا دەکـەین چۆن لەسەرخۆو بەپێی نەخشەیەکی تایبـەتی خۆیـان هـەموو مەبەستەکانیان هێنایـە ئەنجام.

# بەشی بیست‌ویەکەم
# شەڕی یەکەمی جیهانی‌و بارودۆخی کوردستان لەکاتی شەڕەکەدا

وەکوو لەباسەکانی پێشودا ڕوون بۆتەوە باری ئابووریی دەوڵەتی عوسمانی لەپێش شەڕی جیهانیدا بەماوەیەك تەواو دارِزاوو ئالۆز بووە لەژێر باری قەرزێکی زۆردا نالآندوێتی‌و توانای دانەوەی ئەو قەرزانەی نەبووەو دەوڵەتە سەرمایەدارە خاوەن قەرزەکان مرخیان لەدابەشکرن‌و دەسگرتن بەسەر خاکی عوسمانیدا خۆشکردبوو، ماوەیەك بوو ئەو ولآتانە چاویان بریبووە خێروبێری عوسمانی‌و کۆمپانیاکانی هەندێکیان دەسەلآتی پشکنینی گەلێك شوێنیان پێدرابوو بۆ دۆزینەوەی نەوت‌و دەرهێنانی بەئومیدی ئەوەی لەم ڕێگەیەوە قەرزەکانی خۆیان دەزگیر بکەنەوەو ئەڵمانەکانیش ئاگاداری مەبەستەکانی حکومەتەکانی بریتانیاو فرنساو روسیاو ئەمریکا بوون‌و ئەوانیش نەخشەی ئەوەیان کێشابوو دەسبکەن بەدروستکردن‌و تەواوکردنی ئەو هێڵی شەمەندەفەرەی بەتەمابوون لە موصڵەوە بیگەیەننە بصرە بەرامبەر بە بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز لە هندستان‌و لەناوچەی ئەهوازی خوارووی ئێرانی پڕ لەنەوت.

لە گێژاوی ئەو بارودۆخ‌و هەڵوێستانەدا طورانیەکانی أتحادوترقی ماوەیەك بوو پێوەندییان لەگەڵ ئەڵمانەکانا بەهێز کردبوو شان بەشانی ئەوان تیکەڵ بەشەڕی جیهانی بوون.

بەرلە دەسپێکردنی شەڕو لەکاتی شەڕەکەشدا ئەڵمانەکان کەوتنە چالاکی‌و بایەخ پێدان بە میللەتی کورد کە خاکەکەیان هەندێکی کەوتبووە سەر سنوری یەکێك لە دوژمنەکانی خۆیان‌و تورکەکان (مەبەستی روسیایە).

دەربارەی ئەوە دوکتۆر کمال مەزهەر لەسەرچاوە/٢٤دا لەباسی چالاکیو بایەخ پێدانی ئەڵمان بەکورد لەکاتی شەڕی جیهانیداو هەوڵیان دابوو هەموو بەیاننامەو چاپەمەنیەکانی پان ئیسلام بەهەموو کوردستانی ئێرانا بلاوبکەنەوە بۆ ئەوەی لەلایەکەوە بەلای تورکدا ڕایانکێشنو لەلایەکی تریشەوە لەڕووسەکان دوریان بخەنەوەو بۆ ئەو مەبەستە ژمارەیەك سیخوڕی خۆیان وەکوو(شێونمان)و(لیستین) هەندێکیتر کەوتەکارو لەرۆژهەلاتی ناوەڕاستداو لەناو کوردستانا چالاکییان پەرەی سەندو ئینگلیزەکانیش لەناوچەی وان و لەڕێگەی وەکیلی قونسولەکەیانەوە پێوەندیان بەدەسەلاتدارانی کوردەوە کرد لەناوچەی بدلیسداو لەدیاربکرو موصلیش لەچالاکیدابوون و وایان لەدانیشتوان کردبوو لەدوارۆژێکی نزیکدا هەموو رۆژهەلاتی ناوەڕاست دەکەوێتە ژێر دەسەلاتی بەریتانیا هەروەکوو لازاریف لەکتێبەکەیدا بەدوورو درێژ باسی کردووە.

بەرامبەر بەوان، روسەکانیش ماوەیەك بوو خۆیان بۆ ئەوە ئامادە کردبوو هەرکاتێك بۆیان بلوێ چەند بەشێکی کوردستان داگیر بکەنو بۆ ئەو مەبەستە چەند قونسولخانەیەکیان لەشارەکانی کوردستانی ئێرانو تورکیا کردبووەوەو لەولاشەوە فرنسەکانو ئەمریکاییەکانیش هەریەکەیان پرۆژەو نەخشەی خۆی هەبوە لەناوچەکەدا.

دوکتۆر کمال مەزهەر لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٤لەسەری ئەڕواو ئەڵێ:

((ساتێك شەڕی جیهانی یەکەم دەستی پێکرد، کوردستان بوبوو بەمەیدانی سوپای سێ ولات کەبریتی بوون لەعوسمانیو روسو ئینگلیز، بەهۆی ئەوەوە کوورد توشی کارەساتێکی گەورەبوو بەبێ ئەوەی ئەوشەڕە هیچ سوودێکی کوردی تیادا بووبێو میللەتەکەیو ولاتەکەی بەخۆڕایی ئالێنرایە شەڕەوە.

لەگەرمەی شەڕدا تورکەکان هەستی ئاینی کوردیان دژی روسیای کریستیان دەبزوانو بەرامبەر بەوان روسەکانیش کوردیان دژی تورکەکان هانئەداو پێوەندییان لەگەڵ چەند سەرۆکێکی کوردا بەهێز کردبوو تەنانەت شێخ عبدالقادری شمزینی کە شێخێکی ئاینی بوو بەڵێنی دابوو بەروسەکان بەهەموو توانای خۆیەوە بداتە پاڵ ئەوان بەمەرجێك بەرامبەر بەوە ئەوانیش دەزگایەکی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد موسوەگەر بکەن.

دەربارەی ئەو پەیوەندییەی نێوان روس‌و شێخ عبدالقادر، لازاریف لەلاپەرە/٣٠٤ی کتێبەکەیدا باسی ئەوەی کردوەلەو رۆژانەدا نامەیەکی خۆی بەکوردستانا بڵاوکردبووەوەو داوای لەخەڵك کردبوو بەرەنگاری لەشکری روس نەبنەوەو شەڕی لەگەڵدا نەکەن، بەوجۆرە هەروەکوو لازاریف باسی کردوە، دەنگی یەکەم تەقەی شەڕ لەرۆژهەڵاتی نزیکدا لەکوردستانی ئێرانا بەرز بووەوە نەك لەدەریای رەشی نێوان تورکیاو روسیا.

بەوجۆرەلەماوەی شەڕی یەکەمدا کە چوارساڵی خایان، کوردستان بوبوو بەکێڵگەو ژێرپێی هێزەکانی روس‌و تورك‌و ئینگلیزو بوویەهۆی ماڵوێرانی‌و کوشتنی هەزاران کوردی بێتاوان، بەتایبەتی سەربازەکانی سوپای عوسمانی لەئەرزڕۆم‌و لەشکری دەهەمی ناوچەی سیواس‌و لەشکری یازدە لەناوچەی (العزیز)و لەشکری دوازدە لە موصلێ لەکوردەکان بوون‌و زۆریان لێ کوژرا.

لەڕاستیدا سەربازەکانی کوردی ناو سوپای عوسمانی بەهۆی جەورو ستەمی کاربەدەستانی تورکەوە بەکێشدەکران بۆ کوێری شەڕو هەروەکوو دوکتۆر کمال مەزهەر لەلاپەرەکانی (٥٤ ـ ٥٥)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٤باسی کردوە، هێشتا زۆر بەسەر دەست پێکرنی شەڕدا تێپەڕی نەکردبوو سەربازە کوردەکانی ناو لەشکری عوسمانی بەتاکەو بەکۆمەڵ سوپای تورکیان بەجێ دەهێشت‌و ڕایان دەکردو هەموو چەند مانگێك بوو شەڕ دەستی پێکردبوو، لە (١٨هەزار) سوارەی کوردی ناو لەشکری سێهەم تەنها(٢٨٠٠) کەسیان لێ مایەوەو لەجەبهەی قفقاسدا لەگەرمەی شەڕدا جاری واهەبوە سەربازو سەردارەکانی کوردی ناو سوپای عوسمانی بەخۆیان‌و چەکەکانیانەوە دەچوونە پاڵ هێزی روس.

دوای ئەوە شەڕی روس‌و عوسمانی لەکوردستانی ئێرانا تەشەنەی کرد، عوسمانیەکان لەوێ دوو سەرداری کورد (محمد حسێن خان)و (سیف الدین خانی سەقزی)یان لەسێدارە داو بۆ چاوترساندنی خەڵك بۆ چەند رۆژێك لاشەکانیان بەسێدارەوە هێڵرانەوە.

ئەوی راستی بێ لەکوردستانی ئێرانا روسەکانیش شتێکی کەمتریان نەکردبوو لەتورکەکان، کە وشەی (مۆسقۆف)دیاریی تاوانەکانی ئەو سەردەمەی روس بووە لەناو کوردەکاناو ئەوانیش مرزا فتاحی قازی (مەبەست لەقازی فتاحە ١٨٣٢ ـــ

١٦١٦) كه برا بچوكى باپيرى قازى محمدى شەهيد بووه كـه قـازى فتـاح خـۆىو كورێكى لەلايەن روسەكانەوە شەهيد كرابوون.

دەربارەى چالاكى ئەلمانەكان لەكاتى شەڕدا بۆ هاوكـاريكردن لەگـەلْ توركـى هاوكاريانا، سەرچاوە/٦٢ بەدورو درێژ باسى تەقەلاكانى ئەلمانـەكانى كـردوە بـۆ ئەوەى كورد بۆ سوودى تورك بەتەواوى بگلێنرێتـە شـەڕەوەو بـۆ ئـەو مەبەستە چـەند كوردێكيـان نـارد بـۆ نـاو خـاكى روسـيا بـۆ كـاولكردنو وێرانكـارىو توركەكانيش بۆ هێوركردنەوەو دلْنيـا بوونـى كـورد بەرامبـەريان بـەلێنيان دابـوو بەكورد لەدواى تەولو بوونى شـەڕ ئۆتۆنۆمـى ئـەدەن بـەكورد، بـەلام تەقـەلاكانى توركەكانو ئەلمانەكان سەركەوتنێكى ئەوتۆى بەدى نەهێنا.

سەرچاوە/٦٢لە باسەكەيدا ئەلێ :

لەڕاستيدا توركەكانو ئەلمانەكان هەر لەسەرەتاى شەڕەوە زۆر دلْنيا نـەبوون لـەكوردەكانو لێيـان دەسـلەمينەوە، لەبـەر ئـەوەى لـەكاتى شـەڕدا چـەكو جبەخانەيـەكى كـەميان ئـەدا بـەكوردەكان كـە بەشـى شـەڕێكى درێژخايـەنى نەدەكردو هێزى كورد لەناو سوپاى توركدا بىٚبەش دەكـرا لـە تـۆپو ڕەشـاشو واى لىٚ هـاتبوو لـەكۆتايى سالّى ١٩١٥دا لـەناو سـوپاى سـێهەمى كـوردا تەنـها (٨)هەزار كوردى تيا مابووەوە (بەلام وەكوو لەمەوپێش باسكراوە دوكتۆر كمـال مەزهەر لەسەرچاوە/٢٤دا وتويەتى لەناو سـوپاى سـێهەمدا تەنـها (٢٨٠٠) كـورد مابووەوە)، هـەروەكوو هـەوالّنێرەكانى روس ڕايـان دەگـەياند، كوردەكـان وايـان لێهـاتبوو باوەڕيـان بـەو هەوالانـە نـەدەكرد دەربـارەى سـەركەوتنەكانى تـورك بلاودەكرانەوە.

باسيل نيكتين دەربارەى باوەڕنەبوونى كورد بەرامبـەر بـەو أعلانـى جـهادەى توركـەكان بلاويـان دەكـردەوە لەكتێبەكـەيدا باسـى ئـەوەى كردوەكـە تەنانـەت شـێخە ئاينيـەكانى كـورد بەوپـەڕى قەناعەتـەوە دژى ئـەو أعلانـى جـهادە ڕادەوەستانو سەربازەكانى كورد يا لەسوپا ڕايـان دەكـرد يـان دەچوونـە پـالْ هێزەكەى روسو خۆيان ئـەدا بەدەستەوەو كـامل بدرخـان كـە مـامى عبدالـرزاق بدرخـان بـووە لەگـەلْ كورحسـن پاشـاو چـەند كەسـێكىتر بانگـەوازێكيان بلاوكردەوەو داوايان لەكورد كرد لوولەى چەكەكانيان ئاڕاستەى توركەكان بكەن.

دەربـارەی هـۆی بـێزاربوونی کـوردو ئەرمـەنی بەرامبـەر بـەتورك، سەرچاوە/٦٣باسی ئەوەی کردوە ساتێك کاربەدەستان‌و هێزەکانی تورك لەکاتی شەڕدا بەناو ئەرمەنی رۆژهەلأت‌و کوردستاندا تێپـەڕیان بکردایـە هـەموو خـۆراك‌و مـەڕومالأتی دانیشتوانیان تـالأن دەکـردو دەت ووت بـەناو خـاکی دوژمنــدا تـێ دەپەڕن!!

تورکەکان دوای ئەوەی ئومێدی ئەوەیان نەما بەکاولکردن وا لە ئەرمەنیـەکان دەکەن ببێ بەهاوکاریان، ئیتر دەستیان کرد بەبەکارهێنانی سیاسەتی (بەکۆمەڵ لەناوبردن‌و جینۆساید) بەبیانوی ئەوەی ئەرمەنیەکان خەریکی خۆ ئامـادەکردنن بۆ راپەرینێك دژی تـورك دەستیانکرد بـە ئاوارەکردنیـان بـۆ دەشتە چۆڵـەکانی سوریاو لەئەنادۆڵیشـدا دەسـتیانکرد بەکوشـتاری ئەرمەنیـەکان‌و هـەر ئەوانـەیان رزگـاری بوبـوو کـە توانیبویـان خۆیـان بگەیەننـە نـاو خـاکی روسـیاوەو جگـە لەئەرمەنیەکان نسطوریەکانی ناوچەی هەکاریش (مەبەست ئاسـوریەکانە) توشـی کارەساتێکی گەورەبوون‌و بەناچاری پـەنایان بردە بـەر ناوچـەکانی دەوروبـەری گۆلی ورمیـەو لـەرێگایانا ژمارەیـەکی زۆریـان لێ کـوژراو، تورکـەکان توانیبویـان هەندێ لەدەرەبەگەکانی ناوچەکانی وان، موش، شـاکرو، هـەکاری، ورمیـە بکـەن بەدوژمنی ئەرمەنی‌و ئاسوری‌و بەڵێنی ئەوەیان پێدابوون زەوی‌و زاری ئەرمـەنی‌و ئاسوریەکانیان بدرێتێ.

سـاتێك هـەواڵی ئـەو تـاوان‌و کوشـتارەی لەئەرمـەنی‌و ئاسـوریەکان کرابـوو لەلایـەن تورکەکانـەوە، طلعـت پاشـای نەخشەکێشـی کوشـتارو ئـاوارەکردن بـۆ ئـەوەی کـوردی پـێ بـەدناو بکـاو پاکانـە بۆخـۆی بکـا هــەمووی دابـووە پـاڵ کوردەکان‌و بەپرۆپاگەندە تاڕادەیەك لەو رۆژانەدا کـوردو ئەرمـەنی‌و ئاسـوری‌یان کردبوو بەدوژمنی یەك‌و بەخۆڕایی ناوی کوردیان زڕاندبوو.

بەلأم لەگەڵ ئەو هەموو تەقەلادانەی تورکـدا، تورکـەکان توانیبوویـان هـەندێ لـەو پرۆپاگـەندەو درۆو دەلەسـانەی کاربەدەسـتانی تـورك بـەدرۆ بخەنـەوە. بـۆ نمونەی ئەوە: (ف.أ. گردلێڤسکی) کە خۆی لەکاتی شەڕدا چەند جارێك چووە بۆ کـۆڕی شـەڕ لەکتێبەکـەیدا هــەندێ لـەو درۆو دەلەسـانەی پوچـەڵ کردۆتـەوە وتوویەتی :((ئەرمەنیەکان لەناو کوردەکانا لەهەموو شوێنێکدا دۆستیان هـەبوەو

زۆرجـار کوردەکـان توانیبویـان ئەرمەنیـەکان لـەو جەوروسـتەمو کوشـتاری تورکەکان رزگار بکەنو بەرامبەر بەوە لـەناو ئەرمەنـەکاندا هـیوا هـەبوە لـەکاتی پێویستدا یارمەتی کوردیان دابوو.

ساتێك تورکـەکان دەستیان کردبوو بەکوشتاری ئەرمەنیـەکان، ژمارەیـەکی زۆری ئەرمەنیـەکان پـەنایان بردبـووە بـەر تورکـەکانو لەشـوێنێکی وەکـوو (دەرسیم)دا نزیکی بیست هـەزار ئەرمـەنی لای کوردەکـان پەنابـەر بوون لەگـەڵ ئەوەشـدا کـورد خـۆی لـەو رۆژەدا زۆر پەرێشـان بـوونو لـەژێر بـاری گرانـیو نـەبوونیو برسـێتیدا بـوونو کوردەکـان لـەو رۆژانـەدا دوا پارچـەنانیان لەگـەڵ ئەرمەنیەکانا دەکرد بەدوو کەرتەوە)).

دەربارەی ئەو یارمەتیدانەی کورد بۆ ئەرمەنی کە گردلێڤسـکی باسـیکردوە، عبدالعزیز یامولکی لەکتێبەکەیدا (کوردو کوردسـتان أختـلا للـری) چاپی تـاران، وتوویەتی سیٚچارەکی ئەو ئەرمەنیانەی لەکوشتنو مردن رزگاریان بوبوو بـەهۆی یارمەتیدانی کوردەوە بووە لەگـەڵ ئەوەشـدا لـەو رۆژانـەدا هەرکەسێك یارمـەتی ئەرمەنی بدایە لەلایەن تورکەکانەوە بەوپەڕی دڵڕەقیـیەوە سزا ئەدرا.

# بەشی بیست و دوەم
# ئەنجامی شەڕی جیهانی یەکەم و ئەو زیانانەی بە کورد گەیشت

وەکوو لەپێشترا باس کرا، میللەتی کورد لەشەڕی جیهانی یەکەمدا کە بە (سەفەربەر) ناسراوبووە لای کورد، وڵاتەکەی کرابوو بەکۆڕی شەڕی نێوان تورکو روس و ئینگلیزو لەو شەڕەدا کورد زیانێکی زۆری ماڵی و گیانی لێ کەوت وڵاتەکەی کاول کراو بەدەیان هەزاری لەکۆڕی شەڕەکانا کوژراو برسێتی و قات و قڕی ژمارەیەکی زۆری لەناو بردبوو، میللەتی کورد لەناو وڵاتی عوسمانیدا لەهەموو میللەتانی تر توشی زیان و ماڵ کاولی بوو.

ئەمین زەکی بەگی مێژوونووس و شارەزا بەڕووداوەکانی ئەو رۆژانە وەکوو ئەفسەرێکی گەورەی ناو سوپای تورکیا کەلە شوێنی خۆیدا باسی ژیانیمان کردووە، کەلە کتێبەکەیدا مێژووی کوردو کوردستان، سەرچاوە/٣٢ باسێکی تایبەتی تەرخانکردووە لەژێر ناوی شەڕی گەورە ساڵی ١٣٣٢/ی کۆچی بەرامبەر ساڵی ١٩١٤ی زایین هەتا ساڵی ١٣٣٦ بەرامبەر ١٩١٨ لەو باسەدا بەدوورودرێژ باسی ئەو زیانانەی کردووە کە میللەتی کورد بەهۆی ئەو شەڕەوە توشی بوبوو لەلاپەڕە/٢٥٧ی کتێبەکەیدا ئەو زیانانەی کردبوو بەم بەشانەی خوارەوە:

(ئێمەش وەکوو وێنەیەکی راستی بەسەرهاتەکان و ئەو زیانانەی کەلەکورد کەوتبوو کورتەیەکی پێشکەش دەکەین).

**یەکەم: ئەو زیانانەی بەهۆی رەشبگیری (سەربازی أجباری)یەوە تووشی کورد بوبوو**

لەو شەڕەدا هەرچی لاو گەنج هەبوو (وەکوو پیرەکانی سەردەمی منداڵی ئێمە دەیانگێڕایەوە مرۆڤی بەساڵاچووش لە سەربازێتی و بێگاری عوسمانی رزگاری نەبوبوو)، هەموویان بەزۆرەملێ گیران و کران بەسەربازو بەزۆرەملێ کران

بەچەك هەڵگرو ئەم كارە بوو بەهۆی ئەوەی بەهەزاران گـەنج‌ولاو لەخێزانـەكانیان دورخرانەوەو لەناو ماڵآنا مابوونەوە تەنها ژن‌و منـداڵ‌و پیـاوی پـیری بەسـاڵآچوو بوون‌و دەوڵەمەندەكانیش كەوتنە ژێر باجێكی زۆری حكومەتەوە كـەپێی دەوتـرا (بدلی عسكری) بۆ ئەوەی نەكرێن بەسەربازو حكومەت گەلێك شێوەی تری بـەكار دەهێنا بۆ پارەسەندن لەخەڵك كـە بـۆ هـەرجۆرێك بـڕوو بیانوویـەكی ئەدۆزیـەوە لەگـەڵ لێسـەندنی ولاغی بـەرزە بـەبیانووی ئـەوەی خـۆراك‌و ئازووقـەیان پـێ دەگوێزنـەوە بـۆ ناوچـەكانی شـەڕ لەكوردسـتانا هـی وای تیـا نـەمابوو توانـای كشت‌وكاڵ كردن‌و بەرهەم هێنانی مابێ‌و ئەو بەرهەمە كەمانەش كە لەلایـەن ژن‌و منداڵـەوە پـەیدا ئـەبوو توركـەكان بـەو پـەڕی بـێ ویژدانیـەوەو بەوپـەڕی بـێ بەزەییەوە لێیان زەوت دەكردن‌و بەبرسێتی‌و بەنەبوونی دەیان هێشتنەوە.

**دوهەم: ئەو زیانانەی لەكۆڕی شەڕەكانا بەكورد گەیشتبوو**

حكومـەتی عوسمـانی لـەكاتی شـەڕی جیـهانیدا دوو سـوپای لـەكوردەكان ئامادەكردبوو، سوپای یەكەمیان بریتی بوو لەسوپای یازدەهـەم كە شـوێنەكەی لە (معموره العزیز)داو سوپای دوهەم لە موصڵدا بـوو بێجگـە لـەو دوو سـوپایە، (١٣٥) بلووك سواری أحتیاط كە دەیكردە چوار فرقەو لیوایـەك جگـە لـە هـەندێ هێزی‌تر كران بە جەندرمەو ئاسایش‌و زۆربـەی ئەفسـەرەكانی سـوپای نۆهـەم لـە (ئەرزیرۆم)و هی دەهەم لە (سیواس) كەلە كوردەكان بوون.

بێگومان خۆراكی ئەو هەموو سوپایانە لەدەمی میللەت دەگیرایـەوەو میللـەت ناچار دەكـرا ئـەو خۆراكانـە بـۆ حكومـەت ئامـادە بكـاو بـەهۆی درێـژە كێشـانی شەڕەوە ئەو بۆشاییانەی لـەناو هـێزی سـوپادا پـەیدا دەبـوو (مەبەسـتی ئـەمین زەكـی لـەو بۆشـاییانە : ئەوانـەی دەكـوژران شـوێنەكانیان دەبوایـە بـەهی‌تر پـڕ بكرایەتەوە) هەمووی بەگەنج‌و لاوی ستەمدیدە پڕ بكرایەتەوە.

ئەمین زەكـی باسـی ئـەوەی كـردوە چـۆن سـەركردەی هێزەكـانی عوسمـانی كوردیـان ناچـار دەكـرد بـەناوی (غـەزا)وە بچنـە نـاو ریـزی شـەڕەكانەوە كەلـە شوێنێكی وەكوو باشوری كوردستانا شـێخ مـەحمودو چـەند سـەرۆك‌و نـائیبێكی كـورد نـێران بـۆ شـەڕی شعێبەو بـەهۆی ئـەوەوە تووشـی زیـانێكی زۆر بـووە (دەربارەی ئەو شەڕی شعیبەیەی ئەمین زەكی باسی كـردوە، لەبـەرگی یەكـەمی

کتێبەکەی شێخ مەحمودا ـ لاپەڕە/٣٤٥ بەدورو درێژ باسی ئەو شەڕەو ئەوەی ناوچەی مەریوانیش کە هەمدیسان شێخ مەحمود دژی سوپای روسی کردبووی لەلاپەڕە/٣٤٨دا باس کراوە).

ئەمین زەکی لەلاپەڕە/٢٥٩ی کتێبەکەیدا ئەڵێ:

حکومەتی عوسمانی لەسەرەتای شەڕی یەکەمدا تووشی خەیاڵ پلاوێکی سەیر بوبوو، لای وابوو بەهۆی ئەو شەڕەوە دەتوانرێ ئێران و توران داگیربکاو بیخاتە سەر ئیمپراتۆریەتەکەی و لەوێشەوە بگاتە هندستان و بەوە ئاواتی سەرگرتنی ئیمپراتۆریتی (طورانی) دەهێنێتە دی کە هەمیشە خەوی پێوە دەبینی، لەبەر ئەوە کەشەڕ دەستی پێکرد ئەویش دژی روسیا کەوتە شەڕەوەو هەرچی سوپاکانی بوو، هەرچی سوارەی عەشایرو قوتابی کولیەکان بوو هەمووی کۆکردنەوەو بەکێشی کردن بۆ سەر سنوری ئێران بەسەرکردایەتی (عمر ناجی)و (رؤوف)و (خالد)و هێزی یەکەم و دەهەم پەلاماری ئێرانیاندا کەلە ناوچەی هەورامانەوە هەتا تەورێزی گرتەوەو ناوچەی موکری و بانەی گرت و تالآنیان کردو راوو رووتێکی زۆری کردو ئیبراهیم بەگ کە سەرکردەی هێزیکی عوسمانی بوو (حسێن خان)ی حاکمی موکری أعدام کرد کە دوا ئەمیری بنەماڵەی (بابامیری) بوو لەناوچەی موکریاندا، لەگەڵ (حمه خان) کە لام وایە ئەمین زەکی مەبەستی حەمە خانی بانەی بەناوبانگ بووە کە گەلێك گۆرانی فولکلۆری دەربارەی وتراوە).

(بێجگە لە حسێن خان ـــ کە دوکتۆر کمال مەزهەر لەلاپەڕە/٦١/ی سەرچاوە/٢٤دا بە محمد حسێن خان ناوی بردوە، قازی فتاح کە برا بچووکی باپیری قازی محمد بووە لەلایەن روسەکانەوە کوژرابوو وسیف الدین خانی سەقزیش هەر لەو شەڕانەدا کوژرابوو (وەکوو لەبەشی بیست و یەك دا بەرلەوە باس کراون).

ئەمین زەکی لەباسی تاوانەکانی (عمر ناجی)و (ئیبراهیم بدلیس) دواوە، کە سالێك هێزەکانیان لە (وان)و (بدلیس)ەوە بردبووە ناو خاکی کوردستانی ئێرانەوە، ئەو کوشتارو تالآنکردن و ماڵ کاول کردنەی ئەوان کردبویان لەسنووری هەموو رەفتارێك چوبووە دەرو قەڵەم ناتوانێ باسیان بکات.

**سێهەم : ئەو زیانانەی بەهۆی کوشتارو ئاوارەکردن و ڕاگویزانەوە بەکورد گەیشتبوو**

ئەمین زەکی باسی ئەو ئەرمەنیە چەکدارانەی کردوە کەلەلایەن روسەکانەوە پرچەك کرابوون و نێرابوونە ناو خاکی عوسمانیەوە کەلە ناوچە کوردیەکانا گەیشتبوونە (بایزید)و (ئەلشکرد) و(وان) لەو ناوچانەدا زیانێکی زۆری ماڵی و گیانی‌یان بەکورد گەیان و تورکەکانیش لەلایەن خۆیانەوە بەو پەڕی دڵڕەقیەوە دەستیانکرد بەکوشتارو تالآنی لەکوردەکانی ئەو ناوچەو یەکێکی وەکوو (خلیل پاشا)ی یەکێك لەسەرکردەکانی تورك خۆی بەوەوە هەڵدەکێشا بەزەیی بەهیچ کوردێکدا نەدەهاتەوەو لەناوی دەبردن.

ئەمین زەکی لەلاپەرە/٢٦١ی مێژووی کوردو کوردستانا ئاماژەی بۆ لاپەرە/٣٣ی کتێبی (القضیة الکردستانیة والترك) کردوە، بەپێ ئەو کتێبە تورکەکان (٧٠٠) هەزار کوردیان ئاوارە کردبوو.

سوپای دوهەمی عوسمانی کەلە دیاربکردا بوو لەپایزی ساڵی ١٩١٧ دانیشتوانی شارەکانی دیابکرو موش‌و بدلیسی دەکرد بەبیانووی ئەوەی بەدەرکردنیان هەموو خۆراکەکانیان بۆ سوپای عوسمانی دەمێنێتەوەو لەئەنجامی ئەو کردەوەیانا ژمارەیەکی زۆری کوردیان ئاوارەکرد بۆ موصل‌و ئەطنەو حلب‌و لەڕێگایانا بەهۆی برسێتی‌و سەرماو نەخۆشیەوە ژمارەیەکی زۆر کەمیان بەساغی گەیشتنە ئەو شوێنانەی بۆیان دەسنیشانکرابوو، برسێتی گەیشتبووە ڕادەیەك خەڵك ناچاربوو گۆشتی مردوو بخوا، بەوجۆرە لەساڵانی یەکەم‌و دوهەمی شەڕی جیهانی یەکەمدا ئەرمەنیەکان چیان بەسەرهات کوردەکانیش لەماوەی یەکدوساڵدا تووشی هەمان کارەسات‌و ماڵ وێرانی بوون.

دەربارەی ئەو (٧٠٠)هەزار کوردە ئاوارە کراوانە، جگە لەو باسەی ئەمین زەکی، گەلێك سەرچاوەی تر باسی ئاوارەبوونی کوردیان کردوە بەهۆی ئەو شەڕەوە، بەپێویستم زانی کورتەی هەندێکیان باس بکەم بۆ ئەوەی دڕندەیەتی‌و نامرۆڤایەتی تورکی ئەو ڕۆژانە بخەمە بەرچاو:

دەربارەی ئەوە، لەسەرچاوە/٦٣دا باسی ڕێکخراوێکی تورکی کردووە لەکاتی شەڕی جیهانیدا ناوی (العروة الوثقی والتقدم ـ ترجمە عەرەبیەکەیەتی بەپێی ئەو سەرچاوە/ بەداخەوە تورکیەکەیم دەست نەکەوت)، لەوەدا ئەو ڕێکخراوەی تورك

لەساڵی ١٩١٥دا سوڵتانیان ناچارکردبوو چەند فەرمانێك دەربکا بۆ ئاوارەکردنی کورد بۆ رۆژئاوای ئەنادۆڵ بۆ ئەوەی لەناو تورکەکانا بتوێنرێنەوە، بەو جۆرە (٧٠٠) هەزار کورد ئاوارە کران و ئەوانەش کە مابوونەوە بەهۆی نەخۆشی کولێرەو ئاوڵەوەو بەرشانەوە لەناو چون و تورکەکان هەموو مەڕو ماڵاتەکانیان تالآنکرد.

دەربارەی ئاوارەکردنی کورد، سریا بدرخان، لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٩دا باسی دەزگای سەرکردایەتی گشتی بۆ سەرپەرشتی کردنی ئاوارەکان لەساڵی ١٩١٥ بەئاشکرا دانی بەئاوارەکردنی (٧٠٠)هەزار کوردا ناوە کەلە کوردستانەوە گوێزرابوونەوە بۆ رۆژئاوای تورکیاو ژن و منداڵیان لەگەورەکان جیا کردبووەوەو هەروەکوو دیل و بەند رەفتاریان لەگەڵا دەکردن و برسێتی و نەخۆشی کارێکی وای کردبوو بەسەلامەتی ئەو گوێزراوانە نەدەگەیشتنە ئەو شوێنەی بۆیان دەستنیشان کرابوو، ئەوانەی لەناو دۆڵو لاپاڵی چیاکاندا دەکەوتن کەس نەبوو فریایان بکەوێو دەمردن. لێرەدا ئەو دوو دێرە شیعرەی فقێ محمدی هەمەوەندی دێتەوە بەرچاو کە دەربارەی تورك وتوویەتی و خۆیشی یەکێك بووە لەوانەی کاتی خۆی ئاوارە کرابوو بۆ لیبیاو لەشاری (بنغازی)دا بەئاوارەیی مردبوو لەو شیعرەدا بەرامبەر بە تورك ووتویەتی:

وەسیەتم ئێرەن جەلای خاص و عام — بەتورکان هەرگیز مەواچون ئیسلام
نەصرف ئینصاف، نە مەیل و مروەت — نەهەن جەلاشان زەرپی مەرحەمەت

عبدالعزیز یاملکیش لەلاپەڕەکانی ٦١ ــ ٦٢ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٧ باسی ئاوارەکردنی کوردی کردوە چۆن لە زستانێکی ساردو سەهۆڵبەندانا لەرێگا ئەو کوردە ئاوارەبوانە تووشی نەخۆشی و برسێتی و رووت و قووتی دەبوون و لەلاپەرە/٦٦دا باسی درندەیەتی تورکی کردوەو ئاماژەی بۆ راپۆرتەکانی (کاوریکا) کردوە یەکێك بووە لەسیاسیەکانی روس و لەو راپۆرتانەدا باسی ئەوەی کردوە چۆن تورکەکان وەکوو درەندە سکی پیاوانی کوردیان هەڵدەدری و مەمکی ئافرەتیان دەبری و بەزەییان بەهیچ کەسێکدا نەدەهاتەوە.

عبدالعزیز لەکتێبەکەیدا ئەڵێ : پێویست ناکا باسی هەموو تاوانەکانی تورک بکەین چونکە من بەچاوی خۆم لەڕێگای کرمنشاەو خواروی خانقیندا چاوم بەلاشەی ئەو جوتیارانەی کورد کەوتبوو لەلایەن تورکەکانەوە کوژرابوون‌و لاشەکانیان بەملاولای ڕێگەکانا فڕێ درابوون.

دەربارەی ئاوارەکردنی کورد، بلەچ شێرکوە (جلادت بدرخان) لەلاپەڕە/٧٢ی سەرچاوە/٦٠دا ئەمیش وەکوو سەرچاوەکانی تر ژمارەی ئاوارەکانی کوردی بە (٧٠٠) هەزار کەس داناوەو باسی ڕۆژنامەی (سریستی)ی تورکی ژمارە/٤٨١ی ڕۆژی ١٩١٩/٤/٣٠ کردوە (دیارە دوای تەواو بوونی شەڕ دەرچووە) کەلە ئەستەمبوڵ دەرچووەو ئەوەی تەنها لەلیستەی ئەو ڕۆژنامەیەدا بڵاوکراوەتەوە وەکوو بلەچ شێرکوە باسی کردوە، تەنها ئەوانەی ئاوارە کرابوون لە (سنجق)ی (بوردور) لەئەنادۆڵدا بریتی بوون لە (٤٧٤٥) خێزان کە بلەچ شێرکوە ناوی سەرۆکی تاقم تاقمی هەموویانی تۆمار کردوە.

بێگومان ئاخۆ چەند لیستەی شوێنەکانی تر هەبوەو جلادت بدرخان زانیاری دەربارەیان دەسگیر نەبوە.

لەڕاستیدا ئەو زانیاریانەی بەکورد گەیشتبوو بەهۆی شەڕەوە ئەوەندە باسێکی دوورودرێژەو کتێبی تایبەتی ئەوێ کە هەموو زانیاریەکانی تیایا باسبکرێت دەربارەی‌و مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەیاداشتەکانیا سەرچاوە/٦٥ باسێکی ئێجگار دڵتەزێنی تۆمار کردوە لە کتێبەکەی شێخ محمودا، سەرچاوە/٨٠ ئەو باسەی ئەومان بڵاوکردۆتەوە کە پیاو دەیخوێنێتەوە هەموو ژیان‌و مرۆڤایەتیشی لەبەرچاو دەکەوێ لەو برسێتی‌و قات‌و قڕییەی لەکاتی شەڕدا تووشی میللەتی کورد بوبوو.

لەکۆتایی ئەم باسەو ئەم بەرگی یەکەمەی باکوری کوردستان، بەپێویستم زانی ئەو شیعرە ئێجگار بەرزەی شاعیری بێچاو (مەلا حمدون) کە لە چاوساغێك شارەزایانەتر باسی ئەو شەڕی یەکەمی جیهانەی کردوە هەروەکوو مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەکتێبەکەیدا لەلاپەڕە/١٣٢ی بەرگی یەکەمی کتێبی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)دا باسیکردوە، مەلا حمدون ماوەیەکی زۆر لە ئەستەمبوڵدا ژیاوەو لەقاوەخانەی ـ یا (چایخانەی بغداد) لە (سرکەچی) بەزۆری وەختی خۆی

بەسەر بربوەو لەویٚ چاوی بەکوردەکانی ئەویٚ کەوتوەو هەواڵی شەڕی (سەفەربەر)ی لیٚ بیستوون.

ئەم ڕۆژەچ ڕۆژێکە کە دنیا شڵەژاوە
هەرکەس بەجەخاریٚ جگەری قیمەکراوە
دنیا پڕی ئاشووبە خەلایق بەعمومی
ئاسایشی لیٚ مەنعە ئەڵێی جونبوشی ئاوە
وەك تەرزە ئەباریٚ بەهەموودەم ئەسەف و غەم
هەوری غەزەب و قەهری خوا توندو بەتاوە
ئەم وەزعە کە ناوی بە (سەفەربەر) ئەبەن ئیمڕۆ
فەرمانی بەخوێن ڕشتنی ئەم عالەمەی داوە
گیرۆدەیە ئەم عالەمە، هەرکەس بەسیاقیٚ
کەوتۆتە کەشاکەش بەقوماندەی ئومەراوە
(ژەندرمە) ئەسووڕێتەوە وەك واشەیی برسی
بۆلاشەیی میللەت بەفڕو فێڵی غەزاوە
فەوتاوە لەبەرسوخرە کەرو ئێسترو یابوو
حوشتر سەقەتو شەل بووە گا پشتی شکاوە
کەر شەوقی زەڕینی نیە هەتا لەبەهارا
ترسی هەیە نەك بیخەنە ژێر باری قەزاوە
بۆ گرتن و بۆ کوشتنی ئەم عالەمە یەکسەر
ئەم عرصەیی ئافاتە دەڵێی حەڵقەیی داوە
نێك و بەدی ئەم عالەمی ئیسلامە بەجاریٚ
کەوتوونەتە ژێر حەلقەیی زنجیری بەلاوە
هەرشەش جیهەتی گرتووە ئاشووب و مصیبەت
مێشوولە مەجالی نیە بفڕیٚ بەحەواوە
ئەم ظاڵمی سفاکی (سەفەر بەرلکە) ئیمڕۆ
نامەی فەرەحی داوە بەدەم بادی صباوە
طیارە بەئەسبابی شەڕو فیتنەوە دایم

جەولانی ئەڵێی هەورە بەسەر مرکزی باوە
باڵۆنی هەڵۆ شێوە لەگەڵ دێتە بزووتن
عالەم لەنەزمریا هەر ئەڵێی پۆڕی خوراوە
ئەم جووتە بەلازادەیی باڵندەیە ئیمڕۆ
سیارە بە سەیالەی برقی بەهەواوە
برقو غەزەبی دانەیی نارنجەك وبۆمبا
ئاگر دەپرژێنێ بەزەمیندا لەسەماوە
شەوو ڕۆژ لەبەر برقی قلیج و ڕم و سونگی
لەمعە قەسەتۆرە بەدەلی عەکسی هەتاوە
لەو ڕۆژەوە دنیا هەیە تائەم دەمە بێ شك
مەغلوبەیی بەم غایەتە، نەبووەو نەکراوە
بنچینەیی دەرکەوتوە ئاساری شریعەت
یەکسەر هەرەسی بردوە ئانێکی نەماوە
ئەم دینە لەپێشدا وەکوو زەمزەم بوو بەڕوونی
هیچ غەشی نەبوو، ئیستە دەڵێی لێڵی قوڕاوە
یارەبی لەبەر خاتری پێغەمبەرەکەی خۆت
ڕەحمێ بکە بەم کۆمەڵی ئیسلامە کەماوە
لەت لەت بووە بەم چەکوشە سەعاتی دڵی عالەم
ڕەقاصو جەڕو زەمبەلەك و چەرخی سواوە
(حمدی) دڵی یەخسیری فەڕەنگی خەمە ئیمڕۆ
بەربوونی بەبەربوونی گەروی (بصرە) و (فاو)ە

# سەرچاوەکان

| ز | ناوی سەرچاوە | نووسەرو وەرگێڕ | شوێن و ساڵی لەچاپدانی |
|---|---|---|---|
| ١ | گۆڤاری the kurds | David medwell | ژمارە/٢٣ لندن ١٩٨٢ |
| ٢ | اعلام الكرد | مير بصري | چاپی لندن — قبرص ١٩٩١ |
| ٣ | مێژووی ڕۆژنامەگەری | دوکتۆر جمشيد حيدری | گۆڤاری پەیڤ.لندن ژمارە١٦ساڵی١٩٩٢ |
| ٤ | People without country | Challand وەرگێرانی دوکتۆر احمد عوسمان | گۆڤاری نوسەری کورد ژمارە٤ ساڵی ١٩٨٦ |
| ٥ | ڕۆژنامەی کوردستان | دەستەی نوسەران | گۆڤاری چوارچرا ژمارە/٢ساڵی١٩٨٦ سويد |
| ٦ | پێوەندی نێوان کورد و روسیا | دوکتۆر كمال علي | گۆڤاری چوارچرا ژمارە/٣ساڵی١٩٨٦ سويد |
| ٧ | شۆڕشی دەرسیم | ترجمەی عبدالجبار عبدالغفور لەتورکیەوە | گۆڤاری ڕۆشنبیری کورد ژمارە١٢٦بغداد١٩٩٠ |
| ٨ | مەسئەلەی کوردەکان | و.جی.نیلفنستن.وەرگێڕانی بۆ کوردی عبدالقادر حشمت | لەبلاوکراوەکانی دەنگی گێتی ساڵی١٩٤٧ بغداد |
| ٩ | کوردستانی تورکیا بەزەمینەی مێژوویەوە | د.عصمت شريف وانلي | گۆڤاری خوندکاری کورد پاريس١٩٩٠ |
| ١٠ | گۆڤاری کوردستان ساڵی ١٩١٩–١٩٢٠ | فەرهاد پیرباڵ | گۆڤاری میوای پاریس١٩٩٠ |
| ١١ | چل ساڵ لەبیرەوەیی جلادت بدرخان | کونی ڕەش | گۆڤاری میوا ژمارە ٨ پاریس ١٩٨٦ |
| ١٢ | البارزاني والحركة التحررية. انتفاضة بارزان الاولى١٩٣١–١٩٣٢ | مسعود بارزانی | چاپخانەی خەبات ١٩٨٦ |
| ١٣ | ملاحظة تأريخية حول نشأة الحركة القومية الكردية | سيامند احمد عوسمان | گۆڤاری دراسات كردية ژمارە ١ی ساڵی ١٩٨٤ بغداد |
| ١٤ | ڕابەری ڕۆژنامەگەری | جمال خەزنەدار | بغداد ١٩٧٣ |
| ١٥ | ڕۆژنامەکانی بانگی کوردستان و ڕۆژی کوردستان ١٩٢٢–١٩٢٣ | جمال خەزنەدار | بغداد١٩٧٣و١٩٧٤ |
| ١٦ | کوردستان والاكراد | د. عبدالرحمن قاسملو | بيروت ١٩٧٢ |
| ١٧ | جمهوريه مهاباد | وليم نيگلتن.ترجمەی جرجيس فتح الله | بيروت ١٩٧٢ |
| ١٨ | ڕاپەڕینی کوردەکان ساڵی١٨٨٠ | د.جليلی جليل وەرگێرانی بۆکوردی د.کاوس قەفتان | بغداد ١٩٧٨ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩ | کێشەی کورد لەسیڤەرەوە بۆ لۆزان | د.فوئاد حەمەخورشید | گۆڤاری رەنگین ٧٩ بغداد |
| ٢٠ | دەربارەی رۆژنامەی کوردستان | محمد ملا کریم | گۆڤاری رەنگین ٧٩ بغداد |
| ٢١ | کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی | د.جلیلی جلیل وەرگێرانی بۆ کوردی د.کاوس قەفتان | بغداد ١٩٨٧ |
| ٢٢ | کوردستان والحرکة القومیة الکردیة | جلال تاڵەبانی | بیروت ١٩٧١ |
| ٢٣ | الکرد وکردستان في الوثائق البریطانیة | د. ولیدحمدی الأعظمی | قبرص ١٩٩٢ |
| ٢٤ | کوردستان لەساڵەکانی شەڕی جیهانیدا | د. کمال مەزهەر | بغداد ١٩٧٥ |
| ٢٥ | عرب و لکراد ـ رؤیة عربیة | منذر الموصلي | بیروت ١٩٨٦ |
| ٢٦ | رۆژ کورد ـ ١٩١٣ | جمال خەزنەدار | بغداد ١٩٨١ |
| ٢٧ | یادداشتەکانی مێجەر نۆئێل | مێجر نۆئێل | دۆکیومێنتی ژمارە FO.351 13974 ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا |
| ٢٨ | جمهوری اول تورکی | ریچارد ئەلینسۆن، ترجمەی بۆ فارسی ئیرج ئەمینی | چاپی تهران ساڵی ١٣٥٦ی کۆچی |
| ٢٩ | کوشتاری ئەرمەنیەکان | kak bajalan | گۆڤاری Kurdish time |
| ٣٠ | کمال ئەتاتورک | محمد محمد توفیق ـ ترجمەی بۆ فارسی فردوسی فراهانی | ئەراک ـ ئێران ١٣١٨ ی‌کۆچی |
| ٣١ | کوردستان وشۆڕشەکەی | د. جمال نەبەز ـ ترجمەی د.کوردو علي بۆ کوردی | سوید ١٩٨٥ |
| ٣٢ | خلاصە تأریخ الکرد وکوردستان | محمد ئەمین زەکی ـ وەرگێرانی بۆعەرەبی محمد علي عوني | قاهیرە ساڵی ١٩٦١ |
| ٣٣ | گەشتەکەی (بیوو) لەکوردستاندا | وەرگێرانی لەتورکیەوە بۆ کوردی شوکور مصطفی | گۆڤاری کۆڕی زانیاری بەرگی دوهەم بغداد ١٩٨٣ |
| ٣٤ | کورد لای گردلیێفسکی | د. کمال مەزهەر | گۆڤاری کوری زانیاری ژمارە٢ بغداد١٩٨٣ |
| ٣٥ | عرب ولکراد ـ خصام او وئام | دریە محمدعلي عوني | قاهرە ١٩٩٣ |
| ٣٦ | کوردو مەسەلەی کورد | میخائیل سیمونە ڤیچ لازاریف ترجمەی بۆ کوردی د.کمال علي | گۆڤاری سوکمە ـ سوید |
| ٣٧ | الاکراد شعبا وقضیة | صلاح بدرالدین | بیروت ١٩٨٧ |
| ٣٨ | مێژوو ـ کوردو مێژوو | دوکتۆر کمال مەزهەر | بغداد ١٩٨٣ |
| ٣٩ | چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد | د. کمال مەزهەر | بغداد ١٩٨٣ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤٠ | کۆمەڵو رێکخراوو حزبە کوردییەکان لەماوەی نیوسەدەدا | د. عبدالستار طاهر شریف | گۆڤاری کۆڕی زانیاری بەرگی ١٨ و١٩ ساڵی ١٩٨٨ بغداد |
| ٤١ | مێژووی کورد لەسەدەی نۆزدەو بیستدا | کریس کوچیرا ـ وەرگێڕ محمد ریانی | تاران ساڵی ١٣٦٩ی کۆچی |
| ٤٢ | جوڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی کورد | د.عزیز شمزینی، وەرگێر بۆ کوردی (ئەسەسەرد) | چاپخانەی ئیبراهیم عەزۆ/١٩٨٥ |
| ٤٣ | کورد | مینۆرسکی وەرگێر بۆ عەرەبی د.مارف خەزنەدار | بغداد ١٩٨٤ |
| ٤٤ | الرجل الصنم ـ أتاتورك | ضابط ترکی سابق ترجمەی بۆ عەرەبی عبدالله عبدالرحمن | بیروت ١٩٩٢ |
| ٤٥ | القومیة فی تورکیا | وەرگێری بۆ کوردی سیامند سرتی | شوێنو ساڵی لەسەرنییە |
| ٤٦ | ترکیا والشرق الاوسط | Philip Robinsوەرگێری بۆ عەرەبی میخائیل نجم خوری | لیماسول قبرص ١٩٩٣ |
| ٤٧ | العرب والترك في العهد الدستوري العثماني ١٩٠٨ – ١٩١٤ | د. توفیق برو | دمشق ١٩٩١ |
| ٤٨ | الدولة العثمانیة قراءة جدیدة لعوامل الأنحطاط | د. قیس جواد الغراوي | فلوریدا ١٩٩٤ |
| ٤٩ | کردستان تورکیا بین الحربین | پرۆفیسۆرحسریتان ترجمەی سعدالدین ملاو باڤی نازی | بیروت ١٩٨٧ |
| ٥٠ | بنەماڵەی شێخانی پیران | Robert Olson | جامعە کنتاکی ١٩٩٤ |
| ٥١ | سیاحەتنامەی ئەولیا چلبی | وەرگێری بۆ کوردی سعید ناکام | بغداد ١٩٧٦ |
| ٥٢ | کوردەکان أزیبرون | حسن عرفە وەرگێری بۆ فارسی حامد گەوهەری | سوید ١٩٨٥ |
| ٥٣ | جنبشهای کورد أز بیرون تاکنون | م.کاردۆخ | یوتەبوری ـ سوید١٩٩٣ |
| ٥٤ | الاکراد | باسیل نیکتن ترجمەی صلاح برواری | ١٩٩٣(شوێنی لەسەر نیە) |
| ٥٥ | نهضەالاکراد الثقافیة | د. جلیلیجلیل وەرگێرانی بۆ عەرەبی باڤی نازیە د.ولاتو | بیروت ١٩٨٦ |
| ٥٦ | کردستان والحرکة التحرریة | صلاح بدرالدین | نیقوسیا ١٩٨٣ |
| ٥٧ | في سبیل کردستان(مذکرات) | زنار سلوپی (قدری جمیل بەگ) | بیروت ١٩٨٧ |
| ٥٨ | تأریخ الدولة العلیة العثمانیة | فرید بەگ المحامي | بیروت ١٩٨١ |
| ٥٩ | جوڵانەوەی رزگاریخوازی کورد | رادوڤان باڤیع ترجمەی محمود ملا عزت | سوید ١٩٨٥ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦٠ | القضية الكردية ماضي الكرد وحاضرهم | بلەچ شیرکوە(جلادت بدرخان) | بيروت ١٩٨٦ |
| ٦١ | انتفاضة ئاگرى ـ يادداشت | احسان نورى پاشا وەرگێرى صلاح بروارى | بيروت ١٩٩٠ |
| ٦٢ | محاضرەیەك دەربارەی کوردستان گۆڤاری Journal of the Royal centre | ژنەکەی مێجرسۆن Mr. s. soane | حزیرانی ١٩٣٥ |
| ٦٣ | الحركة الكردية في الزمن الحديث والمعاصر | مجموعەمن المستشرقين ترجمەی لەروسیەوە بۆ عەرەبی کرم السويدی | موسودەیەو چاپ نەکراوە |
| ٦٤ | The Baning Of Kuorog is Cultur | پرۆفیسۆرحسریتان ترجمەی ش. خ. محو | ئەنستیوتی کوردی لەپاریس |
| ٦٥ | یاداشتەکانی مامۆستا رفیق حلمی | رەفیق حلمی | چاپی دوهەم بغداد ١٩٨٤ |
| ٦٦ | The Conficlict OF tribes Iniran And Afgistan | مارتن ڤان برونستون | لندن ١٩٨٣ |
| ٦٧ | بیرەوەریەکانی عبدالعزیز یامولکی | عبدالعزیز یامولکی | گۆڤاری مامۆستای کورد سوید ١٩٩٦ |
| ٦٨ | گەشتەکەی ریچ | ترجمەی محمدی حمەباقی | چاپی تەوریز ١٩٩٢ |
| ٦٩ | یاداشتەکانی ئەحمەد تقی | ئامادەکردنی جلال تقی | بغداد ١٩٧٠ |
| ٧٠ | کوردو عەجەم | صالح محمد ئەمین (نەوشیروان مصطفی) | چاپی ١٩٩٢ |
| ٧١ | کورتە مێژووی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد | صادق شرفکندی | سوید ١٩٩٥ |
| ٧٢ | ذکر الاكراد وأصولهم في كتابات المسلمين الأوائل | د. احمدعوسمان ابوبكر | گۆڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە١٣بغداد ساڵی ١٩٨٥ |
| ٧٣ | شێخ وئاغاو دەوڵەت | مارتن ڤان برونستون وەرگێری بۆ کوردی د. کوردۆعلی | سوید ١٩٩٦ |
| ٧٤ | التراث الكردي في المؤلفات الأيطالية | Mirello Galletti وەرگێری بۆ عەرەبی د. یونس حبی | گۆڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە٦ بغداد ١٩٨١ |
| ٧٥ | شرفنامە | شرفخانی بدلیسی ترجمەی هەژار لە فارسیەوە بۆکوردی | چاپی تاران چاپخانەی جەوهەری ساڵی ١٩٨١ |
| ٧٦ | رۆژنامەکانی کوردستان١٨٩٨–١٩٠٢ | کۆکردنەوەو لەسەرنوسینی بەکرمانجی محمد ئەمین بۆز ارسلان دوجلد | سوید ـ دوجلد |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧٧ | گۆڤارەکانی ژین | کۆکردنەوەی محمد ئەمین بوزارسلان | سوید ٤ جلد |
| ٧٨ | ژیانی شریف پاشای خندان | رۆهات ئالاکۆم | گۆڤاری مامۆستای کورد سوید سالی ١٩٩٥ |
| ٧٩ | The Case of Kurdistan against Turkey . | سریا بدرخان | چاپی فلاد لیفا سالی ١٩٢٨ له سوید سالی ١٩٩٥ چاپکراوەتەوە |
| ٨٠ | بەرگی یەکەم ودوەمی شێخ مەحمودی قارەمانو دەولەتەکەی خواروی کوردستان | محمد رسول هاوار | لەسوید سالی ١٩٩٥ چاپکراوەتەوە ١٩٩٠ لندن و١٩٩١ستوکهۆلم |
| ٨١ | گزیده أسناد سیاسی ایرانو عوثماني دردورەی قاجاریه/ جلد أول | دفتر مطالعات سیاسی وبین الملل أیران | طهران ١٣٦٩ هـ |
| ٨٢ | الأمبراطورية العثمانية | سعيدأحمد برجاوی | بيروت ١٩٩٣ |
| ٨٣ | الترك في العصور الوسطى بيزنطاو سلاجقة الروم | د. زبيده عطا | كويت دار الفكر العربي / مێژووی لەسەر نیه |
| ٨٤ | The Emergence of Kurdish Natinalism and saikh said Rebilion | robert olson | چاپی ئەمریکا ١٩٨٩ |
| ٨٥ | Ataturk: the Rebirth of Nation | Patrick Kinross | لندن ١٩٩٥ |
| ٨٦ | المغول | د. السيدالباز العريني | بيروت ١٩٨٦ |
| ٨٧ | گۆڤاری رۆژی نوێ (یاداشت) | اسماعيل حقي شاويس | سلێمانی ١٩٦٠-١٩٦١ |
| ٨٨ | الأجزاء العشرة من السنةالسابعة عشرة من مجلات الهلال١٩٠٨تشرين الأول١٩٠٨- ١٩٠٩ | منشأها جرجي زيدان | مطبعة الهلال ـ فجالة ـ مصر |
| ٨٩ | The Ottoman Empire | Wuynes vacinici ترجمەی سهيل ئازری بۆ فارسی | چاپخانەی شفق ـ تەوریز ١٣٤٦هـ |
| ٩٠ | تأريخ عوسمانی أزتشكيلات دولت تافتح استمبول ـ جلداول | پرۆفیسۆر حقی ئۆزون ترجمەی د. ایرج نوبخت بۆفارسی | ١٣٦٨ کۆچی |
| ٩١ | کردستان موکریان یائەتروپاتین | حسین حوزنی موکریانی | رواندز ١٩٣٨ زاری کرمانجی |
| ٩٢ | الأكراد و العرب | ئیبراهیم ئەحمەد | بغداد چاپی یەکەم ١٩٣٧ |
| ٩٣ | تأريخ الامارات الكردية في الأمبراطورية العثمانية | پرۆفیسۆر جلیلی جلیل ترجمەی د. محمد عبدو بۆعەرەبی | دمشق ١٩٨٧ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩٤ | پێوەندارێتی کوردی | د. جمال نەبەز | ستۆکهۆڵم ١٩٨٦ |
| ٩٥ | معاهدة سيفر | م. رسول هاوار | مجله الثقافية الكردية لندن-١٩٩٠المركز الثقافي الكورد في لندن |
| ٩٦ | الاكراد أحفاد الميديين | مینۆرسکی ترجمەی د. کمال مەزهەر | گۆڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە١ بغداد |
| ٩٧ | ئاوێستاو نامەی مەینەتی ئاینی زەردەشت بەشی یەکەم | ئەنداز حوێزی | سوید ١٩٩٢ |
| ٩٨ | کورد و کوردستان لەنیگای چەند گەڕیدەیەکی رۆژئاواییدا | ترجمەی شوکور مصطفی لەتورکیەوە | گۆڤاری کۆڕی زانیاری بەرگی هەشتەم ساڵی ١٩٨١ |
| ٩٩ | مێژووی حەسەن وەیهیو عەییاری | محمد جمیل رۆژبەیانی | بغداد ١٩٩٦ |
| ١٠٠ | رۆژنامەگەریی کوردی | مالمیسانژ | سوید ١٩٨٩ |
| ١٠١ | دوکیومینتەکانی ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی حکومەتی بریتانیا | | ١٩١٩-١٩٣٩ |
| ١٠٢ | خەبات (کێشە) لەرێی کوردستانا | ن.أ.خالفین ترجمەی جلال تقی لە روسیەوە | چاپی ساڵی ١٩٨٢ |
| ١٠٣ | أضواءعلى قضايادولية | د. كمال مەزهەر | بغداد ١٩٧٨ |
| ١٠٤ | مێژووی مۆسیقای کوردی | محەمەد حمە باقی | سەقز ١٩٩٦ |

کۆتـــایـــی